# سایکۆ لۆژیای گەشە
# (منداڵ و هەرزەکار)



د. کەریم شەریف قەرەچەتانی
پرۆفیسۆری یاریدەدەر
کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی / زانکۆی سلێمانی

ئامادەکردن و کردنە PDF
جوان ئیبراهیم
ڕۆژگار کەرکوکی

سلێمانی
٢٠٠٩

# سایکۆلۆژیای گەشە
# ( منداڵ و هەرزەکار )

د. کەریم شەریف قەرەچەتانی
پرۆفیسۆری یاریدەدەر
کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی / زانکۆی سلێمانی

*زانکۆی سلێمانی پشتگیری و یارمەتی لەچاپدانی ئەم کتێبەی داوە بە دابینکردنی پاداشتی هەڵسەنگێنەری زانستی و زمانەوانی سەرەڕای تایپکردنی کتێبەکە .*

سلێمانی ٢٠٠٩

چاپی یەکەم ( ٢٠٠٩ )
چاپخانەی پەیوەند - سلێمانی
لە کتێبخانەی گشتی سلێمانی ژمارەی سپاردنی ژمارە ( ٢٣٦٨ ) ساڵی( ٢٠٠٨ ) پێدراوە
زانکۆی سلێمانی یارمەتی لەچاپدانی ئەم کتێبە داوە بە دابینکردنی پاداشتی هەڵسەنگێنەری زانستی و زمانەوانی سەرەڕای پیتچنینی .
لەسەر ئەرك و حسابی نووسەر بە چاپ گەیەندراوەومافی لەبەرگرتنەوەو دووبارە چاپکردنەوەی تەنها بۆ نووسەرە .

## ناوەرۆك



| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشەكی | ١٠ |
| بەشی یەكەم ( قۆناغی منداڵی ) | |
| گرنگی سایكۆلۆژیای منداڵ. | ١٤ |
| قۆناغەكانی گەشەكردنی سایكۆلۆژیای منداڵ.. | ١٥ |
| ڕێگاكانی بە ئەنجام گەیاندنی توێژینەوە لە سایكۆلۆژیای منداڵدا.. | ٢٧ |
| كەرەستەكانی كۆكردنەوەی زانیاری | ٣٣ |
| تیۆرەكانی گەشەكردن | ٣٩ |
| پرانسیپەكانی گەشەكرد | ٤٥ |
| گەشەكردن لە قۆناغی پێش لە دایك بوون | ٥٠ |
| ئەو هۆكارانەی كار دەكەنە سەر گەشەكردنی كۆرپەلە لەناو منداڵدانی دایك | ٥٥ |
| بۆماوەو ژینگە | ٦٠ |
| كاریگەری گلاندەكان لەسەر گەشەكردن | ٦٦ |
| هەستەوەرەكان( گرنگی و چۆنیەتی گەشەكردنیان | ٧٥ |
| گەشەكردنی جووڵەی منداڵ | ٨١ |
| چاودێریكردنی گەشەی جووڵەی منداڵ | ٨٤ |
| زیرەكی ومەعریفەو چۆنیەتی گەشەكردنی لە روانگەی ( جان بیاجیە ) | ٨٩ |
| قۆناغەكانی گەشەكردنی زیرەكی ومەعریفە لە روانگەی تیۆرەكەی ( جان بیاجیە ) | ٩٥ |
| ئەركەكانی دایك و باوك و مامۆستا بە پێی تیۆرەكەی پیاجیە | ١٠٧ |

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |
| ئایا راستە منداڵانی هەندێك گەل و نەتەوە هەر لە بنەڕەتەوە منداڵانی لە گەلانی تر زیرەکترن | ١٠٨ |
| چۆنیەتی گەشەکردنی هەڵچوونەکانی منداڵ | ١١٤ |
| ئەو هۆکارانەی کار لە گەشەکردنی هەڵچوونەکان دەکەن | ١١٩ |
| رۆڵــی دایــك و بــاوك و مامۆســتا لــە گەشــەکردنی هەڵچوونەکاندا | ١٢٣ |
| منداڵ چۆن دەبێت بە بوونەوەریکی کۆمەڵایەتی ؟ | ١٢٥ |
| شێوازەکانی راهێنانی کۆمەڵایەتی | ١٣٢ |
| گرنگی دایك لە ژیانی منداڵ | ١٣٦ |
| باوەشی گەرمی دایك | ١٣٨ |
| بێبەشبوون لە دایك | ١٤٠ |
| جێگری دایك | ١٤٢ |
| پرۆسەی شیر پێدان | ١٤٢ |
| شیری دایك و شیری دەستکرد | ١٤٣ |
| گرنگی باخچەی ساوایان | ١٤٦ |
| چۆنیەتی گەشەکردنی زمانی منداڵ | ١٥٠ |
| بنەما فسیۆلۆژیەکانی زمان | ١٥٠ |
| تیۆرەکانی لێکدانەوەی فێربوونی زمان | ١٥٢ |
| هەنگاوەکانی فێربوونی زمان | ١٥٧ |
| چی گەشەی زمانی منداڵ دوا دەخات ؟ | ١٥٩ |
| قۆناغەکانی گەشەکردن و فێربوونی زمان | ١٦٠ |
| دەوڵەمەندی و هەژاری زمانی منداڵ | ١٦٥ |
| قۆناغەکانی گەشەکردن بە پێی تیۆرەکەی ئەریکسۆن | ١٦٨ |

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |
| پرۆسەی فێربوونی رۆڵی کۆمەلایەتی ( جێندەر ) | ١٧٨ |
| گەشەکردنی نەخلاقی ( ئاکاری ) | ١٨٧ |
| ویژدان و گەشەکردنی | ١٩٣ |
| پێوەرە نەخلاقیەکان | ١٩٦ |
| جۆرەکانی نەخلاق | ٢٠٤ |
| یاریکردن و گەشەکردنی منداڵ | ٢٠٩ |
| تیۆرەکانی یاریکردن | ٢١٠ |
| چیرۆك و پەروەردەکردنی منداڵ | ٢١٤ |
| خوێندنگاو رۆڵی لە درووستی دەروونی منداڵدا | ٢١٧ |
| ئایا راستە منداڵ کاولکەرو تێکدەرە ؟ | ٢١٩ |
| سزادانی منداڵ | ٢٢٣ |
| منداڵی نازدار | ٢٢٦ |
| منداڵی گێل | ٢٢٩ |
| منداڵی گەمژە | ٢٣١ |
| منداڵی دەبەنگ | ٢٣٣ |
| منداڵی مەنگۆلی | ٢٣٥ |
| منداڵ بۆ درۆ دەکات ؟ | ٢٣٨ |
| چکۆسی ( غیرە ) | ٢٤٣ |
| بروا بەخۆنەبوون | ٢٤٦ |
| لەخوێندن دواکەوتن | ٢٤٨ |
| شەرمکردن | ٢٥١ |
| هەست بەکەمی کردن | ٢٥٤ |
| دڵنیایی دەروونی | ٢٥٨ |

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| راودرگرتنی منداڵ | ٢٦٠ |
| هەر منداڵەو جیهانی تایبەتی خۆی هەیە | ٢٦٣ |
| یاریكردن و گەشەكردنی كۆمەڵایەتی | ٢٦٥ |
| پەیوەندی نێوان منداڵ و دایك و باوك ( هۆگری ) | ٢٦٨ |
| ناخۆشی نێوان دایك و باوك و كاریگەری لەسەر منداڵ | ٢٧١ |
| سایكۆدراماو چارەسەركردنی گرفتەكانی منداڵان | ٢٧٤ |
| چالاكییە هونەری و وەرزشیەكان و هەڵچوونەكانی منداڵ | ٢٧٨ |
| منداڵ و پشت بەستنی بە كەسانی تر | ٢٨٠ |
| منداڵ لە شیر بڕینەوە | ٢٨٤ |
| پاداشت كردنی قوتابی منداڵ نەك سزادانی | ٢٨٧ |
| ئەو هۆكارانەی دەبنە هۆی دواكەوتنی ژیری و بیر كوێلی منداڵ | ٢٩٣ |
| منداڵی بەهرەمەندو بلیمەتیش گرفت دروست دەكات | ٢٩٩ |
| گەشە پێكردنی چەمكەكان لە قۆناغی باخچەی ساوایان | ٣٠١ |
| شەڕو ناخۆشی منداڵان | ٣٠٥ |
| منداڵانی یەك خێزانیش شەڕ دەكەن | ٣٠٧ |
| منداڵی لاسارو سەرەڕۆ كێیە؟ | ٣٠٩ |
| هۆكارەكانی لاساری و سەرەڕۆیی منداڵ | ٣١٠ |
| شەڕخوازی منداڵان | ٣١٣ |
| یاخی بوونی منداڵ و هەرزەكار | ٣٢٠ |
| تەلەفزیۆن و رەفتاری شەڕخوازی | ٣٢٥ |
| شەڕو كوشتارو منداڵ | ٣٣١ |
| منداڵ بۆ دزی دەكات؟ | ٣٣٤ |

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| ترس و چۆنیەتی چارەسەرکردنی | ٣٤٠ |
| منداڵ بۆ دەترسێت و چۆنیش چارەسەر دەکرێت؟ | ٣٤٥ |
| منداڵی بێزراوو پشت گوێخراو | ٣٥٢ |
| باری دەروونی منداڵی پۆلی یەکەم | ٣٥٤ |
| منداڵە نوقستانەکان و پێداویستیەکانیان | ٣٥٦ |
| منداڵی هەڵچوو دەمارگیر | ٣٦٠ |
| کابووس | ٣٦٤ |
| عینادی و کەللە ڕەقی منداڵ | ٣٦٦ |
| قسەکردن و ڕۆیشتن لەکاتی خەوتندا | ٣٧٠ |
| نینۆک قرتاندن بە ددان | ٣٧٢ |
| پە نجە مژین | ٣٧٤ |
| میز کردن بە خۆدا : هۆکارو چارەسەرکردن | ٣٧٧ |
| قوتابی بۆ لە قوتابخانە رادەکات؟ | ٣٨٢ |
| چەند ڕێنمایییەکی پەروەردەیی بۆ دایکان و باوکان و مامۆستایان | ٣٨٦ |
| چەند ساتێك بۆ منداڵەکەت تەرخان بکە | ٣٩٠ |
| تاوانی باوك، قوربانی منداڵ | ٣٩٤ |
| هەست کردن بە جوانی | ٣٩٦ |
| چە پەڵی و ناڕێکی وەك خویەکی خراپ | ٣٩٨ |
| ڕێز نەگرتنی کات و بەفیڕۆدانی | ٤٠٦ |
| منداڵ چۆن خۆی لە ئاوێنەی خێزانەکەیدا دەبینێتەوە | ٤١٥ |
| هەست کردن بە گوناهو شەرمەزاری | ٤١٧ |
| ڕووداوو مەترسییەکانی ناو ماڵ بۆ منداڵ | ٤١٩ |

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| منداڵ و هەرزەکار چۆن لەجۆری پەیوەندییەکان و شێوازی پەروەردەکردن دەگەن | ٤٢٢ |
| منداڵ و دیموکراسیەت | ٤٢٤ |
| منداڵی خۆپەرست | ٤٢٦ |
| باری دەروونی منداڵی نەخۆش | ٤٣٢ |
| بەشی دووهەم (قۆناغی هەرزەکاری) | |
| قۆناغی هەرزەکاری | ٤٣٦ |
| جیاوازی نێوان باڵقی و هەرزەکاری | ٤٣٩ |
| گلاندەکان و کاریگەرییان لە قۆناغی باڵق بوون | ٤٤١ |
| هەڵس و کەوت و جووڵەی هەرزەکار | ٤٥٢ |
| تەندروستی هەرزەکار | ٤٥٣ |
| هەرزەکارو جۆرەکانی | ٤٥٤ |
| تیۆرییەکانی هەرزەکاری | ٤٥٦ |
| هەرزەکاری دیاردەیەکی بایۆلۆژییە | ٤٥٦ |
| هەرزەکاری دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە | ٤٥٨ |
| هەرزەکاری دیاردەیەکی دەروونییە | ٤٦٠ |
| هەرزەکارو گۆڕانکارییە جەستەییەکان | ٤٦٤ |
| گۆڕانکارییە هەڵچوونیەکانی قۆناغی هەرزەکاری | ٤٧٠ |
| شڵەژان و گرفتە دەروونیەکانی قۆناغی هەرزەکاری | ٤٨٠ |
| زیندە خەون (أحلام اليقظة) | ٤٨٣ |
| خۆشەویستی لە قۆناغی هەرزەکاری | ٤٩٢ |
| هەرزەکارو گەشەکردنی کۆمەڵایەتی | ٤٩٨ |
| جۆرەکانی خێزان و ڕەنگدانەوەیان لەسەر باری دەروونی | ٥٠٥ |

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| هەرزەکار | |
| حەزوو ئارەزووەکانی هەرزەکار | ٥١١ |
| هەرزەکارو هاوڕێیەتی | ٥١٧ |
| پێداویستیەکانی هەرزەکارو ڕۆڵی مامۆستا لە دابینکردنیان | ٥١٩ |
| کەم کردنەوە لە نرخی هەرزەکار | ٥٢٦ |
| گەشەکردنی عەقڵی و زانیاری لە قۆناغی هەرزەکاری | ٥٢٩ |
| سایکۆلۆژیای خۆ گونجاندن و خودی مرۆڤ | ٥٤١ |
| مێرد منداڵان و لاساری | ٥٥٠ |
| پەروەردەی سێکسی | ٥٥٩ |
| پەروەردەی سێکسی و ڕەنگدانەوەی لەسەر کەسایەتی | ٥٦١ |
| پیشەو کار لە قۆناغی هەرزەکاری | ٥٧٣ |
| سایکۆلۆژیای لاوان | ٥٧٧ |
| گرفتەکانی لاوان و چۆنیەتی زاڵ بوون بەسەریاندا | ٥٨١ |
| نامۆبوونی لاوان | ٥٨٥ |
| کێن ئەوانەی کە کێشەو گرفتی دەروونیان هەیە؟ | ٥٩٢ |
| سەرچاوەی گرێ دەروونیەکانمان | ٥٩٦ |
| پێکهێنەرەکانی دەروونی بێگەرد | ٦٠٠ |
| سەرچاوەی هەرەس و یاخی بوون | ٦٠٤ |
| سەرچاوەکان | ٦٠٨ |

## پێشەکی

سایکۆلۆژیای گەشە ئەو لقەیە لە دەروونزانی کە گرنگی بە گەشەکردنی مرۆڤ دەدات لەو کاتەوە کە کە پێی دەڵێن هێلکەی پیتێنراو تا دواهەمین ڕۆژی ژیانی مرۆڤ ،واتە گەشەکردنی ئەو هێلکەی پیتێنراوە ( زایگۆت ) لەناو منداڵدانی دایك و گەورەبوونی و دواتر لەدایك بوونی • دوای قۆناغی پێش لەدایك بوون گەشەکردنی منداڵ پێدەنێتە قۆناغێکی ترەوە ئەویش قۆناغی شیرخۆریە، دواتر قۆناغی پێش چوونە خوێندنگا ئینجا قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و دواتر قۆناغی هەرزەکاری و کامڵی و لە لوتکەو ترۆپکی قۆناغەکانیش قۆناغی بەساڵاچوونە • هەریەك لە ئەو قۆناغانە تایبە تمەندێتی خۆی هەیەو لەهەر قۆناغێکدا ژمارەیەك گۆڕانکاری ڕوودەدەن کە جیای دەکاتەوە لە قۆناغەکانی تر •

کاتێك ئێمەی دایك و باوك و مامۆستا و تاکەکانی تری کۆمەڵ شارەزایی پێویستمان دەربارەی گۆڕانکاریەکانی قۆناغەکانی گەشەکردن دەبێت ، ئەوا دەتوانین بە شێوەیەکی ڕاست و دروست مامەڵە لەگەڵ منداڵ و هەرزەکارەکانمان بکەین و لەزۆر کێشەو گیروگرفت ڕزگارمان بێت • بەڵام ئەوەی جێگەی داخە زۆربەی زۆری تاکەکانی کۆمەڵگا شارەزایی پێویستیان دەربارەی قۆناغەکانی گەشەکردن نیە ، ئینجا لەبەر ئەوەی زانیاری پێویستیان نیە ، ئەوا زۆر جار لەکاتی پەروەردەکردن و فێرکردن و مامەڵەی ڕۆژانەیاندا لەگەڵ مدالەکانیان ، ڕووبەڕووی کۆمەڵێك کێشەو گیروگرفت دەبنەوە •

ئەم کتێبە بۆ هەردوو قۆناغی منداڵی و هەرزەکاری تەرخان کراوەو باسی سەرجەم گۆڕانکارییە ( جەستەیی و جووڵەیی و عەقلی و مەعریفی و هەڵچوونی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیەکان ) دەکات بەو هیوایەی ببێت بە سەرچاوەیەکی زانستی بۆ سەرجەم مامۆستایان و دایکان و باوکان و خوێندکارو قوتابیانی خۆشەویست •

هەموومان دەزانین كە قۆناغی منداڵی گرنگی خۆی لە ژیانی هەموو مرۆڤێكدا هەیەو زۆر لە دەروونزانەكان بە بناغەی كەسایەتی مرۆڤی دادەنێن و لەو بڕوایەدان كە بنەماكانی كەسێتی مرۆڤ لە پێنج شەش ساڵی یەكەمی قۆناغی منداڵیدا بونیاد دەنرێت، لەبەر ئەوە دەبێت گرنگی زۆری پێبدرێت و سەرجەم پێداویستیە فسیۆلۆژی و دەروونی و كۆمەلایەتیەكان لەم قۆناغەدا بۆ منداڵ دابین بكرێت بۆ ئەوەی لە داهاتوودا كەسێكی دەروون دروست بێت و دوور بێت لە گرفت و نەخۆشی دەروونی.

هەرزەكاریش یەكێكی ترە لە قۆناغەكانی ژیانی مرۆڤ و گرنگی خۆی لە ژیانیدا هەیە، لەم قۆناغەدا كۆمەڵێك گۆڕانكاری (جەستەیی و كۆمەلایەتی و هەڵچوونی و ژیری) روودەدەن و ڕەنگدانەوەی راستەوخۆیان لەسەر باری دەروونی هەرزەكار هەیە. كاتێك دایك و باوك و مامۆستاو كەسانی تری چواردەوری هەرزەكار شارەزاییان دەربارەی ئەم قۆناغە دەبێت، ئەوا بێگومان دەتوانن بەسەركەوتوانە مامەڵە لەگەڵ هەرزەكار بكەن و ژینگەی گونجاو بۆ گەشەكردنی بخوڵقێنن.

بەلام كاتێك ئێمەی گەورە وەك پێویست زانیاریمان نەبێت، ئەوا زۆر زەحمەتە بتوانین بەسەركەوتوانە مامەڵە لە تەك هەرزەكار و گۆڕانكارییەكانی قۆناغەكەی بكەین. ئەم كتێبە تارادەیەكی باش بەشێوەیەكی زانستیانە تیشكی خستۆتە سەر هەردوو قۆناغی منداڵی هەرزەكاری و زۆربەی گۆڕانكارییە گرنگەكانی ئەو دوو قۆناغە و چۆنیەتی مامەڵەكردنی دروست لەتەك منداڵ و هەرزەكار. لەبەر ئەوە زۆر پێویستە هەموو دایك و باوك و مامۆستاو كەسێك كە مامەڵە لەگەڵ منداڵ و هەرزەكار دەكات بیخوێننەوە، بۆ ئەوەی بتوانن بەشێوەیەكی زانستیانە پەی بە نهێنی و باری دەروونی منداڵ و هەرزەكار ببەن و كەش و هەوای دەروونی و كۆمەلایەتی گونجاویان بۆ بخوڵقێنن، تا منداڵ و هەرزەكارەكانمان لەلادان و سەرەڕۆیی و نەخۆشی و گرفتە دەروونیەكان دوور بخەینەوەو بە ئاسانی بەهەردوو قۆناغی منداڵی و هەرزەكاریدا تێبپەڕن. سەرەڕای ئەوەش زۆر

پێویستە هەموو هەرزەكارێك ئەم نووسراوە تاوتوێ بكات بۆ ئەوەی شارەزای باری دەروونی خۆی و گۆڕانكارییەكانی قۆناغەكەی ببێت.

بەئەركی سەرشانی خۆمانی دەزانین كە سوپاسی بەڕێزان (پ.ی.د.لویس كارلۆ) لەزانكۆی دهۆك – كۆلێژی پەروەردەی بونیاد وە (د.صابر بۆكانی) مامۆستا لە كۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەكانی زانكۆی سلێمانی بكەین كە بەكاری هەڵسەنگاندنی زانستی ئەم كتێبە هەڵسان سەرەڕای سوپاس و پێزانین بۆ بەڕێز (پ.ی.د. بەكر عومەر عەلی) لەزانكۆی سلێمانی – كۆلێژی زمان كە ئەركی زمانەوانی ئەم كتێبەی گرتە ئەستۆ.

لەكۆتایدا ئەوە ماوە سوپاسی بەڕێزان سەرۆك و ئەندامانی لیژنەی پشتگیری توێژینەوەی زانستی و دانانی كتێب و وەرگێڕان لەسەرۆكایەتی زانكۆ بكەین.

د. كەریم شەریف قەرەچەتانی

سلێمانی - ٢٠٠٨

گرنگی سایکۆلۆژیای منداڵ

قۆناغەکانی گەشەکردنی سایکۆلۆژیای منداڵ

مرۆڤی سەرەتایی

فەلسەفەی یۆنانی

ئاینی پیرۆزی ئیسلام

فەیلەسوفەکان

سەردەمی دەرکەوتنی سایکۆلۆژیای منداڵ بە شێوەیەکی زانستی

## گرنگی سایکۆلۆژیای منداڵ

سایکۆلۆژیای منداڵ بە شێکە لە سایکۆلۆژیای گەشەکردن (علم النفس النمو) وە سایکۆلۆژیای گەشەکردنیش یەکێکە لە بوارەکانی سایکۆلۆژیا. سایکۆلۆژیای گەشەکردن سەرجەم گۆڕانکارییەکانی ژیانی مرۆڤ (هەر لەیەکەم رۆژی دروست بوونیەوە لەناو منداڵدانی دایکدا تاوەکوو دواهەمین رۆژی ژیانی) دەگرێتەوە، واتە قۆناغەکانی (پێش لەدایک بوون، شیرەخۆری، پێش چوونە قوتابخانە، هەرزەکاری، کامڵی، پیری) بەڵام سایکۆلۆژیای منداڵ تەنها توێژینەوە لەسەر قۆناغی منداڵی دەکات و لە گۆڕانکاریو گرفت و پێداویستیەکانی دەکۆڵێتەوە. هەموو دەروونزانەکان لەسەر گرنگی قۆناغی منداڵی کۆکن و دوای لێکۆڵینەوەی گۆڕانکاریو دیاردەکانی دەکەن بەمەبەستی وەسف کردن و لێکدانەوەو پێش بینی کردن و کۆنترۆڵ کردنیان، گرنگی سایکۆلۆژیای منداڵ لەم خاڵانەی لای خوارەوەدا دەردەکەوێت:

١- منداڵ دوای لەدایک بوون لاوازترین و بێ دەسەڵاتترین بوونەوەرەو ژیان و مانەوەی پەیوەستە بەخزمەتگوزاری کەسانی چواردەوری، چونکە لەتوانایدا نییە ئاو بخواتەوەو خۆی پاک بکاتەوەو پێداویستیەکانی تری ژیانی دابین بکات و لە مەترسی و هەڕەشەکانی ژیان خۆی بپارێزێت بە پێچەوانەی زۆر لە بێچووی باڵندەو ئاژەڵ و بوونەوەرەکانی تر، کە هەر لەدوای لەدایک بوون بەماوەیەکی کەم لە توانایاندا هەیە کە خۆیان لەگەڵ دەوروبەرەکەیان بسازێنن.
٢- قۆناغی منداڵی مرۆڤ ئەگەر بەراورد بکرێت بە قۆناغی منداڵی بوونەوەرەکانی تر، ئەوە درێژترین قۆناغە. لەم قۆناغەدا منداڵ پێداویستی بە هاوکاری کەسانی تر هەیەو دەبێت فێری زۆر رەوشت و خوو داب و نەریت و پیشەو چالاکی بکرێت. لەبەر ئەوەیە دەبێت بەووردی لەم قۆناغە بکۆڵدرێتەوەو پێداویستی و گرفت و گۆڕانکارییەکانی دیاری بکرێت.
٣- دیاریکردنی پێداویستیەکانی قۆناغەکانی منداڵی (پێش لەدایک بوون، شیرە خۆری، پێش چوونە قوتابخانە چوونە قوتابخانە)و دابین کردنی ژینگەی گونجاو بۆ تێر کردنیان.
٤- دانانی پێوەر (معیار)ی دروست بۆ دەست نیشان کردنی رێچکەی گەشەکردنی ئاسایی منداڵ و ناسینەوەی ئەوانەی کە لەو رێچکەیە لایان داوە.
٥- زانینی هۆی دواکەوتن یان پێش کەوتنی گەشەی ئاسایی منداڵ و دەست نیشان کردنی خراپی و باشیەکانیان.
٦- دەست نیشان کردنی منداڵانی دواکەوتوو خاوەن گرفت و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنیان.
بەشێوەیەکی گشتی سایکۆلۆژیای منداڵ گرنگی بەم دیاردەو گۆڕانکارییانەی خوارەوە دەداو بەشێوەیەکی زانستی لێیان دەکۆڵێتەوە:
١- گەشەکردنی جەستەیی و هەستی و جووڵەی منداڵ. ٢- گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی.
٣- گەشەکردنی ژیری و زانیاری. ٤- گەشەکردنی هەڵچوونی. ٥- قۆناغەکانی گەشەکردن. ٦- گیروگرفتەکانی ئەو قۆناغانە. ٧- پێداویستییەکانی ئەو قۆناغانە.
هەروەها هەر لەرێگەی سایکۆلۆژیای منداڵەوە دەتوانین لە گرفت و نەخۆشی و ئەندێشە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکانی گەورەکان بگەین.

# قۆناغەکانی گەشەکردنی سایکۆلۆژیای منداڵ

## پێشەکی:

ئەو زانیاری و شارەزاییانەی کە ئێستا لەبەردەم دیدو دەستی خوێنەردا هەیە دەربارەی منداڵ و هەرزەکارو سایکۆلۆژیای گەشەکردن، یەکسەر کوت و پڕ لەکاتێکی دیاریکراودا پەیدا نەبووە، بەڵکو بەچەندەها قۆناغدا تێپەڕیوەو دەیەها بگرە سەدەها فەیلەسووف و زاناو نووسەر بەبۆچوون و توێژینەوەکانیان بەشداری دەوڵەمەندکردنی ئەو بوارە گرنگەیان کردووە، بەڵام نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت کە هەندێک فەیلەسووف و کەڵە زانا ڕۆڵی سەرەکیان لەگەشەکردنی سایکۆلۆژیای منداڵ بەتایبەتیو سایکۆلۆژیای گەشەکردن (علم النفس النمو) بەگشتی هەبووە، ئینجا بۆ ئەوەی کەمێک شارەزای قۆناغەکانی گەشەکردنی سایکۆلۆژیای منداڵ ببین، دەبێت گەشتێکی خێرا بەناو لاپەڕەکانی مێژوودا بکەین.

## مرۆڤی سەرەتایی:

پێش ئەوەی مرۆڤایەتی پێ بنێتە قۆناغی شارستانیەتەوە، لەسەر دەمێکی پڕ لەنەزانی و تاریکیدا دەژیا، مرۆڤی ئەو کاتە ژیانێکی زۆر سادەو ساکارییان هەبووەو هیچ قوتابخانەو دامەزراوێکی کۆمەڵایەتی و ئامرازێکی ڕاگەیاندن نەبووە کە ئەو مرۆڤانە فێری چۆنیەتی گەشەکردن و پەروەردەکردنی منداڵ بکەن و قۆناغەکانی گەشەکردن و پێداویستی و گیروگرفتەکانی ئەو قۆناغانەیان بۆ شیتەڵ بکەنەوە، بەڵکو لەچەند سەرچاوەیەکی دیاریکراوەوە زانیاری سەرەتاییان دەربارەی منداڵ و چۆنیەتی گەشەکردنی دەست دەکەوت، کە ئەوانیش بریتی بوون لە:

### ١- دایک:

دایک زۆر جار دەبوو بەسەرچاوەیەکی گرنگ بۆ زانیاری دەربارەی منداڵ و قۆناغەکانی گەشەکردنی. چونکە کاتێک ئافرەت دوو گیان دەبوو خۆی هەستی بەکۆمەڵێک گۆڕانکاری فسیۆلۆژی و دەروونی دەکرد، بۆ نموونە لەتەمەنێکی دیاری کراودا هەستی بەجووڵە جووڵی کۆرپەکەی ناوسکی دەکرد. ئینجا بۆ جاری دووهەم دووگیان دەبووەوە، بەهەمان شێوەی جاری یەکەم لەدەوروبەری هەمان مانگدا هەستی بەجووڵە جووڵی کۆرپەکەی دەکردەوە، بەم شێوەیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژو ساڵ لەدوای ساڵ هەندێک زانیاری لەلای ئەو دایکە دوو گیانانە دەربارەی کۆرپەکانی ناوسکیان کەڵەکە دەبوو، ئینجا ئەو دایکانە ئەو بەسەر هات و ڕووداوانەیان بۆ یەکتری باس دەکردو ئەوە لەدوای ئەوەش بۆ منداڵەکانیان (کچەکانیان) دەگێڕایەوە. هەروەها دوای لەدایک بوون دایک سەرنجی منداڵە شیر خۆرەکەی دەداو ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش شارەزایی دەربارەی هەڵس و کەوت و خەوتن و شیرخواردن و هات و هاوارو چۆنیەتی ڕۆیشتن و قسە کردنی.. تاد، لەلا زیاد دەبوو، بەم شێوەیە لەو قۆناغەی گەشەکردنی مرۆڤایەتیدا دایک یەکێک بووە لەسەرچاوە گرنگەکانی زانیاری دەربارەی هەندێک لایەنی ژیانی منداڵ و هەرزەکار. هەرچەندە زۆر جار کەوتونەتە هەڵەی

گەورەوەو بۆچوونی خوارو نابەجێیان دەربارەی منداڵ و قۆناغەكانی لەلا دروست بووە، چونكە تێبینی و سەرنجەكانیان زانستیانە نەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەو كاتە شتێكی باش بووە.

**٢) یادگارییەكانی دایكان و باوكان:**

سەرچاوەی دووەهەمی زانیاری لەوكاتەدا بریتی بووە لەو یادگاری و بەسەرهاتانەی سەردەمی منداڵی دایكان و باوكان. واتە كاتێك ئەو دایك و باوكانە سەردەمی منداڵی خۆیان یاد دەكردەوە، زۆر زانیاری و بەسەرهاتیان دەربارەی ژیانی تایبەتی خۆیان بەبیر دەهاتەوە، كە ئەمەش دەبوو بەسەرچاوەیەك بۆ زانیاری دەربارەی قۆناغی منداڵیو هەرزەكاری. بۆ نموونە هەندێك لەدایكان و باوكان ئەوساڵ و مانگەیان بەبیر دەهاتەوە كە تیایدا دەنگیان گڕبووە یان چوونەتە قۆناغی هەرزەكاری، یان چ كاتێك دەستیان تیرو كەوانی گرتووە، یان چ كاتێك دەستیان بەڕاو كردن یان ئیش و كاری ناوماڵ كردووە، ئەمانەو چەندەها بەسەرهات و یادگاری تری دایكان و باوكانی ئەو كاتە دەبوون بەسەرچاوە بۆ زانینی هەندێك لە گۆڕانكارییەكانی قۆناغەكانی گەشەكردن.

**٣) سەرنج دان و تێبینی كردنی هەڵس و كەوتی رۆژانەی منداڵەكانیان:**

بەبەردەوام منداڵان لەبەر چاوی دایك و باوك و كەسانی چوار دەوریانن، بێگومان لەم كاتانەشدا كارێكی ئاساییە كە ئەو دایك و باوكانە سەرنجی هەڵس و كەوت و رەوشتی رۆژانەی ئەو منداڵا نەیان بدەن و رۆژ لەدوای رۆژو مانگ لەدوای مانگ زانیاری و شارەزایی دەربارەیان پەیدا بكەن. بۆ نموونە كاتێك دایكان و باوكان سەرنجی منداڵی یەكەمیان دەدەن و بۆیان دەردەكەوێت كە لەمانگ و ساڵێكی دیاریكراودا، فێری قسە كردن یان رۆیشتن یان واز لەشیرخواردن دەهێنێ یان... تاد، هەروەها منداڵی دووەهەم و سێهەم و چوارەمیش هەر لەو دەوروبەرەدا فێری ئەو رەوشت و هەڵسوكەوتانە دەبن. لەهەمان كاتدا ئەم شارەزاییو زانیاریانە لەلای چەندەها دایك و باوكی تریش گەڵاڵە دەبوو، بەم شێوەیە زانیاری گونجاویان دەربارەی زۆر گۆڕانكاری ژیانی منداڵان لەلا كۆدەبووەوەو لەپەروەردەكردنی منداڵەكانیاندا سوودیان لێوەردەگرت. شایانی ئاماژە بۆ كردنە كە بەم شێوازە زۆر لەزانایان زانیاری زۆر بەسوودیان دەربارەی سایكۆلۆژیای منداڵ و هەرزەكار كۆكردەوەو تەنانەت هەندێكیان لەوانە (جیزیل، جان پیاجیە، ...تاد) تیۆرو قوتابخانەی تایبەتیشیان لەسەر ئەو زانیاریانە بنیاتنا.

**ئەخناتون:-**

تارادەیەكی باش بەسەركەوتوانە باسی چۆنیەتی دروست بوونی كۆرپەلەی لەقۆناغی پێش لەدایك بوون كردووە، ئەخناتون دەڵێت ((ئەی دروست كەری هێلكۆكە - لەئافرەت و تۆو لەپیاودا، ئەی بەخشێنەری ژیان بەكۆرپەلەی ناوسك، چۆن دڵنیاییو ئارامی پێ دەبەخشی و بەزیندوویی دەیهێڵیتەوە تا ئەو كاتەی كە لەدایك دەبێت))، (السید، ١٩٧٤، ص٢٤-٢٥) بەم شێوەیە ئەخناتۆن زۆر بەسەركەوتوانە لەو سەردەمە تاریك و پڕ لەنەزانینەدا ئاماژە بۆ گرنگی هێلكۆكەی دایك و سپێرمی باوك لەدروست كردنی كۆرپەلەدا دەكات، بەڵام بەشێواز و زاراوەو زمانی سەردەمەكەی خۆی.

**فەلسەفەی یۆنانی کۆن:-**

یۆنانیە کۆنەکان لەو بڕوایەدا بوون کە ژیان لەماددەیەکەوە کە شێوەیەکی تایبەتی هەیە دروست دەبێت و ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش تا دەبێت بەبوونەوەرێکی زیندوو گەشە دەکات، بەڵام دوای ئەوە بۆچوونێکی تریان لەلا دروست بوو، ئەویش ئەوەیە کە دروست بوونی سپێرمی پیاو لەناوەڕۆکدا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ دروست بوونی مرۆڤدا نییە، ئەرکی سەرەکی ئافرەتیش هەڵگرتنی ئەو کۆرپەلەیەیە لەناو سکیدا تا گەورەو لەدایک دەبێت. (السید، ١٩٧٤، ص٢٥) واتە سپێرمی پیاو هەموو خاسیەتەکانی ژیانی تێدایەو پێویستی بە هێلکۆکەی ئافرەت نیە بۆ دروست بوونی کۆرپەلە، بەڵکو ڕۆڵی ئافرەت هەڵگرتنی ئەو سپێرمەو خواردن پێدان و گەورەکردن و لەدایک بونیەتی. ئینجا ئەگەر بەچاوێکی زانستیانە بەراورد لەنێوان ئەم بۆچوونەو بۆچوونەکەی ئەخناتۆن بکەین، دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە بۆچوونەکانی ئەخناتۆن زانستی و ڕاستتر بووە.

**ئەفلاتۆن (Plato) (٤٢٩-٣٤٧ پ.ز):-**

ئەفلاتۆنیش وەک فەیلەسوفێکی بەتوانا بەشداری دەوڵەمەندکردنی کەلتورو فەرهەنگی سایکۆلۆژیای منداڵی کردووەو لەزۆر جێگاو بۆنەدا ئاماژەی بۆ کردووە، تەنانەت لە کۆمارەکەشیدا پلەو پایەی چینەکانی لەسەر توانست و لێهاتوویەکانی منداڵ دیاری کردووە. بەبڕوای ئەفلاتۆن دەبێت ئەرکی پەروەردەکردنی منداڵ لەتەمەنی هەفت ساڵیەوە تا تەمەنی هەژدە ساڵی بەدەوڵەت و میری بسپێندرێت و لەژێر چاودێری ئەودا پەروەردە بکرێت. ئەفلاتۆن داوای ئەوە دەکات کە دەبێت هەوڵی ئەوەبدرێت لەپێنج ساڵی یەکەمی ژیاندا توانست و حەزو ئارەزوو بەهرەکانی منداڵ دیاری بکرێت و خزمەتگوزاری پێویستیش بۆ گەشەکردنیان دابین بکرێت، هەروەها گرنگیەکی زۆریشی بەڕاهێنان و فێرکردنی منداڵ و دەست نیشان کردنی جیاوازییەکانی نێوانیان دەدا، چونکە منداڵان لەنێوان خۆیاندا لەزۆر لایەنەوە جیاوازن. بەڕای ئەفلاتۆن پەروەردەکردن و دروست کردنی هاووڵاتیانی باش و بەسوود پێویستی بەشێوازو ڕێبازی تایبەتی هەیەو دەبێت بەدوایدا بگەڕێین.

**ئەرستۆ (٣٨٤- ٣٢٢ پ.ز):-**

ئەرستۆ گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لەفەلسەفەو بیرو بۆچوونەکانی یۆنانی کۆندا کردو لەو بڕوایەدا بوو کە چارەنووسی کۆرپەلەو دروست بوونی پەیوەستە بەهەردوو توخمی نێرو مێ وە، چونکە لەئەنجامی یەکگرتنی مادەو وێنەوە (المادة والصورة) (ژیان دروست دەبێت. مادەش تایبەتە بەئافرەت و بە هەڵچوونی و نوقوستانیەکانیدا دەناسرێتەوەو وێنەو شێوەش تایبەتە بەپیاوو بەکاملی و زیرییدا دەناسرێتەوە. ئینجا ئەگەر شێوە بەکاملی و بێ نوقستانی لەلای پیاوەوە هات ئەوە کۆرپەلەکە کوڕ دەبێت بەڵام ئەگەر بەنوقستانی و نەبەکامی هات ئەوە کۆرپەلەکە کچ دەبێت.
لەلایەکی ترەوە ئەرستۆ داوای ئەوەی دەکرد کە دەبێ گرنگی بەڕاهێنانی کارو چالاکیەکانی جەستەی منداڵ بدرێت بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی باش لەش و جەستەی گەشە بکات و بتوانێت کۆنترۆڵی خودی خۆی بکات و بەسەر حەزوو ئارەزوو هەڵچونەکانیدا زاڵ بێت. هەروەها گرنگیدان

بەفێرکردنی هونەرو تام و چێژ وەرگرتن لەشتی جوانی بەکارێکی پێویست لەقەڵەم دەدا بۆ گەشەکردنی عەقڵی منداڵ.

## ئاینی ئیسلامی پیرۆز:-

ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش لەزۆر بوارو لایەنی جیاجیاوە بەشداری بنیاتنانی سایکۆلۆژیای منداڵ بەتایبەتیو سایکۆلۆژیای گەشەکردنی بەگشتی کردووەو کاریگەری زۆری لەسەر بیرکردنەوەو بۆچوونی زۆر لەزاناکانی ئەو بوارە هەبووە، هەر ئەمەش بۆتە هەوێنی بیرو فەلسەفەی زاناو فەیلەسوفەکانی وەک (ابن سینا، غەزالی، ابن خلدون.. تاد) دەربارەی پەروەردەو گرنگی دان بە منداڵ. زۆر لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیش ئاماژە بۆ قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلەو چۆنیەتی دروست بوون و گەشەکردنی دەکات لەوانە:

*(ولقد خلقنا الانسان من سلالة من طين ثم جعلناه نطفة في قرار مكين ثم خلقنا النطفة علقة فخلقنا العلقة مضغة فخلقنا المضغة عظاما فكسونا العظام لحما، ثم انشأناه خلقا اخر فتبارك الله احسن الخالقين)، (يأيها الناس ان كنتم في ريب من البعث فانا خلقناكم من تراب ثم من نطفة ثم من علقة ثم من مضغة مخلقة وغير مخلقة لنبين لكم ونقر في الارحام ما نشاء الى اجل مسمى. ثم نخرجكم طفلا لتبلغوا اشدكم. ومنكم من يتوفى ومنكم من يرد الى ارذل العمر، لكيلا يعلم من بعد علم شيئا)- (سورەتی المؤمنون، ئایەتی ژمارە ١٣، ١٢).*

## جۆن لۆک (John Lock) :-

فەیلەسوفی ئینگلیزی بەناوبانگ جۆن لۆک کە لەکۆتایی سەدەی هەڤدەهەمدا ژیاوە، لەیەکێک لەنووسراوەکانیدا کە بەناوی (بیروباوەڕەکانی تایبەت بە پەروەردە)یە دەڵێت، منداڵ لەکاتی لەدایک بووندا عەقڵی لاپەڕەیەکی سپی نەنووسراوە، واتە منداڵ لەکاتی لەدایک بووندا هیچ توانست و بەهرەیەکی بۆماوەیی (وراثی) نیەو عەقڵی وەک لاپەڕەیەکی سپی وایە کە هیچی لەسەر نەنووسراوە، بەڵکو رۆژ لەدوای رۆژ دوای لەدایک بوون لەرێگەی هەستەوەرەکانیەوە (الحواس) فێری دیاردەکانی جیهانی دەرەوە دەبێت. بەمانایەکی تر جۆن لۆک بڕوای تەواوی بەڕۆڵی ژینگە (البيئة) هەیەو بە گەورەترین هۆکاری بنیاتنەری عەقڵی مرۆڤی دادەنێت. بەبڕوای جۆن لۆک منداڵ ئامادەیە بۆ وەرگرتن و فێربوونی هەموو جۆرە زانستێک و دەبێت لەرێگەی راهێنانەوە فێری هەموو جۆرە زانیاری و شارەزایی و خورەوشتێکی باش و دروست بکرێت و رەمەک و حەزو ئارەزووە سروشتیە ئاژەڵیەکانیشی سەرکوت بکرێن. بە بۆچوونی جۆن لۆک ژینگەی لەبارو گونجاوی هاوبەش لەنێوان منداڵاندا دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەموو ئەو منداڵانە بەیەک شێوە هەڵس و کەوت بکەن، چونکە هیچ توانست و لێهاتوویەک بە بۆماوە ناگوێزرێتەوە تا ببێتە هۆی دروست کردنی جیاوازی تاکایەتی (الفروق الفردية) لەنێوان ئەو منداڵانەدا، گومانیشی

تێدا نیە کە ئەو بیرو بۆچوونانەی جۆن لۆک بوون بەسەرچاوەو هەوێن بۆ لەدایک بوونی قوتابخانەی رەوشتایەتی (المدرسة السلوكية).

## جان جاک رۆسۆ (J.J. Rousseau) (١٧١٢-١٧٧٨):-

فەیلەسووفێکی گەورەی فەرەنسی بوو کە لەسەدەی هەژدەهەمدا ژیاوەو زۆر بیرو باوەڕی پەروەردەیی دەربارەی منداڵ هەبووە. رۆسۆ بەپێچەوانەی (هۆبز)ەوە لەو بڕوایەدا بوو کە سروشتی منداڵ خێرخوازەو هیچ تۆوو ئامادەباشیەکی شەڕخوازی تێدا نیە، بەڵام کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی بەرەو شەڕخوازی دەبەن. هەر لەبەر ئەوەش بووە کە بەردەوام داوای ئەوەی دەکرد کە دەبێت منداڵ بەسەربەستی دوور لەکۆمەڵ و دام و دەزگاکانی لەسروشتدا بژی، چونکە منداڵ هەر بە بۆماوە خاوەنی هەست و ئامادەباشیەکی ئەخلاقی تایبەتیە، کە بەهۆیەوە دەتوانێت رەوشتە باشەکان لەخراپەکان جیا بکاتەوەو پارێزگاری لەو سروشتە پاک و بێگەردەی بکات. بەڵام ئەگەر بەردەوام لەناو کۆمەڵدا ژیا، ئەوە ئەو کۆمەڵە رۆژ لەدوای رۆژ بەربەست و رێگر لەبەردەم حەزوو ئارەزووەکانیدا دادەنێت و وورده وورده بەرەو شەڕخوازی دەبات و لەڕێچکە سروشتیە ئاساییەکەی خۆی دووری دەخاتەوە.
بەبڕوای رۆسۆ گەڕاندنەوە بۆ باوەشی سروشت تەنها رێگایە بۆ چاک کردنی هەڵەکانی تاک و کۆمەڵ. ئەوەی شایانی باسکردن بێت رایەکانی رۆسۆ بە تاقیکردنەوە نەسەلمێندراوەو بریتی بوون لەراو بۆچوون و تێرامانی تایبەتی فەیلەسووفێک دەربارەی مرۆڤ و چۆنیەتی پەروەردەکردنی، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی کاریگەری زۆریان لەسەر پرۆسەی پەروەردەو فێرکردن هەبووەو بوونەتە هەوێن و سەرچاوە بۆ دامەزراندنی زۆر قوتابخانەو رێبازی دیموکراسی و پێشکەوتنخواز.
جان جاک رۆسۆ لەساڵی (١٧٦٢)دا کتێبە بەناوبانگەکەی دەربارەی چۆنیەتی پەروەردەکردنی منداڵ لەژێر ناونیشانی (ئەمیل) (Emile) داناو بوو بە ئینجیلی پەروەردەکردنی سەردەمەکەی و قۆناغەکانی دواتریش، رۆسۆ لەو کتێبەدا بەدوورو درێژی باسی قۆناغەکانی پەروەردەکردنی ئەمیل دەکات و ئاماژە بۆ گرنگی راهێنان و تاقی کردنەوەو چالاکی سەربەخۆو سەربەستی منداڵ دەکات و بەبناغەی گەشەکردنیان دادەنێت.

## پستالۆزی (Pestalozzi) (١٧٤٦-١٨٢٧):-

یەکێک بوو لەو کەڵە فەیلەسووفانەی سەدەی نۆزدەهەم کە بەتەواوی لایەنگری راو بۆچوونەکانی رۆسۆ بوو دەربارەی منداڵ و پەروەردەکردنی. پستالۆزیش بڕوای وابوو کە سروشتی مرۆڤ خێرخوازەو بەردەوام هەوڵی کاری خێر دەدات، کاتێکیش دەبێت بەشەڕ خواز، ئەوە لەئەنجامی ئەوەوەیە کە هەموو دەروازەو دەرگاکانی خێر بەڕوویدا داخراوە.
پستالۆزی یەکەم کەس بوو کە بەشێوازێکی زانستیانە زانیاری دەربارەی منداڵ کۆکردەوە، ئەویش لەڕێگەی سەرنج دان و تێبینی کردنی هەڵس و کەوتی واقیعیانەی منداڵانەوە بوو، هەر ئەوەش بوو پاڵی پێوەنا کە بۆ ماوەیەکی زۆر تێبینی کورەکەی خۆی بکات کە تەمەنی سێ ساڵ و نیو بوو. بەم رێبازە زانیارییەکی زۆری دەربارەی هەندێک لایەنی گەشەکردنی منداڵ کۆکردەوەو لەساڵی (١٧٧٤)دا وەک یاداشتنامەیەک بڵاوی کردەوە.

## فرۆبل (Froebel)(١٧٨٢ -١٨٥٢):-

یەكێكە لەو فەیلەسوفانەی كە شوێن پەنجەی خۆی لەسایكۆلۆژیای منداڵدا بەجێ هێشتووەو تائێستاش بیرو بۆچوونەكانی لەبواری پەروەردەكردندا كاریگەری خۆیان هەیە. فرۆبل بەیەكەم دامەزرێنەری باخچەی ساوایان دادەنرێت و سوور بوو لەسەر ئەوەی كە دەبێت بواری تەواو بۆ چالاكیو یاریكردنی منداڵ بڕەخسێندرێت، چونكە گرنگی خۆیان لەگەشەكردنی منداڵدا هەیە بەتایبەتیش گەشەكردنی روحی و ئەخلاقیان. هەر ئەمەش بوو كەوای لەفرۆبل كرد لەساڵی (١٨١٦)دا لەناو كەپری گوندێكی ئەڵمانیدا ئامۆژگای پەروەردەیی ئەڵمانی بۆ (٥) پێنج منداڵی بچووك بكاتەوە.

هەروەها لەساڵی (١٨٢٦) كتێبێكی بەناونیشانی (پەروەردەی مرۆڤ) بڵاوكردەوە، كە تیایدا ئاماژە بۆ گرنگی بەكارهێنانی چالاكی و یاری سەربەست لەلێكۆڵینەوەو پەروەردەكردنی منداڵدا دەكات. فرۆبل بەردەوام ئامۆژگاری دایكان و باوكانی دەكرد كە ئەگەر دەتوانن بەشێك لەباخچەیماڵەكەیان بۆ یاریكردنی منداڵەكانیان تەرخان بكەن، ئیتر ئەو كاتە منداڵ بۆ خۆی زەویەكەی ئەم دیوو ئەو دیو دەكات و دەیچێنێ و ئاوی دەدات، هەروەها زۆر چالاكی وەك یاری كردن و گۆرانی و چیرۆك و... هتد. بۆ باخچەی ساوایان پێشنیاز كردووە. (الالوسی، ١٩٨٣، ص١١١-١١٣).

فرۆبل داوای ئەوەی دەكرد كە دەبێت رێگە بەمنداڵ بدرێت بۆ ئەوەی راستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ ژینگەو شت و كەل و پەلەكانی بكات، چونكە لەرێگەیانەوە شارەزای ژینگەو فێری دیاردەكانی دەبێت و شارەزایی و زانیاری زیاتر دەبێت.

## داروین (Darwin) :-

تیۆرییەكەی داروین لەچەند لایەكەوە كاری كردە سەر بەرەو پێش چوونی سایكۆلۆژیای منداڵ. چونكە بووە هۆی ووروژاندنی زۆر بابەتی گەشەكردن و كاریگەرییان لەسەر كەسایەتیو چارەنووسی منداڵ بەتایبەتی و مرۆڤ بەگشتی لەوانە كاریگەری بۆ ماوەو ژینگە لەسەر رەوشتی منداڵ، پەیوەندی نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ، مل ملانێ ی نێوان مرۆڤ و ژینگەكەی، گرنگی خۆ سازاندن بۆ مانەوەی مرۆڤ و قڕنەكردنی، گرنگیدان بەقۆناغەكانی گەشەكردن لەلایەك و پرۆسە زیرییە یەك لەدوای یەكەكان لەلایەكی تر، رۆڵی بایۆلۆژی و ئەندامەكانی لەش لەپرۆسەی گەشەكردندا.

هەروەها داروین هەوڵی دا كە زانیاری دەربارەی چۆنیەتی گەشەكردنی منداڵی شیرە خۆرەی دەست بكەوێت بۆ ئەوەی لەرێگەیەوە شارەزای چۆنیەتی گەشەكردنی مرۆڤ ببێت، بەڵام ئەو هەوڵ و زانیاریانەی زۆر سەركەوتوو سوود بەخش نەبوون چونكە تەنها لەسەر ژمارەیەكی كەم لەمنداڵانی شیرەخۆر كۆكرابوونەوە. لەلایەكی تریشەوە لەساڵی (١٨٧٧) شیتەڵ كردنەوەیەكی لەبارەی مێژووی ژیانی منداڵی یەكەمیەوە كە لەساڵی (١٨٣٩) لەدایك بوو بوو بڵاو كردەوە(زهران، ١٩٨١، ص١٦).

جێگەی خۆیەتی كە بڵێین، زۆربەی ئەو زانیاریانەی كە تاوەكوو كۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم دەربارەی سایكۆلۆژیای منداڵ كۆكرانەوە زۆر زانستیو ووردو بەكەڵك نەبوون،

چونکە زۆربەیان بریتی بوون لە بۆچوونی فەلسەفی و گێڕاندنەوە و تۆمارکردنی ڕێچکەی گەشەکردنی ژیانی منداڵانی فەیلەسووف و نووسەران یان منداڵانی خوشک و براکانیان، کە ئەمانەش زۆر کەم و کورتی و دەلاقەی گەورەیان تێدا بووە لەوانە:

١_ بەشێوەیەکی میتۆدی زانستی کۆ نەکرابوونەوە.
٢- لەچەند کات و شوێنێکی پچڕپچڕو جیاواز جیاوازدا کۆکرابوونەوە.
٣- چونکە زۆربەی زانیاریەکان لە سەر منداڵانی خۆیان و کەس و کاریان بوو، لەبەر ئەوە دوورنیە کە تەنها باسی لایەنە باشەکانیان کردبێت و کەم و کورتی و لایەنە خراپەکانیان پشت گوێ خستبێ.
٤- هەر یەکەیان تایبەت بوون بەیەک حاڵەت و ناتوانرێت گشتاندن (التعمیم) بکرێت و ڕەوشتی منداڵانی تری پێ لێک بدرێتەوە. (کۆنجر، ١٩٧٠، ص٢٠-٢١). بەڵام لەگەڵ ئەو کەم و کورتیانەشدا گرنگی خۆیان هەر هەبوو لەسەر بەرەو پێش چوونی سایکۆلۆژیای منداڵدا.

## سەردەمی دەرکەوتنی سایکۆلۆژیای منداڵ بەشێوەیەکی زانستی:-

سایکۆلۆژیای منداڵ وەک بوارێکی زانستی گرنگ لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لەسەر دەستی (ج. ستانلی هۆل) (G. Stanley Hall) کە بەڕێوەبەری زانکۆی کلارک بوو لەئەمریکا، سەری هەڵدا. هۆل بەپلەی سەرەکی گرنگی بەپێکهاتەکانی (محتویات) عەقلی منداڵ دەدا. بۆ گەیشتنیش بەم ئامانجەی شێوازێکی نوێی لە بە ئاکام گەیاندنی توێژینەوەو کۆکردنەوی زانیاری داهێنا، ئەویش میتۆدی (ڕاپرس) (الاستبیان) بوو، کە ئەم هەوڵ دان و داهێنانەی (ستانلی هۆل)یش بەسەرەتای دەست پێ کردنی کاروانی توێژینەوەی زانستی لەبواری سایکۆلۆژیای منداڵدا دادەنرێت. هەرچەندە کارەکانی (هۆل) بەپێی پێودرە زانستیەکانی ئەمڕۆ کەم و کورتی زۆریان تێدا بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەکاری زانستی لەقەڵەم دەدران چونکە ژمارەیەکی زۆری لەمنداڵان وەردەگرت و توێژینەوەی لەسەر دەکردن کە لەتوانادا هەبوو پرۆسەی گشتاندن بەئاکام بگەیەندرێت.

لەبەر ڕۆشنایی تیۆرییەکەی داروین، دامەزرێنەری سایکۆلۆژیای گەشەکردن (ستانلی هۆل) گەیشتە ئەو بڕوایەی کە قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ کورتکراوەی مێژووی قۆناغەکانی گەشەکردنی مرۆڤایەتییە، واتە هەر قۆناغێکی گەشەکردنی منداڵ گوزارشت لەیەکێک لەو قۆناغانە دەکات کە بەدرێژایی مێژوو مرۆڤایەتی پیایدا تێپەڕیوە. هەر لەبەر ئەوەش هەڵسا بەئەنجام گەیاندنی چەندەها توێژینەوە لەسەر ڕەوشت و هەڵس و کەوتەکانی منداڵ، بەمەبەستی تێگەیشتنی ڕەوشت و هەڵس و کەوتەکانی مرۆڤ بەگشتی لە قۆناغە جیاجیاکانی گەشەکردنی مرۆڤایەتیدا. لەمیانەی ئەو توێژینەوانەیدا سەرنجی زۆر لایەنی ڕەوشتی منداڵی لەکاتی یاریکردن، دروست کردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی... تاد دەدا. (الزوبعی، ١٩٨٩، ص١١- ١٢).

## میندڵ (G. mendel):-

ڕاو بۆچوون و یاساکانی میندڵ مشتو مڕێکی زۆری دەربارەی گرنگی هەر یەک لە بۆماوەو ژینگە دروست کرد. یاساکانی مەندڵ دەربارەی چۆنیەتی گواستنەوەی خاسیەت و سیفاتەکان لەباوکان و

دایکانەوە بۆ منداڵەکانیان گورو تینێکی تری بەسایکۆلۆژیای منداڵ داو زۆر کون و قوژبنی نەزانراوی ئاشکرا کرد.
هەروەها پاڵی بەزاناکانەوە نا کە چەندەها توێژینەوە دەربارەی هۆی هەندێک نەخۆشی و نوقستانی بۆماوەیی بەئاکام بگەیەنن، هەر راو بۆچوونەکانی میندڵ بوو کەبوون بەهاندەر بۆ گەڕان بەدوای دیاریکردنی بەرپرسیاریەتی هەریەک لە بۆماوەو ژینگە لە بنیاتنانی کەسایەتی مرۆڤدا.

## سەدەی بیستەم سەدەی منداڵە:-

زۆر جار دەگوترێت کە سەدەی بیستەم سەدەی منداڵە، چونکە ئەوەندەی لەم سەدەیەدا گرنگی بەمنداڵ دراوەو توێژینەوەی زانستی دەربارەی بەئاکام گەیەندراوە، بەهەموو درێژایی مێژوو ئەوەندە لێی نەکۆڵدراوەتەوەو گرنگی پێ نەدراوە، ئەوەش بەپلەی یەکەم بۆ ئەم رووداوو هۆکارانەی خوارەوە دەگەڕێنەوە:

### ١- دروست بون و گەشەکردنی قوتابخانە دەروونیەکان:-

لەسەدەی بیستەم بەتەواوی ئەو قوتابخانانەی کە لەسەدەی نۆزدەهەم سەریان هەڵدابوو گەشەیان کرد، هەروەها چەندەها قوتابخانەو ریبازی دەروونی تر دروست بوون و گەشەیان کرد، هەرچەندە زۆر لەو قوتابخانەو رێبازە دەروونیانە راستەوخۆ تایبەت نەبوون بەمنداڵەوە، بەلام نا راستەوخۆ کاریگەری خۆیان لەسەر سایکۆلۆژیای منداڵ هەبوو، هەندێک جاریش بەشێک لەو قوتابخانانە بۆ منداڵ تەرخان دەکران.

### أ- شیتەڵکردنەوەی دەروونی (فرۆید):-

قوتابخانەکەی فرۆید لەچەند لایەنێکەوە کاری کردە سەر بەرەو پێش چوونی سایکۆلۆژیای منداڵ بەتایبەتیش لەگرنگی دانی بە پێنج ساڵی یەکەمی منداڵ و چۆنیەتی دروست بوونی کەسایەتی و قۆناغەکانی دەمی و کۆمی و ئەندامی زاوزێ و پەیوەندی نێوان منداڵ و دایک و باوکی و کاریگەریان لەسەر کەسایەتی منداڵ. بەبیروڕای فرۆید رووداوو کارەساتەکانی پێنج ساڵی یەکەم گرنگیەکی زۆریان لەسەر دیاریکردنی چارەنووسی منداڵ هەیەو دەبێت دایک و باوک و کەسانی چواردەوری ئاگاداری بن بۆ ئەوەی کەسایەتی منداڵ پتەو بێت و لەتێک شکان و گرێی دەروونی دوور بخرێتەوە.

لەلایەکی تریشەوە فرۆید زۆر بابەتی گرنگ و بقەی وروژاندو پاڵی بەهەندێک لەزاناکانەوە نا بۆ بەئاکام گەیاندنی توێژینەوەی زانستی لەبارەیانەوە، لەوانە [گرێ دەروونیەکان (ئۆدیب و ئەلکترا گرێ)، پێک هاتەکانی کەسایەتی، رۆڵی رەمەکەکان (سێکس و شەڕخوازی)، جۆرەکانی راهێنانی کۆمەلایەتی.. هتد)] کەسەرجەم ئەو رووداوو بیرو باوەڕانە بوون بەهاندەر بۆ گرنگی دان بەمنداڵ و دیاریکردنی گرفت و پێداویستیەکانی و چۆنیەتی پەروەردەکردنی.

ب- قوتابخانەی ڕەوشتێتی:-

لەسیەکانی ئەم سەدەیەدا، قوتابخانەی ڕەوشتێتی کە قوتابخانەیەکی دەروونی ئەمریکیە، گرو تینێکی زانستی بەهێزی بەسایکۆلۆژیای منداڵ دا، وەک ئاشکرایە ئەم قوتابخانەیە بەپلەی یەکەم گرنگی بەهۆکاری ژینگە دەدات و بۆماوەو ئامادەباشیەکانی منداڵ بەهۆکارێکی لاوەکی و سادە لەقەڵەم دەدات و بڕوای بەڕاوەرگرتن و تێرامان (الاستبيان و الاستبطان) نیەو بەکەرەستەی زانستیان دانانێت و لەجیاتی ئەوە سەرنج و تێبینی زانستی (الملاحظة العلمية) بۆ کۆکردنەوەی زانیاری بەکاردەهێنێ.

ئەم قوتابخانەیە دەروازەی زۆری بۆ توێژینەوەی زانستی لەبواری سایکۆلۆژیای منداڵدا کردەوەو زۆر بابەتی گرنگیشی وروژاند. بەبڕوای ئەم قوتابخانەیە ژیری منداڵ وەک لاپەڕەیەکی سپی وایەو لەتوانای ئەو ژینگەیەی کە تیایدا دەژی هەیە کە بەئارەزووی خۆی ئەو لاپەڕە سپیە ڕەش بکاتەوە، هەر ئەمەش بوو کەوای لە(واتسن)ی دامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیە کرد کە بڵێت [دە (١٠) منداڵی ئاسایی و بێ نوقسانیم بدەنێ، من هەر لەخۆمەوە بەبێ دەست نیشان کردن یەکێکیان هەڵدەبژێرم و بەئارەزووی خۆم ڕای دەهێنم و چیم بوێ ئەیکەم بەوە، ئەگەر بمەوێ ئەوا ئەو منداڵە دەکەم بەپزیشک، یان هونەرمەند یان زانا یان بازرگان یان دز یان سواڵکەر] (الالوسی، ١٩٨٣، ص٦٦).

واتە بەبڕوای (واتسن)و هاوەڵەکانی بۆماوەو توانستە تایبەتیەکانی منداڵ هیچ گرنگیان نیەو تەنها ڕۆڵی سەرەکی بۆ ئەو ژینگەیەیە کە تیایدا دەژی، هەرچەندە ئەم بۆچوونەیان هەڵەیەو تووشی زۆر ڕەخنەو گلەیی کردن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕاو بۆچوونەکانی ئەم قوتابخانەیە پاڵی بەزۆر توێژەرو دەروونزانەوە نا کە گرنگی بەژینگەو شێوازی پەروەردەو سزاو پاداشت و چۆنیەتی دروست کردنی ڕەوشت و بەکارهێنانی شێوازی سەرنج دان و تێبینی کردن بدەن.

ج- پیاجیە:-

زانای سویسری پیاجیە یەکێکە لەو کەڵە توێژەرەوانەی کە بەتوێژینەوەکانی بواری سایکۆلۆژیای منداڵی زۆر زۆر دەوڵەمەند کرد.
پیاجیە یەکێکە لەو زانایانەی کە بەقوڵی بەناخی عەقڵی منداڵدا چۆتە خوارەوەو لەهەموو زاناکانی تر باشتر چۆنیەتی گەشەکردنی عەقڵی منداڵی شیتەڵ کردۆتەوەو قۆناغەکانی بەووردی دیاری کردووە. هەر ڕاو بۆچوونەکانی پیاجیە بوو کە پاڵی بەدەیەها بگرە سەدەها توێژەرو زاناوە نا کەدەست بکەن بەتوێژینەوەی زانستی لەبواری گەشەکردنی عەقڵی و ئەخلاقی منداڵدا. جان پیاجیە زۆر بەتوندی ڕەخنەی لە(واتسن)و هاوەڵەکانی گرت، لەبەر ئەوەی کە تەنها گرنگیان بەهۆکاری ژینگە دەدا، بەڵام جان پیاجیە لەو بڕوایەدا بوو کە کەسایەتی و ڕەووشتی مرۆڤ دەرئەنجامی کارلێکردنی هەردوو هۆکاری ژینگەو بۆماوەیە واتە شارەزایی (فێربوون) و گەینە (النضج).

**د- ئەنسرۆپۆلۆژیا:**

زانایانی ئەم بوارەش خزمەتێکی زۆری سایکۆلۆژیای منداڵیان کرد، ئەنسرۆپۆلۆژیا ئەو زانستەیە کە گرنگی بەتوێژینەوەی هۆزو تیرەو کۆمەڵگا سەرەتاییەکان دەدات بەمەبەستی زانینی یاسا هاوبەشەکانی نێوان هەموو کۆمەڵگاکان و ئەو جیاوازییانەی کە لەنێوان کۆمەڵگا سەرەتایی و کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا هەیە. زانایانی ئەم بوارە گەیشتنە ئەو راستیانەی کە کەلتوورو رۆشنبیری گەلان رۆڵی کاریگەری خۆیان لەسەر کەسایەتی تاکەکانیان هەیە.
یەکێک لەو زانایانە (مارگرت مید) بوو کە توێژینەوەی لەسەر سێ (٣) هۆزی سەرەتایی (غینیای نوێ) کرد بەمەبەستی زانینی کاریگەری جۆری راهێنانی کۆمەڵایەتی لەسەر کەسایەتی منداڵەکانیان لەداهاتوودا. ئەم زانستە تازەیەش زۆر بابەتی گرنگی وروژاندو شوێن پەنجەی خۆی لەبواری سایکۆلۆژیای منداڵدا بەجێ هێشت.

**٢- زیرەکی پێوەکان** (مقاييس الذكاء):-

بۆ یەکەم جار لەساڵی (١٩٠٤) لەسەر دەستی زانای فەرەنسی (بینیە) زیرەکی پێو دانراو توانرا بەسەرکەوتوانە رێژەی زیرەکی منداڵانی پێ بپێورێ و منداڵە دەبەنگ و دواکەوتووەکان لەمنداڵە ئاسایی و زیرەک و بلیمەتەکان جیا بکرێنەوە. دوا بەدوای ئەوەش ساڵ لەدوای ساڵ زیرەکی پێوی تر ئامادە دەکراو زیرەکی و توانستە جیاجیاکانی منداڵانیان پێ دەپێوان.

**٣- رووداوەکانی ساڵانی ١٩٢٠-١٩٤٠:-**

لەبیستەکانی سەدەی بیستەم سایکۆلۆژیای منداڵ زۆر بەخێرایی گەشەی کرد، ئەویش لەئەنجامی ئەو گرنگی دانە زۆرەی زانایان بوو بەقۆناغی منداڵی. زۆر لەزاناکان گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە شارەزابوون لەسایکۆلۆژیای منداڵدا زۆر گرفتی پەروەردەیی و دەروونی چارەسەر دەکات، هەر لەم قۆناغەشدا زۆر لەپەروەردەیاران و زانایان دەستیان کرد بەبەستنی کۆڕو کۆبوونەوەو ئاگادارکردنەوەی دایکان و باوکان و مامۆستایان لەچۆنیەتی پەروەردەکردنی منداڵ و شێوازەکانی راهێنانی کۆمەڵایەتی دروست، هەروەها زۆر عەیادەو جێگای تایبەت بە توێژینەوەو چارەسەرکردنی منداڵان کرایەوە، لەلایەکی تریشەوە چەندەها دایەنگاو باخچەی ساوایان لە زۆربەی زانکۆو کۆلێژەکانی پێگەیاندنی مامۆستایان وەک لابورێک بۆ بە ئاکام گەیاندنی توێژینەوەی زانستی لەسەر منداڵان کرانەوە، هەروەها زۆر مەڵبەندی توێژینەوەی منداڵان لەئەمریکاو ئەوروپا کرانەوە (الزوبعي، ١٩٨٣، ص١٣- ١٤).

**٤- ساڵانی (١٩٤٠- بەدواوە):-**

لەکۆتایی سیەکانی سەدەی بیستەم ، توێژینەوەو هەوڵ و کۆششەکانی زانایانی بواری سایکۆلۆژیای منداڵ گۆڕو تینی جاری نەما، ئەوەش بەڕای مێژوونووسان بۆ چەند هۆکارێک دەگەڕێتەوە لەوانە:

أ- زۆر بوارو پسپۆری تر لەسایکۆلۆژیادا سەریان هەڵداو بوونە هۆی ئەوەی کە زیاتر لەسایکۆلۆژیای منداڵ سەرنجی زانایان و پسپۆران بۆلای خۆیان رابکێشن.

ب- هەڵگیرسانی شەڕی جیهانی دووهەم کە بووە هۆی دەربەدەرو پەرەوازەکردنی رۆشنبیران و وەستانی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی زانستی لەزۆربەی بوارەکان، بەتایبەتیش سایکۆلۆژیای منداڵ.
بەلام لەناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی بیستەم جارێکیتر گرنگیدان بەسایکۆلۆژیای منداڵ سەری هەڵدایەوەو گۆڕانکاری و گەشەکردنێکی زۆر لەتیۆرە دەروونیەکان و میتۆدو شێوازەکانی توێژینەوەی زانستی و کۆکردنەوەی زانیاریدا ڕوویدا، لەم قۆناغەدا زۆربەی توێژینەوەکان ڕێچکەو شێوازی لابووریان وەرگرت (الزوبعی، ١٩٨٣، ص١٦- ١٧).

بەم شێوەیە بواری سایکۆلۆژیای منداڵ رۆژ لەدوای رۆژو ساڵ لەدوای ساڵ گەشەی کرد، تا گەیشتە ئەم ئاستەی ئەمرۆ کە ئەوەندە زانیارییەکان و ڕێبازەکانی زیادی کردووە، بۆتە هۆی ئەوەی کە چەندەها پسپۆری جیاجیا لەسایکۆلۆژیای منداڵدا دروست ببن و هەر کۆمەڵە زانایەک خۆیان بەلایەنێکی سایکۆلۆژیای منداڵەوە (لایەنی ژیری، ئەخلاقی، کۆمەڵایەتی، زمانی، رۆڵی سیکسی، هەڵچوونی... تاد) خەریک بکەن.

بەلام لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنەشدا، تاوەکو ئێستا تیۆرێکی گشتی کەسەرجەم دیاردەکانی سایکۆلۆژیای منداڵ لێک بداتەوە نیەو چەندەها پرسیاریش بێ وەلامن، بەلام ئێمە لەوە دڵنیاین کە رۆژێک دێت ئەو تیۆرەش لەدایک ببێت و وەلامی ئەو پرسیارانەش بدرێنەوە.

**ڕێگاکانی بەئەنجام گەیاندنی توێژینەوە لەسایکۆلۆژیای منداڵدا**

**وەسفە ڕێگا**

**درێژە ڕێگا**

**پانە ڕێگا**

**کەرەستەکانی کۆکردنەوەی زانیاری**

**تێبینی**

**چاوپێکەوتن**

**ڕاپرسی**

## رێگاكانی بەئەنجام گەیاندنی توێژینەوە لەسایكۆلۆژیای منداڵدا
## (طرق البحث في علم نفس الطفل)

لەدێر زەمانەوە بەردەوام مرۆڤ لەهەوڵی ئەوەدا بووە كە شارەزای دیاردەكانی گەردوون و ئەو جیهانە بەرفراوانە ببێت كە تیایدا دەژی. بۆ ئەم مەبەستەش پەنای بۆ چەندەها شێوازو رێگاو كەرەستەی جیاجیا بردووە، بۆ ئەوەی بگاتە مەبەست و مەرامەكانی. گومانیشی تێدا نیە كە رێگاو كەرەستەو شێوازەكانی كۆكردنەوەی زانیاری و بەئاكام گەیاندنی توێژینەوەی زانستی لە بوارێكەوە بۆ بوارێكی تر جیاوازەو لەهەندێك لایەنەوە تایبەتمەندێتی خۆیان هەیە.
سایكۆلۆژیای منداڵیش وەك هەموو بوارەكانی تری ژیان دیاردەو بابەتی تایبەتی خۆی هەیەو پێداویستیشی بەمیتۆدو رێگای گونجاو بۆ كۆكردنەوەی زانیاری دەربارەی منداڵ و قۆناغ و لایەنەكانی گەشەكردنی هەیە. بۆ ئەم مەبەستەش دەروونزان و پزیشك و پسپۆرانی ئەم گۆڕەپانە چەندەها شێوازو كەرەستەو رێگای گونجاوو لەباریان هەڵبژاردووەو بنیاتناوە بۆ كۆكردنەوەی زانیاری و بەئاكام گەیاندنی توێژینەوەی زانستی.

هەر چەندە هەر بوارو گۆڕەپانێك گرفت و بابەت و دیاردەو شێوازی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەنگاوەكانی چارەسەركردن و هەڵهێنان و دۆزینەوەی گرێ كوێرەی گرفتەكان لەهەموو بوارەكاندا تارادەیەكی زۆر هاوبەشن و بەیەك رێچكەدا گوزەر دەكەن، ئەویش بەهەست كردن بە گرفت و ئەندێشەكان دەست پێدەكات و بەقۆناغەكانی دانانی گریمان (فرضية)و كۆكردنەوەی زانیاری و گەڕان بەدوای راست و دروستی گریمانەكاندا تێدەپەڕێت و بەشیتەڵ كردنەوەو لێكدانەوەی دەرئەنجامەكان كۆتایی دێت.
ئەم رێگاو كەرەستانەی خوارەوە بەگرنگترین و شیاوترین رێگاو كەرەستەی كۆكردنەوەی زانیاری بۆ بەئاكام گەیاندنی توێژینەوەی زانستی دەژمێردرێن.

### أ- رێگای ئەزموونی (تاقیگەیی) (الطريقة التجريبية) (Experimental method):-

لەم رێگایەدا زانیاری تەواو دەربارەی دیاردەكانی گەشەكردن كۆدەكرێتەوەو چەندەها گۆڕانكاری بەسەردا دێت و بەچەند قۆناغێكدا تێدەپەڕێت تادەگاتە دەرئەنجامەكان، لەم رێگەیەدا بەپلەی سەرەكی پشت بەم خاڵانەی خوارەوە دەبەسترێت:

١- دیاری كردنی هۆ (سبب) (متغير مستقل)و دەرئەنجام (النتيجة) (متغير تابع) بە شێوەیەكی (مەبدەئی) وەك گریمان و بۆ چونێكی زیرەكانە بۆ دەست نیشانكردنی ئەو هۆكارەی كە دەمانەوێت شوێنەواری كاریگەرییەكانی بزانین.

٢- هەڵبژاردنی نموونە (عينة) (Sample)ی گونجاوو كە گوزارشت لەو كۆمەڵگایە بكات كە لێ ی وەرگیراوە بۆ ئەوەی نموونەیەكی راستەقینە بێت (Representative).

٣- دابەش کردنی نموونەکە بەسەر دوو گروپ و کۆمەڵدا، کەیەکەمیان بە گروپی ئەزموونی (المجموعة التجريبية) (Experimental group)و دووهەمیان بەگروپی کۆنترۆڵی (Control group) ناودەبریت.

٤- زاڵ بوون و کۆنترۆڵ کردنی ئەو هۆکارانەی کە دەرەکی و نامۆن (المتغيرات الدخلية) بەتاقی کردنەوەکەو کاردانەوەی خراپیان لەسەر دەرئەنجامی توێژینەوەکە هەیە، ئەویش لەرێگەی دوور خستنەوە (وەک گەرما، سەرما، دەنگە دەنگ، ترس و دڵەڕاوکێ، خەم و خەفەت... تاد) یان بەیەکسان کردنیان لەنێوان هەردوو گروپەکەدا (وەک تەمەن، زیرەکی، ئاستی رۆشنبیری و پلەی کۆمەڵایەتی و... تاد).
٥- دانانی هۆو هۆکاری سەربەخۆ (عامل مستقل) لەسەر گروپی ئەزموونی و دوورخستنەوەو دانەنانی لەسەر گروپی کۆنترۆڵی.
٦- پێوان و زانینی کاریگەری هۆکاری سەربەخۆ لەسەر گروپی ئەزموونی و بەراوردکردنی هەردوو گروپەکە بەیەکتری.
٧- شیتەڵکردنەوەی زانیارییەکان.

٨- لێک دانەوەی دەرئەنجامەکان.

نموونە: ئەگەر بمانەوێت توێژینەوەو تاقی کردنەوەیەک بەرێگای ئەزموونی (تجريبي) دەربارەی کاریگەری بینینی فیلمە شەڕخوازو خوێناوی یەکان لەسەر رەوشتی شەڕخوازی بەئاکام بگەیەنین، ئەوا دەبێت ئەم خاڵانەی خوارەوە پەیرەو بکەین:

١- دانانی گریمانێک (Hypothesis) کە بینینی فلیمە شەڕخوازیەکان دەبێتە هۆی زیادکردنی رەوشت و هەڵس و کەوتی دەست درێژیو شەڕخوازی لەلای منداڵان.

٢- دوو کۆمەڵ منداڵ هەڵدەبژێرین بۆ ئەوەی تاقی کردنەوەکەیان لەسەر بکەین، کۆمەڵەی یەکەم ناو دەبەین بەکۆمەڵەی ئەزموونی (تجريبي)، کۆمەڵەی دووهەمیش بە کۆمەڵەی کۆنترۆڵی (ضابطة).

٣- دەبێت زۆربەی خاسیەت و سیفاتەکانی (هۆکارەکان) (العوامل)ی ئەو دوو کۆمەڵە لەیەکەوە نزیک بن وەک (تەمەن، ئاستی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئابووری، رەوشتی شەڕخوازانەیان... تاد)، واتە نابێت منداڵانی کۆمەڵەی یەکەم لەکۆمەڵەی دووهەم گەورەتر بن یان دەوڵەمەندتر یان رۆشنبیرتر یان زیرەکتر یان لاسارتر، بەڵکو دەبێت زۆر نزیک بن لەیەکترییەوە.

٤- منداڵانی ئەو دوو کۆمەڵەیە تاقی دەکرێنەوە بۆ زانینی رێژەو چەندێتی رەوشت وهەڵس و کەوتی شەڕخوازی لەلایان.

٥- فیلمی دەست درێژی و شەڕخوازی پیشانی گروپی یەكەم (تجريبي) دەدرێت و لەجیاتی ئەو فیلمەش فیلمێكی كۆمیدی كۆمەڵایەتی خۆش پیشانی كۆمەڵەی دووهەم (ضابطة) دەدرێت.

٦- دوای تەواو بوونی هەردوو فیلمەكە، دەست دەكرێت بەپێوانە كردن و دەست نیشانكردنی رەوشت و هەڵس و كەوتی دەست درێژی و شەڕخوازانە لەلای هەردوو گروپەكە.

٧- شیتەڵكردنەوەی ئەو زانیاریانەی كە دەربارەی رەووشتی ئەو دووگروپە دەست كەوتووەو گۆڕینی جۆری رەوشت و هەڵس و كەوتە شەڕخوازییەكان بۆ ژمارەو زانیاری چەندێتی (المعلومات الكمية).

٨- لێكدانەوەی (تفسير) دەرئەنجامی ئەو توێژینەوەیە، واتە كاتێك دەگەینە ئەو راستیەی كە منداڵانی گروپی یەكەم زیاتر لە منداڵانی گروپی دووهەم دەست درێژكارو شەڕخواز بوون، ئەوە دەتوانین بەدڵنیایی یەوە بڵێین كە منداڵانی گروپی یەكەم لەرێگەی بینین و لاسایی كردنەوەی ئەو فلیمە شەڕخوازییەوە فێری ئەو رەوشتە نا بەجێیانە بوون.
بێگومان ئەم رێگایە زۆر سەركەوتوو بەكەڵكە بۆ كۆكردنەوەی زانیاری و بەئاكام گەیاندنی توێژینەوەی زانستی بەڵام هەندێك كەم و كورتی تێدایە لەوانە، زۆر جار لەبەر هەندێك پێوەری مرۆڤایەتی و ئەخلاقی ناتوانرێت هەندێك ئەزموون و تاقی كردنەوە بكرێن لەوانە:

أ- كاریگەری لێدان و سوكایەتی پێكردن (هۆكاری سەربەخۆ، عامل مستقل) لەسەر هەندێك گۆڕانكاری لەرەوشتدا (هۆكاری پاشكۆ، عامل تابع)، چونكە توێژەر ناتوانێت كۆمەڵێك منداڵ بهێنێ و دەست بكات بەلێدان و سووكایەتی پێكردنیان بۆ ئەوەی بزانێت كاریگەری ئەو لێدانە لەسەر گەشەكردن و كەسایەتی و هەندێك لایەنی رەوشتی ئەو منداڵانە چیە؟.

ب- ناتوانرێت بەشێك لەتوێكڵ و پەردەی مێشك لا ببردرێت یان دەست كاری چەند ناوچەیەكی مێشك بكرێت یان چەند خانەو شانەیەك تێك بدرێت (هۆكاری سەربەخۆ) بۆ ئەوەی كاریگەرییان لەسەر یادكردنەوەو بیركردنەوەو هەڵس و كەوتی ئەو كەسانە بزاندرێت (هۆكاری پاشكۆ).
ج- ناتوانین كۆمەڵێك منداڵ برسی بكەین تاوەكو كاریگەری برسێتی زۆر لەسەر رەوشتی منداڵ بزانین.
لەگەڵ هەندێك لە ئەو كەم و كورتیانەشدا ئینجا بەسەركەوتووترین رێگا بۆ كۆكردنەوەی زانیاری دادەنرێت، لەبەر ئەوەی زۆر لەخودێتی و داشكاندن بەلایەك و حاڵەتی مەزاجی توێژەر دوور دەكەوێتەوەو لەبابەتی (موضوعي) (Objectivity) نزیك دەكەوێتەوە هەروەها لەتوانای توێژەردا هەیە كە بەسەر دیاردەكاندا زاڵ بێت و كۆنترۆڵی زۆربەی زۆری ئەو هۆكارە دەرەكی و نامۆیانە بكات كە كاری خراپ دەكەنە سەر دەرئەنجامی توێژینەوەكەو لەرێچكەی ئاسایی خۆی لادەدەن.

## ب- وەسفە ڕێگا (الطريقة الوصفية) (Descriptive method):

وەک بەناوەکەیدا دیارە ئەم ڕێگایە پشت بەوەسف کردنی گۆڕان و قۆناغەکان و دیاردەکانی گەشەکردن دەبەستێت ئەویش بەکۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی لایەنە جیاجیاکانی گەشەکردنی منداڵ (جەستەیی، ژیری، هەڵچوونی، کۆمەڵایەتی... تاد)، ئیتر بەسەرنج دان و چاوپێکەوتن و پرسیار لێکردنی منداڵ خۆی بێت یان دایک و باوک و مامۆستاکانیان. ئەم ڕێگایەش بۆ یەکەم جار لەسەر دەستی هەندێک لەدەروونزانەکان هاتەکایەوە ئەوانیش بەسەرنج دان و چاوپێکەوتنی منداڵەکانیان دەستیان پێکردو ڕۆژ لەدوای ڕۆژو ساڵ لەدوای ساڵ زانیارییان دەربارەی چۆنێتی گەشەکردنیان کۆدەکردەوە. ئەم ڕێگایەش دوو جۆری جیاوازی هەیە، یەکەمیان ناودەبرێت بەدرێژە ڕێگا (الطريقة الطولية)و دووهەمیشیان بەپانە ڕێگا (الطريقة المستعرضة).

### ١- درێژە ڕێگا (الطريقة الطولية) (Longitudinal method):

مەبەست لەدرێژە ڕێگا ئەو شێوازەیە لە بەئاکام گەیاندنی توێژینەوەی زانستی کە لێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵێک منداڵی دیاری کراو بۆ ماوەیەکی درێژ کە هەندێک جار دەگاتە (٣٠-٤٠) ساڵ دەکرێت، ڕۆژ لەدوای ڕۆژو مانگ لەدوای مانگ و ساڵ لەدوای ساڵ زانیاری دەربارەی لایەنەکانی گەشەکردنیان کۆدەکرێتەوە، واتە توێژەر لەو ڕۆژەی کە دەست دەکات بەدیاری کردنی ئەو کۆمەڵە منداڵە هەتا ئەو ڕۆژەی کە توێژینەوەکەی تەواو دەبێت هەر تەنها لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو کۆمەڵە منداڵە دەکات و ساڵ لەدوای ساڵ لەگەڵیان بەردەوام دەبێت. لەساڵی یەکەم پێوانەی ئەو لایەنە دەکات کە توێژینەوەی لەسەر دەکات ئینجا چاوەڕوان دەبێت تا ئەو منداڵانە ساڵێک گەورە دەبن ئینجا بۆجاری دووەم پێوانەی ئەو لایەنەی گەشەکردن دەکات، ساڵی سێهەمیش بەهەمان شێوە.. تاکۆتایی توێژینەوەکەی.

بۆ نموونە ئەگەر توێژەرێک بیەوێت بزانێت منداڵ لەلایەنی جەستەیی و کۆمەڵایەتییەوە چۆن گەشە دەکات، ئەوا لەسەری پێویستە کە کۆمەڵێک منداڵی دیاریکراو (کە یەک تەمەنیان هەبێت) هەڵبژێرێت (بۆ نموونە ٢ ساڵ) ئینجا لەم تەمەنی دوو ساڵییەدا درێژی و کێش و بارستایی وپەیوەندی و هاوکاریان لەگەڵ کەسانی تر بپێوێ، ئینجا لەتەمەنی (٣) سێ ساڵیدا ئەو دیاردەو لایەنانە بۆ جاری دووهەم بپێوێ، هەروەها لەساڵی (٤) چوارەم ئینجا (٥) پێنجەم... تاد. بەم شێوەیە زانیاری تەواوی دەربارەی چۆنیەتی گەشەکردنی جەستەیی‌و کۆمەڵایەتی ئەو کۆمەڵە منداڵە دەست دەکەوێت و توێژەر دەتوانێت بەراورد لەنێوان منداڵەکاندا بکات یان ڕێژەی گەشەکردنیان بەپێی تەمەن بدۆزێتەوە یان بزانێت لە چ ساڵێکدا گەشەکردن زۆر خێرایە یان هێواش و لاوازە.

تیرمانی (Terman) زانا یەکێک بوو لەو کەسانەی کە بۆ ماوەی (٣٠) سی ساڵ لەگەڵ کۆمەڵێک منداڵی زیرەک و بلیمەتدا هەر لەقۆناغی باخچەی ساوایانەوە (رياض الاطفال) تا قۆناغی خوێندنی باڵا بەردەوام بوو، ساڵ لەدوای ساڵ سەرنجی چۆنیەتی و ڕێژەی گەشەکردنی

(جەستەیی، ژیری، كۆمەڵایەتی) ئەو منداڵانەی دەدا. هەروەها ئارنولد جیزلیش توێژینەوەی لەسەر (١٠٠) سەد منداڵی شیرخۆر كردو مانگ لەدوای مانگ زانیاری دەربارەی چۆنیەتی فێربوونی گرتنی شتەكان و گەشەكردنی كۆكردەوە. لەلایەكی تریشەوە پەیمانگای (فلز) بۆ لێكۆڵینەوەی زانستی توێژینەوەیەكی بەم رێگایە لەسەر (٧١) كەس لەكاتی لەدایك بوونەوە تا قۆناغی كامڵی (مرحلة الرشد) كردو لەو ماوە دوورو درێژەدا زانیارییەكی زۆر دەربارەی رەوشت و هەڵس و كەوتی شەرخوازیو دەست درێژیان كۆكرایەوە. (هرمز، ١٩٨٨، ص٢٩).

***شایانی باسە ئەم رێگایە چەند خاڵ و خاسیەتێكی باش و بەهێزی هەیە لەوانە:***

أ)- ئەو زانیاریانەی بەم رێگایە كۆ دەكرێتەوە زۆر ووردو بەدیقەتترە لەشێوازی پانەڕێگا.

ب)- دەتوانرێت جیاوازی تاكایەتی (الفروق الفردیة) لەنێوان منداڵەكاندا بكرێت و بزاندرێت كام منداڵ لەهەموویان باشترە یان خراپترە، لەهەمان كاتیشدا خاڵی لاوازی و بەهێزیان دیاری بكرێت.

ج)- لەتوانادا هەیە بەم رێگایە زانیاری لەسەر زیاتر لەلایەنێكی گەشەكردنی منداڵەكان (جەستەیی، كۆمەڵایەتی، ژیری، هەڵچوونی) كۆ بكرێتەوە بەپێچەوانەی پانە رێگاوە كە زیاتر زانیاری لەسەر لایەكی گەشەكردن كۆدەكاتەوە.

***بەڵام لەگەڵ ئەو باشیانەی سەرەوەشدا، كەچی ئەم رێگایە چەند كەم و كورتی و نووقستانیەكی تێدایە لەوانە:***

أ- كات و ماندووبونێكی زۆری دەوێت و لەتوانای هەموو توێژەرێكدا نیە كە پەنا بۆ ئەم رێگایە ببات.

ب- ناتوانرێت كە سوود لەكەرەستەو ئامرازە تازەكان وەربگیرێت. بۆ نموونە ئەگەر توێژەرێك بۆ ماوەی (١٠) ساڵ زانیاری لەسەر رێژەی زیرەكی كۆمەڵێك منداڵ بەرێگەی زیرەكی پێوێكی دیاریكراو كۆبكاتەوە بەڵام دوای ئەو (١٠) ساڵە زیرەكی پێوێكی باشتر پەیدا بوو، ئەوا لەو كاتەدا توێژەر ناتوانێت ئەو زیرەكی پێوە (مقیاس الذكاء) تازەیە بەكار بهێنێت، چونكە (١٠) ساڵە زانیاری بەو زیرەكی پێوە كۆنە كۆدەكاتەوەو نابێت دوای ئەوە زیرەكی پێوێكی تر بەكار بهێندرێت چونكە لەوانەیە جیاوازی لەنێوان جۆری برگەو قورسی و سوكی و ئەو توانستەی كە هەردووكیان دەیپێون هەبێت.

ج- ناتوانرێت توێژینەوە لەسەر ژمارەیەكی زۆر لەمنداڵان بكرێت، چونكە كات و ماندو بوون و توانایەكی زۆری دەوێت.

د- ئەگەر یەكێك یان زیاتر لەیەكێك لە ئەو منداڵانەی كە توێژینەوەیان لەسەر دەكرێت مردن یان بێزار بوون یان ماڵیان لەو شارو وڵاتە باری كرد، ئەوا لەو كاتەدا لەتوانادا نییە كە جێگەیان بەمنداڵانی تر پڕ بكرێتەوە، چونكە لەوانەیە (٧) ساڵ یان زیاتر یان كەمتر بێت كە تەنها زانیاری لەسەر ئەو منداڵە كۆدەكرێتەوە، ئیتر ناتوانرێت دوای ئەو چەند ساڵە منداڵێكی تر كە لە(١٠٠٪) سەدا سەد لەهەموو توانست و خاسیەت و لایەنێكدا وەكوو ئەو بێت ، بدۆزرێتەوە.

## ٢- پانە ڕێگا (الطريقة المستعرضة) (Cross- Sectional Method):

ئەم ڕێگایە بریتییە لە بەئاکام گەیاندنی توێژینەوە لەسەر چەند کۆمەڵێک منداڵی تەمەن جیاواز، واتە توێژەر لەهەمان کاتدا کۆمەڵێک منداڵ لەتەمەنی (٤) چوار ساڵان و کۆمەڵێکی تر (٥) ساڵان و کۆمەڵێکی تر (٦)و یەکێکی تر (٧)و یەکێکی تر (٨)... تاد هەڵدەبژێرێت، ئینجا دەست دەکات بەپێوانە کردن یان سەرنج دانی ئەو لایەنەی کە مەبەستیەتی لەلای هەریەک لەو کۆمەڵانە لەماوەیەکی دیاریکراودا بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی ئەوە بکات کە هیچ کەس لەمنداڵانی ئەو کۆمەڵانە گەورەببن، ئینجا دوای ئەوە ناوەندی ژمێرەیی (متوسط الحسابي) بۆ منداڵانی ئەو کۆمەڵانە دەردەهێنێت و دەیکات بەنرخ و بەهای هەموو کۆمەڵێک واتە دەبێت بەپێوەری (معيار) هەموو منداڵەکانی ئەو کۆمەڵە، دوای ئەوە دەست دەکات بە بەراوردکردنی بەهای ئەو ناوەندە ژمێرەییانەی کە بۆ کۆمەڵەکانی دەرهێناوە تا بزانێت ڕێژەی گەشەکردنی لایەنەکان (جەستەیی، ژیری، کۆمەڵایەتی، هەڵچوونی) چەندەو بە چ شێوەیەک گەشە دەکەن.
ئینجا بۆ ئەوەی توێژەر لەکارەکەیدا سەرکەوتوو بێت دەبێت ژمارەیەکی زۆر لەمنداڵان ( وەک نموونە ) بۆ هەر کۆمەڵێک هەڵبژێرێ تاوەکو بەشێوەیەکی ڕاستەقینە گوزارشت لەو کۆمەڵە بکەن کە لێی هەڵبژێردراوەو ببن بەنوێنەری ڕاستەقینەی کۆمەڵە سەرەکیەکەیان.

***شایانی باسە ئەم ڕێگایە چەند خاسیەت و خاڵێکی باش و بەهێزی خۆی هەیە لەوانە:***

أ- پێویستی بەماندوو بوون و هیلاکی زۆر نیە.
ب- لەماوەیەکی کورتدا توێژەر دەگاتە دەرئەنجامی توێژینەوەکەی و وەک درێژە ڕێگا پێویستی بەچەندەها ساڵ نیە بۆ ئەوەی بگاتە ئامانجە دیاریکراوەکانی.
ج- لەتوانادا هەیە لەیەک کاتدا توێژینەوە لەسەر هەزارەها منداڵی تەمەن جیاواز بکرێت.
د- ئەگەر چەند منداڵێکی کۆمەڵەکە دوور کەوتنەوەو بەشداریان نەکرد ئەوا لەتواناندا هەیە کە بەمنداڵانی تر شوێنەکانیان پڕ بکرێنەوە.
هـ- دەتوانرێت سوود لەکەرەستەو ئامرازو زیرەکی پێوە نوێیەکان وەر بگیرێت.

***لەگەڵ ئەو خاڵە بەهێزانەی سەرەوە، پانە ڕێگا ڕووبەڕووی ئەم گرفتانە دەبێتەوە:***

أ- زانیاریەکانی ئەم ڕێگایە وەک زانیارییەکانی درێژە ڕێگا ووردو بەدیقەت نین.
ب- لەتوانادا نیە لەیەک کاتدا توێژینەوە لەسەر چەند لایەنێکی گەشەکردن بکرێت.
ج- ناتوانرێت هەست بەجیاوازی تاکایەتی نێوان منداڵەکان بکرێت، چونکە پشت بە ناوەندی ژمێرەیی هەموو منداڵەکان دەبەستێت نەک بە زانیاری سەر هەر یەک لەمنداڵەکان.
واتە لەم ڕێگایەدا ناتوانرێت دەست نیشانی خاڵە لاوازو بەهێزەکانی هەریەک لەمنداڵەکان بکرێت. ئینجا بۆ ئەوەی سوود لەخاڵە بەهێزەکانی هەردوو پانەو درێژە ڕێگا وەربگیرێت و لەنوقوستانی و کەم و کورتیەکانیان ڕزگاربن، هەندێک لەتوێژەرەکان لەیەک کاتدا پەنا بۆ هەردوو ڕێگاکە دەبەن لەکاتی بەئاکام گەیاندنی توێژینەوەکانیان.

## کەرەستەکانی کۆکردنەوەی زانیاری (وسائل جمع المعلومات):-

بۆ ئەوەی توێژینەوەی زانستی بەسەرکەوتوانە بەئاکام بگەیەندرێت، دەبێت چەندەها کەرەستەی تایبەت بە کۆکردنەوەی زانیاری بۆ دەستەبەرو دابین بکرێت، بێگومان هەر بوارو پسپۆڕیەو بابەتێک تایبەتمەندی خۆی هەیە، لەبەر ئەوە دەبێت توێژەر زۆر بەزیرەکانە ئەو کەرەستەو ئامرازانە بەکار بهێنێت کە دەیان گەیەنێتە مەبەست.

**ئەمانەی خوارەوە لەکەرەستە گرنگەکانی کۆکردنەوەی زانیارین لەبواری گەشەکردنی منداڵاندا:-**

### ١- تێبینی (الملاحظة) (Observation):

تێبینی یەکێکە لەو کەرەستە گرنگانەی گۆڕەپانی سایکۆلۆژیای منداڵ و بەکۆنترین کەرەستەی کۆکردنەوەی زانیاریش دادەنرێت، چونکە یەکەم جار گرفت و دیاردەکان سەرنجی مرۆڤیان ڕاکێشاوەو لەلایەنیەوە تێبینی کراون ئینجا لەهەنگاوی دووەم بیر لەکەرەستەو ئامرازی تر بۆ چارەسەرکردن و کۆنترۆڵ کردنیان کراوەتەوە.
مەبەست لەتێبینی سەیرکردن و سەرنج دانی ئەو ڕەوشت و هەڵس و کەوت و گۆڕانکارییانەیە کە لەلای منداڵان ڕوودەدەن دواتریش کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەیان. شایانی ئاماژە بۆ کردنە کە دوو جۆر تێبینی هەیە یەکەمیان تێبینی بێ مەبەست و سەرپێیە (الملاحظة العابرة) و دووهەمیشیان تێبینی بەمەبەستە (الملاحظة المقصودة). جۆری دووهەمیان زۆر گرنگ و پێویستە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری.

**ئەم خاڵانەی خوارەوەش پێوەری جیاکردنەوەن لەنێوان تێبینی سەرپێیی و تێبینی زانستی و بەمەبەست:**

١- دەبێت توێژەر مەبەست و ئامانجی سەرەکی / خۆی لەکاتی تێبینی کردندا دیاری بکات. ئایا مەبەستی سەرەکی توێژەر تێبینی کردنی ڕەوشتی شەڕخوازی منداڵە یان چۆنیەتی هاوکاری کردنی یان گۆشەگیری یان توانای ڕاکردن و هەڵبەزو دابەز یان... تاد. دەبێت مەبەستەکە لەپێش دەست کردن بەتێبینی دیاری بکرێت.

٢- شوێن/ ئەرکی سەرەکی توێژەرە کە دەبێت شوێن و جێگای تێبینیەکانی دیاری بکات، واتە لەچ جێگایەک زانیاری دەربارەی منداڵ کۆدەکاتەوە، ئایا دەیەوێت تێبینی ڕەوشتی منداڵ لەگۆڕەپانی قوتابخانە بکات یان لەماڵەوە یان کۆڵان یان کاتی یاریکردنی لەیاریگا یان... تاد.

٣- کات/ زۆر پێویستە کە توێژەر کاتی تێبینی کردنەکانی دیاری بکات، واتە لەچ کاتێک (بەیانی، نیوەڕۆ، ئێواریٚ، شەو، ڕۆژ، کاتی نان خواردن، کاتی یاریکردن کاتی پشوودان.. تاد) تێبینی ڕەووشت و هەڵس و کەوتی منداڵەکان دەکات.

٤- ئامادەکردنی خشتەو کەرەستەی پێویست : بۆ تۆمارکردنی زانیارییەکان. بۆ نموونە هەندێک جار پێویست بەئەوە دەکات کە لەژووری تایبەتیەوە تێبینی ڕەوشتی منداڵەکان بکرێت بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی واقیعی و راستەقینە هەڵس و کەوت بکەن. ئا لەم کاتانەدا توێژەر پێداویستی بەژووری تایبەتی دەبێت کە جام و شووشەکانی لەو جۆرەن کە تەنها لەیەک دیوەوە کەسانی تر دەبینرێن، واتە تەنها توێژەر منداڵەکان دەبینیٚ و منداڵەکان ناتوانن توێژەری ناو ئەو جۆرە ژوورانە ببینن.

هەروەها هەندێک جار پێویست بە ئەوە دەکات کە زیاتر لەتێبینەرێک (ملاحظ) سەرنجی منداڵەکان بدەن بۆ ئەوەی ئەگەر یەکەم تێبینەر نەیتوانی هەموو ڕەوشت و هەڵس و کەوتەکان تۆمار بکات ئەوە تێبینەری دووهەم لەو بارەیەوە یارمەتی دەدات. لەلایەکی تریشەوە هەندێک جار ئامێرەکانی وەک کامێرا و تۆمارکەر (المسجل) دەتوانن کاری تێبینەر ئاسان بکەن.

وەک دەرکەوتووە تێبینی تەنها کەرەستەیە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی منداڵی شیر خۆرو تەمەن بچووک چونکە فێری زمان نەبوون و ناتوانرێت لەرێگەی کەرەستەکانی تری وەک (چاوپێکەوتن، ئیش کردن، زیرەکی پێوەکان، ڕاپرسی.. تاد) زانیاری دەربارەیان کۆبکرێتەوە.

## ٢- چاوپێکەوتن (المقابلة) (Interview):

بریتیە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی نێوان دووکەس کە لەمیانەیەوە راو و بیرو بۆچوون ئاڵوگۆڕ دەکرێت و هەرجارەی لایەک پرسیار دەکات و ئەوی تر وەڵام دەداتەوە، بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەو جۆرە چاوپێکەوتنەیە کە لەنێوان توێژەرو منداڵ یان دایک و باوک و مامۆستاکانیدا بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی هەندێک لایەنی ژیانی منداڵ ساز دەدرێت.

**چاوپێکەوتن زۆر جۆری هەیە لەوانە:**

١- چاوپێکەوتنی تاکی (فردي) یان چاوپێکەوتنی کۆمەڵی (جماعي) ، مەبەست لەچاوپێکەوتنی تاکی ئەوەیە کە بەتەنها لەنێوان توێژەرو یەک منداڵ یان یەک کەسی منداڵدا ساز دەدرێت، بەڵام چاوپێکەوتنی بەکۆمەڵ ئەوەیە کە لەنێوان توێژەرو ژمارەیەک لەمنداڵان یان کەس و کاری منداڵاندا سازدەدرێت.

٢- چاوپێکەوتنی ئازاد (المقابلة الحرة)، لەم جۆرەدا ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ساز دەدرێت بەئارەزووی خۆی قسە دەکات و هیچ ڕێگرو لەمپەرێک لەبەردەم قسەو راو بۆچوونەکانیدا

دانانرێت بەڵام سنووری چاوپێکەوتنی دیاریکراو (المقابلة المحددة) روون و ئاشکرایەو دەبێت ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ساز دەدرێت پابەندی هەندێک مەرج و خاڵی دیاریکراو بێت و نابێت لەو سنوورە دەربچێت. بێگومان هەریەک لەو چاوپێکەوتنانە مەبەست و بارودۆخی تایبەتی و خاڵی بەهێزو لاوازی خۆی هەیە.

**چاوپێکەوتن لەهەندێک بارودۆخدا لەبەر ئەم خاڵانەی لای خوارەوە باشترین کەرەستەیە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری:**

١- هەندێک کەس لەرێگەی چاوپێکەوتنەوە زیاتر زانیاری دەدەن وەک لەرێگەی راپرس و ئەزموونەکانی ترەوە، واتە حەز دەکەن بەقسە باسی حەزوو ئارەزوو خەوو خەیاڵ و گرفتەکانیان بکەن نەک بەنووسین.

٢- زۆر جار دەتوانرێت لەرێگەی سەرنجدانی گۆرانکاریەکانی دەم و چاوو جووڵەی ئەندامەکانی لەشی ئەو کەسانەی کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ساز دەدرێت، زۆر زانیاری بەکەڵک لەسەر باری دەروونی و گرفت و ئەندێشەکانیان کۆبکرێتەوە، کە لەتواناد ا نیە بەو شێوەیە بەهۆی هیچ کەرەستەیەکی ترەوە کۆبکرێنەوە.

٣- لەرێگەی چاوپێکەوتنەوە دەتوانرێت زیاتر هانی ئەو کەسە بدرێت کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ دەکرێت، بۆ ئەوەی زیاتر بەناخی گرفتەکانیدا بچێتە خوارەوەو زیاتر بیریان لێبکاتەوە.

٤- چاوپێکەوتن کەرەستەیەکی بەکەڵکە بۆ زانینی هەندێک لەنهێنیەکان، ئەویش لەرێگەی زمان تەتەڵە کردن یان رەزم و ئەزمی (ایقاع ونغمات) قسەکانی. چونکە هەندێک پرسیاری تایبەتی دەبێتە هۆی وروژاندنی ئەو کەسەو لەرێگەیەوە دەتوانرێت زانیاری زۆر دەربارەی پاڵنەرو سۆزو ئارەزوو هەڵچوون و بیرو باوەڕەکانی هەڵبهێنجرێت کە ناتوانرێت بەهیچ شێوەیەک لەرێگەی کەرەستەکانی ترەوە دەست بکەون.

٥- چاوپێکەوتن زیاتر لەبارو گونجاوە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی منداڵانی بچووک و کەسانی نەخوێندەوار (ڤان دالین، ١٩٧٧، ص٤٢٨- ٤٣٩).

***ئەو کەسەی کە چاوپێکەوتن ساز دەدات دەبێت ئاگاداری ئەم مەرجانەی لای خوارەوە بێت:***

١- دەبێت چاوپێکار پەیوەندی گەرم و گوڕ لەگەڵ ئەو کەسانەی کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ساز دەدات دابنێت و لەمەبەستی راستەقینەی چاو پێکەوتنەکە دڵنیایان بکات.

٢- دەبێت شێوەو جۆرى پرسيارەكان ديارى بكرێت و بەهۆى رستەو ووشەى سادەو ئاسانەوە ئاراستەيان بكرێت و دوور بن لەتەم و مژو پێچ و پەنا.

٣- دەبێت پرسيارەكان لەگەڵ ئاستى رۆشنبيرى و كۆمەڵايەتى ئەو كەسانەى كە چاوپێكەوتنيان لەگەڵ دەكرێت بگونجێن.

٤- دەبێت چاوپێكار ئاگادارى وەڵامەكان بێت و بەبێ هەڵسەنگاندن و لێوردبوونەوە پشتيان پێنەبەستێت، چونكە هەندێك جار ئەو كەسانەى كە چاوپێكەوتنيان لەگەڵ ساز دەدرێت لەبەر شەرم يان ترس يان عەيبەو شورەيى يان لەبەر ئەوەى وەڵامە راستەكان هەست و سۆزيان بريندار دەكات و تووشى سوكايەتيان دەكات يان بۆ رازى كردنى چاوپێكار هەندێك زانيارى و وەڵامى نارِاستەقينەو چەواشەكەر دەدەن بەچاوپێكار.

٥- دەبێت چاوپێكار پێش ئەوەى دەست بكات بەچاوپێكەوتن بۆ ماوەيەكى دياريكراو خۆى رابهێنێ و چەندەها چاوپێكەوتن بۆ فێربوونى خۆى بەئاكام بگەيەنێت. چونكە چاوپێكەوتن لەگەڵ منداڵان و كۆكردنەوەى زانيارى لێيان كارێكى ئاسان نيە.

٦- دەبێت چاوپێكار ئاگادارى ئەوەبێت كە ئەو كەسانەى چاوپێكەوتنيان لەگەڵ ساز دەدات لەسنوورى ئامانجەكانى دەرنەچن و خۆيان بەشتى لاوەكى و بێ ماناوە خەريك نەكەن.

## ٣- <u>*راپرسى، راوەرگرتن (الاستفتاء) (Questionnaire):*</u>

بريتيە لەژمارەيەك پرسيارو برگەى نوسراو كە دەدرێت بەمنداڵ (بەتايبەتى گەورەكان و ئەوانەيان كە خوێندەوارن) بەمەبەستى كۆكردنەوەى زانيارى دەربارەى هەندێك لايەنى ژيانيان. ئينجا بۆ ئەوەى راپرسەكە ئاكامى خۆى ببێنێ دەبێت ئەو كەسەى بەكارى دەهێنێت ئاگادارى ئەم خاڵانەى خوارەوە بێت:

١- دەبێت بەتەواوى ئەو گرفت و بابەتەى كە دەيەوێت زانيارى دەربارەى كۆبكاتەوە ديارى بكات.
٢- دەبێت هەموو پرسيارەكان تايبەت بن بەجۆرى گرفتەكەو توێژەر هەوڵ بدات لەرێگەى هەندێك پسپۆرو شارەزاوە لەراست و دروستيان دڵنيا بێت.

٣- دەبێت بەزمانێكى سادەو ساكار دابرێژرێت و لەگەڵ ئاستى رۆشنبيرى و كۆمەڵايەتى منداڵدا گونجاو بێت.
٤- دەبێت بەشێوەيەكى لۆژيكانە پرسيارەكان دابنرێت واتە لەسووكەوە بۆ قورس لەسادەوە بۆ ئاڵۆز ريز بكرێن.

٥- دەبێت زانيارى پێويست لەپێشەكى راپرسەكەدا بۆ رێنيشاندان و رێنمايى كردنى منداڵەكان بنووسرێت، تاوەكوو لەرێگەيەوە وەك پێويست وەڵام بدەنەوە.

٦- هانی ئەو کەسانە بدرێن بۆ ئەوەی بەراست گوێی و بابەتیانە وەڵام بدەنەوە.

٧- دەبێت هەر پرسیارەو یەک بیرو بۆچوون (فکرة) هەڵبگرێت و نابێت تەم و مژاوی بێت.

٨- باشتر وایە وەڵامی پرسیارەکان لەڕێگەی چەند ووشەیەکی کەمەوە دیاری بکرێن لەوانە (بەڵێ، نەخێر) (بەڵێ، نازانم، نەخێر) (رازیم، بێلایەنم، رازی نیم) (هرمز، ١٩٨٨، ص٣٢).

پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە هەندێک جار راپرس کەرەستەیەکی سەرکەوتوو نیە بۆ منداڵان، لەبەر ئەوەی دەبێت منداڵەکان خوێندەوار بن و توانایەکی باشیان لەزمان و گوزارشت کردندا هەبێت، لەوانەشە هەندێک جار لەمەبەستە سەرەکیەکەی راپرسەکە تێنەگەن. لەبەر ئەوە دەبێت توێژەر ئاگاداری ئەو حاڵەتانە ببێت کە راپرس تیایدا سەرکەوتوو نابێت.

تیۆرەكانی گەشەكردن
تیۆرەكانی پێگەیشتن ( گەین )
تیۆرەكانی زانینی
تیۆری فێربوونی كۆمەڵایەتی
تیۆری شیتەڵكاری دەروونی
پرانسیپەكانی گەشەكردن
گەشەكردن لە قۆناغی پێش لەدایك بوون
بۆماوەو ژینگە
كاریگەری گلاندەكان لەسەر گەشەكردن

## تیۆرییەکانی گەشە کردن (Devlopmental Theories)

بابەتی گەشەکردن سەرنجی زۆر لەزاناو فەیلەسوفەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە، هەر گرنگی ئەم بابەتەشە بۆتە هۆی ئەوەی کە چەندەها تیۆریی جیاواز دەربارەی لێکدانەوەو چۆنیەتی ڕوودانی هەبێت. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین ڕاو بۆچوونی زانایان دەربارەی گەشەکردنی مرۆڤ لەم تیۆرانەی لای خوارەوەدا کۆبکەینەوە.

### ١- تیۆرەکانی پێگەیشتن (گەین) (Maturational Theories):-

بەپێ ی ئەم تیۆرە، منداڵ بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و هەر لەخۆیەوە، دوای پێ گەیشتنی کۆئەندامەکانی لەشی، فێری دیاردەکانی گەشەکردن دەبێت و دەتوانێت کۆنترۆڵی جووڵەی ئەندامەکانی لەشی بکات. زانایانی سەر بەم ڕێبازو تیۆرانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە نابێت منداڵ ناچار بکرێت و دوای بەناکام گەیاندنی زۆر لەچالاکیەکانی لێبکرێت، پێش ئەوەی ئەو کۆئەندامەی بەرپرسە لەکۆنترۆڵ کردن و بەناکام گەیاندنی ئەو چالاکیە پێ گەیشتبێ، بەڵکو پێویستە دایکان و باوکان و مامۆستایان چاوەڕوانی پێ گەیشتن و گەینی ئەو کۆئەندامە بکەن کە بەرپرسیارە لەڕاپەڕاندنی ئەو چالاکی و کارو فەرمانانە.

جێگەی ئاماژە بۆ کردنە کە زانایانی وەک (جیزل، هیلگارد، فرانسیس... هتد) بەدامەزرێنەرو ڕابەرانی ئەم تیۆرە دادەنرێن. وە لەگرنگترین توێژینەوەکانی ئەم بوارەش، ئەو توێژینەوەیەیە کە ئارنۆلد جیزل لەسەر دوو کۆمەڵ منداڵ بەئاکامی گەیاند، ناوەڕۆکی توێژینەوەکەش بەم شێوەی لای خوارەوەیە:

[جیزل دوو کۆمەڵ منداڵی ئامادە کرد کە هەموویان دوانە (جمک) بوون]، کۆمەڵەی یەکەم بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک لەسەر چۆنیەتی سەرکەوتن بەسەر قادرمەو پێ پلیکاندا ڕاهێنراون و بەدرێژایی ئەو چەند هەفتەیە هەوڵیدا کە فێری چۆنیەتی سەرکەوتنیان بکات، بەڵام وازی لەکۆمەڵەی دووهەم هێناو هیچی فێر نەکردن، دوای تەواو بوونی ماوەی توێژینەوەکە بۆ جیزل دەرکەوت کە منداڵانی کۆمەڵەی دووهەم بەماوەیەکی زۆر کورت فێری سەرکەوتن بوون، لەکاتێکا کە کۆمەڵەی یەکەم ماوەیەکی زۆر پێوەی خەریک بوون. هەروەها هیلگارد لەساڵی (١٩٣٢) دوو کۆمەڵ منداڵی ئامادە کردو، وەک جیزل بۆ ماوەی (١٢) دوانزە هەفتە کۆمەڵەی یەکەمی ڕادەهێناو فێری سەرکەوتن بەسەر قادرمەیدا دەکردن، دوای ئەو (١٢) هەفتەیە منداڵانی کۆمەڵەی یەکەم فێری ئەو چالاکیە بوون، بەڵام دوای ئەو (١٢) دوانزدە هەفتە ئینجا دەستی کرد بەڕاهێنانی کۆمەڵەی دووهەم، دوای یەک هەفتە منداڵانی کۆمەڵەی دووهەم توانیان وەک منداڵانی کۆمەڵەی یەکەم بەسەر قادرمەو پێ پلیکانەدا سەربکەون.

دەرئەنجامی ئەو توێژینەوانە وای لەو زانایانە كرد كە بگەنە ئەو باوەڕەی كە ڕاهێنان و فێر بوون بەتەنها ناتوانن گەشە بەمنداڵ بكەن ئەگەر كۆئەندام و ئامادەباشیە بۆماوەییەكان بەتەواوی گەشەیان نەكردبێ، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی كە منداڵانی كۆمەڵەی یەكەم دوای ماوەیەكی زۆر لەڕاهێنان و فێربوون ئینجا بتوانن چالاكی سەركەوتن بەسەر قادرمەدا بەئاكام بگەیەنن، لەبەر ئەوەی هێشتا كۆئەندامی جووڵەو ماسوولكەكانیان بەتەواوی گەشەی نەكردبوو بەپێچەوانەی منداڵانی كۆمەڵەی دووهەم كە لەتەمەنێكی گەورەتردا دوای پێ گەیشتنی كۆئەندامی جووڵەو ماسوولكەكانیان فێری ئەو چالاكیە كران، هەر لەبەر ئەوەش بوو كە لەماوەیەكی زۆر كورتدا كۆنترۆڵی ئەو چالاكیەیان كرد، چونكە ئەو ڕاهێنان و فێر بوونەیان بناغەیەكی بایۆلۆژی پێەوی هەبوو.

## ٢. تیۆریەكانی زانینی (النظريات المعرفية) (Cognitive Theories):-

لایەنگرانی ئەم تیۆرە لەپرۆسەی گەشە كردندا باوەڕێكی تەواویان بەگرنگی و ڕۆڵی منداڵ هەیە، بەپێ ی بۆچوونی زانایانی ئەم ڕێبازە، منداڵ بوونەوەرێكی كاریگەرو چووست و چالاكەو هەر بە بۆماوەو لەخۆیەوە توانستێكی خودی خۆی هەیە بۆ تاووتوێ كردن و زانینی دیاردەكانی ژیان، وە لەتوانایدا هەیە چەندەها هەڵس و كەوت و شێوازی جیاواز بۆ خۆسازاندن لەتەك ژینگەو دەوروبەرەكەیدا بگرێتە بەر. لەبەناوبانگترین زانایانی ئەم ڕێبازە (جان پیاچە)ی سویسرییە، كە بەدامەزرێنەرو پێشەوای تیۆری زانینی دادەنرێت.

جان پیاجیە لەو بڕوایە دایە كە گەشە كردن بەهۆی چەند پاڵنەرێكی سروشتی و بۆماوەییەوە دەوروژێندرێ واتە پێكهاتەی دەروونی مرۆڤ بریتیە لەكۆمەڵێك هێلكاری (Schema) ناوەكی كە لەڕێگەی دووبارە بوونەوەی ژمارەیەك كردارو هەڵس و كەوتی ڕۆژانەوە، بەردەوام دروست دەبێت و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەڕێگەی هەردوو پرۆسەی مژین و (Assimilation) خۆگونجاندن (Accommodation)ەوە گۆڕانكاری بەسەردا دێت، بەڕای (پیاجە) دوو جۆر هێلكاری و سكیما هەیە، جۆری یەكەم بریتیە لەسەرجەم كردارو هەڵس و كەوتە جووڵەییە دەرەكیەكان كە ناودەبرێن بەهێلكاری هەستی جووڵەیی (Sensorimotor- Schema)، جۆری دووهەمیش بریتیە لەسەرجەم ئەو كردارو پرۆسیسە ناوەكیانەی كە ناو دەبرێن بەهێلكاری زانینی (Cognitive- Schema). مرۆڤ لەڕێگەی ئەو هێلكاری و سكیمایانەوە لەژیان تێدەگات و شارەزای دیاردەكانی ژیان دەبێت، ئەو پرۆسەیەی كە دەبێتە هۆی كار لێككردن لەگەڵ ژیان و بەردەوام بوونی بوونەوەر، ناودەبرێت بەپرۆسەی خۆسازاندن (Adaptation).

ئەم پرۆسەی خۆسازاندنە لەهەردوو پرۆسەی مژین و خۆگونجاندن پێك دێت. مەبەست لەپرۆسەی مژین (Assimlation) وەرگرتنی شارەزایی و زانیاری تازەو لێكدانەوەی بەهەمان هێلكاری و سكیمای پێشوتر بەبێ گۆڕانكاری كردن لەهێلكاری و سكیما كۆنەكاندا، واتە لێكدانەوەی شارەزایی تازەو تێگەیشتنی لەڕێگەی هێلكاری و شارەزایی كۆنەوە، بۆ نموونە منداڵێكی تەمەن

ساڵ و نیو ناوی پشیلە فێر دەبێت و هێڵکاری و سکیمای تایبەتی لەمێشکی خۆیدا بۆ دروست دەکات، بەڵام دوای ئەوە ئەگەر بۆ یەکەم جار سەگ یان کەروێشکێکی بینی، ئەوە یەکسەر بەوانیش هەر دەڵێت پشیلە، چونکە هیچ هێڵکاری و سکیمایەکی دەربارەی ئەم ئاژەڵە تازەیە نیە، لەبەر ئەوە هەر لەڕێگەی هێڵکاری و سکیما کۆنەکەوە (پشیلە) ئەو ئاژەڵە تازەیە لێک دەداتەوە، بەڵام ئەگەر دایک و باوک و کەسانی چواردەوری منداڵەکەیان تێنگەیاندو فێریان کرد کە ئەم ئاژەڵە تازەیە پشیلە نیە بەڵکو کەروێشک یان سەگە، ئەوا دوای چەند جار دووبارە بوونەوەی، ئەو منداڵە هێڵکاری و سکیمایەکی تازە بۆ ئەو ئاژەڵە دروست دەکات، بەم پرۆسە تازەیەش دەگووترێت پرۆسەی خۆگونجاندن (Accommadation).

پرۆسەی خۆگونجاندن پێچەوانەی پرۆسەی مژینە، چونکە مرۆڤ لەڕێگەی پرۆسەی خۆگونجاندنەوە گۆڕانکاری لەهێڵکاری و پێکهاتەو بینای سکیما کۆنەکانیدا دەکات بەمەرجێک کە لەگەڵ ئەو شارەزایی و زانیارییە تازانەی جیهانی دەرەوەدا بگونجێت بەبێ ئەوەی بیان شێوێنێ و بەهەڵە لێکیان بداتەوە بۆ نموونە کاتێک منداڵ فێری ناوی باوک دەبێت و هێڵکاری و سکیمای تایبەتی بۆ دروست دەکات، دوای ئەوە ئەگەر پیاوێکی تری بینی هەر پێ ی دەڵێ بابە، بەڵام پاش ماوەیەکی ترو دوای چەند هەوڵدان و دووبارە کردنەوەیەک دەتوانێت لەڕێگەی پرۆسەی خۆگونجاندنەوە گۆڕانکاری لەهێڵکاری و سکیمای (باوک)دا بکات و سکیمایەکی نوێ بۆ ئەو پیاوە تازەیە دروست بکات، ئیتر ئەو پیاوە تازەیە (مام یان خاڵ، یان باپیر... هتد) بێت. بەم شێوەیە منداڵ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەڕێگەی هەردوو پرۆسەی مژین و خۆگونجاندنەوە شارەزای دیاردەکانی ژیان دەبێت و بەردەوام گەشە دەکات، بەڵام نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە ژینگەی دەرەوەی منداڵ لەپاڵ توانست و لێهاتویی منداڵدا ڕۆڵێکی گرنگ لەگەشە کردنی منداڵ و هەردوو پرۆسەی مژین و خۆگونجاندندا دەگێڕێت.

## ٣. تیۆری فێربوونی کۆمەڵایەتی (Social Learning Theories):-

بەپێ ی پرانسیپەکانی ئەم تیۆرە، منداڵ لەڕێگەی سەرنج دان و لاساییکردنەوەی ڕەوشت و خاسیەت و هەڵس و کەوتەکانی کەسانی ترەوە، بەردەوام گەشە دەکات و شارەزایی و زانیاری دەربارەی دیاردەکانی ژیان زیاد دەکات. هەمیشە منداڵ هەڵس و کەوتی کەسانی چواردەوری دووبارە دەکاتەوە، هەوڵ دەدات وەک گەورەکانی بجووڵێتەوەو وەک ئەوان هەڵس و کەوت بکات. بەڕای زانایانی ئەم ڕێبازە، منداڵ هەر لەدوای لەدایک بوونیەوە یەکسەر حەزو ئارەزووی لاسایی کردنەوەی کەسانی تری هەیە، واتە حەزوو ئارەزووی لاسایکردنەوە ڕەمەک و بۆماوەیەو حەزو پاڵنەرێکی سروشتیەو منداڵ لەکۆمەڵەکەیەوە فێری نابێت. بێگومان پاڵنەرو حەزوو ئارەزووی منداڵ بۆ لاسایکردنەوەی ڕەوشتی کەسانی تر پشت بەدوو هۆکاری گرنگ دەبەستێت، یەکەمیان پلەو پایەو کەسایەتی ئەو کەسەیە کە منداڵ دەیەوێت لاسایی بکاتەوە، تاوەکوو ئەو کەسە پلەو پایەی بەرزو دیار بێت و گرنگی هەبێت لەدەوروبەرەکەیدا، ئەوا منداڵ زیاتر لاسایی دەکاتەوە، هۆکاری دووهەمیان پەیوەندی بەتواناو لێهاتوویی منداڵەکەوە هەیە، منداڵ هەوڵ دەدات لاسایی ئەو ڕەوشت و سیفاتانە بکاتەوە کە لەتوانایدا هەیە بەئاکامیان بگەیەنێت و لەگەڵ توانست و قۆناغی گەشەکردنیدا دەگونجێت، بەپێ ی ئەو لاسایی کردنەوە بەردەوام کەسایەتی منداڵەکە

دەگۆڕدرێت و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گەشە دەکات. یەکێک لەزاناکانی ئەم ڕێبازە (باندۆرا)یە کە چەندەها توێژینەوەی لەو بارەیەوە بەئەنجام گەیاندووە، لەگرنگترین توێژینەوەکانی، ئەو توێژینەوەیە بوو کە لەسەر دوو کۆمەڵ منداڵ کردی بەمەبەستی زانینی کاریگەری فیلمە شەڕخوازو دەست درێژی کارەکان لەسەر ڕەوشتی ئەو منداڵانەی کە دەیان بینن. دوای توێژینەوەکەی، گەیشتە ئەو ڕاستیەی کە زۆربەی ئەو منداڵانەی سەیری ئەو فیلمە شەڕخوازییانەیان کردبوو، دوای تەواو بوونی فیلمەکە هەمان هەڵس و کەوتی شەڕخوازانەی کەسانی ناو فیلمەکەیان دووبارە دەکردەوە، واتە منداڵان لەڕێگەی لاسایی کردنەوەو سەرنج دانی ڕەوشتی کەسانی شەڕخوازەوە، زۆر ڕەوشتی شەڕخوازی فێر دەبن.

ئەوەی جێگەی ئاماژە بۆ کردنە ئەوەیە کە تیۆرەکانی فێر بوونی کۆمەڵایەتی، بەزۆری گرنگی بەو ڕەوشت و هەڵس و کەوتانەی کە دیارو لەبەر چاون و دەتوانرێت لەڕێگەی سەرنج دانەوە هەستیان پێ بکرێت دەدەن وەک (ڕەوشتی دەست درێژی و شەڕخوازی، قسە کردن، جووڵەی ئەندامەکانی لەش... هتد) بەڵام زۆر کەم خۆیان بەچۆنیەتی گەشەکردنی دیاردە دەروونیەکانی ناوەوە کە بەهۆی سەرنج دانەوە ناتوانرێت هەستیان پێ بکرێت وەک (بیر کردنەوە، یادکردنەوە، هۆش، هەست، زیرەکی... هتد) خەریک کردووە.

هەروەها لایەنگرانی ئەم تیۆرانە لەو بڕوایەدان کە لەتوانای مرۆڤدا هەیە کە بەردەوام لەهەموو قۆناغەکانی ژیانیدا، ئەی لەو ڕۆژەوە کە لەدایک دەبێت تا ئەو ڕۆژەی کە دەمرێت فێری ڕەوشت و هەڵس و کەوتی تازە ببێت، بەپێچەوانەی ڕاو بۆچوونی (فرۆید)و هاوەڵەکانی کە لەو بڕوایەدان، کە کەسایەتی مرۆڤ لەپێنج ساڵی یەکەمی ژیاندا دروست دەبێت و ئیتر ڕووداوو بەسەرهاتەکانی دوای ئەو پێنج ساڵە گرنگیەکی ئەوتۆیان لەسەر گەشەکردنی کەسایەتی مرۆڤ نیە. هەروەها زانایانی ئەم بوارە بڕوایەکی زۆریان بەکاریگەری پاداشت و سزا لەسەر گەشە کردنی ڕەوشتی مرۆڤ هەیە، واتە ئەو ڕەوشت و هەڵس و کەوتانەی کە پاداشت دەکرێن، ئەوە بەزۆری دووبارە دەکرێنەوەو دەبن بەبەشێک لەکەسایەتی ئەو کەسە. بەڵام سزادانی ڕەوشت و هەڵس و کەوت دەبێتە هۆی ئەمان و دووبارە نەبوونەوەی ئەو ڕەوشت و هەڵس و کەوتەی کە لەسەری سزا دراوە. بەپێ ی ئەم بۆچوونەیان، مرۆڤ ڕۆڵی تێگەتیڤەو بێ دەسەڵات و کەم توانایەو کەسایەتی لەڕێگەی هێزی دەرەکی و ژینگەکەیەوە بنیات دەنرێت.

## ٤. تیۆری شیکردنەوەی دەروونی (Psychoanalytic Theory)ـ

(سیگمۆند فرۆید)ی دامەزرێنەری قوتابخانەی شیتەڵ کردنەوەی دەروونی و هاوەڵەکانی، بەشێوەیەکی گشتی گرنگی بەهەڵچوون و پاڵنەرەکانی مرۆڤ دەدەن و بەگرنگترین چالاکیە دەروونیەکانیان دادەنێن. هەروەها ئەم تیۆرە گرنگیەکی زۆریش بەخەون و زیندە خەون و خەوو خەیاڵ و ترس و دڵەڕاوکێکانی مرۆڤ دەدات و بەکەرەستەو ئامرازی گرنگیان لەقەڵەم دەدات بۆ تێگەیشتنی هەڵس و کەوت و کەسایەتی مرۆڤ بەڵام زۆر بەکەمی گرنگی بەگەشەکردنی ژیری و زانیاری و ڕەوشتی بینراوو زمان و زیرەکی مرۆڤ دەدات.

بەڕای فرۆید، گەشە كردنی منداڵ پابەندە بەكار لێكردنی ڕەمەك و پاڵنەرە فسیۆلۆژیەكانی لەلایەك و هێزو داب و نەریتی دەرەكی لەلایەكی تر. ئینجا ئەگەر مرۆڤ توانی حەزو ئارەزوو پاڵنەرەكانی تێر بكات بەمەرجێك دڵی هێزی دەرەكی (كە خۆی لەداب و نەریت و یاسای كۆمەڵایەتیدا دەبینێتەوە) لەخۆی نەڕەنجێنێت واتە ئەگەر توانی هاوسەنگیەك لەنێوان هێزی دەرەكی و هێزی ناوەكیدا دروست بكات ئەوا ئەو كاتە مرۆڤێكی ئاسایی دەبێت و دەتوانێت خۆی لەتەك ژینگەكەیدا بسازێنێ. بەڵام هەر چ كاتێك یەكێك لەو دوو هێزە زاڵ بوو، واتە ئەگەر ڕەمەك و پاڵنەرە فسیۆلۆژیەكان یان هێزی داب و نەریت و یاسای كۆمەڵایەتی بەتەنها زاڵ بوو ئەو كاتە منی (ego) ئەو كەسە لاواز دەبێت و تووشی كۆمەڵێك گرێی دەروونی و مل ملانێی ناوەكی دەبێت و تاكێكی نەخۆش و دەردەدار دەردەچێت. شایانی ئاماژە بۆ كردنە كە فرۆید كەسایەتی مرۆڤ دابەش دەكات بۆ سێ بەش كە ئەوانیش بریتین لە ئەو (ID)، من (ego)، منی باڵا (Super ego).

هەروەها گەشەكردنی سێكسی منداڵان بەتایبەتی و مرۆڤی گەورە بەگشتی بەسەر پێنج (٥) قۆناغدا دابەش دەكات كە بریتین لەقۆناغەكانی (دەمی، كۆمی، ئەندامی زاووزێ، مت بوون، سێكسی ڕاستەقینە) بەبۆچوونی فرۆید منداڵ لە هەریەك لەو قۆناغانەدا وەك دیاری كراوە تام و چێژی سێكسی لەبەشێك لەئەندامەكانی لەشی وەردەگرێت. فرۆید بەپلەی یەكەم گرنگی بەدوو پاڵنەری سەرەكی كە ئەوانیش ڕەمەكی ژیان و ڕەمەكی مردنن دەدات، واتە مرۆڤ هەر لەكاتی دروست بوونیەوە دوو پاڵنەری دژ بەیەك لەناخیدا خۆیان حەشار داوە، هەروەها گرنگیەكی زۆریش بەپێنج ساڵی یەكەمی ژیانی منداڵ دەدات و بەبناغەی دروست بوونی كەسایەتی مرۆڤی دادەنێت، لەو پێنج ساڵەی یەكەمی ژیاندا پەیوەندی هەڵچوونی و سۆزی و كۆمەڵایەتی نێوان منداڵ و دایك و باوكی گرنگیەكی زۆری لەسەر گەشە كردنی هەیە، ئەگەر پەیوەندییەكە دۆستانەو مرۆڤانە بێت، ئەو كاتە منداڵ بەشێوەیەكی ئاسایی گەشە دەكات، بەڵام ئەگەر پەیوەندی نێوان منداڵ و كەسانی چواردەوری توندوتیژی و هەڕەشەی لەخۆ گرت و منداڵ لەكاتی پرۆسەكانی (شیر خواردن، ڕاهێنان لەسەر پاشەڕۆ، لەشیر برینەوە، فێربوونی زمان و پێ گرتن... هتد) هەستی بەئازارو سوكایەتی كرد، ئەو كاتە گەشە كردنی ئاسایی منداڵ دەكەوێتە مەترسیەوە. كەواتە گەشەكردنی سروشتی منداڵ پشت بەژینگەكەی و ئەو كۆسپ و بەربەستانەی كە دێتە سەر ڕێگای دەبەستێت، ئەگەر ژینگە توانی پێداویستیەكانی منداڵ تێر بكات و لە خەفەكردن و ململانێ و گرێی دەروونی دووری بخاتەوە، ئەو كاتە كەسایەتی منداڵ ئاسایی دەبێت.

***<u>لەكۆتایی باسكردنی ئەم تیۆرانە چەند پرسیارێك سەر هەڵدەدات، لەوانە ئایا كام لەو تیۆرانە لەهەموویان ڕاسترە؟ ئایا كامیان لەهەموویان خراپترە؟</u>***

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە دەبێت بەچاوێكی زانستیانە بڕوانینە كەسایەتی مرۆڤ و پێكهاتەكانی، ئەوەی ڕوون و ئاشكرایە، كەسایەتی مرۆڤ لەهەموو لایەنەكانی (زیری، هەڵچوونی، كۆمەڵایەتی، جووڵەیی، جەستەیی) پێك دێت بەڵام كاتێك سەیری پرانسیپەكان و ناوەرۆكی هەریەك لەو تیۆرانەی پێشوو دەكەین، ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە هەریەك لەو تیۆرانە لەگۆشە نیگای

تایبەتی خۆیەوە سەیری كەسایەتی مرۆڤی كردووەو تەنها لایەكی كەسایەتی خستۆتە بەر باس و لێكۆڵینەوەو لایەكانی تری پشت گوێ خستووە، كەواتە هەموو ئەو تیۆرانەی سەرەوە ڕاستن و لایەكی ڕاستیان پێكاوە، هەرچەندە هەریەكەیان كەم و كورتی و نووقستانی زۆریان تێدایە، بەڵام بەهەر هەموویان ئینجا زۆربەی كەسایەتی مرۆڤیان تاووتوێ كردووە. بۆ نموونە تیۆری فرۆید بەزۆری گرنگی بەلایەنی هەڵچوونی مرۆڤ داوە لەكاتێكدا تیۆری فێر بوونی كۆمەڵایەتی گرنگی بەرەوشتی بینراوی دەرەكی كۆمەڵایەتی داوە، بەڵام تیۆرەكانی پێگەیشتن گرنگیان بەڕۆڵی كۆئەندامە بایۆلۆژیەكان داوە لەكاتێكدا تیۆری جان پیاجیەو هاوەڵەكانیان گرنگیان بەڕۆڵ و كاریگەری منداڵ و ژینگەكەی لەسەر گەشەكردنی زانیاری و ژیری منداڵ داوە (هرمز، ١٩٨٨، ص٢٢-٢٦).

## پرانسیپەکانی گەشەکردن

**گەشەکردن:**

مەبەست لەگەشەکردن سەرجەم ئەو گۆڕانکارییانەیە کەلەئەنجامی کارلێککردنە کیمیاویەکانی ناو لەشەوە ڕوو دەدەن و دەبنە هۆی زیاد بوونی درێژی و کێش و بارستایی لەش، بەمەبەستی گەیشتن بەئاکامە سەرەکیەکەی کەئەویش خۆی لەتەواو بوونی گەشەکردن و پێگەیشتن و بەردەوام بوونیدا دەدۆزێتەوە.

**پرانسیپەکانی گەشەکردن:-**

گەشەکردن پرۆسەیەکە بەپێ ی کۆمەڵێک پرانسیپ (مبادیء) و یاسای نەگۆڕ ڕوو دەدات و دوورە لەهەڕەمەکی و لابەلایی. هەروەها ئەو پرانسیپانە سنووری هەردوو یەکەی کات و شوێن دەبەزێنن، واتە هەموو بوونەوەرەکان (بەتایبەتیش منداڵی مرۆڤ) بەپێ ی ئەو پرانسیپانە گەشەدەکەن، ئیتر لەهەرچ کات و شوێنێک بن.

*پرانسیپەکانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:-*

**١) گەشەکردن هەردوو گۆڕانکاری چەندێتی و چۆنێتی (التغيرات الكمية والنوعية) لەخۆ دەگرێت.**

واتە کاتێک یەکێک لەئەندامەکانی لەشی مرۆڤ لەلایەنی چەندێتیەوە (کێش، درێژی، بارستایی) ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گەشە دەکات و زیاتر دەبێت، لەهەمان کاتیشدا چۆنیەتی کارکردنی ئەو ئەندامە لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر دەگۆڕێ. دەتوانین بەم نموونەی لای خوارەوە زیاتر ئەو پرانسیپە ڕوون بکەینەوە. ئەگەر سەیری یەکێک لەئەندامەکانی کۆئەندامی هەرسکردن بکەین ئەویش گەدەیە، دەبینین ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەلایەنی چەندێتیەوە کێش و درێژی و بارستایی زیاتر دەبێت لەهەمان کاتیشدا لەلایەنی چۆنیەتیەوە کارو فەرمانەکانی لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەگۆڕدرێت. بۆ نموونە گەدەی منداڵ لەسەرەتای ژیانیدا، لەلایەنی چۆنیەتیەوە تەنها دەتوانێت شلەمەنی و خواردنی

سووکە هەرس بکات، بەلام وردە وردە لەئەنجامی گەشەکردنەوە چۆنیەتی کارو فەرمانەکانی دەگۆڕدرێت و دەتوانێت خواردنی قورس و ڕەق و ووشک هەرس بکات و دوای ئەوەش دەتوانێت خواردنی قورسترو ووشکترو ڕەقتر هەرس بکات.

**٢) گەشەکردن پرۆسەیەکی بەردەوامو ڕێکو پێکەو دوورە لەپچڕانو ناڕێکی:-**

واتە چرکەیەک نیە لەژیانی مرۆڤدا پرۆسەی گەشەکردن تیایدا بوەستێت، بەڵکو لەهەموو کات و شوێنێک ڕێچکەی ئاسایی خۆی هەیەو بەچەند پلەو قۆناغێکی یەک لەدوای یەکدا تێدەپەڕێت. بۆ نموونە، فێربوونی پێگرتن و ڕۆیشتن لەلای منداڵ بەچەند قۆناغێکی بەردەوام و ڕێک و پێکدا تێدەپەڕێت ئەویش بەم شێوەی لای خوارەوە (لەسەر پشت پاڵ کەوتن ـــــ خۆ هەڵگەڕاندنەوە بۆ سەر سک ـــــ خۆخشان لەسەر سک بەیارمەتی هەردوو دەست ـــــ ئینجا هەردوو دەستو قاچ ـــــ گاگۆڵکێ ـــــ دانیشتن ـــــ دارە دارە ـــــ ڕۆیشتن لەسەر هەردوو قاچ.....) بێگومان هەموو پرۆسەکانی تریش هەمان ڕێک و پێکی و بەردەوامیان تێدا هەیەو بەهیچ شێوەیەک ناتوانرێت بەسەر یەکێک لەو قۆناغانەدا باز هەڵبدرێت و پیایدا تێنەپەڕێت، واتە هەموو منداڵانی جیهان دەبێت یەکەم جار گاگۆڵکێ بکەن، پێش ئەوەی بتوانن دابنیشن، دەبێت دابنیشن پێش ئەوەی بکەونە دارە دارەو بەیارمەتی کەسانی چوار دەور لەسەر هەردوو قاچ بڕۆن.

**٣) تێکرایی ڕێژەی گەشەکردن دەگۆڕدرێو لەهەموو قۆناغەکانی ژیاندا وەک یەک نین.**

واتە ڕێژەی گەشەکردن لەقۆناغی پێش لەدایک بوون وەک ڕێژەی گەشەکردنی دوای لەدایک بوون نییە، بەڵکو ڕێژەی گەشەکردن لەقۆناغی پێش لەدایک بوون زۆر زۆر خێرایەو هیچ قۆناغێکی تر لەژیانی مرۆڤدا نییە، کەخێرایی گەشەکردن تیایدا بگاتە قۆناغی پێش لەدایک بوون، چونکە لەماوەی (٩) نۆ مانگ و (٩) نۆ ڕۆژدا کەدادەنرێت

بەقۆناغی پێش لەدایکە بوون کێشەکەی نزیکەی (٣) کیلۆ زیاد دەکات و درێژییەکەشی نزیکەی (٤٥) سم چلوپێنج سانتیمەتر زیاد دەکات. بەلام لەهیچ قۆناغێکی تری ژیانی مرۆڤدا نییە کەهەموو (٩) مانگ و (٩) ڕۆژێک کێشی مرۆڤ (٣) کیلۆ و درێژیەکەشی (٤٥) سم زیاد بکات. (السید، ١٩٧٤، ص١١٩-١٢٠).

٤) هەریەک لەلایەنەکانی گەشەکردنی مرۆڤ ڕێژەو خێرایی تایبەتی خۆی هەیە.

واتە هەموو لایەنەکانی گەشەکردن (ژیریی، جەستەیی، هەلچوونی، کۆمەلایەتی) لەیەک کات و قۆناغدا بەیەک ڕێژەو خێرایی گەشە ناکەن، بەلکو هەر قۆناغ و لایەنە تایبەتمەندیتی خۆی هەیە. بۆ نموونە لەسالی یەکەمی ژیانی منداڵدا، لایەنی جەستەیی خێراتر لەلایەنی کۆمەلایەتی گەشەدەکات، بەلام لەسالی دووهەم و سیهەم لایەنی کۆمەلایەتی زیاتر لەلایەنی جەستەیی گەشەدەکات. هەرزەکار لەدوای یەک دوو سال لەچوونە ناو قۆناغی هەرزەکاریدا، لەلایەنی جەستەییەوە گەشەی بەرەو نیمچە تەواو بوون دەڕوات، بەلام لەلایەنی هەلچوونیەوە هێشتا هەر منداڵەو وەک لایەنەکانی ژیری و کۆمەلایەتی گەشەی نەکردووەو کەمتر لەلایەنی جەستەیی گەشەی کردووە.

٥) گەشەکردن لەلای مرۆڤ بەرەوتاکایەتی ڕێچکە دەگرێت.

گوتەیەک هەیە دەلێت (مرۆڤ وەک هەموو کەس وایە، وە وەک هەندێک کەسیش وایەو بەلام لەهیچ کەسێکیش ناچێت) ئەمە مەتەڵ نیە، بەلکو یەکێکە لەپرانسیپ و یاساکانی گەشەکردن، چونکە منداڵی مرۆڤ لەسەرەتای ژیانیدا وەک هەموو منداڵانی جیهان وایە، واتە هەموویان لەلایەنی جەستەیی و ژمارەی ئەندامەکانی لەش و پێکهاتە فسیۆلۆژیەکانیانەوە چوون یەکن، ئەی هەموویان وەکوو یەک دوو دەست و دوو قاچ و یەک سەریان هەیە بەلام دوای ژیان لەناو کۆمەڵ، ئیتر ورردە ووردە جیاوازی لەنێوان منداڵاندا (بەپێ ی جیاوازی بۆ ماوەو ژینگەی کۆمەلایەتی و جوگرافی و ئابووری و

رامیاری) دروست دەبێت، کۆمەڵێک منداڵ درێژ ، کۆمەڵێکی تر کورت، کۆمەڵێک زۆر زیرەک یان زۆر تەمبەڵ یان ڕەش پێست یان جیاواز لەداب و نەریتی کۆمەلایەتی، بەلام دوای ماوەیەک ژیان لەناو کۆمەڵ مەحاڵە لەناو ئەو کۆمەڵە منداڵە لێک چووانەشدا، دوو منداڵی وەکوو یەک لەهەموو لایەنەکانی گەشەکردنەوە (جەستەیی، ژیری، کۆمەلایەتی، هەڵچوونی) بدۆزینەوە تەنانەت ئەگەر ئەو دوو منداڵەش دووانەی وەکوو یەک (جمک) بن و لەیەک مێلکەی پیتێنراو دروست بووبن کەلەلایەنی بۆماوەوە لەسەدا سەد وەکوو یەکن، چونکە زۆر زەحمەتە خێزان و دامودەزگا کۆمەلایەتیەکانی تر بتوانن بەیەک شێوە ئەو دوو منداڵە پەروەردە بکەن و یەک ژینگەی کۆمەلایەتی و دەروونی و جوگرافیان بۆ بخولقێنن.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو بۆچوونەی سەرەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە هەرچەندە زۆربەی منداڵانی جیهان لەسەرەتای ژیاندا جیاوازییەکی زۆر لەنێوانیاندا نیە، بەلام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەئەنجامی گەشەکردنەوە جیاوازی زیاتر دروست دەبێت، تا لەقۆناغەکانی هەرزەکاری و کامڵیدا بەهیچ شێوەیەک دوو مرۆڤی وەک یەک نادۆزینەوە.

٦) پرۆسەی گەشەکردن بەڕیچکەی درێژی ستوونی (واتە لەسەرەوە بۆ خوارەوە) وە بەپانی ئاسۆیی (واتە لەناوەندی لەشەوە بۆ ئەم لاو لاو تەنیشتەکان) گەشە دەکات و ئاراستە وەردەگرێت.

واتە گەشەکردنی کۆرپەلە لەناو منداڵدانی دایکدا لەسەرەوە دەست پێدەکات. ئەی یەکەم جار سەری منداڵ دروست دەبێت ئینجا ملی، ئینجا سنگی تا دواهەمین جار پێ یەکانی دروست دەبێت، بەهەمان شێوە یەکەم جار ئەندامەکانی ناوەڕاستی لەش دروست دەبن، ئینجا شان و باسک و قۆڵ و دواهەمین جاریش دەست و پەنجەکان. هەمان پرۆسەش لەلایەنی جووڵەی ئەندامەکانی لەشەوە دووبارە دەبێتەوە.

واتە یەکەم جار منداڵ دەتوانێت بەسەر جووڵەی سەرو ملیدا زاڵ بێت، ئینجا جووڵەی سنگ و ناوقەد، دواهەمین جاریش دەتوانێت بەسەر جووڵەی هەردوو لاقەکانیدا زاڵ بێت و فێری ڕۆیشتن ببێت. هەروەها منداڵ یەکەم جار دەتوانێت بەسەر جووڵەی سنگ و شانەکانیدا زاڵ بێت، ئینجا قۆڵ و باسک و دواجاریش دەستی، تاوای لێ دێت بەویستی خۆی زاڵ بێت بەسەر جووڵەی پەنجەکانی دەستداو بۆ مەبەستی نووسین و هەلگرتن بەکاریان بهێنێ. بەڵام لەقۆناغی بەساڵاچووندا (پیری) ئەو پرۆسەیە پێچەوانە دەبێتەوە، واتە یەکەم جار مرۆڤی بەساڵاچوو دەسەڵاتی بەسەر جووڵەی دەست و قاچیدا نامێنێت ئینجا ناو قەدو سنگ و شان دواهەمین جاریش جووڵەی سەرو ملی.

٧) گەشەکردن پرۆسەیەکی هەمەلایەنەیە، هەموو لایەنەکانی گەشەکردن پابەندن بەیەکترییەوەوکاریگەریان لەسەر یەکتری هەیە، واتە هەر چ لایەنێک پێشکەوتن و سەرکەوتن بەدەست بهێنێت ئەو کاتە دەبێت بەهۆکارێکی یارمەتیدەر بۆ پێشکەوتن و سەرکەوتنی لایەنەکانی تر، بەپێچەوانەشەوە کەم و کورتی و دواکەوتنی لایەنێک ڕەنگ دانەوەی خراپی دەبێت لەسەر لایەنەکانی تر، بۆ نموونە، ئەگەر منداڵ لەش ساغ و پتەو و سەلامەت بێت ئەوا بەقازانجی لایەنەکانی تر تەواو دەبێت، واتە ئەو منداڵە زووتر پێدەگرێت و فێری قسەکردن دەبێت و لایەنی ژیری و کۆمەڵایەتیشی خێراتر گەشەدەکات، ئەگەر بەراورد بکرێت بەمنداڵێکی نەخۆش و لاواز، لەلایەکی ترەوە ئەگەر منداڵ تووشی دواکەوتنی ژیری (التخلف العقلي) بوو بوو، ئەوا ئەو دواکەوتنە زیانێکی گەورە بەگەشەکردنی زمان و ڕۆیشتن و لایەنی کۆمەڵایەتی ئەو منداڵە دەگەیەنێتو وەک منداڵێکی ئاسایی گەشە ناکات.

## گەشەکردن لەقۆناغی پێش لەدایک بوون

زۆر لەخەڵکی لەو بڕوایەدان کەژیانی مرۆڤ دوای لەدایک بوون دەست پێدەکات، هەر ئەم بیروباوەڕە هەڵەیەشە کەوای لەو خەڵکانە کردووە کەتەمەنی مرۆڤ لەو کاتەوە بژمێرن کەمنداڵ لەدایک دەبێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەهەموو ڕووداوو بەسەرهاتەکانی پێش لەدایک بوون هیچ گرنگیەکی لەسەر گەشەکردن و پێشکەوتنی ئەو منداڵە نیە لەپاشەڕۆژدا. بەڵام دەرئەنجامی هەموو توێژینەوەکان و ڕاستیەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەقۆناغی پێش لەدایک بوون گرنگترین و ناسکترین قۆناغی ژیانی مرۆڤە، لەبەر ئەوە بەهیچ شێوەیەک نابێت پشتگوێ بخرێت، چونکە ژیانی ڕاستەقینەی مرۆڤ لەپێش لەدایک بوونەوە دەست پێدەکات.

### چۆن منداڵ دروست دەبێت؟

هەموو (٢٨) بیست و هەشت ڕۆژ جارێک یەکێک لەهێلکەدانەکانی ئافرەت دەست دەکات بەدەرهاویشتنی یەکێک لەهێلکە پێگەیشتووەکان کەئەویش بریتیە لەخانەیەکی زاووزێ، کە(٢٣) بیست و سێ تاکە کرۆمۆسۆمی تێدایەو بارستاییەکەی زۆر زۆر بچووکترە لەسەری دەرزییەک. ئەم هێلکەیە دوای هاتنە دەرەوەی لەهێلکەدان دەست دەکات بەجووڵە بەناو جۆگەلە(قناة) ی ڤالوپدا، کەهێلکەدان بەمنداڵدانی دایکەوە دەبەستێتەوە. ئا لەو کاتەی کەهێلکەکە لەناو جۆگەلەی ڤالوپدایە، ئەگەر ڕێکەوتی سپێرمی پیاوی کرد {کەبریتیە لەخانەیەکی نێر، کەئەویش (٢٣) تاکە کرۆمۆسۆمی تێدایە}و ئەو سپێرمە توانی دیواری هێلکە ببڕێت، ئەو کاتە هێلکەکە دەپیتێندرێت و بەزایگۆت ناو دەبرێت و دەبێت بەیەکەم چرکەی دروست بوونی ژیانی کۆرپەلە.

کەواتە ژیانی ڕاستەقینەی مرۆڤ یەکسەر لەدوای پیتاندنی ئەو هێلکەیە دەست پێدەکات، وەهەر لەو کاتەدا یەکسەر تۆخمی منداڵەکە نێر بێت یان مێ دیاری دەکرێت و هەموو خاسیەتەکانی بۆماوە لەدایک و باوکەوە بۆ منداڵەکە دەگوێزرێتەوە.

## قۆناغەکانی پێش لەدایک بوون

زانایانی کۆرپەلە (علماء الأجنة) ژیانی پێش لەدایک بوونی مرۆڤ بەسەر سێ قۆناغی سەرەکیدا دابەش دەکەن کەبریتین لە:-

### ١ - قۆناغی هێلکەی پیتێنراو (زایگۆت):

ئەم قۆناغە یەکسەر لەو چرکەیەوە دەست پێ دەکات کەهێلکەی دایک بەسپێرمی باوک دەپیتێندرێ و نزیکەی ماوەی (٢) دوو هەفتە بەردەوام دەبێت. لەم قۆناغەدا هێلکەی پیتێنراو لەجۆگەلەی ڤالوبەوە بەرەو منداڵدانی دایک سەرەو خوار ڕێچکە دەگرێت، دوای گەیشتنە ناو منداڵدان، یەکسەر خۆی بەدیواریدا هەڵدەواسێت و ئیتر دەبێت بەبەشێکی فسیۆلۆژی دایک و هێلکەی پیتێنراو لەهەموو لایەنێکەوە پشت بەدایک دەبەستێت بۆ گەشەکردنی وەهەر لەڕێگەی خوێنی دایکەوە ئەو زایگۆتە هەموو پێداویستیەکانی بەردەوام بوونی ژیانی دەست دەکەوێت.

ئالەم قۆناغەدا کۆمەڵێک گۆڕانکاری گرنگ ڕوودەدات، یەکسەر دوای (٣٦) سی و شەش کاتژمێر، هێلکەی پیتێنراو کەبریتیە لەیەک خانە دەبێت بە(٢) خانە ئینجا لەئەنجامی دابەش بوونەوە دەبێت بە(٤) خانە، ئینجا دوای (١٦) شانزدە کاتژمێر دەبێت بە(٨) خانە ئینجا دەبێت بە(١٦)، (٣٢)، (٦٤)، ١٢٨٠) خانە...هتد.

بەم شێوەیە ژمارەی خانەکان بەردەوام لەزیاد بووندا دەبێت، دوای ماوەیەک بۆشاییەک لەنێوان خانەکاندا دروست دەبێت و خانەکان دەبن بەدوو کۆمەڵ، کۆمەڵی یەکەم ناو دەبرێت بەخانەکانی دیوی دەرەوە، کەئەرکی سەرەکی دابین کردنی خۆراک و پێداویستیەکانی تری ژیانی کۆرپەلەو پارێزگاری کردنیەتی، بەڵام کۆمەڵەی دووەم ناو دەبرێت بەخانەکانی ناوەوەو کۆرپەلەی لێ دروست دەبێت. هەر لەم کاتەشدا لەشی

دایک خواردنی پێویست لەرێگەی خوێنەوە بۆ منداڵدان و کۆرپەلەکەی دابین دەکات.
(هرمز،١٩٨٨، ص٤٠)، (فهمي، ١٩٧٧، ص٣٥-٣٦).

**٢) قۆناغی ئیمپریۆنی:**

ئەم قۆناغە نزیکەی (٦) شەش هەفتە بەردەوام دەبێت و کۆمەڵێک گۆڕانکاری گرنگ تیایدا بەسەر ژیانی کۆرپەلەدا ڕوودەدات لەوانە:-

ا) یەکسەر لەو خاڵەی کەکۆرپەلە خۆی بەمنداڵدانی دایکدا هەڵواسیوە، ویلاش (پلاسینتا، المشیمة) دروست دەبێت، کەئەرکی سەرەکی گواستنەوەی ئۆکسجین و خۆراک و پێداویستیە گرنگەکانی ترە لەخوێنی دایکەوە بۆ خوێنی کۆرپەلە بەپێچەوانەشەوە گواستنەوەی پاشەڕۆیە لەخوێنی کۆرپەلەوە بۆ خوێنی دایک. پێویستە ئەوەشمان لەبیر نەچێت، کەویلاش ڕەگەزەکانی ناو خوێن دەگوێزێتەوە نەک خوێنی دایک بۆ منداڵ یان بەپێچەوانەوە.

ب) لەهەمان کاتدا پەتکە ناوک (الحبل السري) دروست دەبێت، کەئەرکی سەرەکی بەستنەوەی منداڵە بەویلاشەوە، دواجاریش کیسە سولی (الکیسی السلی) دروست دەبێت، کەبەلانەی گەشەکردنی منداڵ دەناسرێت، وەئەم کیسەش پڕە لەشلەیەک کەناو دەبرێت بەشلەی سولی و منداڵ تیایدا مەلەدەکات. بێگومان ئەو کیسەو شلەکەی ناوی تائەوپەڕی توانا پارێزگاری لەکۆرپەلە دەکەن و ناهێڵن هێزو پاڵەپەستۆی نائاسایی دەرەوە کار لەکۆرپەلە بکات و تووشی زەرەرو زیانی بکات، چونکە کاتێک لایەکی سکی دایک تووشی پاڵەپەستۆو ئازار و هێزی دەرەکی دەبێت، ئەوا کۆرپەلە یەکسەر بەمەلە لەناو شلەکەدا بەئاسانی بەرەو لایەکەی تری سکی دایک دەڕوات، بەمەش لەو پاڵەپەستۆو ئازارو هێزە دەرەکیەی سەر سکی دایک ڕزگاری دەبێت.

**جـ) لەم قۆناغەدا خانەکانی لەش بەسەر (٣) چیندا دابەش دەبن کەبریتین لە:-**

١) چینی دەرەوە (Ectoderm) کەئەم کۆمەڵە خانەیە دیوی دەرەوەی لەشی کۆرپەلەی لێ دروست دەبێت لەوانە پێست، پرچ و قژ، نینۆک، ددان، پێستە گلاندەکان، هەستەوەرە خانەکان، کۆئەندامی دەمار...هتد.

٢) چینی ناوەڕاست (Mesoderm) وەئەم کۆمەڵە خانەیەش دەبێت بەبناغە بۆ گەشەکردنی ماسولکەو ئێسقانەکان و کۆئەندامی سوڕی خوێن و ئەندامەکانی دەرهاویشتن و سەرجەم ئەندامەکانی ناوەڕاستی لەشی مرۆڤ (کونجر، ١٩٧٠، ص٨١).

٣) چینی ناوەکی (Endoderm) ئەم کۆمەڵە خانەیەش دەبێت بەبناغە بۆ دروست بوونی ئەندامەکانی هەناوو ناو سکی مرۆڤ وەک سیەکان، جگەر، گەدە، پەنکریاس، ئەوەی جێگەی ئاماژە بۆ کردنە کەلەکۆتایی هەفتەی هەشتەمی ژیانی کۆرپەلەدا هەموو پێکهاتووەکانی جەستەی بەلایەنی کەمەوە وەک پێکهاتوەکانی جەستەی مرۆڤێکی کامڵ وایە، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر بچووک، دەبێت ئەوەشمان لەیاد نەچێت کەئەم قۆناغە زۆر ناسک و ترسناکە، ئەگەر ئافرەتی دوو گیان زۆر ئاگاداری خۆی نەبێت، ئەوا دوور نیە کەچارەنووسێکی ڕەش و ترسناک ڕووبەڕووی ئەو کۆرپەلەیە ببێتەوە، لەهەمووشیان ترسناکتر لەبارچوونە کە کۆتایی بەژیانی ئەو کۆرپەلەیە دەهێنێ، بەڵام ئەگەر منداڵەکەش لەبار نەچێت، ئەوا دوور نیە منداڵێکی لاواز و نووقستان و دەردەدار لەدایک ببێت، کەبەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێک هۆکار لەوانەش نەخۆش کەوتنی دایک بەهەندێک نەخۆشی ترسناک یان بەدخۆراکی، یان بەکارهێنانی داوو دەرمانی نائاسایی بۆ گەشەکردنی کۆرپەلە...هتد.

### ٣ - *ڤیتۆسە قۆناغ:*

ئەم قۆناغە لەدوای تەمەنی (٨) هەشت هەفتەیی ژیانی کۆرپەلەوە دەست پێدەکات تا کاتی لەدایک بوون، لەم قۆناغەدا کۆمەڵێک ڕووداوی گرنگ ڕوودەدەن کەلەهەموویان گرنگتر گەشەکردن و پێگەیشتنی هەموو ئەو ئەندامانەیە کەلەقۆناغی

پێشوودا بناغەی داڕێژراوە، تاوای لێ دێت هەفتە دوای هەفتە ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلە یەک لەدوای یەک بەرەو پێگەیشتن و تەواو بوونیان دەچن. بۆ نموونە کۆرپەلە لەهەفتەی (٩) نۆهەمدا توانای وەڵام دانەوەی دەست لێدانی منداڵدانی دایکی هەیەو دەشتوانێت سەری بجوڵێنێت، دوای تەواو بوونی مانگی سێهەمیش درێژی کۆرپەلە دەگاتە (٣) بۆسەوە کێشەکەی (٩٨٥ر٠) کغم، وەشێوەشی وەک مرۆڤێکی ئاسایی لێ دێت، هەرچەندە سەری زۆر زۆر گەورەیەو لەگەڵ بارستایی جەستەیدا ناگونجێت، هەروەها کۆمەڵێک جووڵەی هەرەمەکی دەست و قاچ دەردەکەوێت لەگەڵ دروست بوونی پێڵوی چاوو نینۆک وە توخمی کۆرپەلەش بەئاشکرا دەردەکەوێت. لەکۆتایی مانگی (٤) چواردا درێژی کۆرپەلە دەگاتە (١١,٥) یانزە سانتیمەترو نیو، وە بۆ زیاتر زانیاری دەتوانین سوود لەو وەسفەی زانای ئەمریکی جیزل وەربگرین کەبەم شێوەی لای خوارەوە باسی جووڵەی کۆرپەلە لەمانگی چوارەمدا دەکات:-

*(لێوی سەرەوەی دەجوڵێنێت، ئەگەر زیاتر گەشەی کرد ئەوکاتە دەتوانێت لێوی خوارەوەشی بجوڵێنێ، ئینجا هەردووکیان پێکەوە، هەروەها دەتوانێت دەمی بکاتەوەو داشی بخات و پرۆسەی قووت دان بەئەنجام بگەیەنێت لەکاتێکدا دەمیشی داخراوە. هەندێک جار ڕێکەوتیش دەکات کەتەنانەت شلەی سولی قووت بدات. زمانی دەجوڵێنێت، سەری وەردەگێڕێ، دایک بەئاسانی دەتوانێت لەمانگی چواردا هەست بەجووڵەی کۆرپەلە بکات) (هرمز،١٩٨٨، ص٤٣).*

لەماوەی مانگی پێنجەمی ژیانی کۆرپەلەدا درێژییەکەی دەگاتە (٢٥,٥) سم ،زیاتر شێوەی لەمرۆڤی کامڵ نزیک دەبێتەوەو پێستی زیاتر گەشە دەکات و نینۆک و پرچ دەردەکەون، هەروەها عەرەقە گلاند گەشەدەکات. وە لەمانگی (٦) شەش پێکهاتەی چاو تەواو دەبێتو هەستەوەری تام کردن و خانەکانی تایبەت بەتام و چێژ لەسەر زمان دەردەکەوێت و لەتوانای کۆرپەلەدا هەیە کەهەناسە بدات و وەربگرێتەوە، لەبەر ئەوە ئەگەر ڕێکەوتی کرد لەم مانگەدا لەدایک بوو ئەوا لەتوانایدا هەیە کەبەنووزە نووزێک

بگرێ. مانگی (٧) هەفت خاڵێکی ناسکە و ترسناکەو جۆرە وەرچەرخانێکە لەژیانی کۆرپەلەدا، ئەو مندالانەی لەم مانگەدا لەدایک دەبن، تاڕادەیەکی گونجاو بواری ژیان و مانەوەیان بۆ دەڕەخسێت، چونکە کۆئەندامەکانی (سوڕی خوێن، دەمار، هەرس) تاڕادەیەکی باش پێگەیشتون کەیارمەتی مانەوەی ژیانی منداڵ دەدەن.

هەروەها لەم قۆناغەدا لەتوانای کۆرپەلەدا هەیە کەهەست بەگۆڕانکارییەکانی پلەی گەرما بکات و تامی خواردنەکان و بۆنە سەرەکیەکان لەیەکتری جیابکاتەوە و تاڕادەیەکیش توانای بینین و بیستنی هەیە بەڵام کەمتر لەو مندالانەی کەدوای (٩) مانگو (٩) ڕۆژ لەدایک دەبن، لەبەر ئەوە تاماوەی مانەوەی کۆرپەلە لەناو منداڵداندا زیاتر بێت و ماوە سروشتیەکەی خۆی تەواو بکات ئەوا ئەوەندە زیاتر هەموو ئەندامەکانی لەشی گەشە دەکات و منداڵێکی ئاسایی دەبێت.

## ئەو هۆکارانەی کار دەکەنە سەر گەشەکردنی کۆرپەلە لەناو منداڵدانی دایکدا

گەشەکردنی مرۆڤ هەر لەیەکەم چرکەی خوڵقاندنیەوە لەمنداڵدانی دایکداو گەورە بوونی لەخانەیەکەوە (کەبریتیە لەهێلکەیەکی پیتێنراوی دایک) بۆ ملیۆنەها خانەی زیندوو، بەچەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت، لەگرنگترین ئەو قۆناغانەش، قۆناغی کۆرپەییە (پێش لەدایک بوون) کەنزیکەی نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ دەخایەنێت.

ئەم قۆناغە زۆر ناسک و گرنگە لەژیانی مرۆڤداو دادەنرێت بەبناغەیەک بۆ کەسایەتی تاک لەداهاتوودا، لەم قۆناغەدا، کۆمەڵێک هۆکاری گرنگ هەیە، ئەگەر ڕەچاو نەکرێت و گرنگی پێ نەدرێت، ئەوا کاریگەری ترسناکیان لەسەر گەشەکردنی کۆرپەلە دەبێت و گرفت و پەشێویەکی زۆری بۆ دروست دەکەن، لەگرنگترین هۆکارەکانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:-

۱) نەخۆش کەوتنی دایک:-

نەخۆش کەوتنی دایک کاریگی خراپ دەکاتە سەر کۆرپەلە، لەبەرئەوەی نەخۆشی (پێکهاتەی خوێن تێک دەدات و کاردەکاتە سەر پرۆسەی میتاپۆلیزم، کەئەمەش گەشەکردنی کۆرپەلە لەرێچکەی ئاسایی خۆی لادەدات) (زهران، ۱۹۸۱،ص۸۷). لەترسناکترین ئەو نەخۆشیانەش سورێژەی ئەڵمانیە کەزۆرجار دەبێتە هۆی کەرولاڵی یان نەخۆشی دڵ و دواکەوتنی ژیری، هەروەها نەخۆشی تای قرمزی و تێک چوونی کاری کوێرە گلاندەکان و چەند نەخۆشیەکی تر کەکۆرپەلە بەهۆیانەوە تووشی کۆمەڵێک گرفتو نەخۆشی دەبێت. ئینجا ئەگەر دایک تووشی یەکێک لەو نەخۆشیانە بوو بوو یان مەترسی تووش بوونیانی هەبوو، پێویستە نەهێڵێت سکی ببێت، بۆ ئەوەی منداڵێکی نەخۆشو دەردەدار لەدایک نەبێتو نەبێتە مایەی ئازارو دەردەسەری بۆ خۆی و خێزان و کۆمەڵەکەی.

۲) خۆراک:

خۆراکی دایک زۆر گرنگە بۆ گەشەکردنی کۆرپەلەکەی و سەرچاوەی وزەو بنیاتنەری ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەو دروست بوونی گشت شانەکانی لەشیەتی، لەبەرئەوەی کۆرپەلە گشت پێداویستیەکانی لەخۆراک لەرێگەی دایکەوە دەستی دەکەوێت، ئینجا ئەگەر هاتو دایکی سک پڕ خواردنەکەی خراپ بوو، زۆربەی پێداویستیەکانی گەشەکردنی کۆرپەلەی تێدا نەبوو. ئەو کاتە هەندێک لەئەندامەکانی لەشی کۆرپەلە بەتەواوی گەشە ناکات و تووشی بەدخۆراکی دەبێت و پێداویستیە سەرەکیەکانی بۆ دابین ناکرێت. دەرکەوتووە کەکەمی ڤیتامین (B)و پرۆتین و ئاڕێکیان لەخۆراکی دایکدا (دەبێتە هۆی کەموکورتی جەستەیی کۆرپەلەو، کەم خوێنی، لاوازی، دواکەوتنی ژیری کۆرپەلە) (قطامی، ۱۹۸۹، ص۱۹) هەروەها ئەو ئافرەتانەی کەتووشی بەدخۆراکی دەبن زیاتر منداڵیان لەبار دەچێت و پێش کاتی خۆیان لەدایک دەبن.

**٣) دەرمانو هۆکارە سرکەروهۆشبەرەکان:-**

زۆربەی ئەو توێژینەوانەی کەلەسەر ئەو ئافرەتە سکە پڕانە کراوە، کەبەڕێژەیەکی زۆر خەریکی مەی خواردنەوەو بەکارهێنانی ئەو هۆکارانەن کەدەبنە هۆی سەرخۆشکردن و بەزۆری ئەو دەرمانە پزیشکیانە بەکار دەهێنن کەبۆ ئارام کردنەوەو خاوکردنەوەی کۆئەندامی دەماری ناوەندییە، یان بۆ چارەسەرکردنی هەندێک نەخۆشی و هەڵئاوسانی سادەو یان لەکاتی نەشتەرگەریدا بەکاری دەهێنن وەک (باربتیورات، سیکونالی سۆدیۆم، تتراسایکلین...هتد)، یان جگەرەکێشن و بەڕێژەیەکی زۆر نیکۆتین وەردەگرن. ئەنجامی ئەو توێژینەوانە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کەزۆر لەمنداڵانی ئەو دایکانە تووشی کەم ژیری و نارێکی جەستەیی و لەبارچوونو مردنو لاوازی، یان پێش وەخت لەدایک بوون دەبن. لەبەرئەوە زۆر پێویستە کەئافرەتی دووگیان تا لەتوانایدا هەیە لەبەکارهێنانی ئەو داوو دەرمان و هۆکارەسرکەرو سەرخۆش کەرانە دوور بکەوێتەوە، بەتایبەتیش لەماوەی سکە پڕیدا (کونجر، ١٩٧٠)، (قطامی، ١٩٨٩).

**٤) باری جەستەیی و دەروونی:**

بەردەوام پێویستە ئافرەتی سکە پڕ ئاگاداری کارو فەرمانەکانی بێت و زۆر خۆی ماندوو نەکات، چونکە هەڵگرتنی شتی قوورس و گران و هیلاکە بوونی بەردەوام دەبێتە هۆی ئازاردانی دایک و لەبارچوونی کۆرپەلەکەی. زۆرجار ئەو ئافرەتانەی شتی قورس بەپشت هەڵدەگرن و کاری گران دەکەن و بەشوێنی بەرزدا سەردەکەون و ئاگایان لەتەندروستی خۆیان نیە، منداڵیان لەبار دەچێت یان منداڵەکانیان تووشی نووقستانی و کەم ئەندامی دەبن. هەروەها باری دەروونی دایک زۆر گرنگە بۆ کۆرپەکەی. ئەگەر هات و ئافرەتی دوو گیان لەژینگەیەکدا بوو کەپڕ بێت لەخەم و خەفەت و ترس و دڵەڕاوکێ و زۆربەی جار تووشی هەڵچوون ببێت، ئەو کاتە کۆرپەلەکەی زەرەرو زیانێکی نۆری پێدەگات. لەبەرئەوەی ئەو تووڕەیی و خەم و خەفەت و ترسەی دایک دەبێتە هۆی زیاد

بوونی دەرهاویشتنی کوێرە گلاندەکان بەتایبەتیش ئەدرنالینە گلاند کەئەمەش دەبێتە هۆی تێک چوونی پێکهاتەی خوێن و گواستنەوەی دەرئەنجامی ئەو بارە دەروونیە بۆ کۆرپەلە. لەبەرئەوە زۆر پێویستە کەئەندامانی خێزان و کەسانی چوار دەوری ئافرەتی دوو گیان، بارودۆخی لەبارو گونجاو بۆ دایکی سک پڕ بخولقێنن و تا دەتوانن دووری بخەنەوە لەترس و خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێ.

٥- تیشک گرتن (الأشعة):-

چەند پزیشک و دەروون زانێک توێژینەوەیەکیان لەسەر ژمارەیەک ئافرەتی سک پڕ کردوو لەتەکیاندا بەردەوام بوون تا منداڵەکانیان بوو. لەئەنجامدا بۆیان دەرکەوت، کەزۆربەی ئەو منداڵانەی تووشی دواکەوتنی ژیری و شێواندنی جەستەیی یان لەبار چوون بوون، هۆکانیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دایکانەی کەلەکاتی سک پڕیدا سک و چوار دەوری منداڵدانیان داوەتە بەر تیشک بەتایبەتیش تیشکی (×) و ڕادیۆم (کونجر، ١٩٧٠، ص٩١).

هەروەها زۆر لەدایکانی سک پڕ لەئەنجامی کارەساتی هەردوو شاری ناکازاکی و هیرۆشیمای یابانی تووشی لەبارچوون بوون و زۆربەی منداڵەکانیان بەنووقستانی لەدایک بوون. لەبەرئەوە زۆر پێویستە کەئافرەتی دوو گیان تا دەتوانێت دوور کەوێتەوە لەتیشک گرتن بەتایبەتیش لەکاتی سک پڕیدا.

٦) هۆکاری RH:-

لەئەنجامی توێژینەوەی زانستی دەرکەوتووە کە٨٦% ی مرۆڤ جۆرە مادەیەک لەخوێنیاندا هەیە کەناو دەبرێت بە (RH+) بەڵام ١٤% ئەو جۆرە ماددەیە

لەخوینەکانیاندا نیە، لەبەرئەوە ناسراون بە (RH-) . ئینجا ئەگەر ڕێکەوتی کرد خوێنی باوک لەجۆری (RH+) بوو، کۆرپەلەش جۆری خوێنەکەی لەباوکیەوە وەرگرت (RH+)، بەلام جۆری خوێنی دایک (RH-) بێت، ئەو کاتە لەئەنجامی جیاوازی (RH) لەنێوان ئەوو دایکیدا، مەترسی تووشی ژیانی کۆرپەلە دەبێت. لەبەرئەوەی خوێنی کۆرپەلە جۆرە ماددەیەک دروست دەکات کەناو دەبرێت بە(antigens) ئەم (antigens) لەڕێگەی پەتکە ناوک و ویلاشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ناو خوێنی دایک. کاتێک ئەم ماددەیە دەچێتە ناو خوێنی دایکەوە، خوێنی دایک دەست دەکات بەدروست کردنی مادەیەک دژ بەو ماددەیە کەناو دەبرێت بە(antibodies) ئەم ئەنتی بۆدیانەش ژەهراوی و مەترسیدارن بۆ کۆرپەلە. کاتێک ڕێژەی (antibodies) لەخوێنی دایک زیاد دەبێت، لەڕێگەی پەتکە ناوک و ویلاشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کۆرپەلە.

هەر ئەوەندە ڕێژەکەی کەمێک زیادی کرد ئیتر یەکسەر دەست دەکات بەتێک شکاندنی خڕۆکە سوورەکانی خوێنی کۆرپەلەو نامێلێت بەتەواوی خۆراکە و ئۆکسجین بۆ هەموو خانەکانی لەش ببەن، کەئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ژمارەی خڕۆکە سورەکانی خوێن کەم بکەن و پاش ماوەیەک منداڵەکە بمرێت یان بەنابەکام و نووقستانی لەدایک ببێت. بەلام لەخۆش بەختیدا هەموو جارێک ئەم حاڵەتە نابێتە هۆی کوشتنی منداڵەکە بەڵکو لە(٢٠٠) جاردا جارێک ئەو کارەساتە ڕوودەدات، هەروەها لەلایەکی ترەوە ئەگەر زوو بەو حاڵەتە بزانرێت، ئەوا دەتوانرێت چارەسەر بکرێت، لەبەرئەوە زۆر پێویستە کەکچ پێش شوکردن و کوڕ پێش ژن هێنان جۆری خوێنەکەیان بزانن و ئافرەتیش لەکاتی سک پڕیدا سەردانی پزیشک بکات.

## بۆماوەو ژینگە

چارەنووسی گەشەكردن و پاشەرۆژی منداڵ پەیوەستە بەكۆمەڵێك هۆكارەوە. ئەو هۆكارانە رۆڵی ترسناك لەدیاریكردنی چارەنووسی مرۆڤدا دەبینن. ئینجا ئەگەر توانرا كۆنترۆڵی ئەو هۆكارانە بكرێن و بارودۆخی گونجاو بۆ گەشەكردنیان رەخسێندرا، ئەو كاتە بەقازانجی بوونەوەر بەگشتی و مرۆڤ بەتایبەتی تەواو دەبێت، بەڵام ئەگەر ئەو هۆكارانە دژ بەحەزو خواست و بەرژەوەندی مرۆڤ بوون، ئەوكاتە زەرەرو زیانێكی گەورە بەگەشەكردن و چارەنووسی ئەو بوونەوەرە دەگەیەنێت. لەگرنگترین هۆكارەكانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:

### ١- بۆماوە (Inheritance):

مەبەست لەبۆماوە، گواستنەوەی سەرجەم ئەو خاسیەت و سیفاتانەیە كەلەرێگەی جیناتەوە لەباپیران بۆ باوكان و دایكان، وە لەباوكان و دایكانیشەوە بۆ منداڵانو لەمنداڵانیشەوە بۆ نەوەكانی داهاتوو، دەگوێزرێتەوە. بۆماوەزانی (علم الوراثة) گەیشتە ئەو راستیەی كەهەر خانەیەك لەخانەكانی زاووزێ لە(٢٣) بیست و سێ جووت كرۆمۆسۆم پێك هاتووە، هەریەك لەو كرۆمۆسۆمانەش هەزارەها بگرە ملیۆنەها جیناتی لەسەر پشتی خۆی هەڵگرتووە، ئەو جیناتانە كەبریتین لەتوورەكە ترشەڵۆك (اكیاس حامضیة) بەرپرسیاری یەكەمن لەگواستنەوەی خاسیەت و سیفاتەكان لەباوكان و دایكانەوە بۆ منداڵەكانیان. كۆرپەلە لەئەنجامی پیتاندنی هێلكۆكەیەكی دایك بەسپێرمی باوك دروست دەبێت. ئەو هێلكۆكە پیتێنراوە ناو دەبرێت بەزایگۆتو (٤٦) كرۆمۆسۆمی تێدایە كە(٢٣) تاكیان لەرێگەی هێلكۆكەوە لەدایكەوە بۆ كۆرپەلەكە گوێزراوەتەوە بەڵام (٢٣) كرۆمۆسۆمەكەی تریان لەرێگەی سپێرمەوە لەباوكەوە بۆ كۆرپەلەكە گوێزراوەتەوە.

كەواتە هەریەك لەدایكو باوك بە(٢٣) تاك كرۆمۆسۆم بەشداری دەكەن و هەریەكەیان خاسیەت و سیفاتەكانیان لەڕێگەیانەوە بۆ كۆرپەلەكەیان دەگوێزنەوە. ئەوەی شایانی باس كردنە، كەلەو (٢٣) تاك كرۆمۆسۆمە (٢٢) تاكیان خاسیەتە جەستەیی و بۆماوەییەكانی وەك (ڕەنگی چاوو پرچ، درێژیو كورتی، قەڵەویو لاوازی، خاسیەتەكانی كۆئەندامی دەماری ناوەندیو كاریگەری گلاندەكانو.....هتد) لەباوكو دایكەوە بۆ كۆرپەلە دەگوێزنەوە بەلام تاكی (٢٣) بیست و سێ هەمین توخمی كۆرپەلە دیاری دەكات، ئیتر كوڕ بێت یان كچ، دەركەوتووە كەئەو جووتە كرۆمۆسۆمەی لای باوك كەتوخمی كۆرپەلە دیاری دەكەن، لەیەكتری جیاوازن و لەشێوەی (XY)ی لاتینی دەچن بەلام ئەو جووتە كرۆمۆسۆمەی لای دایك كەتوخمی كۆرپەلە دیاری دەكەن، هەردووكیان وەك یەك وان و لەشێوەی (XX)ی لاتینی دەچن.

لەكاتی گواستنەوەی كرۆمۆسۆمەكان ئەگەر (X) كرۆمۆسۆم لەلای باوكەوە هات ئەوا لەگەل (X) كرۆمۆسۆمی دایك یەك دەگرێت و توخمی منداڵەكە كچ دەردەچێت (XX)، بەلام ئەگەر (Y) كرۆمۆسۆم لەلای باوكەوە هات، ئەوكاتە لەگەل (X) كرومۆسۆمی دایك یەك دەگرێت و توخمی منداڵەكە كوڕ دەردەچێت (XY). بەم شێوەیە زانست ئەوەی سەلماند كەتوخمی كۆرپەلە ئیتر كوڕ بێت یان كچ ئەوە باوك دیاری دەكات نەك دایك.

دوای ئەوەی هێلكۆكەی دایك لەگەل سپێرمی باوك یەك دەگرن و زایگۆت دروست دەبێت، ئیتر كاریگەری بۆماوە تەواو دەبێت و هەرچی خاسیەت و سیفات ئیتر باش بێت یان خراپ گواستوویەتیەوە بۆ كۆرپەلەو چارەنووسی ئەو بوونەوەرەی دیاری كردووەو هەرچی ئامادەباشی و خاسیەتێك هەیە لەناو ناوكی ئەو تاكە خانەیە، كەسەرەتای دروست بوونی مرۆڤە چاندوویەتی و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەقۆناغەكانی ژیانی ئەو كۆرپەلەیە ڕەنگ دەداتەوەو كاریگەری دەردەكەوێت. دوای تەواو بوونی پرۆسەی گواستنەوەی

خاسیەت و سیفاتەکانی دایکە و باوکە لەڕێگەی بۆماوەوە، ئیتر کاریگەری هۆکاری دووهەم دەردەکەوێت کەئەویش ژینگەیە بەمانا بەرفراوانەکەی (ژینگەی ناو منداڵدان، ژینگەی کۆمەڵایەتی، جوگرافی، مێژوویی، دەروونی).

## ب) ژینگە (Environment):

مەبەست لەژینگەش سەرجەم ئەو هۆکارە جوگرافی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاری و دەروونیانە دەگرێتەوە، کەکاریگەرییان لەسەر کەسایەتی و چارەنووسی مرۆڤ هەیەو هەر لەیەکەم چرکەی خوڵقاندن و دروست بوونی کۆرپەلەوە لەناو منداڵدانی دایکدا، تاوەکو دواهەمین هەناسەی ژیانی و خستنە ناو گۆڕەوە، دەست بەکار دەبێت و بەردەوام شوێن پەنجەی لەسەر کەسایەتی و چارەنووسی مرۆڤ دیارە. ژینگەش زۆر جۆری هەیە لەهەموویان گرنگتر ئەمانەی لای خوارەوەن:-

### ١) ژینگەی جوگرافی:

جوگرافیای ئەو ژینگەی کەمرۆڤی تێدا دەژی کاریگەری بەردەوامی لەسەر چالاکی و هەڵس و کەوت و کەسایەتی تاکەکانی هەیە، ئیتر شاخاوی بێت یان دەشت، ئاوو هەوای گەرم بێت یان سارد، دەوڵەمەند بێت بەسەرمایەی سروشتی (کانزاکان، نەوت، باخو بێستان، لەوەڕگای ئاژەڵ، سەرچاوەی ئاوو زەوی بەپیت و بەرەکەتی کشتو کاڵی...هتد) یان هەژار، ڕۆڵی خۆی دەبینێت. ئەگەر بەخێراییش سەیری دانیشتوانی ناوچە جیاجیاکان بکەین، بەئاسانی هەست بەجیاوازی (جلو بەرگ، خانوو، ڕەنگی پێست، داب و نەریت، جۆری ئاژەڵ و چالاکی و کەرەستەکانی بەرهەم هێنان) دەکەین، کەبەپلەی یەکەم بۆ هۆکاری جوگرافی دەگەڕێتەوە، دەرکەوتووە کەئەو مرۆڤانەی لەناوچەی شاخاوی و ڕەقنو ساردو سەخت دەژین، جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ ئەو کەسانەی کەلەناوچەیەکی بیابانی گەرم و ڕووتەڵدا

دەژین هەیە لەشێوەی بیركردنەوەو جۆری گرفت و جل و بەرگ، خانوو ئاژەڵ و پەلەوەرو ئەو كشت و كاڵەی كەلەسەری دەژین.

هەروەها بوونی كانزاو پترۆڵ، خاك و ئاوو زەوی بەپیت و بەرەكەت، شێوەی ژیانی تاكەكانی بەجۆرێك دیاری دەكات كەجیاواز بێت لەناوچەیەكی تر. بۆ نموونە تاكەكانی ناوچە شاخاوییەكان زیاتر توندوتیژو هەڵچوون، لەوانەیە ئەوەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە كەژینگەی شاخاوی زیاتر سەخت و پڕ لەگرفت و بەربەستەو دەبێت مرۆڤی ئەو ناوچانە بۆ پەیدا كردنی بژێوی ژیان و لوقمە نانێك بەردەوام لەململانێ و شەڕو توندو تیژیدا بن لەگەڵ ئەو شاخو داخو ئاوو هەوا دژوارە. كەبەردەوام بوونی ئەو بارودۆخە توندوتیژی لەلای تاكەكانی دروست دەكات.

هەروەها بەردەوام بوونی ڕۆژو تیشكی خۆر پێستی مرۆڤ ڕەش دەكات، بەپێچەوانەشەوە مرۆڤی شوێنە ساردەكان سپی پێست دەبن، (دەرئەنجامی توێژینەوە زانستیەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە لەژێر پێستی هەموو مرۆڤێكدا ژمارەیەك گلاند هەیە، هەندێكیان هۆرمۆنی كارۆتین و ئەوانی تریان هۆرمۆنی مالنین بەرهەم دەهێنن. ئینجا ئەگەر مرۆڤ لەشوێنی زۆر گەرم ژیا، ئەوكاتە ڕێژەی هۆرمۆنی مالنین لەئەنجامی بەرزی پلەی گەرماوە زیاتر بەرهەم دێت و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پێستی ئەو مرۆڤە ڕەشتر دەكات. بەڵام ئەگەر لەشوێنێكی سارد ژیا ئەو كاتە گلاندەكانی ژێر پێست هۆرمۆنی كارۆتین زیاتر بەرهەم دەهێنن و پێستی ئەو مرۆڤانە سپی دەكات. لەلایەكی تریشەوە ڕەنگی ڕەش (پێستی ڕەش) زیاتر گونجاوترە بۆ ناوچە گەرمەكان، لەبەرئەوەی لەش لەزۆر تیشكی چەوپەی بەئازار دەپارێزێ كەڕێژەكەی زۆر زۆرە لەناوچە گەرمەكانو زیانێكی زۆر بەلەشی مرۆڤ دەگەیەنێت) (جعفر،١٩٧٧، ص٤٥).

۲) ژینگەی مێژوویی:

ژینگەی مێژوویی (كات) ڕۆڵی لەژینگەی جوگرافی كەمتر نیە، ئەگەر زیاتر نەبێت، چونكە مرۆڤ دیاردەیەكی مێژووییەو ئەو پلەو پایە، ڕۆشنبیری و شارستانیەی ئەمڕۆی بۆ ڕەنج و عارەقەو ماندوو بوونی چەندەها نەوەو سەدەی پێشتر دەگەڕێتەوە. بەڵام ناتوانرێت نكوڵی لەوە بكرێت كەهەر زەمەن و سەردەم و كاتێك گرفت و بیركردنەوەو شێوازی تایبەتی خۆی هەیە، لەبەر ئەوە هەڵس و كەوت و ڕەوشت و ڕاوبۆچوون و بیركردنەوەو حەزو ئارەزوو خەوو خەیاڵی مرۆڤێكی سەدەی بیستەم، لەزۆر ڕووەوە لەخەوو خەیاڵو ڕەوشتی مرۆڤێكی سەدەی نۆزدەهەم جیاوازە، تەنانەت جیاوازیش هەیە لەنێوان یەكێك كە لەنیوەی یەكەمی سەدەی بیستەم ژیاوە لەگەڵ یەكێكی تر كەلەنیوەی دووهەمی هەمان سەدەدا ژیاوە، چونكە پێش كەوتنی تەكنەلۆژی و زانستی و ڕۆشنبیری لەكاتێكەوە بۆ كاتێكی تر دەگۆڕدرێت و ژینگەیەكی تایبەتی بۆ خۆی دروست دەكات كەجیای دەكاتەوە لەزەمەن و سەردەمێكی تر.

هەموومان دەزانین كەئەو تەقینەوە زانستی و ڕۆشنبیرییەی نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەم گۆڕانكارییەكی زۆری بەسەر بیرو بۆچوون و هزرو خەوو خەیاڵی تاكەكانیدا هێنا كەبەهیچ شێوەیەك بەدی ناكرێت لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا. هەر ئەم جیاوازی زەمەن و سەردەمەیە كەململانێ ی نێوان نەوەكان (كۆن و نوێ) (باوك و كوڕ)ی دروست كردووەو لەزۆر بۆچوون و لێكدانەوەو هەڵس و كەوتدا جیاوازن و یەك ناگرنەوەو هەریەكەیان زەمەن و ژینگەی مێژوویی تایبەتی خۆی هەیە.

۳) ژینگەی كۆمەڵایەتی:

داب و نەریت و پەیوەندی كۆمەڵایەتی نێوان تاكەكانی كۆمەڵ و ئەو بەهاو ئاكارانەی كەباوەڕیان پێ یەتی و جۆری ڕژێمی فەرمانڕەوایەتی، ڕەنگدانەوەو كاریگەری تایبەتی خۆیان لەسەر ڕەوشت و كەسایەتی مرۆڤ هەیە. بۆ نموونە نەتەوەی كورد خاوەنی داب

و نەریتو ئاکاری کۆمەلایەتی خۆیەتی، کەتاکەکانی لەتاکی گەل و نەتەوەکانی تر جیادەکانەوە، لەلای ئێمە ژن هێنان و شووکردن و پرسەو سەرەخۆشی و ئاهەنگی لەدایک بوونی منداڵ و بۆنەو جەژنە ئایینی و نەتەوەییەکان داب و نەریت و سیمای تایبەتی خۆی هەیە، کەجیاوازە لەهەمان دیاردە لەلای گەل و نەتەوەیەکی تر. لەبەرئەوە تاکیش زۆرجار بیرکردنەوەو ڕەوشت و ئاکاری گیرۆدەی داب و نەریتی کۆمەلایەتی دەبێتو ناتوانێت لێ ی دەرباز بێت و پێشێلیان بکات. بەپێچەوانەوە، دەکەوێتە بەر هەڕەشەو سزای کۆمەلایەتی.

٤ - ژینگەی دەروونی:

مەبەست لەژینگەی دەروونی ئەو بارودۆخو کەش و ئاووهەوا تایبەتیەیە کەتاک لەناو خێزانو کۆمەڵەکەیدا بەرەنگارییان دەبێتەوە. ئینجا ئەگەر ئەو ژینگە دەروونیە ئاسایی و پەروەردەیی و بێ گرێ و گرفت بوو، ئەوا بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە لەهەڵسو کەوت و بیرو هەڵچوونی تاکدا ڕەنگ دەداتەوە، بەڵام ئەگەر پڕ گرفت و کێشەو بێ بەش بوونو جیاوازی و کۆسپ بوو، ئەوکاتە بەشێوەیەکی نێگەتیڤانە لەسەر کەسایەتی تاک دەکەوێتەوەو ژینگەیەکی دەروونی ئاڵۆزی بۆ دەخولقێت کەجیاواز بێت لەتاکێکی تر کەلەهەمان ژینگەی جوگرافی و مێژوویی و کۆمەلایەتی ئەودا دەژی. هەر لەڕێگەی ئەم ژینگە دەروونیەوە دەتوانین ئەو جیاوازی و ناتەبایی و ناکۆکیانەی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ لێک بدەینەوە، لەکاتێکدا کەهەمان ژینگەی جوگرافی و مێژوویی و کۆمەلایەتیان هەیە. سەرجەم ئەو ژینگانەی سەرەوە ئەو هەموو جیاوازی و دژایەتیانەی نێوان تاکەکانی کۆمەڵیان دروست کردووە. (منصور،١٩٧٨،ص٩٥).

## کاریگەری گلاندەکان لەسەر گەشەکردن

گلاندەکان بریتین لەکۆمەڵێکە ئەندام لەناو لەشی مرۆڤداو هەموویان بەیەکەوە کار دەکەن‌و ڕەنگدانەوەی گرنگیان لەسەر گەشەکردنی مرۆڤ هەیە. دوو جۆر گلاند لەناو لەشی هەموو مرۆڤێکدا هەیە، جۆری یەکەم ناو دەبرێت بەکوێرە گلاندەکان (الغدد الصماء) و هیچ جۆگەلەو کەناڵێکیان نیە بۆ دەرهاویشتنی هۆرمۆنەکانیان، بەڵکو ئەم جۆرە گلاندانە ڕاستەوخۆ یەکسەر مەوادو کەرەستە سەرەتاییە پێویستەکان لەخوێن وەردەگرن و دوای چەند پرۆسەو گۆڕانکارییەکی کیمیاوی چەند هۆرمۆنێکی گرنگی لێ دروست دەکەن.

واتە ئەو کوێرە گلاندانە وەک کارگەیەکی کیمیاوین لەناو لەشداو هەریەکەیان تایبەتمەندێتی خۆی هەیە لەدروست کردن و بەرهەم هێنانی هۆرمۆنەکاندا، دوای دروست کردنی هۆرمۆنەکان ئیتر یەکسەر ئەو گلاندانە هۆرمۆنەکانیان ڕاستەوخۆ دەڕێژنە ناو خوێنەوەو، خوێنیش بەپێ ی پێویست بەسەر هەموو ئەندام و خانەکانی لەشدا دابەشی دەکات. بێگومان ئەم کوێرە گلاندانە هەریەکەیان سەربەخۆ دوور لەگلاندەکانی تر کارناکات، بەڵکو هەر هەموویان کاریگەرییان لەسەر یەکتری هەیەو تێک چوونی کاری هەریەکێکیان ئیتر ڕێژەی هۆرمۆنەکەی زیاد ببێت یان کەم ئەوا بەخراپی کاردەکاتە سەر چالاکی گلاندەکانی تر.

بەڵام جۆری دووهەمی گلاندەکانی ناو لەشی مرۆڤ ناو دەبرێن بەجۆگەلەدارە گلاندەکان (الغدد القنوية)، چونکە ئەم جۆرە گلاندانە جۆگەلەو کەناڵی تایبەتیان هەیە بۆ دەرهاویشتن، ئەم جۆگەلەدارە گلاندانە هەڵدەستن بەکۆکردنەوەی ئەو مەوادو پاشەڕۆ زیادانەی ناو خوێن و ڕزگارکردنی لەش لێیان بەهۆی فڕێدانیان لەڕێگەی جۆگەلەکانیانەوە بۆ دەرەوەی لەش یان دەیان کەنە ناو لەشەوە وەک چۆن فرمێسکە گلاند (الغدد الدمعية) هەڵدەستێت بەوەرگرتنی ئاوو هەندێکە خوێ ی کانزایی لەخوێن

و ئینجا تێکەڵیان دەکات و فرمێسکی لێ دروست دەبێت. جۆگەلەدارە گلاندەکان لەناو لەشدا زۆرن، لەوانە (فرمێسکە گلاند، عەرەقە گلاند، چەورییە گلاند، لیکە گلاند، هەرسە گلاند، شیرە گلاند،...هتد)، گومانی تێدا نیە کەکوێرە گلاندەکان گرنگیەکی لەڕادەبەدەریان هەیە لەسەر گەشەکردنی مرۆڤ و دیاریکردنی چارەنووسی. واتە ئەگەر ئەو کوێرە گلاندانە بەشێوەیەکی ڕێک و پێک و دروست کار بکەن و بەرێژەیەکی گونجاو هۆرمۆنەکانیان بڕژێننە ناو خوێنەوە ئەو کاتە گەشەکردنی مرۆڤ ڕێچکەی ئاسایی خۆی وەردەگرێت، بەڵام ئەگەر ڕێژەی دەرهاویشتنی هۆرمۆنەکان زیاد یان کەم بوو، ئەوکاتە کەلێنو دەلاقەی گەورە دەکەوێتە ڕێچکەی گەشەکردنی ئاسایی ئەندام و شانەو خانەکانی لەشەوە.

***<u>کوێرە گلاندەکانیش بەپێ ی شوێنیان لەسەرەوە بۆ خوارەوە ئەمانەن:-</u>***

### <u>١) پینیەلە(سنەوبەرە) گلاند (*الغدة الصنوبرية*) (*Pineal Gland*):</u>

ئەم کوێرە گلاندە دەکەوێتە بەشی سەرەوەی مۆخو درێژییەکەی نزیکەی (١) سم یەک سنتیمترو پانیەکەی (٢\١)سم نیو سەنتمتر. ئەم کوێرە گلاندە ناسراوە بەگلاندی منداڵی لەبەرئەوەی کاریگەری تەنها لەقۆناغی منداڵی هەیەو لەقۆناغی هەرزەکاریدا دەپووکێتەوەو ئەو گرنگیەی نامێنێ (*السيد، ص٥٣*). بارستایی ئەم گلاندە بەپێ ی جۆری بوونەوەرەکان دەگۆڕدرێت، بۆ نموونە بارستایی زۆر گەشەی کردووەو گەورەیە لەلای خشۆکەکان. تەنانەت لەلای جۆری (الورل)ی خشۆکە لەشێوەی چاوی سێهەمدایە لەناوەڕاستی سەریانەو ناو دەبرێت بە(پینیەلە چاو). هەروەها فەیلەسوفی فەرەنسی (دیکارت) لەو بڕوایەدا بوو کەئەم کوێرە گلاندە لانەو شوێنی گیانی مرۆڤایەتیە (*الروح الأنسانية*).

بەلام ئەوەی تاوەکو ئێستا زانراوە لەسەر کاریگەری ئەم گلاندە ئەوەیە کەکارو چالاکیەکانی سێکسە گلاند ڕێک دەخات و نامێلێت خاسیەت و سیفاتەکانی سێکسی تاوەکوو قۆناغی هەرزەکاری دەربکەوێت. بەلام ئەگەر ئەم گلاندە تووشی نەخۆشی و کەمو کورتی بوو ئەوکاتە کار دەکاتە سەر گەشەکردنی منداڵ و زۆر خاسیەت و سیفاتی قۆناغی هەرزەکاری لەلای ئەو منداڵە دەردەکەوێت، بۆ نموونە ئەو منداڵە ئەگەر تەمەنی (٥) پێنج ساڵان بێت، ئەوکاتە دەنگی وەک هەرزەکارێکی (١٢) ساڵان گردەبێت، ڕیش و سمێڵی دێت و سێکسە گلاند دەکەوێتە چالاکی خۆی، هەروەها ئەگەر لەسەردەمی منداڵیدا ڕێژەی زۆر زیاتر بوو ئەوکاتە دەبێتە هۆی مردنی منداڵەکە.

## ٢) پیتویتەرییە گلاند (الغدة النخامية) (Pituitary Gland):

ئەم کویرە گلاندە دەکەوێتە ژێر مۆخەوە، لەبەشی خوارەوەی ناو کاسەی سەرەو کێشەکەی نزیکەی (٢\١١)غم نیو گرامەو ناو دەبرێت بەدایکە گەورەی گلاندەکان، چونکە کاریگەری و ڕۆڵی گرنگی هەیە بەسەر هەموو گلاندەکانی ترەوە. ئەوەی تاوەکوو ئێستا زانراوە، ئەم کویرە گلاندە (بەشی پێشەوەی) نزیکەی (١٢) دوانزدە جۆر هۆرمۆن بەرهەم دەهێنێ، لەهەموشیان گرنگتر هۆرمۆنی گەشەکردنە کەڕۆڵێکی ترسناکی هەیە لەسەر چارەنووسی مرۆڤ، چونکە کاریگەری هەر لەسەرەتای دروست بوونی کۆرپەلە لەناو منداڵدانی دایکدا هەیە، ئەگەر ڕێژەی ئەم هۆرمۆنە لەخوێندا کەم بکات دەبێتە هۆی وەستان و گەشە نەکردنی ئێسقانەکانی منداڵ و کورتە بالایی هەروەها کار لەژیری و زیرەکی و کرداری سێکسی ئەو منداڵە دەکات.

هەندێک جار لەڕێگەی دەرزییەوە ئەو هۆرمۆنە دەدرێت بەو جۆرە منداڵانە بۆ ئەوەی گەشەکردنیان خێرا بکرێت. بەلام ئەگەر هۆرمۆنی گەشەکردن لەقۆناغی هەرزەکاریدا کەمی کرد ئەو کاتە دەبێتە هۆی قەڵەوی زیاد لەپێویست و پەک خستنی هێزی سێکسی، بەلام ئەگەر ڕێژەی هۆرمۆنی گەشەکردن لەقۆناغی منداڵیدا زیاد بوو ئەو کاتە

گەشەکردن زۆر خێرا دەبێت و ئەو جۆرە مندالانە زەبەلاح و زۆر درێژ دەبن، چونکە ئێسقانەکانی لەشیان زیاد لەپێویست گەشە دەکەن. بەلام ئەگەر دوای قۆناغی منداڵی رێژەکەی زیادی کرد، ئەوکاتە گەشەکردنە زیادەکە بەپانی دەبێت و شان و دەست و قۆڵەکانی زیاد لەپێویست گەشە دەکات و دەم و چاوو چەناگەی تووشی هەڵئاوسان و شێواندن دەبن. (*عیسوی، ص٥٩* ).

## ٢) *سیرۆیدە گلاند (الغدة الدرقیة)* *(Thyroid Gland)*:

شوێنی ئەم کوێرە گلاندە بەشی پێشەوەی ملەو دەکەونە ئەم لاو ئەولای بۆری هەناسەدانەوە کێشەکەی نزیکەی (١٠-١٥) گرامە، ئەم کوێرە گلاندە هۆرمۆنی سیرۆکسین بەرهەم دەهێنێت و فەرمانی سەرەکی رێکخستنی چالاکیەکانی شانەکانی لەشە لەپرۆسەی میتاپۆلیزم (تێکدان و بنیاتنان) (*آغا، ص١١١*). هەروەها جگەریش بەرێژەیەکی کەم هۆرمۆنی سیرۆکسین بەرهەم دەهێنێ، سەرچاوەی سەرەکی دروست بوونی سیرۆکسین ماددەی (یۆدە) کەلەماسی و ئاوو زۆر خواردنی تردا هەیە.

ئەگەر رێژەی سیرۆکسین لەخوێندا کەمی کرد ئەو کاتە دەبێتە هۆی گەشەنەکردنی درێژی ئێسقانەکان، بەڵکو بەشێوەی پانی گەشە دەکەن و دەبنە هۆی قەڵەوی زیاد لەپێویست، هەروەها درەنگ دەرهاتنی ددانی منداڵ، لاوازی هێزی سێکسی و ژیری ئەو جۆرە مندالانە، درەنگ پێ گرتن و فێربوونی زمان، بەلام ئەگەر لەقۆناغی هەرزەکاری و کامڵیدا رێژەی سایرۆکسین کەمی کرد ئەوکاتە دەبێتە هۆی گێژی و شت لەبیرکردن و پرچ هەڵوەرین، سستی و هیلاک بوون. بەلام زیاد بوونی رێژەی سیرۆکسین دەبێتە هۆی زیاد بوونی لێدانی دڵ، دڵەراوکێ، زیاد بوونی گەشەکردن، زۆر جووڵە کردن (ماخۆلان) ئۆقرە نەگرتن لەشوێنێکدا، زوو هەڵچوون، زیاد بوونی هەناسەدان، بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای لەش.

گومانی تێدانیە کەمی یۆد لەخوێ و ئاوو خۆراکدا دەبێتە هۆی هەڵئاوسانی سیرۆیدە گلاند تەنانەت ئەگەر ئافرەتی دوو گیان بەڕێژەی پێویست یۆد وەرنەگرێت و لەناو خۆراکەکەیدا نەبێت، ئەو کاتە منداڵەکەی ناو سکی دوای لەدایک بوونی یەکسەر تووشی هەڵئاوسانی ئەم کوێرە گلاندە دەبێت و ناتوانێت هۆرمۆنی سیرۆکسین بەرهەم بهێنێت و ئەگەر چارەسەر نەکرێت و ماددەی یۆدی نەدرێتێ ئەوا تووشی کورتە باڵایی و زۆربەی ئەو خاسیەت و سیفاتانەی سەرەوە دەبێت.

## ٤) ماوسیکانی سیرۆید (جارات الدرقیة) (Para thyroid):

ئەمانەش بریتین لەچوار بەشی بچوک کەهەر جووتەی دەکەوێتە تەنیشت لایەکی بۆری هەناسەدان، ئەرکی سەرەکیان ڕاگرتنی ڕێژەی کالیسیۆم و فۆسفۆرە بەشێوەی پێویست لەناو خوێندا، ڕێژەی ئاسایی کالیسیۆم لەناو خوێندا (٠٫٠٠٨ر) و (٠٫٠١ر) بەڵام ئەگەر ڕێژەکەی کەم بووەوە بۆ (٠٫٠٠٦ر) یان کەمتر ئەو کاتە مرۆڤ هەست بەژانە سەرو ئازار لەدەست و قاچ و بێ هێزی و گێژی و زوو هەڵچوون و بێزاری دەکات. بەڵام زیاد بوونی چالاکیان دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی ڕێژەی کالیسیۆم لەئێسقانەکان و تووش بوونیان بەئێسکە نەرمەو زوو شکاندنیان و شێواندنی پەیکەری ئێسکی ئەو مرۆڤە.

## ٥) تیموسە گلاند (الغدة التیموسیة) (Thymus Gland):

ئەم کوێرە گلاندەش ناو دەبرێت بەکوێرە گلاندی منداڵی لەبەرئەوەی تەنها لەقۆناغی منداڵیدا کاریگەری هەیەو لەقۆناغی هەرزەکاری و کامڵیدا دەپووکێتەوەو دەکەوێتە بەشی سەرەوەی بۆشایی سنگەوە، ئەوەی شایانی باس کردن بێت تاوەکو ئێستا زانست نەیتوانیوە پەی بەنهێنی و کارو فەرمانە سەرەکیەکانی ببات، بەڵام تەنها ڕاستی کەبزانرێت ئەوەیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەپێ ی گەورە بوونی منداڵ کێش و بارستاییەکەی کەم دەبێتەوە. هەروەها ئەوەش زانراوە ئەگەر ئەم کوێرە گلاندە تووشی نەخۆشی

ببێت ئەوا دەبێتە هۆی درەنگ پوکاندنەوەی پینیەلە گلاند (الغدة الصنوبرية)و دوجارایش کار کردن لەگەشەکردنی منداڵ و دواکەوتنی پێ گرتن و ژیری، هەروەها هەڵئاوساندنی ئەم کوێرە گلاندە دەبێتە هۆی تەنگە نەفەسی و دیارکەوتنی هەندێک نیشانە کەنزیکە لەنیشانەکانی نەخۆشی (ڕەبۆ).

## ٦) ئەدرینالینە گلاند (الغدة الأدرنالينية) (Adrenal Gland):

ئەم دوو کوێرە گلاندە هەریەکەیان دەکەوێتە پشت گورچیلەکانەوەو لەدوو بەش پێک دێن، یەکەمیان توێکڵ و بەشی دەرەوەی گلاندەکەیەو بەشی دووهەمیشیان کاکڵ و ناووکی گلاندەکەیە، کەهەریەکەیان جۆرە هۆرمۆنێک بەرهەم دەهێنێت جیاواز لەئەوی تر، بەشی دەرەوە، واتە توێکڵی ئەم کوێرە گلاندە هۆرمۆنی کۆرتیزۆل و کۆرتیکوستیرون دروست دەکات (أغا، ص١١٦) کەیارمەتی بەردەوام بوونی چالاکی ماسوولکەکان و بەرگری کردن لەنەخۆشیەکان دەدات، ئینجا ئەگەر ڕێژەی ئەو هۆرمۆنانە لەخوێندا کەم بوو ئەو کاتە ئەو مرۆڤە تووشی تەمبەڵی و گێژی و زەین کوێری دەبێت و سەبرو ئارامی لاواز دەبێت و توانای بەردەوام بوونی لەسەر ئەرک و چالاکیەکانی نامێنێت.

بەڵام ئەگەر ڕێژەی لەخوێندا زیاد بوو ئەوکاتە دەبێتە هۆی زیاد بوونی دەرکەوتنی خاسیەت و سیفاتەکانی نێرایەتی لەلای نێرو مێ، واتە ئەگەر ئافرەت بوو ئەوا وەک پیاو دەنگی گڕ دەبێت و ڕیش و سمێڵی دەردێت. بەڵام ناوک و کاکڵەی ئەم کوێرە گلاندە هۆرمۆنی ئەدرنالین دروست دەکات و پەیوەستە بەکۆئەندامی دەماری ئۆتۆنۆمیەوە بەتایبەتی کۆئەندامی سمپساوی، کەزیاد بوونی ئەم هۆرمۆنە لەخوێندا دەبێتە هۆی زیاد بوونی لێدانی دڵ، زیاد بوونی هەناسەدان، زۆربوونی ڕێژەی شەکر لەخوێنداو درەنگ هێلاک بوونو لەکارخستنی کرداری هەرس کردن و وەستانی پژانی لیکەگلاند، کەئەم گۆڕانکارییە فسیۆلۆژیانە یارمەتی مرۆڤ دەدات کەزاڵ بێت بەسەر ئەو بارودۆخانەی

دەبێتە هۆی هەڵچوون و هەڕەشە كردن لەبوونی. بەڵام ئەگەر بەردەوام ڕێژەی لەخوێندا زیاد بوو ئەوا دواجار مرۆڤ تووشی كۆمەڵێك نەخۆشی سایكۆسۆماتی دەكات.

### ٧) پەنكریاس (*Pancreas*):

ئەم گلاندە هەردوو جۆرەكەی لەخۆی گرتووە، واتە كوێرە گلاندیشەو لەهەمان كاتیشدا جۆگەلەدارە، پەنكریاس گلاندیكی گەورەیەو كێشەكەی نزیكەی (٨٠-٩٠) گرامەو، دەكەوێتە ژێر گەدەوە. دوو جۆرە كرداری جیاوازی لەیەكتری هەیە:ــ

ا) وەك گلاندیكی جۆگەلەدار، دیوی دەرەوەی سێ جۆر گوشراو (ئەنزیمات) بۆ هەرس كردنی (چەوری، پرۆتینات، كاربۆهیدرات) دەڕژێنێتە ناو گەدەو ڕیخۆڵەی دوانزە گرێ وە.

ب) بەڵام بەشی ناوەوەی پەنكریاس هۆرمۆنی ئەنسۆلین بەرهەم دەهێنێت كەڕێژەی شەكر لەخوێندا دیاری دەكات، بەڵام ئەگەر پەنكریاس نەیتوانی بەڕێژەی گونجاو ئەنسۆلین دروست بكات، ئەو كاتە كەمی دەبێتە هۆی تووش بوون بەنەخۆشی شەكرە، بەڵام زیاد بوونی ئەنسۆلین دەبێتە هۆی سووتاندنی شەكر لەخوێنداو ئەمەش دەبێتە هۆی تێك چوونی چالاكیەكانی كۆئەندامی دەماری ناوەندی و هەست كردن بەبرسێتی و هیلاكی و ڕەنگ زەرد هەڵگەڕان و هەست كردن بەسەرما.

### ٨) سێكسە گلاندەكان (الغدد الجنسیة) (*Sexual Gland*):

سێكسە گلاندەكان بریتین لەهەردوو گوون لەلای نێرو هێلكەدان لەلای مێ هەریەكەیان دوو جۆر دەرهاویشتنی جیاوازی هەیە، (١) دەرەكیە، ئەویش دروست كردنی خانەكانی زاوزێ كردنە (سپێرم- [نێر]- هێلكە - [مێ]) (٢) ناوەكیە، ئەویش بەرهەم هێنانی هۆرمۆناتی سێكسە. هەردوو گوون سێ (٣) جۆر هۆرمۆنی نێرایەتی دروست دەكەن لەهەموویان گرنگتر تێتیستیرۆن (Testesterone) هەروەها ڕێژەیەكی كەمیش

لەهۆرمۆنی مێ یەتی ئەستروجین بەرهەم دەهێنێت، بێگومان ئەركێ و فەرمانی هۆرمۆنی نێرایەتی پێ گەیاندن و خستنەگەڕی ئەندامی زاوزێ یەو دەرخستنی نیشانەكانی نێرایەتیە وەكێ دەنگێ گربوون، ڕیش و سمێل، تووكەبەرو بن هەنگڵ، زیاد كردنی گەشەی ماسوولكەكان. بەڵام هەردوو هێلكەدان هۆرمۆنەكانی مێ یایەتی وەكێ ئەسترۆجینو بروجستیرون دروست دەكەن و لەگرنگترین ئەركو فەرمانەكانیشیان پێ گەیاندنی ئەندامەكانی زاوزێ، دەرخستنی نیشانەكانی مێ یایەتی وەكێ گەورەبوونی مەمكێ، كۆكردنەوەی چەوری لەهەندێكێ بەشی لەشی ئافرەت، نەرم و ناسكی ماسوولكەكانی.

شایانی ئاماژە بۆ كردنە كەهەردوو هۆرمۆنی نێرایەتی و مێ یایەتی لەلای هەردوو توخمەكە هەیە، بەڵام ڕێژەی هۆرمۆنی مێ یایەتی لەلای نێر كەمە بەڵام ڕێژەی هۆرمۆنی نێرایەتی زۆرترە لەبەرئەوە نیشانەو خاسیەتەكانی نێرایەتی بەزۆری لەلای دەردەكەوێت بەڵام لەلای مێ بەپێچەوانەوە بەڵام ئەگەر سێكسە گلاندەكان تووشی نەخۆشی و كەم و كورتی هاتن و ڕێكەوتی كرد ڕێژەی هۆرمۆنی مێ یایەتی لەلای نێر زیادی كرد ئەو كاتە زۆر نیشانەو خاسیەتی ژنانە لەلای ئەو نێرە دەردەكەوێت وەبەپێچەوانەشەوە لەلای مێ. وە زۆر توێژینەوە لەسەر گرنگی ئەو هۆرمۆنانە كراوە (بۆ نموونە هۆرمۆنی نێرایەتیان لەكەڵەشێر وەرگرتووەو داویانە بەمریشكێ و بەپێچەوانەشەوە هۆرمۆنی مێ یایەتیان لەمریشكێ وەرگرتووەو داویانە بەكەڵەشێر. دوای ئەو كردارە زۆر ڕەوشتی كەڵەشێرو ئەو مریشكە گۆڕاوە، یەكسەر مریشكێ وەكێ كەڵەشێر دەستی كردووە بەقوقە قوق و شەڕانی بووەو، كەڵەشێریش دەستی كردووە بەگارە گارو لەسەر هێلكە پاڵ كەوتووەو نۆد سیفاتی نێرایەتی خۆی لەدەست داوە) (عیسوی، ص ٦٠).

# هەستەوەرەکان (گرنگی و چۆنیەتی گەشەکردنیان)

هەستەوەرەکان (الحواس) یەکەم دەروازەی چوونە ژوورەوەی زانیارییەکانە بۆ ناو کۆئەندامی دەماری ناوەندی (الجهاز العصبي المركزي)، هەر لەڕێگەی ئەو هەستەوەرانەوە مرۆڤ شارەزای ژینگەو دەوروبەرەکەی دەبێت، هەریەک لەو هەستەوەرانە تایبەتمەندێتی خۆی هەیە و جۆرە وورووژێنەرێک (مثير) وەردەگرێت کەجیاوازە لە وورووژێنەری هەستەوەرەکانی تر، بۆ نموونە هەستی بینین تەنها ئەو وورووژێنەرانە دەناسێتەوەو هەستیان پێدەکات کەلەشێوەی شەپۆلە ڕووناکی دەگوازرێنەوە، واتە چاو تەنهامامەڵە لەگەڵ ڕووناکی دەکات، هەروەها گوێ لەگەڵ دەنگەکان و بۆنیش لەگەڵ تەن و شتە بۆندارەکان.

بەم شێوەیە یەکەم ئامرازی سەرەکی هەست و زانین و شارەزایی و زانیارییەکان هەستەوەرەکانن، ئینجا خوانەخواستە ئەگەر یەکێک یان زیاتر لەیەکێک لەو هەستەوەرانە تووشی کەم و کورتی و نووقستانی بوو ئەوا دەلاقەو کەلێنی گەورە دەکەوێتە گەشەکردنی ئاسایی زانیاری و ژیری ئەو کەسانەی تووشی ئەو نووقستانیە بوون، هەر لەبەر ئەمەشە دەبێت گرنگیەکی تەواو بەساغ و سەلامەتی هەستەوەرەکان و چۆنیەتی گەشەکردنیان بدرێت.

بۆ بەدی هێنانی ئەم مەبەستەش بەردەوام زۆر لەزانایان لەهەوڵی ئەوەدا بوون کەچۆنیەتی گەشەکردنی زانیارییەکان و هەستەوەرەکان پێ بزانن، بەڵام بەداخەوە نەیان توانی زانیاری تەواو دەربارەی هەستەوەرەکان و چۆنیەتی گەشەکردن و ڕادەی پێگەیشتنیان لەقۆناغی شیر خۆریدا بەدەست بهێنن، ئەوەش بەپلەی یەکەم بۆ ئاسکی قۆناغی شیرە خۆری دەگەڕێتەوە، چونکە لێتوێژینەوەو کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر منداڵی شیر خۆر کارێکی ئاسان نیەو پێویستی بەکەرەستەو ئامرازی زۆر هەستیارو جۆراو جۆر و کەسانی پسپۆر و شارەزا هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا بەهەوڵ و کۆششی ئەو توێژەرو زانایانە، توانراوە زانیارییەکی باش دەربارەی هەستەوەرەکانی منداڵ و ڕادەی گەشەکردن و چۆنیەتی فێربونی زانیاری دەست بکەوێت، تەنانەت لەقۆناغی شیر خۆریشدا کەدووساڵی یەکەمی ژیان دەگرێتەوە.

## ١- هەستی بینین:-

هەرچەندە میکانیزمە دەمارییە سەرەکیەکانی بینین هەر لەهەفتەی سێهەمی دروست بوونی کۆرپەلە لەناو منداڵدانی دایکەوە دەست بەدروست بوون و گەشەکردن دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک منداڵ لەدایک دەبێت، هێشتا کۆئەندامی دەماری ماسوولکەیی (الجهاز العصبي العضلي) تایبەت بەبینین لەلای بەتەواوی گەشەی نەکردووە (کونجر، ١٩٧٠، ص ١٢٤).

کۆرپەلە یەکسەر دوای لەدایک بوون لەتوانایدا هەیە، لەڕێگەی چاو داخستن و کردنەوەی وەڵامی ڕووناکی زۆر بەهێزو لەناکاو بداتەوە، بەڵام لەسەرەتادا ئەو وەڵامدانەوەیە زۆر کزو لاوازەو

تەنها بۆ ڕووناکی زۆر بەهێزە ، بەڵام دوای ئەوەی کەبەشەکانی چاوو هەستە دەمارەکان وورده وورده گەشەدەکەن، ئەو کاتەش لەتوانای چاودا هەیە کە وەڵامی ئەو ڕووناکیە بەهێزو لاوازانە بداتەوەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش شارەزایی زیاتری دەربارەیان دەست بکەوێت، لەقۆناغی شیرە خۆریدا زۆر گۆڕانکاری گرنگ بەسەر هەستی بینیندا ڕوودەدات، لەگرنگترینیان ئەمانەی لای خوارەوەن:-

منداڵی شیر خۆر یەک دوو هەفتە دوای لەدایک بوونی دەتوانێت سەرنجی ئەو خاڵە ڕووناکیە ڕەنگاو ڕەنگە جووڵاوە بدات کەلەبەرانبەری لەسەر شاشە یان دیوارێک پیشانی دەدرێت، تەنانەت هەندێک جاریش ڕەنگەکان لەیەکتری جیا بکاتەوە . دەرئەنجامی توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەیەکسەر دوای لەدایک بوون لەتوانای منداڵی شیرخۆردانیە کە بەهەردوو چاوی پێکەوە شتەکان ببینێ، بەڵام لەتوانای شیرخۆردا هەیە کەلەدەوروبەری سێ مانگیدا لەیەک کاتدا بەهەردووچاوی سەیری یەک شت بکات و پێکەوە هەستی پێبکات، لەکاتێکدا کەلەپێش سێ مانگیدا هەر چاوەی ڕوو لەلایەک دەکات و لەوە دەچێت کەتووشی خێلی بووبێت (معوج، ١٩٩٤، ص١٧٦)، بێگومان ئەمەش بۆ پێنەگەیشتنی ماسوولکەو هەستە دەمارەکانی چاوی دەگەڕێتەوە.

منداڵی شیرەخۆر بۆ یەکەم جار لەدەوروبەری مانگی پێنجەم و شەشەمی ژیانیدا دەتوانێت دایکی خۆی بناسێتەوەو لەئافرەتانی تری جیا بکاتەوە. هەر ئەمەشە دەبێتە هۆی ئەوەی کەمنداڵ کاتێک چاوی بەدایکی دەکەوێت دەست بەزەردەخەنەو خۆشی بکات و لەکاتی برسێتی و تینوێتیدا دەست بەگریان و هاوار بکات، لەلایەکی تریشەوە هەر لەدەوروبەری پێنج شەش مانگیدا لەدەم و چاوی کەسانی نامۆو نەناسراو دەترسێت و لێیان دوور دەکەوێتەوەو پەنا بۆدایکی دەبات، لەمانگی پێنجەمی ژیانیدا لەتوانای منداڵی شیر خۆردا هەیە کە دەست و چاوەکانی لەیەک کاتدا بۆ هەست پێکردنی شتەکان بەکار بهێنێ، هەروەها لەتوانایدا هەیە، کەلەسێ مانگیدا ڕەنگەکان هەست پێبکات، بەتایبەتیش ڕەنگە زەق و بریقەدارەکان، وە لەمانگی نۆهەمی ژیانیدا دەتوانێت شتی ووردی وەک دەرزی (دەنبوس) ببینێ و هەڵیشی بگرێت.

منداڵ لەقۆناغی پێش چوونە قوتابخانە شتە دوورەکان زیاتر لەشتە نزیکەکان و ووشە گەورەو شاشەکان زیاتر لەووشە بچووکەکان دەبینێ هەر ئەمەشە بۆتە هۆی ئەوەی کەمنداڵ لەساڵی یەکەم و دووهەمی چوونە قوتابخانەی بەزەحمەت ووشە بچووک و نزیکەکانی بەردەمی بخوێنێتەوەو زۆر جاریش لەئاکامی ئەوەدا تووشی ژانە سەرو چاوو ماندوو بوون ببێت، چونکە دەبێت چالاکی و ماندوو بوونێکی زۆر بۆ خوێندنەوەی ئەو ووشانە تەرخان بکات، ئەمەش بەپلەی یەکەم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەزۆربەی منداڵان لەسەرەتای چوونە قوتابخانەیان تووشی حاڵەتی درێژ (دوور) بینی (طول النظر) دەبن. (السيد، ١٩٧٤، ص ١٤٠-١٤١). کەناوەرۆکی ئەم حاڵەتەش ئەوەیە منداڵ لەو قۆناغەدا ، دەتوانێت بەئاسانی و بەڕوونی شتەدوورەکان ببینێ بەڵام بەزەحمەت و بەلێڵی و تەم و مژاوی شتە نزیکەکانی بۆ دەخوێندرێتەوە.

٢- هەستی بیستن:-

هەستەوەری بیستن لەگرنگیدا لەدوای هەستەوەری بینین بەپلەی دووهەم دێت و گرنگیەکی زۆری لەگەشەکردنی زانیاری و شارەزایی منداڵدا هەیە بەتایبەتیش گەشەکردن و فێربوونی زمان، چونکە هەستەوەری بیستن تایبەتە بەوەرگرتن و تێگەیشتنی شەپۆلە دەنگەکان، خۆشمان دەزانین کە زمانیش بریتیە لەژمارەیەک هێماو ووشەو دەنگی جیاجیا کە هەستەوەری بیستن ڕۆڵی ترسناکی لەفێربوونیدا هەیە، ئینجا هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەو منداڵانەی تووشی کەڕی یان گوێ گرانی بوون، کەم و کورتی زۆر لەگەشەکردنی زمانیاندا بەدی دەکرێت و زمانیان وەک منداڵی ئاسایی پاراوو دەوڵەمەند نابێت.

کۆئەندامی بیستنی منداڵ هەر لەدوای لەدایک بوون ئەوەندە گەشەی کردووە کەشیرە خۆرە بتوانێت بۆ ڕاپەراندنی کارەکانی خۆی سوودیان لێوەربگرێت، هەرچەندە لەچەند ڕۆژی یەکەمی ژیانیدا تووشی هەندێک گیروگرفتی بیستن دەبێت، ئەویش بەپلەی یەکەم بۆ ئەو پیسی و شلە تایبەتیە دەگەڕێتەوە کە لەدوای لەدایک بوون بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک جۆگەلەی گوێی دەگرێت و ناهێڵێت شەپۆلە دەنگەکان بەئاسانی بگەنە هەستە دەمارەکانی بیستن، بەڵام ووردە ووردە لادەچێت و هەستەوەری بیستن بەکاری خۆی هەڵدەستێت.

لەهەفتەی یەکەم و دووهەمی ژیانیدا، لەتوانای منداڵی شیرە خۆردا هەیە کە جیاوازی لەنێوان ئەو دەنگانەدا بکات کە ڕەزم و ئەزمی (لحن وإيقاع) تایبەتی خۆیان هەیە، بەڵام تەنها دەیان بیستێ بەبێ ئەوەی هیچ لەماناکانیان تێبگات چونکە شارەزایی و زانیاری لەبارەیانەوە نیە، زۆر بەڵگەی زیندووش هەیە ئەوە دەسەلمێنن، کەمنداڵ هەر لەدوای لەدایک بوونەوە یەکسەر توانای بیستنی هەیە، یەکێک لەو بەڵگانەش ئەوەیە، ئەگەر منداڵی شیر خۆر گوێ بیستی دەنگێکی بەرز ببێت ئەوا یەکسەر پێڵوەکانی چاوی دادەخات و تووشی هەناسە سواری و هەندێک جووڵەی دەست و قاچ دەبێت.

٣- هەستی بۆن کردن:-

هەندێک لەزاناکان لەو بڕوایەدان کەلەتوانای منداڵی تازە لەدایک بوودا هەیە کە بۆنە خۆشەکان لەبۆنە ناخۆشەکان جیا بکاتەوە، بەڵام هەندێکی تریان لەو باوەڕەدان کەمنداڵی تازە لەدایک بوو زۆر بەزەحمەت دەتوانێت بۆنە لاواز و کەمەکان هەست پێ بکات.

٤- تام و چێژ کردن:-

زۆربەی دەرئەنجامی توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هەستی تام و چێژ کردن لەلای منداڵی تازە لەدایک بوو زۆر زۆر لاوازەو هەمان وەڵامدانەوەی بۆ هەموو تامەکانی وەک (خوێ، شەکر، ترشی، تفتی، تاڵی) هەیە، کەئەمەش بەڵگەیە بۆ لاوازی ئەو هەستەوەرە لەسەرەتای لەدایک بووندا، بەڵام پاش چەند ڕۆژێک لەدایک بوون زۆر بەخێرایی گەشە دەکات و ئادەگاتە

ئەو ئاستەی كەلەتەمەنی دوو هەفتەیدا بتوانێت شتە شیرینەكان لەترشەكان جیابكاتەوە، بەڵگەی زۆریش هەیە كەمنداڵ لەو تەمەنەدا لەسەر مژینی شتە شیرینەكان بەردەوام دەبێت بەڵام قێزو بێز لەشتە ترشەكان دەكات و نایان مژێت. (كۆنجر، ۱۹۷۰، ص۱۳٦) .

## ٥- هەست كردن بەبەركەوتنی پێست:-

بەركەوتن و پێستی منداڵ زۆر هەستیارە بۆ وروژێنەرو گۆڕانكارییەكانی چواردەوری، بۆ نموونە بچووكترین دەست لێدانی لێوو ڕوومەتی منداڵی تازە لەدایك بوو دەبێتەوە هۆی دەم جووڵان و مژینی منداڵ و سەروەر گەڕاندنی، هەروەها بچووكترین دەست لێدانی لووتی منداڵ دەبێتە هۆی چاو داخستنی، لەلایەكی تریشەوە منداڵ بەئاسانی هەست بەگۆڕانكارییەكانی پلەی گەرما دەكات، بەڵگەش بۆ ئەوە ئەوەیە كەئاستی چالاكی منداڵ لەسەرمادا بەرزدەبێتەوە بەڵام لەگەرمادا نزم دەبێتەوە، هەروەها ئەگەر شیری منداڵ لە(٥٠) پەنجا پلەی سەدی گەرمترو لە(۲۳) بیست و سێ پلە ساردتر بێت ئەوا ئەو منداڵە تووشی بێزاری و مژینی پچڕ پچڕ و تەپ و تل و جووڵەی زیاد دەكات.

## پرۆسەی هەست كردن (عملية الأحساس)

ئەو پرۆسەیە كە بوونەوەر لەمیانەی هەستەوەرەكانیەوە وروژێنەرەكانی ناوەوەو دەرەوەی خودی خۆی هەست پێدەكات بەبێ ئەوەی لەماناو ناوەرۆكەكانیان بگات، واتە هەستەوەرەكان تەنها وروژێنەرەكان و گۆڕانكارییەكان وەردەگرن و لەڕێگەی هەستەدەمارەكانەوە (الأعصاب الحسية) دەگەنە كۆئەندامی دەماری ناوەندی بەبێ ئەوەی ماناكانیان لێك بدرێتەوە، گومانیشی تێدانیە كەمنداڵ دوای لەدایك بوون تەنها لەتوانایدا هەیە كەهەست بەوروژێنەرو گۆڕانكارییەكانی چواردەوری بكات بەبێ ئەوەی لەماناكانیان تێبگات، بۆ نموونە لەتوانای منداڵی تازە لەدایك بوودا هەیە كەهەست بەدەنگی دایك و باوك و كەسانی چواردەوری بكات بەڵام هیچیان لێحاڵی نابێت هەروەها دەتوانێت كەسەكان ببینێ و بۆنەكان بكات بەڵام بەبێ ئەوەی بیان ناسێت و لێكیان جیا بكاتەوە، بەڵام وورده وورده ڕۆژ لەدوای ڕۆژ وروژێنەرەكان ئاشكرا ترو ڕوونتر دەبن و منداڵ زانیاری لەبارەیانەوە پەیدا دەكات و ئیتر پرۆسەكە لەهەست كردنەوە بۆ زانین دەگۆڕدرێت.

## پرۆسەی زانین (عملية الادراك)

وەک لەپێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد یەکەم قۆناغی زانینی دیاردەکان و ووروژێنەرەکانی ژیان پرۆسەی هەست کردنە، بەڵام دوای زیاد بوونی شارەزایی و چەندجار ڕوو بەڕوو بووونەوەی دیاردەکان، وورده وورده ووروژێنەرو دیاردەکان دەناسرێنەوەو منداڵ پێیان ئاشنا دەبێت، ئالەم کاتەدا دەتوانین بڵێین پرۆسەی زانین لەلای منداڵ سەری هەڵداوە، مەبەست لەپرۆسەی زانینیش ئەوەیە کەمنداڵ ووروژێنەرو دیاردەکانی ژیان لێک بداتەوەو هەریەکەیان مانای خۆی بداتێ، (واتە ئەگەر منداڵ ئەو دەنگەی کە گوێ بیستی دەبێت زانیتی کەدەنگی دایکە یان دەنگی باوکیەتی و ئەو کەسەی کەدەیبینێ برایەتی و ئەو بۆنەی کەدەیکات بۆنی پرتەقاڵەو ئەو شتەی کەدەستی لێدەدات ساردەو بەفری پێ دەڵێن و ئەو شتەی کەتامی دەکات شیرینەو شەکری پێدەڵێن....هتد) ئەمە مانای ئەوەیە کەپرۆسەی ژیری منداڵ لەسنووری هەست کردن دەرچووەو پێی ناوەتە سنووری پرۆسەی زانینەوە کەئەمەش زۆر پێش کەوتووترە لەقۆناغی هەست کردن، هەرچەندە پرۆسەی زانینیش هەر پشت بەهەستەوەرەکان دەبەستێت.

ئەوەی کەزیاتر دەبێت بەهاندەرو یارمەتیدەری زیاد بوونی زانیاری منداڵ و گەشەکردنی ژیری، فێربوونی زمان و ڕۆیشتن و پێگرتنی منداڵە، چونکە پێگرتنی منداڵ و ڕۆیشتنی ژینگە کۆمەڵایەتیەکەی بەرفراوانتر دەکات و دەبێت بە یارمەتیدەر بۆ جێ گۆڕکێ و گەڕان و تاوتۆی کردنی دیاردەکانی ژیان، بەڵام ئەگەر منداڵ پێی نەگرتبێ و فێری ڕۆیشتن نەبووبێ ئەوا بواری گەڕان و کارلێککردنی سنووردارو دیاری کراوەو ناتوانێت لەو سنوورە دەربچێت. لەلایەکی تریشەوە فێربوونی زمان هۆکارێکی ترە کەیارمەتی منداڵ دەدات بۆ ئەوەی تێکەڵاوی تاکەکانی کۆمەڵ ببێت و لەگەڵیان دا بکەوێتە گفت و گۆو مامەڵە کردن و فێربوونی زانیاری و شارەزایی لێیانەوە.

منداڵ لەسەرەتاوە فێری کەل و پەل و دیارەکانی ژینگە سنووردارەکەی خۆی دەبێ کەئەویش خێزانە واتە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ فێری مانای شتەکانی ناو خێزان و ئەندامەکانی لەشی خۆی دەبێت و لەقۆناغی دواتریشدا بەرەو ژینگەی دەرەوەی خێزانی دەڕوات.

کەواتە لەقۆناغی شیرە خۆریدا کەنزیکەی دوو(٢)ساڵ دەخایەنێ گەشەکردن و سەلامەتی هەستەوەرەکان و کۆئەندامی دەماری ناوەندی ڕۆڵی گرنگ و ترسناک لەگەشەکردنی زانیاری و ژیری منداڵدا دەبینن، هەر لەبەر ئەو گرنگی و ترسناکیەشە کەدەبێت گرنگیەکی تەواو بەسەلامەتی و گەشەکردنی هەستەوەرەکان و کۆئەندامی دەماری ناوەندی منداڵ بدرێت و ژینگەی لەبارو گونجاو بۆ پێگەیشتن و کامڵ بوونیان بڕەخسێندرێت، لەبەر ئەوەی تەنها دەروازەو تاقە کەرەستەی سەرەکین بۆ وەرگرتن و لێکدانەوەی زۆربەی زۆری دیاردەکانی ژیان.

منداڵ سێ مانگی یەکەمی ژیانی بەخەوو خواردن و گریان بەسەر دەبات و کاتێکی زۆر کەم بۆ تێگەیشتنی چواردەورو گەردوونە بەرفراوانەکەی تەرخان دەکات. بەڵام لەمانگی سێهەمی ژیانییەوە ، ئیتر منداڵ وورده وورده لەڕێگەی هەستەوەرەکانیەوە خەریکی تێگەیشتن و هەست کردنی دیاردەکانی ژیانی دەبێت، دایک و باوک بەئاسانی دەتوانن هەست بەو گرنگی و

هەوڵدانەی منداڵەکانیان بکەن، چونکە منداڵ زۆر حەز بەسەیرکردن و سەرنج دانی ڕووداوو دیاردەکانی چواردەوری دەکات و ماوەیەکی زۆر چاویان تێ دەبرێت، هەروەها لەو ڕووداوو بینراوانەی کەزۆر جار لەبەرچاویان دووبارە دەبنەوە وەڕس دەبن و هەوڵی ئەوە دەدەن کەڕووی خۆیان بۆ ڕووداوو بینراوی نوێ و تازەتر وەربگێڕن.

منداڵ لەو کاتەوە کە لەتوانایدایە سەیری ئەو دیوی پەرژین و دیواری لانکەکەی بکات، ئیتر دەست بەهەڵهێنانی گرفت و زانینی دیاردەکانی چواردەوری دەکات. لەمیانەی مانگەکانی سێ بۆ حەفت (٣-٧) زۆر گۆڕانکاری گرنگ لەژیانی منداڵدا ڕوو دەدات کەیارمەتی گەشەکردنی زانیاری دەدەن، لەهەموویان گرنگتر یەک گرتن و پێکەوە کارکردنی هەردوو چاوو دەستەکانیەتی، واتە پێش ئەو تەمەنە زۆر زەحمەتە بۆ منداڵ بتوانێت ئەو شتانەی کەبەچاو دەیان بینێ لەهەمان کاتیشدا دەستیان بۆ درێژ بکات و بیان گرێت لەبەر ئەوەی هێشتا ئەو توانای پێکەوە کارکردنە لەلای دروست نەبووە بەڵام لەمانگی چوارەمی ژیانییەوە ئەو توانستەش وردە وردە سەردەردەهێنێ و ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش زیاتر گەشەدەکات، لەسەرەتاشدا هەرچ شتێک بکەوێتە بەردەم دەست و چاوی منداڵ ئەوا یەکسەر بۆ دەمی دەبات و گەرەکیەتی کە لەڕێگەی دەم و لێویەوە شارەزای ئەو کەرەستەو شتانە ببێت.

## هەست پێکردن و زانینی قوڵایی (إدراك العمق)

زۆر لەزانایان لەهەوڵی ئەوەدا بوون کەبزانن منداڵ لەچ تەمەنێکدا هەست بەقووڵایی و دووری سێهەم دەکات و زانیاری دەربارەی پەیدا دەکات، بۆ ئەم مەبەستەش چەند توێژینەوەیەکیان بەئاکام گەیاند ، ناوەڕۆکی ئەو توێژینەوانەش بریتی بوو لەدانانی سندوقێکی شووشە کە لەسەرێکیان (A) لەسەر شووشەکە کۆمەڵێک چوار گۆشەی ڕەش و سپی (وەک شەترەنج) دروست کرا بەڵام لەژێر شووشەی سەرەکەی ترلەقووڵایدا پەڕۆیەکی نەخشە کێشراو بەچوار گۆشەی ڕەش و سپی دانرا (B) کە گوزارشتی لەقوڵایی و بەرزی دەکرد، ئالەم کاتەدا منداڵێکی شیرە خۆریان دەهێناو لەو سەری کەلەسەر شووشەکە چوار گۆشە ڕەش و سپیەکان کێشرا بوو(A) منداڵەکە دادەنرا و دایکی منداڵەکەش لەو سەری (B) سندوقەکە بانگی منداڵەکەی دەکردو هانی دەدا لەسەر گاگۆڵکێ بەرەو لای خۆی، دوای چەند جار دووبارە کردنەوەی ئەو تاقی کردنەوەیە بۆ زۆربەی زاناکان دەرکەوت کەمنداڵی شیرە خۆرەی تەمەن (٦) شەش مانگ کاتێک دەگاتە ئەو هێڵەی کەبەشی (A) و (B) لەیەکتری جیادەکاتەوە یەکسەر دەوەستێت و بەهیچ شێوەیەک ناپەڕێتەوە بۆ بەری (B) چونکە وای دەزانی کەئەوە بەرزیەو دەکەوێتە خوارەوە، هەرچەندە دایکیشی لەئەو بەر (B) بانگی دەکردو هانی دەدا. لەدەرئەنجامی ئەو جۆرە توێژینەوانە زۆر لەزاناکان گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە ئەگەر هەست کردن و زانینی قوڵایی توانستێکی بۆ ماوەش نەبێت ئەوا لەتەمەنێکی زۆر بچووکدا لەلای منداڵ و بێچووی ئاژەڵ گەشەدەکات. لەبەناو بانگترین ئەو زانایانەش کەلەم جۆرە تاقی کردنەوانەیان کرد زانایان (جبسون)و (وەڵک) (Gibson and Walk) بوون کە لەساڵی (١٩٦٠) بەئاکامیان گەیاند. (زهران، ١٩٨١، ص١٣٤).

ئەو وورووژێنەرو شتانەی کە زیاتر سەرنجی شیرە خۆر ڕادەکێشن کامانەن؟:-

دەرەنجامی توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کەئەو وورووژێنەرو شتانەی لەحاڵەتی جووڵەو گۆڕاندان زیاتر لەوانەی کەوەستاوو نەگۆڕن سەرنجی شیرە خۆر بۆ خۆیان ڕادەکێشن و سەیریان دەکەن. بۆ نموونە ئەگەر منداڵی شیرەخۆری تەمەن (٥) پێنج ڕۆژە خەریکی مژینی مەمکی دایکی بێت، ئالەو کاتەدا ئەگەر تیشکێک یان ڕووناکیەکی بچووک کەلەحاڵەتی جووڵەدا بێت پیشانی ئەو منداڵە بدرێت، ئەوا یەکسەر لەمەمک مژینەکە دەوەستێت و سەرنجی ئەو ڕووناکیە دەدات، کەئەمەش بەڵگەیە کەهەست بەو ڕووناکیە دەکات و هەر لەبەر ئەوەشە کە بۆ ماوەیەکی کەم لەمەمک مژین دەوەستێت.

هەروەها ئەو وێنەو هێڵکاریانەی کەبەهێڵی خوارو خێچ و چەماوە کێشراون زیاتر لەوانەی کەبەهێڵی ڕاست کێشراون سەرنجی منداڵ بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن،لەلایەکی تریشەوە بازنە زیاتر لەچوارگۆشە سەرنجی منداڵ بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ هەروەها ئەو وێنەو دیاردانەی کەڕەنگاو ڕەنگن زیاتر لەوانەی کەڕەش و سپین سەرنجی منداڵ ڕادەکێشن. هەر ئەو خاسیەت و سیفاتانەی سەرەوەشە کەوا لەمنداڵ دەکات لەکاتی شیر خواردندا زیاتر سەیری چاوەکانی دایکی بکات نەک ئەندامەکانی تری دەم و چاوی، چونکە چاو خاسیەتەکانی (بازنەیە، جووڵە، گۆڕانکاری) زیاتر تێدایە. (مسن، ١٩٨٦، ص١٢٢-١٢٥).

گەشەکردنی جووڵەی منداڵ

جووڵە (الحركة) لەئەنجامی گرژبوونی یەکێک لەماسوولکەکان و خاوبوونەوەی ماسوولکەیەکی تری بەرانبەری دروست دەبێت، واتە لەئەنجامی جیاوازی نێوان هەردوو هێزی ڕاکێشان و پاڵنان، جووڵە لەدایک دەبێت.

دەتوانین بڵێین کە هەموو توێژینەوەکانی کۆرپەلەزانی (علم الأجنة)، لەسەر ئەوە ڕێک کەوتوون، کە بۆ یەکەم جار جووڵەی هەرەمەکیو لەخۆوەی کۆرپەلە، لەکۆتایی مانگی دووهەمی دروست بوونی کۆرپەلەوە دەست پێ دەکات، بەتایبەتیش جووڵەی هەردوو دەست و قاچ، هەروەها لەمانگی چوارەمی ژیانیدا، کۆرپەلە بەربەرچدانەوەی تایبەتی خۆی بۆ هەندێک وورووژێنەری ناو منداڵدان و دەرەوەی هەیە، بەڵام لەمانگی هەشتەمی ژیانیدا، جووڵەی کۆرپەلە وەک جووڵەی منداڵێکی تازە لەدایک بووی لێدێت. بەڵام نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت، کە باری هەڵچوونی ناٱسایی دایک وەک ترس یان توڕە بوونی زۆر دەبێتە هۆی زیاد کردنی جووڵەی کۆرپەلە، هەروەها چەند هیلاک و ماندوو بێت، ئەوەندە جووڵەی کۆرپەلە زیاد دەکات. بەڵام کاتێک دایک خواردن دەخوات و دەحەسێتەوە، جووڵەی کۆرپەلەش کەم دەبێتەوە، لەبەرئەوە زۆر گرنگە بەردەوام دایک ئاگای لەتەندروستی و جەستەی خۆی بێت و ئەرکی سەرشانی پیاوو ئەندامانی تری خێزانیشە، کە ژینگەی گونجاوو لەبار بۆ دایکی دووگیان برەخسێنن و نەهێڵن ئافرەتی سک پڕ تووشی ترس و خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێی بەردەوام ببێت، بۆ ئەوەی کۆرپەلەکەی بەشێوەیەکی ڕاست و دروست گەشە بکات.

منداڵی تازە لەدایک بوو زۆربەی کات لەسەر پشت پاڵ کەوتووەو توانای دانیشتن و گاگۆڵکێ ی نیەو ناتوانێت لەجێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر هات و چۆ بکات، چالاکی و جووڵەکانی منداڵی تازە لەدایک بوو هەرەمەکی و لەخۆوەیە (عشوائی)و نارێک و جۆراوجۆرو خێرایەو تایبەتمەندێتی تێدا نیە، هەموو وورووژێنەرێک دەتوانێت بیخاتە جووڵە، ناتوانێت بەویستی خۆی جووڵە بکات. بێگومان هەموو ئەو خاسیەتانەی سەرەوە بۆ لاوازیو پێنەگەیشتویی کۆئەندامی دەماری ناوەندی (الجهاز العصبي المركزي) ئەو منداڵانە دەگەڕێتەوە. لەلایەکی ترەوە زۆربەی جووڵەو هەڵس و کەوتەکانی منداڵی تازە لەدایک بوو پابەندە بەپرۆسە فسیۆلۆژیەکان، کە یارمەتی مانەوەی ژیانی منداڵ دەدەن وەک کردارەکانی (مژین، قووت دان، شت خستنە ناو دەمەوە، پژمین، هەناسەدان، چاوتروکاندن، ڕاچڵەکین، گرتنی هەر شتێک کە بکەوێتە ناو دەست) (زهران، ۱۹۸۱، ص۱۰۹).

***<u>گەشەکردنی جووڵەی منداڵ، وەک هەموو لایەنەکانی تری گەشەکردن بەپێی چەند پرانسیپێک بەرەو پێشەوە دەڕوات، لەوانە:</u>***

۱. منداڵ یەکەم جار بەسەر جووڵەی ئەندامەکانی بەشی سەرەوەی لەشیدا زاڵ دەبێت. بۆ نموونە لەسەرەتادا، منداڵ دەتوانێت کۆنترۆڵی جووڵەی سەرو مل و دەم و چاوی بکات، دواجار دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر چالاکی و جووڵەی ئەندامەکانی بەشی خوارەوەی لەش وەک قاچ و پێ و پەنجەکانی. لەمانگی سێهەمی دوای لەدایک بوون منداڵ لەڕێگەی هەردوو چاوەکانیەوە، دەتوانێت سەیری شتەکانی چواردەوری بکات، بەڵام زۆر بەزەحمەت دەتوانێت چاو بۆ ئەم لاو ئەو لای شتەکان بگێڕێ، لەبەرئەوەی هێشتا بەسەر جووڵەی ماسوولکەکانی چاویدا زاڵ نەبووە. بەڵام وردە وردە دوای پێ گەیشتنی ماسوولکەکانی چاوی، دەتوانێت چاو بە ئەم لاو ئەولادا بگێڕێ و سەیری شتەکانی لای ڕاست و چەپی خۆی بکات و دوای جووڵەو گۆڕانکاری کەل و پەل و شتەکانی چواردەوری بکەوێت. هەروەها دوای ماوەیەکی تر ماسوولکەکانی ملی گەشە دەکات و دەتوانێت سەری بەرز بکاتەوەو بە ئەم لاو ئەو لادا بیگێڕێ. بەهەمان شێوە دوای پێگەیشتنی ماسوولکەکانی ڕوومەت و دەم و لێوی، منداڵ لەدەوروبەری مانگی سێهەمی ژیانیدا دەتوانێت زەردەخەنە بۆ کەسانی چواردەوری پیشان بدات، هەروەها لەڕێگەی گرژبوون و گۆڕانکاری ڕوومەت و دەم و لێویەوە، دەتوانێت گوزارشت لەباری هەڵچوونی (خۆشی و ناخۆشی) بکات، کە ئەمەش دەبێت بەبناغەیەک بۆ ڕەوشتی کۆمەڵایەتی و وەڵامدانەوەی دەوروبەری.

منداڵ دەتوانێت لەماوەی شەش مانگی یەکەمی ژیانی، هەردوو دەستەکانی بۆ کەسانی چواردەوری بجووڵێنێ، لەسەرەتادا منداڵ هەوڵ دەدات دەست و هەموو پەنجەکانی بەیەک جار بخاتە ناو دەمیەوە، بەڵام دوای گەشەکردنی ماسوولکەکانیو زاڵ بوونی بەسەر جووڵەی دەست و پەنجەکانیدا، دەتوانێت تەنها یەک پەنجەی (بەتایبەتیش پەنجە گەورەی) بەمەبەستی مژینی بخاتە ناو دەمیەوە. هەروەها لەکۆتایی مانگی شەشەمدا، منداڵ دەتوانێت لەڕێگەی پەنجەو

ئینۆکەکانیەوە ئەو کەل و پەلانەی کە دەکەوێتە بەردەستی بیان ڕووشێنێ و هەوڵی دڕاندنیان یان کون کردنیان بدات، ئەویش بەمەبەستی شارەزا بوون و زانینی نهێنیەکانی. لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە ڕێگە بەمنداڵ بدرێت، بۆ ئەوەی بەئارەزووی خۆی بجووڵێت و کەل و پەلەکانی چواردەوری ئەم دیوو ئەودیو بکات، چونکە دەبێتە هۆی تەقاندنەوەی کانیاوی حەزوو ئارەزووی شت زانینی.

٢. جووڵەی منداڵ لەسەرەتادا هەرەمەکی و لەخۆوەو گشتیە. واتا هەموو ئەندامەکانی لەشی منداڵ بەیەکجار وەڵامی وورووژێنەرەکان دەدەنەوە. بەڵام دوای پێگەیشتن و گەشەکردنی ماسوولکەکان و دەمارە ووردەکان، منداڵ دەتوانێت بەیەک ئەندام یان بەشێک لەو ئەندامە وەڵامی وورووژێنەرەکان بداتەوە. بۆ نموونە کاتێک منداڵ بۆ یەکەم جار هەوڵی فێربوونی نووسین دەدات، ئەگەر بەووردی سەیری بکەین دەبینین لەکاتی نووسیندا (دەست و قاچ دەجووڵێنێ، زمانی دەردێنێ، لێوی خۆی دەگەزێ، پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر هەردوو دەستی). بەڵام دوای گەشەکردنی ماسوولکەکانی، منداڵ دەتوانێت تەنیا لەڕێگەی بەکارهێنانی ئەو ئەندامانەی کە پەیوەندیان بەچالاکی نووسینەوە هەیە (مەچەک، دەست، پەنجەکانی) ئەو کارە بەئەنجام بگەیەنێت بەبێ ئەوەی پێویستی بەجووڵەی ئەندامەکانی تری وەک قاچ و سەرو زمان و دەم و لێو هەبێت، کە هیچ پەیوەندیان بەنووسینەوە نیە.

٣. یەکەم جار منداڵ بەسەر جووڵەی ماسوولکە گەورەکانی لەشیدا زاڵ دەبێت، دواجار دەتوانێت بەسەر جووڵەی ماسوولکە ووردەکانی لەشیدا زاڵ ببێت و بۆ کاری پێویست بەکاریان بهێنێ، هەر ئەوەشە بۆتە هۆی ئەوەی کە منداڵ یەکەم جار ئەو یاریانە بکات کە پێداویستی بەجووڵەی ووردو بەدیقەت نیە، بەڵام دوای پێگەیشتن و گەشەکردنی وورده دەمارو ماسوولکەکان، منداڵ هەوڵ دەدات ئەو یاری و چالاکیانە بەئەنجام بگەیەنێت، کە پێداویستی بەووردەکاریو دیقەت و چالاکی ماسوولکەو دەمارە ووردەکانی لەش هەیە. هەر ئەم حاڵەتەشە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە یەکەم جار نووسینی منداڵ شاش و گەورە بێت و ووشەو پیتەکانی لەیەکتری دوورو خوارو خێچ دەربچن. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە منداڵ لەسەرەتادا ناتوانێت کۆنترۆڵی وورده دەمارو ماسوولکەکان بکات و لەژێر دەسەلاتی ئەودا نین، بەڵام دوای ماوەیەک گەشە کردن، منداڵ دەتوانێت بەپیتی بچووک بنووسێت و بەڕێک و پێکی چالاکی نووسین بەئەنجام بگەیەنێت.

هەر ئەو پرانسیپانەی گەشە کردنیشە کە بۆتە هۆی ئەوەی پەروەردەی نوێ داوای ڕەخساندن و دابین کردنی ژینگەی لەبارو گونجاو بکات، بۆ ئەوەی منداڵ ئەو هێزو ووزە زیادەی هەیەتی لەیاریکردن و هەڵبەزو دابەزدا سەرفی بکات، پێش ئەوەی داوای ئەوە لەمنداڵ بکات کە دەبێت هێمن. و لەسەرخۆو ووردەکار بێت، هەر ئەمەشە بۆتە هۆی ئەوەی کە قۆناغی گوزارشت کردنی سەربەست پێش قۆناغی گوزارشت کردنی ووردەکاری دیاریکراو بێت (السید، ١٩٧٤، ص١٢٣-١٢٥).

## چاودێری کردنی گەشەی جووڵەی منداڵ

بۆچوونێکی هەڵە لەلای زۆر لەدایکان و باوکان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو باوک و دایکانە زۆر جار ئەو منداڵانە بەزیرەک و بلیمەت و ژیرو لێهاتوو لەقەڵەم دەدەن، کە بێدەنگ و کەم دوو کەم جووڵەن، ئەمەش لەوانەیە لەبەرئەوە بێت کە گەورەکان خۆیان حەز بە بێدەنگی و لەسەرخۆیی و هێمنی دەکەن. بەڵام بەداخەوە ئەو بۆچوونە هەڵەیەو لەتەک پرانسیپەکانی گەشەکردندا ناگونجێت، لەبەرئەوەی منداڵ لەسەرەتای ژیانیدا پێویستیەکی زۆری بەجووڵەو هەڵبەزو دابەزو هات و هاوار هەیەو ئەو چالاکیە لەخۆوەو هەڕەمەکیانە دەبن بە بناغە بۆ گەشەکردنی ئاسایی منداڵ.

گەورەترین هەڵەی دایک و باوک و مامۆستا ئەوەیە کە بەربەست و ڕێگر لەبەردەم جووڵەو هەڵس و کەوتی منداڵدا دابنێن. پێویستی سەر شانی دایک و باوک و مامۆستایە کە ژینگەی لەبارو گونجاو بۆ گەشەکردنی جووڵەی منداڵ دابین بکەن، ئەگەر هەڵەیان کرد، پێویستە بۆیان ڕاست بکرێتەوەو ئامۆژگاری و ڕێنمایی بکرێن، نابێت بەهیچ شێوەیەک گەورەکان بەردەوام دەست بخەنە ناو هەموو چالاکیەکانی منداڵ ئیتر کچکە بێت یان گەورە، هەروەها کاتێک منداڵ هەڵەیەک دەکات نابێت بەتوندی بەرگری بکرێت و ئازار بدرێت، بەڵکو دەبێت بۆ چالاکیو جووڵەی ڕاست و دروست ڕێنمایی بکرێت.

### ئەو هۆکارانەی کار دەکەنە سەر گەشەکردنی جووڵەی منداڵ:-

زۆر هۆکار هەن کار دەکەنە سەر گەشەکردنی جووڵەی منداڵ، لەبەرئەوە دەبێت لەکاتی مامەڵە کردن لەگەڵ چۆنیەتی و ڕێژەی گەشەکردنی جووڵەی منداڵ ئاگاداریان بین. لەگرنگترین هۆکارەکانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:-

#### ١- لایەنی جەستەیی و تەندروستی:-

دەرئەنجامی توێژینەوەکانی (ویش، کامبیل) ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان کێش و تەندروستی منداڵان و توانای دانیشتن و گاگۆڵکێ و ڕۆیشتنیان هەیە. واتا ئەو منداڵانەی نەخۆش و لاواز نین و تەندروستیان باشە، خێراترو باشتر فێری دانیشتن و گاگۆڵکێ و ڕۆیشتن دەبن ئەگەر بەراورد بکرێن بەو منداڵانەی کە زۆربەی کات نەخۆش و لاوازو زەرد هەڵگەڕاون.

٢- دواکەوتنی ژیری:-

توێژینەوەکانی (سکوت، سمیپ) ئەوەیان سەلماند کە ئەو منداڵانەی تووشی دواکەوتنی ژیری (تخلف عقلی) بوون، ناتوانن وەک منداڵە ئاسایی و زیرەک و بلیمەتەکان فێری جووڵەو چالاکی ئەندامەکانی لەشیان ببن و درەنگتر دەتوانن کۆنترۆڵی چالاکی ماسوولکەکانیان بکەن.

٣- کەسێتی منداڵ:-

ڕاستیەکی بەڵگەنەویستە کە جۆری کەسایەتی و باری دەروونی منداڵ پەیوەندییەکی پتەوی بەجۆرو ڕێژەی چالاکیەکانیەوە هەیە. بۆ نموونە ئەو منداڵانەی کە لەخێزان و ژینگەی دواکەوتوو پڕ لەهەڵەدا پەروەردە دەکرێن و بەدەستی شەرم و گۆشەگیری و خەمۆکی و نازداری و شەرخوازییەوە دەناڵێنن درەنگتر فێری جووڵەو چالاکی ئەندامەکانی لەشیان دەبن و لەزۆر لایەنی جووڵەوە تووشی گرفت و کەم و کورتی دەبن ئەگەر بەراورد بکرێن بە ئەو منداڵانەی کە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست پەروەردە دەکرێن و کەسایەتیەکی پتەویان هەیەو لەزۆر گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی بەدوورن. (فهمي، ١٩٧٩، ص٥٧-٥٨).

٤- ژینگەی گونجاوو لەبار:-

بێگومان ئەو منداڵانەی کە لەژینگەی (خێزان، قوتابخانە، کۆمەڵ... هتد) دەوڵەمەندو گونجاوو لەباردا دەژین و ئامرازەکانی یاریکردن و گەشەکردنیان بۆ دابین دەکرێت و بەردەوام پشتگیری دەکرێن و لەلایەن دایک و باوک و مامۆستاکانیانەوە هان دەدرێن و بواری جووڵەو چالاکیەکانیان بەرفراوانە، زووترو باشتر کۆنترۆڵی چالاکی و جووڵەی ئەندامەکانی لەشیان دەکەن و سەرکەوتنی گەورە لەبواری چالاکیو جووڵەدا بەدەست دەهێنن، لەبەر ئەوە ئەرکی سەرشانی خێزان و قوتابخانەو دام و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی ترە کە ژینگەی گونجاوو لەبار بۆ گەشە کردنی جووڵەی منداڵەکانیان بڕەخسێنن و ئامرازو کەرەستەکانی یاریکردنیان بۆ دابین بکەن و بەردەوام هانیان بدەن و هەڵەکانیان بۆ ڕاست بکەنەوە.

**پێوەرەکانی گەشەکردنی جووڵەی منداڵ لەقۆناغی شیرە خۆریدا:**

نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت کە ڕێژەی گەشە کردنی جووڵەی هەموو منداڵان وەک یەک نین بەڵکو لەئەنجامی ئەو هۆکارانەی کە باسکران جیاوازی تاکایەتی (الفروق الفردية) لەنێوان منداڵاندا هەیە، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەتوانین چەند پێوەرو نەخشەیەک بۆ چۆنیەتی گەشەکردنی جووڵەی منداڵ دابنێین. بێگومان ئەو پێوەرو نەخشانە لەسەر ژمارەیەکی زۆر لەمنداڵان دانراوەو گوزارشت لەناوەندی ژمێرەیی (المتوسط الحسابي) ئەو منداڵانە دەکات و دەتوانرێت تاڕادەیەکی باش سوودی لێ وەربگیرێ بۆ دەست نیشان کردنی گەشەی ئاسایی جووڵەی منداڵان و جیاکردنەوەو ناسینەوەی ئەو منداڵانەی کە تووشی دواکەوتنی جووڵەیی‌و چالاکی ئەندامەکانی لەشیان تووشی کەم و کورتی بوون، ئەم خشتەیەی خوارەوەش جووڵەی ئاسایی زۆربەی منداڵان تاتەمەنی (٢٤) مانگی ڕوون دەکاتەوە.

| تەمەن بەمانگ | جۆری جووڵەو چالاکیەکان |
|---|---|
| ٠ | درێژ بوون لەسەر ڕوومەت و دەم و چاو. |
| ١ | سەری بەرز دەکاتەوەو دەتوانێت بیسووڕێنێ. |
| ٢ | سنگی بەرز دەکاتەوە |
| ٣ | دەتوانێت دەست بۆ شت درێژ بکات بەڵام ناتوانێت بیگرێت، بەهەردوو پێیەکانی پەلەقاژێ دەکات. |
| ٤ | بەیارمەتی کەسانی تر دەتوانێت دابنیشێت. |
| ٥ | بەبێ پاڵپشت دادەنیشێ و دەتوانێت شت بەدەستی بگرێت، هەروەها شتەکان لەدەستێکەوە بۆ دەستەکەی تری دەگوێزێتەوە. |
| ٦ | بەتەنها لەسەر کورسی دادەنیشێ، دەست بۆ شت ڕادەکێشێ، زۆربەی ئەو شتانەی دەکەوێتە بەردەستی دەیخاتە دەمیەوە. |
| ٧ | بەتەنها دادەنیشێ. |
| ٨ | دەتوانێت بەیارمەتی کەسانی تر ڕابوەستێت |
| ٩ | دەتوانێت بەهۆی دەست گرتن بەشتەوە ڕابوەستێت. |
| ١٠ | گاگۆڵکێ دەکات. |
| ١١ | بەیارمەتی کەسانی تر دەتوانێت بڕوات بەڕێوە. |

| | |
|---|---|
| ١٢ | بەیارمەتی شتی ناومالّ دەتوانێت ڕابوەستێت، پەرداخ بەدەستەوە دەگرێت بۆ خواردنەوە، دەتوانێت هێلی لابەلایی و شەقلی و پەقلی بکێشێ. |
| ١٣ | بەگاگۆلکێ بەسەر قادرمەو پێ پلیکاندا سەردەکەوێت. |
| ١٤ | بەتەنها بەپێوە دەوەستێت. |
| ١٥ | بەتەنهاو بەبێ یارمەتی دەڕوات بەڕێوە. |
| ١٦ | دەتوانێت بەدوو شەش پالّوو تاوەرو عەمودێک دروست بکات. |
| ١٧ | دەتوانێت بەدەستەکانی تۆپ فڕێ بدات. |
| ١٨ | تۆپ و شت دەخاتە ناو سندوقەوە، بەسێ شەش پالّوو تاوەر دروست دەکات. |
| ١٩ | دەتوانێت بەسەر کورسیدا سەربکەوێت. |
| ٢٠ | بەیارمەتی کەسانی تر دەتوانێت بەسەر قادرمەو پێ پلیکاندا سەربکەوێت و بێتە خوارەوە. |
| ٢١ | لەژێر چاودێری کەسانی تر دەتوانێت لەدەرەوەی مالّ هات و چۆ بکات، دەتوانێت بۆ دواوە بگەڕێتەوە. |
| ٢٢ | بەپێیەکانی دەتوانێت شەق لەتۆپ هەلّبدات. |
| ٢٣ | دەتوانێت پەڕەکانی کتێب و دەفتەر هەلّبداتەوە. |
| ٢٤ | ڕادەکات، لاسایی نووسین و کێشانی هێل کاری دەکاتەوە، بەتەنها دەتوانێت بەسەر قادرمەدا سەربکەوێت و بێتە خوارەوە، دەتوانێت سێ پارچە تەختەی جیاواز (بازنە، چوارگۆشە، سێ گۆشە) بخاتە ناو شوێنی خۆی کە لەناو تابلۆیەکدا (لوحة) هەلّ کەندراوە، لەڕێگەی شەش پالّووەوە تاوەرێک دروست بکات، هەوڵی نوشتاندنەوەی کاغەزو لاپەڕەی پەڕاوو دەفتەر دەدات، (زهران، ١٩٨١، ص١٣٠). |

# زیرەکی و گەشەکردنی ژیری لەروانگەی (جان پیاجیە)وە
# زاراوەکانی تیۆرەکەی پیاجیە
# قۆناغەکانی گەشەکردنی ژیری ( عەقلی ) لە ڕوانگەی پیاجیە
# ئەرکەکانی دایک و باوک بە پێی تیۆرەکەی پیاجیە

## زیرەکی و گەشەکردنی ژیری لەروانگەی (جان پیاجیە)وە

**پێشەکی:**

زیرەکی (الذکاء)و ژیری (عقل) وەک دیاردەیەکی دەروونی، گرنگی تایبەتی خۆی لەژیانی مرۆڤ و بونیاتنانی شارستانیەتدا هەیە، زۆر لەزاناکان خەریکی لێکۆڵینەوەی ئەو بابەتە بوون و ئێستاش هەر بەردەوامن، هەندێک لەزاناکان زیرەکی و ژیری بەیەک چاو سەیر دەکەن و هیچ جیاوازییەک لەنێوانیاندا ناکەن، بەڵام هەندێکی تر لەزاناکان ئەو دوو چەمکە لەیەکتری جیا دەکەنەوەو بەجیا باسیان لێوە دەکەن، بەڕای ئەوان زیرەکی بەشێکە لەژیری، واتە ژیری بەرفراوانترەو هەموو پرۆسەو توانستە ژیرییەکان لەخۆ دەگرێت.

یەکێک لەگرنگترین و بەناوبانگترین لەزاناکان کە توێژینەوەی لەسەر زیرەکی و گەشەکردنی ژیری کردبێ و پسپۆری تەواوی تیا وەرگرتبێ، دەروونزانی سویسری (جان پیاجیە)یە کە بەتاکە سوارو کەڵەزانای ئەو بوارە لەقەڵەم دەدرێت و تاوەکوو ئەمڕۆ زانایەکی تری وەک ئەو لەو بوارەدا هەڵ نەکەوتووە کە بتوانێت شان لەشانی پیاجیە بدات.

جان پیاجیە لەساڵی (١٨٩٦) لەشاری نیوتشاتل (Neuchatel) لەسویسرا چاوی بەدنیا هەڵهێناوە.. زیرەکی و بلیمەتی پیاجیە (Piaget) هەر لەمنداڵییەوە بەدەرکەوتووە، هێشتا تەمەنی (١٠) دە ساڵان بوو کە توانی بۆ یەکەم جار بەرهەم بڵاو بکاتەوە، هەر لەتەمەنی (١٥) پانزدە ساڵیەوە خولیای توێژینەوەی زیندەوەرزانی کەوتە مێشکیەوەو دەستی کرد بەلێکۆڵینەوەی بوونەوەرە بچووک و ئاوییەکان (الکائنات المائیة). لەساڵی (١٩١٥) کە هێشتا تەمەنی (١٨) هەژدە ساڵان بوو بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەزانکۆی نیوتشاتل وەرگرت، دوای ئەوە بە(٣) سێ ساڵ لەتەمەنی (٢١) بیست و یەک ساڵیدا توانی بڕوانامەی دکتۆرا لەزیندەوەرزانیدا (علوم الحیاة) وەربگرێت، هەر لەتەمەنی (٢١) بیست و یەک ساڵیدا توانی (١٥) پانزدە ڕاپۆرتی زانستی دەربارەی هەندێک لەزیندەوەرە بچووکەکان بڵاو بکاتەوە، کە ئەو کارەش بووە مایەی ئەوەی کە ناوبانگی لەزۆربەی وڵاتە پێش کەوتووەکانی جیهاندا بڵاو ببێتەوە (الأزیر جاوی، ١٩٩٠، ص١٢).

لەسەرەتادا بواری گرنگی دان و توێژینەوەکانی پیاجیە تایبەت بوو بەزیندەوەرزانی (بایۆلۆجیا، علوم الحیاة)، بەڵام وەک دەردەکەوێت ئەو بوارە نەیتوانیوە تینویەتی زانستی (پیاجیە) بشکێنێ و تێری بکات، لەبەر ئەوە هەڵگیەو بنەو ماڵ و حاڵی خۆی لەبواری زیندەوەرزانیەوە بۆ بواری دەروونزانی دەگوێزێتەوەو بابەتی گەشەکردنی زیرەکی و ژیری منداڵ سەرنجی پیاجیە بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و نزیکەی (٥٠) ساڵی ڕەبەق ئەم کەڵە زانایە ژیانی خۆی بۆ زانین و دۆزینەوەی نهێنیەکانی زیرەکی منداڵ و چۆنیەتی گەشەکردنی ژیری تەرخان دەکات و لەبواری (genetic Epistemology) بەپلەی یەکەم خۆی خەریک دەکات، کە ئەم بوارەش (ئیپیستۆمۆلۆژی)

گرنگی بەچۆنیەتی و بنەمای گەشەكردنی زانست و زانیاری و مەنتیق دەدات و بەقوڵی لەڕەگ و ڕیشەو لق و پۆپەكانی زانست و بوارە جیاجیاكانی دەكۆڵێتەوە. (الحفنی، ١٩٧٨، ص٢٧٤).

**بنەمای فەلسەفی تیۆرییەكەی جان پیاجیە:**

بۆ ئەوەی بەتەواوی ئاشنای تیۆرییەكەی جان پیاجیە ببین، دەبێت بزانین ئەم تیۆرییە (نظریة) لەسەر چ فەلسەفەو بیرو باوەڕێک بنیات نراوەو پشت بە چ فەیلەسووفێک دەبەستێت، ئەو بنەماو چوارچێوەی كە تیۆرییەكەی پیاجیە پشتیان پێ دەبەستێت زۆر جیاوازە لەو بنەمایانەی كە دەروونزانانی ئەمریكی بەتایبەتیش دەروونزانانی سەر بەڕێبازی قوتابخانەی ڕەوشتایەتی (المدرسة السلوكیة) پشتیان پێ دەبەستن. تیۆرییەكانی دەروونزانانی ئەمریكی بەپلەی یەكەم پشت بەبیرو باوەڕی هەردوو فەیلەسووف (جۆن لۆك)و (هیوم) دەبەستن، كە ئەم دوو فەیلەسووفە لەو بڕوایەدان، مرۆڤ لەڕێگەی وەحی خودایی و مەنتیقیەوە زانیاری و ژیری دەست ناكەوێت، بەڵكو زانیاریو شارەزایی تەنها لەڕێگەی هەستەوەرەكانەوە (الحواس) وەردەگیرێت، بەبڕوای (جۆن لۆك)و (هیوم) عەقڵی مرۆڤ بریتیە لەلاپەڕەیەكی سپی نەنووسراو، كە لەڕێگەی ئەو زانیاری و شارەزاییانەی كە بەردەوام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەمیانەی هەستەوەرەكانەوە وەری دەگرێت، لاپەڕەكانی ڕەش دەكرێتەوەو ووروژێنەرو ڕووداوەكانی جیهانی دەرەوەش لەڕێگەی پێكەوەلكاندن و پەیوەست بوونیان (الأرتباط) بەردەوام شوێن پەنجەی خۆیان لەسەر ئەو لاپەڕە سپیەی عەقڵی مرۆڤ بەجێ دەهێڵن.

بەڵام بنەماكانی تیۆرییەكەی پیاجیە پشت بەنووسین و بیرو باوەڕەكانی فەیلەسوفی ئەڵمانی (ئیمانیۆل كانت) دەبەستێت. پیاجیە لەو بڕوایەدا بوو كە نووسین و بیرو بۆچوونەكانی هەردوو فەیلەسووف (جۆن لۆك)و (هیوم) كەم و كورتی و نووقستانی تێدایە. پیاجیە وەک (لۆك)و (هیوم) بڕوای بەوە هەیە كە هەستەوەرەكان گرنگ و پێویستن بۆ وەرگرتنی زانیاریو شارەزایی لەجیهانی دەرەوە، بەڵام گومانی لەوە هەیەو بڕوای بەوە نیە كە هەستەوەرەكان تەنها هۆكارو دەروازە بن بۆ بوونیاتنانی ژیری و ڕێک خستنی زانیارییەكان لەناو عەقڵی مرۆڤدا. هەر لەبەر ئەوەش بوو كە بڕوای تەواو لەلای پیاجیە دروست بوو كە مرۆڤ هەر بە بۆ ماوە توانستێكی تایبەتی هەیە كە سیستەم و مانای گونجاو لەعەقڵدا بەو زانیاریو شارەزاییانە دەدات كە لەڕێگەی هەستەوەرەكانەوە وەری دەگرێت (عیسی، ١٩٨١، ص٩).

بەم شێوەیە بۆچوونەكانی (كانت) بوون بەبنەماو هەوێنی تیۆرییەكەی پیاجیەو بەردەوام لەو ڕوانگەوە پیاجیە دەیڕوانیە جیهان و دیاردەكانی. پیاجیە بەپێچەوانەی (جۆن لۆك)و (هیوم)ەوە لەو بڕوایەدا بوو كە عەقڵی منداڵ دوای لەدایک بوون لاپەڕەیەكی سپی نیە، بەڵكو توانستێكی (القدرة) چالاک و كاریگەرەو هەموو ئەو زانیاری و شارەزاییانەی كە لەڕێگەی هەستەوەرەكانەوە وەردەگیرێت دەیان خاتە ژێر ڕكێف و كۆنترۆڵی خۆیەوەو بەشێوەیەكی گونجاوو دروست ڕێكیان

دەخات. بڕوای تەواویشی بەوە هەبوو کە زۆر توانست و بیرو بۆچوونی تایبەت بە(کات، شوێن، بەردەوامی شتەکان.... هتد) بۆ ماوەن و تاک یەکسەر لەکاتی لەدایک بوونەوە خاوەنیانە.

***زاراوەکانی تیۆرییەکەی پیاجیە:***

بۆ ئەوەی بەتەواوی لەناوەرۆک و کرۆکی تیۆرییەکەی پیاجیە تێبگەین، دەبێت بەووردی شارەزای ئەو زاراوانە (المصطلحات) ببین کە پیاجیە لەتیۆرییەکەیدا بەکاریان دەهێنێت. وەک لەپێشەکی ئەم باسەدا ئاماژەمان بۆ کرد گۆڕەپانی یەکەمی کار کردنی پیاجیە زیندەوەرزانی بوو، هەر لەبەر ئەوەشە کە زۆربەی زاراوەو چەمکەکانی تایبەتن بەبواری زیندەوەرزانی و بۆ هەمان مەبەستیش لەبواری دەروونزانیشدا بەکاریان دەهێنێ. لەگرنگترین چەمک و زاراوەکان ئەمانەی لای خوارەوەن:-

***1. هێلکاری (مخطط) (Schema):-***

دەتوانین بڵێین هێلکارییەکان وەک دۆسییەک (فایل) وان کە ژمارەیەک کارتی تێدا پارێزراوە، هەر کارتەش ئاماژە بۆ ناوو خاسیەتی دیاردە یان شتێک یان ڕووداوێک لەجیهانی دەرەوە دەکات و لەکاتی پێویستدا لەڕێگەیانەوە ئەو دیاردەو شت و ڕووداوانەی پێ دەناسرێتەوە، بۆ نموونە کاتێک منداڵ ناوی باوک فێر دەبێت ئەوا کارتێک لەناو دۆسییە (ئەو هێلکارییە)ی ئەو منداڵەدا زیاد دەبێت، ئەگەر ناوی ئاژەڵێک فێر بوو ئەو کاتە کارتێکیش بۆ ئەو ئاژەڵەو... هتد. بەم شێوەیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەو جۆرو بارستایی ئەو هێلکارییانە بەرەو زیاد بوون دەڕوات. بەڵام ئەگەر وورووژێنەر (مثیر) یان ڕووداو یان شتێکی تازەی بۆ یەکەم جار بینی ئەوا بەیەکێک لەکارتە کۆنەکان لێکی دەداتەوە یان پاش ماوەیەک کارتێکی تازەی بۆ دروست دەکات و جێگای تایبەتی لەدۆسیە (هێلکاری) یەکەیدا بۆ دەکاتەوە.

بەڕای پیاجیە هێلکارییەکان (سکیماکان) بوونیاتی عەقلین و وەک ئەندام و بوونیاتە جەستەیی و فسیۆلۆژیەکان (بۆ نموونە گەدە، دڵ، گورچیلە... هتد)وان و میکانیزم و هۆکاری خۆسازاندنن و پارەمتی مانەوەو گەشە کردنی بوونەوەر دەدەن. ئەو هێلکارییانە بوونیاتی واتادارن (معنوی) وەک چەمکەکانی (ئەو) (من) (منی باڵا)ی (iD) (ego) (Superego) فرۆید، واتە شوێن و جێگای ماددیو دیاری کراویان لەمێشکی مرۆڤدا نیە بەڵکو لەڕێگەیانەوە پرۆسەی تێگەیشتن و گەشەکردنی ژیریو زیرەکی منداڵی پێ لێکدەداتەوە. بە بۆچوونی پیاجیە، منداڵ یەکسەر دوای لەدایک بوون ژمارەیەکی کەمی لەو هێلکارییانە هەیە (واتە ژمارەیەک کارتی بچووک لەدۆسیەکەدا هەیە) بەڵام بەشی خۆسازاندنی ناکات، هەر لەبەر ئەوەشە کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەئەنجامی گەشەکردن و زیاد بوونی زانیاری و شارەزاییەوە ژمارەو جۆری هێلکارییەکان زیاد دەبن.

## ٣- مژین (التمثل) (Assimilation):

لەزیندەوەرزانیدا مژین ئەو پرۆسەیە کە لەڕێگەیەوە ووروژێنەرو دیاردەو ڕەگەزەکانی دەرەوە بۆ حاڵەتێکی وا دەگۆڕدرێت کە لەتوانای لەشی مرۆڤدا هەبێت کە سوودیان لێوەربگرێت، بۆ نموونە خواردن (نان، گۆشت... هتد) کە لەدەرەوەی مرۆڤن بەو شێوەی کە هەن، جەستە (لەش) سوودیان لێوەرناگرێت لەبەر ئەوە دەبێت بەچەند قۆناغێکدا (لەت کردن، جووین، لیک ڕژاندن، قووت دان، هەرس کردن لەناوگەدە... هتد) تێبپەڕێت تا لەتوانای لەشدا هەبێت کە سوودیان لێوەربگرێت، ئەم پرۆسەی گۆڕانکارییە لەزیندەوەرزانیدا بە(مژین) ناو دەبرێت. ئینجا پیاجیە پرۆسەی وەرگرتنی ووروژێنەرەکانی جیهانی دەرەوەو لێکدانەوەیان لەقۆناغی یەکەمی پرۆسەی ژیریدا بەهەمان زاراوەو شێوازی پرۆسەی هەرس کردن لەزیندەوەرزانیدا لێک دەداتەوە.

بەبۆچوونی پیاجیە مژین ئەو گۆڕانکارییانەیە کە بەسەر فشارو ووروژێنەرەکانی دەرەوەی مرۆڤدا دێت بۆ ئەوەی لەگەڵ جیهانی ناوەوەو جەستەی مرۆڤدا بگونجێت، کە ئەم گۆڕانکارییانەش شێوەو خاسیەتە ئەسڵی و ڕەسەنەکانی ووروژێنەرەکانی جیهانی دەرەوە دەگۆڕێت و وەک خۆی نایان هێڵێتەوە، کەواتە مژین ئەو پرۆسەیەیە کە ئاراستەکەی لەدەرەوە بۆ ناوەوەیە. بۆ نموونە منداڵ فێری ناوی ئاژەڵێکی وەک سەگ بووەو کارتی تایبەتی لەدۆسیەو هێڵکارییەکانیدا بۆ دروست کردووە، بەڵام ئەگەر ڕێکەوتی کرد ئەم منداڵە بۆ یەکەم جار لەگەڵ باوکی ڕێگای کەوتە ناو کێڵگەیەکەوەو لەوێ ئاژەڵێکی تری وەک مانگای بۆ یەکەم جار بینی، ئەگەر باوکی پرسیار لەمنداڵەکە بکات و بڵێت ئەو ئاژەڵە چییە؟ ئەوا بێ سێ و دوو ئەو منداڵە دەڵێ ئەو ئاژەڵە (سەگە) لەبەر ئەوەی هیچ کارت و هێڵکارییەکی بۆ ئەو ئاژەڵە تازەیە (مانگا) نیە، لەبەر ئەوە لەناو کارتەکاندا دەگەڕێت کام کارت و هێڵکاری لەم ئاژەڵە تازەیەوە نزیکە ئەوا لەڕێگەیەوە ئەو ئاژەڵە تازەیە وەک ووروژێنەرێکی تازە ناوزەد دەکات، نزیکترین کارتیش لەدۆسیەی ژیری منداڵەکەدا بێگومان کارتی (سەگە) چونکە ئەویش (دوو گوێ، چوار قاچ، کلک،... هتد)ی وەک مانگاکە هەیە. ئەم پرۆسەی ناونان و گۆڕین و دەست کاری کردنی ئەو ووروژێنەرە تازەیە (مانگا) مژینی پێ دەگوترێت.

پرۆسەی مژین مانای زیاد کردن و گەشەکردنی ژمارەو جۆری هێڵکارییەکان نیە، بەڵکو تەنها گەورەکردنی بارستایی هێڵکارییەکانە. ئەگەر هێڵکارییەکان وەک باڵۆنێک دابنێین، ئەوا پرۆسەی مژین بریتیە لەهەوا کردنە ناو باڵۆنەکەو گەورە کردنی نەک گۆڕینی شێوەکەی. واتە مژین پرۆسەیەکە دەبێتە هۆی گەورەکردنی هێڵکارییەکان نەک گۆڕینی شێوەیان یان دروست کردنی هێڵکاری تر، واتە مژین گۆڕانکاری چەندێتییە (کمیة) نەک چۆنیەتی (کیفیة). کەواتە پرۆسەی مژین ئەو پرۆسەیە کە لەمیانەیەوە گۆڕان و دەست کاریو داتاشین لەووروژێنەرو دیاردەکانی دەرەوەدا دەکرێت بۆ ئەوەی لەگەڵ کارت و هێڵکارییەکانی ناوەوەدا بگونجێت، بەبێ گوێ دان بەجەوهەرو ناوەرۆک و راستی و واقیعی ووروژێنەرو دیاردەکانی دەرەوە.

## ٤- خۆگونجاندن (المواءمة) (Accomodation):-

بریتیە لەپرۆسەی خۆگونجاندن لەگەڵ ووروژێنەرو دیاردەکانی جیهانی دەرەوە. جەستەی مرۆڤ لەرێگەی کۆمەڵێک میکانیزمی فسیۆلۆژیەوە بەردەوام خۆی لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی جیهانی دەرەوەدا دەگونجێنێت، بۆ نموونە ئەگەر پلەی گەرما لەدەرەوە گۆڕانکاری بەسەردا هات ئەوا جەستەی مرۆڤ لەرێگەی عەرەق ڕژتنەوە هەوڵ دەدات کە خۆی لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە کت و پڕەی جیهانی دەرەوەدا بگونجێنێت، ئەگەر مرۆڤ لەجێگایەکی ڕووناکەوە بۆ جێگایەکی تاریک ڕۆیشت ئەوا چاو لەرێگەی کۆمەڵێک گۆڕانکاری فسیۆلۆژیەوە خۆی لەگەڵ ئەو جێگا تاریکەدا دەگونجێنێت....هتد.

کەواتە پرۆسەی خۆگونجاندن گۆڕانکاری کردنە لەجیهانی ناوەوە بۆ وەڵامدانەوەی پێویستی گۆڕانکارییەکانی جیهانی دەرەوە، بەپێچەوانەی پرۆسەی مژین، پرۆسەی خۆگونجاندن ئاراستەکەی لەناوەوە بۆ دەرەوەیەو ووروژێنەرو دیاردەکانی دەرەوە گۆڕانکارییان بەسەردا نایە بەڵکو وەک خۆیان دەمێننەوە. (یعقوب، ١٩٨٢، ص٧١).

منداڵ کە بۆ یەکەم جار ڕوو بەڕووی ووروژێنەرو ڕووداوێکی تازە دەبێتەوە، ئەوا هەوڵ دەدات کە لەرێگەی کارت و هێڵکارییە کۆنەکانەوە مانای بزانێت و لێکی بداتەوە، بەڵام زۆر جار ئەم کارەی بۆ ناچێتە سەرو سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت. هەروەها هەندێک جاری تریش هێڵکاری نزیک و چوون یەک بەو ووروژێنەرو ڕووداوە تازەیە لەدۆسیەی کارتەکاندا بۆ لێک دانەوەو ناسینەوەی نیە. ئا لەم کاتەدا ئەو منداڵە دەکەوێتە بەردەم دوو ڕێگا یەکەمیان ئەوەیە کە دەبێت هێڵکارییەکی نوێ بۆ ئەو ووروژێنەرە تازەیە دروست بکات یان دەبێت ڕێگای دووهەم بگرێتە بەر ئەویش ئەوەیە کە دەبێت دەست کاری یەکێک لەهێڵکارییە کۆنەکان بکات و گۆڕانکاری تێدا بکات بۆ ئەوەی ئەو ووروژێنەرە تازەیەی پێ لێک بدرێتەوەو لەچوارچێوەیدا جێگای ببێتەوە، ئەم دوو ڕێگایە هەردووکیان ناودەبرێن بەپرۆسەی خۆگونجاندن، لەبەرئەوە خۆگونجاندن بریتیە لەپرۆسەی دروست کردنی هێڵکاری تازە یان دەست کاری و گۆڕانکاری کردن لەهێڵکارییە کۆنەکاندا، کە لەئەنجامی ئەو پرۆسەیەوە گۆڕانکاری لەبوونیاتی زانیاری و جۆری هێڵکارییەکاندا دەبێت (الأزیر جاوی، ١٩٩٠، ص٢٤).

بۆ نموونە کاتێک منداڵی نموونەی پێشوومان کە بۆ یەکەم جار لەکێڵگەکەدا ئاژەڵێک (مانگا) دەبینێ و باوکی پێ ی دەڵێت ئەوە چییە؟ منداڵەکەش لەوەڵامدا دەڵێت ئەوە سەگە، ئا لەم کاتەدا ئەگەر باوک وەڵامەکەی بۆ ڕاست کردەوەو جیاوازی نێوان مانگاو سەگی بۆ ڕوون کردەوەو زانیاری زیاتری دەربارەی جۆری ئاژەڵەکان بەمنداڵەکەیدا، ئەوا منداڵەکە گۆڕانکاری لەوەڵامەکەیدا دەکات و لەرێگەی دروست کردنی هێڵکارییەکی تازە بۆ مانگاو دانانی لەناو دۆسیەی کارتە کۆنەکانیدا خۆی لەگەڵ ئەو ووروژێنەرە تازەیەدا (مانگا) دەگونجێنێت.

## ٥- هاوسەنگی (التعادل، التوازن) (Equilibrium):-

هاوسەنگی بریتییە لەرزگار کردنی بوونەوەر لەگرژی و ناڕەحەتی و گەڕاندنەوەی بۆ دۆخی هاوسەنگی پێش گرژی و ناڕەحەتییەکەی. بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤ لەئەنجامی برسێتییەوە تووشی گرژی و ناڕەحەتی بوو، ئەوا دەبێت ئەو مرۆڤە بکەوێتە خۆو لەڕێگەی بیرکردنەوەو گەڕان و هەوڵ و کەوتەوە خواردنی دەست بکەوێت، بۆ ئەوەی لەو برسێتی و گرژی و ناڕەحەتیە رزگاری بێت و بگەڕێتەوە دۆخی جارانی و هاوسەنگی بۆ بگەڕێتەوە. بەهەمان شێوەش ئەگەر مرۆڤ لەیەک کاتدا دوو مانای جیاوازو دوو لێکدانەوەی دژ بەیەکی لەبەرانبەر یەک دیاردەدا لەلا دروست بوو، ئەوا تووشی گرژی و ناڕەحەتی دەروونی دەبێت و هاوسەنگی ژیری و زانیاری لەدەست دەدات، ئینجا دەبێت لەڕێگەی بیرکردنەوەو پرۆسە ژیرییەکانی ترەوە لەو گرژی و ناڕەحەتیە رزگاری بێت و هاوسەنگی بۆ بگەڕێتەوە.

### بۆچی و چۆن زیرەکی و ژیری منداڵ زیاد دەکات:-

بەپێی تیۆرییەکەی پیاجیە لەڕێگەی هەردوو پرۆسەی مژین و خۆگونجاندنەوە (تمثل، مواءمة) ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زانیاری و شارەزایی منداڵ و ژمارەو جۆری هێلکارییەکان بەرەو زیاد بوون دەڕوات. بێگومان گەشەکردنی زانیاری و شارەزایی منداڵ پشت بەکۆمەڵێک هۆکار دەبەستێت لەوانە (ساغ و سەلامەتی کۆئەندامی دەماری ناوەندی‌و هەستەوەرەکان و گلاندەکان، ژینگەی ماددی و کۆمەڵایەتی، پرۆسەی کار لێککردن لەنێوان منداڵ و هەردوو ژینگە کۆمەڵایەتی و ماددیەکە).

بۆ ئەوەی زیرەکی و ژیری منداڵ بەتەواوی گەشە بکات، دەبێت هاوسەنگی نێوان هەردوو پرۆسەی مژین و خۆگونجاندن ڕابگیرێت و نابێت یەکێکیان بەسەر ئەوی تردا زاڵ ببێت. بۆ نموونە ئەگەر کەسێک هەبێت بەردەوام هەر ورووژێنەرەکان بمژێت بەبێ ئەوەی پرۆسەی خۆسازاندنی لەگەڵدا بێت، ئەوا دەرئەنجام ئەو کەسە دەبێت بەخاوەنی ژمارەیەکی زۆر لەهێلکاری گەورە بەڵام ناتوانێت جیاوازی لەنێوان شت و ووروژێنەرو دیاردەکاندا بکات، بەڵام ئەگەر ئەو کەسە بەپێچەوانەوە تەنها لەڕێگەی پرۆسەی خۆگونجاندنەوە هێلکارییەکانی دروست کردو پرۆسەی مژین ڕووی نەدا ئەوا ئەو کەسە دەبێت بەخاوەنی ژمارەیەکی زۆر لەهێلکاری بچووک و توانایەکی زۆر بچووکی بۆ گشتاندن (التعمیم) دەبێت و ناتوانێت سەرنجی ڕووداوو شتە لێک چووەکان بدات. کەواتە کارکردنی بەتەنهای هەریەک لەو دوو پرۆسەیە زەرەرو زیانێکی گەورە بەبوونیاتی زانیاری و گەشە کردنی ژیری تاک دەگەیەنێت.

کەواتە باڵەنس (موازنة، Balance) نێوان هەردوو پرۆسەی مژین و خۆگونجاندن زۆر گرنگە بۆ گەیشتن بەقۆناغی هاوسەنگی (التعادل)و زامن کردنی کار لێککردنی نێوان منداڵ و

ژینگەکەی، واتە هاوسەنگی بریتیە لەپرۆسەی لەنگەرگرتن و یەکسانی و بالەنسی نێوان هەردوو پرۆسەی مژین و خۆگونجاندن.

بۆ ئەوەی زانیاری و زیرەکی منداڵ وەک پێویست گەشە بکات، دەبێت منداڵ سەربەستی تەواوی خۆی هەبێت و زۆربەی کات لەحاڵەتی جووڵەو کارکردندا بێت و ژینگەو جیهانی دەرەوەشی پڕبێت لەووروژێنەرو ڕووداوو شارەزایی تا کانیاوی پەنگ خواردوی زیرەکی ئەو منداڵە بتەقێنێتەوە، هەروەها دەبێت هەستەوەرو کۆئەندامی دەماری ناوەندیو گلاندەکانی ساغ و سەلامەت بن، ئەو کاتە کارلێککردنی نێوان منداڵ و ژینگەکەی زامنی گەشەکردنی زیرەکی و ژیری دەکات.

دەتوانین بەم نموونەی خوارەوە تێگەیشتنی چۆنیەتی کارکردنی پرۆسەکانی (مژین، خۆگونجاندن، هاوسەنگی) ئاسان بکەین. بۆ نموونە منداڵێکی تەمەن یەک ساڵ و چەند مانگێک بۆ یەکەم جار باڵۆنێکی گەورەی پڕ لەهەوا دەبینێ. ئەم منداڵە یەکەم جار لەڕێگەی پرۆسەی مژینەوە هەوڵ دەدات کە بەهەموو هێزو توانای خۆی باوەش بەو باڵۆنەدا بکات و بەرزی بکاتەوە، چونکە وا دەزانێت زۆر قورسە ئەویش لەبەرئەوەی بارستاییەکەی زۆر گەورەیە، بەڵام کاتێک هەڵیدەگرێ، بۆی دەردەکەوێت کە سووکەو بەو شێوەیە نیە کە ئەو تێیگەیشتووە، ئەم جیاوازی نێوان بارستایی و کێشی باڵۆنە بۆ ماوەیەک مێشکی منداڵەکە داگیر دەکات و لەئەنجامی کەمی زانیارییەوە تووشی جۆرە گرژیو ناڕەحەتیەک دەبێت (لەدەست دانی هاوسەنگی) تا لەڕێگەی پرۆسەی خۆگونجاندنەوە هێلکارییەکی نوێ بۆ ئەو دیاردەیە (باڵۆنی گەورەی پڕ لەهەوا) دروست دەکات و لەو گرژی و ناڕەحەتیە ڕزگاری دەبێت و دەگەڕێتەوە دۆخی هاوسەنگی (التعادل).

## قۆناغەکانی گەشەکردنی ژیری (عەقڵی) لەڕوانگەی پیاجیەوە:-

پیاجیە لەو بڕوایە دایە کە گەشەکردنی عەقڵی منداڵ بەچەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت، هەریەک لەو قۆناغانەش خاسیەت و تایبەتمەندێتی خۆی هەیەو لەقۆناغەکانی تری جیا دەکاتەوە، بەڵام قۆناغی یەکەم دەبێت بەبناغە بۆ قۆناغی دووهەم و قۆناغی دووهەمیش بۆ قۆناغی سێهەم و قۆناغی سێهەمیش دەبێت بەبناغە بۆ قۆناغی چوارەم.

بەبڕوای پیاجیە هەموو منداڵانی دونیا بەو قۆناغانەدا تێدەپەڕن و هیچ منداڵێکیش ناتوانێت بگاتە قۆناغی سێهەم ئەگەر بەقۆناغی دووهەمدا تێنەپەڕێت. بەڵام لەتوانای ژینگەی مادی و کۆمەڵایەتیدا هەیە کە جیاوازی لەنێوان ئەو ساڵانەدا بکات کە پیاجیە دیاری کردووە، بۆ نموونە پیاجیە لەو بڕوایە دایە کە منداڵان لەتەمەنی (٧) ساڵاندا پێ دەنێنە ناو قۆناغی پرۆسە هەست پێ کراوەکانەوە (العمليات المحسوسة)، بەڵام مەرج نییە منداڵانی هەموو جیهان لەتەمەنی (٧) هەفت ساڵاندا بچنە ناو ئەو قۆناغەوە، چونکە ئەو منداڵانەی لەژینگەی هەژارو دواکەوتوودا دەژین

لەوانەیە لەتەمەنی (٨) هەشت یان (٩) نۆ ساڵاندا بچنە ئەو قۆناغەوە، بەڵام هەردەبێت بەو قۆناغانەدا تێبپەڕن هەرچەندە دوا یان پێش بکەون.

لەلایەکی تریشەوە ڕزگار بوون لەقۆناغێک و چوونە ناو قۆناغێکی ترەوە لەنێوان شەوو ڕۆژێک یان چەند ڕۆژێکی دیاری کراودا ڕوو نادات، ڕاستە پیاجیە تەمەن و ساڵەکانی چوونە ناو قۆناغەکانی دیاری کردووە، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە لەو ساڵ و کاتەدا یەکسەر گۆڕانکاری بنەڕەتی و جەوهەری ڕوو دەدات بەڵکو لەوانەیە هەست بەهیچ گۆڕانکارییەکی ڕوون و ئاشکرا تاماوەیەکی دیاری کراو نەکەین چونکە ڕزگار بوون لەقۆناغێک و چوونە ناو قۆناغێکی تر وەک چوونە ناو وەرزێکی ساڵ و ڕزگار بوونە لەوەرزێکی تر. بۆ نموونە کە دەڵێین ٣/٢١ وەرزی بەهارە، ئیتر ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە یەکسەر لە ٣/٢١ کەش و هەوا بەیەک جار دەگۆڕێ و بەئاسانی هەست بەجیاوازی پلەی گەرمای نێوان ڕۆژی ٣/٢٠ لەگەڵ ٣/٢١ دەکەین بەپێچەوانەوە لەوانەیە تاوەکوو تاوەڕاستی مانگی (٤) چواریش هیچ جیاوازیەکی جەوهەری بەدی نەکەین، بەهەمان شێوەش بەنیسبەت ٩/٢١ کە سەرەتای وەرزی پایزە تاماوەیەک هەست بەگۆڕانی بنەڕەتی کەش و هەوا ناکەین. کەواتە ئەو ساڵ و مانگ و ڕۆژانە زیاتر بۆ دیاری کردنی وەرزو قۆناغەکانە بەشێوەیەکی زانستیانە بەمەبەستی تیۆری بەڵام مەرج نیە بەهەمان شێوە گۆڕانکاری پراکتیکی و بنەڕەتی ڕوو بدات. بەڵام دەتوانین بەخاڵی دەست پێکردنیان دابنێین. بەبڕوای پیاجیە مرۆڤ لەو ڕۆژەوە کە لەدایک دەبێت تادەگاتە قۆناغی کامڵی لەلایەنی عەقلیەوە بەچوار (٤) قۆناغی سەرەکیدا تێدەپەڕێت، کە قۆناغەکانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:

أ- **قۆناغی (هەستی- جووڵەیی)** (المرحلة الحسية- الحركية):-

ئەم قۆناغە لەکاتی لەدایک بوونەوە دەست پێدەکات و نزیکەی دوو ساڵی یەکەمی ژیانی منداڵ دەخایەنێت. پیاجیە ئەم قۆناغەی ناو ناوە قۆناغی (هەست- جووڵەیی) (حس- حركي) ئەویش لەبەر ئەوەیە کە منداڵ لەم قۆناغەدا بەپلەی یەکەم پشت بەهەستەوەرەکان (الحواس)و جووڵەی ئەندامەکانی لەشی دەبەستێت لەکاتی شارەزا بوونی ژینگەو کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی چواردەوری. منداڵ (شیرەخۆرە) زۆر بەدەگمەن لەم قۆناغەدا پەنا بۆ بەکارهێنانی زمان و هێماکان (اللغة والرموز) لەکاتی خۆسازاندندا دەبات، چونکە چالاکیەکانی ئەم قۆناغە پێداویستیان بە بەکارهێنانی زمان و هێماکانی نیە، بۆ نموونە لەم قۆناغەدا منداڵ فێری ئەوە دەبێت کە ئەو شت و یاریەی لەژێر سەرین و پشتیدا شاردراوەتەوە بیدۆزێتەوە یان تام و چێژ لەڕاوەشاندنی شەق شەقە (زەنگۆڵەیەک) کە بەلانکەکەیدا هەڵواسراوە وەربگرێت، یان ئەو شتەی کە کەوتۆتە ژێر کورسیەکەوە دەری بهێنێت. ئەم چالاکیانەی پێداویستیان بەبەکارهێنانی زمان و هێماکان و وێنە عەقلیەکان نیە، ئەم چالاکیانەو چەندەها چالاکی تر ناو دەبرێن بەچالاکیەکانی پێش قۆناغی فێر بوونی زمان و بەکارهێنانی. ئەم قۆناغە دەبێت بەرەگ و ڕیشەو بناغە بۆ گەشەکردنی ژیریو بوونیاتنانی قۆناغەکانی تر.

منداڵ کاتێک لەدایک دەبێت تەنها چەند کارت و زانیاریو هێڵکارییەکی کەم و بچووکی بۆ خۆسازاندن لەگەڵ ژینگەو دەوروبەرەکەیدا هەیە، کە ئەوانەش بریتین لە(توانای مژین. شت

گرتن بەدەستەکانی، هاوار کردن، قووت دان، پەلەقاژێ ی ناڕێک.... هتد)، ئەم هێلکاریو توانستانە بۆ ماوەن و وەک ڕەمەک (غریزة) ئارادەیەک یارمەتی مانەوەو خۆسازاندنی (التکیف) شیرەخۆرە لەگەڵ ژینگەکەیدا دەدەن. بەڵام لەتەمەنی (٢) دوو ساڵیدا جۆرو بارستایی و ژمارەی هێلکارییەکان زیاترو گەورەترو ئاڵۆزتر دەبن ئەویش لەئەنجامی هەردوو پرۆسەی مژین و خۆگونجاندنەوە.

<u>پیاجیە قۆناغی (هەست- جوولەیی) بەسەر شەش (٦) قۆناغی بچووکتردا دابەش دەکات کە ئەو قۆناغانەش ئەمانەی لای خوارەوەن:</u>

۱. <u>قۆناغی پەرچە کردارەکان (الأفعال المنعکسة):-</u>

ئەم قۆناغە لەیەکەم چرکەی لەدایک بوونەوە تاکۆتایی مانگی یەکەمی ژیانی شیرە خۆرە دەخایەنێت. لەم قۆناغەدا شیرەخۆرە لەڕێگای ژمارەیەک پەرچە کردارەوە (کە هەر لەکاتی لەدایک بوونەوە هەن و منداڵ فێریان نابێت) خۆی لەگەڵ چواردەورەکەیدا دەگونجێنێ، ئەو پەرچە کردارانەش بریتین لە(توانای مەمک مژین و قووت دان، وەڵامدانەوەی هەموو ئەو ووروژێنەرانەی کە نزیک دەم و لێوی دەکەوێتەوە) لەم مانگەدا زیاتر گەشە دەکەن. هەموو زانیاری و زیرەکی منداڵ لەم قۆناغەدا لەچوارچێوەی ئەو پەرچە کردارو ڕەمەکانە دەرناچێت. جیاوازی لەنێوان ووروژێنەرەکاندا ناکات، واتە جیاوازی لەنێوان مەمکی دایکی و پارچە قوماشێکدا ناکات.

۲. <u>کرداره سەرەتاییە خولاوەکان (الأفعال الدوریة الأولیة):-</u>

ئەم قۆناغە لەکۆتایی مانگی یەکەم دەست پێدەکات و مانگی چوارەم کۆتایی دێت، واتە نزیکەی (٣) سێ مانگ دەخایەنێت، گرنگترین گۆڕانکاری کە لەم قۆناغەدا ڕوو دەدات، ئەوەیە کە ئەو پەرچە کردارو چالاکیە ڕەمەکی و بۆ ماوانە منداڵ زوو زوو دووبارەیان دەکاتەوە بەڵام بەبێ ئەوەی هیچ مەبەست و ئاکامێکی دیاریکراو بیبێ، واتە تەنها دووبارە کردنەوەیەکی بێ ئاکام و مەبەستەو هیچ کاریگەری و ڕۆڵێکی دیاری کراوی لەسەر ژینگە نابێت. بۆ نموونە شیرەخۆرە لەم قۆناغەدا چەند جار پرۆسەی (مژین، کردنەوەی ناولەپی دەست و داخستنی، هەڵەشەیی و پەلەقاژەی دەست و قاچەکان.... هتد) دووبارە دەکاتەوە، بەڵام هیچ گۆڕانکارییەک لەژینگەدا ناکەن، هەروەها لەم قۆناغەدا چەند چالاکیەکی نوێ دەردەکەوێت و هەندێک گۆڕانکاری لەپەرچە کردارەکاندا ڕوو دەدەن، بۆ نموونە شیرەخۆرە فێری پەنجە مژین دەبێت، بەچاوەکانی دوای ئەو ڕووناکیە دەکەوێت کە لەبەرانبەری دەردەکەوێت. سەرو ملی بۆ ئەو شوێنە وەردەگێڕێ کە دەنگی لێوەدێت، جیاوازی کردن لەنێوان هەندێک لەووروژێنەرەکان، شیرەخۆرە دەتوانێت جیاوازی لەنێوان ئەو شووشەیەدا بکات کە شیری تیایە لەگەڵ ئەو شووشەی کە شیری تێدا نیە. واتە ئەو شووشانە نامژێت و لەسەریان بەردەوام نابێت کە شیریان لێنایەتە دەرەوە. بەم شێوەیە لەم قۆناغەدا شیرەخۆرە هەندێک چالاکی نوێ فێر دەبێت و ژمارەیەکی تر هێلکاری بچووک و سادە دروست دەبن.

### ٣. کرداره ناوەندییه خولاوەکان (الأفعال الدورية الثانوية):-

ئەم قۆناغەش لەمانگی چوارەوە دەست پێ دەکات و لەمانگی (٨) هەشت کۆتایی دێت. لەم قۆناغە بەدواوە، زۆربەی چالاکی و کردارەکانی منداڵ مەبەست و ئامانجی تایبەتی خۆیان هەیەو منداڵ دەیەوێت لەڕێگەیانەوە کار لەژینگەو چواردەورەکەی بکات، بۆ نموونە کاتێک منداڵ لەم قۆناغەدا بەدەست و قاچەکانی بە ئەو یارییەدا دەکێشێ کە بەلانکەکەیدا هەڵواسراوە، مەبەستی تایبەتی خۆی هەیە ئەویش تام و چێژ وەرگرتنە لەجووڵاندن و ئەم سەرو ئەو سەر کردنی ئەو یارییە، یان کاتێک شەق شەقەو زەنگۆڵەکەی ڕادەوەشێنێ، مەبەستیەتی کە گوێ بیستی دەنگەکەی ببێت.

وەک دەردەکەوێت منداڵ لەم قۆناغەدا بەڕێکەوت ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە چالاکی و هەڵس و کەوتێکی ئەو (قاچ یان دەست ڕاوەشاندن) دەبێتە خۆشی و گۆڕانکاری لەژینگەکەیدا (جووڵاندنەوەی یاری یان دەنگ دروست بوون). هەر لەبەر ئەوەشە کە منداڵ دوای ئەو جارە چەندەها جاری تر ئەو چالاکیانە دووبارە دەکاتەوە بۆ ئەوەی ئەو گۆڕانکارییانە ببینێ و ببیستێ کە لەژینگەکەیدا ڕوو دەدەن، کە ئەمەش بەگۆڕانکارییەکی گرنگ لەبواری عەقلی ئەو منداڵەدا دادەنرێت، چونکە لەقۆناغی پێشووتر منداڵ هیچ مەبەستێکی دیاری کراوی لەچالاکیەکانیدا نەبوو، بەڵکو تەنها بۆ دووبارە کردنەوە بوو نەک بۆ گۆڕانکاری کردن لەژینگەکەیدا. هەروەها لەم قۆناغەدا منداڵ دەتوانێت هەردوو دەست و هەردوو چاوی لەیەک کاتدا بۆ بەئاکام گەیاندنی کارێک بەکار بهێنێت، هەر ئەمەشە وای لێدەکات کە هەموو ئەو شتانە بگرێت کە دەکەونە بەردەستی.

### ٤. هەم ئاهەنگی و هاوکاری نێوان هەموو کرداره ناوەندییه خووڵاوەکان (التآزر بين الأفعال الثانوية):-

ئەم قۆناغە دەکەوێتە نێوان مانگی هەشت و دوانزده (٨ - ١٢). لەم قۆناغەدا زانیاری و عەقڵی منداڵ زیاتر گەشە دەکات و منداڵ هەوڵ دەدات کە ئەو زانیاری و شارەزاییانەی کە هەیەتی بۆ هەڵهێنان و زانینی هەندێک گیروگرفت بەکاریان بهێنێ. ئەگەر لەقۆناغی پێشوو بەدەست و قاچەکانی سەرین و پشتیەکی دەجووڵاند بۆ ئەوەی تام و چێژ لەجووڵان و کەوتنە خوارەوەی وەربگرێت، ئەوا لەم قۆناغەدا بەدەست و قاچەکانی ئەم سەرین و پشتیە دەجووڵێنێ نەک تەنها بۆ ئەوەی تام و چێژ لەو چالاکیە وەربگرێت، بەڵکو بەمەبەستی دۆزینەوەو گەڕان بەدوای ئەو یارییەدا کە لەژێریدا شاردراوەتەوە. واتە لەم قۆناغەدا منداڵ فێری ئەوە دەبێت کە هەندێک شت ئامرازو کەرەستەن (الوسيلة) (جووڵاندنی سەرین) بۆ گەیشتن بەهەندێک مەبەست و ئامانجی دیاریکراو (دۆزینەوەی یاری). کەواتە لەم قۆناغەدا دەتوانێت پەیوەندی نێوان هۆو مەبەستەکان (الأسباب والغايات) هەست پێ بکات و هاوکاری لەنێوانیاندا بکات و پێکەوە بۆ یەک چالاکی بەکاریان بهێنێ، کە ئەمەش بەگۆڕانکارییەکی گرنگ لەبوونیاتی عەقڵی منداڵدا دادەنرێت.

**٥- سێهەم كرداره خولاوەكان (الأفعال الدورية الثالثة):-**

ئەم قۆناغەش دەكەوێتە نێوان (١٢ - ١٨) مانگی تەمەنی منداڵەوە. لەم قۆناغەدا منداڵ دەیەوێت لەرێگەی (هەوڵدان و هەڵە كردنەوە) (المحاولة والخطأ) ژینگەكەی تاقی بكاتەوەو لەمیانەی چەند جار دووبارە كردنەوەی ئەو هەوڵدان و هەڵە كردنەوە لەچوار دەورەكەی تێبگات و زانیاری زیاتر دەربارەی كۆبكاتەوە. لەم قۆناغەدا پەنا بۆ زیاتر لەیەكێك لەو كردارو چالاكیانەی قۆناغەكانی پێشوتر دەبات و هەوڵ دەدات لەرێگەیانەوە خۆی لەگەڵ ژینگەكەیدا بسازێنێ، بۆ نموونە لەقۆناغی پێشوودا بەقاچەكانی سەرین یان پشتیەكی دەجووڵاندو بەدوای یارییەكەی ژێریدا دەگەڕا، بەڵام لەم قۆناغەدا بۆ گەیشتن بە ئەو مەبەستەی پێشووی (دۆزینەوەی یارییەكە) پەنا بۆ زیاتر لەچالاكیەك دەبات، واتە نەك بەتەنها بەقاچەكانی بەڵكو دەستەكانی و شەق شەقەكەی دەستیشی بۆ هەمان مەبەست بەكار دەهێنێ، چونكە دەیەوێت بزانێت كام لەو چالاكیانە (قاچ، دەست، شەق شەقە) جووڵاندن لەهەموویان كاریگەرترو باشترە بۆ گەیشتن بەمەبەستەكەی كە ئەویش دۆزینەوەی یارییە شاراوەكەی ژێر سەرینەكەیە. واتا منداڵ لەم قۆناغەدا دەیەوێت هەموو كردارو چالاكیەكان تاقی بكاتەوە بۆ ئەوەی بزانێت كامیان لەهەموویان باشترە.

لەم قۆناغەدا ژمارەی هێڵكارییەكانی زیاتر دەبێت و شێوازو رێگا چارەی زیاتر بۆ گەیشتن بەئامانجەكانی فێر دەبێت، ئینجا ئەگەر لەرێگەی هێڵكارییە كۆنەكانیەوە نەیتوانی گرفتە تازەكانی چارەسەر بكات، ئەوا پەنا بۆ دروست كردنی هێڵكاری تر دەبات یان گۆڕانكاری و دەست كاری لەهێڵكارییە كۆنەكانیدا دەكات تابتوانێت ئەو گرفتە تازەی پێ چارەسەر بكات. واتە هەر لەهەوڵدان و تاقی كردنەوەو گەڕان بەدوای رێگا چارەی تازەدا دەبێت.

**٦- قۆناغی داهێنانی شێوازی نوێ (مرحلة أختراع وسائل جديدة):-**

ئەم قۆناغە دەكەوێتە نێوان (١٨ - ٢٤) مانگی تەمەنی منداڵەوە. منداڵ لەم قۆناغەدا هەوڵدەدات كە لەرێگەی ژیریی و ئەو توانستە عەقڵیانەی كە هەیەتی (بیركردنەوە، بەراورد كردن، لێك دانەوە.... هتد) كردارو شێوازی نوێ و رێگاچارەی سەركەوتووتر بۆ هەڵهێنان و چارەسەر كردنی گرفتەكانی جیهانی دەرەوەی بدۆزێتەوە. زۆر جار منداڵ لەم قۆناغەدا لەبەردەم گرفتەكاندا هەڵوێستە دەكات و لێیان وورد دەبێتەوەو سەرنجیان دەدات، وەك ئەوەی بیریان لێ بكاتەوە پێش ئەوەی هیچ چالاكیەك بەئاكام بگەیەنێت. واتە سەیری لایەنە جیاجیاكانی گرفتەكە دەكات و وەك ئەوەی بەراوردكاری لەنێوانیاندا بكات، كە ئەم گۆڕانكارییەش بەلای پیاجیەوە بەیەكەم هەنگاوی (سادەو ساكاری) دووربینی و بیر كردنەوەی وێنەدار (التفكير التصوري) دادەنرێت.

بۆ نموونە یەكێك لەو منداڵانەی كە پیاجیە تاقی كردنەوەی لەسەر دەكردن، بەنیازی ئەوە بوو كە زنجیرێك بخاتە ناو شووشەیەكەوە، كە دەمی شووشەكە لەئەستووری زنجیرەكە بچووكتر بوو،

منداڵەكە یەك دوو جار هەوڵیدا بەڵام كە زانی زنجیرەكە ناچێتە ناو شووشەكەوە ئینجا هەڵوێستەیەكی بۆ كردوو، جارێك سەیری دەمی شووشەكەو جارێكیش سەیری ئەستووری زنجیرەكەی كرد، وەك ئەوەی بیر لەو گرفتە بكاتەوەو بەراورد لەنێوان دەمی شووشەكەو ئەستووری زنجیرەكەدا بكات، دوای كەمێك وازی لەزنجیرەكە هێناو جارێكی تر هەوڵی ئەوەی نەدا كە زنجیرەكە بخاتە ناو شووشەكەوە. كەواتە دوور نیە كە بیركردنەوەو هەڵسەنگاندن وەك دوو پرۆسەی عەقلی لەم قۆناغەدا چەكەرە بكەن. بەڵگەش ئەوەیە كە منداڵ لەقۆناغی پێشوودا هەر لەسەر چالاكی و هەوڵدانی زنجیر خستنە ناو شووشەكە بەردەوام دەبێت و هیچ هەڵوێستەیەكیش لەبەردەم ئەو گرفتەدا ناكات و زۆر بەزەحمەتیش واز لەو هەوڵدان و تاقی كردنەوەی دەهێنێ، ئەمەش زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە لەقۆناغی پێشوو هەست بەجیاوازی نێوان دەمی شووشەو ئەستووری زنجیرەكە ناكات. (كۆنجر، ١٩٧٠، ص١٤٨-١٥٠).

لەم قۆناغەدا ئەو توانایە بۆ منداڵ دروست دەبێت كە وێنەی عەقلی بۆ دیاردەكان دروست بكات و هەر لەڕێگەی ئەو وێنە عەقڵیانەوە بیر لەچارەسەر كردنی گرفتەكان بكاتەوە.

### ب- قۆناغی پێش پرۆسە مەنتقیەكان (مرحلة ماقبل الأجرائية):-

ئەم قۆناغە دەكەوێتە نێوان (٢ - ٧) ساڵی تەمەنەوە. لەم قۆناغەدا كۆمەڵێك گۆڕانكاری گرنگ ڕوو دەدات و دەبن بەسیماو خاسیەتەكانی ئەم قۆناغەو لەقۆناغی پێشووی جیا دەكەنەوە، گۆڕانكارییەكانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:-

١. گەشە كردنی زمان و فێر بوونی هێماكان. ٢. بەكارهێنان و تێگەیشتنی چەمكەكان (المفاهيم الرمزية) لەجیاتی شتە هەست پێكراوو فیزیقیەكان. ٣. زاڵ بوونی دیاردەكانی گیان بەبەردا كردن (الأحيائية)و توانای دروست كردن (الأصطناعية)، خۆ پەرستی و خۆیەتی بەسەر بیر كردنەوەی مەنتقیانەو گیانی هاوكاریو پێكەوە كار كردن و دیالۆگ. ٤. قسەكردن لەسەر شێوازی مۆنۆلۆژو زۆربەی كات ئاڕاستە كردنی بۆ خودی خۆی نەك بەمەبەستی دیالۆگ و ڕاگۆڕینەوەو گفت و گۆ لەگەڵ كەسانی تر. ٥. سەرنەكەوتن لەلێكدانەوەی مەنتقي دیاردە فیزیقیەكان.

ئەمانەو چەندەها گۆڕانكاری تر لەگرنگترین سیماتەكانی پرۆسەی ژیری منداڵن لەم قۆناغەدا. جان پیاجیە ئەم قۆناغە بەسەر دوو قۆناغی بچووكتردا دابەش دەكات، كە ئەوانیش بریتین لە:

### ت- قۆناغی پێش چەمكەكان (مرحلة ماقبل المفاهيم):-

ئەم قۆناغە دەكەوێتە نێوان (٢ - ٤) ساڵیەوە، ئەم قۆناغە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەو چالاكیانەیە كە ووشەو هێماكانی تێدا بەكار دەهێنرێت. لەم قۆناغەدا وەڵامدانەوەی منداڵ وەك قۆناغی پێشوو تەنها بۆ شتە ماددی و فیزیقیەكان نیە، بەڵكو منداڵ هەمان وەڵامدانەوەی شتە ماددی و

فیزیقیەکانی بۆ ئەو هێماو ووشانەی کە گوزارشت لەو شتە ماددیو فیزیقیانە دەکەن هەیە. هەروەها منداڵ لەم قۆناغەدا هەوڵدەدات کە چارەسەری هەندێک لەگرفتەکان لەرێگەی بیرکردنەوەو بەکارهێنانی ووشەو هێماکانەوە بکات، واتە منداڵ دەتوانێت مانای تایبەتی بەهێماو ووشەو دیاردە جیاجیاکانی ژیان بدات و لەجیاتی یەکتری بەکاریان بهێنێ.

بۆ نموونە منداڵی کچ لەم قۆناغەدا دەتوانێت بووکە شووشەکەی وەک هێمایەک بۆ منداڵی راستەقینە بەکار بهێنێ و لەگەڵ ئەو بووکە شووشە بێگیانەدا بکەوێتە گفت و گۆو چیرۆکی بۆ بگێرێتەوەو گلەیی و گازاندەی لەدەست بکات و ئامۆژگاری و رێنمایی بکات، لەهەمان کاتدا منداڵ لەم قۆناغەدا دەتوانێت دارەکەی دەستی بکات بەئەسپ و گوێ درێژو سواری بێت و غار غارێنی پێبکات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لەم قۆناغەدا ئەو بۆچوون و بیرو باوەڕە لەلای منداڵ دروست دەبێت، کە هەندێک شت ووشەو هێماو مانان بۆ هەندێک شتی ترو دەتوانرێت لەجیاتی ئەو بۆ هەمان مەبەست بەکار بهێندرێ، کە ئەم توانستە لەقۆناغی پێشوو لەلای منداڵ نەبوو.

لەم قۆناغەدا لەتوانای منداڵدانیە کە چەمکەکان دروست بکات و لەمانایان تێبگات و هەروەها ناشتوانێت مانای شتەکان هەڵبهێنجێت (الأستدلال)، چونکە منداڵ لە بەشێک و پارچەیەکی بچووکەوە باز دەدات بۆ بەش و پارچەیەکی تر، بێ ئەوەی لەتوانایدا هەبێت لەبەشێکەوە (جزء) بچێت بۆ هەموو (گشت، الکل) یان لە(هەمووە)وە بۆ (بەش)ێک.

## ١. قۆناغی ئین تیو تیف (المرحلة الحدسية):-

ئەم قۆناغەش دەکەوێتە نێوان (٤ - ٧) ساڵەوە، مەبەست لە(الحدس) (Intuitive) ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە کە ڕاستەوخۆو کت و پڕ بۆ زانینی دیاردەکان لەدایک دەبێت، بەبێ ئەوەی پشت بەهەنگاوەکانی بیر کردنەوەی مەنتیقی و لێک دانەوەو شیتەڵ کردنەوە ببەستێت، کە زۆر جار وەک (تخمین)و قەبلاندن و بڕیاری خێراو لەناکاو دەردەکەوێت. بیر کردنەوەو زانینی منداڵ لەم قۆناغەدا لەو جۆرە بیر کردنەوانەیە کە زۆر جار منداڵ بەڵگەی زانستی و مەنتیقی بۆ سەلماندنی بڕیارو بیر کردنەوەکانی پێ نیە.

منداڵ دەتوانێت چەمکی بەرفراوانترو بیر کردنەوەی وێنەداری ئاڵۆزتر بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفتەکانی بەکار بهێنێ، هەرچەندە لەیەک لایەن و گۆشە نیگای تەسکیشەوە دەڕوانێتە دیاردەکانی ژیان و لێکیان دەداتەوە. چونکە هێشتا ئەو توانایەی لەلا دروست نەبووە کە لەهەموو گۆشەو لایەکەوە بڕوانێتە گرفت و دیاردەکانی ژیان.

بۆ نموونە ئەگەر دوو شووشە (کەمۆڵە، بیکەر)ی وەک یەک پڕ بکرێن لەشلەیەک و پیشانی منداڵ بدرێت ئەوا لەم قۆناغەدا ئەم منداڵە دەتوانێت بڕیاری راست بدات و بڵێت کە شلەی ناو هەردوو شووشەکە یەکسانن، بەڵام ئەگەر لەبەرچاوی منداڵەکە شلەی یەکێک لەدوو شووشەکەمان

کردە ناو شووشەیەکی باریکترو درێژتر ئەوا بڕیاری منداڵەکە لەم حاڵەتەدا ئەوەیە کە شلەی ناو ئەو شووشە باریک و درێژە زۆرترە. بۆ منداڵەکە لەم قۆناغەدا ئەو بڕیارە دەدا؟ لەبەرئەوەی لەتوانای منداڵدا نیە کە هەموو لایەن و بەشەکانی ئەو دیاردەیە لەبەرچاو بگرێت، ئەو تەنها حیساب بۆ یەک لایەن دەکات و بڕیارەکەی خێراو لەناکاوە، ئەو کاتێک دەڵێت شلەی ناو شووشە باریک و درێژەکە زۆرترە ئەوە تەنها حیسابی بۆ درێژی شووشەکە کردووە و ناتوانێت لەیەک کاتدا درێژی شووشە باریکەکە لەگەڵ پانی شووشە کورت و بچووکەکە بەراورد بکات و بڕیاری ڕاست و دروست بدات. چونکە بڕیاری ڕاست ئەوەیە کە منداڵ درێژی و پانی و قوڵایی و بارستایی هەردوو شووشەکە لەبەرچاو بگرێت و بگاتە ئەو ڕاستیەی کە شلەی ناو هەردوو شووشەکە یەکسانن. بەڵام منداڵ لەتەمەنی (٦ - ٧) ساڵان بەدواوە دەتوانێت بڕیاری ڕاست لەو بارەیەوە بدات، ئەویش لەبەر ئەوەی کە هەموو لایەنەکانی دیاردەو گرفتەکان لەبەرچاو دەگرێت و هیچیان پشت گوێ ناخات. واتە ئەگەر لەمنداڵێکی تەمەن (٥ - ٦) ساڵان پرسیار بکەین، بۆچی شلەی ناو شووشەی یەکەم زۆرترە لەوەڵامدا دەڵێت لەبەرئەوەی درێژترە بەڵام منداڵی تەمەن (٦ - ٧) ساڵان بەدواوە کە دەڵێت یەکسانە، هۆکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە کە ڕاستە شووشەی یەکەم درێژترە بەڵام تەسکترە هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا کە شووشەی دووهەم کورتترە بەڵام پان ترە، کەواتە هەردوو شلەکە یەکسانن.

کەواتە لەم قۆناغەدا منداڵ ئەو زانیارییەی لەلا نیە کە بڕو چەندێتی (كمية) ماددەکان لەگەڵ ئەوەشدا کە جۆرو شێوەی شووشەو دەفرەکانیش دەگۆڕدرێن هەروەک خۆیان دەمێننەوە، واتە تانەگەنە تەمەنی (٦ - ٧) ساڵان بەدواوە لەمانای نەگۆڕی مادە (ثبات المادة) تێناگەن. کەواتە هەر چ کاتێک ئەو توانایە لەلای منداڵ دەرکەوت کە بڕو چەندێتی شلەکان و ژمارەی شتەکان بەگۆڕینی شێوەو بارستایی و ڕەنگی شووشەو ئەو دەفرانەی کە تێیان دەکرێن ناگۆڕدرێن، ئەوە مانای ئەوەیە کە منداڵ پێی ناوەتە قۆناغی پرۆسە زیرییە هەست پێکراوەکانەوە کە ئەویش قۆناغی سێهەمی تیۆرییەکەی پیاجیەیە.

دەتوانین بڵێین لەقۆناغی پێش پرۆسە مەنتیقیەکان، عەقڵیەت و بیرکردنەوەی منداڵ لەزۆر لایەنەوە بێ بنەماو بەڵگەی زانستیە، بۆ زیاتر شارەزا بوون لەسیماو خاسیەتە سەرەکیەکانی ئەم قۆناغە، دەتوانین ئەم نموونانەی خوارەوە باس بکەین.

١. ئەگەر پرسیار لەمنداڵی ئەم قۆناغە بکرێت ئەمڕۆ بۆچی ڕۆژ دیار نیە، زۆر وەڵامی وەک (لەبەر ئەوەی نەخۆشە، عاجزو بێ تاقەتە، خەوتووە)مان چنگ دەکەوێت، چونکە منداڵ هۆیە ڕاستەقینەکەی کە هەورە نازانێت، بەڵام لەقۆناغی سێهەم دەتوانێت وەڵامی ڕاست بداتەوە.

٢. منداڵ لەسەرەتای ئەم قۆناغەدا گیان بەبەری هەموو شتێکدا دەکات، بەبڕوای ئەو ئەگەر بزمار بەدیواردا دابکوتین ئەوە لەئەنجامی چەکوش و داکوتانەوە ئازار دەکێشێ، هەروەها ئەگەر قاچی بەر کورسیەک کەوت و ئازاری پێ گەیشت ئەوا بەکورسیەکەدا دەکێشێ و بەعەقڵی خۆی تۆڵەی لێدەکاتەوە و کورسیەکەش ئازاری پێدەگات، بەڵام پاش ماوەیەک کە زانیاری زیاتر دەبێت

تەنها گیان دەکات بەبەر ئەو شتانەدا کە دەجووڵێن، واتە لەم کاتەدا بزمارو دارو بەرد بێ گیانن، بەڵام پایسکیل و ماشێن و مانگ و ئەستێرەو ئاوو گەڵای دار گیانیان هەیەو خاوەن هەست و سۆزن، چونکە دەجووڵێن، بەڵام دوای ئەوەی کە زانیاری منداڵ زیاتر دەبێت و شارەزای هەندێک دیاردەی تر دەبێت، ئەو کاتە گیان و سۆزو هەست تەنها دەدات بە ئەو شتانەی کە خۆیان دەجووڵێن نەک کەسانی تر بیان جووڵێنن، لەم کاتەدا گەڵای دارو ماشێن و پایسکیل گیان و هەست و سۆزیان نیە لەبەر ئەوەی کەسانی تر دەیان جووڵێنن، بەڵکو مانگ و رۆژو ئاوو ئاژەڵ گیان و هەست و سۆزیان هەیە چونکە خۆیان دەجووڵێن، بەم شێوەیە رۆژ لەدوای رۆژ گۆرانکاری لە بۆچوونەکانیدا دەکات تا لەکۆتایی ئەم قۆناغەدا تەنها گیان و هەست و سۆز بە ئەو گیانەوەرانە دەدات کە شایەنی ئەو مافەن وەک مرۆڤ و ئاژەڵ و بوونەوەرەکانی تر.

٣. لەم قۆناغەدا منداڵ لەو بڕوایە دایە کە هەموو دیاردەکانی چوار دەور دروست کراون، بۆ نموونە ئەگەر پرسیاری ئەوەی لێبکرێ کێ شاخی دروست کردوە؟ لەوەڵامدا دەڵێت (کەسانی زۆر گەورەو زەبەلاح و سوپەرمان گڵ و خۆڵ و بەردیان کۆکردۆتەوەو شاخ و گردو تەپۆڵکەیان دروست کردووە، یان دەڵێت کەسێکی زۆر بەتوانا چاڵێکی زۆر گەورەی هەڵکەندووەو ئاوی بۆ هێناوەو دەریاو رووباری دروست کردووە) یان خودا خۆی شاخ و دەریای دروست کردووە... هتد.

٤. زمانی منداڵ لەم قۆناغەدا لەجۆری (مۆنۆلۆژ)ە، واتە یەک لایەنیەو منداڵ ئاراستەی خودی خۆی دەکاتەوەو بۆ مەبەستی کار لێککردنی کۆمەڵایەتی و راگۆرینەوەو دیالۆگ بەکاری ناهێنێ، بۆ نموونە کە چەند منداڵێکی (٤-٥) ساڵان بەیەکەوە قسە دەکەن هەریەکەیان بۆ خۆی قسە دەکات و گوێ لەقسەی بەرانبەرەکەی ناگرێت و جاری واش هەیە هەر هەموویان پێکەوە قسە دەکەن، هەر ئەمەشە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە گفت و گۆو دیالۆگ لەنێوان منداڵاندا سەرنەگرێت، چونکە منداڵ لەم قۆناغەدا ناتوانێت راو بۆچوونی کەسانی تر لەبەرچاو بگرێت و لەتوانایدا نیە کە خۆی بخاتە شوێنی ئەوان و رۆڵی ئەوان یاری بکات، چونکە ئەو وادەزانێت کە هەموو کەس وەک ئەو بیر دەکەنەوە، نازانێت کە راو بۆچوونی جیاواز لەراو بۆچوونی ئەو هەیەو لەوانەیە ئەو هەڵە بێت و کەسانی تر لەسەر هەق بن. هەروەها لەیەک لاوە سەیری شتەکان دەکەن و ناتوانن لەجەوهەرو ناوەرۆکی دیاردەکان و پێچەوانەی دیاردەکان تێبگەن، واتە ئەگەر لەبیر کردنەوەدا لەخاڵێکی وەک (أ) دەستیان بەرۆیشتن کرد بۆ خاڵی (د) ئەوا ناتوانن لەخاڵی (د)ەوە بگەرێنەوە (معكوسية) بۆ خاڵی (أ).

٥. دیاردەی خەست کردنەوەو چاو برینە خاڵێک (التركيز) زاڵە لەکاتی بیر کردنەوەیاندا، واتە تەنها گرنگی بەیەک خاڵ و لایەن دەدەن و ووردەکاری و لایەنەکانی تری دیاردەکە پشت گوێ دەخەن.

## ج. قۆناغی پرۆسە ژیرییە هەست پێکراوەکان (مرحلة العمليات العقلية المحسوسة):-

ئەم قۆناغە دەکەوێتە نێوان ساڵەکانی (٧-١١). لەم قۆناغەدا پرۆسەی بیر کردنەوەی منداڵ زۆر مەنتیقیەو لەتوانایدا هەیە کە بەبەڵگەی زانستی و مەنتیقی بەرگری لەبیرو بۆچوونەکانی خۆی بکات و دەتوانێت هۆیە مەنتیقیەکانی دیاردە سروشتیەکان هەست پێ بکات. منداڵ لەم قۆناغەدا نابێت بەکۆیلەی بیر کردنەوەی یەک لایەنی، بەڵکو لەهەموو لایەک و گۆشەیەکەوە سەیری دیاردەو گرفتەکان دەکات و لەتوانایدا هەیە بەپێچەوانەشەوە (المعكوسية) بیر لەدیاردەو گرفتەکان بکاتەوە، واتە لەکۆتاییەوە بگەڕێتەوە بۆ سەرەتا، هەروەها لەم قۆناغەدا لەقاوغ و چوارچێوەی تەنیایی و خۆخۆیی و خۆپەرستی ڕزگاری دەبێت و گیانی هاوکاری و دۆستایەتی و تەبایی تیایدا گەشە دەکات و زمانیشی ئاڕاستەی کەسانی تر دەکات و لەتوانایدا دەبێت کە گفتوگۆو دیالۆگ بەئاکام بگەیەنێت و ڕاو بۆچوونی کەسانی تر لەبەرچاو بگرێت و حیساب بۆ بەرامبەرەکەی بکات.

لەلایەکی تریشەوە دەتوانێت دیاردەکان بەشێوەیەکی زنجیرەیی یەک لەدوای یەک پۆلین بکات، بەڵام بیرکردنەوە مەنتیقیەکەی هەر لەسنووری دیاردەو گرفتە هەست پێکراوەکاندا دەسووڕێتەوەو ناتوانێت بەشێوەیەکی مەنتیقیانە بیر لەدیاردەو گرفتە واتادارو ڕووتەکانی (الظواهر المجردة والمعنوية) وەک (یەکسانی، دیموکراسی، ڕاستگۆیی، دادوەری، ئازایەتی، مەردایەتی... هتد) بکاتەوە.

لەم قۆناغەدا منداڵ دەگاتە ئەو بڕوایەی کە کەسانی تریش وەک ئەو بیرو باوەڕی جیاوازیان هەیەو لەوانەیە بگەنە دەرئەنجامێک کە جیاواز بێت لەو دەرئەنجامەی کە ئەو پێیگەیشتووە، هەوڵدەدات کە لەڕێگە بیرو بۆچوونی کەسانی ترەوە لەڕاست و دروستی ڕاو بۆچوونەکانی خۆی دڵنیا بێت. بێگومان ئەم گیانی هاوکاری و تەباییەی منداڵیش هەر لەڕێگەی کار لێککردنی کۆمەڵایەتی و تێکەڵاو بوونی کەسانی ترەوە گەشە دەکات.

لەم قۆناغەدا دەتوانێت وەک مرۆڤێکی کامڵ بیر بکاتەوەو دیاردەکان شیتەڵ بکاتەوەو تێیان بگات، بەڵام بەمەرجێک لەسنووری هەستەوەرەکانیدا بێت. واتە دەتوانێت هۆی سروشتی (باران بارین، ڕۆژ دەرنەکەوتن... هتد) بزانێت و بەڵگەی زانستیشی (بەپێچەوانەی قۆناغی پێشو) بۆ بهێنێتەوە. واتە لەم قۆناغەدا منداڵ بەخاسیەت و سیما فیزیقی و ماددییەکان هەڵناخەڵەتێت. دەتوانین بەچەند نموونەیەک زیاتر عەقلیەتی منداڵ لەم قۆناغەدا ڕوون بکەینەوە لەوانە:-

١. ئەگەر دوو شووشە تا نیوەی شلەی تێدا بێت، ئینجا لەبەرچاوی منداڵێکی (٩ - ١٠) ساڵان پارچەیەک شەکر بخەینە ناو یەکێک لەشووشەکان، ئەگەر پرسیاری ئەوەی لێبکرێت کە شەکرەکە چی لێهات؟ لەتوانای ئەو منداڵەدا هەیە کە بزانێت شەکرەکە هەر ماوە بەڵام لەناو ئاوەکەدا تواوەتەوەو تامی ئاوەکەشی شیرین کردووە بەڵام منداڵێکی تەمەن (٥ - ٦) ساڵان ناتوانێت ئەو وەڵامە بداتەوە.

٢. ئەگەر پارچەیەک قوڕی دەست کرد (هەویر) لەبەرچاوی منداڵێکی تەمەن (٩ - ١٠) ساڵان لەسەر لایەکی تەرازوویەک دابنێین لەبەرانبەریشی پارچەیەکی تر بەقەدەر خۆی لەسەر لایەکەی تری تەرازووکە دابنێین، ئینجا دوای ئەوە شێوەی پارچەی یەکەم وەک تۆپێکی بچکۆلە خڕ بکەین بەڵام پارچەی دووهەم وەک قەڵەم درێژ بکەینەوە، ئەوا زۆر لەمنداڵەکانی تەمەن (٥ - ٦) ساڵان دەڵێن کە ئەوەی لەشێوەی قەڵەمدایە زۆرترە بەڵام منداڵانی تەمەن (٩ - ١٠) ساڵان دەڵێن کە هەردوو پارچە قوڕەکە یەکسانن باشێوەشیان جیاواز بێت.

٣. ئەگەر پرسیارێکی وەک (محمد لەئازاد گەورەترە، هیواش لەئازاد کچکەترە، ئایا کامیان لەهەموویان گەورەترە؟) لەمنداڵێکی تەمەن (٦ - ٧) ساڵان بکرێت ناتوانێت وەڵامی ڕاست بداتەوە بەڵام زۆربەی منداڵانی ئەم قۆناغە دەتوانن بەسەرکەوتوانە وەڵام بدەنەوە.

## د. قۆناغی پرۆسەی بیر کردنەوەی واتداروڕووت [مرحلة التفكير المجرد (أو المعنوي)]:-

ئەم قۆناغە دەکەوێتە نێوان (١١ - ١٥) ساڵان. ئەم قۆناغە دواهەمین قۆناغی گەین و کامڵبوو عەقلیەت و زیرەکی منداڵ (هەرزەکار) دەگاتە ترۆپک و پۆپەی گەشە کردنی چۆنیەتی، کە لەدوای ئەم قۆناغە هەموو گۆڕانکارییەکانی تر چەندێتییەو تەنها برو ڕێژەی زیرەکی زیاد دەکات نەک جۆری هێلکارییەکان. واتە بیناو بنەمای عەقلی هەرزەکار وەک گەورەکان وایە بەڵام تەنها برو ڕێژەی شارەزاییو زانیاری لەگەورەکان کەمترە، کە ئەویش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەڕێگەی هەردوو پرۆسەی مژین و خۆگونجاندنەوە زیاد دەکات و وەک گەورەکانی لێدێت.

لەم قۆناغەدا لەتوانای هەرزەکاردا هەیە کە مامەڵە لەگەڵ تیۆریی و گریمان و بابەت و دیاردە ڕووت و واتادارەکاندا بکات و بەئاسانی تێیان بگات و نەخشەو پلانی زانستی بۆ ئێستاو داهاتوو لەبەر ڕۆشنایی ڕووداوەکانی ڕابووردو دابنێت. منداڵ لەقۆناغی پێشودا تەنها دەتوانێت مامەڵە لەگەڵ یەک گرفت و دیاردەی هەست پێکراو بکات بەڵام لەم قۆناغەدا لەتوانایدا هەیە کە مامەڵە لەگەڵ زیاتر لەیەک دوو گرفت و دیاردەی ئاڵۆزی ڕووت و واتاداردا بکات و لەچوارچێوەی تیۆرو چەند گریمانێکیشدا کۆیان بکاتەوە، هەروەها دەشتوانێت کە بەچەندەها شێواز بیر لەیەک دیاردەو گرفت بکاتەوەو چەندەها ڕێگا چارەی گونجاویشی بۆ بدۆزێتەوە. دەتوانین لەڕێگەی ئەم نموونانەی خوارەوە خاسیەتەکانی عەقلی منداڵ و هەرزەکار لەم قۆناغەدا بەدەربخەین:-

١. لەتوانای منداڵ (هەرزەکاری) ئەم قۆناغەدا هەیە کە شت بنیات بنێت و لەچەند پارچەو بەشێک بەرهەمێک دروست بکات. بۆ نموونە ئەگەر (٥) پێنج جۆر شلەی جیاواز لەناو (٥) پێنج شووشەدا لەبەردەم منداڵ و هەرزەکارێکی ئەم قۆناغەدا دابنێین و دوای ئەوەی لێبکەین کە ڕەنگی شینمان لەئەنجامی تێکەڵ کردنی ئەو شلانە بۆ دروست بکات. بێگومان شلەی شووشەی ژمارە (٢) لەگەڵ ژمارە (٤) هیچ ڕۆڵێکیان نیە لەدروست کردنی ئەو ڕەنگەدا بەڵکو تەنها لەئەنجامی تێکەڵکردنی شلەکانی ناو شووشەکانی (١،٣،٥) ئەو ڕەنگە شینە دروست دەبێت، لەتوانای منداڵ و هەرزەکاری ئەم قۆناغەدا هەیە کە هەموو گریمان (فرضية)و لەوانەیەکان (الأحتمالات) تاقی

بکاتەوە تادەگاتە دروست کردنی ڕەنگەکە، بەلاّم منداڵی قۆناغی پێشوو دوای چەند هەوڵدان و تاقی کردنەوەیەک ئیتر بێزارو وەڕس دەبێت و واز لەو تاقی کردنەوەیە دەهێنێت و ناگاتە مەبەستەکەی کە ئەویش دروست کردنی ڕەنگی شینە.

۲. دەتوانێت گیروگرفت و بابەتی زمانەوانی، کە وێنە عەقلیەکان، لەڕێگەی ووشەو هێما ڕووت و واتادارەکانەوە دروست دەکرێن، چارەسەر بکات و هەڵیان بهێنێت. بۆ نموونە ئەگەر لەمنداڵ و هەرزەکاری ئەم قۆناغە پرسیار بکرێت (ئازاد لەمحمد سپی ترە، بەلاّم لەهیوا ڕەشترە، ئایا کامیان لەهەموویان سپیترە؟) ئەوا زۆربەیان بەڕاستی وەلاّمی دەدەنەوە، بەلاّم ئەگەر هەمان پرسیاری پێشو لەمنداڵێکی (۹ - ۱۰) ساڵان بکرێت، زۆر زەحمەتە بتوانێت وەلاّمی ڕاست بداتەوە مەگەر منداڵەکان لەبەردەمی ڕیز بکرێن و ئینجا ئەو پرسیارەی لێبکرێت، کەواتە لەم قۆناغەدا بەپێچەوانەی قۆناغی پێشوو دەتوانێت خۆی لەشت و دیاردە هەست پێکراوو فیزیقیەکان دەرباز بکات و لەڕێگەی هێماو گریمان و چەمکە زمانەوانیەکانەوە (المفاهیم اللغویة) بیر لەدیاردەو گرفتە ڕووت و واتادارو هەست پێنەکراوەکان بکاتەوەو چارەسەری گونجاویشیان بۆ دابنێت.

هەروەها لەتوانای منداڵ (هەرزەکاری) ئەم قۆناغەدا هەیە کە لەگەڵ جۆرەها گریمان مامەڵە بکات، بۆ نموونە ئەگەر پێی بڵێین (گریمان ماست ڕەشە، یان بابڵێین زستان گەرمە، یان گریمان شەکر تاڵە... هتد) ئەوا لەتوانایدا هەیە کە وەریان بگرێت و مامەڵەیان لەگەڵ بکات، بەلاّم بەهیچ شێوەیەک لەتوانای منداڵانی قۆناغی پێشوودا نیە کە ئەو گریمانە وەربگرن و مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، واتە هەر یەکسەر ڕەتی دەکەنەوەو باوەڕی پێ ناکەن و ناشتوانن وەک گریمان بۆ ماوەیەکی کەمیش قوبوڵی بکەن. واتە ناتوانن بوونیاتی بابەتەکە لەناوەڕۆکەکەی جیا بکەنەوەو تەنها بوونیاتەکەی شیتەڵ بکەنەوەو گفتوگۆی لەسەر بکەن بەپێچەوانەی منداڵ و هەرزەکارانی ئەم قۆناغە کە ئەو توانستەیان بۆ دروست بووە. (الأزیر جاوی، ۱۹۹۰، ص۹۵-۱۰۰).

۳ - لەتوانای منداڵ (هەرزەکاری) ئەم قۆناغەدا هەیە کە مامەڵە لەگەڵ هێما ماتماتیکیەکاندا (الرموز الریاضیة) بکات، بۆ نموونە دەتوانین لێیان بپرسین کە (س >ص، ع < ص) ئایا کام لە (س، ص، ع) لەهەموویان گەورەترە. لەم کاتەدا زۆربەی منداڵان و هەرزەکارانی ئەم قۆناغە دەتوانن بەسەرکەوتوانە وەلاّمی بدەنەوە، بەلاّم زۆر زەحمەتە منداڵانی قۆناغی پێشوو وەلاّم بدەنەوە.

## ئەرکەکانی دایک و باوک و مامۆستا بەپێی تیۆرییەکەی پیاجیە

١. دەبێت پرۆگرام و شێوازی وانە گوتنەوەو شێوەی مامەڵە کردنی منداڵان بەپێ ی قۆناغ و تەمەنی منداڵ بگۆڕدرێت، چونکە هەریەک لەقۆناغەکان خاسیەت و سیمای تایبەتی خۆی هەیە.

٢. دەبێت تاتەمەنی (١١ - ١٢) ساڵان بابەت و وانەو گرفتەکان هەست پێ کراو بن و دووربن لەچەمک و هێمای ڕووت و واتادارو هەست پێنەکراو.

٣. دەبێت ژینگەی منداڵ و چواردەورەکەی پڕ بێت لەووروژێنەرو ڕووداوو بابەتی پێویست بۆ گەشەکردنی عەقڵی.

٤. نابێت سەربەستی و جووڵەی منداڵ لغاو بکرێت بەڵکو دەبێت سەربەست و چالاک بێت بۆ ئەوەی شارەزای ژینگەو چواردەورەکەی ببێت.

٥. دەبێت دایک و باوک و مامۆستا ئاگاداری هەستەوەرەکانی منداڵ بن و لەکەم و کورتی و نووقستانیان دڵنیابن و چارەسەری هەستەوەرە لاوازەکانیش لەکاتی خۆیدا بکەن، چونکە هەستەوەرەکان کلیلی کردنەوەی هەموو دەرگا زانستیەکانن.

٦. ئەرکی سەرەکی کەسانی چواردەوری منداڵە کە بەردەوام دیاردە ئاڵۆزو تەم و مژاوییەکان بۆ منداڵەکان ڕوون بکەنەوە.

٧. کار لێککردن و تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی زۆر گرنگە بۆ منداڵ، لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە هانی منداڵ بدرێت بۆ تێکەڵاو بوونی منداڵانی تر چونکە لەڕێگەیەوە شارەزای داب و نەریت و بەهای کۆمەڵەکەی دەبێت و شارەزایی و زانیاری زیاتر دەبێت کە سەرجەم ئەمانەش منداڵ لەخۆیەتی و تەنیایی و دوورەپەرێزی دەپارێزێ و گیانی کۆمەڵایەتی و برایی و تەبایی تیایدا دەچێنێ.

٨. بیرو باوەڕو بۆچوونی دایک و باوک و مامۆستا زۆر گرنگە دەربارەی ژیریو زیرەکی منداڵ، چونکە ئەگەر دایک و باوک و مامۆستا لەو بڕوایەدا بوون کە زیرەکی و عەقڵی منداڵ نەگۆڕە، ئەوا بەجۆرێک مامەڵە لەگەڵ منداڵە دواکەوتووەکان دەکەن کە جیاواز دەبێت لەو کاتەی کە لەو بڕوایەدا بوون کە ژیری و عەقڵی منداڵ گۆڕدراوە. ناوەڕۆکی تیۆرییەکەی پیاجیەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە عەقڵ و زیرەکی منداڵ بەچەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت و بەردەوام لەحاڵەتی گۆڕاندایە. کەواتە ئەرکی سەرەکی دایک و باوک و مامۆستا دابین کردنی ژینگەی مادی و کۆمەڵایەتی گونجاوە بۆ گەشەکردنی زیرەکی و عەقڵی منداڵەکانیان.

٩. لەئەنجامی تیۆرییەکەی پیاجیەوە دەیەها بگرە سەدەها ئەزموون و کەرەستەو تاقی کردنەوەی جیاواز جیاواز لەدایک بووە، لەبەر ئەوە زۆر گرنگە کە مامۆستا شارەزایی لەبارەی هەندێک لەو ئەزموون و کەرەستانەوە هەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت خاڵە لاوازو بەهێزەکانی گەشەکردنی ژیری و زیرەکی منداڵەکان دیاری بکات.

## ئایا ڕاستە منداڵانی هەندێک گەل و نەتەوە هەر لەبنەڕەتەوە لەمنداڵانی گەلانی تر زیرەکترن؟

زۆرجار لێرەو لەوێ هەندێک جار لەسەر زمان و گفتی چەند سەرکردە و زاناو لێپرسراوێک وا پیشان دەدرێت کەهەندێک گەل و نەتەوە هەر لەبنەڕەتەوە زیرەکترو بەتواناو لێهاتووترن لەگەلان و نەتەوەکانی تر، لەبەرئەوە مافی خۆیانە باڵا دەست بن و گەل و نەتەوەکانی تر لەژێر دەسەڵاتی ئەماندابن و زیاتریش پاساوی ڕاوبۆچوونەکانیان بەدەرئەنجامی هەندێک ئەزموون (اختبار) و زیرەکی پێوەکان (مقايس الذكاء) دەدەنەوە.

بۆ نموونە هیتلر پرۆپاگەندەی ئەوەی دەکرد کەگەلی ئەڵمانی لەگەلان و ڕەگەزەکانی تر زیرەکترن و خوێنیشیان پاکترە. گومانی تێدانیە ئەو ڕابۆچوونانە تەنها قسەو قسەڵۆکن و بۆ مەبەستی داگیرکردن و پارێزگاری کردنی کورسی دەسەلات، گەل و نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیانیانی پێ چەواشە دەکەن و وەک دەڵێن (حەبلی درۆش کورتە). بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنج و داخە ئەوەیە کەهەندێک جار زاناو ڕۆشنبیری ناودار کەوتوونەتە ناو ئەو چڵپاوەو بوون بەو جۆرە تەڵەوە، کەیەکێک لەوانە (ئیزنکَ)ە کەپاساوو بەڵگەی چەواشەکاری دەهێنایەوە بۆ ڕەوایی و دروستی، بوونی چینو توێژی جیاجیاو باڵا دەستی ڕەگەزی سپی پێست (یاسین، ص٦٩).

*ئینجا بۆ یەکلاکردنەوەو پووچەڵ کردنەوەی ئەو قسەو قسەڵۆکانە ئەم بەڵگە زانستیانەی خوارەوە دەهێنینەوە:-*

١) ڕاستە زۆرجار هەوڵ دراوە گەل و نەتەوەکانی هەموو جیهان دابەش بکرێن و بگەڕێنرێنەوە بۆ چەند ڕەگەزو بنەچەو (سەلالەیەک) بەڵام بەتەواوی سەرکەوتوو نەبوون

و ڕەخنەی زۆریان ئاڕاستە کراوە، لەبەرئەوەی تەنها پشتیان بەیەک پێوەر بەستووە ئەویش لایەنی جەستەییە، واتە گەل و نەتەوەکانیان بەپێ ی (ڕەنگی چاو، پێست، پرچ، شێوەی دەم و چاوو کەللەی سەر، جۆری خوێن، چالاکی کوێرە گلاندەکان و ڕەگەزەکانی تری لەش و جەستە) دابەش کردووە بەسەر چوار ڕەگەزو کۆمەڵ و (سەلالەدا) کەبریتین لە:-

ا) (قەوقازیەکان، نۆردییەکان، ئەلبیەکان، دانیشتوانی ناوچەی دەریای سپی ناوەڕاست و هندۆسەکان).

ب) شێوە مەنگۆلیەکان (دانیشتوانی مەنگۆلیا، مەلاتو، هیندە ئەمریکیەکان).

ج) زنجیەکان (ڕەش پێستو دانیشتوانەکانی میلانیزیا، بۆشمان).

ء) چەند دەستەو تاقمێکی تر کەبەپەرتو بلاوی لێرەو لەوێ دەژین بەڵام ناتوانرێت بخرێنە چوارچێوەی یەکێک لەو سێ سەلالەی سەرەوە (جیلفورد، ص٦١٥).

*بەڵام ئەم دابەشکردنە بێ ڕەخنەو کەموکورتی نیە لەوانە:-*

زۆرجار جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان تاکەکانی یەک سەلالەدا لەلایەن زیرەکی و حەزو ئارەزوو ڕەگەزەکانی جەستەییەوە، هەروەها زۆر لەتاکەکانی ئەو (سەلالانە) لەزۆر لایەنەوە وەک یەکن، لەلایەکی ترەوە هەندێک کەس هەن کەلەلایەنی دەم و چاوو لووتەوە وەک زنجیەکان وان بەڵام لەلایەنی پرچ و شێوەی کەللە سەرەوە وەک قەوقازییەکان وان، هەروەها لەم دوایەشدا چەند پێوەرێکی تری وەک (زمان، نەتەوە) هاتنە گۆڕێو ڕەگەزی تری وەک (ئاری، لاتینی) دەرکەوتن، لەبەرئەو هەموو کەم و کورتیانە ناتوانرێت بووترێت لەسەدا سەد (١٠٠) ئەو دابەشکردنە ڕاستە، بەڵام ئەوەش ئەوەندە گرنگ نیە، با وای دانێین زۆر ڕاستە، بەڵام ئایا لەلایەنی زیرەکیەوە جیاوازی هەیە لەنێوانیاندا.

بۆ نموونە توێژەرەکانی سووپای ئەمریکی لەشەڕی یەکەم و دووهەمی جیهانیدا لەڕێگەی زیرەکی پێوی (ئەلفا )ی سوپاوە زیرەکی زۆر لەسەربازەکانیان پێوا، لەئەنجامدا بۆیان دەرکەوت کەلەزۆر لایەنەوە جیاوازی نیە لەنێوان ڕێژەی زیرەکی ڕەش پێست و سپی پێستەکانی ئەمریکا، بەلام بەپێچەوانەوە زۆرجار ڕێژەی زیرەکی ڕەش پێستەکانی باکووری ئەمریکا زیاترە لەڕێژەی زیرەکی ڕەش پێستەکانی باشووری ئەمریکا.

*راستە هەندێک جار ڕێژەی زیرەکی منداڵە سپی پێستەکان زیاترە لەڕێژەی زیرەکی منداڵە ڕەش پێستەکان، ئەوەش بەلای زۆربەی دەروونزانەکانەوە دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێک لەوانە:-*

١) بارودۆخو ژینگەی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و ئابووری و رامیاری سپی پێستەکان زۆر باشترو لەبارترە لەژینگەی ڕەش پێستەکان.

٢) ئەو ئەزموون و زیرەکی پێوانەی کەڕێژەی زیرەکی منداڵەکانی پێ دەردەهێنرێت لەسەر منداڵ و ژینگەی سپی پێستەکان تاقی کراونەتەوەو دەرهێنراون لەبەرئەوە گونجاو نیە بۆ ڕەش پێستەکان و ناتوانن وەک سپی پێستەکان لێی تێبگەن و زانیارییەکان تایبەتن بەژینگەی سپی پێستەکان زیاتر لەڕەش پێستەکان.

٣) زۆربەی ئەزموون و زیرەکی پێوەکان کەم و کورتیان تێدایە، هەریەکەیان چەند لایەنو توانستێکی ژیری مرۆڤ دەپێوێ و جیاوازە لەوانی تر، هەروەها زۆربەی توانستەکانی ژیری مرۆڤ تاوەکوو ئێستا بەتەواوی نەزانراوە و زیرەکی پێوی بۆ دانەنراوە، بۆ نموونە (جیلفورد ) ی زانا تاوەکو ئێستا توانیویەتی (٦٥) شەست و پێنج توانستی جیاجیای ژیری بدۆزێتەوە وەپێشبینی ئەوەشی کردووە کە(١٢٠) سەدو بیست توانست هەبێت نەک (٦٥)، لەگەڵ ئەوەشدا فراوانترین و باشترین ئەزموون، زیرەکی پێوی (ستافورد- بینیە)یە لەو (٦٥) توانستە تەنها چەند ژمارەیەکی کەمی لێ دەپێوێ. (الشیخ، ص٢٢-٢٣).

هەروەها کاتێک زاناکان توێژینەوەیان لەسەر منداڵان و هەرزەکارانی هندیە ئەمریکی و هندیە کەنەدیەکان کرد، بۆیان دەرکەوت کەجیاوازی هەیە لەنێوان ڕێژەی زیرەکی هندیە ئەمریکیەکان و هندیە (کەنەدیە)کان، لەبەرئەوەی ژینگەی کۆمەلایەتی و ئابووری و رۆشنبیری ئەو دوو وولاتە جیاوازە، کاتێکیش بەراورد کرا لەنێوان ڕێژەی زیرەکی (نۆردی، ئەلبی)یەکانی فەرەنساو ئیتالیاو ئەلمانیا، دەرکەوت کەجیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوانیادا، هەروەها دەرکەوتووە کەجیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوان چین و یابانیەکانی ئەمریکاو هاوڕەگەزو توخمەکانیان لەوولاتی چین و یابان، هەروەها هەندێک جار منداڵە چینی و یابانیەکانی ئەمریکا ڕێژەی زیرەکیان زیاترە لە هەندێک منداڵی ئەمریکی، ئەمانەو چەندەها دەرئەنجامی توێژینەوە زانستیەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەڕەگەزو توخم و (سەلالە) نابێتە هۆی ئەوەی کەمرۆڤ زیرەکتر بێت، لەبەرئەوەی منداڵی زیرەک و بەهرەمەند و بلیمەت لەناو هەموو گەل و نەتەوەیەکدا هەیە، بەهەمان شێوە بەنیسبەت منداڵی نەزان و گەمژەو دەبەنگ، لەلایەکی تریشەوە منداڵانی گەل و نەتەوە دواکەوتووەکان کاتێک ژینگەی کۆمەلایەتی و ئابووریو رۆشنبیریو رامیاریان باش دەبێت یان دەگوێزرێنەوە بۆ ژینگەیەکی پێشکەوتوو، ڕێژەی زیرەکیان بەرزدەبێتەوە، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر لەژینگەیەکی پێشکەوتوو دەوڵەمەندەوە بگوێزرێنەوە بۆ ژینگەیەکی دواکەوتو ئەوا ڕێژەی زیرەکیان دادەبەزێت.

شایانی ئاماژە بۆ کردنە کەدەروونزانی تازە، گەیشتە ئەو ڕاستیەی کەزیرەکی پابەندە بەدوو هۆکاری سەرەکیەوە، یەکەمیان بۆماوەیە ئەویتریان ژینگە، لەئەنجامی کارلێککردنی ئەو دوو هۆکارەوە (بۆماوە × ژینگە) ڕێژەو توانستی زیرەکی دیاری دەکرێت، بەنیسبەت بۆماوەو توانستی سەرکەوتوو لەناو هەموو گەل و نەتەوەو سەلالەیەکدا هەیە، بەلام هۆکاری دووهەم واتە ژینگەی کۆمەلایەتی و ئابووریو رامیاری و رۆشنبیری جیاوازەو وەک یەک نین، لەبەرئەوە ئەو جیاوازییە زۆرە دەبینین کەهەیە لەلایەنی ژیری و توانستە عەقلیەکانی ترو ژمارەی بەهرەمەندو لێهاتووەکان، دەگۆڕدێن لەکۆمەلێکەوە بۆ کۆمەلێکی تر بەپێی پێشکەوتنی شارستانی و کۆمەلایەتییان.

وەبەڵگەش بۆ کارلێککردنی ئەو دوو هۆکارە ئەو جیاوازیە زۆرەیە کەلەنێوان وولاتانی ڕۆژئاوا و وولاتانی ڕۆژهەلات لەلایەک و وولاتانی پێشکەوتوو وولاتانی تازە پێش کەوتوودا لەلایەکی ترەوە کەلەلایەنی داهێنان و ئەفراندن و دەرکەوتنی کەسانی ناودارو زانا هەیە، هۆکاری سەرەکیشی دواکەوتوویی ڕژێمی حوکمداری و سیستمی ئابووریەکەیەتی و دواکەوتوویەکەی بۆ ڕەگەزو توخم و سەلالەکەی ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ ئەو ژینگە کۆمەلایەتی و ئابووری و رامیاری و ڕۆشنبیرییەی دەگەڕێتەوە کەتیایدا دەژی، ئەگەر منداڵێکی یابانی یان ئەمریکی بهێنین و لەکوردستان بژی و بەو شێوەی لای ئێمە لەخێزانو خوێندنگاو کۆلان و لەڕێگەی ئەو ئامرازانەی ڕاگەیاندنی ئێمەوە فێربکرێت و لەو بارودۆخە نالەبارو دژوارەی ئێمەدا بژی بێگومان بەهیچ شێوەیەک لەمنداڵە کوردەکە باشتر نابێت، بەلام ئەگەر ئەو منداڵە کوردەمان گواستەوە بۆ ژینگەیەکی پێشکەوتوو، ئەوا ئەگەر لەوان بەتواناترو بلیمەتر نەبێت ئەوا لەوانیش کەمتر نابێت، وە نموونەی زیندووش لەم بارەیەوە زۆرە.

**چۆنیەتی گەشەکردنی هەڵچوونەکانی منداڵ**

**منداڵ بۆ تووشی هەڵچوون دەبێت ؟**

**قۆناغەکانی گەشەکردنی هەڵچوونەکان**

**ئەو هۆکارانەی کار لە گەشەکردنی هەڵچوونەکان دەکەن**

**منداڵ چۆن دەبێت بە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی ؟**

**شێوازەکانی راهێنانی کۆمەڵایەتی**

**گرنگی دایک لە ژیانی منداڵ**

**پرۆسەی شیر پێدان**

**گرنگی باخچەی ساوایان**

# چۆنیەتی گەشەکردنی هەڵچوونەکانی منداڵ

## پێشەکی

هەڵچوون (الأنفعال) وەک هەموو دیاردە جەستەیی و دەروونیەکانی تر لەکاتی گەشەکردنیدا تادەگاتە ئاستێکی کامڵ و گەیو بەچەند قۆناغێکدا تێ دەپەڕێت.

لەسەرەتای ژیاندا هەڵچوونەکان زمان حاڵی منداڵی شیرە خۆرەن و لەڕێگەیانەوە زۆر لەپێداویستیەکانی لەلایەن کەسانی چواردەوریەوە (بەتایبەتی دایک) تێر دەکرێن، زۆربەی هەڵچوونەکان لەسەرەتای ژیانی مرۆڤدا پەیوەستن بەخۆشی و حەواندنەوەی جەستەو تێرکردنی پێداویستییە فسیۆلۆژیەکان (خەو، نان، ئاو، ڕزگار بوون لەپاشەڕۆ، ...هتد). واتە کاتێک منداڵ برسی یان تینو یان خۆی پیس کردووە یان ئازاری هەیە پەنا بۆ هەڵچوونەکانی دەبات و لەڕێگەی گریان و تووڕەبوون و بێزاری و قەڵسیەوە گوزارشت لەو برسێتی و ئازارو ناخۆشیانەی دەکات و سەرنجی کەسانی چواردەوری پێ ڕادەکێشێ. بەڵام منداڵی شیرەخۆر کاتێک تێر دەبێت و هەست بەهیچ ئازارو ناخۆشیەک ناکات ئەوا زۆر هەڵچوونی وەک (دڵخۆشی، کامەرانی، شادی) لەجەستەو دەم و چاویدا ڕەنگ دەداتەوەو لەڕێگەی زەردەخەنەوە گوزارشتیان لێ دەکات. دوای ئەوەی شارەزایی زیاترو تەمەنی گەورە تر دەبێت، ئەوا ئەو کاتە پێکەنین و گاڵتەو گەپی جێگای زەردەخەنەی دەگرێتەوە. کەواتە سەرچاوەی ئەو ورووژێنەرانەی (مثيرات) کەدەبنە مایەی هەڵچوونەکان یان لەجیهانی ناوەوەی منداڵ یان لەجیهانی دەرەوە سەرهەڵدەدات، بۆ نموونە:-

[زۆر جار (قسە لەگەڵ کردن، یاری کردن، سەرکەوتن بەسەر گرفتێکدا، هەڵبەزو دابەز بەسەر کەڵ و پەلدا، دەست کەوتنی شتێکی خۆش، نەمانی برسێتی، تێر خەوتن،... هتد) دەبنە مایەی خۆشی و کامەرانی منداڵ] (همام، ١٩٨٤، ص١٤١).

لەساڵی یەکەم زۆربەی هەڵچوونەکانی منداڵی شیر خۆر ئاڕاستەو پەیوەستە بەدایکەوە چونکە ئەو یەکەم کەسە لەژیانی منداڵداو و بەرپرسیارە لەتێرکردن یان تێرنەکردنی پێداویستیە گرنگەکانی منداڵ، بەڵام لەساڵی دووهەم لەئەنجامی فراوان بوونی بازنەی پەیوەندییەکانی منداڵ بەجیهانی دەرەوە، هەڵچوونەکانی زیاتر گەشە دەکەن و وروژێنەرەکان زیاتر و جۆراو جۆرتر دەبن.

ئەوەی زانراوە هەڵچوونەکان گرنگیەکی تایبەتی و بێوێنەیان لەژیانی مرۆڤدا هەیەو بەبێ هەڵچوونەکان هیچ تام و چێژێکی نیە. بەڵکوو تەنها هەڵچوونەکانی وەک (دڵ خۆشی، دڵتەنگی، شادی، توورەبوون، ترس، هیواو ئاوات، چکۆسی، .... هتد) دەتوانن ببن بەداینەمۆو جووڵێنەری بیرکردنەوەو هەڵس و کەوتی ڕۆژانەمان و ماناو تام و چێژی تایبەتی خۆی بدەنێ، بەمەرجێک لەسنووری ئاسایی خۆیاندا بن.

**پێناسە:**

هەڵچوونەكان بریتین لەچەند حاڵەتێكی كت و پڕو لەناكاو كە لەناوەوەی مرۆڤ ڕوودەدەن و چەند لایەنێكی زانینی تایبەتی و گۆڕانكاری جەستەیی و فسیۆلۆژی لەخۆ دەگرێت و كۆنترۆڵ كردنی زۆر زەحمەتە و بەئاسانی هەستی پێ دەكرێت (دافیدوف، ۱۹۸۳، ص ٤٨٠).

ئەگەر بەوردی سەیری سروشتی هەڵچوونەكان بكەین ئەوا دەتوانین (۳) سێ هەڵچوونی سەرەكیان لێدیار بكەین، كە ئەوانیش بریتین لە دڵە ڕاوكێ (القلق)، توڕەبوون و شەڕخوازی (الغضب والعدوانیة)، خۆشیو شادی (الأبتهاج). ئەوەی جێگەی ئاماژە بۆ كردنە هەندێك لەزاناكان مانای زاراوەی هەڵچوون (EMOTION) بەمانا بەرفراوانەكەی لێك دەدەنەوەو دەڵێن هەموو حاڵەتە ویژدانیەكانی مرۆڤ دەگرێتەوە (بەئاسك و سادەیو توندی و هەموو زەبرو گرژییە كیبەوە) لەوانەش (ترس، توڕەبوون، كامەرانی، غەمباری، تام و چێژ وەرگرتن لەسەیر كردنی دیمەنێك یان خوێندنەوەی نووسراوێك، یان خواردن و خواردنەوەی خۆراك و شلەمەنیەك، یان بێزاری و ناڕەحەتی و بینینی ڕووداوێك یان چاوەڕوان كردنی بەسەرهاتێكی ناخۆش..... هتد) (راجح، ۱۹۸٥، ص ۱٥۳) بەلام ئەوەی ئێمە لەم نووسینەدا مەبەستمانە تەنها ئەو حاڵەتە و یژدانیە كت و پڕو لەناكاوەیە كە جەستەو دەروونی مرۆڤ دەهەژێنێ و تووشی بارێكی دەروونی ئاڵۆزی دەكات و ڕەنگدانەوەی كت و پڕی لەسەر جەستەو ئەندامەكانی ناوەو دەرەوەی دەبێت.

زاراوەی هەڵچوون (EMOTION) لەووشەكانی (EMOTUS)و (EMOYION)ی لاتینیەوە داتاشراوە كەبەزمانی لاتینی مانای ( بجووڵێندرێ) یان (بخرێتە حاڵەتی جووڵە) دەگەیەنێت وە لە دەروونزانیشدا بەمانای هەژاندن و وروژاندنی جەستەو دەروونی مرۆڤ بۆ كاتێكی دیاری كراو دێت. (كاظم، ۱۹۸٥، ص۱۳).

**منداڵ بۆ تووشی هەڵچوون دەبێت.؟**

بێگومان هیچ كەس بەبێ هۆ تووشی هەڵچوون نابێت، بەڵكو دەبێت كۆمەڵێك هۆكاری دەرەكی یان ناوەكی یان تەنها یان لەگەڵ یەكتری هەبن بۆ ئەوەی تاك تووشی هەڵچوون و ئەو بارە دەروونیە تایبەتیە ببێت، هۆكارەكانیش زۆرن و لەژمارە نایەن بەلام دەتوانین لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا زۆربەیان كۆبكەینەوە:

١- دانانی بەربەست و ڕێگر لەبەردەم تێركردنی پێداویستییە فسیۆلۆژیەكانی منداڵدا. بۆ نموونە برسێتی، تینوێتی، ئازاری لەش، خۆپیس كردن، تەنگە نەفەسی، خەو لێزڕان منداڵ تووشی گریان و توڕەبوون و گرژی و خەم و خەفەت و دڵە ڕاوكێ دەكات، كەئەمانە هەموویان جۆری هەڵچوونەكانن.

٢- تێركردنی لەناكاوی زۆر لەپێداویستیەكانی منداڵ. بۆ نموونە ئەگەر لەناكاو دیاری و یاریەكی بەنرخی بدرێتێ، یان لەمەترسییەك دوور بخرێتەوە یان پێداویستییە فسیۆلۆژیەكانی تێر بكرێت، یان لەئازارو ناخۆشیەك ڕزگار بكرێت، سەرجەم ئەمانە دەبنە مایەی كامەرانی و شادی و دڵخۆشی ئەو منداڵە.

٣- هەست كردن بەلەدەست دانی كەس و هێماو كەل و پەلێكی خۆشەویست منداڵ تووشی هەڵچوون دەكات. بۆ نموونە ئەگەر منداڵ لەئەنجامی لەدایك بوونی منداڵێكی ترەوە هەستی بەلەدەست دانی سۆزو خۆشەویستی و چاودێری دایك و باوك و كەسانی تری ناو خێزان كرد، ئەوا رق و كینەیەكی زۆری لەبەرانبەر ئەو منداڵە تازە لەدایك بووە لەلا دروست دەبێت و تووشی چكۆسی (غیرە) دەبێت.

٤- ڕووداوی لەناكاوی چاوەڕوان نەكراو منداڵ تووشی هەڵچوون دەكات. بۆ نموونە ئەگەر لەپڕ لەنزیك منداڵەوە دەنگێكی بەرز پەیدابێت، یان یاری لێتێك بدرێت یان كەل و پەلێكی بەنرخ لەناو ببرێت یان كەسانێكی نامۆو بیانی لەبەردەمیدا قووت ببنەوە... هتد، سەرجەم ئەو وروژێنەرانە منداڵ تووشی (ترس، توڕەبوون، شەرم، خەم، خەفەت، ... هتد) دەكەن.

## چۆن بزانین منداڵ تووشی هەڵچوون بووە؟:-

لەڕێگەی كۆمەڵێك گۆڕانكاری و نیشانەوە دەتوانین هەڵچوون و جۆرەكانی بناسینەوە. چونكە كاتێك منداڵ لەئەنجامی هۆكارێكەوە تووشی هەڵچوون دەبێت، ئەوا كۆمەڵێك گۆڕانكاری كت و پڕ كە ئەو منداڵە ناتوانێت بیان شارێتەوە ڕوودەدەن كە بریتین لە:

١- خێرا بوونی لێدانی دڵ ٢- تێك چوونی پرۆسەی ئاسایی هەناسەدان. ٣- زیاد بوونی ڕژێن و هۆرمۆناتی هەندێك لەگلاندەكان، لەوانە( ئەدرنالینە گلاند، پیتۆیتەرییەگلاند) (الغدة الأدرنالية، الغدة النخامية). ٤- زیاد بوونی ڕێژەی شەكر لەخوێندا. ٥- دەم و چاو سور یان، زەرد هەڵگەڕان. ٦- زیاد كردنەوەو بەرفراوان بوونی بیبیلەی چاو. ٧- وەستان یان خاوبوونەوەی پرۆسەی هەرس كردن. ٨- وەستان و كەم بوونەوەی دەرهاوێشتەكانی لیكە گلاند (الغدة اللعابية)... هتد.

جێگەی ئاماژە بۆ كردنە كە ئەو گۆڕانكارییانەی سەرەوە لەئەنجامی توێژینەوە زانستیەكانی زانایان (دارون، ١٨٧٢)، (كانون، ١٩٢٢) دۆزرانەوەو بەووردی دیاری كران.( فهمي، ١٩٧٧، ص٧٢).

## قۆناغەکانی گەشەکردنی هەڵچوونەکان:

هەڵچوونەکانی مرۆڤیش وەک هەموو دیاردەو لایەنە جەستەیی و دەروونیەکانی تر، بەچەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت، بەڵام بەداخەوە تاوەکوو ئێستا بەتەواوەتی ئەو قۆناغانە یەکلا نەکراونەتەوەو هەموو زاناکان لەسەریان ڕێک نەکەوتوون، بەڵکوو زۆر جار مشت و مڕو بگرەو بەردەیەکی زۆریش لەنێوانیادا دروست بووە لەبارەی ئەوەی ئایا هەڵچوونەکان بۆ ماوەن یان لەژینگەوە فێریان دەبین، چەند جۆر هەڵچوون هەیە، جیاوازی نێوان هەڵچوون و سۆز (العاطفة) چییە؟.

هەر لەبەر ئەوەشە کە زاناکان بەسەر دوو کۆمەڵی سەرەکیدا دابەش بوون، کۆمەڵەی یەکەم لەو بڕوایەدان کە منداڵ هەر لەکاتی لەدایک بوونەوە خاوەنی چەند هەڵچوونێکە کە لەڕێگەی بۆ ماوەوە بۆی گوێزراوەتەوەو لەنێوان سەرجەم منداڵانی جیهاندا هاوبەشە. بەڵام کۆمەڵەی دووهەم لەو بڕوایەدان کەمنداڵ لەدوای لەدایک بوون بێجگە لەهەڵچوونێکی گشتی ( تهیج عام)، ئیتر هیچ جۆرە هەڵچوونێکی دیاری کراوی تری نیە، بەڵکو لەدوای لەدایک بوون دوای زیاد بوونی شارەزایی و گەورە بوونی تەمەنی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەو جۆری هەڵچوونەکان زیاد دەکەن و دەناسرێنەوە. (واتسن)ی دامەزرێنەری قوتابخانەی ڕەوشتایەتی( المدرسة السلوكية) بەپێشەوای کۆمەڵەی یەکەم لەقەڵەم دەدرێت.

(واتسن) لەو بڕوایەدایە کەمنداڵ یەکسەر دوای لەدایک بوون خاوەنی(٣) سێ جۆر هەڵچوونی جیاوازە کە ئەوانیش (ترس، تووڕەیی، خۆشەویستی) یە، بەڵگەشی بۆ بوونی ئەو هەڵچوونانە ئەوەیە کە ئەگەر دەنگێکی بەرز لەلای منداڵ دروست بکرێت ئەوا یەکسەر نیشانەکانی ترس لەدەم و چاوی ئەو منداڵە تازە لەدایک بوەدا دروست دەبێت، یان ئەگەر لەسەر هەردوو دەست دابنرێت و یەک تۆز بۆسەرەوە بەرز بکرێتەوە (هەڵپەڕاندنی) هەمان حاڵەتی ترسی لەلا دروست دەبێت.

بەڵام زانایانی کۆمەڵەی دووهەم لەو بڕوایەدان کەمنداڵ دوای لەدایک بوون لە هەڵچوونێکی گشتی زیاتر( کەبەهیچ شێوەیەک ناتوانرێت جۆری هەڵچوونەکەی دیاری بکرێت)، خاوەنی هیچ جۆرە هەڵچوونێکی ناسراوو زانراوی تر نیە وەک ئەوانەی کە (واتسن) دیاری کردون، نموونەی زۆریش لەو بارەیەوە وەک بەڵگە بۆ پووچەڵ کردنەوەی بیروڕاکانی (واتسن) دەهێننەوە لەوانە:

کاتێک منداڵ دەگری ئەگەر فیشەکێک لەنزیکیەوە بتەقێندرێ ئەوا یەکسەر ژێر دەبێتەوەو لەگریان دەوەستێت بەپێچەوانەی بیروڕاکانی( واتسن) کەدەڵێت دەنگی بەرزو لەناکاو منداڵ تووشی هەڵچوون (ترس) دەکات، ئەگەر ئەو بۆ چوونەی (واتسن) ڕاست بوایە، ئەوا دەبوایە منداڵەکە لەگریان نەوەستێت بەڵکو لەئەنجامی ئەو تەقەیەوە گریانەکەی زیاتر بوایە. هەروەها دەرئەنجامی توێژینەوەکانی(کاترین بردجز) ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەمنداڵ تەنها خاوەنی

بناسرێنەوە ئاخۆ ئەمانەش (ترسە، توڕەبوونە، خۆشەویستییە،... هتد) هەڵچوونێکی گشتیە کەناتوانرێت بزانرێت ئایا ئەوە( ترسە، توڕەبوونە، خۆشەویستییە،... هتد) بەڵام وورده وورده دوای چەند هەفتەیەک سەرەتای هەڵچوونەکان دەردەکەون و دوای چەند مانگێک دوای لەدایک بوون دەتوانرێت هەڵچوونەکانی وەک( ترس، تووڕەبوون، قێز لێبوونەوە) بناسرێنەوە ئەویش بەم شێوەی لای خوارەوە:

لەمانگی سێهەمی دوای لەدایک بوون لەپاڵ هەڵچوونە گشتیەکاندا دەتوانرێت دوو جۆر هەڵچوونی گەشە کردوو بناسرێنەوە کەئەوانیش (حەسانەوە) (الأرتياح) و قەڵسییە (الضيق)، هەروەها لەسەرەتای مانگی شەشەم هەڵچوونی (قەڵسی) زیاتر گەشە دەکات و چەند هەڵچوونێکی تری وەک( لق و پۆپ) لێدەکەوێتەوە کەئەوانیش بریتین لە [تووڕەبوون، قێز لێبوونەوە (التقزز) ترس] هەروەها هەڵچوونی (حەسانەوە) ش زیاتر گەشە دەکات و چەند هەڵچوونێکی تری لێدەکەوێتەوە کەدەتوانرێت لەمانگی دوانزەهەمدا بەئاسانی هەردوو هەڵچوونی (خۆشەویستی) (المحبة) و (شانازی کردن) (الزهو) بناسرێنەوە، لەدەوروبەری مانگی هەژدە هەمیشدا لەهەڵچوونی (خۆشەویستی) هەردوو هەڵچوونی (خۆشەویستی گەورەکان) (محبة الكبار)و (خۆشەویستی گچکەکان) (محبة الصغار) دروست دەبن ( الحمداني، ١٩٨٩ ، ص ١٥٩).

بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کەچۆن هەڵچوونە جۆراو جۆرەکان یەک لەدوای یەک گەشە دەکەن و زیاتر دەناسرێنەوەو دەتوانین لەکۆتایی ساڵی دووهەمی ژیانی منداڵدا (٢٤ مانگی) بەئاسانی زۆربەی هەڵچوونەکان دیاری بکەین و بەئاسانی لەهەڵچوونە گشتیەکەی دوای لەدایک بوونی جیا بکەینەوە. لەئەنجامدا بۆمان دەردەکەوێت کە( بردجز) لایەنگیری ئەو بۆ چوونەیە کەجەخت لەسەر ئەوە دەکات کە هەڵچوونیش وەک جەستەو ژیری لەکاتی گەشە کردنیدا بەچەند قۆناغێکدا تێ دەپەڕێت( فهمی، ١٩٧٧، ص ٨٠-٨١). بەواتایەکی تر منداڵ چەند گەشە بکات و شارەزایی زیاتر و تەمەنی گەورە تر ببێت ئەوەندە زیاتر هەڵچوونەکانی گەشە دەکات و لەیەکتری جیا دەبنەوەو باشتر دەناسرێنەوە و بەئاسانیش منداڵ دەتوانێت ووروژێنەرەکانی چوار دەوری لەیەکتری جیا بکاتەوەو جیاوازی لەنێوان دەم و چاوو ڕووی بەزەردەخەنەو پێکەنیناوی و دەم و چاوو ڕووی گرژو مۆن بکات، هەروەها جیاوازی لەنێوان دەنگی بەسۆزو دەنگی ناخۆش و ترسناکدا بکات.

بۆ نموونە منداڵ لەنێوان مانگی دوو(٢) وەمانگی شەشدا(٦) دەتوانێت زەردەخەنە بۆ کەسانی چواردەوری بکات بەڵام بەبێ ئەوەی بتوانێت دەم و چاوە هەمەجۆرەکان لەیەکتری جیابکاتەوە، بەڵام لەنیوەی دووهەمی ساڵی یەکەمی تەمەنیدا دەتوانێت دەم و چاوەکانی کەسانی چواردەوری لەیەکتری جیابکاتەوە، واتە باوک و دایک و خزم و کەسی چواردەوری لەکەسانی نامۆو دەرەکی و بیانی جیابکاتەوە، بەزەردەخەنەکردن بۆ کەسانی خۆی و ترسان و دڵەڕاوکێ بۆ کەسانی نامۆو بیانی گوزارشت لە هەڵچوونەکانی دەکات. (کونجر، ١٩٧٠، ص ١٥٣).

لەسەرەتای ژیاندا خۆشەویستی شیرەخۆرە بۆ ئەو کەسانەیە کە پێداویستییەکانی تێردەکەن و ئازارەکانی کەم دەکەنەوە، کەئەوانیش خۆیان لەدایک و باوک و ئەندامانی تری خێزانەکەیدا دەبیننەوە، ئینجا دوای ئەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بازنەی خۆشەویستی منداڵ بەرفراوانتر دەبێت و ئاراستەی کەسانی تری دەرەوەی خێزان و بیانی دەکرێت.

## ئەو هۆکارانەی کار لەگەشەکردنی هەڵچوونەکان دەکەن:

دوو هۆکاری سەرەکی ڕۆڵی گرنگیان لەگەشەکردنی هەڵچوونەکاندا هەیە، ئەوانیش بریتین لە:

### ١ - پێگەیشتن (کەمین) (النضج):

مەبەست لەکەمین (پێگەیشتن) کامڵ بوون و دەست بەکار بوونی ئەندامەکانی لەشە، ئەو ئەندام و کۆئەندامانەش کەپەیوەندی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆیان بە هەڵچوونەکانەوە هەیە، کۆئەندامی دەماری ناوەندی (الجهاز العصبي المركزي) و کۆئەندامی دەماری ئۆتۆنۆمی(الجهاز العصبي الذاتي)و گلاندەکان و هەستەوەرەکانن.

واتە تا منداڵ زیاتر گەورە ببێت و بچێتە ناو تەمەنەوە ئەوەندە ئەو کۆئەندامە جەستەییانە زیاتر گەشە دەکەن و منداڵ زیاتر دەتوانێت ووروژێنەرەکان لەیەکتری جیا بکاتەوەو باشتر لەماناو مەترسی و باشی و خراپیان تێ بگات، کەسەرجەم ئەوانەش لەخزمەتی گەشەکردنی هەڵچوونەکانیدان، لەبەر ئەوەی پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان توانستە ژیرییەکان (القدرات العقلية) و ئاستی هەڵچوونی مرۆڤدا هەیەو پرۆسە ژیرییەکانی (العمليات العقلية) وەک (یادکردنەوە، بەراوردکردن، چاوتێ برین، پێش بینی کردن، تێگەیشتن، لێکدانەوە،... هتد) یارمەتی دەرن بۆ ناسینەوەو جیاکردنەوەو زانینی مانای وروژێنەرەکان، هەر ئەمەشە وا لەمنداڵ دەکات کە هەرجارەی لەچەند شتێک بترسێت یان توورە، یان پێیان دڵخۆش ببێت و بەپێ ی تەمەنی بگۆڕێن. بۆ نموونە منداڵ لەسەرەتادا لەو شتانە دەترسێت کەلەناو خێزان و چواردەوری هەن دوای ئەوە لەشتەکانی دەرەوەی خێزان دەترسێت، یەکەم جار کەل و پەل و شتە هەست پێکراوەکان (الأشياء المحسوسة) دەبنە مایەی (ترس و تورەبوون و کامەرانی و دڵ تەنگی) منداڵ دوای ئەوە لەقۆناغەکانی تردا شت و ڕووداوو دیاردە واتادارو ڕووتەکان (الأشياء والظواهر المجردة والمعنوية) دەبنە مایەی دروست کردنی هەڵچوونە جیاجیاکانی.

هەروەها گلاندەکانیش بەتایبەتیش ئەدرنالیە گلاند (الغدة الأدرنالية) ڕۆڵی گرنگیان لەگەشەکردنی هەڵچوونەکاندا هەیە (الزوبعی، ١٩٨٩، ص ١٢١). کە بەرپرسە لەزۆربەی ئەو گۆڕانکارییە فسیۆلۆژیانەی کە هاوکات لەگەڵ هەڵچوونەکاندا ڕوودەدەن. لەلایەکی تریشەوە هەندێک لە دەرئەنجامی توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەهەندێک لەمنداڵان هەر بە بۆماوە یەکسەر دوای لەدایک بوون زوو هەڵدەچن و بەئاسانی دەوروژێندرێن و بەردەوام لەحاڵەتی جووڵەو گرژو مۆنیدان و لەرێگەی گریان و هاوار و تورەبوونەوە گوزارشت لەباری دەروونیان دەکەن، بەپێچەوانەی منداڵانی تر کە زۆر لەسەر خۆو بێ دەنگ و هێمنن و تەنانەت لەداهاتووشدا لەکاتی کامڵی و گەورە بونیاندا هەر ئەو بارەدەروونیەی منداڵی لەگەڵیان بەردەوام دەبێت، کەئەمەش بەرای ئەو زانایانە بۆ جۆری کۆئەندامی دەماری ناوەندی و کۆئەندامی دەماری ئۆتۆنۆمی ئەو منداڵانە دەگەڕێتەوە، لەبەر ئەوەی هەندێک کەس هەر بە بۆماوە خاوەنی جۆرێک کۆئەندامی دەماری هەستیارن کەبەئاسانی دەوروژێندرێن و وەک (فیشەکە شێتە بەئاسماندا دەچن) و ئەو کەسانە زۆر سەرە ڕۆو سەرگەرم و دەمارگیر دەبن و لەکاتی هەڵچوونەکانیاندا زۆر توندوتیژو هەڵچوو دەبن و دەکەونە ئەم سەرو ئەو سەری هەڵچوونەکان، واتە کە ترسا زۆر دەترسێ کەتورە بوو زۆر خراپ تورە دەبێ، کەیەکێکی خۆشویست زۆر بەتوندی خۆشی دەوێت کە ڕقی لەیەکێکیش بوو زۆر خراپ ڕقی لێی دەبێت، بەپێچەوانەی ئەوانیشەوە کەسانێکی تر هەن کە خاوەنی کۆئەندامی دەماری زۆر سست و لەسەر خۆو هێمنن کە تووشی جۆرە گێژی و سستی و خاوی و تەمبەڵی و لاوازییەکیان دەکەن، ئەم جۆرە کەسانە کە تورەدەبن تورەییەکەیان زۆر سادەو لاوازەو مەترسی بۆ سەر کەسانی چواردەوری نیە، واتە زۆر درەنگ و بەزەحمەت تووشی هەڵچوون دەکرێن. (الهاشمی، ١٩٨٦، ص ٢٧٢).

کەواتە پێگەیشتنی کۆئەندامی دەماری ناوەندی و جۆرەکەی ڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر هەڵچوونی منداڵ، چونکە منداڵ ئەگەر ماناو مەترسی و باش و خراپی دیاردەو وروژێنەرەکان نەزانێت ئەوە بەهیچ شێوەیەک تووشی هەڵچوون نابێت، هەروەها تابە بەباشیش شارەزای داب و نەریتی کۆمەڵایەتی و یاساکانی نەبێت ئەوا بەهیچ شێوەیەک مانای شەرم کردن و هەست کردن بەگوناهو تاوان و کەمی فێرنابێت. (الحمدانی، ١٩٨٩، ص ١٥٨).

### ٢- *فێربوون (التعلم)*:-

دوای ئەوەی کۆئەندامی دەماری ناوەندی تا ئاستێکی گونجاو گەشەی کردو منداڵ ئەو توانایەی لەلادروست بوو کە سوود لەدیاردەکانی ژیان وەربگرێت و ڕاست و چەپی خۆی لەیەکتری جیا بکاتەوە، ئیتر ڕۆڵی هۆکاری دووەم دەردەکەوێت کەئەویش فێربوونە. فێربوونیش مانای وەرگرتن و تێ گەیشتنی دیاردەو وروژێنەرەکانی ژینگەی خێزانی و کۆمەڵایەتی دەگەیەنێت. منداڵ لەقۆناغی منداڵیدا بەسێ شێواز فێری هەڵچوونەکان دەبێت و وورده وورده گەشە دەکەن، شێوازەکانیش بریتین لە:-

**أ- فێربوون بەڕێگەی هەوڵدان و هەڵەکردن (المحاولة والخطأ):**

زۆر جار منداڵ لەسەرەتای ژیانیدا لەڕێگەی هەوڵدان و هەڵەکردن و تاقی کردنەوەو ئەم دیوو ئەو دیوو کردنی دیاردەکانی ژیانەوە فێری هەندێک لەهەڵچوونەکان دەبێت، بۆ نموونە ئەگەر منداڵ لەڕێگەی هەوڵدان و تاقی کردنەوەوە بۆی دەرکەوت کەهات و هاوارو گریانەکانی دەبنە هۆی تێرکردنی پێداویستییەکانی و دەست کەوتنی سۆزو خۆشەویستی و ڕەزامەندی دایک و باوک و کەسانی چواردەوری، ئەوە ئیتر بەردەوام پەنا بۆ هەڵچوونەکانی گریان و توڕە بوون و هات و هاوار دەبات، تاوای لێدێت کەدەبێت بەبەشێک لەهەڵچوونەکانی. بەلام ئەگەر بەپێچەوانەوە بۆی دەرکەوت کە ئەو گریان و توڕەبوون و هاوارکردنەی هیچ دەست کەوت و سودو قازانجێکیان نیە بەڵکو دەبنە مایەی توڕەبوون و ناڕەزایی دایک و باوک و کەسانی چواردەوری، ئەوا ئەو کاتە وازیان لێ دەهێنێ و دووبارەیان ناکاتەوەو بەناچاری پەنا بۆ شێوازێکی تر دەبات تا لەڕێگەیەوە گوزارشت لەهەڵچوونەکانی بکات، بەمەبەستی تێرکردنی پێداویستیەکانی و ڕازی کردنی کەسانی چواردەوریشی.

**ب- فێربوون لەڕێگەی لاسایی کردنەوە:**

زۆر جار منداڵ لەڕێگەی لاسایی کردنەوەی کەسانی چوار دەوریەوە (بەتایبەتی دایک و باوک) فێری هەندێک لەهەڵچوونەکان دەبێت، واتە هەڵچوونەکانی کەسانی چواردەور وەک پەتایەک بەخێرایی بۆ منداڵ دەگوێزرێنەوە. بۆ نموونە ئەگەر دایک لەکاتی بینینی مشکێکدا زۆر ترساو هاواری کردو لەو جێگایە ڕای کرد، ئەوە منداڵەکەشی لەداهاتوودا بەهەمان شێواز وەک دایکی ئەگەر مشکێکی بینی یەکسەر هاوار دەکات و لەترسان ئەو جێگایە بەجێ دەهێڵێ، بەلام ئەگەر ئەو دایکە نەترساو یەکسەر پەلاماری شتێکی دا بەمەبەستی کوشتنی مشکەکە، ئەوا منداڵەکەشی لەکاتی بینینی مشکدا ناترسێت و وەک دایکی هەڵس و کەوت دەکات.

هەروەها کاتێک منداڵ دەبینێ دایک و باوکی لەهەورە تریشقەو تارمایی و تاریکی دەترسن ئەوا ئەویش فێری ئەو ترسە دەبێت، یان کاتێک دایک و باوک لەئەنجامی بینینی فیلم یان گۆرانی یان ڕووداوێک لەتەلەفزیۆن تووڕە یان دڵخۆش دەبن، بەهەمان شێوەش منداڵەکانیان بەبینینی ئەو فیلم یان گۆرانی یان ڕووداوە تووڕە یان دڵخۆش دەبن. کەواتە منداڵ لەڕێگەی سەیرکردن و لاسایی کردنەوەو سەرنج دانی دایک و باوک و مامۆستا و کەسانی تری چواردەوریەوە فێری زۆر لەهەڵچوونەکان و شێوەی گوزارشت لێکردنیان دەبێت.

**ج- فێربوون لەڕێگەی پەیوەست بوون و پێکەوە لکاندنی مەرجێتی (الأقتران الشرطي):**

ئەم شێوازەش ئەوە دەگەیەنێت کەهەندێک جار لەئەنجامی هاوکات و هاوشوێنی و پێکەوە دووبارە بوونەوەی دوو وروژێنەر (مثیر)، کەیەکێکیان دەبێتە مایەی هەڵچوون بەلام ئەوی تریان بێلایەنە‌و نابێتە مایەی هەڵچوون، ئینجا کاتێک ئەو دوو وروژێنەرە لەیەک کاتدا پێکەوە ڕوودەدەن و بۆماوەی چەند جارێکیش بەیەکەوە دووبارە دەبنەوە ئەوا دوای ماوەیەک وروژێنەری دووەم کە

وروژێنەری یەکەم (کە بێلایەنەو نابێتە مایەی هەڵچوون هەمان سیفات و خاسیەت و کاریگەری وروژێنەری یەکەم (کە دەبێتە مایەی هەڵچوون) وەردەگرێت، واتە ئەویش دەبێتە مایەی هەڵچوون، بێ گومان ئەم شێوازی فێرکردنە پشت بە تیۆرەکەی (بافلۆفی) زانای ڕوسی دەبەستێت. لەگرنگترین و بەناوبانگترین توێژینەوە لەم بوارەدا، توێژینەوەکەی(واتسن)ە( Watson) کەبەدامەزرێنەری قوتابخانەی ڕەوشتایەتی دادەنرێت، پوختەی توێژینەوەکەشی بەم شێوەی لای خوارەوەیە:-

(توێژینەوەکەی لەسەر منداڵێکی تەمەن (٩) نۆ مانگ کەناوی (ئەلبرت) بوو کرد، لەسەرەتادا (واتسن) هەندێک ئاژەڵی وەک کەروێشک ، سەگ ، مەیموون، مشک، پشیلەی پیشانی ئەلبرت دەدا، سەیری کرد کەئەو منداڵە لەهیچ یەکێک لەو ئاژەڵانە ناترسێت و بگرە یاریشیان لەگەڵ دەکات، ئینجا واتسن بڕیاری ئەوەی دا کە هەڵچوونی ترس لەلای ئەو منداڵە دروست بکات، یەکەم جار کەروێشکێکی سپی خستە بەردەم ئەلبرت، لەو کاتەی کە ئەلبرت دەستی بۆ کەروێشکەکە درێژ دەکرد بۆ ئەوەی یاری لەگەڵ بکات و بیگرێتە باوەش، ئالەو کاتەدا یەکسەر واتسن دەنگێکی گەورەی ترسناکی لەنزیک ئەلبرتەوە دروست دەکرد کەئەمەش بێگومان دەبووە مایەی ترساندنی ئەلبرت و ڕاپەڕاندنی، بەم شێوەیە هەرچ کاتێک ئەلبرت دەستی بۆ کەروێشکەکە درێژ دەکردو دەیویست یاری لەگەڵ بکات، ئالەو کاتەدا واتسن لەڕێگەی کوتانی چەکوشێک بەپارچە ئاسنێکدا دەنگێکی بەرزو ناخۆشی دروست دەکرد کەدەبووە مایەی ڕاچڵەکین و ترساندنی ئەلبرت. ئەم کارەی بۆ ماوەی (٦) شەش جار دووبارە کردەوە.

دوای ئەو (٦)شەش جارە بۆ واتسن دەرکەوت کە ئەلبرت تووشی هەڵچوونی ترسان لەکەروێشکەکە بووە، چونکە دوای ئەو(٦) شەش جارە هەر کەکەروێشکەکەی لە ئەلبرت نزیک دەکردەوە بەبێ ئەوەی هیچ دەنگێکی لەگەڵدا بێت، ئەوا یەکسەر ئەلبرت دەستی بەگریان و هاوار دەکردو هەوڵی دەدا کە لەکەروێشکەکە دووربکەوێتەوە. نەک هەر ئەوە بەڵکو لەهەموو ئەو ئاژەڵانەش دەترسا کەوەک کەروێشکەکە سپی بوون، لەسەگ و پشیلە و مشکی سپیش دەترسا، چونکە لەڕێگەی گواستنەوەو گشتاندنەوە(التعميم) ترسەکە بۆ ئەو ئاژەڵانەش گوێزرایەوە. کەواتە لەڕێگەی مەرجێتییەوە (الأقتران، الأشتراط) وروژێنەری بێلایەن (کەروێشک) هەمان خاسیەت و سیفاتی وروژێنەری ترسناک (دەنگی بەرزو ناخۆش) وەردەگرێت. بەم شێوەیە منداڵ لەزۆربەی قۆناغەکانی ژیانیدا زۆر لەهەڵچوونەکانی بەم شێوازە فێردەبێت)(الزوبعی، ١٩٨٩، ص ١٢٢-١٢٣).

هەروەها بەهەمان شێوازیش دەتوانرێت هەڵچوونی خۆشەویستی دروست بکرێت و بۆ کەسانی تریش لەڕێگەی گشتاندنەوە (التعميم) بگوێزرێتەوە.بۆ نموونە ئەگەر پەیوەندی نێوان منداڵ و دایک و باوک پتەوو بەهێز بێت و لەسەر بناغەی خۆشەویستی بوو، واتە منداڵ دایک و باوکی خۆی خۆش ویست و هەستی بەخۆشەویستی ئەوان کرد. ئەو کاتە تۆوی خۆشەویستی لەبەرانبەر

كەسانی تری دەرەوەی خێزان لەدڵ و دەروونی ئەو منداڵەدا سەوزدەبێت و حەز بەتێكەڵاوی و هاوكاری و دۆستایەتی كەسانی تر دەكات، بەڵام ئەگەر منداڵ بێزراوو پشت گوێ خراو هەستی بەڕق و كینەی دایك و باوك و كەسانی چواردەوری كرد، ئەوا ئەمیش هەمان ڕق و كینە ئاراستەی كەسانی دەرەوەی خێزان دەكات و حەز بەتێكەڵاوی و هاوكاری و دۆستایەتی هیچ كەس ناكات و بگرە هەوڵی ئەوەش دەدا تۆڵەی دایك و باوكی لەخەڵكانی تر بكاتەوە. ( زهران، ١٩٨١، ص١٤٧) (الزوبعی، ١٩٨٩، ص ١٢٣-١٢٤).

## ژینگەی كۆمەڵایەتی و جۆری هەڵچوونەكان

زۆربەی زاناكان لەسەر ئەوە كۆكن كەهەڵچوونەكان وەرگیراون و ژینگەی كۆمەڵایەتی ڕۆڵی گرنگ لەگەشەكردن و جۆرو شێوازی دەربڕینیاندا دەبینێ. واتە ئەو ورووژێنەرانەی لەكۆمەڵگای كوردەواری دەبنە هۆی هەڵچوون مەرج نیە هەموو ئەوانە لەكۆمەڵگایەكی تر ببنە مایەی هەمان هەڵچوون. بۆ نموونە ئەگەر زانیمان كەهەندێك گەل و نەتەوە حەز بەخواردنی گۆشتی سەگ و بۆق و پشیلە دەكەن، ئەوا دوورنیە ئێمە یەكسەر بەبیستنی ئەو هەواڵە تووشی قێز لێزبوونەوەو هێڵنج دان ببین، بەڵام یادكردنەوەو باس كردنی‌ئەو جۆرە گۆشتانە دەبێتە مایەی دڵخۆشی و كامەرانی تاكەكانی ئەو كۆمەڵ و گەل و نەتەوانەی كە دەیخۆن. هەروەها لەلای هەندێك كۆمەڵگا شێوازی گریان و هاوارو لاواندنەوە لەكاتی مردندا كارێكی پەسندو پێویستە بەڵام لەلای هەندێك كۆمەڵگای تر ئەو جۆرە گریان و هاوار و لاواندنەوەیە قەدەغەیە، كە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی كەمنداڵانی كۆمەڵگای یەكەم لەڕێگەی خێزان و دام و دەزگا كۆمەڵایەتیەكانی ترەوە فێری گریان و هاوارو لاواندنەوە لەكاتی مردنی خەڵكیدا ببن. بەڵام منداڵانی كۆمەڵگای دووهەم فێری ئەو جۆرە هەڵچوونانە نابن لەبەر ئەوەی قەدەغەیە(الحمدانی، ١٩٨٩، ص ١٦٠).

## ڕۆڵی دایك و باوك و مامۆستا لەگەشەكردنی هەڵچوونەكاندا

وەك لەپێشەوە ئاماژەمان بۆ كرد منداڵ زۆربەی هەڵچوونەكانی لەژینگەی كۆمەڵایەتیەوە (خێزان، قوتابخانە، كۆڵان، برادەر، ئامرازەكانی ڕاگەیاندن،... هتد) فێردەبێت، لەبەر ئەوە كەسانی ئەو ژینگە كۆمەڵایەتیە (دایك و باوك، مامۆستا،... هتد) ڕۆڵی گرنگ و ترسناكیان لەگەشەكردنی هەڵچوونەكاندا هەیەو دەبێت هۆكاری یارمەتی دەربن بۆ گەشەكردنی دروستی هەڵچوونەكان و منداڵ لەخراپەكانیان بپارێزن، ئەویش لەڕێگەی ئەم خاڵانەی لای خوارەوە:

١- دابین كردنی ژینگەی كۆمەڵایەتی گونجاو كەپڕبێت لەخۆشەویستی و دڵنیایی و ئارامی و ئەمن و ئاسایش، بۆ ئەوەی منداڵ بەشێوەیەكی ئاسایی و دروست گەشە بكات.

٢- نابێت دایك لەكاتی شیر پێداندا بەپێی ویست و ئارەزووی منداڵ بجووڵێتەوەو هەرچ كاتێك گریاو كروزایەوە یەكسەر شیری پێبدات، چونكە ئەوە وا لەمنداڵ دەكات كەبەردەوام بۆ سەپاندنی حەزو ئارەزووەكانی بەسەر كەسانی چواردەوریدا وەك خوویەك پەنا بۆ گریان و هاوار ببات.

٣- ئامادەكردن و ڕاهێنانی منداڵانی تری خێزان لەسەر ڕازی بوون و پەسەند كردنی منداڵی تازە لەدایك بوو. هەروەها نابێت دایك و باوك یەكسەر دوای لەدایك بوونی منداڵی تازە، هەموو سۆزو خۆشەویستی لەمنداڵەكانی تر بسێننەوەو بیدەن بەو منداڵە تازە لەدایك بووە، چونكە دەبێتە هۆی دروست كردنی ڕق و كینەو غیرە لەبەرانبەر منداڵە تازە لەدایك بووەكە.

٤- پێویستە لەسەر دایك و باوك و مامۆستا كەدەروازەی گونجاو لەڕێگەی (یاری كردن، نیگار كێشان، شانۆ، شیعرو چیرۆك نووسین، گۆرانی، گریان،... هتد) بۆ منداڵەكان بڕەخسێنن تا لەڕێگەیانەوە لەهەڵچوونە پەنگ خواردووەكانیان ڕزگاریان بێت، چونكە كپ كردن و خەفەكردنی هەڵچوونەكان زیانی گەورە بەباری دەروونی منداڵ دەگەیەنێت و لەداهاتووشدا تووشی كۆمەڵێك گرفت و نەخۆشی دەروونی دەكات.

٥- دەبێت پرۆسەی لەشیر بڕینەوە لەسەرخۆو دوور بێت لەتووندو تیژی و كت و پڕی، بۆ ئەوەی زیان بەباری هەڵچوونی منداڵ نەگەیەنێت.

٦- هەروەها دەبێت ڕاهێنان و ڕزگار بوون لەپاشەڕۆ بەشێوەیەكی هێمن و لەسەرخۆ بێت و نابێت لێدان و سزاو توندو تیژی تێدا بەكار بهێندرێ.

٧- تادەتوانرێت دەبێت منداڵ لەدەنگ و ڕووداوی ترسناك و تۆقێنەر دوور بخرێتەوە ونابێت گاڵتەو سوكایەتیشی پێبكرێت و وەك ئامرازێك بۆ ڕابواردن و كات بەسەر بردن بەكاربهێندرێت.

٨- دەبێت پێداویستییە دەروونیەكانی منداڵ بەتایبەتیش پێداویستی (خۆشەویستی، هەست كردن بەئارامی و دڵنیایی و ئاسایش، ڕێزگرتن، چوونە ناو كۆڕو كۆبوونەوە... هتد) تێر بكرێن.

٩- نابێت منداڵان بەیەكتری بەراورد بكرێن و خاڵی لاوازیان گەورە بكرێت، چونكە ڕق و كینەو غیرە و هەست بەكەمی لەلایان دروست دەكات.

١٠- دەبێت بەیەك چاو سەیری هەموو منداڵەكان بكرێت و جیاوازی لەنێوانیاندا نەكرێت.

١١- لەبەر ئەوەی دایك و باوك و مامۆستا نموونەی زیندو و پێشەوان بۆ لاسایی كردنەوەی منداڵان، دەبێت نموونەیەكی بەكەڵك و سوود بەخش بن و دووربن لەهەڵچوون و تووڕەیی و ترس و دڵەڕاوكێ ی بەردەوام، چونكە لەڕێگەیانەوە منداڵ فێری ئەو جۆرە هەڵچوونانە دەبێت.

## منداڵ چۆن دەبێت بەبوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی؟

منداڵانی هەموو جیهان یەکسەر دوای لەدایک بوون وەک یەک وان و هەموویان یەک جۆر خواردن دەخۆن ئەویش شیرە، هەروەها یەک زمانی تایبەتیان هەیە ئەویش زمانی هاوارو گریان و دەنگی هەڕەمەکی (عشوائي)و گڕوگاڵە، هیچ شتێکیش دەربارەی ئایین و فەلسەفەو داب و نەریتی کۆمەڵەکەیان نازانن، بەڵام پاش ماوەیەک وورده وورده ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەئەنجامی ڕاهێنان و فێرکردنی کۆمەڵایەتیەوە جیاوازی زۆر لەلایەنەکانی کۆمەڵایەتیەوە (زمان، ئایین، ئایدۆلۆژیا، داب و نەریت..... تاد) لەنێوان ئەو منداڵانەی هەموو جیهان دروست دەبێت.

کەواتە منداڵ دوای لەدایک بوون لەبوونەوەرێکی بایۆلۆژی زیاتر هیچی تر نیەو هیچ شتێک دەربارەی کۆمەڵ و داب و نەریت و بەهاکانی نازانێت، تەنانەت ئەوەش نازانێت کە ئەو بوونەوەرێکی تایبەتیەو تایبەتمەندێتی خۆی هەیەو وەک هیچ کەسێکی تری جیهانی دەرەوە نیە، بەپێچەوانەوە وا دەزانێت کە ئەو هەموو جیهانەو جیهانیش بەتەنها هەر ئەوە.

بەڵام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەڕێگەی خێزان و دام و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی ترەوە فێری داب و نەریت و بەهاو یاساو ڕەوشتە کۆمەڵایەتیەکان دەکرێت و لەبوونەوەرێکی بایۆلۆژییەوە بۆ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی دەگۆڕدرێت. ئەو پرۆسەیەش کە لەمیانەیەوە منداڵ دەکرێت بەبوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی، بەپرۆسەی ڕاهێنان و پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی (التنشئة الأجتماعية) (SocialiZation) ناودەبرێت.

### منداڵ و دایک:

یەکەم کەسی گرنگ لەژیانی منداڵدا دایکە، هەر لەبەر ئەوەشە کە یەکەم پەیوەندی کۆمەڵایەتی منداڵ لەگەڵ دایکیەتی. سەرجەم دەرئەنجامی توێژینەوەکان سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی منداڵ لەداهاتوودا بەجۆری ئەو پەیوەندییەی نێوان منداڵ و دایکی لەساڵەکانی یەکەمی ژیاندا دەبەستنەوە. ئینجا ئەگەر ئەو پەیوەندیانەی نێوان منداڵ و دایکی لەسەر بناغەی خۆشەویستی و دڵسۆزی و ڕێزو دڵنیایی بنیات نرابوو، ئەوا ئەو جۆرە منداڵانە دەتوانن لەداهاتوودا بەئاسانی خۆیان لەتەک کۆمەڵ و دام و دەزگاکانیدا بسازێنن، بەڵام ئەگەر یەکەم پەیوەندی نێوان منداڵ و دایکی پڕ لەناخۆشی و گیروگرفت و توندو تیژی بوو، ئەوا ئەو جۆرە منداڵانە لەداهاتوودا لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانیاندا سەرکەوتوو نابن.

منداڵ لەدوو ساڵی یەکەمی تەمەنیدا (کە بەقۆناغی شیرەخۆری ناو دەبرێت) کۆمەڵێک پێداویستی فسیۆلۆژی و دەروونی هەیە لەوانە (شیر خواردنەوە، ڕاهێنان لەسەر پاشەڕۆ، سۆزو خۆشەویستی، باوەشی گەرمی دایک، دڵنیایی و ئارامی.... تاد). ئینجا ئەگەر دایک و باوک و

کەسانی چواردەوری منداڵ توانیان ئەو پێداویستیانەی بۆ دابین بکەن و دایک لەکاتی پرۆسەی شیر پێداندا تووندو تیژو دڵرەق و تورە نەبوو، هەروەها منداڵ بەشێوەیەکی نەرم و گونجاو فێری چۆنیەتی رزگار بوون لەپاشەڕۆ کراو هەستی بەدڵنیایی و ئارامی کردو پرۆسەی لەشیر بڕینەوە دوور بوو لەئازارو تووندو تیژی، ئەوا بێگومان ئەو جۆرە منداڵە ئاراستەو هەست و سۆزو بیرو بۆچوونێکی ڕاست و گونجاوو دروستی دەربارەی دایک و باوک و کەسانی چواردەوری لەلا دروست دەبێت و وەک هەموو منداڵێکی تر بەئاسانی و دوور لەگیروگرفت لەلایەنی کۆمەڵایەتیەوە گەشە دەکات و دەتوانێت وەک پێویست خۆی لەتەک ژینگەو دەوروبەرەکەیدا بسازێنێ.

هەر لەبەر ئەوەشە کە قۆناغی شیرە خۆری بەقۆناغێکی شلۆق و گرنگ و ترسناک لەقەڵەم دەدرێت، ئەویش بەپلەی یەکەم بۆ ئەو پەیوەندییە دەگەڕێتەوە کە لەم قۆناغەدا دەکەوێتە نێوان منداڵ و دایکی دەگەڕێتەوە، لەبەر ئەوەی هیچ قۆناغێکی تر لەژیانی منداڵدا بەقەدەر قۆناغی شیر خۆری گرنگ نیە، چونکە لەسەدا سەدی (١٠٠٪) تێر کردنی پێداویستیەکانی منداڵ پشت بەکەسانی تر (بەتایبەتیش دایک) دەبەستێت، لەبەر ئەوە هەر ج جۆرە هەست و سۆزو بۆچوونێک لەلایەن منداڵ بەرانبەر ئەو کەسانەی کە ئەو پێداویستیانەی بۆ تێر دەکەن دروست ببێت، ئەوا بەباش و خراپیەوە دەبن بەناوک و بناغە بۆ هەموو هەست و سۆزو بۆچوونەکانی تری منداڵ لەداهاتوودا، کەواتە تووندو تیژیو هەڕەشەو بێبەشکردن و ئازاردانی منداڵ زیانێکی گەورە لەداهاتوودا بەکەسایەتی دەگەیەنێت. (الفخري وأخريات، ١٩٨٢، ص٩٨-٩٩) (هرمز وابراهيم، ١٩٨٨، ص١٠٨-١٠٩).

## گەشە کردنی کۆمەڵایەتی لەقۆناغی شیرە خۆریدا:

منداڵ لەم قۆناغەدا زۆر ڕەفتارو هەڵس و کەوت بەرانبەر دایک و باوک و کەسانی چواردەوری دەکات کە گوزارشت لەدڵخۆشی یان بێزاری دەکەن. لەوانە (زەردەخەنە، گوروگاڵ دواتریش پێکەنین، دەم و چاو گرژ کردن، هاوار کردن دواتریش تورە بوون.... تاد). لەسەرەتادا منداڵ تەنها بۆ دایکی دەشێتەوەو دواجاریش بۆ کەسانی تر، کەچی لەبەرانبەر کەسانی نامۆو دەرەوەی خێزان هەڵوێستە دەکات، بەڵام لەدەوروبەری (٦) شەش مانگیدا منداڵ گرنگی بەمنداڵان و کەسانی چواردەوری دەدات، هەروەها لەدەوروبەری (٨) هەشت مانگیدا، منداڵ گرنگی بەکەسانی نامۆو دەرەوەی خێزان دەدات، تەنانەت لەتەمەنی (٩) مانگیدا خۆی هەوڵدەدات بچێت بۆ لای کەسانی دەرەوەی خێزان و لەرێگەی زەردەخەنەو گروگاڵ و پێکەنینەوە گوزارشت لەو حەزوو ئارەزووەی دەکات.

منداڵ لەتەمەنی (١٢) دوانزدە مانگیدا، لەتوانایدا هەیە کە لاسایی جووڵەو هەڵس و کەوتی کەسانی گەورە بکاتەوە. شایانی باسە منداڵ زۆربەی زۆری دوو ساڵی یەکەمی ژیانی (قۆناغی شیرەخۆری) لەناو خێزاندا بەسەر دەبات، هەر لەبەر ئەوەشە کە کەسانی ناو خێزان (بەپلەی یەکەم دایک) گرنگیەکی زۆریان لەسەر ژیان و چارەنووسی منداڵ هەیە.

منداڵ دوای ئەوەی فێری گاگۆڵکێ و ڕۆیشتن و قسەکردن دەبێت، دەتوانێت باشتر سوود لەژینگەی خێزانی وەربگرێت، چونکە ڕۆیشتن یارمەتی دەدات کە ئەم جێگاو ئەو جێگا بکات و قسەکردنیش دەبێتە هۆی گوزارشت کردن لەخودو ڕاگۆڕینەوەو تێگەیشتن لەگەڵ کەسانی تر، بێگومان لەم قۆناغەدا گرنگیو ڕۆڵی باوک بەپلەی دووهەم دێت لەدوای دایک، چونکە وەک لەپێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد، زۆربەی پێداویستیەکانی منداڵ لەم قۆناغەدا لەسەر دەستی دایک تێر دەکرێن، بەڵام کاتێک منداڵ فێری ڕۆیشتن و قسە کردن دەبێت، ئەوا ئەو کاتە گرنگی و ڕۆڵی باوک زیاتر لەژیانی منداڵدا دەردەکەوێت. (معوض، ١٩٩٤، ص١٩٢-١٩٣).

***دەرئەنجامی توێژینەوەیەکی (بوهلر)ی زانا دەری خست کە منداڵ لەقۆناغی شیرە خۆریدا ئەم وەڵامدانەوەو هەڵس و کەوتانەی خوارەوەی بۆ گەورەکان هەیە:-***

| تەمەن بەمانگ | وەڵامدانەوەو هەڵس و کەوتەکان |
|---|---|
| ٢-١ | * بەزەردەخەنە وەڵامی دەنگی کەسانی جواردەوری دەداتەوە.<br>* بێدەنگ بوون لەکاتی دەست هێنان بەشان و پشتیدا.<br>* سەر وەرگێران بۆ ئەو دەنگانەی کەدەیان بیستێ. |
| ٣-٢ | * زەردەخەنە کردن بۆ ئەو کەسانەی کە زەردەخەنەی بۆ دەکەن.<br>* هاوار کردن کاتێک دایکی بەجێ ی دەهێڵێ.<br>* ئەگەر کەسێک لێی نزیک ببێتەوە دەشڵەژێ. |
| ٤-٣ | * ئەگەر بەتەنها بەجێ بهێڵدرێ دەگری.<br>* ئەگەر کەسێک قسە یان یاری لەگەڵ بکات ئەوا زیر دەبێتەوەو بێدەنگ دەبێت. |
| ٥-٤ | * دەنگە هێمن و لەسەرخۆیەکان دەناسێتەوەو بەزەردەخەنە وەڵامیان دەداتەوە، بەڵام بەهاوارو گریان وەڵامی دەنگە ناخۆش و تورەکان دەداتەوە.<br>* بەبینینی کەسانی نامۆو دەرەوەی خێزان دەشڵەژێت. |
| ٧-٥ | * دەتوانێت دەست بۆ دایک و باوکی درێژ بکات و لاسایی سڵاو کردن و چەپڵە لێدانیش بکاتەوە. |
| ٩-٧ | * دەیەوێت بەجووڵەو هەڵس و کەوتەکانی سەرنجی کەسانی جواردەوری بۆ لای خۆی رابکێشێ.<br>* لاسایی دەنگی کەسانی تر دەکاتەوە. |
| ١٠-٩ | * جل و بەرگی گەورەکان ڕادەکێشێ.<br>* شت بەگەورەکان دەدات. * لاسایی جووڵەو یاری گەورەکان دەکاتەوە. |
| ١٢-١٠ | * دەتوانێت بەرێک و پێکی هەندێک یاری بکات.<br>* منداڵ وەڵامدانەوەی تایبەتی خۆی بۆ (وامەکە)ی دایک و باوکی دەبێت.<br>* لەکەسانی نامۆو دەرەوەی خێزان دەترسێت. لەدەستیان ڕادەکات و بەهەردوو دەستی دەم و چاوی خۆی دادەپۆشێ. (معوض، ١٩٩٤، ص١٩٤). |

## گەشە کردنی کۆمەڵایەتی لەقۆناغی پێش چوونە قوتابخانە

لەکۆتایی ساڵی دووهەم منداڵ پێ دەنێتە قۆناغێکی تری ژیانەوە، ئەویش قۆناغی پێش چوونە قوتابخانەیە. لەم قۆناغەدا وورد ە وورده لەپشت بەستنی تەواو بەدایک و باوکی ڕزگاری دەبێت و دەست دەکات بەهاوکاری کردن و تێکەڵاو بوونی کەسانی تری دەرەوەی خێزان، لەوانە منداڵانی دراوسێ و خزم و هاوڕێکانی. ئینجا ئەگەر منداڵ پەیوەندی کرد بەدایەنگاو باخچەی ساوایان ئەوا ژینگەو سنووری پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان و تێکەڵاو بوونی بەرفراوانتر دەبێت و زیاتر شارەزای داب و نەریت و بەهاو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان دەبێت، بەڵام ئەگەر هەر لەچوارچێوەو سنووری خێزان و کۆڵانەکەیدا خوولایەوە، ئەوا کەمتر لەمنداڵانی باخچەی ساوایان فێری بەهاو داب و نەریتە کۆمەڵایەتیەکان دەبێت. بەڵام لەم قۆناغەشدا خێزان هەر گرنگی و ڕۆڵی تایبەتی خۆی لەژیانی منداڵدا هەیە، پێویستە منداڵ لەناو خێزاندا هەست بەئارامی و دڵنیایی بکات و هەست بکات کە خۆشەویستەو جێگەی ڕێزو شانازی دایک و باوک و کەسانی چواردەوریەتی، چونکە هەر لەڕێگەی خێزانەوە منداڵ فێری ماف و ئەرکەکانی دەبێت و لەخۆپەرستی و چروکی ڕزگاری دەبێت و تۆوی برایەتی و هاوکاری و لەخۆ بووردن و دڵسۆزی لەناخیدا دەچێندرێت، لەهەمان کاتیشدا دایک و باوک دەبن بەنموونە بۆ لاسایی کردنەوەی، لەبەر ئەوە دەبێت ڕەوشت و هەڵس و کەوت و گفت و کردەوەکانیان نموونەی ڕاست و دروست بن.

لەم قۆناغەدا منداڵانی دراوسێ و کۆڵان و باخچەی ساوایان گرنگیەکی زۆریان لەژیانی منداڵدا هەیە، لەبەر ئەوە نابێت (بەبیانووی ئەوەی فێری ڕەوشتی خراپ و ناشیرین دەبن) ڕێگەی تێکەڵاو بوون بەمنداڵانی تر لەمنداڵ بگیرێت، بەپێچەوانەوە زۆر ڕەوشت و بەهای باش لەمنداڵانی ترەوە فێر دەبن، دایک و باوکیش دەتوانن لەڕێگەی ڕێنمایی و ئامۆژگاری‌و ڕاسپاردەکانیانەوە، منداڵەکانیان لەهەڵس و کەوتە خراپەکانی تێکەڵاو بوون ڕزگار بکەن، بەڵام بێ بەشکردنیان لەتێکەڵاو بوونی منداڵانی تر زیانێکی گەورە بەکەسایەتی منداڵەکانیان دەگەیەنن، چونکە درەنگ بێت یان زوو دەبێت ئەو منداڵە تێکەڵاوی منداڵانی تر ببێت و بچێتە ناویانەوە لەبەر ئەوە دەبێت هەر لەسەردەمێکی زووەوە منداڵان بەکۆڵان و ژینگەی کۆمەڵایەتی ئاشنا بکرێت، لەلایەکی تریشەوە منداڵ لەناو منداڵانی تردا زۆر دڵخۆش و کامەران دەبێت، چونکە زۆربەیان لەتەمەن و حەزوو ئارەزوو خەم و خەفەت و بیرو بۆچووندا وەک یەک وان و لەڕێگەی یاریکردن و هاوکاری و ڕاگۆڕینەوەوە زۆر شت لەیەکتری فێر دەبن و لەزۆر حاڵەتی هەڵچوونی و باری دەروونی ئاڵۆز ڕزگاریان دەبێت و زۆر لەحەزوو ئارەزووەکانیشیان تێر دەکرێت، کە لەتوانای گەورەکان و ژینگەی خێزانیدا نیە بەو کارانە هەڵبستن.

### قۆناغی چوونە قوتابخانە:-

لەم قۆناغەدا منداڵ دەچێتە قوتابخانەو سەردەمێکی تر لەژیانی دەست پێدەکات. لەم قۆناغەدا کەسانی تری وەک مامۆستاو قوتابی و بەڕێوەبەر دێنە ناو ژینگەی کۆمەڵایەتی منداڵەوەو هەریەکەیان شوێن پەنجەی تایبەتی خۆی لەبواری دەروونی منداڵدا بەجێ دەهێڵێ. لەبەر ئەوە زۆر گرنگە کە ژینگەی قوتابخانە ژینگەیەکی پەروەردەیی دروست بێت، بۆ ئەوەی ڕۆڵی گرنگی

خۆی لەگەشە كردنی كۆمەڵایەتی منداڵدا بگێڕێ، چونكە قوتابخانە تەنها منداڵ فێری خوێندن و نووسین و بیركاری ناكات، بەڵكو خێزانی دووهەمە لەژیانی منداڵداو دەبێت فێری زۆر ڕەوشت و هەڵس و كەوتی كۆمەڵایەتیو ئەخلاقی گرنگی بكات. ئینجا لەبەر ئەوە دەبێت بەڕێوەبەرو مامۆستاكان بەكردەوە نموونەی ڕاست گۆیی و بەوەفایی و دادوەری و بەبەزەیی بن، تاوەكو منداڵ لەڕێگەیانەوە زۆر ڕەوشتی كۆمەڵایەتی جوان و بەكەڵك فێر ببێت. هەروەها لەتوانای قوتابخانەدا هەیە كە زۆر گرفتی كۆمەڵایەتی وەك (خۆپەرستی، گۆشەگیری، شەڕخوازی، درۆ.... تاد)ی منداڵ چارەسەر بكات و زۆر لەحەزوو ئارەزووەكانی تێر بكات.

**<u>نیشانەكانی گەشە كردنی كۆمەڵایەتی:-</u>**

زۆر بەڵگەو نیشانەی گرنگ هەن كە ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن منداڵ لەلایەنی كۆمەڵایەتیەوە گەشەی كردووە، لەوانە:-

١. فێر بوونی هەڵس و كەوتە كۆمەلایەتیە گونجاوو دروستەكان.
٢. هەڵس و كەوت كردن بەپێ ی ئەو پێوەرو داب و نەریتانەی كە لەگەڵ توخم و تەمەن و ژینگەی كۆمەڵایەتیدا دەگونجێت.
٣. هاوكاری كردن و بوونی حەزوو ئارەزووی تێكەڵاو بوون و پەیوەندی كردن بەكەسانی تر.
٤. لێك جیاكردنەوەی ڕەوشتە كۆمەڵایەتیە بەسوودەكان لەداب و نەریتە خراپەكان.

***<u>بێگومان گەشە كردنی كۆمەڵایەتی و كامڵی و دروست بوونی گیانی هاوكاری و زانینی بەهاو داب و نەریتەكان، هەر لەخۆیانەوە نابن، بەڵكو پێداویستیان بەژینگەی لەبارو گونجاو هەیەو دەبێت ئەم خاڵانەی خوارەوەش لەبەرچاو بگیرێت:-</u>***

١. دابین كردنی ژینگەی كۆمەڵایەتی دروست بۆ منداڵ، تا لەڕێگەیەوە فێری داب و نەریت و بەها كۆمەڵایەتیەكان ببێت.
٢. دەبێت منداڵ تام و چێژو خۆشی لەو تێكەڵاو بوون و هاوكاری كردنەی وەربگرێت، بۆ ئەوەی چەند جار دووبارەی بكاتەوەو ببێت بەبەشێك لەهەڵس و كەوتی. بەڵام ئەگەر ئەو هاوكاری و چوونە ناو كۆڕو كۆبوونەوانە بووە مایەی ئازارو ناخۆشی و سووكایەتی پێكردنی، ئەوا گیانی پێكەوە ژیان و هاوكاری لەناخیدا دروست نابێت.
٣. دیاری كردنی داب و نەریت و ڕەوشت و بەها باش و بەكەڵكەكان بۆ منداڵ، بۆ ئەوەی لەخراپەكانیان جیا بكاتەوە.
٤. پاداشت كردنی ڕەوشتە باشەكان و گلەیی لێكردن و سزادانی ڕەوشتە خراپەكان.
٥. دەبێت كەسانی چواردەوری منداڵ نموونەی باش بن بۆ فێر بوونی ڕەوشتی كۆمەڵایەتی.

**لەماڵ نەبوون و دووری باوک:-**

لەدوای تەمەنی دوو ساڵیەوە ڕۆڵ و گرنگی باوک لەژیانی منداڵدا دەردەکەوێت، بەتایبەتیش لەژیانی منداڵە کورەکاندا، چونکە باوک بەپلەی یەکەم نموونەی نێرایەتی و لاسایی کردنەوەی کورەکانە. ئینجا ئەگەر هات و لەبەر هەر ج هۆیەک بێت (مردن، نەخۆشی، کۆچ کردن، کار کردن لەشوێنی دوور، سەربازی... تاد)، باوک لەناو ماڵ و منداڵی خۆیدا نەژیاو بۆ ماوەیەکی زۆر لەخێزانەکەی پچڕاو دوورکەوتەوەو لەهەمان کاتیشدا کەسێکی تری نێر لەناو خێزاندا نەبوو، کە جێگەی ئەو بگرێتەوە، ئەوا بێگومان زەرەرو زیانێکی زۆر بەباری دەروونی و کەسایەتی منداڵەکانی دەگات.

دەرئەنجامی ئەو توێژینەوانەی (کە لەسەر منداڵانی بێبەش بوو لەچاودێری و شارەزایی دایک و باوک) کراون، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە زۆر بەزەحمەت ئەو منداڵانە دەتوانن خۆیان بسازێنن و بەتەواویش لەلایەنی کۆمەڵایەتیەوە گەشە ناکەن، هەروەها لەماڵ نەبوون و دووری باوک زیاتر زیان بەکورەکان دەگەیەنێ وەک لەکچەکان (Bigner, ١٩٧٩)، هەروەها دەرکەوتووە کە ئەو منداڵانەی برای گەورەیان هەیە کەمتر بێ باوکیان پێوە دیارەو زەرەرو زیانی نەبوونی باوک بەبەراورد کردن بە ئەو منداڵانەی کە برای گەورەیان نیە زۆر کەمترە (Smith, ١٩٦٨).

لەلایەکی ترەوە دەرئەنجامی توێژینەوەیەکی (هیسرنگتون) (Hetherington) کە لەساڵی (١٩٦٦) لەسەر ئەو منداڵانە کردی کە (لەئەنجامی کۆچی درێژ خایەن یان مردن یان تەڵاق)، لەچاودێری باوکیان بێبەش بوو بوون، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەو منداڵە بێ باوکانە وەک منداڵانی خاوەن باوک پشت بەخۆیان نابەستن و زیاتر هەوڵدەدەن کە کەسانی تر کارەکانیان بۆ جێبەجێ بکەن، هەروەها ناش وێرن بەشداری ئەو یاریانە بکەن کە توندو تیژی و خۆ بەیەکدادانی تێدایە. (الحمدانی، ١٩٨٩، ص٢٢٢).

کەواتە لەماڵ بوونی باوک و چاودێری گرنگیەکی زۆریان بۆ گەشە کردنی کۆمەڵایەتی منداڵەکانیان هەیە، بەڵام خوانەخواستە ئەگەر لەبەر هەر ج هۆیەک بوو منداڵ لەباوک و چاودێری بێبەش بوو، ئەوا زۆر پێویستە کە هەوڵی دابین کردنی جێگرێکی وەک (برای گەورە، مام، خاڵ، باپیر... هتد) بۆ باوک بدرێت، بۆ ئەوەی منداڵ لەئەنجامی ئەو نەبوونی باوکەوە، زەرەرو زیانێکی زۆری لێنەکەوێت.

**ڕۆڵی دایک و باوک و مامۆستا:-**

وەک لەپێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد، منداڵ لەڕێگەی خێزان و قوتابخانەو دام و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی ترەوە، داب و نەریت و بەها کۆمەڵایەتیەکان فێر دەبێت، ئەو فێر بوونەش لەڕێگەی لاسایی کردنەوەو سەرنج دان و سەیر کردن و پاداشت و سزاوە دەبێت، لەهەموو ئەو

حاڵەتانەشدا دایک و باوک و مامۆستاو کەسانی تری چواردەوری منداڵ، ڕۆڵی گرنگ و ترسناکیان هەیە، بەتایبەتیش لەم خاڵانەی لای خوارەوەدا:-

١. هاندانی منداڵ بۆ تێکەڵاو بوون و هاوکاری کردنی کەسانی تر.
٢. ڕوون کردنەوەی هەڵس و کەوت و داب و نەریتە باش و خراپەکان.
٣. پاداشت کردنی هەڵس و کەوتە باشەکان و سزادانی خراپەکان.
٤. دابین کردنی ژینگەی لەبارو گونجاو بۆ چاندن و گەشەکردنی گیانی هاوکاریو برایەتی.
٥. دەبێت دایک و باوک و مامۆستا نموونەی چاک و ڕاست گۆ بن بۆ منداڵەکانیان و دەبێت ئەوان بەکردەوە هەڵس و کەوتە کۆمەڵایەتیە باشەکان بەرجەستە بکەن.
٦. دەبێت منداڵ فێری ڕەوشت و ڕۆڵی خۆی بکرێت، چونکە ڕەوشت و هەڵس و کەوتەکان بەپێی تەمەن و شوێن و توخم دەگۆڕدرێن.
٧. ڕزگار کردنی منداڵ لەگۆشەگیری و دەمارگیری و خۆپەرستی.
٨. منداڵ فێری پشت بەخۆ بەستن و بڕوا بەخۆ بوون بکرێت.

## شێوازەكانی ڕاهێنانی كۆمەڵایەتی

كاتێك منداڵ لەدایك دەبێت، بوونەوەرێكی بایۆلۆژی ڕووتەو بێجگە لەهەندێك ڕەمەك (غریزە) و ئامادە باشی، ئیتر هیچ شتێك دەربارەی كۆمەڵ و داب و نەریت و ئاكارەكانی نازانێت. بەڵام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەئەنجامی ژیانی لەناو خێزان و كۆمەڵدا، شارەزایی و زانیاری دەربارەی كۆمەڵ و زمان و ئایین و داب ونەریتی كۆمەڵایەتی پەیدا دەكات و وردە وردە لەبوونەوەرێكی بایۆلۆژییەوە، بۆ بوونەوەرێكی كۆمەڵایەتی دەگۆڕدرێت. ئەم پرۆسەیەش كە منداڵی پێ فێری داب و نەریت و بەهاو ئاكاری كۆمەڵایەتی دەكرێت، ناودەبرێت بەڕاهێنانی كۆمەڵایەتی (عملية التنشئة الاجتماعية).

گومانی تێدانیە، ئەم پرۆسیسی ڕاهێنانی كۆمەڵایەتیەش بەپێ ی چینو توێژو تاكەكانی كۆمەڵو جۆری خێزان دەگۆڕێتو جیاوازی هەیە لەخێزانێكەوە بۆ خێزانێكی ترو لەتوێژو چینێكەوە بۆ توێژو چینێكی تر. بێگومان ئەم جیاوازی مامەڵەو شێوازی ڕاهێنانە، دەبێتە مایەی جیاوازی كەسایەتیو ڕەوشتی تاكەكانی كۆمەڵ.

لەئەنجامی چەندەها توێژینەوەی بیانی و ناوخۆیی دەركەوتووە، كەپرۆسەی ڕاهێنانی كۆمەڵایەتی لەلای زۆربەی جیهان بەچەند شێوازو جۆری جیاواز بەئەنجام دەگەیەندرێت و هەموو خێزان و گەل و نەتەوەكان بەیەك شێواز منداڵەكانیان پەروەردە ناكەن.

*لەگرنگترین و باوترین شێوازی ڕاهێنانی كۆمەڵایەتی ئەمانەی لای خوارەوەن:*

١) بەكارهێنانی لێدان و توندو تیژی ٢) نەرم و نیانیو گوێ پێنەدان ٣) هەڵكشان و داكشان و نەبوونی یەك جۆر مامەڵەی گونجاو (التذبذب في المعاملة). ٤) مامەڵەی ڕاست و دروست لەڕاهێنانی كۆمەڵایەتیدا ٥) نازداری.

هەریەك لەو مامەڵانەی سەرەوە، جۆرە ڕەوشت و كەسایەتیەك لەلای منداڵ دروست دەكات. بۆ نموونە، هەندێك لەباوكان و دایكان، بەردەوام پەنا بۆ لیدان و توندو تیژی دەبەن لەكاتی پەروەدەكردن و ڕاهێنانی كۆمەڵایەتی منداڵەكانیاندا، ئەم جۆرە باوك و دایكانە وائیگەیشتوون، كە توندوتیژی و زاڵ بوون و چاوسوركردنەوەو سەركوت كردن و فشار خستنە سەر منداڵ، مامەڵەیەكی ڕاستەو لەبەرژەوەندی منداڵەكانیانە، بەلام بەپێچەوانەوە، دەرئەنجامی توێژینەوەكانی ئەو بوارە ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن، كەتوندو تیژی و لیدانی بەردەوام، دەبێتە هۆی ئەوەی كەمنداڵ سەربەستی نەبێت و بەتەواوی شارەزای ژینگەكەی نەبێت و فێری ڕەفتاری پاشە كشێ و گۆشەگیری ببێت.

هەروەها بەردەوام ئەو جۆرە منداڵانە هەست بەكەمی و سوكایەتی دەكەن و مل كەچ دەبن و هەست بەدڵنیایی و ئاسایش ناكەن و لەدڵە ڕاوكێ و بارێكی دەروونی ئاڵۆزدا دەژین، ناتوانن وەك منداڵێكی ئاسایی گوزارشت لەخودی خۆیان بكەن. هەندێك جاریش منداڵی ئەو جۆرە خێزانانە شەڕخواز دەبن و هەوڵ دەدەن ئەو ڕق و كینەو توڕەییەی كە بەرامبەر دایك و باوك هەیانە، بەكەسانی تری دەربڕن و تۆڵەی خۆیان لەوان بكەنەوە. بۆ نموونە ئەگەر باوك بەردەوام ئازاری منداڵ بدات و سوكایەتی پێ بكات، ئەو منداڵە ئەگەر خوشك و برای بچوكی هەبێت، ئەوا دەچێت داخی دڵی خۆی بەئەوان دەڕێژێت، ئەگەر خوشك و برای بچوكیشی نەبوو، ئەوا لەكۆڵان بەدوای منداڵانی دراوسێ و بەستەزماندا دەگەڕێ و دەیەوێت ئازاری ئەوان بدات، ئەگەر منداڵی دەست نەكەوت، دەست دەكات بەلیدان و ئازاردانی ئاژەڵ و داروبەردو دەرگاو پەنجەرەو....هتد. كەواتە ئەو توندو تیژی و شەڕخوازییەی منداڵەكە بۆ توندوتیژی و سوكایەتی و لیدانی باوك و دایكی دەگەڕێتەوە.

بەلام هەندێك دایك و باوك هەن كە گوێ بەمنداڵەكانیان نادەن و زۆر بەنەرمی مامەڵەیان لەگەڵدا دەكەن و بەنازداری بەخێویان دەكەن و لەهەڵەو سەرەڕۆییەكانیان ناپێچنەوەو خراپی و كەم و كورتیەكانیان بەدەرناخەن و بۆیان ڕوون ناكەنەوە، بەردەوام

لێبوردن و چاوپۆشینێکی نائاساییان بەرامبەر لاساری و سەرکێشی منداڵەکانیان هەیە. بێگومان ئەو منداڵانەی لەو جۆرە خێزانانەدا پەروەردە دەکرێن، زۆر سەرەڕۆو لاسار دەبن، هیچ کات هەست بەلێپرسینەوەو مسئولیەت ناکەن و لەیاساو دەسەڵات و داب ونەریتی کۆمەڵایەتی یاخی دەبن، کەسایەتیەکی پتەوو و سەربەخۆیان نابێت، منداڵ بەسەر تاکەکانی تری خێزاندا (بەتایبەتی دایک و باوک) زاڵ دەبێتو ناچاریان دەکات کە گشت حەزوو ئارەزوو پێداویستیەکانی تێر بکەن (بەتایبەتی منداڵی نازدار)، ئیتر ئەو پێداویستیانە هەق بێت یان ناهەق، باش بێت یان خراپ.

هەندێک جاریش وا ڕێکەوت دەکات کەهەندێک دایک و باوک، هیچ جۆرە مامەڵەو شێوازێکی گونجاویان نیە بەپێچەوانەوە، هەر جارەی بەشێوازێک لەگەڵ منداڵەکانیان مامەڵەدەکەن، بۆ نموونە ئەگەر منداڵ شەڕی کردو دەست درێژی کردە سەر منداڵی دراوسێکەیان، کاتێک بۆ ماڵەوە گەڕایەوە، باوکی هیچ قسەیەکی پێ نەگوت، تەنانەت گلەیشی لێ نەکرد. بۆجاری دووهەم ئەومنداڵە دەست درێژی کردەوە سەر منداڵی دراوسێکەیان، کەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، باوکی هانی داو پیرۆزیایی و دەست خۆشی لێ کرد، بەڵام بۆ جاری سێهەم لێدان و ئازارو سزایەکی چاکی لەبەرامبەر ئەو شەڕخوازییەی وەرگرت.

لەو جۆرە خێزانەدا منداڵ دەکەوێتە گێژاو تووشی بارودۆخێکی تەم و مژاوی دەبێت و ناتوانێت ڕاست و هەڵەکان لەیەکتری جیابکاتەوە، چونکە بەپێی ئەو نموونەی سەرەوە منداڵەکە فێری ڕەوشتی دروست نابێت و نازانێت، ئایا ئەو هەڵس و کەوتەی کردی هەڵەبوو یان ڕاست؟ ئەگەر هەڵەیە، ئەی بۆچی باوکی لەجاری دووهەمدا پاداشتی کرد؟ ئەگەر ڕاستیشە ئەی بۆچی لەجاری سێهەم تووشی ئازارو لێدان بوو؟ سەرجەم ئەو پرسیارانەو سەدەها پرسیاری تر لەمێشکی ئەو جۆرە منداڵانەدا بەبێ وەڵام بەتەم و مژاوی دەمێننەوە، ئەمەش لەئەنجامی ئەو شێوازە هەڵەی دایک و باوکەوەیە کە لەپەروەردەکردنی منداڵەکانیاندا بەکاری دەهێنن. بێگومان هەمان قەوان و بەسەرهات

لەگشت بوارەکانی تری ژیانی ئەو جۆرە مندالانەدا دووبارە دەبێتەوەو فێری چاک و خراپەکانیان نابێت و کەسایەتیەکی لاوازو لەرزۆکی دەبێت، بڕوای بەخۆی و دایک و باوکیشی نابێتو بەچاوی گومان و دوودڵیەوە دەڕوانێتە دیاردەکانی ژیان.

بەلام هەندێک دایک و باوک هەن، دەتوانن بەشێوازێکی ڕاست و دروست منداڵەکانیان پەروەردە بکەن و بەواتایەکی تر، ئەگەر منداڵەکانیان هەڵەیان کردو لەڕێگەی ڕاست لایاندا، ئەو کاتە باوکانو دایکان هەڵەکانیان بۆ ڕاست دەکەنەوەو ڕێنمایشیان دەکەن و ئامۆژگاری بەسوودیان پێش کەش دەکەن. بەلام ئەگەر پێویستی کرد، ئەو کاتە بەپێ ی جۆری هەڵەو لاساری و سەرکێشیەکە، گلەیی و ناڕەزایی و سەرزەنشت و لێدان بەکاردەهێنن. لەگەڵ ئەوەشدا هۆی لێدان و ئازاردانەکە بۆ منداڵ ڕوون دەکەنەوە، بەلام ئەگەر هەر چ کردارو ڕەفتارێکی ڕاست و جوانی کرد، بەردەوام هانو پاداشتو دەست خۆشی لێ دەکەن، بۆ ئەوەی لەسەر ئەو کردارو ڕەفتارە جوانە بەردەوام بێت، لەو جۆرە خێزانانەدا دیاردەکانی ژیان بۆ منداڵ ڕوون دەکرێتەوەو وەلامی گشت پرسیارەکانی بەبێ پێچ و پەناو گرێ دەدرێتەوەو ڕێزی ڕاو بۆچوون و خودی منداڵەکە دەگیرێت.

بێگومان ئەم جۆرە پەروەردەکردنەو بەکارهێنانی ئەم شێوازە، باشترین و سەرکەوتوترین شێوازە لەئەمڕۆی جیهانی پەروەردەو فێرکردندا. واتە نەبەکارهێنانی توندوتیژی و لێدان بەبەردەوامی، نەپشت گوێ خستنی منداڵ و نەرم و نیانی و نازداری زیاد لەپێویست وەنە (تذبذب)و نەبوونی یەک جۆر مامەڵەی گونجاو، چونکە ئەو شێوازانە هەڵەن و زەرەرو زیانێکی گەورە بەکەسایەتی منداڵ دەگەیەنن و تووشی نۆد گرفتی کۆمەلایەتیو دەروونیان دەکەن (دەرکەوتووە کە زۆریەی ئەو مندالانەی تووشی لاساری و سەرکێشی و لادان بوون، لەو خێزانانەدا پەروەردەکراون کەباوک و دایکیان مامەڵەی نادروستو توندوتیژ یان نەرمی بێ لێ پرسینەوەیان لەگەڵیاندا بەکار هێناون) (اسماعیل، ١٩٧٤) (حسن، ١٩٦٧) (حسین ١٩٩٤).

## گرنگی دایك لەژیانی منداڵ

دایك لەساڵەكانی یەكەمی ژیاندا (بەتایبەتی پێنج ساڵی یەكەم) گرنگترین و پیرۆزترین بوونەوەرە لەژیانی منداڵدا، كاتێك منداڵ چاو بەدنیا هەڵدەهێنێ، یەكەم بوونەوەر كە ڕووبەڕووی دەبێتەوە، دایكە. هەر دایكە دەتوانێت هەموو پێداویستیەكانی منداڵ دابین بكاتو ببێتە مایەی مانەوەو بەردەوام بوونی لەژیاندا. دایك لەساڵی یەكەم و دووەمی منداڵدا، گرنگی لەهەموو كەسانی تری چواردەوری منداڵ گرنگترەو ڕۆڵی یەك لاكەرەوەی هەیە لەسەر چارەنووس و كەسایەتی منداڵ. دایك لەو قۆناغەدا، سەرچاوەی ژیانە بۆ منداڵ، تێركردن و نەكردنی هەموو پێداویستیە فسیۆلۆژی و دەروونیەكانی منداڵ پێوەندە بەدایكەوە.

ئەگەر ڕێكەوت بكات منداڵ لەخێزانێكی پڕ لەئاژاوەو لێك ترازاودا چاو بەژیان هەڵبهێنێت و دایك لەبەر هەر چ هۆیەك بێت (ئاژاوەی ناو خێزان، نەزانی دایك و باوك، خراپی و ڕق و كینەو توندوتیژی تاكەكانی تری خێزانەكەی بێت) نەتوانێت بەئەركی سەرشانی خۆی هەڵبستێت بەرامبەر منداڵەكەی و كەم تەرخەمی بكات، یان بەشێوەیەكی هەڵەو توندو تیژانە مامەڵە لەگەڵ منداڵەكەی بكات، یان لەكاتی شیردان و پاككردنەوەی منداڵەكەیدا توندوتیژو بێ بەزەیی بێت و پێداویستیە گرنگەكانی منداڵ تێر نەكات، ئا لەو بارودۆخەدا منداڵ تووشی كارەساتی دڵتەزێن دەبێت و باری دەروونی ئەو منداڵە بەرەو ئاڵوزی دەبات.

ئەگەر دایك خراپ و توندوتیژو دەمارگیر بێت و مامەڵەی نابەجێ لەتەك منداڵەكەیدا بكات. ئەو كاتە منداڵ بۆچوون و ئاراستەیەكی (اتجاه) هەڵەی بەرانبەر دایك و تاكەكانی تری كۆمەڵ دەبێت، بەتایبەتی توخمی (مێ). بۆ نموونە، كاتێك منداڵ لەسەر دەستی دایكی نەزان و بێ بەزەیی ئازار دەچێژێ و تووشی ناخۆشیی دەردەسەری دەبێت، ئەو كاتە منداڵ بەچاوی ڕقو كینەوە دەڕوانێتە دایكی و

بوچوونێكی هەڵەی لا دروست دەبێت و وا تێدەگات كەهەموو تاكەكانی تری كۆمەڵیش، هەروەك دایكی دڵڕەق و بێ بەزەیین، لەبەرئەوەی ئەو منداڵە لەسەر دەستی پیرۆزترین و نزیكترینو خۆشەویسترین كەسی كە دایكە تووشی ئازارو دەردەسەری بووە، ئەی دەبێت كەسەكانی تری كۆمەڵ مامەڵەی چۆن لەگەڵ بكەن؟.

ئا لەم كاتەدا منداڵ دەكەوێتە بەردەم دوو ڕێگا، یان دەبێت هەر خۆی بخواتەوەو گۆشەگیر و دوورە پەرێز بێتو لەحاڵەتی دڵەڕاوكێ و نائارامیدا بێت، یان چی خەم و خەفەت و ڕق و كینەی بەرانبەر دایكی هەیە، بەسەر كەسانی تردا هەڵیڕێژێ و تۆڵەی خۆی لەكەسانی تر بكاتەوە، ئەمە لەكاتێكدا ئەگەر نەیتوانی ئاڕاستەی دایك و باوكی بكات. بەڵام ئەگەر ئەو بوارەی بۆ ڕەخسا، ئەوا بەبێ سێ و دوو دەست درێژی دەكاتە سەر دایك و باوك و كەسانی تری چواردەوری. لەئەنجامدا منداڵ ئەو ڕاوبۆچوونە هەڵانەی ناو خێزان بۆ دەرەوەی خێزان دەبات و مامۆستای پیاو بەباوك و ئافرەت بە دایك دادەنێت و ئەگەر بۆی برەخسێت تۆڵەی دایك و باوكی لەئەوان دەكاتەوە. بێگومان لەهەردوو ئەو حاڵەتانەی سەرەوەدا منداڵ ڕۆڵی خراپی دەبێت و ناتوانێت خۆی لەتەك دەوروبەرەكەیدا بسازێنێ.

سەرجەم دەروونزانەكان ئاماژە بۆ گرنگی پێنج ساڵی یەكەم دەكەن و بەقۆناغێكی ناسك و ترسناكی لەقەڵەم دەدەن لەژیانی منداڵداو كەسایەتی منداڵی تێدا بنیات دەنرێت. دەرئەنجامی توێژینەوەكانی (فرۆید، رۆسۆ، بستالوتزی، دۆلار، میلر، بندورا) و چەندەها زاناو فەیلەسوفی تر، ئەوە دەسەلمێنن، كە پەیوەندی كۆمەڵایەتی و مرۆڤانەی نێوان دایك و منداڵ زۆر گرنگە بۆ كەسایەتی منداڵ، بەڵام ئەگەر منداڵ لەو قۆناغەدا، لەسۆزو خۆشەویستی و باوەشی گەرمی دایك بێ بەش ببێت، ئەو كاتە كەلێن و دەلاقەی گەورە دەكەوێتە كەسایەتی ئەو منداڵەو زۆر زەحمەتە بتوانرێت لەقۆناغەكانی تری ژیانیدا ئەو كەلێن و دەلاقانە بەئاسانی پڕ بكرێتەوەو برین و ئازارەكانی سارێژ بكرێت.

هەروەها دەرئەنجامی گشت توێژینەوەو لێکۆڵینەوە دەروونییەکانی بواری لاساری مێرمندالان (جنوح الاحداث) (الأعرجي، ۱۹۸۹) (حجازي، ۱۹۸۱) (الدباغ، ۱۹۷۵) (عبداللــه، ۱۹۸۱) (عیسوی، ۱۹۸٤) (الكبيسي، ۱۹۸۸) (المغربي، ۱۹٦۰) (موسى، ۱۹۷۳) (الیاسین، ۱۹۸۱) دەری خستووە کە پەیوەندی خراپی نێوان دایک و مندال لەلایەک و تێک چوونی شیرازەی خێزان بەهۆی مردنی دایک و باوک لەلایەکی ترەوە، ترسناکترین هۆکارە بۆ لادان و سەرکێشی و لاساری منداڵەکانیان و زۆربەیان تووشی کوشتن و دزی و، وازهێنان لەقوتابخانەو سەرەڕۆیی دەبن. لەبەرئەوە ئەرکی سەرشانی دایکە کە پێداویستیە گرنگەکان بۆ منداڵەکانی دابین بکات و، بە سۆزو بەزەیی و دڵگەورە بێت و توندوتیژی و رق و کینە لەکاتی پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا بەکار نەهێنێ، بۆ ئەوەی منداڵەکانی بەشێوەی ڕاست و دروست گەشە بکەن و کەسایەتیەکی پتەویان هەبێت.

## باوەشی گەرمی دایک

هەندیک لە زاناو توێژەرەکانی بواری دەروونزانی پێ لەسەر ئەوە دادەگرن، کە پەیوەندی جەستەیی نێوان مندال و دایک، ئامادەباشی و خاسیەتێکی بۆماوەییەو هەر لەیەکەم چرکەی ژیانی کۆرپەلەوە گرنگی خۆی هەیەو دەبێتە مایەی خۆشی و تام و چێژ لێ وەرگرتن و یەکێکە لەگرنگترین پێداویستیە دەروونیەکانی منداڵو هیچی لەخواردن و پێداویستیە فسیۆلۆژیەکانی تر کەمتر نیە، بۆ دڵنیابوونو زانینی گرنگی پەیوەندی جەستەیی نێوان مندال و دایکی، هاری هارلۆی زانا، توێژینەوەیەکی لەسەر کۆمەڵێک بێچوە مەیموونی تازە لەدایک بوو کرد.

لەئەنجامدا بۆی دەرکەوت کە پەیوەندی جەستەیی نێوان دایک و کۆرپەکەی و خۆ نووساندن بەسنگی دایک و باوەشی گەرمی، گرنگیەکی زۆری هەیە بۆ باری دەروونی و کەسایەتی منداڵەکانیانو ئامادەباشیەکی بۆ ماوەییە. توێژینەوەکەش بریتی بوو لەوەی

کە شێوەی دوو دایکی دەست کردی بۆ مەیموون دروست کرد. دایکی یەکەمی لەئاسن و شیش دروست کردو شووشەیەک شیرو مەمکە مژەیەکیشی لەسەر سنگی دانا، بەڵام دایکی دووهەمی لەئاسن و شیش دروست کردو دوای ئەوەش بەخوری و موو داپۆشی، بەبێ ئەوەی شووشە شیرو مەمکە مژەی لەسەر دابنێ، ئینجا ژمارەیەک بێچووە مەیموونی تازە لەدایک بووی، یەک لەدوای یەک دەخستە ئەو ژوورەی کە ئەو دوو نموونەو شێوە مەیموونەی لێ بوو.

<u>دوای سەرنج دان و کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی ڕەوشتی بێچووە مەیموونەکان، ئەم ڕاستیانەی خوارەوەی بۆ دەرکەوت:-</u>

١) کاتێک کە بێچووە مەیموونەکان برسیان دەبوو، یەکسەر دەچوون بۆ لای ئەو دایکەی کە لەئاسن و شیش دروست کرابوو، شووشە شیرو مەمکە مژەکەی پێوەبوو، دوای ئەوەی کە تێر دەبوون، دەچوون لەباوەشی گەرم و نەرمی دایکی دووهەمدا دەخەوتن کە نزیک بوو لەباوەشی گەرم و نەرمی دایکی ڕاستەقینە. (بڕوانە شێوەی ژمارە -٦-).

٢) کاتێک بێچووە مەیموونەکان ناچار دەکران، کەتەنها بچن بو لای یەکێک لەو دوو نموونەی دایکە، هاری هارلۆ سەیری کرد، کە بێچووە مەیموونەکان دایکی دووهەمیان هەڵدەبژارد کە لەخوری و موو پەڕۆ دروست کرابوو لەکاتێکدا شیرو خواردنەکە لەلای دایکی یەکەم بوو.

٣) هاری هارلۆ شێوەی جاڵجاڵۆکەیەکی لەشیش و تەل و تەختە دروست کردو خستیە بەردەم بێچووە مەیموونەکان. دەرکەوت کە کاتێک بێچووە مەیموونەکان دەترسان، یەکسەر دەچوون بۆ لای دایکی دووهەم کە لەخوری و موو دروست کرابوو، لەباوەشی گەرمی ئەودا هەستیان بەدڵنیایی و ئارامی دەکردو لەترس و دڵەراوکێی ئەو جاڵجاڵۆکەیە ڕزگاریان دەبوو.

٤) کاتێک بێچووە مەیموونەکان لەلای دایکی دووهەم دەبوون، زیاتر ئازاو بەجەرگتر دەبوونو هێرش و پەلاماری جاڵجاڵۆکەو شتەکانی تریان دەدا وەک لەوەی کە لەلای دایکی یەکەم دەبوون.

لەئەنجامدا هاری هارلۆ گەیشتە ئەو ڕاستیەی کە باوەشی گەرمی دایک و پەیوەندی جەستەیی نێوان دایک و کۆرپەکەی پێداویستیەکی بۆماوەییەو هیچی لەخۆراک و ئاو و خەو و ئۆکسجین کەمتر نیە بۆ گەشە کردنی منداڵ. (کونجر، ١٩٧٠، ص١٩٦-١٩٧).

## بێ بەش بوون لەدایک

هەندێک جار لە ئەنجامی ئاڵۆزی ژیان و ڕووداوەکانیەوە، خێزان تووشی لێک ترازان و تێک چوون دەبێت و دوور نیە ببێتە مایەی بێ بەش بوونی منداڵ لەسۆزو خۆشەویستی و خزمەتگوزاری دایکی. ڕاستیەکی بەڵگە نەویستە کە منداڵ یەکەم کەسە کە دەبێتە قوربانی ئەو کارەساتەو زەرەرو زیانێکی زۆری لێ دەکەوێت، یەکێک لە گرنگترین زیانەکانی بێ بەش بوون لەدایک، پێک نەهاتن و دروست نەبوونی پەیوەندی کۆمەلایەتی سەرکەوتووە لەنێوان منداڵ و کەسانی چواردەوری، زۆر لە دەرئەنجامی توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە ئەگەر منداڵ لەپێنج ساڵی یەکەمی تەمەنیدا لەدایک بێ بەش بوو وە هیچ کەسێکی تریش نەبوو کە جێگای دایکی بۆ بگرێتەوە، ئەو کاتە منداڵ زۆر بە زەحمەت دەتوانێت پەیوەندی کۆمەلایەتی سەرکەوتوو بەردەوام لەگەڵ کەسانی چواردەور و تاکەکانی تری کۆمەڵدا دابنێت و هەندێک جاریش تووشی گۆشەگیری و دوورەپەرێزی دەبێت.

یەکێک لەزاناکان کە ناوی خاتوو (ریهن گۆلدە) توێژینەوەیەکی لەسەر کۆمەڵێک منداڵی بێ دایک و باوک بەئەنجام گەیاند. ئەم خاتوونە چوو بۆ یەکێک لە خانەکانی بەخێوکردنی منداڵە بێ دایک و باوکەکان (هەتیوخانە) لەوێ (١٦) شازدە منداڵی شیرە

خۆرەی هەڵبژاردو دابەشی کردن بەسەر دوو کۆمەڵەوە، کۆمەڵەی یەکەم بریتی بوو لە (٨) منداڵی شیرە خۆرە، خاتوو ریهن گۆڵد بۆ ماوەی (٨) هەفتە، هەر هەفتەی (٥) ڕۆژ، هەر ڕۆژەی (٨) کاتژمێر، خۆی ڕۆڵی دایکی دەبینی و وەک دایکێکی دڵسۆز بەردەوام ئەو منداڵانەی پاک دەکردەوەو خواردنی دەدانێ و جل و بەرگی دەگۆڕین و قسەی لەگەڵ دەکردن و گرفتەکانیانی چارەسەر دەکردو دارەدارەی پێ دەکردن و بەردەوام لەباوەشی دەکردن و پێداویستیەکانی بۆ دابین دەکردن.

بەڵام کۆمەڵەی دووهەم بریتی بوو لە (٨) منداڵی شیرەخۆرەو بەشێوەیەکی زۆر ئاسایی وەک هەموو منداڵەکانی تری هەتیوخانەکە دەژیان و تەنها چەند دادەو فەرمانبەرێکی لێ بوو، لەکاتی دیاریکراودا شیریان دەدرایەو لەزۆر سۆزو خۆشەویستی و چاودێری بێ بەش بوون. دوای تەواو بوونی ماوەی توێژینەوەکە، بۆ خاتوو ریهن گۆلد دەرکەوت، کە منداڵانی کۆمەڵەی یەکەم لەزۆر لایەنەوە پێش کەوتوتربوون لەمنداڵانی کۆمەڵەی دووهەم. لەهەمووشیان گرنگتر (کەئامانجی سەرەکی توێژینەوەکە بوو) گەشەکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی بوو.

دەرکەوت کە کۆمەڵەی یەکەم بەردەوام بۆ میوان و تاکەکانی تری هەتیوخانەکەو خاتوو ریهن گۆلد، دەم بە پێکەنین بوون و لەرێگەی دەست ڕاکیشان و گاگۆڵکەو زەردەخەنەو جوولەی دەستیانەوە، داوای باوەش و چوون بۆ لای کەسانی تریان دەکرد، بەپێچەوانەی منداڵانی کۆمەڵەی دووهەم کە بەردەوام گۆشەگیرو دوورە پەرێز بوون و لەمیوان و تاکەکانی تری هەتیوخانەکە دەترسان و بەردەوام دەم و چاویان گرژو مۆن و شەرمن و پڕ لەترس دیار بوو. بە بۆچوونی خاتوو ریهن گۆلدو زۆر لەدەروون زانەکان، گەشەکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی منداڵانی کۆمەڵەی یەکەم، بەپلەی سەرەکی بۆ ئەو (٨) هەفتەیە دەگەڕێتەوە، کە خاتوو ریهن گۆڵد جێگای دایکی بۆ گرتبوونەوەو ئەو بۆشاییەی بۆ پڕ کردبوونەوە کە بەهۆی نەمانی دایکەوە دروست بوو بوو، بەپێچەوانەی کۆمەڵەی دووهەم کە ژیانێکی زۆر ئاسایی دەژیان وەک دەڵێن (مەمرەو مەژی) دوور لە سۆزو خۆشەویستی و باوەشی گەرمی دایک دەژیان (کونجر، ١٩٧٠، ص٢٠٢-٢٠٣).

## جێگری دایک

زۆر جار ئەو پرسیارە دەکرێت، ئایا کەسانی تر دەتوانن جێگەی نەمانی دایک بگرنەوە؟ بێگومان وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارە ئاسان نیە، بەڵام کاتێک سەیری ژیانی ئەو منداڵانە دەکەین کەلەسۆزو خۆشەویستی و چاودێری دایک و باوکیان بێ بەش بوون، هەروەها دەرئەنجامی ئەو توێژینەوانەش کە لەسەر مندالانی بێ دایک و باوک کراوە، دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە بڵێین بەڵێ، لەتوانای کەسانی تردا هەیە، کە جێگەی دایک بۆ منداڵان بگرنەوە، بێگومان ئەو کەسانەش زۆر جۆریان هەیە، لەوانەیە هەندێک جار (باوک یان پوور، یان نەنک، یان خاڵ...هتد) یان هەر خێرخوازێکی تر کە بیەوێ ئەو منداڵە لەخۆ بگرێ، دەتوانێت جێگای دایک بگرێتەوە، هەروەها خانەی بەخێوکردنی منداڵانیش لەتوانایدا هەیە کە ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە کە لەئەنجامی نەمانی دایکەوە دروست دەبێت. بەڵام ئەگەر منداڵ بێ دایک ببێت و لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی تر نەبێت خزمەتگوزاری و چاودێری و سۆزو خۆشەویستی بەو منداڵە بدات، ئەو کاتە چارەنووسی ئەو منداڵە نادیار دەبێتو تووشی زۆر گرفتی دەروونی و لاساری و سەرەڕۆیی دەبێت.

## پرۆسەی شیر پێدان

منداڵ دوای لەدایک بوون بوونەوەرێکی لاوازو بێ دەسەڵاتە، مانەوەی ژیانی پەیوەندە بە کەسانی ترەوە، یەکەم کەسیش کە بتوانێت بەو ڕۆڵە هەڵبستێت و لەلایەنی جەستەیی و بایۆلۆژییەوە ئامادەبێت، ئەوە دایکە، گومانیشی تێدا نیە قۆناغی شیرەخۆری، قۆناغێکی ناسک و ترسناکە لەژیانی منداڵدا. لەبەرئەوەی سەرەتای دەست پێکردنی ژیانیەتی و یەکەم ئەزموون و تاقیکردنەوەیەتی و یەکەم خاڵی دانانی پەیوەندی کۆمەڵایەتیە لەگەڵ کەسانیتر. لەقۆناغی شیرەخۆریدا گرنگترین پرۆسە بە ئەنجام دەگات، ئەویش پرۆسەی شیر پێدانە، پرۆسەی شیرپێدان گرنگی تایبەتی خۆی لەژیانی منداڵدا هەیەو دەبێتە هۆی تێرکردنی گرنگترین پێداویستی فسیۆلۆژی کە ئەویش برسێتیە.

لەبەرئەوە دایک دەبێت زۆر بەئاگا بێت و نەهێڵێت منداڵ تووشی ئازارو خەم و خەفەت ببێت، چونکە فرۆید بەسەرەتای دروست بوونی گرفتە دەروونیەکانی منداڵی دادەنێت. منداڵ لەرێگەی شیرخواردنەوە، نەک تەنها خۆراکی دەست دەکەوێت، بەڵکو هەست بە دڵنیایی و ئارامی و باوەشی گەرمی دایک دەکات و زۆر پێداویستی دەروونیشی تێر دەبێت. بەڵام ئەگەر دایک توندوتیژ بێت و بەزۆر مەمک لەدەمی منداڵ دەربهێنێ و لەکاتی شیرپێداندا گرژو مۆن و تورە بێت، ئەوا زەرەرو زیانێکی گەورە بەمنداڵ دەگات. لەبەرئەوەی منداڵ لەکاتی شیرخواردندا دەم و چاوی دایکی دەخوێنێتەوە و هەست بە هەموو گرژی ماسولکەو ئەندامەکانی لەشی دایکی دەکات و سوود لەو شیر خواردنە وەرناگرێت و تووشی بارێکی دەروونی ئاڵۆز دەبێت. (لەلایەکی ترەوە نابێت بەخێرایی منداڵ تێر بکرێتو بواری مەمک مژینو ملچە ملچی نەدرێت، چونکە ئەگەر کاتی پێویست نەدرا بەمنداڵ بۆ شیرخواردن و پەلە پەلی لێ کرا، ئەو کاتە ناچار دەبێت کە پەنا بۆ زۆر شتی تر ببات [وەک پەنجە، کەوچک، جلو بەرگ] مژین ) (سبوك، ۱۹۹۰، ص٦٧).

## شیری دایک و شیری دەست کرد

گومانی تێدا نیە کە شیری دایک چەندەها جار لەشیری قوتوو دەست کرد گرنگترو بەسوود ترە بۆ منداڵ لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:-

١) شیری دایک بە خۆڕاییەو بودجەی خێزان لاواز ناکات.
٢) پلەی گەرماییەکەی سروشتیەو گونجاوە بۆ دەمو لێوو گەروو گەدەی منداڵ.
٣) لەرێگەیەوە دایک هەست بە شانازی دەکات و دەگاتە ئەو بروایەی کە لەتوانای هیچ کەسێکی تردا نیە، بێجگە لە ئەو، ئەو شیرە بدات بە منداڵەکەی.
٤) بەپێی پێداویستی گەشە کردنی منداڵ دەگۆڕدرێت، دوو سێ ڕۆژی یەکەم خەست و زەرد باوەو ژەکی پێ دەڵێن و پڕە لەپرۆتین و ڤیتامین و خوێ ی کانزاو زۆر پێویستە بۆ

منداڵ، کە بەهیچ شێوەیەک لەشیری دەست کردا نیە، دوای ماوەیەک ڕوون دەبێتەوە منداڵ پێویستی پێیەتی.

٥) هەموو ڕەگەزەکانی خۆراکی تێدایەو تاوەکو ئێستا هیچ کارگەیەک نەیتوانیوە بەو شێوەیە دروستی بکات.

٦) هەرسکردنی لەشیری دەستکرد ئاسانترەو گرفت بۆ گەدەی منداڵ دروست ناکات.

٧) پاکژەو دوورە لە میکرۆب و گشت جۆرە ڤایرۆسێکی زیان بەخش.

٨) دژەتەنی تێدایەو پارێزگاری لەمنداڵ دەکات و لەتووش بوونی زۆر نەخۆشی دووری دەخاتەوە، وەک شیری قووتو منداڵ توشی ڕەوانی و هەوکردن و سوور بوونەوەی ڕیخۆڵە ناکات.

٩) لەکاتی شیرخواردندا، منداڵی کۆرپە، تێر تێر دەست دەکاتە ملی دایکی و یاری بەسنگی و گرو کاڵی لەگەڵ دەکات و لەباوەشی گەرمیدا هەست بە دڵنیایی و ئارامی دەکات. کە بەهیچ شێوەیەک ئەو حاڵەتە لەکاتی شیری قووتودا دروست نابێت.

١٠) کاتێک منداڵ مەمکی دایکی دەمژێت، ئا لەو کاتانەدا ماسوولکەکانی منداڵدانی دایک وورده وورده گرژ دەبنەوەو منداڵدان دەگەڕێتەوە دۆخی جارانی.

١١) بەهۆی مەمک مژینەوە، دایک لەگرژی و تورتی و ئازاری مەمکی ڕزگاری دەبێت و شیرە مەلاس دراوەکانی ناوی بەتاڵ دەکرێتەوەو بەوەش گرژی و ئازارەکانی دەڕەوێتەوەو هەست بە ئارامی و دڵنیایی و تام و چێژ دەکات.

١٢) شیردان بەمنداڵ و مژینی مەمکەکان، سنگ و مەمکی دایک لەتووش بوونی نەخۆشی شێرپەنجە دوور دەخاتەوە. (قطامی، ١٩٨٩، ص٨٥-٨٦).

لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە زۆر پێویستە کە دایک شیری خۆی بدات بە منداڵەکەی، چونکە قازانجی خۆی و کۆرپەکەی تێدایە، *لەبەر ئەوە پێویستە دایک ئاگاداری ئەم خاڵانەی لای خوارەوە بێت، بۆ ئەوەی منداڵ سوود لەشیرەکەی وەربگرێت:-*

١) نابێت دایک خۆی زۆر هیلاک و ماندوو بکات و تا دەتوانێت خۆی لەخەم و خەفەت و ترس و دڵەڕاوکێ دوور بخاتەوە، چونکە ئەوانە کار لەڕێژە و بڕی شیرەکەی دەکەن و بەرەو کەمی و خراپی دەبەن.

٢) پێویستە جگەرەو مەشروب نەخواتەوە، بۆ ئەوەی تامی شیرەكە نەگۆڕدرێت.
٣) نابێت زۆر داوو دەرمانی وەك (حەبی منع، تتراسایكلین، خەو لێ خەرو خاوكەرەوە) بەكاربهێنێ.
٤) تا دەتوانێت لەماوەی شیرداندا، لەخواردنی پیازو سیر دوور بكەوێتەوە، بۆ ئەوەی تامی شیرەكە تێك نەچێت و منداڵ لێی نەتۆرێت.

بەڵام هەندێك جار دایك ناچار دەبێت بۆ تێركردنی منداڵەكەی، پەنا بۆ شیری دەست كرد ببات، لەئەنجامی ئەوەی كە شیرەكەی كەمەو بەشی منداڵەكەی ناكات یان لەوانەیە مەمكی تووشی نەخۆشی بووبێت، یان گۆی مەمكی بچووك یان تەخت بێت و منداڵ نەتوانێت بیمژێت، یان دایك لەدەرەوەی ماڵ ئیش بكات، ئا لەم كاتانەدا، دایك ناچار دەبێت كە پەنا بۆ مەمەو شیری قووتو ببات. ئینجا بۆ ئەوەی منداڵ دوور بێت لە زیانەكانی شیری دەستكرد، *پێویستە دایك ڕەچاوی ئەم خاڵانەی لای خوارەوە بكات:-*

١) پێویستە مەمەو شووشەكان بەئاوی گەرم پاك پاك بشۆردرێن و لەناو گیراوەدا (محلول) دابنرێن، بۆ ئەوەی پاك بینەوە.
٢) زۆر پێویستە لەكاتی شیرپێداندا منداڵ لەباوەش بگیرێت، تا لەسۆزو خۆشەویستی و باوەشی گەرمی دایك بێ بەش نەبێت.
٣) پێویستە پلەی گەرمای ئەو ئاوەی كە شیرەكەی پێ دەگیرێتەوە گونجاوو مام ناوەندی بێت.
٤) پێویستە كونی مەمەی شووشەكە گونجاو بێت، واتە نە زۆر گەورە بێت و پاش ماوەیەكی كەم شیری تێدا نەمێنێت، وە نە زۆر بچووكیش بێت، كە بەزەحمەت شیری لێ بێتە دەرەوە.
٥) پێویستە ئەو ئاوەی كە شیرەكەی پێ دەگیرێتەوە، بەتەواوی بكوڵێندرێت بۆ ئەوەی میكرۆبەكانی ئاوی بكوژرێت.

## باخچەی ساوایان

لای زۆربەمان ئاشکرایە کەباخچەی ساوایان وەک دامەزراوێکی پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی گرنگیەکی زۆری لەژیانی منداڵدا هەیە، چونکە قۆناغی منداڵی زۆر ناسک و گرنگەو بنیاتنەری کەسایەتی مرۆڤە لەداهاتوودا، ئەگەر ئەم قۆناغە ژینگەی لەبارو گونجاوی بۆ دابین نەکرێت، ئەوا زەرەرو زیانێکی گەورە بەکەسایەتی منداڵ دەگات و کۆمەڵێک ئەندێشەو گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی بۆ منداڵ دەخوڵقێنێ کەزۆر زەحمەتە بتوانێت لێ ی دەرباز بێت و هەتا هەتایە کاریگەری و خراپی هەر دەمێنێت، لەبەرئەو گرنگیەی قۆناغی منداڵی، وڵاتانی پێشکەوتوو شارستانیخواز بیریان لەدامەزراوێکی تری کۆمەڵایەتی کردەوە بۆ ئەوەی هاوکاری خێزان بکات لەپەروەردە کردنی منداڵدا لەلایەک و لەلایەکی تریشەوە بتوانێت قەرەبووی ئەو کەم و کورتی و کێشانە بداتەوە کەهەندێک لەخێزانەکان لەئەنجامی هەژاری یان نەزانی یان کارکردنی دایک یان قەرەباڵغی ئەندامانی، تووشی بوون و بەدەستیەوە دەناڵێنن.

گومانی تێدا نیە کەزۆربەی خێزانەکان ناتوانن ژینگەیەکی دروست و لەبارو گونجاو بۆ منداڵەکانیان دابین بکەن، تەنانەت خێزانە دەوڵەمەندو بەتواناکانیش لەم سەردەمی شارستانیەت و تەکنەلۆژیاو تەقینەوەی کانیاوی زانستەکاندا ناتوانن هەموو پێداویستیە فسیۆلۆژی و دەروونی و کۆمەڵایەتیەکانی منداڵ تێر بکەن و تینوێتی زانستی و حەزو ئارەزووەکانی بشکێنن، بەلام باخچەی ساوایان ئەگەر لەسەر نەخشەیەکی زانستیانە پرۆگرام و پێداویستیەکانی بۆ دانرا ئەوە دەتوانێت بەو ئەرکە گەورەو پیرۆزە هەلبستێت و خزمەتێکی گەورە بەمنداڵو جیهانە پاک و بەرفراوانەکەی پێش کەش بکات. ئینجا بۆ ئەوەی باخچەی ساوایان بتوانێت بەو کارە پیرۆزەی خۆی هەلبستێت، دەبێت بینایەکی گونجاوی بۆ تەرخان بکرێت کەباخچەو گۆرەپانێکی فراوانی هەبێت و بەجۆرەها گوڵ و گوڵزارو دارو درەخت رازێنرابێتەوە و جۆرەها یاری وەک جۆلانە و خشۆک (خلیسکێنە) و حەوزی لم و ئاوو کۆمەڵێک بووکە شووشەو یاری منداڵانەو تەنانەت جێگایەکی

تایبەتیش بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵ و پەلەوەری هەبێتو جێگای نووستن و هۆڵی یاریکردن و تایبەت بەنان خواردنو ڕەچاو کردنی پلەی گەرمای گونجاوو ڕووناکی پێویست و دابین کردنی بەڕێوەبەری بەتواناو دادەی شارەزا بەبواری دەروونی منداڵ و دەست نیشانکردن و چارەسەر کردنی هەندێک لەگرفتەکانی منداڵ.

بێگومان لەزۆربەی وولاتانی جیهان بەم شێوەیە باخچەی ساوایان دەکەنەوەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گەشەی پێ دەدەن، بەڵام بەداخەوە لەلای ئێمە باخچەی ساوایانیش وەک زۆربەی بوارەکانی تری ژیان شیرازەی تێک چووە، لەگەڵ ئەوەشدا بەو توانا کەمەو بارودۆخە نالەبارەی هەمانە دەتوانرێت بەپێ ی توانا خزمەت بەمنداڵانمان پێشکەش بکرێت و کەمێک لەئازارو گرفتەکانیان کەم بکرێتەوەو قەرەبووی منداڵانی خێزانە هەژارو قەرەباڵغەکان و ئەو منداڵانەی کەدایکیان کار دەکەن یان نەزان و کەمتەرخەمن و پەروەردەیان هەڵەیە، بکرێتەوە.

*دەتوانین بەکورتی گرنگی باخچەی ساوایان لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:-*

١) لایەنی جەستەیی:

لەبەرئەوەی باخچەی ساوایان چەندەها جۆر یاری و ئامرازی یاریکردنی تێدایە، ئەوە دەتوانێت خزمەتێکی گەورە لەلایەنی جەستەییەوە بەمنداڵان بگەیەنێت کەدەبێتە هۆی گەشە کردن و بەهێزکردنی ماسولکەو ئەندامەکانی لەشی و وورووژاندن و پێش خستنی هەستەوەرەکانی، کەلەوانەیە ئەم شارەزایی و بواری جووڵەیە لەژینگەی خێزانی زۆر منداڵدا نەبێت.

٢) لایەنی کۆمەڵایەتی:

کاتێک منداڵ لەباخچەی ساوایان تێکەڵ بەمنداڵانی تر دەبێت لەڕێگەیانەوە فێری زۆرداب و نەریت و بەهای کۆمەڵەکەی دەبێت، هەروەها تۆوی گیانی برایەتی و هاوکاری

و یەکسانی لەدڵ و دەروونیدا دەچێندرێ و لەکۆشەگیری و تاکایەتی و خۆپەرستی رزگاری دەبێت و زۆر ڕەوشتو شارەزایی تازە لەمنداڵانی ترەوە فێر دەبێت و ڕۆڵی کۆمەلایەتی خۆی دەناسێتەوەو ئامادە دەکرێت بۆ قوتابخانەی سەرەتایی و رزگارکردنی لەگرفتی خۆسازاندن.

۳) لایەنی ژیری:

منداڵ لەباخچەی ساوایان لەڕێگەی یاریکردن و گۆرانی و سرودو چیرۆک و حیکایەتەوە زۆر شارەزایی و زانیاری فێر دەبێت و زمانی پاراو دەبێت و ژمارەی وشەکانی زیاد دەبێت و هەڵەکانی بۆ ڕاست دەکرێتەوەو یادکردنەوەو ئاگاداری و چاو تێ برین و خەوو خەیاڵی بەهێز دەکرێت و شارەزایی هەندێکە لەدیاردەکانی ژیان دەبێت.

٤) لایەنی هەڵچوونی:

منداڵ لەڕێگەی یاریکردن و تێکەڵاوبوونی منداڵانی ترو گێڕاندنەوەی چیرۆک و گۆرانی و سروود ووتنەوە لەزۆر گرژی و هەڵچوون و خەم و خەفەت رزگاری دەبێت، لەوانەیە ئەگەر ئەو ژینگەیە نەبێت ئەوا گرژی و خەم و خەفەت و هەڵچووەکان تووشی زۆر گرفت و گرێ ی دەروونی بکەن.

شایەنی ئاماژە بۆ کردنە کەبیرو نەخشەو سەرەتای دامەزراندنی باخچەی ساوایان دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسوف و زانایانی وەک بستالوتزی و فرۆبلی ئەڵمانی. (الألوسي، ۱۹۸۳، ص۱۱۰-۱۱۸).

## چۆنیەتی گەشەکردنی زمانی منداڵ

زمان کەرەستەی سەرەکی پێش کەوتنی گشت گەل و نەتەوەکانە. تازەکەرەوەی رۆشنبیریە، ئامرازی گوزارشت کردن‌و تێ گەیشتنی نێوان تاکەکانی کۆمەڵە، بنەمای هاوسۆزی و بیری و پێوەری پتەوکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانەو کاریگەرییەکی زۆریشی لەسەرگەشەکردنی بیروهۆش و هزری مرۆڤ هەیە، بەڵگەش ئەوەیەکە (دەتوانریت بریار لەسەر زیرەکی لەرێگەی دەوڵەمەندی یان هەژاری زمانیەوە بدریت) (منصور، ١٩٨٢، ص١٠٤). کەواتە زمان گرنگیەکی لەرادەبەدەری لەژیانی مرۆڤدا هەیەو تەنها مرۆڤیشە کەدەتوانێت زمان بەمانا بەرفراوانەکەی بەکار بهێنێ و لەبوونەوەرەکانی خوار خۆی جیا بکاتەوە.

زمان وەک روون و ئاشکرایە لەژمارەیەک دەنگ پێک هاتووەو بەپێ ی یاساو رێزمانی تایبەتی کاڵای مانای بەباڵایدا دەبردرێ و لەرێگەیەوە تاکەکانی کۆمەڵ لەیەکتری تێدەگەن و گوزارشت لەحەزو ئارەزوو بیرو بۆ چوونەکانیان دەکەن.

### بنەما فسیۆلۆژیەکانی زمان

زمان و قسەکردن وەک هەمو دیاردە مرۆڤایەتی و دەروونیەکانی تر بنەمای فسیۆلۆژی و بایۆلۆژی تایبەتی خۆی هەیەو لەرێگەی ئەو ئەندامانەوە زمان بەرجەستە دەبێت و تایبەتمەندێتی مرۆڤ دەردەکەوێت، زیاتر لەکۆئەندامێک بەشداری بەرهەم هێنانی زمان و قسەکردن دەکەن، لەپێشەوەی هەمووشیان کۆئەندامی دەماری ناوەندییە کە کۆنترۆڵی کارو فەرمانی زۆربەی کۆئەندامەکانی تری مرۆڤ دەکات، کۆئەندامی هەناسەدانیش دووهەم کۆئەندامە کەبەشداری دروستکردنی دەنگەکانی لەرێگەی دابین کردنی هەوا بەرێژەیەکی گونجاو دەکات. دەبێت ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە کۆئەندامی هەناسەدان ئەرکی سەرەکی گواستنەوەی ئۆکسجینە لەدەرەوەی لەش بۆ خوێنی مرۆڤ

و دەرهاویشتنی دووەم ئۆكسیدی كاربۆنە بۆ دەرەوەی لەش، بەڵام هاوبەشی لەپرۆسەی قسەكردن یا دروست كردنی دەنگ كاریگی لاوەكیە. بەڵام بەپلەی یەكەم كۆئەندامی دەماری ناوەندی بەرپرسیارە لەپرۆسەی قسەكردن و نووسین و لەیەك گەیشتن. لەكۆئەندامی دەماری ناوەندیش مێشك بەتایبەتیش توێكڵ و پەردەی مێشك بەرپرسیاری یەكەمن لەزمان. مێشكیش (الدماغ) لەدووبەش پێك هاتووە (نیوەی لای راستو نیوەی لای چەپ).

ئەوەی تاوەكوو ئێستا زانراوە ئەوەیە كەنیوەی چەپی مێشك بەرپرسیارە لەجووڵەو چالاكیەكانی نیوەی راستی لەش، بەڵام نیوەی راستی مێشك كۆنترۆڵی جووڵەو چالاكیەكانی نیوەی چەپی لەش دەكات. وەك دەركەوتووە نیوەی چەپی مێشك زاڵە بەسەر زۆربەی كارو فەرمانەكانی مرۆڤدا. هەریەكێك لەدوو نیوەكەی مێشك لەرێگەی چەند پێچ و چاڵ و خوارو خێچیەكەوە دابەش بوون بۆ چوار بەش (فصوص) وهەر یەكەیان كارو فەرمان و تایبەتمەندێتی خۆی هەیە، هەندێك لەو بەشانەی مێشك تایبەتن بەزمان و پرۆسەی قسەكردن لەوانە ناوچەی رۆلاند (منطقة رولاند) كەتایبەتە بەجووڵەی ئەندامەكانی زمان و قسەكردن. هەروەها ناوچەی (برۆكا) كەپزیشكی فەرەنسی (برۆكا) لەساڵی (١٨٦١) دۆزییەوەو دەكەوێتە پشت گوێ ی چەپەوە بەڵام تۆزێك بۆ پێشەوە (الحمداني، ١٩٨٢، ص٧٢-٧٤).

برۆكا نەخۆشێكی هەبوو كە توانای قسەكردنی نەمابوو، دوای مردنی نەخۆشەكەو لێكۆڵینەوەو توێ توێ كردنی مێشكی دەركەوت كە ئەو جێگایەی ئێستا ناو دەبرێت بەناوچەی برۆكا، لەكار كەوتووەو هیچ رۆڵێكی نەماوە. هەروەها دوای (١٠) دە ساڵ لەدۆزینەوەكەی برۆكا، (فرنكه)ی زانا گەیشتە ئەو راستیەی كەئەگەر پەردەی مێشك لەبەشی چەپی (الصدغي) كە دەكەوێتە ژێر ناوچەی بیستنەوە، تووشی لەناو چوون ببێت، ئەو كاتە ئەو كەسەی تووشی ئەو نەخۆشیە دەبێ، توانای تێگەیشتن و زمانی قسەكردنی نابێت، بەڵام زمانی نووسینی وەك خۆی دەمێنێتەوە ( الحمداني، ١٩٨٢، ص٧٤-٧٥).

جاران زاناکان لەو بڕوایەدا بوون کەبەشەکانی نیوەی چەپ یەکسانن بە بەشەکانی نیوەی ڕاستی مێشک. بەڵام دەرئەنجامی توێژینەوەکانی مێشک گەیشتنە ئەو ڕاستیەی کە جیاوازی لەنێوان بەشەکانی هەردوو نیوەی مێشکدا هەیە، بۆ نموونە بەشی (الصدغی) (temporal lobe) کە ڕۆڵی گرنگی هەیە لەزماندا، بەشەکەی نیوەی مێشکی لای چەپ گەورەترە لەبەشەکەی نیوەی مێشکی لای ڕاست، کە ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە نیوەی چەپی مێشک زیاتر زاڵ بێت و ڕۆڵی هەبێت لەگەشەکردنی زمان. (یوسف، ١٩٩٠، ص١٦٥). هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵ ڕاستەوانەبن ودەستی ڕاستیان بەکاربهێنن بۆ نووسین و ژمارەیەکی کەمیش چەپەوانەبن و دەستی چەپیان بەکاربهێنن بۆ نووسین.

## وەرگرتن و فێربوونی زمان

لەئەنجامی ژیان لەناو کۆمەڵدا و تێکەڵاو بوون بەتاکەکانی، منداڵ فێری زمانی گەل و نەتەوەکەی دەبێت و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەی ووشەکانی زیاتر دەبێت و شارەزایی دەربارەی ڕێزمان و پێکهاتووەکانی زمان پەیدا دەکات. زۆر بەڵگەی زیندووش هەیە، ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێ کە گفت و گۆو قسەکردن لەگەڵ منداڵ خێراتر فێری زمانی دەکات لەوەی تەنها هەر گوێبیستی زمان ببێت و ئەو بەشداری تێدا نەکات.

مشت و مڕو بگرەو بەردەیەکی زۆر لەنێوان زاناکاندا هەیە دەربارەی چۆنیەتی فێربوونی زمان لەلایەن منداڵەوە. هەر زاناو قوتابخانەیەکی دەروونی بۆ چوونی تایبەتی خۆی هەیە لەو بارەیەوە، بەڵام تاوەکوو ئێستا یەکالا نەبۆتەوەو هیچ زاناو قوتابخانەیەکی دەروونی نەیتوانیوە بەسەرکەوتوانە چۆنیەتی فێربوونی زمان لێک بداتەوەو شارەزای هەموو لایەنە جیاجیاکانی ببێت. لەگرنگرین تیۆرەکانی لێکدانەوەی چۆنیەتی فێربوونی زمان ئەمانەی لای خوارەوەن:_

## ١) تیۆرە بایۆلۆژیەكان:ـ

ژمارەیەك لەزاناكانی لەو بڕوایەدان كە ئامادەباشی و توانستی فێربوونی زمان بۆ بۆ ماوەو ڕەمەكەكانی پێش لەدایك بوون دەگەڕێتەوە. چۆمسكی (chomisky) یەكێكە لەلایەنگرانی ئەم تیۆرەو لەو باوەڕەدایە كەمندال پێش ئەوەی لەدایك ببێت، توانستێكی لەبن نەهاتووی بۆ فێربوونی زمان هەیە، كە ئەویش لەڕێگەی پێكهاتووەكانی كۆئەندامی دەماری ناوەندییەوە بەرجەستە دەبێت. هەروەها لینبرگ (Lenneberge) لەو بارەیەوە دەڵێت (توانستی مرۆڤ بۆ بەرهەم هێنانی زمان و تێگەیشتن، یەكێكە لەخاسیەتە بۆ ماوەییەكان و زمان پشت بەكۆمەڵێك ئەندامی بایۆلۆژی زۆر وردو خاوەن كارو فەرمانی تایبەتی دەبەستێت لەوانەش- كۆئەندامی قسەكردن، مەڵبەندەكانی مێشك، كۆئەندامی بیستن...هتد- وە زانای ناو براو ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كەهەموو مندالانی جیهان بەپێ ی یەك شێواز و یاساو ڕێزمانێكی هاوبەش فێری زمان دەبن و یەك ئاستیش لەخۆ دەگرێت، هەرچەندە ژینگەو بارودۆخی ژیانیشیان جیاوازە ،هەموو مندالانی جیهان لەدەوروبەری مانگی شەش (٦) دەست دەكەن بەهات و هاوارو گرو گاڵ و لەپێش كۆتایی ساڵی یەكەمی ژیانیاندا یەكەم ووشە فێر دەبن و قسەی پێ دەكەن) (هرمز، ١٩٨٩، ص٤٧).

لایەنگرانی ئەم تیۆرە دەڵێن، هەموو منداڵێك ئیتر لەهەر چ كات و شوێنێك بێت، ئەوا لەڕێگەی ژمارەیەك دەنگی دیاریكراوەوە بەپێ ی ڕێساو ڕێزمانێكی نیمچە هاوبەشەوە فێری زمان دەبێت و هەر لەڕێگەی ئەو كۆمەڵە دەنگە بێ مانایەوە ژمارەیەك ووشەی لەبن نەهاتووی واتادار دروست دەكات. لەلایەكی تریشەوە هەموو مندالانی جیهان بەشێوەیەكی سەرنج ڕاكێش و لەكاتێكی دیاریكراودا، دەتوانن فێری چەندەها ڕێزمان و یاسای زۆر ئالۆزی زمان ببن. ئەمانەو چەندەها بەڵگەی تر دەهێننەوە بۆ سەلماندنی ئەوەی كە بەپلەی یەكەم بۆ ماوەو ڕەمەكەكانی بەرپرسیارن لەفێربوونی

زمان، بەڵگەکانیش بەکورتی ئەمانەن (١- پەیوەندییەکی پتەو هەیە لەنێوان زمان و لایەنی فسیۆلۆژی، ٢- زمان بەپێ ی خشتەو کاتێکی دیاریکراو گەشەدەکات. ٣- زۆر بەزەحمەت دەتوانرێت گەشەکردنی زمان بوەستێنرێت. ٤-ناتوانرێت زمانی مرۆڤ بێجگە لەمرۆڤ فێری هیچ بوونەوەرێکی تر بکرێت ٥- بنەماو ڕێزمان و ڕێسا سەرەکیەکانی زمان لەنێوان هەموو گەل و نەتەوەکاندا هاوبەشە (کلاس، ١٩٨٤،ص١٠٨-١١٠).

٢) تیۆری فێربوون:-

بەپێی ئەم تیۆرە، زمان وەک هەموو ڕەوشت و هەڵس و کەوتەکانی تر، لەڕێگەی پاداشتو دووبارەبوونەو ڕاهێنانەوە گەشەدەکات و مرۆڤ فێری دەبێت. بەڕای (سکنر)، منداڵ کاتێک فێری گرگاڵ و یاریکردن بەدەنگەکانی دەبێت، لەو کاتەدا دایکان و باوکان و کەسانی تری چواردەوری منداڵ، لەڕێگەی پێکەنین و زەردەخەنەو لەباوەش گرتن و ماچ کردن و لاواندنەوەو ڕازی بوون، پشتگیری هەندێک لەدەنگەکانی منداڵ دەکەن و ژمارەیەکی تری دەنگەکانی پشت گوێ دەخەن. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ تەنها ئەو دەنگ و ووشانە دووبارە بکاتەوە کە کەسانی چواردەورو دایک و باوکی پێ یان خۆشەو پاداشتی دەکەن، ئەمەش مانای ئەوەیە کەمنداڵ لەسەرەتادا چەند دەنگێکی لابەلایی هەر لەخۆیەوە، کە هیچ مانایەکی نیە بەکاردەهێنێ، ئینجا لەڕێگەی هاندانی کەسانی چواردەورییەوە، هەندێک لەو دەنگانە بەردەوام دووبارە دەکاتەوەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ فێری دەنگ و ووشەکانی تر دەبێت و دووبارەو چەند بارەیان دەکاتەوە، هەروەها واز لەو دەنگ و ووشانە دەهێنێ کەکەسانی چواردەور پێ ی ڕازی نابن و پشتگیری ناکەن.

لەئەنجامی ئەوەی کە ئەم تیۆرە نەیتوانیوە بەسەرکەتوانە هەموولایەکانی پرۆسەی فێر بوونی زمان لێک بداتەوە، ڕووبەڕووی کۆمەڵێک ڕەخنەو پلار تێگرتن

بۆتەوە، بەتایبەتی لەلایەن (چومسكی) زاناوە، كە دەڵێت تیۆری فێركردن ناتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارەی خوارەوە بداتەوە:-

*ئەگەر منداڵ لەڕێگەی لاساییكردن و سەرنج دان و پاداشتەوە هەموو ووشەو ڕستەو دەستەواژەكان فێر دەبێت، ئەی چۆن زۆرجار منداڵان فێری زۆر ووشەو ڕستەو دەستەواژەی تازە دەبن كە لەفەرهەنگی گەورەكاندا نین؟.*

(٣) تیۆری لاساییكردنەوە (التقليد):-

بەڕای زانایانی ئەم تیۆرە، منداڵ لەڕێگەی لاساییكردنەوەی گەورەكان و كەسانی چواردەورییەوە فێری زمان دەبێت. واتە كاتێك باوك و دایك و كەسانی چواردەوری منداڵ قسە لەگەڵ یەكتری و لەگەڵ منداڵ دەكەن، ئا لەو كاتانەدا منداڵ سەرنجی ئەو كەسانەدا دەدات و هەوڵ دەدات وەك ئەوان دەنگ و ووشەو ڕستەكان دووبارە بكاتەوە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ وشەو ڕستەی تازە لەو كەسانەوە فێر بێت. بەڵام ئەم تیۆرەش كەمو كورتی زۆری تێدایە، چونكە زۆر جار منداڵ لاسایی گەورەكان دەكاتەوەو گوێ بیستی قسەكانیان دەبێت، بەڵام كاتێك ئەو منداڵە قسە دەكات، دەبینین ووشەو ڕستەی گەورەكان وەك ئەوان تووتی ئاسا دووبارە ناكاتەوە، بەڵكو دەست كارییان دەكات و بەشێوەیەكی نوێ دایان دەڕێژێتەوە جیاواز لەو شێوەی كەگوێ بیستی بووە ئەمەش مانای ئەوەیە لەكاتی فێربوونی زماندا، چەند میكانیزم و توانستێكی تر لەپاڵ لاساییكرنەوەدا بەشداری دەكەن، كەتیۆری لاساییكردنەوە ئاماژەی بۆ نەكردوون و نەیتوانیوە دیاریان بكات، لەلایەكی تریشەوە منداڵ ناتوانێت تەنانەت لاسایی ڕستەو دەستەواژەكانی خۆشی بكاتەوە.

(٤) تیۆری زانینی (النظرية المعرفية):-

جان پیاجیە بەپێشەوای ئەم تیۆرە دادەنرێت و لەو بڕوایەدایە، كەتواناو لێهاتوویی فێربوونی زمان، لەڕێگەی كارلێكردنی نێوان منداڵ و ژینگەكەیەوە گەشەدەكات، واتە

## هەنگاوەکانی فێربوون

زمان و چۆنیەتی گەشەکردنی توێژینەوەی زۆر دەربارەی بەئەنجام گەیەندراوە [دەرئەنجامی هەموو توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە منداڵ یەکەم جار فێری ناوەکان دەبێت، بەتایبەتی ئەوانەی کە لەچواردەوری منداڵن و ڕۆژانە منداڵ لەڕێگەی هەستەوەرەکانیەوە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە وەک (بابە، دایە، دادە، پشە، ئاو، نان، حەم، دەم، لوت، چاو، سەر، تەلەفزیۆن....هتد) دوای ئەوە بەماوەیەکی زۆر ئینجا دەتوانێت فێری کردار (فعل) ببێت و بەکاریان بهێنێ، هەروەها لەدەوروبەری کۆتایی ساڵی دووهەم، بۆ یەکەم جار دەتوانێت ڕاناو (ضمير) بەکار بهێنێ و وورده وورده گەشەدەکات، تا لەکۆتایی ساڵی سێیەم دەگاتە ترۆپکی ڕاناوەکان. یەکەم جار ڕاناوە هەست پێکراوەکان فێر دەبێت دوای ئەوە بەماوەیەک ئینجا فێری ڕاناوی نادیار دەبێت] (الشماع، ١٩٦٧،ص١٥٥). هەروەها توێژینەوەی (شريف، ١٩٨٧،ص٩٢) کە لەسەر سەرمایەی زمانی منداڵانی کورد کراوە ئاماژە بۆ هەمان دەرئەنجام دەکات، کە لەسەدا (٨٨٫٢٢٪) سەرمایەی زمانی منداڵانی کورد ناوە، لەسەدا (١٠٫٣٩٪) ووشەکانی تریان کردارە. بێگومان فێر بوونی ووشەو ڕستەو ئامرازو دەستەواژەکان پەیوەندی بە قورسی و سوکی دیار و نادیاربیانەوەیە، منداڵ لەسەرەتای فێربوونی زماندا فێری ووشەو ڕستە سووکەکان دوای ئەوەش قوورسەکان دەبێت، یەکەم جار فێری مانای ئەو شتانە دەبێت کەلەڕێگەی هەستەوەرەکانیەوە درکی پێدەکات و دەیان ناسێتەوە دواجار ئەوشت و چەمکانەی کە نادیارو واتادارو (معنوی) رووتن.

هەر لەبەر ئەوەشە کەمنداڵ یەکەم جار فێری ناو دەبێت، دوای ئەوە کردار، لەبەر ئەوەی کردار لەدوولایەنەوە جیاوازە لەناو، یەکەم کات لە کرداردا هەیە (ئێستا، رابووردوو، داهاتوو) بەڵام لەناودا نیە، دووهەمیش ڕوودان لەکرداردا هەیە (ڕۆیشتن، خواردن، بردم، گرتم..هتد) کە گۆرانکاری لەحاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر دەبێت بەڵام ئەم ڕوودانەش لەناودا نیە، کەواتە فێربوونی کردار گرانە و کاتی زۆری دەوێت و

پەیوەستە بەگەشەکردنی ژێریی‌و کۆئەندامی دەماری ناوەندییەوە، لەبەرئەوە فێر بوونی دوا دەکەوێت، وەهەمان شتیش لەکاتی فێربوونی ڕاناوو ئامرازەکاندا (حروف الجر والعطف) دووبارە دەبێتەوە. دەروون زانی ئەمریکی (جیزل) (Gesell) توێژینەوەیەکی لەسەر فێربوون و وەرگرتنی زمان بەئەنجام گەیاند. لەڕێگەی چاوپێکەوتن لەگەڵ ژمارەیەک لەدایکان و باوکان و پیشاندانی کۆمەڵێک وێنە بەمندالان و داواکردن لێ یان کەناوی ئەو وێنەو شتانە بڵێن کە پیشانیان دەدات. دوای کۆکردنەوەی زانیارییەکی زۆر، گەیشتە ئەم دەرئەنجامانەی خوارەوە:-

| ئەمەنی منداڵ | دیاردەکانی زمان |
|---|---|
| ٤مانگ | زەردەخەنە، گمەگم، قاقالێدان، دروست کردنی دەنگ لەرێگەی دەمەوە. |
| ٦مانگ | گرو گاڵ، قسەکردن بەچەند برگەیەک، پێکەنین بەچەند دەنگ و وێنە و نیگارێک |
| ٩مانگ | فێر بوونی ووشەی دایە، دادە، وەک بەرپەرچدانەوەیەکی ئەو ووشانەی کەگوێ بیستی دەبێت |
| ١٢مانگ | تێگەیشتنی هەندێک ووشەو قسەی سادە، دەربڕینی دوو ووشە لەگەڵ هەردوو ووشەی بابا، دادا، خواحافیزی و بای بای بەدەستەکانی |
| ساڵو نیوێک | گوتن و دەربڕینی (٥) ووشە یان زیاتر، تێگەیشتنی پرسیارە ئاسانەکان، ئاماژەکردن بۆ لووت، چاوەکان، قژ (پرچ)، تواناى سوپاس کردن و وەڵامدانەوەی سلاوکردن |
| ٢سالان | بەکار هێنانی رستە بەتایبەتی رستە ئاسانەکانی، ناو نانی شتو کەلو پەلەکانی چواردەوری وەک (کلیل، دەرگا ، کات ژمێر) جیاکردنەوەی هەندێک (حروف جر) |
| ٣ سالان | فێربوونی بەکارهێنانی ڕاناو، کاتی رابووردوو، کۆکردنەوە، ناو نانی سێ شت لەو وێنانەی کەپیشانی دەدرێت، گێراندنەوەی کورتە چیرۆک ، جیاکردنەوەی هەندێک کەرەستەو پیت (ادوات و حروف) |
| ٤ سالان | ناسینەوەو جیاکردنەوەی چوار کەرەستە (ادوات)، بەکار هێنانی هەندێک ووشە بۆ وەسف کردن، لەگەڵ پێناسەکردنی ئەو ووشانەی بەکاری دەهێنێ وەک چەقۆ بۆ برین، کورسی بۆ دانیشتن، تێ گەیشتنی سێ (٣) ووشەیان زیاتر لەوانەی کەپیشانی دەدرێت. (خلیل، ١٩٨٦، ص ٦٤ - ٦٥). |

## چی گەشەی زمانی منداڵ دوادەخات؟

زۆر لەئەنجامی توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە زۆر هۆکار هەیە دەبێتە هۆی دواکەوتنی گەشەی ئاسایی زمانی منداڵ، لەوانە:_

(١) پەلەکردنی دایک و باوک:_

زۆر لەدایکانو باوکان، پێش ئەوەی منداڵەکانیان بگەنە تەمەنی قسەکردن، زۆر لەمنداڵەکانیان دەکەن بۆ ئەوەی زوو قسە بکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی لەلایەنی بایۆلۆژییەوە ئەو منداڵە بەتەواوی گەشەی نەکردووە و مەڵبەندەکانی قسەکردن لەمێشکدا کەم و کورتیان تێدایەو دەنگەژێ و ماسولکەکان نەگەیشتوونەتە ئاستی پێویست، منداڵەکە ناتوانێت وەکە پێویست و بەپێ ی دڵ و خواستی دایک و باوکی قسەبکات و تووشی سەرنەکەوتن دەبێت و دواجار دوورنیە باوەڕی بەخۆی نەبێت و بەچاوی سووکە سەیری خۆی بکات، هەروەها ئەو سەرنەکەوتنە دەبێتە (مایەی تورەبوون و بێزاری ئەو منداڵانەو شۆرشێکی گەورە لەدژی زمان و قسەکردن بەرپادەکەن و دوورنیە لەتەمەنی ئاسایی قسەکردنیشدا مان بگرن و قسە نەکەن وەکە بەرپەرچدانەوە و نارەزاییەکە بۆ ئەو پەلەکردن و زۆرە ملێ یەی دایک و باوکیان تەنانەت ڕەنگدانەوەی خراپیشی دەبێت لەسەر قۆناغەکانی داهاتووی ئەو منداڵە، زۆر جار بەشداری گفت و گۆو قسەکردن ناکەن و کەم دوو گۆشەگیر دەبن (منصور، ١٩٨٢،ص١٥٢).

(٢) ئاخاوتن بەدوو زمان:-

ئەو منداڵانەی کە لەسەرەتای ژیانەوە فێری دوو زمانیان دەکەن، لەداهاتوودا زەرەرو زیانێکی گەورە لە سەرمایەی زمانیان دەکەوێت (چونکە ناتوانن بەتەواوی فێری هەردوو زمانەکە ببن، بەڵکو بەنیوە چڵی و ناتەواوی فێری ئەو دوو زمانە دەبن، ئەویش

لەئەنجامی ئەوەی هەریەكە لەو زمانانە دەبن بەكۆسپ و ڕێگر لەبەردەم فێربوونی تەواوی زمانەكەی تر، چونكە هەر زمانە تایبەتمەندێتی و خاسیەت و سیفاتی خۆی هەیە كەوا لەمنداڵەكە دەكەن كە لەكاتی قسەكردندا تێكەڵاویان بكات و بەئاسانی لێكیان جیانەكاتەوە) (منصور، ١٩٨٢،ص١٥٢) ڕاستیەكی بەڵگەنەویستە كەمرۆڤ هێزو تواناو ژیری تایبەتی خۆی هەیە، ئەگەر بۆ بەئاكام گەیاندنی یەكە كارو فەرمان ئاراستەكرا، ئەوا زیاتر سەركەوتن بەدەست دەهێنێ لەوەی كەدابەش بكرێت بەسەر دوو یان زیاتر لەكارو فەرمانێك. ئینجا لەبەرئەوەی ئەو منداڵانەی كە لەیەكە كاتدا فێری دوو زمانیان دەكەن یان زمانیماڵەوەیان جیاوازە لەگەڵ زمانی خوێندنو دەرەوەیان، ئەوا ناچار دەبن كە ئەو هێزو تواناو ژیرییەی هەیانە دابەش بكەن بەسەر ئەو دوو زمانەداو وەك ئەو منداڵە فێری زمان نەبن كەهەموو هێزو تواناو ژیری ئاراستەی یەكە زمان دەكاتو فێری دەبێت.

(٣) هەژاری ژینگەی منداڵ:-

ئەگەر ژینگەی كۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری منداڵ هەژار بێت و كەرەستەو ئامرازو هۆكاری تایبەت بەگەشەكرنی زمانی منداڵی تێدا نەبێت، ئەوا منداڵ وەك پێویست فێری زمان نابێت. بۆ نموونە ئەگەر دایكو باوكە كەمدوو بن و هانی منداڵ نەدەن و هەڵەكانیان بۆ ڕاست نەكەنەوەو ئامرازەكانی ڕاگەیاندن و یاریكردن لە ماڵدا نەبێت، ئەوا دوورنیە منداڵەكانیان تووشی دواكەوتنی زمان ببن و زمانیان پاراوو دەوڵەمەند نەبێت و لەكاتی قسەكردندا تووشی زۆر هەڵە ببن.

## قۆناغەكانی گەشەكردنی زمان

زمان ئەو توانست و ئامادە باشیەیە كە مرۆڤ لەبوونەوەرەكانی تر جیادەكاتەوەو ئەو سەروەری و تایبەتمەندێتیەی پێ دەبەخشێت و لەئەنجامی بوونی

بنەمای جەستەیی و فسیۆلۆژی پێشکەوتوو، زمانی وەک کەرەستەیەکی پێشکەوتوو دانسقە بۆ خۆی پاوان کردووە. زمان دوو فەرمان و کاری سەرەکی هەیە، یەکەمیان تێ گەیشتن و کارلێککردنی کۆمەڵایەتیە لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵدا، فەرمانی دووهەمی کەرەستەیەکە بۆ دەرهێنان و دەربڕینی بیرو بۆچوونەکانی مرۆڤ، واتە ئەگەر زمان نەبوایە تاک نەیدەتوانی بەو شێوەی ئێستای لەگەڵ تاکەکانی تری کۆمەڵەکەی لێک تێبگەن و کار لەیەکتری بکەن، هەروەها بیرو بۆچوونو زیرەکیەکەی هەر لەنێوان کاسەی سەریدا دەمایەوەو نەیدەتوانی گوزارشتیان لێ بکات و بیانهێنێتە دەرەوە.

هەمووومان دەزانین کە هەر گەل و نەتەوەیەک زمانی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام سەرهەڵدانو گەشەکردن و قۆناغەکانی لەنێوان هەموو گەلانی جیهاندا چوون یەکن و یەک ڕێچکەو بنەمای تایبەتی خۆی هەیە، دەروونزانەکان لەئەنجامی توێژینەوەکانیانەوە گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی کە گەشەکردنی زمانی منداڵ بەم قۆناغانەی خوارەوەدا تێدەپەڕێت:-

(١) قۆناغی هاوار کردن:

یەکەم جار هاوار کردنی منداڵ دیاردەیەکی بایەلۆژی ڕووتەو پەیوەندی بەهیچ شتێکی ترەوە نیە وەک هەندێک کەس لەو باوەڕەدان کە ئەو هاوارکردنە دژی لەدایک بوونەو ناڕەزاییە بۆ هاتنە ناو ئەم ژیانە ترسناک و دژوارەو مانەوەیە لەناو منداڵدانی ئارامو پڕ لەکامەرانی. ئەوەی ڕاستی بێت هەموو منداڵانی جیهان هەر یەکسەر دوای جیابوونەوەیان لەدایکیان هاوارێک دەکەن، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەوایەی کە بۆ یەکەم جار دەچێتە ناو بۆری هەناسەو سیەکانیەوە.

بێگومان ئەو هاوارکردنە بەرپەرچدانەوەی ئاسایی و بایەلۆژی لەشە بۆ ئەو هەوایە. هاوارکردن لەسەرەتای ژیاندا پرۆسیسێکی ئۆتۆماتیکیەو لەژێر کۆنترۆڵ و ویستی منداڵدانیە، بەڵام وردە وردە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەگۆڕدرێت بۆ پرۆسیسێکی ویستی و منداڵ کۆنترۆڵی دەکات و لەکات و شوێنی پێویستدا منداڵ بەئارەزووی خۆی

بەکاری دەهێنێت و دەبێت بەئامرازێکی ڕاگەیاندن لەنێوان ئەوو کەسانی چوار دەوریدا بەتایبەتیش دایکو باوک. بۆ نموونە، کاتێکە برسی یان تینووی دەبێت یان هەست بەئازار یان خۆی تەڕ دەکات، منداڵ هاوار دەکات و دایک فریای دەکەوێت و لەو بارودۆخە نائاساییە ڕزگاری دەکات، تەنانەت دایک دوای چەند جارێک و شارەزایی پەیدا کردن جۆری هاوار کردنەکە دەناسێتەوە، بۆ نموونە منداڵ کاتێک برسی دەبێت هاوار دەکات کەجیاوازە لەو هاوارەی کەبۆ ئازارە یان بۆ خۆ پیس کردنە، واتە زمانی منداڵ لەم قۆناغەدا هاوار کردنەوە لە هەمان کاتدا ئەو هاوار کردنە دەبێت بەهۆکارێک بۆ بەهێز کردن و ڕاهێنانی دەنگە ژێکان.

٢) قۆناغی گڕوگاڵ:

دوای ماوەیەک دەنگە و هات و هاواری منداڵ لەهاوار کردن و قیژە قیژەوە دەگۆڕدرێت بۆ گڕوگاڵ، ئەوەی گڕو گاڵ لەقۆناغی پێشوو جیادەکاتەوە ئەوەیە کەلەقۆناغی گڕوگاڵدا دەنگی منداڵ و هاوار کردنەکەی جۆرە ڕەزم (ایقاع) و ڕێک و پێکیەکی مۆسیقی لەخۆی دەگرێو تام و چێژو خۆشیەک بەمنداڵ و کەسانی چوار دەوری دەدات، یەکەم جار بەچەند دەنگێکی لابەلاو تەم و مژاوی دەست پێدەکات دوای ئەوەش پیتەکان چەکەرە دەکەن، یەکەم پیت کەمنداڵ دەتوانێت دەری ببڕێت، ئەو پیتانەیە کەپەیوەندیان بەدەم و لێوەوە هەیە، چونکە منداڵ بەئاسانی دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر جوولەو بەکارهێنانی هەردوو لێوەکانیەوە لەئەنجامی پرۆسیسی مژین و ملچە ملچ و قوتدانەوە، یەکەم پیتیش بریتیە لە (ب)، دوای ئەوە ئەو پیتانە دەردەکەوێت کە پەیوەندیان بەبەکارهێنانی دانەکانەوە هەیە وەک (د) و (ت) دوای ئەوەش ئەو پیتانە دەردەکەوێت کەپەیوەندیان بەلووتەوە هەیە وەک (ن) و (م)، بەم شێوەیە پیتەکان یەک لەدوای یەک سەوز دەبن و باخچەی زمان دەوڵەمەند دەکەن، تا دواهەمین جار ئەو پیتانەی کە پەیوەندیان بەبن میچی دەمو قوڕگەوە هەیە دەردەکەون وەک (ک) و (ج) و (ق) و (ع)....هتد.

٣- قۆناغی لاسایکردنەوە:-

دوای پێنج مانگی منداڵ دەچێتە قۆناغی لاسایکردنەوە، لەم قۆناغەدا منداڵ لەلایەک تام و چێژ لەو پیت و دەنگانەی کە لەقۆناغی گرگاڵدا فێری بووە دەبینێت، لەلایەکی تریشەوە لاسایی قسەو گفتی کەسانی چواردەوری دەکاتەوە، بەم شێوەیە منداڵ کاتێک گوێ ی لەدەنگی خۆی دەبێتو پیتەکانی دووبارەو سێ بارە دەکاتەوەو قسەی دایک و باوک و خوشک و برا دەڵێتەوە، تام و چێژێکی زۆری دەست دەکەوێت، پاداشت و پشتگیری دایک و باوکیش ئەوەندەی تر هانی دەدات بۆ فێربوونی پیت و ووشەی زیاتر.

منداڵ کاتێک (دا) یان (با) یان (ما) دووبارە دەکاتەوە تام و چێژ وەردەگرێت لەلایەکو لەلایەکی ترەوە ووشەکانی (دادا) یان (بابا) یان (ماما) پەیدا دەبێت، چونکە منداڵ کاتێک یاری بەپیتەکان دەکات، ووشە دروست دەبێت بۆ نموونە منداڵ (دا) دووبارە دەکاتەوەو لاسایی خۆی دەکاتەوە دوای چەند جار دووبارە کردنەوەی دا دا دا ووشەی (دا دا) دەبیسترێت، هەروەها بەهەمان شێوە بەنیسبەت با با با ووشەی (بابا) وەپیتی ما ما ما ما ووشەی (ماما) دەبیسترێت، ئیتر لەم کاتەدا دایک و باوک و کەسانی تری چواردەوری منداڵ شاگەشکە دەبن و دەڵێن منداڵەکانمان فێری (دا دا) و (با با) و (ما ما) و بووە، کەلەڕاستیدا منداڵ هیچ مانایەکی ئەو ووشانە نازانێت لەم قۆناغەدا.

٤) قۆناغی مانا و واتا پێدان:-

منداڵ لەم قۆناغەدا فێری مانای ووشەکان دەبێت، لەقۆناغی لاسایکردنەوەدا منداڵ دەڵێت ماما، بابا، دادە بەبێ ئەوەی مانایان بزانێت، بەلام لەم قۆناغەدا لەئەنجامی پابەند بوون و هاوکات و شوێنی ووشەو ئەو شتەی گوزارشتی لێ دەکات منداڵ فێری

ماناى شتەكان دەبێت، بۆ نموونە كاتێك دایك دەردەكەوێت و بەمنداڵ دەڵێن ئەوە دایكە، وەكاتێك خووشك دەردەكەوێت دەڵێن ئەوە دادەیە كاتێك باوك دەردەكەوێت دەڵێن ئەوە بابەیە بەم شێوەیە منداڵ ڕۆژ لەدواى ڕۆژ فێرى ماناى ووشەكان دەبێت، هەرچەندە یەكەم جار ئەو مانایە دەدات بەهەموو ئەو بابەتانەى دەكەونە خانەى ئەو مانایەوە.

بۆ نموونە منداڵ كاتێك فێرى بابە دەبێت، ئیتر بەهەموو پیاوێك دەڵێت بابە هەروەها بەهەموو كچێك دەڵێت دادە یان دایە.... هتد، بەڵام وورده وورده ناوى ئەوانیش فێردەبێت و هەر شتە لەشوێنى خۆیدا بەكار دەهێنێ. منداڵ لەساڵى یەكەمى ژیانیدا ناتوانێت ڕستەبەكار بهێنێ، بەڵكو لەجیاتى ڕستە تەنها ووشەیەك بەكاردەهێنێت و بەو ووشەیە گوزارشت لەڕستەیەك دەكات و جێگەى ڕستەیەكى بۆ دەگرێتەوە، كە بەم قۆناغە دەڵێن قۆناغى ووشەى ڕستەیى (مرحلة الكلمة الجملية)، بۆ نموونە كاتێك منداڵ دەڵێت (ئاو) مەبەستى لەو ووشەیە ئەوەیە كە (تینوومەو ئاوم دەوێ) بەڵام ناتوانێت ئەو ڕستەیە بڵێت لەبەرئەوە تەنها یەك ووشەى (ئاو) بەكاردەهێنێ هەروەها كەدەڵێت (تۆپ) ماناى ئەوەیە (ئەو تۆپەم بدەرێ یارى پێ دەكەم) بەڵام لەبەرئەوەى تواناى ووتنى ئەو ڕستەیەى نیە لەبەرئەوە تەنها دەڵێت (تۆپ)، بەڵام لەسەرەتاى ساڵى دووهەمى تەمەنى بەدواوە دەتوانێت دوو ووشەو سێ ووشەو....هتد بەكار بهێنێ و یەكەمجار منداڵ تەنها ناو بەكاردەهێنێت دواجار كردار، چونكە ناو ئاسانترەو وەك كردار (ڕوودان) و (كاتى) تێدا نیە.

## دەوڵەمەندی و هەژاری زمانی منداڵ

ئەم هۆکارانەی لای خوارەوە کار لەگەشەکردن و پاراوی و دەوڵەمەندی زمانی منداڵ دەکەن:-

١) تەمەن:-

تامنداڵ تەمەنی زیاتر بێت، ئەوەندە سەرمایەی ووشەو زمانی زیاتر دەبێت و دەتوانێت زیاتر زاڵ بێت بەسەر ڕێزمان و ژمارەی ووشەکان و چۆنیەتی دەربڕینیان. واتە منداڵی (٣) سێ سالان زمانی دەوڵەمەندترو پاراوترە لەمنداڵی (٢) دوو سالان، بێگومان ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی بەهێزی نێوان تەمەن و پێگەیشتن و کاملی، بەتایبەتی پێگەیشتن و کاملی کۆئەندامی قسەکردن و زمان و ژیری و زیاد بوونی شارەزایی و زانیاری منداڵ.

٢) تەندروستی:-

ئەو منداڵەی تەندروستی باش بێت و بەردەوام نەخۆش و لاواز نەبێت، ئەوا چالاکی قسەکردنو یاریکردنی بەووشەکانی زیاتردەبێتو دواجاریش زمانی پاراوتر دەبێت، بەلام ئەگەر بەردەوام نەخۆش و پەککەوتەو کەم جووڵە بوو ئەو کاتە تاقەتی قسەکردن و یاریکردن بەووشەکانی نابێت و زیاتر سەرقاڵی جەستەو باری تەندروستی دەبێت و سەرمایەی زمانو پاراوی وەکە منداڵێکی ئاسایی نابێت.

٣) تۆخم:-

دەرئەنجامی توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوەدەکەن کەگەشەکردنی زمانی کچ لەکوڕ خێراترە بەتایبەتی لەپێنج (٥) سالی یەکەمدا، هەروەها ژمارەی ئەو ووشانەی کەکچ دەیزانێت زیاترە لەژمارەی ئەو ووشانەی کە کوڕ دەیزانێت و ڕستەی کچ درێژ ترە لەو ڕستانەی کە کوڕ بەکاری دەهێنێ.

٤) زیرەکی:-

پەیوەندیەکی پتەو هەیە لەنێوان زیرەکی و توانای زمان و دەوڵەمەندی، دەرکەوتووە ئەو منداڵانەی زۆر زیرەکە و بلیمەتن زووتر فێری زمان دەبن و زمانیشیان زۆر پاراوو دەوڵەمەندترە لەمنداڵی ئاسایی، هەروەها منداڵی ئاسایی گەشەکردنی زمانی خێراترە لەگەشەکردنی زمانی منداڵی گەمژەو دەبەنگ و دواکەوتوو، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە هەر چ منداڵێک کەم و کورتی لەگەشەکردنی زمانیدا هەبوو ئەوە دەبەنگ و گەلحۆیە، بەڵکو کۆمەڵێک هۆکاری تر هەیە کەکار لەزمان دەکەن بێجگە لەزیرەکی.

٥) ژینگەی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری :-

بێگومان ئەو منداڵانەی لەژینگەیەکی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری پێشکەوتوودا دەژین، زمانیان پاراوترو دەوڵەمەندتر دەبێت لەو منداڵانەی کە لەژینگەیەکی دواکەوتوودا دەژین، لەبەرئەوەی ژینگەی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری پێش کەوتوو زیاتر هانی منداڵ دەدات و تاکەکانی ئەو ژینگەیە بەردەوام نموونەی زمان پاراوی دەبن بۆ لاسایکردنەوەی منداڵەکانیان و هەڵەکانی زمانیان بۆ ڕاست دەکەنەوەو بەڕاستی فێری ڕێزمانیان دەکەن و ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و خۆ ڕۆشنبیری کردنی وەک پەڕاو گۆڤارو ڕۆژنامەو ڕادیۆو تەلەفزیۆن....هتد. زیاتر لەژینگەی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری پێش کەوتوودا هەیەو دەبێتە هۆی دەوڵەمەندی زمانی منداڵەکانیان بەڵام ژینگەی دواکەوتوو زمانی منداڵ دەشێوێنێ و پشتگیری و هانی منداڵ نادات و هەڵەکانی بۆ ڕاست ناکەنەوەو نموونەی هەڵەو دواکەتوو دەبن بۆ منداڵەکانیان.

## قۆناغەکانی گەشەکردن لەلای ئەریکسۆن

ئەریکسۆن یەکێکە لەو کەڵە زانایانەی کە هەوڵی داوە پرۆسەی گەشەکردن و بنیاتنانی کەسایەتی مرۆڤ بەسەر هەشت قۆناغدا دابەش بکات، هەر قۆناغەو خاسیەت و سیماتی تایبەتی خۆی هەیەو دەبێت بەبناغە بۆ قۆناغی دواترو هەندێك گرفتی تایبەتی خۆی هەیەو بڕین و سەرکەوتن بەسەر گرفتەکانی ئەو قۆناغەدا دەبێت بەهۆکارێکی یارمەتیدەر بۆ پەڕینەوە بۆ قۆناغێکی تر، بەلام سەرنەکەوتن بەسەر گرفتەکان و هەرس نەکردنی پێداویستیەکانی هەر قۆناغێك دەبێت بەکۆسپ و ڕێگر بۆ قۆناغەکانی تر. هەرچەندە تیۆرەکی ئەریکسۆن ڕەگو ڕیشەو سەرچاوەی لەقوتابخانەی شیتەڵ کردنەوەی دەروونی فرۆیدەوە وەرگرتووەو کاریگەری ئەو تیۆرەی بەسەرەوەیە، بەلام ئەریکسۆن بەسەرکەوتوانە بەرگ و کالای رۆشنبیری و کۆمەلایەتی بەبالایدا بڕیوەو ڕۆڵی هۆکاری رۆشنبیری و کۆمەلایەتی وەك (فرۆید) پشت گوێ نەخستووە، بەپێ ی راو بۆچوونەکانی ئەریکسۆن ئەو مندالەی کە رەوشت و رۆڵی پۆزەتیڤانە بێت لەو قۆناغەی کە پیایدا تێدەپەڕێت، ئەوە مندالێکی ئاسایی و دوور لەگرفتی دەروونی دەبێت. قۆناغەکانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:

### ١- قۆناغی بڕوا بەخۆبوون لەبەرانبەر بڕوا بەخۆنەبوون:

یەکەم پێکهاتەی کەسایەتی سەرکەوتوو هەست کردن بەخودو بڕوابوونە پێی، گونجاوترین کاتیش بۆ چاندنی تۆوی بڕوا بەخۆبون لەناخ و دڵ و دەروونی مندالدا سالی یەکەمی ژیانیەتی. گەشەکردنی بڕوا بەخۆبوون پەیوەستە بەپەیوەندی نێوان مندال و کەسانی چوار دەوری بەتایبەتیش دایك لەسالی یەکەم، ئەگەر مندال لەقۆناغی شیرەخۆریدا هەستی بەدلنیایی و ئارامی کردوو تێربوو لەشیری مەمکی دایکی و هەستی بەباوەشی گەرم و سۆزو خۆشەویستی کرد، ئەوا تۆوی بڕوا بەخۆبون و هەست کردن بەدلنیایی لەناخیدا سەوز دەبێت، بەلام ئەگەر مندال لەم قۆناغەدا تووشی بێزراوی و

لێدان و سووکایەتی پێ کردن و پشت گوێ خستن بوو، لەکاتی شیرخواردندا هەستی بەدڵنیایی و ئارامی و خۆشەویستی و سۆزی دایك و کەسانی چواردەوری نەکرد، ئەوا تۆوی بڕوا بەخۆنەبوون و گومان و دوودڵی لەناخیدا دەچێنرێ و بڕوای نەك هەر بەخۆی بەڵکو بڕوای بەکەسانی تریش نابێت. وە نموونەش زۆرە کە بتوانین لەمیانەیانەوە هەست بەبڕوا بەخۆبوونی منداڵ بکەین، بۆ نموونە ئەگەر منداڵ بڕوای بەخۆی ببێت ئەوا لەدەورویەری مانگی چوارەمی ژیانیدا، کاتێك برسی دەبێت و لەهەمان کاتدا گوێ بیستی پێیەکانی هاتنی دایکی دەبێت، ئەوا یەکسەر نیشانەی کامەرانی و دڵخۆشی لەدەم و چاویدا دەردەکەوێت و پێش بینی ئەوە دەکات کە کەسێك هەڵی دەگرێت و خواردنی دەداتێ و لەبرسیەتی رزگاری دەکات، ئینجا دووبارەبوونەوەی ئەم شارەزاییە (واتە برسێتی ئینجا خواردن، رزگاربوون لەگرژی و برسێتی، هەست کردن بەتێری و کامەرانی) وا لەمنداڵ دەکات کە بگاتە ئەو رایەی کە ئەو جیهانەی ئەو تیایدا دەژی جیهانێکی پڕ لەکامەرانی و دڵنیاییە (جابر، ١٩٧٧، ص٥٣). لەبەرئەوە زۆر گرنگە کە دایك لەم قۆناغەدا ئاگای لەمنداڵەکەی بێت و نەهێڵێت هەست بەبێزاری و بێ بەش بوون بکات و سۆزو خۆشەویستی پێویستی پێ بدات و پەیوەندی مرۆڤانە بێت لەگەڵیاو نەهێڵێت هەست بەترس و تەنیایی و دوودڵی بکات، بۆ ئەوەی تۆوی بڕوا بەخۆبوون لەناخیدا سەوز ببێت و بەسەرکەوتووانە بگوێزرێتەوە بۆ قۆناغی دووهەم.

## ٢- قۆناغی هەست کردن بەسەربەخۆیی لەبەرانبەر هەست کردن بەشەرم و گومان:

دەبێت منداڵ لەم قۆناغەدا هەست بەسەربەخۆیی بکات و لەشەرم و گومان کردن لەخودی خۆی دووربخرێتەوە. راهێنانی منداڵ لەسەر پرۆسەی دەرهاویشتن و رزگاربوون لەپاشەڕۆ، گەورەترین دەرفەتە بۆ منداڵ کە لەمیانەیەوە فێری سەربەخۆیی و پشت بەستن بەخۆ دەکرێت، لەلای زۆربەمان ئاشکرایە کە شێوازو جۆرەکانی راهێنانی کۆمەڵایەتی جۆراوجۆرەو لەکۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر دەگۆڕدرێت تەنانەت لەهەمان کۆمەڵگادا لەچین و توێژێکەوە بۆ چین و توێژێکی تر دەگۆڕدرێ ئینجا ئەگەر

پرۆسەی راهێنان لەسەر رزگاربوون لەپاشەڕۆ نەرم و نیان و لەسەرخۆبوو، دووربوو لەتوندوتیژی و لێدان و سوکایەتی پێ کردن، ئەوا منداڵ بەشێوەیەکی راست و دروست گەشە دەکات و هەست بەسەربەخۆیی خودی (الاستقلال الذاتي) خۆی دەکات، بەلام ئەگەر پرۆسەی رزگاربوون لەپاشەڕۆ توندوتیژی لەخۆی گرت و منداڵ لەمیانەیەوە تووشی سووکایەتی پێکردن بوو، ئەوا هەست کردن بەشەرم و گومان لەدڵ و دەروونی ئەو منداڵانەدا دروست دەبێت و بەردەوام لەگازاندەو رەخنەو سووکایەتی و پلاری کۆمەڵ دەترسن و گومان لەتوانست و خودی خۆیان دەکەن. لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە خێزان بوارو ژینگەی لەبار بۆ ئەو منداڵە بچکۆلەی بخوڵقێنێ تاوەکو هەست بەسەربەخۆیی خۆی بکات، ئەویش لەرێگەی ئەوەوە کە مافی ئەوەی هەبێت بەسەربەستی بێت و بچێت و هەڵسێت و دانیشێت، ئەو خواردنەی حەزی لێدەکات بیخوات، هەروەها نابێت لەنرخی کەم بکرێتەوەو خاڵە لاوازەکانی بەدیار بخرێت یان زیاد لەپێویست گەورە بکرێت، ئەگەر منداڵ ئەو بوارانەی بۆ رەخسا ئەوا وەك تاکێکی سەربەخۆ هەڵس و کەوت دەکات و بڕوای بەخۆی دەبێت و لەگومان و شەرم و راڕایی رزگاری دەبێت و بەسەرکەوتوانە هەنگاو دەنێت بۆ چوونە ناو قۆناغی سێهەمی ژیانی.

## ٣- قۆناغی دەست پێشخەری و لەخۆییەوە لەبەرانبەر هەست کردن بەگوناە :

ئەم قۆناغە لەساڵی سێهەمەوە تاوەکوو پێنجهەم دەخایەنێت، لەم قۆناغەدا منداڵ زۆر رەوشت و هەڵس و کەوتی گرنگ فێردەبێت، لەوانە چۆنیەتی هاوکاری کردن لەگەڵ کەسانی تر، چۆنیەتی بون بە پاشکۆ یان بەسەرکردە، دەست کردن بەزانین و دۆزینەوەی ژینگەکەی، هەوڵدان بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەندامەکانی لەش و جووڵەکانی. ئەگەر منداڵ لەسەر ئەو هەڵس و کەوتانەی سەرەوە پاداشت و هاندرا، ئەوا خاسیەتەکانی دەست پێشخەری و لەخۆوەی (المبادأة والمبادرة) لەلا دروست دەبێت و رۆژ لەدوای رۆژیش گەشە دەکات و لەداهاتوودا دەبێت بەبناغەیەکی پتەو بۆ کەسایەتی منداڵ، بەلام ئەگەر رێگرو بەربەست و کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم منداڵ و ئەو رەوشت و چالاکیانەی سەرەوەدا دانراو

بەردەوام تێگەیەندرا كە ئەو لەهەموو كارو چالاكیەكانیدا هەڵەیە ئەوا وەك تاكێكی غەمبارو دڵتەنگ گەشەدەكات و تۆوی هەست كردن بەگوناهو شەرمەزاری لەناخیدا دەچێندرێ ( جلال، ١٩٨٥،ص١٧٦).

منداڵ لەرێگەی لاسایی كردنەوەی گەورەكان زۆر رەوشت و سیفاتی كۆمەڵەكەی فێردەبێت و لەمیانەیانەوە هەست بەبوونی خۆی دەكات. هەر لەم قۆناغەدا ویژدان وەك هێزێكی دەروونی ناوەكی دروست دەبێت و ئیتر منداڵ پابەند دەبێت بەبڕیارو هەڕەشەكانی ویژدان و جێگەی ترس و هەڕەشەی دایك و باوك و هێزی دەرەكی بۆ دەگرێتەوە، لەبەرئەوە زۆر گرنگە كە بوار بەمنداڵ بدرێت و لەسەر چالاكی و كردارەكانی هان بدرێت و زۆر بەكەمی ئازارو سزا لەتەكیدا بەكاربهێندرێ، هەروەها نابێت رێگەی پێش بڕكێی لێبگیرێت. ئەم قۆناغە بۆ منداڵ زۆر ناسك و شلۆقە چونكە ئەگەر لەم قۆناغەدا نەیتوانی شارەزای رۆڵی خۆی بێت و زانیاری تەواوی دەربارەی هەندێك لەچالاكی و كارو فەرمانەكانی داهاتووی دەست نەكەوت، ئەوا ناتوانێت لەقۆناغەكانی داهاتوودا بەسەر كۆسپ و گرفتەكانیدا زاڵ ببێت و تەم و مژی ترس و شەرم و گوناه چواردەوری دەگرێت. لەبەرئەوە زۆر پێویستە كە هەست بەدەست پێشخەری و لەخۆوە بەردەوام لەناخیدا پەرەپێبدرێت و ژینگەی گەشەكردنی بۆ دابین بكرێت.

٤- قۆناغی هەوڵدان و بەئاكام گەیاندن لەبەرانبەر هەست كردن بەكەمی:

ئەم قۆناغە دەكەوێتە ناو قۆناغی چوونە قوتابخانەی سەرەتایی واتە لەتەمەنی شەش ساڵیەوە تاوەكو سەرەتای قۆناغی هەرزەكاری بەردەوام دەبێت، لەم قۆناغەدا منداڵ فێری ئەوە دەبێت چۆن رێزو خۆشەویستی كەسانی تری دەست بكەوێت لەبەرئەوەی دەتوانێت بەرهەمی هەبێت ئەویش لەرێگەی سەركەوتنی لەفێربوونی خوێندنەومو نووسین و بیركاری، یان كاتێك بەرهەمێكی دەستی دەبێت. ئەگەر خێزان و قوتابخانە توانیان ژینگەی لەبارو گونجاو بۆ سەركەوتن وهەوڵدان و بەئاكام گەیاندنی چالاكیەكانی منداڵ

بسازێنن و پاداشت و پشتگیریان کردن، ئەوا هەست کردن بەهەوڵدان (الاجتهاد) و بەئاکام گەیاندن (الانجاز) لەلای دروست دەبێت، بەڵام ئەگەر نەیان توانی و منداڵان لەرێگەیانەوە تووشی ئازارو بێزاری و سەرنەکەوتنی یەك لەدوای یەك بوون ئەوا تۆوی هەست کردن بەکەمی لەناخیاندا دەچێندرێ و گیانی هەوڵدان و بەئاکام گەیاندن لەدەروونیاندا لەناو دەبرێت.

ئەگەر قۆناغی پێشوو بە پلەی یەکەم خەوو خەیاڵ و زیندەخەون بووبێت ئەوا منداڵ هەوڵ دەدات لەم قۆناغەدا ئەو خەوو خەیاڵانەی لەکارو کردارێکی واقیعی و پراکتیکیدا بەرجەستە بکات، کەواتە زۆر پێویستە کە ژینگەی لەباری بۆ بخوڵقێندرێ. ئینجا ئەگەر منداڵ لەناو خێزاندا بەباشی پەروەردەو ئامادە نەکرا بۆ چوونە قوتابخانەی یان ژینگەی قوتابخانە هاندەر نەبوو بۆ منداڵ و حەزوو ئارەزووەکانی تێرنەکرد، یان لەسەردەستی مامۆستا تووشی ئازارو سووکایەتی پێکردن بوو، یان بەرنامەو پرۆگرامەکانی قوتابخانە لەسەرو ئاستی توانای منداڵەوە بوو، لەئەنجامی ئەو هۆکارانەی سەرەوە تووشی سەرنەکەوتن و پشت گوێ خستن بوو، ئەوا تووشی هەست کردن بەکەمی دەبێت و دوورنیە لەداهاتووشدا تووشی زۆر گرفتی دەروونی و کۆمەلایەتی و رەوشتی ناکۆمەلایەتی ببێت، بەڵگەش بۆ ئەو قسانەی سەرەوە (یادگارو نووسراوەکانی لاسارەکانن کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ژیانی قوتابخانەیان ناخۆش بووەو مامۆستاکانیان لەتەکیاندا باش نەبوون و وەك هاورێکانی تریان لەخوێندندا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوەو لەدەرەوەی دیواری قوتابخانە زیاتر هەستیان بە دڵنیایی و کامەرانی کردووە، لەبەرئەوە وازیان لەخوێندن هێناوە) (جابر، ١٩٧٧، ص٦٨).

## ٥- قۆناغی هەست کردن بەناسنامە لەبەرانبەر تێك چوونی رۆڵ:-

لەرێگەی راهێنانی کۆمەلایەتیەوە هەموو کۆمەڵگایەك هەوڵدەدات کە تاکەکانیان لەسەر رۆڵی داهاتوویان ڕابهێنن و پیشەو کارو حەزوو ئارەزووەکانیان بۆ دەست نیشان

بكەن، بۆ نموونە كوڕ بەشێوەیەك پەروەردە دەكەن جیاواز لەكچ، لەسەر ئەو بناغەیەی كە ئەو رۆڵەی كوڕ پێی هەڵدەستێت لەداهاتوودا جیاوازە لەو رۆڵەی كە كچ پێی هەڵدەستێت.

ئەم ناسنامەو دۆزینەوەی خودو زانینی رۆڵە، بەشێوەیەكی سەرنج راكێش لەم قۆناغەدا سەرهەڵدەدات و هەرزەكار بەدوایدا دەگەڕێت. ئەم قۆناغە لەسەرەتای قۆناغی هەرزەكارییەوە دەست پێ دەكات، قۆناغی هەرزەكاریش قۆناغێكی ناسك و گرنگە لەژیانی مرۆڤدا، لەبەرئەوەی كۆمەڵێك گۆرانكاری فسیۆلۆژی و جەستەیی و ژیری و كۆمەلایەتی و هەڵچوونی گرنگ تیایدا روودەدات، ئینجا ئەگەر كۆمەڵ و دامەزراوەكانی لە پێشەوەی هەمووشیان خێزان، ژینگەی لەبارو دروست بۆ گەشەكردنی هەرزەكار نەسازێنن، ئەوا هەرزەكار تووشی زۆر گرفتی دەروونی و كۆمەلایەتی و ئابووری دەبێت و لەوانەیە رۆڵی خۆی لێ تێك بچێ و وەك مرۆڤێكی بێ ناسنامەو لاوازو بێ بنەما لەكۆمەڵدا بەشێوەیەكی سادەو لە پەراوێزی روداوەكاندا بژی، بەلام ئەگەر هەرزەكار ناسنامەی تایبەتی خۆی هەبوو، وە زانیشی ئەو كێیەو رۆڵ و جێگاو رێگای خۆی دۆزییەوەو پلەو پایەیەكی لەناو كۆمەڵەكەیدا هەبوو، هەستی بەسۆزو خۆشەویستی كەسانی چوار دەوری كردوو، دەستەو تاقم و كۆمەڵی خۆی هەبوو، شانازی بەچوونە ناوكۆمەڵ و دامەزراوەكانیەوە كرد، ئەوە ئەو كاتە رۆڵی خۆی و ناسنامەی دەزانێ و بەسەلامەتی دوور لەگرفت و ئەندێشە قۆناغی هەرزەكاری دەبڕێت. بەلام بەداخەوە هەندێك جار هەرزەكار لەئەنجامی هەندێك هۆكاری دەرەكی كە هیچ پەیوەندی بەتوانست و لێهاتوویی و ناسنامەیەوە نیە، تووشی گرفت و ئەندێشەی كۆمەلایەتی دەبێت و رۆڵی خۆی لێتێك دەچێت و لەناو كۆمەڵەكەیدا هەست بەئارامی و دڵنیایی ناكات و خۆی بەكەسێكی نامۆ دەزانێت، هۆكارەكانیش زۆرن لەوانە (توخم، رەگەز، رەنگ، چین و توێژی كۆمەلایەتی، زمان، باری ئابووری....هتد).

ئینجا لەهەرچ كۆمەڵگایەكدا، هەرزەكار لەئەنجامی ئەو هۆكارانەی سەرەوە هەستی بەنامۆیی و كەمی و خەم و خەفەت و ئازار كردوو، ئەو هەستەی لا دروست بوو كە تاكێكی بێزراوو پشت گوێ خراوو كەم توانایە، ئەوا رۆڵ و ناسنامەی لێتێك دەچێت و ئیتر یان

هەرزەكاریكی سەرەڕۆو لاسارو شەڕخواز یان تاكێكی گۆشەگیرو دوورە پەرێزو غەمبار دەبێت، لەهەردوو حاڵەتەكەدا ناتوانێت بەشێوەیەكی راست و دروست خۆی لەتەك كۆمەڵەكەیدا بسازێنێ.

## ٦- قۆناغی هاوكاری و یەكگرتن لەبەرانبەر گۆشەگیری:-

لەم قۆناغەدا باشترین بوار بۆ هاوڕێیەتی و دۆستایەتی و پێك هێنانی خێزان و دۆزینەوەی هاوسەری ژیان دەڕەخسێت و تاكیش خۆی ئامادەباشیەكی زۆری تێدایە بۆ ئەو یەكگرتن و دۆستایەتی و هاوپەیمانێتیە. ئەگەر تاك لەقۆناغی پێشودا سەركەوتوو بوو، هەستی بەخودی خۆی و ناسنامەكەی كردبوو، كۆسپ و تەگەرە نەخرابێتە بەردەمی ئەوا بەئاسانی دەتوانێت ئەم قۆناغە ببڕێت،، چونكە تاك لەوون كردن و دۆڕاندنی خودو ناسنامەی خۆی ناترسێت، لەبەرئەوەی ژن هێنان یان شووكردن یەكگرتنی دوو خودە لەخودێكی تازەدا بەبێ ئەوەی هیچ یەكێك لەو دوو خودە خۆیان بدۆڕێنن یان لەدەست بدەن. ئینجا ئەگەر تاك بەسەلامەتی و سەركەوتوانە بەقۆناغەكانی پێشوودا تێنە پەڕیبوو، ئەوە بەردەوام ترسی لەدەست دانی خودو ناسنامە سەرو دڵی دەگرێت و سەركەوتوو نابێت لەهەڵبژاردنی هاوسەرو دۆست و هاوڕێی، هەر لەبەر ئەوەشە تەنیایی و گۆشەگیری و دوورە پەرێزی بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت ( جلال، ١٩٨٥، ص١٧٧-١٧٨).

رۆشنبیری و ژینگەی كۆمەڵایەتی و ئابووری رۆڵی سەرەكی لەسەركەوتن یان سەرنەكەوتن بەسەر ئەو قۆناغانەی پێشوودا دەبینن. ئەگەر تاك لەكۆمەڵگایەكدا بژی بەردەوام سەركوت بكرێت و ئازادی و سەربەستی و سەربەخۆیی زەوت بكرێت و هەردەم لەژێر هەڕەشەو چاو سووركردنەوەو توندوتیژیدا ژیان بەسەربەرێت و بواری داهێنان و گوزارشت كردن لەخودو دۆزینەوەی ناسنامەی پێنەدرێت و گیروگرفتی كۆمەڵایەتی و ئابووری تر سەرو دڵی گرتبێ، ئەوا بەهیچ شێوەیەك ئەو كەسە مرۆڤێكی سوودبەخش و داهێنەرو كۆمەڵایەتی و دەروون دروستی لێدەرناچێت، لەبەرئەوە ئەگەر كۆمەڵ بیەوێت تاكەكانی

لەژیاندا دەروون ساغ و سەرکەوتووبن، دەبێت ئەو کۆسپ و تەگەرانەی سەرەوە لەرێگایان لابدەن و بواری گەشەکردنیان بۆ بڕەخسێنن و بەگیانێکی برایانەو دیموکراسیانە گۆشیان بکەن.

## ٧- قۆناغی باوکایەتی و بەرهەم هێنان لەبەرانبەر وەستان و نەبەکامی:-

مەبەست لەم قۆناغە هەلگرتنی بەرپرسێتی منداڵ بوون و بەخێوکردنیان و دابین کردنی پێداویستیە گرنگەکانیان و چاودێری کردنیان و پێدانی سۆزو خۆشەویستیە بەمنداڵەکان، بەلام ئەو دایك و باوکانەی کە منداڵەکانیان پشت گوێ دەخەن و ناتوانن رۆلی باوکایەتی و دایکایەتی بگێرن و لەژیانی خێزانیاندا سەرنەکەوتوون، ئەوە ئەو جۆرە دایك و باوکانە بەهیچ شێوەیەك ناتوانن ببن بەکەسێکی بەرهەم هێنەرو خولقێنەر، کە ئەمەش بۆ باش پەروەردە نەکردنی ئەو دایك و باوکانە لە قۆناغەکانی پێشوتر دەگەرێتەوە (جلال ،١٩٨٥،ص١٧٨) لەبەر ئەوەی باوکایەتی و دایکایەتی تەنها مانای توانای منداڵ بوون نیە، بەلکو مانای بەخێوکردن و پەروەردەکردنی ئەو منداڵانەو گێرانی رۆلی باوك و دایکی راستەقینەیە، بەلگەی زۆریش لەو بارەیەوە هەیە، کە زۆر باوك و دایك هەن خاوەن منداڵن بەلام کەمتەرخەم و نەشارەزان و هەست بە لێپرسراویەتی ناکەن و هەست ناکەن کە منداڵەکانیان ئەمانەتن لەئەستۆیانداو بنیاتنانی کەسایەتیان ئەرکی سەرەکیانە. هۆی سەرەکی ئەو سەرنەکەوتنەی دایك و باوك دەگەرێتەوە بۆ قۆناغەکانی تر، چونکە ئەگەر مرۆڤ خاوەنی ناسنامەی خۆی نەبێت و بڕوای بەخۆی و توانستەکانی بەهێز نەبێت و بەچاوی گومان و دوودڵیەوە بڕوانێتە خودی خۆی و دیاردەکانی ژیان، ئەوا بەهیچ شێوەیەك مرۆڤێکی بەرهەم هێنەرو خولقێنەر نابێت و بە پێچەوانەوە وەك منداڵ و هەرزەکار هەلس و کەوت دەکات و لەگەل منداڵەکانیدا دەکەوێتە ململانێ و پێش برکێ لەجیاتی پەروەردە کردن و گێرانی رۆلی باوکایەتی و دایکایەتی، ئینجا ئەگەر بەوورەی لەسەرنەکەوتنی ئەو دایك و باوکانە بکۆلێنەوە ئەوا دەگەینە ئەو بڕوایەی کە نەبوونی ژینگەی لەبار بۆ گەشەکردن دەبێتە هۆی هەرەس هێنان و سەرنەکەوتنی مرۆڤ لەگشت

مەبەست لەژینگەی لەباریش (دابین کردنی پێداویستیە گرنگەکانی بوارەکانی ژیاندا، مەبەست لەژینگەی لەباریش (دابین کردنی پێداویستیە گرنگەکانی ژیاندا، يەکسانی، برِوا بەخۆبوون، سووکایەتی پێنەکردنی تاك، مرۆڤەو ڕێزگرتن و، دادوەری، يەکسانی، بڕوا بەخۆبوون، سووکایەتی پێنەکردنی تاك، دڵنیابوون و بڕوابوون بەپاشەڕۆژ، هەست کردن بەئەمن و ئاسایشە) کە سەرجەم ئەو هۆکارانە بەرپرس و زامنی مرۆڤايەتی مرۆڤن و وای لێدەکەن کە کاڵای مرۆڤایەتی و خۆنەویستی و خۆشەویستی نیشتمان و تاکەکانی تری کۆمەڵ بەباڵایدا ببڕدرێت و تاکێکی بەرهەم هێنەرو خوڵقێنەر دەربچێت.

## ٨- قۆناغی کامڵی و پتەوی خود لەبەرانبەر هەست کردن بەبێ هیوایی و هەرەس هێنان:-

ئەم قۆناغە بەترۆپك و پلە پۆپەی قۆناغەکانی پێشوو تەواوکەریان دادەنرێت. کامڵی و پتەوی خود مانای بەرەنگار بوونەوەی ژیان و خۆسازاندن لەتەکیداو مامەڵە کردنێکی واقیعیانەیەو رازی بوونە لەخودو بڕوا هێنانە بەتوانستەکانی. لەلایەکی تریشەوە ئەو کەسە لەژیاندا بەختەوەرەو شانازی بەبەرهەم و داهێنانەکانیەوە دەکات. هەروەها ئەو کەسانەی کە خودێکی پتەوو کامڵیان هەیە رێزی دایك و باوکی خۆیان دەگرن و لێیان وەڕس نابن و دڵسۆزو بەوەفان بۆیان، هەروەها ئەو مرۆڤانە خاوەنی فەلسەفەو بۆچوون و کەرامەت و بیروباوەڕی تایبەتی خۆیانن و ئامادەن لەپێناویادا خۆیان بەخت بکەن و بەرەنگاری هەموو کۆسپ و بەربەستەکان ببنەوە بەبێ ئەوەی هەست بەبێ هیوایی و هەرەس هێنان بکەن. بەڵام ئەو کەسەی خاوەنی خودی کامڵ و پتەوی خۆی نەبێت، ئەوا بەردەوام لەبارێکی دەروونی ئاڵۆزدا دەژی و لەمردن دەترسێ و هەر کاتەو خەریکی پیشەو کارێکەو بەردەوام هەوڵی گۆڕینیان دەدات و بیروباوەڕو فەلسەفەیەکی نیمچە نەگۆڕیان نیەو لەچارەنووس و پاشەڕۆژی خۆیان دڵنیانین و زۆرجار هەست بەبێ هیوایی و رەش بینی دەکەن.

ئەمانەی سەرەوە ئەو قۆناغانەن كە (ئەرك ئەریكسۆنی) زانا دیاری كردوون و لەو بڕوایەدایە كە هەموو مرۆڤێك بەو قۆناغانەدا تێدەپەڕێت و هەر قۆناغێكیش دەبێت بەتەواوكەری قۆناغی پێشوترو بناغەی قۆناغی داهاتوو. بەڵام نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت كە هەموو كات لەتوانادا هەیە دەلاقەو كەلێنەكانی كەسایەتی تارادەیەكی باش پڕ بكرێتەوە، واتە ئەگەر مرۆڤ لەیەكێك لەقۆناغەكانی ژیانیدا تووشی نووقستانی و كەم و كورتی بوو ئەوا دەتوانێت لەقۆناغەكانی تردا قەرەبووی بكاتەوە بەمەرجێك ژینگەی لەباری بۆ بخولقێندرێ و بنەماكانی سەركەوتنی بۆ دابین بكرێت. بەڵگەی زۆریش لەو بارەیەوە هەیە، زۆربەی دەرئەنجامی توێژینەوەكان و لیستی ناوی نەخۆشەكانی پزیشكە دەروونیەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە زۆر لەو مرۆڤە دەروون نەخۆشانەی چاوپێكەوتنیان لەگەڵ كراوە، دوای هەوڵدانێكی زۆرو چاككردنی ژینگەی خێزانی و كۆمەڵایەتیان، پێش كەوتنێكی باشیان بەدەست هێناوەو لەبڕوا بەخۆنەبوون و ڕەش بینی و بێ هیوایی و پاشكۆیی و هەست بەكەمی كردن ڕزگاریان بووەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش زیاتر گەشەیان كردووە.

## ﴿پرۆسەی فێر بوونی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی (Gender)﴾

منداڵ لەو ڕۆژەوە کە لەدایك دەبێت، لەڕێگەی ڕاهێنانی کۆمەڵایەتیەوە (التنشئة الأجتماعية) فێری زۆربەی داب و نەریت و بەها کۆمەڵایەتیەکانی دەکەن. یەکێکیش لەگرنگترین لایەنە کۆمەڵایەتیەکان کە منداڵ فێری دەکرێت ڕۆڵی کۆمەڵایەتی (الدور الاجتماعی).

مەبەستیش لەڕۆڵی کۆمەڵایەتی ئەو پرۆسەیە کە منداڵ لەڕێگەیەوە فێری ئەو بیرو باوەڕو هەست و سۆزو چالاکیانە دەکرێت کە لەکۆمەڵگاکەیدا گونجاوو شیاوە بۆ توخمەکەی، ڕۆڵی کۆمەڵایەتی بەچەندەها شێواز پێناسە کراوە لەوانە:-

١. فریمان/ لەو بڕوایە دایە کە ڕۆڵی کۆمەڵایەتی بریتیە لەحەزو ئارەزووی تاك بۆ ئەو بەهاو بابەتانەی کە گونجاوە بۆ توخمەکەی. (Freeman & others ; ١٩٧٥, P; ١٠٥).

٢. لیڤیتین/ دەڵێت ئەو ڕەوشتەیە کە گونجاوو شیاوە بۆ توخمێك و لەهەمان کاتدا نەگونجاوو نەشیاوە بۆ توخمەکەی تر (Levitin ; ١٩٧٢; P: ١٣٠٩).

٣. بارۆن/ ئەو پرۆسەیە کە لەمیانەیەوە منداڵان فێری ناسنامەو ڕۆڵی کۆمەڵایەتی خۆیان دەکرێن. (Baron ; ١٩٨٠ ; P : ٣٩٠).

لەبەر ڕۆشنایی ئەو پێناسانەی سەرەوە دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە زۆربەی زۆری ئەندامانی هەموو کۆمەڵگایەك (پێش کەوتوو بێت یان دواکەوتوو)، ئەگەر بەشێوەیەکی هەستی بێت یان نەستی (اللاشعور)، لەسەر ئەوە کۆکن کە دەبێت هەڵس و کەوت و بیر کردنەوەی نێرەکان لەهەندێك لایەنەوە لەمێیەکان جیاوازبن (کونجر، ١٩٧٠، ص٢٣٢). بۆ ئەم مەبەستەش زۆر جار پەنا بۆ سزادانی ڕەوشتی نەشیاو بۆ توخمی منداڵ و پاداشت کردنی ڕەوشتی گونجاو بۆ توخمی منداڵ دەبەن. کەواتە مەبەست لەپرۆسەی فێربوونی ڕۆڵی سێکسی ئەوەیە کە کوڕو کچ فێری ئەو چالاکی و یاری و پیشەو جل و بەرگانە بکرێن، کە شیاوو دروستن بۆ توخمەکانیان.

## ئامرازەکانی فێر کردنی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی:

خێزان و دام و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی تری کۆمەڵ، بەم شێوازو ئامرازانەی خوارەوە منداڵ فێری ڕۆڵی کۆمەڵایەتی دەکەن:-

### ١. سزاو پشت گوێ خستن:

دایك و باوك لەسەر ئەوە کۆکن کە دەبێت کوڕ وەك توخمی نێر هەڵس و کەوت بکات و ڕەوشتی پیاوانە بێت و لەهەمان کاتیشدا کچ وەك توخمی مێ بجووڵێتەوە، بۆ ئەوەی تاکێکی سوود بەخش و دەروون دروست بێت لەناو کۆمەڵەکەیدا، ئینجا هەر چ کاتێك منداڵ بەپێچەوانەی ئەو بەهاو پێوەرانە هەڵس و کەوتی کردو ئەو سنوورەی بەزاند کە بۆی دیاری کراوە، ئەوە دەکەوێتە بەر هەڕەشەو سزاو ڕق و کینەی دایك و باوك و کەسانی چواردەور. بۆ نموونە ئەگەر کوڕ لەزۆر هەڵس و کەوتدا لاسایی دایکی کردەوە، ئەوا لێی قبوڵ ناکرێت و ڕووبەڕووی بێزراوی و پشت گوێ خستن دەبێتەوە. ئینجا لەبەر ئەوە منداڵ بەناچاری و لەترسی سزاو ئازاری کەسانی چواردەوری، پەنا بۆ ئەو ڕەوشت و بیر کردنەوەو پیشانە دەبات کە لەگەڵ داب و نەریت و بەهای کۆمەڵەکەیی و توخمەکەی خۆیدا دەگونجێت و لەو شتانە دوور دەکەوێتەوە کە لەگەڵ خاسیەتەکانی توخمەکەیدا (وەك نێر یان مێ) ناگونجێت.

### ٢. دەست کەوتنی سۆزو خۆشەویستی:

هاوشان لەگەڵ سزاو ئازار، زۆربەی دایکان و باوکان پەنا بۆ پاداشت کردنی ڕەوشتە گونجاوەکانی منداڵەکانیان دەبەن، بەم شێوەیەش منداڵ لەوە تێدەگات، ئەگەر وەك کەسانی سەر بەتوخمەکەی خۆی هەڵس و کەوت بکات، ئەوا سۆزو خۆشەویستی و ڕەزامەندی دایك و باوك و کەسانی چواردەوری دەست دەکەوێت، ئینجا لەبەر ئەوەی منداڵ

پێویستیەکی زۆری بەسۆزو خۆشەویستی و بەزەیی کەسانی چواردەوریەتی، بۆیە زۆر جار بەناچاری پەنا بۆ ئەو ڕەوشت و هەڵس و کەوتانە دەبات، کە دەبنە مایەی ڕەزامەندی دایک و باوک، لەهەمان کاتیشدا لەو کارو کردەوانە دوور دەکەوێتەوە، کە دەبنە مایەی ڕەنجاندن و لەدەست دانی سۆزو خۆشەویستی دایک و باوک.

## ۲. خۆخستنە شوێن:

مەبەست لەخۆخستنە شوێن (التقمص)، ئەو میکانیزمە دەروونیەیە، کە لەمیانەیدا منداڵ (بیر کردنەوەو، هەست کردن و ڕەوشت و هەڵس و کەوتی) کەسێك یان کۆمەڵێکی تر، بەموڵکی خۆیی و بەخاسیەت و سیفاتی خۆی دەزانێ. شایانی باس کردنە کە زۆر جار خۆخستنە شوێن لەسەر ئاستی نەستی (اللاشعور) ڕوو دەدات و تاك هەستی پێ ناکات.

منداڵ لەڕێگەی خۆخستنە شوێنەوە، زۆر ڕەوشت و سیفات و خاسیەتی دایك و باوکی فێر دەبێت بەتایبەتیش (هی ئەوەیان کە وەك توخمەکەی خۆی وایە)، واتە بەزۆری کوڕ لاسایی باوکی و کچ لاسایی دایکی دەکاتەوەو لەڕێگەی خۆخستنە شوێنی ئەوانەوە زۆر شت لێیانەوە فێر دەبێت، چونکە کاتێك کوڕ لاسایی باوکی دەکاتەوە ئەوا دەبێتە مایەی ڕەزامەندی دایك و باوك و لەلایەکی تریشەوە کوڕ هەست بەو لێك چوونیەی نێوان خۆی و باوکی و کچیش بەو لێك چوونیە جەستەییەی نێوان خۆی و دایکی دەکات، کە ئەمەش دەبێت بە پاڵنەرێکی تر بۆ ئاسانکردنی پرۆسەی خۆخستنە شوێن.

## چۆنیەتی گەشەکردن و دەرکەوتنی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی:-

گومانی تێدا نیە کە منداڵ دوای لەدایك بوون هیچ شتێك دەربارەی کۆمەڵ و داب و نەریتەکانی نازانێت، بەڵام ئامادەباشی ئەوەی هەیە کە فێری زۆربەی دیاردەکانی ژیان و کۆمەڵەکەی ببێت، واتە منداڵ لەسەرەتای ژیانیدا هیچ شتێك دەربارەی ڕۆڵ و کارو

فەرمانەکانی نازانێت بەڵکو کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی (لە پێشەوەی هەمووشیان خێزان) رۆژ لەدوای رۆژ فێری دیاردەکانی ژیانی دەکەن، یەکێکیش لەو داواکارییانە ئەوەیە کە دەبێت منداڵ فێری رۆڵی کۆمەڵایەتی خۆی ببێت. منداڵ تاسالی دووهەمی ژیانی زۆر بەزەحمەت دەتوانێت هەندێک شتی سادە دەربارەی رۆڵی کۆمەڵایەتی فێر ببێت هەرچەندە زانایان (کۆهن و هاوڕێکانی) (Kuhn & others ; ١٩٧٨) لەئەنجامی یەکێک لەتوێژینەوەکانیان گەیشتنە ئەو راستیەی کە منداڵان لەتەمەنی (٢) دووساڵیدا هەندێک زانیاری بنەڕەتی دەربارەی رۆڵە کۆمەڵایەتیە گونجاوەکانی ناو کۆمەڵەکەیان دەزانن.

هەروەها خاتوو (لندا دافیدۆف)یش لەو بڕوایە دایە کە منداڵانی تەمەن (٢) دوو ساڵان زۆر شتی (وەك جل و بەرگ و یاری و... هتد) گونجاو بۆ توخمی خۆیان لەخێزانەکانیانەوە فێر بوون (دافیدوف، ١٩٨٣، ص٧٦٨).

بەڵام گومانی تێدا نیە منداڵی تەمەن (٥) پێنج ساڵان زۆر شت دەربارەی ئەو چالاکی و جل و بەرگ و یارییانە دەزانێت، کە گونجاوە بۆ توخمەکەی (وەك توخمی نێر یان مێ)، وە لەگەڵ بەهاو داب و نەریتی کۆمەڵەکەشی دەگونجێت وەك (یاری کردن بەچەك و بووکە شووشە، کەرەستەکانی چێشتخانە، کەل و پەلی درومان کردن، کەرەستەی بیناسازی و خانوو دروست کردن، چاودێری کردن و بەخێو کردنی منداڵی ساوا، جل و بەرگ لەبەرکردن... هتد)، ئینجا ئەگەر لەتەمەنی (٤-٥) چوار پێنج ساڵاندا ئەو یاری و چالاکی و کەل و پەلانەیان پیشان بدرێت و داوای ئەوەیان لێبکرێت کە هەندێك هەڵبژێرن، ئەوا زۆر بەئاسانی زۆربەیان ئەو کەل و پەل و یاری و چالاکیانە هەڵدەبژێرن کە گونجاوو شیاوە بۆ توخمەکەیان، واتە کورەکان حەز بەدەمانچەو تفەنگ و کەل و پەلی بیناسازی و میکانیکی دەکەن بەڵام کچەکان بووکەشووشەو لانك و کەرەستەی چێشت خانەو تەنورەو چاودێری منداڵی ساوا بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن: (Mussen & others ; ١٩٦٣).

زانیاریەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ڕێژەی (٣/٢) تا (٤/٣) سێ لەسەر چواری منداڵان لەتەمەنی (٣) سێ ساڵیدا، دەتوانن کە توخمی خۆیان بزانن کە گوایە (کوڕن) یان (کچ) وە پرۆسەی ناسینی توخم لەسەرخۆیەو وورده وورده گەشە دەکات. لەتەمەنی (٢) دوو ساڵیەوە دەست پێدەکات وە لەسێ (٣) ساڵیدا بەڕوون و ئاشکرایی دەردەکەوێت و لەتەمەنی (٥) پێنج ساڵیشدا زۆربەی منداڵان دەتوانن هەردوو ڕۆڵی بایۆلۆژی و دەروونی نێرو مێ لەیەکتری جیا بکەنەوە. (Brown, ١٩٦٤).

بەم شێوەیە منداڵ فێری ڕۆڵی داهاتووی دەکرێت و هەموو شێوازێکیش (لەترس و هەڕەشەو چاو سوور کردنەوەو پاداشت و هاندان) بۆ سەرکەوتنی ئەو پرۆسەیە بەکار دەهێنرێت. ئا لێرەدا پرسیارێك خۆی قووت دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە بۆچی هەموو کۆمەڵگاکان بەو شێوەیە گرنگی بەفێر بوونی ڕۆڵی سێکسی دەدەن، باشە نابێت هەردوو توخمەکە لەزۆر چالاکی و حەزو ئارەزوودا وەك یەکن بن؟ لەوەلامی ئەو پرسیارەدا زۆربەی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایانە دەڵێن، لەبەرژەوەندی کۆمەڵ و بەردەوام بوونی ژیانی ئاساییدایە کە دەبێت هەر توخمە کارو چالاکی و حەزو ئارەزووی تایبەتی خۆی هەبێت و نابێت هیچ توخمێك دەست بخاتە کارو فەرمانی توخمەکەی تر، ئەگینا شیرازەی کۆمەڵ و خێزان تێك دەچێت، لەلایەکی تریشەوە بونیادی جەستەیی و فیسۆلۆژی هەردوو توخمی نێرو مێ لە زۆر لایەنەوە جیاوازن لەیەکتری، کە ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە هەندێك کارو چالاکی بۆ نێر گونجاوترو باشتر بێت وەك لەمێ وە بە پێچەوانەشەوە.

ڕاستە هەندێك کارو چالاکی و پیشەی هاوبەش لەنێوان هەردوو توخمی نێرو مێ دا هەیەو لەتوانای هەردووکیاندا هەیە بیکەن، بەڵام ئەوەی کە لێرەدا مەبەستمانە ئەو کارو پیشەو چالاکیانەیە کە تام و چێژ دەدەن بەژیان و بنەماو بناغەی فسیۆلۆژی و دەروونی تایبەتی خۆیان هەیە. جیاکردنەوەی هەردوو توخمی نێرو مێ و دیاری کردنی ڕۆڵەکانیان هەر لەدوای لەدایك بوونەوە دەست پێ دەکات، ئەویش بەوەی کە هەر لەیەکەم ڕۆژی لەدایك بوونی منداڵەوە دایك و باوك بەدوای ناوی گونجاوو لەبار بۆ توخمی منداڵەکەیان

دەگەڕێن. لەلاى هەمووشمان ئاشكرايە كە لەناو زۆربەى كۆمەڵگاكانى جيهاندا ناوەكانى نێرو مێ لەيەكترى جياوازن، ئينجا دواى ئەوە دايك و باوك و كەسانى چواردەورى منداڵ جل و بەرگ و يارى تايبەتى و گونجاو بۆ منداڵەكانيان دەكڕن، بۆ نموونە ئەگەر كوڕ بێت ئەوا جۆرە جل و بەرگێكى لەبەر دەكەن و بەشێوەيەك پرچى شانە دەكەن و دەيڕازێننەوە كە جياواز بێت لە كچ، هەروەها دەچن (تفەنگ و دەمانچەو ماشێن و خەنجەرو... هتد) بۆ كوڕو (بووكە شووشەو لانك و قاپ و قاچاغ و مل وانكەو دەرزى و دەزوو.... هتد) بۆ كچەكانيان دەكڕن. بەم شێوەيە وورده وورده خێزان و دام و دەزگا كۆمەڵايەتيەكانى تر، ڕۆڵى سێكسى منداڵەكانيان ديارى دەكەن.

## گرنگى دايك و باوك لە پرۆسەى فێر كردنى ڕۆڵى كۆمەڵايەتى:

خێزان يەكەم دامەزراوو خانەى كۆمەڵايەتيە كە ڕۆڵى گرنگ لە پەروەردە كردنى منداڵدا دەبينێت، گومانيشى تێدا نيە كە يەكەم كەسى گرنگ لەژيانى منداڵدا دايك و باوكە، لەبەر ئەوە دايك و باوك ڕۆڵى گرنگ و ترسناكيان لەگەشەكردنى ڕۆڵى سێكسى منداڵەكانياندا هەيە، چونكە هەر ئەوانن كە دەبن بە نموونەى سەرەكى و زيندوو بۆ خۆخستنە شوێن و لاسايى كردنەوەى منداڵەكانيان. ئينجا ئەگەر دايك و باوك ڕۆڵى خۆيان لەدەست دابوو يان لەبەر هەر چ هۆيەك بێت لەگەڵ منداڵەكانيان نەژين و دوور بن لێيان، ئەوا كەم و كورتى و نووقستانى زۆر دەكەوێتە كەسايەتى منداڵەكانيانەوە، ئەوەى زياتريش زەرەر بەمنداڵ دەگەيەنێت نەبوونى جێگرە (بديل) بۆ دايك و باوك لەكاتى لەماڵ نەبوون و دووركەوتنەوەيان.

بوونى باوك لەناو خێزاندا تەنها بۆ خۆخستنە شوێن و لاسايكردنەوە پێويست نيە، بەڵكو زۆر زۆريش پێويستە بۆ سزادانى ئەو هەڵس و كەوتاندى كە لەگەڵ توخمى منداڵەكەى ناگونجێت، لەهەمان كاتيشدا بۆ پاداشت كردن و هاندانى ئەو ڕەوشتانەى كە لەگەڵ توخمى منداڵەكەيدا دەگونجێت، چونكە ڕەوشتى (كوڕانە بۆ كچ)و (ژنانە بۆ كوڕ)

خراپەو دەبێت بەڕێگر لەبەردەم خۆسازاندنی ئەو جۆرە مندالأنەدا (الغريب، ١٩٧١) (القيسي، ١٩٨٨) (Lynn , ١٩٧٨).

دەرئەنجامی توێژینەوە مەیدانیەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن، كە باوك زیاتر لەدایك گرنگی بەڕۆلی كۆمەلایەتی ورەوشتی گونجاو بۆ توخمی مندالەكانی دەدات، هەروەها سوریشە لەسەر ئەوەی كە دەبێت مندالەكانی وەك گەورە قسەو هەلس و كەوت بكەن، ئەم جۆرە مامەلەیەش باوكان زیاتر لەگەلْ كوڕەكانیان پەیڕەوی دەكەن. (Brown;١٩٦٤).

لەلایەكی تریشەوە (ڕۆسیلی) زانا گەیشتە ئەو ڕاستیەی كە كار لێككردن (التفاعل) و هاوكاری باوك لەگەلْ ئەندامانی خێزانەكەی ڕۆلی نێرایەتی كوڕەكانی بەهێزتر دەكات و فێر بوونی ئەو ڕۆلەش ئاسانتر دەكات. (Russell ; ١٩٧٨). بێگومان ئەمەش دەمان گەیەنێتە ئەو دەرئەنجامەی كە لەمالْ نەبوونی باوك و دووركەوتنەوەی لەخێزان دەبێتە هۆی ئەوەی كە كوڕەكانیان بەتەواوی فێری ڕۆلی كۆمەلایەتی خۆیان نەبن، ئینجا ئەگەر ڕێكەوتی كرد مندالْ لەگەلْ ئەوەشدا كە لەباوكی بێ بەش بووە، هیچ كەسێكی جێگری باوكی وەك (برای گەورە، خالْ، مام، باپیر) لەمالێشیاندا نەبێت بۆ ئەوەی كەمێك لەخەم و خەفەتەكانی نەبوونی باوكی بۆ كەم بكاتەوە، ئا لەم كاتانەدا زۆر لەمندالەكانیان (بەتایبەتی كوڕەكانیان) ڕەوشتی ژنانەو مێیایەتی فێر دەبن، كە ئەمەش لەداهاتوودا گرفتی زۆریان لەناو كۆمەلدا بۆ دروست دەكەن.

دەركەوتووە كە ئەو خێزانانەی توخمی نێر (باوك، برای گەورە، مام، خالْ، باپیر) وەك نموونە بۆ نێرایەتی كوڕەكانیان لەناویاندا نیەو بواری كار لێككردنی نێرەكانیش بۆ كوڕەكانیان نەڕەخساوە، ئەوا ڕۆلی سێكسی كوڕەكانیان دەشێوێ و پلەی نێرایەتیان كەم دەبێت و لە زۆر هەلس و كەوتدا ژنانی دەبن (Hetherington , ١٩٨٦).

بەلام ئەگەر جێگری باوك لەناو مالدا هەبوو، ئەوا كوڕەكان لاسایی ئەو جێگرانە دەكەنەوەو پلەی نێرایەتی و ڕەوشتی كوڕانەیان زیاتر دەبێت، دەرئەنجامی توێژینەوەكانی بیللری زانا (Biller,١٩٧٦) ئەو ڕاستیانەی بەدەرخست كە پلەی

نێرایەتی ئەو منداڵانەی باوکیان نەبوو بەڵام جێگری باوکیان هەبوو زۆر زیاتر بوو لەپلەی نێرایەتی ئەو کوڕانەی کە باوکیان نەبوو لەهەمان کاتیشدا هیچ کەسێکی تر نەبوو کە جێگەی باوکیان بۆ بگرێتەوە. کەواتە کەسانی تری وەك (برای گەورە، مامۆستای پیاو.... هتد) لەتوانایاندا هەیە هەندێك لەو کەلێن و دەلاقانەی کە نەمانی باوك دروستیان دەکات پڕ بکەنەوە، لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە خێزان و کۆمەڵ هەوڵی دۆزینەوەو دابین کردنی جێگر بۆ منداڵەکانیان بدەن بۆ ئەوەی نەمانی دایك و باوك کەسایەتی منداڵەکانیان تێك نەشکێنێ.

## زیانەکانی فێر نەبوونی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی گونجاو:-

ئەو خاسیەت و سیفات و ڕۆڵانەی کە کۆمەڵ و داو و دەزگاکانی بۆ هەریەك لەتوخمی (نێرو مێ)ی دیاری دەکەن، دەبێت بەپێوەرو جۆرێك لەداب و نەریتی ئەگۆڕی ئەو کۆمەڵگایە، ئینجا هەر چ کەسێك پێشێلی بکات و پابەند نەبێت پێیانەوە، ئەوا دەکەوێتە بەر هەڕەشەو سزاو ئازاری کۆمەڵەکەی. لەبەر ئەوە هەر چ یەکێك لەتوخمی (نێر) یان (مێ) لەبەر هەر چ هۆیەك بێت، نەیتوانی فێری ڕۆڵی سێکسی گونجاو بەتوخمەکەی خۆی ببێت، ئەوا لەژیانی ڕۆژانەیدا تووشی زۆر گێروگرفت دەبێت، چونکە ئەو هەڵس و کەوتەی دژی خواست و بۆچوونی زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵەکەیەتی. یەکێك لەدەرئەنجامی توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکات (ئەگەر منداڵ لەدایك و باوك بێ بەش بوو ئەوا زۆر بەزەحمەت دەتوانێت خۆی لەگەڵ ژینگە کۆمەڵایەتیەکەی بسازێنێ و گەشە کردنی کۆمەڵایەتیشی دوادەکەوێت، لەلایەکی ترەوە، ئەگەر منداڵەکە کوڕ بوو ئەوا بەنەمانی باوك و ئەگەر کچ بوو ئەوا بەنەمانی دایکی زەرەرێکی زۆری لێ دەکەوێت) (Bigner ; ١٩٧٩. هەروەها (ڤینی) زاناش گەیشتە ئەو ڕاستیەی کە زۆربەی حاڵەتەکانی نێرایەتی لەلای ئافرەتان و مێیایەتی لەلای پیاوەکان بەزۆری بۆ هۆکاری دەروونی (نەك هۆکاری فسیولۆژی) دەگەڕێتەوەو کوڕ لەباوك و کچیش لەڕێگەی دایکیەوە خاسیەت و سیفاتەکانی تایبەت بەتوخمەکەی خۆی فێر دەبێت (ڤین، ١٩٥٩).

لەلایەكی تریشەوە هەردوو زانایان (سبنس) و (هلمریج) (Spence & Helmreich ، ١٩٧٨) گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی كە پەیوەندییەكی پۆزەتیڤانە لەنێوان هەردوو خاسیەت و سیفاتی (نێرایەتی) و (مێیایەتی) لەلایەك و ڕێزگرتنی خود (أحترام الذات) لەلایەكی ترەوە هەیە، واتە ئەو كوڕانەی كە پلەی نێرایەتی و ئەو كچانەش كە پلەی مێیایەتی لەلایان بەرزە، ئەوا بەچاوی ڕێزو خۆشەویستیەوە سەیری خودی خۆیان دەكەن. بەلام نزمی پلەی (نێرایەتی) لەلای كوڕو (مێیایەتی) لەلای كچ، دەبێتە هۆی ئەوەی كە بەچاوی نزم و نیگەتیڤانە بڕواننە خودی خۆیان (Massad : ١٩٨١)، كە ئەمەش بێگومان ڕەنگدانەوەی خراپی لەسەر باری دەروونی ئەو كەسانە دەبێت و لەداهاتووشدا كۆمەڵێك گرفتی دەروونی و كۆمەڵایەتیان بۆ دروست دەكات.

دەرئەنجامی توێژینەوەیەكی زانایان (ڕوس) و (كوهن) (Ross & Cohen)، ئاماژە بۆ ئەوە دەكات، كە ئەو كوڕانەی پلەی نێرایەتیان بەرز بوو زیاتر چوست و چالاك و بەتواناتر بوون لەهەڵهێنان و چارەسەر كردنی گیروگرفتەكان و زاڵ بوون بەسەریانداو هەروەها باشتریش خۆیان دەسازاند، لەگەڵ فشارو ناخۆشیەكانی ژیان، لەو كوڕانەی كە پلەكانی نێرایەتیان نزم بوون.

دەرئەنجامی ئەو توێژینەوانەی سەرەوەو چەندەها توێژینەوەی تر ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن، ئەگەر تاك نەیتوانی ڕۆڵی كۆمەڵایەتی خۆی فێر بێت، ئەوا دەكەوێتەبەر فشارو پلارو تیرو توانجی كەسانی ترو بەچاوی نزم سەیری خۆی دەكات و بەردەوام ڕووبەڕووی گرفتی دەروونی و كۆمەڵایەتی دەبێتەوەو دوور نیە چەندەها ناوو ناتۆرەو نازناوی ناشیرینی بخەنە پاڵ لەوانە (خولە ژنانی، ئەحە ژنانی، لەحیزبی یوسفە، نێرە كوڕانی، سەرەژنانی، نێرەمووك..... هتد). دەگێڕنەوە دەڵێن (خوالێخۆشبوو -یوسف-ی مێردی -خاتوون-ی برین پێنج نموونەی پیاوی ماڵ و ژێر دەستی ژن بووە، جا هەر پیاوێك لەسلێمانیدا گەردن كەچی ژنەكەی بوایە، پێیان ئەگووت لەحیزبی یوسفە، ئەویش ئەیگووت: خۆ من لەماڵەوە جل بەدەست ناشۆم، بەماكنە شوشتم) (بابان، ١٩٩٣، ١٦٧).

## گەشەکردنی ئەخلاقی (النمو الخلقي)

**پێشەکی:**

گومانی تێدا نیە کە ئاکار(ئەخلاق)و کرداری جوان برِبرِەی پشتی کۆمەڵگایەو تەنها زامنە بۆ خۆراگری کۆمەڵگاو شارستانیەت و مانەوەی لەسەر ڕێچکەی ئاسایی خۆی، بەڵام بەداخەوە ئاکارو چۆنیەتی گەشەکردنی وەك پێویست گرنگی پێ نەدراوەو بەتەواوی لێی نەکۆڵدراوەتەوەو مافی خۆی نەدراوەتێ، ئەوەش لەوانەیە بۆ یەکێك یان زیاتر لەهۆکارێك لەمانەی خوارەوە بگەڕێتەوە:-

١. ئاکار بابەتێکی ئاڵۆزەو پێوانە کردنی بەشێوەیەکی زانستی و بابەتیانە (موضوعي) کارێکی ئاسان نیە.

٢. تاوەکوو ئێستا کەرەستەو ئامرازی ڕاستگۆ و بابەتیانەی گونجاو بۆ پێوانەکردنی نیە.

٣. تاوەکوو ئێستا پێناسەو چۆنیەتی گەشەکردن و تیۆرییەکانی ئاکار بەتەواوی دیاری نەکراوەو سەرجەم زانایان لەسەریان کۆنین و بگرە چەندەها بۆچوونی جیاجیاو هەندێك جاریش دژ بەیەك دەربارەی ئاکار هەیە.

٤. کۆمەڵێك هۆکاری لاوەکی وەك (توخم، زیرەکی، ژینگەی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری، شێوازو جۆری پەروەردە کردن.... هتد)، ڕۆڵی گرنگ لەگەشەکردنی ئاکاردا دەبینن، بەڵام بەداخەوە تاوەکوو ئێستا بەتەواوی لێیان نەکۆڵدراوەتەوە (العاجي، ١٩٨٩، ص٨).

**پێناسە:**

وەك لە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، چەمکی (مفهوم) ئاکار (الأخلاق) بەچەندەها شێوەی جیاجیا پێناسە کراوە، هۆکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەر یەك لەو زانایانە لەگۆشە

نيگاى تايبەتى خۆيەوە سەيرى ئەو چەمكەى كردووەو كاريگەرى فەلسەفەو بۆچوونى تايبەتى خۆشيان لە پێناسەكانياندا ڕەنگيان داوەتەوە.

***دەتوانين سەرجەم پێناسەكان لەم خاڵانەى خوارەوەدا خەست بكەينەوە:-***

١. بەپێى فەرهەنگى (Good) ئاكار بريتيە لە( جووڵاندنەوەو هەڵس و كەوت كردن بەپێى داب و نەريتى كۆمەلايەتى و بەدواكەوتن و جێبەجێ كردنى ئەو ئامانج و مەبەستانەى كە كۆمەڵ بەڕاستيان دەزانێت) (Good, 1973, P. 281).

٢. بەندۆراش (Bandora, 1969) دەڵێت ئاكار (ئەو ڕەوشتەيە كە تاك لەميانەى لاسايكردنەوەو پاداشتەوە فێرى دەبێت).

٣. فرۆيدش ئاكار بەدوو شێواز پێناسە دەكات (أ) منداڵ كاتێك خاوەنى ئاكارى بەرزو جوان دەبێت كە بتوانێت لەڕێگەى خۆخستنە شوێنەوە (التقمص) پێوەرو هەڵس و كەوتەكانى دايك و باوك و داب و نەريتى كۆمەڵەكەى وەربگرێت. (ب) بەلام ئەو منداڵە بەد ڕەوشت و بەدئاكار (لاأخلاقی) دەبێت، ئەگەر نەتوانێت ئەو پێوەرو داب و نەريتانە وەربگرێت. (Graham, 1974, P. 143).

٤. ڕەوشتى ئاكارى (السلوك الخلقي) (Moral behavior) ئەو ڕەوشتەيە كە لەگەڵ بەهاو پێوەرو داب و نەريتە كۆمەلايەتيەكاندا چون يەكە. بەلام مەبەست لەچەمكە ئاكارييەكان (المفاهيم الخلقية) (Moral concepts) ئەو بنەماو ياساوداب و نەريتە ڕەوشتى و ئاكاريانەيە كە لەناو هەموو كۆمەڵگاو شارستانيەتێكدا هەيەو وەك قاڵب و دەستوورو پێوەرێك، ڕاست و دروستى و باش و خراپى هەڵس و كەوت و ڕەوشتى تاكەكانى ئەو كۆمەڵگايەى پێ ديارى دەكرێت (الفخري، ١٩٨٢، ص١١٦).

٥. بەڕاى (هادفيلد) (J. Hadfield) ئاكار دوو جۆر ماناى بەرفراوانى هەيە:

(أ) بريتيە لەهەڵس و كەوت كردن و جووڵاندنەوە بەپێ ى داب و نەريت و بەها كۆمەلايەتيەكان و لانەدان لێيان.

(ب) دواکەوتن و جێبەجێ کردنی مەبەست و ئامانجی ڕاست، بەبێ گوێ دان بەداب و نەریت و بەهای کۆمەلایەتی. (عیسوی، ١٩٨٠، ص٢٠٨).

بەپێی مانای یەکەم، دەبێت تاك کوێرانە (بەبێ گوێ دان بەباشی و خراپی داب و نەریت و بەهای کۆمەڵەکەی)، گوێ ڕایەڵی داب و نەریت و یاساو ڕێسای کۆمەڵەکەی بێت و نابێت بەهیچ شێوەیەك لێیان لابدات. بەلام مانای دووهەم ئەوە دەگەیەنێت کە مەرج نیە تاك کوێرانە بەبێ بیر کردنەوەو هەڵسەنگاندن گوێ ڕایەڵی داواکاری و فەلسەفەی کۆمەڵەکەی بێت، بۆی هەیە لێیان یاخی ببێت و هەوڵی گۆڕینیان بدات وەك چۆن لەهەموو کات و سەردەمێکدا چەند روناکبیرو ڕۆشنبیرو شۆڕشگێڕێك پەیدا دەبن و داوای گۆڕینی داب و نەریتە کۆن و خراپەکانی کۆمەڵ دەکەن. واتە پێوەری ئاکاری جوان و ڕەوشت بەرزی بەپێی مانای دووهەم مەبەست و ئامانجی ڕاستە کە لەخزمەتی مرۆڤ و شارستانیەتدا بێت، بەلام پێوەری ئاکار بەرزی بەمانای یەکەم، داب و نەریت و بەهای کۆمەڵەو نابێت تاك لێیان لابدات ئەگینا دەکەوێتە بەر هەڕەشەو سزای کۆمەڵ و بە بەد ڕەوشت و لادەرو تاوانبار لەقەڵەم دەدرێت. نموونەش زۆرە لەم بارەیەوە، پێغەمبەر(د.خ)و نێردراوەکانی خودای گەورە دەکەونە قالبی مانای دووهەمەوە چونکە لەسەرەتادا بەتەنها هەوڵی گۆڕینی داب و نەریت و بیرو باوەڕی کۆنی ئەو گەل و نەتەوانەیان دەدا کە بۆیان ڕەوانە دەکران، تەنها پێوەری ڕاستەقینەشیان ئەو نامە پیرۆزو بەبەهایانەیان بوو کە هەڵیان گرتبوو، هەرچەندە لەسەرەتاشدا زۆربەی زۆری ئەو گەل و نەتەوانە دژیان بوون و هەوڵی لەناو بردنیان دەدان.

## چۆنیەتی گەشەكردنی ئەخلاقی:

بەڕای زۆربەی زانایان منداڵ لەكاتی لەدایك بووندا خاوەنی هیچ جۆرە ئاكارێكی كۆمەڵایەتی باش و خراپ نیە، بەڵكو تەنها ئەو توانست و ئامادە باشیەی (الأستعداد) هەیە كە بتوانێ فێری ئاكاری بەرزو ڕەوشت و هەڵس و كەوتی كۆمەڵایەتی (بەباش و خراپیەوە) بكەین. كەواتە ڕۆڵی گرنگ و ترسناك بۆ دامەزراوە كۆمەڵایەتیەكان دەگەڕێتەوە لەچۆنیەتی گەشە كردنی ڕەوشتی ئەخلاقی، دامەزراوە كۆمەڵایەتیەكانیش زۆرن بەخێزان و قوتابخانە دەست پێدەكات و بەئامرازەكانی ڕاگەیاندن و شوێنە گشتیەكان كۆتایی دێت. واتە هەر یەك لەو دامەزراوە كۆمەڵایەتیانە بە پێی گرنگی و كات و شوێنی خۆی ڕۆڵی گرنگ لەگەشەكردنی ئاكاری تاكەكانیاندا دەگێڕێ. بەڕای زانایانی بونیاتگەری و گەشەكردن (البنائية والتطورية)، گەشەكردنی ئاكاری بەهەمان ڕێچكەی گەشە كردنی ژیریدا تێدەپەڕێت و بەشێكیشە لە پرۆسەی پێ گەین (النضج)، بەم پێیە گەشە كردنی ئاكاری بەزنجیرەیەك قۆناغی یەك لەدوای یەكدا (كە نزیكن لەقۆناغەكانی گەشەكردنی ژیری) تێدەپەڕێت (Piajet ; ١٩٦٥ ; Kohlberge ; ١٩٦٩).

هەر ئەم بۆچوونەش بوو كە وای لەهەردوو زانایانی ئەم ڕێبازە (بیاجیە) و (كوهلبرگ) كرد كە چەند ئاست و قۆناغێك بۆ گەشە كردنی ئاكاری دیاری بكەن، كە هەر قۆناغە بەدوای ئەوی تردا دێت. منداڵ بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت بە پێی ڕەوشت و ئاكاری قۆناغی دووهەم هەڵس و كەوت بكات ئەگەر قۆناغی یەكەمی ئەبڕی بێت، هەروەها قۆناغی دووهەمیش دەبێت بەبناغەو دەروازە بۆ قۆناغی سێهەم، ئینجا هەر ج كەسێك بگاتە ئاستێكی بەرزی ئاكاری ئەوا بەهیچ شێوەیەك جارێكی تر ناگەڕێتەوە بۆ ئاستێكی نزمتر، لەبەر ئەوەی گواستنەوە لەئاستێكەوە بۆ ئاستێكی تر یەك ئاراستەو ڕێچكە وەردەگرێت كە ئەویش بۆ پێشەوەیەو بەهیچ شێوەیەك گەڕاندنەوەو پاشەكشێی تێدا نیە (Douglas ; ١٩٧٢ ; P.٢٤٢).

***زۆربەی زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە ڕەوشت و ئاکار (بەباش و خراپییەوە) بەشێوەیەکی گشتی بەم ڕێبازانەی لای خوارەوە گەشە دەکەن:-***

**١. ڕاست و هەڵە** (الخطأ والصواب) **یان هەوڵدان هەڵەکردن** (المحاولة والخطأ):

زۆربەی منداڵان لەسەرەتای ژیاندا بەم شێوازە فێری باش و خراپی زۆر لەهەڵس و کەوت و دیاردەکانی ژیان دەبن. بۆ نموونە هەر شتێك ببێتە مایەی چێژو خۆشی منداڵ ئەوا بەباشی دەزانێ و لێی نزیك دەبێتەوە وە هەر ڕووداوو کارێك ببێتە مایەی ئازارو ناخۆشی ئەوا بەخراپی لەقەڵەم دەدات و لێی دوور دەکەوێتەوە، ئینجا کاتێك لەئاگر نزیك دەکەوێتەوەو خەریکە دەستی دەسووتێ یان گڕو گڵپەی ئاگرەکە ئازاری دەدات، ئەوا بۆ جاری داهاتوو هەوڵ دەدات لێی دوور بکەوێتەوەو بەکارێکی خراپی لەقەڵەم دەدات، بەڵام ئەگەر نزیك بوونەوە لەباوك و دایك و گوێ ڕایەڵی بوونیان بووە مایەی خۆشی و سودو قازانج، ئەوا بەکارێکی باشی لەقەڵەم دەدات و لەداهاتوودا هەولی دووبارە کردنەوەیان دەدات.

**٢ ڕێنمایی و ڕاهێنانی ڕاستەوخۆ:-**

مەبەست لەم ڕێبازە ئەوەیە کە ڕاستەوخۆ منداڵ فێری چەمکە ئاکاریو هەڵس و کەوتە کۆمەڵایەتیە گونجاوو دروستەکان بکرێت، ئەویش لەڕێگەی فشارو هێزی دەرەکی کە دەخرێتە سەر منداڵ بۆ ئەوەی بەو شێوەیە هەڵس و کەوت بکات کە کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی بەدڵنیانەو پێشبینی دەکەن، ئینجا ئەگەر ئەو شێوازو ڕێنمایی و ڕاهێنانە ئەگۆڕو پۆزەتیڤانە بێت ئەوا ئەو هەڵس و کەوت و ڕەوشتە لەلای منداڵ جێگیر دەبێت و دوای ماوەیەك دەبێت بەخوویەك (العادة) لەلای، چونکە هان دان و پاداشت کردن دەبێتە هۆی ئەوەی کە منداڵ بەخێرایی و بەسەرکەوتوانە فێری ڕەوشتەکان ببێت.

## ٣. ڕێنمایی و ڕاهێنانی ناڕاستەوخۆ:-

مەبەست لەم شێوازە ئەو جۆرە فێر بوونەیە کە منداڵ ناڕاستەوخۆ لەڕێگەی پرۆسەی خۆ خستنە شوێنەوە (التقمص) زۆربەی ڕەوشت و هەڵس و کەوتەکانی کەسانی چواردەوری وەردەگرێت، منداڵ تاگەورە ببێت و تەمەنی زیاتر ببێت ئەوا ئەوەندە لەشێوازی (ڕاست و هەڵە) دوور دەکەوێتەوەو بەردەوام بۆ تێگەیشتن و فێر بوونی دیاردەکانی ژیان پەنا بۆ شێوازی ناڕاستەوخۆ دەبات.

## ٤. تێگەیشتن (الفهم):-

کاتێک منداڵ قۆناغی ساوایەتی بەجێ دەهێڵێ و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر گەشە دەکات و ژیری زیاد دەبێت ئەوا لەڕێگەی تێگەیشتنەوە فێری ڕاست و دروستی و باش و خراپی زۆر لەدیاردەکانی ژیان و ڕووداوەکانی دەبێت.

## ویژدان و گەشە کردنی

گومانی تێدا نیە، ویژدان بڕبڕەی پشت و داینەمۆی ڕەوشتی ئاکارییە، بەهیچ شێوەیەك مرۆڤ ناچێتە قۆناغێکی پێش کەوتوو، کاڵای مرۆڤایەتی بەباڵایدا نابڕدرێ ئەگەر خاوەنی ویژدان نەبێت. تەنانەت هەندێك جار ویژدان وەك زاراوو چەمکی ئاکار بەکار دەهێنرێت.

بەزۆر شێواز گوزارشت لەویژدان دەکرێت و کارو فەرمانەکانی دیاری دەکرێت. هەندێك جار ویژدان بەپاسەوانێکی بەوەفای خودی ناوەوە دادەنرێت کە زۆر بەووردی چاودێری ڕەوشت و هەڵس و کەوتەکانی تاك دەکات و لەکاتی لادان و هەڵە کردندا تووشی ئازارو شەرم و دڵەڕاوکێی دەکات. وەك لە زۆربەی بۆچوونی زاناکاندا دەردەکەوێت ویژدان لەکۆمەڵێك بەهاو پێوەرو بیرو باوەڕو پرانسیپی کۆمەڵایەتی و ئاکاری پێك هاتووە، کە تاك لەڕێگەیانەوە بڕیار لەسەر باش و خراپی پاڵنەرو هەڵس و کەوتەکانی دەدات. لەکۆندا بەپێی بیرو باوەڕی لاهوتی، وا سەیری ویژدان دەکرا کە توانست و بەهرەیەکی ئەزەلی و بۆ ماوەییەو هەر لەسەرەتای بوونەوە خودا ئەو توانست و بەهرەیەی لەسروشتی مرۆڤدا چاندووە، بۆ ئەوەی ببێت بەیارمەتی دەرو ڕێ پیشان دەری مرۆڤ، لەکاتی بڕیاردان لەسەر باشی و خراپی ڕەوشتەکان، بەڵام دەروونزانەکان لەو بڕوایەدان کە ویژدان توانستێکی ناوەیەو وردە وردە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەئەنجامی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیکردنەوە دروست دەبێت.

هەندێك جار دەگوترێت کە ویژدان (قازی یان پۆلیس یان چاودێری) ناوەییەو بەردەوام لەبۆسەدایە بۆ چاودێری کردنی هەڵس و کەوتەکانی تاك و لێپێچینەوەو هەڕەشە لێکردن و سزادانی، لەکاتی لادان و سەرپێچی دا تاوای لێبکات کە هەست بەگوناهو شەرم و دڵەڕاوکێ بکات. شایانی باس کردنە کە هێزو توندو تیژیەکەشی لەتاکێکەوە بۆ تاکێکی تر دەگۆڕدرێت (عیسوی، ١٩٨٠، ص٧٥). بۆ نموونە کەسانێك هەن کە ویژدانیان ئەوەندە

بەهێزو کاریگەرە کە لەسەر بچووکترین هەڵە سەرزەنشتیان دەکەن و تووشی هەست کردن بەگوناهو شەرم و دڵەڕاوکێ یان دەکەن، لەکاتێکدا کەسانی تر هەن کە گەورەترین و ترسناکترین تاوان بەئەنجام دەگەیەنن بەبێ ئەوەی یەك میسقاڵ هەست بەگوناهو شەرم و پەشیمانی بکەن، کە ئەوانیش لەو جۆرە کەسانەن کە ناو دەبرێن بەمرۆڤی سایکۆپاسی، زۆربەی خەڵکیش ویژدانیان مام ناوەندییەو دەکەونە نێوان ئەو دوو گروپە نائاساییەوە، گومانیشی تێدا نیە کە ئەو جۆرە ویژدانانە بۆ شێوازی پەروەردە کردن و جۆری ڕاهێنانی کۆمەڵایەتی و ڕووداوو کارەساتەکانی قۆناغەکانی ژیانی ئەو کەسانە دەگەڕێتەوە. پێویستە ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە ویژدانی زۆر زیندوو بەئازارو سەرکوتکەر زیانێکی گەورە بەکەسایەتی تاك و خۆسازدانی کۆمەڵایەتی و دروستی دەروونی دەگەیەنێت، هەر ئەمەشە کە وای لەزاناکان کردووە کە ڕێنمایی دایکان و باوکان و مامۆستایان بکەن، بۆ ئەوەی لەهەڵس و کەوت و مامەڵەیاندا مام ناوەندی بن، واتە بەردەوام نە زۆر توندو تیژو سەرکوتکەر بن، نە زۆریش نەرم و نیان و لێبووردوو بن، بۆ ئەوەی ویژدانی منداڵەکانیان نە زۆر توندو تیژو تۆقێنەر بن، نەویژدان مردوو لاوازو بێ هێزیش بن.

ویژدان لەیەك کاتی دیاری کراودا دروست نابێت، بەڵکو بەچەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت تا بەتەواوی گەشە دەکات. لەسەرەتادا ویژدان ناسك و سەرەتاییە، بەڵام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەئەنجامی ڕاهێنان و فێربوونی کۆمەڵایەتیەوە زیاتر گەشە دەکات و بەرەو کامڵ بوون دەچێت، فەرمانی ویژدان لەسەرەتادا تایبەت دەبێت بە ئەو کارو کردەوانەی کە ناشێرینەو (نابێت بکرێت)، بەڵام لەدواتر ئەو کارو کردەوانەی کە (پێویستەو دەبێت بکرێت) لەخۆ دەگرێت. واتە لەسەرەتادا منداڵ فێری ئەوە دەکرێت کە نابێت لەخوشك و برای خۆی بدات بەڵام دواتر فێری ئەوە دەکرێت، کە نەك نابێت لێیان بدات بەڵکو دەبێت دەستی هاوکاری و یارمەتیشیان بۆ درێژ بکات و بەبەزەیی و بەوەفاش بێت لەگەڵیانداو لەکاتی تەنگانەشدا ببێت بە پشت و پەنایان.

زۆر بەڵگەو نیشانە هەن کە ئاماژە بۆ چەکەرە کردن و دروست بوونی ویژدان دەکەن، لەوانە (دەست پاکی، گوێڕایەڵی یاساو داب و نەریتی کۆمەلایەتی، بەرگری و خۆڕاگرتن لەبەردەم ئەو بارو دڕۆخانەی کە دەبنە مایەی درۆ، فێڵ و تەڵەکە، دزی کردن، لەبەرچاو گرتنی موڵك و ماف و بەرژەوەندی کەسانی تر). لەلایەکی تریشەوە دروست بوون و گەشە کردنی ویژدان پشت بەلایەنی ژیری و تەمەن دەبەستێت، واتە تامنداڵ توانستەکانی (تێگەیشتن، وەرگرتن، بەراورد کردن، یاد کردنەوە،.... هتد) زیاد بێت، ئەوەندە زیاتر پێوەرە ئاکارییەکانی گەشە دەکات و دەتوانێت باش و خراپەکان لەیەکتری جیا بکاتەوەو لەهەڵەو سەرەڕۆییەکان دوور بکەوێتەوە (مسن، ١٩٨٦، ص٢٩١-٢٩٢).

ئیزنك (Eysenck) چۆنیەتی دروست بوونی ویژدان لەڕێگەی ، پەیوەستیەوە (الأرتباط) بەم شێوەی لای خوارەوە لێك دەداتەوە:-

کاتێك منداڵ کارێکی ناشیرین دەکات، بێگومان لەئەنجامدا لەسەر دەستی دایك و باوك و مامۆستا تووشی ناڕەزایی و سزاو ئازار دەبێت، ئەم سزاو ئازارو ناڕەزاییەش، هەست و سۆزێکی ناخۆش لەلای دروست دەکات، دوای چەند جار دووبارە بوونەوەی ئەو کارە نابەجێیە ئیتر تەنها بیر لێکردنەوەی یان بەئەنجام گەیاندنی ئەم جۆرە کارانە، یەکسەر ئەو هەست و سۆزە ناخۆشە بۆ ئەو منداڵە دەگەڕێنێتەوە، کە ئەمەش دەتوانین ناو بنێین (ویژدان)، کە لەناو خودی مرۆڤدا جێگەی دەسەڵات و هێزی دەرەکی (دایك، باوك، مامۆستا... هتد) دەگرێتەوە، وەك لەم هێڵکاریەی خوارەوەدا دەردەکەوێت.

*سزا (وورووژێنەرێکی نامەرجی) (مثیر غیر شرطی) ـــــ ئازار (وەڵامدانەوەی نامەرجی) (استجابة غیر شرطیة).*

*کارێکی ناشیرین (وورووژێنەرێکی مەرجی) (مثیر شرطی) ـــــ ئازار (وەڵامدانەوەی مەرجی) (الأستجابة الشرطیة). (فتحی، ١٩٨٣، ص١٤).*

دەتوانین بەكورتی ویژدان لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا كۆبكەینەوە:-

١. ویژدان دوو فەرمانی سەرەكی هەیە، ئەوانیش كۆنترۆڵ كردن و نەهێشتنی ڕەوشتی خراپ و دروست كردنی هەست كردن بەگوناهو شەرمە لەلای تاك.

٢. ویژدان لەژێر كۆنترۆڵی حەزو ئارەزوو ویستی تاكدا نیە.

٣. زۆر میكانیزم و پرۆسە بەشداری دروست كردنی لایەنە جیاجیاكانی ویژدان دەكەن، لەوانە ( پاداشت، سزا، لاسایی كردنەوە، خۆخستنە شوێن ).

٤. لەسەر كردارو هەڵس و كەوتی پراكتیكانەی دایك و باوك و مامۆستا بنیات دەنرێت.

٥. دەگۆردرێت و جیاوازە لەنێوان تاك و لەنێوان كۆمەڵگاكاندا ( عیسوی، ١٩٨٠، ص٩٧).

دروست بوونی ویژدان كە بەشێكە لە منی باڵا *(الأنا العلیا)*، هەنگاوێكی زۆر گرنگە بۆ گەشە كردنی پێوەرە ئاكاریەكان *(المعاییر الخلقیة)*، ئەوەی ڕاستی بێت تاوەكوو ئێستا ووردەكاری چۆنیەتی تەواوی گەشەكردنی ویژدان ڕوون و ئاشكرا نیە، بەڵام ئەوەی گومانی تێدا نیە ئەوەیە كە خۆخستنە شوێن *(التقمص)* هۆكارێكی گرنگە بۆ دروست بوون و گەشە كردنی ویژدان.

زانایانی شیتەڵ كردنەوەی دەروونی لەو باوەڕەدان كە منی باڵا یەكێكە لەبەرهەم و دەرئە نجامە سەرەكیەكانی پرۆسەی خۆخستنە شوێن، خۆخستنە شوێنیش ئەو پرۆسەیە كە منداڵ لەمیانەیەوە زۆر سیفات و خاسیەت و هەڵس و كەوتی دایك و باوك و مامۆستاو كەسانی تری چواردەوری وەردەگرێت و دەیان كات بەبەشێك لەڕەوشتی خۆی، جیاوازی خۆخستنە شوێن و لاسایی كردنەوەش ئەوەیە، كە خۆخستنە شوێن بەزۆری لەسەر ئاستی نەستی ( اللاشعور ) ڕوودەدات بەڵام لاسایی كردنەوە هەستیە ( شعوری ).

<u>پێوەرە ئەخلاقیەكان</u> *(المعایر الخلقیة)*:-

مەبەست لە پێوەرە ئەخلاقیەكان ( ئاكارییەكان )، سەرجەم ئەو هەڵس و كەوت و ڕەوشتانە دەگرێتەوە كە كۆمەڵ لەسەر باش و خراپی و ڕاست و هەڵەیی ڕێك كەوتوون،

واتە دەبێت منداڵ فێری ئەوە بکرێت کە (دەبێت ڕاستگۆ بێت و دەست درێژی نەکاتە سەر سەروسامانی کەسانی ترو، شەڕخواز نەبێت، هاوکارو بەبەزەیی و گوێ ڕایەڵی دایک و باوك و گەورەکانی بێت، دەست پاك و بەوەفاو... هتد) بێت.

بێگومان لەڕێگەی پرۆسەی ڕاهێنانی کۆمەلایەتیەوە *(التنشئة الأجتماعية)*، لەقۆناغە جیاجیاکانی ژیانیدا، بەردەوام منداڵ فێری ئەو پێوەرە ئەخلاقیانە دەکرێت، بەردەوام بوونی ئەو پرۆسەیەش زامنی دروست بوونی ئەو بەشەیە کە زانایانی شیتەلکردنەوەی دەروونی *(التحليل النفسي)* بە(منی بالا) (Superego) ناوی دەبەن. شایانی باسە کە فێر بوون و گەشە کردنی پێوەرە ئەخلاقیەکان دوادەکەون، لەبەر ئەوەی گرانترن و پێویستیان بەبەکار هێنانی زۆر پرۆسەو توانستی *(قدرة)* ژیری (عقلی) ئاڵۆز هەیە، لەوانە گشتاندن (التعميم)، چونکە فێر بوونی چەمك و پێوەرە ئەخلاقیەکان پێویستی بەگەشە کردنی هەردوو توانستی لێك چوون و (التشابه) لێك جیا کردنەوە (التمييز) هەیە، لەبەر ئەوەی ئەو توانستانە یارمەتی منداڵ دەدەن بۆ ناسینەوەی ڕەگەزە هاوبەشەکانی نێوان دیاردە لێك چووەکان، کە ئەمەش دەبێتە هۆکارێکی یارمەتیدەر بۆ سوود وەرگرتن لەو زانیاریانەی کە منداڵ هەیەتی لەکاتی گۆڕینی شوێن و کاتی ڕووداوەکان.

شایانی باسە هەر ئەمەشە کە ئەو دوو توانستەو توانستە ژیرییەکانی تریش لەدوا قۆناغی منداڵیدا گەشە دەکەن. بۆتە هۆی ئەوەی کە منداڵێکی چوار پێنج (٤ – ٥) ساڵان تەنها بتوانێت لەمانای هەڵس و کەوت و ڕووداوە ڕوون و ئاشکراو هەست پێ کراوەکان تێبگات و ڕۆژانە بەکاریان بهێنی لەوانە (گوێ ڕایەڵی کردنی دایك و باوك، یارمەتی دانی دایك، نەدزینی کەل و پەلی خوشك و براکانی.... هتد)، بەلام بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت لەمانای پێوەرو چەمکە ئەخلاقیە ڕووتەکان (المجرد) تێبگات. بەلام لەتەمەنی هەشت نۆ ساڵاندا (٨ – ٩) لەتوانای زۆربەی منداڵاندا هەیە کە لەمانای پێوەرو چەمکە ئەخلاقیە ڕووتەکان تێ بگەن، واتە فێری مانای گشتی دزی دەبێت و بەکاری ناشیرین و بەدی

دادەنێت، ئیتر لەهەر چ شوێن و كاتێك بێت و هی هەرچ كەسێك بێت. منداڵ لەتەمەنی (٤ - ٥) ساڵاندا وا دەزانێ كە تەنها دزینی كەل و پەلی خوشك و برا خراپە، بەڵام لەتەمەنی (٨ - ٩) ساڵان دەگاتە ئەو بڕوایەی كە دزینی هەموو شتێك و هی خەڵكانی تریش هەر خراپە. (الفخری، ١٩٨٢، ص١٢١).

خاڵێكی زۆر گرنگ هەیەو نابێت لەیادمان بچێت ئەویش ئەوەیە كە فێر بوون و زانینی ئەو چەمك و پێوەرە ئەخلاقیانە مەرج نیە كەوا لەمنداڵ بكات كە پابەندیان بێت و لەهەڵس و كەوتی ڕۆژانەیدا ڕەنگ بداتەوە، چونكە زۆر لەمنداڵان لەباش و خراپی و ڕاست و هەڵەی زۆر كردارو هەڵس و كەوت تێدەگەن، كەچی زۆر جار جێبەجێیان ناكەن بگرە سەرپێچیشیان لێ دەكەن، لەبەر ئەوەی زۆر هۆكاری وەك ئەمانەی لای خوارەوە هەن كە ڕۆڵی گرنگ لەبەرجەستە كردن و پیادە كردن و پابەند بوونی منداڵ بەو چەمك و پێوەرە ئەخلاقیانەوە، دەبینن:-

١. پەیوەندی نێوان دایك و باوك و منداڵ:-

دەرئەنجامی توێژینەوەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە پەیوەندی گەرم و گوڕو بەهێزی نێوان دایك و باوك و منداڵ كە لەسەر بناغەی سۆزو خۆشەویستی و ڕێز گرتن بنیات نراوە، هۆكارێكی زۆر گرنگە كە پاڵ بەمنداڵانەوە دەنێت، بۆ ئەوەی خێراتر بەهاو پێوەرە ئەخلاقیەكان فێر بن و لەهەڵس و كەوتی ڕۆژانەشیاندا بەرجەستە ببێت، لەلایەكی تریشەوە ویژدانیان بەهێزو كاریگەرتر دەبێت. (مسن، ١٩٨٦، ص٢٩٢). یەكێك لەتوێژینەوە مەیدانیەكان، گەیشتە ئەو ڕاستیەی كە ئەو منداڵانەی دایك و باوك و گەورەكانیان بەبەزەیی و دڵ گەورەو (سەخی) و بەرچاو تێر بوون، ئەوا خۆشیان (واتە منداڵەكان) هەمان ڕەوشت و ئاكاری جوانی باوك و دایك و گەورەكانیان لەلا دروست بوو بوو، بەپێچەوانەی ئەو منداڵانەی كە دایك و باوكیان ڕەزیل و پیسكەو توندو تیژو بێ بەزەیی بوون. (مسن، ١٩٨٦، ص٢٩٤).

## شێوازی پەروەردە كردن:-

جۆری پەروەردە كردنی دایك و باوك، پەیوەندییەكی پتەوی بەگەشە كردنی ئەخلاقی (ئاكاری) منداڵەكانیانەوە هەیە، بۆ نموونە ئەو باوك و دایك و مامۆستایانەی كە بەردەوام لەكاتی پەروەردە كردن و ڕاهێنانی منداڵەكانیاندا پەنا بۆ بەكار هێنانی هێزو توندو تیژی و هەڕەشەو بێبەش كردن دەبەن، ئەوا منداڵەكانیان بەجۆرێك پەروەردە دەبن كە زۆر بەكەمی گرنگی بەكەسانی تر دەدەن، بەلام ئەو دایك و باوك و مامۆستایانەی كە پەنا بۆ (لێك دانەوەو گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوەو زانینی هۆكارەكان و ڕوون كردنەوەی دەرئەنجامی كارە خراپەكان بۆ منداڵەكانیان.... هتد) دەبەن، ئەوا منداڵەكانیان بەجۆرێك گەشە دەكەن كە بەرژەوەندی و ڕەزامەندی كەسانی تر لەبەرچاو دەگرن و زەرەرو زیانیش بەسەروماڵیان ناگەیەنن (مسن، ١٩٨٦، ص٣٩٢).

توێژینەوەكانی زانایان (ئارۆن فرید، Aron Freed) لەساڵی (١٩٦٦) وە (سیرزو هاوەڵەكانی) لەساڵی (١٩٦٨)، ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە لێسەندنەوەو بێبەش كردنی منداڵ لەسۆزو خۆشەویستی و پاداشت زۆر باشترو كاریگەرترە، لەبەكارهێنانی لێدان و ئازاری جەستەیی بۆ گەشە كردنی ئەخلاقی. لەلایەكی ترەوە دەرئەنجامی توێژینەوەكانی زانایان (هۆڤ مان) و (سالتزتین) و (ئارۆن فرید) لەساڵی (١٩٦٧)، ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن (كە باسكردن و دەرخستنی هۆكارەكان و ڕوون كردنەوەی خراپی كارەكان) زۆر كاریگەرترە لە (لێسەندنەوەی خۆشەویستی و ئازاری جەستەیی)، هەروەها كاتی نەهێشتنی بەئەنجام گەیاندنی كارە خراپەكانیش گرنگی خۆی هەیە، دەركەوتووە، ئەگەر نەهێڵدرێ منداڵ كارەكە بكات یان پێش كردنی كارەكە سزا بدرێ ئەوا باشتر كۆنترۆڵی ئەو هەڵس و كەوتانە دەكرێت ئەگەر بەراورد بكرێت بەو منداڵانەی كە دوای بەئەنجام گەیاندنی كارەكە ئینجا سزا دەدرێن یان ڕێگەیان لێدەگیرێت (الحمدانی، ١٩٨٩، ص٢٠٦).

## ٣. توخم (جنس):-

زۆر جار لەئەنجامی جیاوازی شێوەی پەروەردە کردنەوە، جیاوازی لەنێوان هەردوو توخمی نێرو مێ دروست دەبێت، بۆ نموونە لەیەکێک لەتوێژینەوەکانی (شیلی) (Shilly) زانا کە لەسەر (٨٠٠) هەشت سەد منداڵ کە تەمەنیان لەنێوان (٩-١٦) ساڵان بوو، کردبووی، دەرکەوت کە کوڕ زیاتر لەکچ شەڕخوازو دەست درێژی کارترەو زیاتریش پێ شێلی داب و نەریتی کۆمەلایەتی دەکات، بەڵام کچ لەتوانستەکانیان بەگومانن و لەکوڕیش زیاتر ملکەچی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی دەبن. (Shantz ; 1979 ; p: 198).

## ٤. ئایین:-

دەرکەوتووە کە شارەزایی لەئایین و بڕوا بوون و باوەڕداری پەیوەندییەکی پتەوی بەگەشە کردنی ڕەوشتی ئەخلاقییەوە هەیە، بۆ نموونە، بۆ زانایان (هارتشۆن) و (مەی) دەرکەوت کە ڕێژەی قۆپی کردن (الغش) لەناو ئەو منداڵانەی کە هاتووچۆی کڵێسا دەکەن کەمترە، هەروەها یارمەتی دان و هاوکاری کردنی کەسانی تر لەناوییان زۆرترە.

## ٥. گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و پچڕانی پەیوەندیەکانی:-

کۆمەڵزانی فەرەنسی (دورکایم) (Durkheim) لەو بڕوایەدایە کە گۆڕانکارییە خێراکانی کۆمەڵایەتی و تێک چوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ و وون بوونی زۆر لەبەها کۆمەڵایەتیەکان، هۆکاری سەرەکین بۆ دروست بوونی تاوان و زیاد کردنی ڕێژەکەی. (العیسوی، ١٩٨٠، ص٢٢٢).

## ٦. ژینگەی ئەخلاقی :-

بێگومان ئەو ژینگە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاریەی کە منداڵ تیایدا دەژی گرنگیەکی زۆری بۆ گەشەکردنی ئەخلاقی مرۆڤ هەیە، بۆ نموونە ئەگەر ژینگەی منداڵ پڕبێت (لەدرۆو فرت و فێڵ و هەڵخەڵەتاندن و دووفاقی و چەوساندنەوەو.... هتد)، ئەوا بەهیچ شێوەیەك پێش بینی ڕەوشتی ئەخلاقی بەرز لەو جۆرە مندالآنە ناکرێت. چۆن دەتوانین منداڵ فێری ڕەوشتی جوان لەکاتی نان خواردن و قسە کردندا بکەین لەکاتێکدا ئێمە خۆمان بەکردەوە لەبەرچاویان نایکەین. چۆن دەتوانین داوا لەمنداڵەکانمان بکەین کە بڕوایان بەیەکسانی و دادگەری ببێت و لەهەڵس و کەوتیاندا بەرجەستەی بکەن، لەکاتێکدا چواردەوریان پڕە لەزوڵم و ستەم و چەوساندنەوە، چۆن دەتوانرێت منداڵ فێری ڕاست گۆیی و دەست پاکی بکرێت، لەکاتێکدا کە ژینگەکەی پڕ بێت لەدرۆو فرت و فێڵ و تەڵەکەبازی و دەس پیسی. کەواتە دەبێت پێش ئەوەی داوا لەمنداڵەکانمان بکەین کە خاوەنی ئەخلاقی بەرز بن، ئێمەی گەورە خۆمان خاوەنی ئەو ڕەوشت و ئاکارە بەرزانە بین و لەپەیوەندیو هەڵس و کەوتی ڕۆژانەماندا ڕەنگ بداتەوە. ئەی پەندە کوردیەکەی لەمەڕ خۆمان نالێت (گەورە ئاو دەڕێژێ و بچووك پێی لێدەخشێنێ).

## ئایا ڕەوشتی ئەخلاقی ئەگۆڕە؟ :-

هەندێك کەس لەوانەی کە ئاسۆی بیر کردنەوەیان تەسکەو بەتەنها شارەزای کۆمەڵگاکەی خۆیانن، لەو باوەڕەدان کە تەنها ڕەوشت و هەڵس و کەوتی ئەوو کۆمەڵەکەی ئەخلاقی و ڕاستن و ئیتر ڕەوشت و هەڵس و کەوتی گەل و نەتەوەکانی تر کە جیاوازن لەڕەوشت و هەڵس و کەوتی ئەو ناڕاست و نادروستن. بێگومان ئەمە بۆچوونێکی هەڵەیەو لەگەڵ واقیع و ڕاستیەکانی ژیاندا یەك ناگرنەوە، لەبەر ئەوەی ڕەوشتی ئەخلاقی ڕێژەییەو (نسبی) بەپێ ی کات و شوێن زۆربەیان گۆڕانکارییان بەسەردا دێت. بۆ نموونە زۆر ڕەوشت و هەڵس و کەوت لەسەرەتای سەدەی بیستەم لەکۆمەڵگای کوردەواری بەهەڵەو

نادروست لەقەڵەم دەدرا، بەڵام ئێستا بەڕاست دادەنرێت، بە پێچەوانەشەوە زۆر هەڵس و کەوت، ئەو کاتە بەڕاست و دروست دادەنران بەڵام ئێستا بەهەڵە لەقەڵەم دەدرێن، هەروەها ئەو ڕەوشت و هەڵس و کەوتانەی کە ئێمە بەنادروست و بەدکارییان لەقەڵەم دەدەین لەوانەیە لەکۆمەڵگایەکی تر بەڕاست و گونجاویان دابنێن. هەر لەبەر ئەوەشە کە تاوەکوو ئێستا چەند پێوەرێکی ڕەها (مطلق)ی هاوبەش و نەگۆڕ لەنێوان هەموو شارستانیەت و کۆمەڵگاکاندا نین، بێجگە لەچەند پێوەرو پرانسیپیکی گشتی وەك (یەکسانی، دەست پاکی، ئازایەتی، دادگەری، ڕاست گۆیی... هتد) نەبێت کە ئەوانیش هەندێك جار لەووردەکارییەکانیاندا جیاوازی دروست دەبێت.

لەلایەکی تریشەوە دەرئەنجامی زۆربەی توێژینەوەکان دەری خستووە کە ڕەوشتی ئەخلاقی (ئاکاری) نەگۆڕ نیە بەڵکو بە پێی کات و شوێن و بارودۆخ (الظروف) دەگۆڕدرێت. واتە ئەگەر منداڵ لەماڵەوە درۆ نەکات و ڕاست گۆ بێت ئەوە مەرج نیە کە لەقوتابخانەش هەر ڕاستگۆ دەبێت یان لەکۆڵان و جادە درۆ ناکات یان ئەگەر منداڵ لەقوتابخانە قۆپی (غەش) بکات ئەوە مەرج نیە کە دەبێت لەماڵەوەش قۆپی بکات.

گراهامی (Graham) زانا لەساڵی (١٩٧٢) کۆمەڵێك توێژینەوەی لەو بارەیەوە تاووتوێ کردو گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە تەنها ئەو کاتانە تاك زۆربەی کات ڕەوشتی ئەخلاقی دەبێت، کە بارودۆخەکان زۆر لەیەك بچن یان کاتێك ئەو کەسە دەگاتە بەرزترین ئاستی بیرکردنەوەی ڕووت (التفکیر المجرد)و دەتوانێت پرانسیپ و چەمکە ئاکارییە بنەڕەتی و گشتیەکان لەزۆربەی بارودۆخ و کات و شوێنە جیاجیاکاندا پەیڕەو بکات، ئەو حاڵەتانەش زۆر دەگمەنن.

هەروەها هەردوو زانایان (هارتشۆرن) و (مەی) (Hartshorn & May) لەساڵی (١٩٢٨) توێژینەوەیەکی بەرفراوانیان لەسەر ڕەوشتی ئەخلاقی هەزارەها منداڵ کرد، بەمەبەستی زانینی ڕەوشتە نائاکارییەکانی وەك (قۆپی، درۆ، دزی) کردن لە زۆر

بارودۆخی جیاوازی وەك كاتی (تاقی كردنەوە، یاری كردن، كێبڕكێ، پێش بڕكێ، ناو ماڵ، قوتابخانە، گۆڕەپانی گشتی، شوێنەكانی خودا پەرستی.... هتد). دەرئە نجامی توێژینەوەكەیان بووە مایەی شلۆق كردن و پووچەڵ كردنەوەی بیرو باوەڕی ئەو كەسانەی كە خەڵكیان بەسەر هەردوو گروپی (خاوەن ڕەوشتە بەرزەكان)و (بەد ڕەوشتەكان)دا دابەش دەكردو لەو بڕوایەدا بوون كە ڕەوشتی ئەخلاقی نەگۆڕو بەردەوام و ڕەهایە. لەگرنگترین دەرئە نجامی توێژینەوەكەی (هارتشۆرن) و (مەی) ئەوە بوو كە ڕەوشتی منداڵەكان نەگۆڕ دەبن ئەگەر لەیەك جێگاو بارودۆخ بێت، بەڵام كاتێك جێگاو بارودۆخەكە دەگۆڕدرێت ئەوە بڕیارو ڕەوشتە ئەخلاقیەكانی منداڵەكانیش دەگۆڕدرێت و نەگۆڕی خۆیان لەدەست دەدەن.

بۆ نموونە زۆربەی منداڵەكان لەماڵەوە قۆپیەیان نەدەكرد، بەڵام كاتێك لەقوتابخانە ڕووبەڕووی تاقی كردنەوە دەبوونەوە، ئەوا زۆربەیان پەنایان بۆ قۆپیە كردن دەبرد. بێگومان كۆمەڵێك هۆكاری تایبەتی هەبوون كە دەبوونە هۆی زیاد كردن یان كەم كردنەوەی ژمارەی ئەو منداڵانەی كە قۆپیەیان دەكرد، لەوانە (بوون و ڕەخساندنی بواری قۆپیەكردن، بوون یان نەبوونی ترس و سزاو هەڕەشە كردن، زۆری ژمارەی ئەو منداڵانەی كە قۆپیەیان دەكرد)، واتە ئەگەر بوار هەبوایەو ترسی سزادانیان نەبوایەو زۆربەی منداڵان لەبەر چاوی مامۆستاكانیان قۆپیەیان بكردایە، ئەوا ژمارەی ئەو منداڵانەی كە قۆپیەیان دەكرد زیاتر دەبوو.

شایانی ئاماژە بۆ كردنە لەو كاتەوە تاوەكوو ئەمڕۆ هیچ توێژینەوەیەك دەرئە نجامی ئەو توێژینەوەیەی پووچەڵ نەكردۆتەوە، بەڵكو بە پێچەوانەوە، دەرئە نجامی توێژینەوەكانی زانایان (سیرزو هاوڕێكانی) (Sears.et.al.) لەساڵی (١٩٦٥)و (ئەلێن سمیس) (Allen Smith) لەساڵی (١٩٦٠) لایەنگیری دەرئە نجامی توێژنەوەكەی (هارتشۆرن)و (مەی) دەكەن. (الحمدانی، ١٩٨٩، ص٢٠٠).

ئەوەی پێویستە بگوترێت ئەوەیە کە ڕەوشتی ئەخلاقی ڕاستەقینە ئەو ڕەوشتەیە کە لەناخی تاکەوە هەڵدەقوڵێت و لەئەنجامی بڕواو قەناعەتەوە لەهەڵس و کەوتیدا بەرجەستە دەبێت نەک لەترسی هەڕەشەو هێزو فشاری دەرەکی.

## جۆرەکانی ئەخلاق:-

هەندێک لەفەیلەسووف و زاناکان خەڵکان بەسەر چەند جۆرێکدا دابەش دەکەن و هەر جۆرەیان خاوەنی ئەخلاقی تایبەتی خۆیانن، بەڕای ئەوان جۆرەکانی ئەخلاق ئەمانەی لای خوارەوەن:

### ١. جۆری بەرژەوەندی (النمط النفعي):

ئەو کەسەی خاوەنی ئەم جۆرە ئەخلاقە بێت، ئەوا تەنها ئەو بیرکردنەوەو ڕەوشت و داب و نەریتانە بەباش و ئەخلاقی دەزانێ کە لەگەڵ بەرژەوەندی تایبەتی و تاکە کەسی خۆیدا بگونجێت.

### ٢. جۆری چاولێکەری (النمط الأمتثالي):

ئەو کەسەی خاوەنی ئەم جۆرە ئەخلاقە بێت، ئەوا هەموو ئەو بیرکردنەوەو ڕەوشت و داب و نەریتانە بەڕاست و ئەخلاقی دەزانێت کە زۆربەی خەڵکی بڕوایان پێیەتی و لەسەری ڕێک کەوتوون، واتە ئەم جۆرە کەسانە ئەو شتانە بەئەخلاقی دەزانن کە زۆربەی خەڵکی بەڕاستیان دەزانن، بەڵام ئەگەر زۆربەی خەڵکی بەخراپیان لەقەڵەم دان ئەوا ئەمیش بەخراپیان لەقەڵەم دەدات.

## ٣. جۆری ژیری یان جۆری ویژدان زیندوو (النمط العقلي أو النمط ذو الضمير الحي):

ئەو کەسانەی خاوەنی ئەم جۆرە ئەخلاقە بن، ئەوا پێوەری ڕاست و دروستی و ئەخلاق بەرزی و باش و خراپی کارەکان، لەناو خودی خۆیاندایەو خۆیان کۆمەڵێك پرانسیپ و یاساو پێوەری تایبەتی بۆ باش و خراپی دیاردەکانی ژیان دادەنێن. واتە ئەم جۆرە مرۆڤانە کارێك ناکەن لەبەر ئەوەی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانی تێدایە یان زۆربەی خەلکی بڕوایان پێیەتی، بەلکو تەنها ئەو کارانە دەکەن و بەئەخلاقی دەزانن کە لەگەڵ ئەو بەهاو پرانسیپ و پێوەرو یاسایانەی ناوەوەی خۆیاندا چوون یەکە. کەواتە پێوەری هەڵسەنگاندن لەناو خودی خۆیاندایە نەك لەدەرەوەی.

### بۆکاری بەدئەخلاقی دەکرێت؟:-

زۆر جار ئەو پرسیارە دەکرێت، لەبەرچی کاری بەد ئەخلاقی و نادروست دەکرێت؟ توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەم هۆکارانەی لای خوارەوە دەکەن:-

١. گەشە نەکردنی ویژدان بە پێی پێوست.

٢. جیاوازی لەنێوان شێوازی پەروەردەکردنی خێزان و قوتابخانە (دووفاقی لە پەروەردە کردندا)، واتە کاتێك لەقوتابخانە هەندێك کارو کردار بەئەخلاقی دادەنرێن کەچی لەماڵەوە بەبێ ئەخلاقی دادەنێن، لەو بارودۆخە تەم و مژاویەدا منداڵ سەری لێدەشێوێ و ناتوانێت بەئاسانی باش و خراپەکان لەیەکتری جیا بکاتەوە، ئەو کاتەش ناچار دەبێت مل کەچی یەکێك لەو دوو دامەزراوە (قوتابخانە یان خێزان) ببێت و ئەوی تریشیان بەتاوانباری لەقەڵەم دەدات. لەلایەکی تریشەوە جیاوازی نێوان پەروەردەی دایك و باوکیش هەمان دەرئە نجامی پێشووی هەیە.

٣. هۆكاری بایۆلۆژی. جیاوازی بایۆلۆژی لەنێوان تاكەكانی كۆمەڵدا هەیە، كە ئەوش بۆ جۆری كۆئەندامی دەماری ناوەندییان دەگەڕێتەوەو دەبێتە هۆی ئەوەی هەندێك منداڵ بەجارو دوو جار فێری ڕەوشتی ئەخلاقی نەبن، بەڵكو پێویستیان بەوە هەیە كە چەندەها جار بۆیان ڕوون و دووبارە بكرێتەوە تاوەكوو فێر بن. ئەم ڕاستیەش دەرئەنجامی زۆربەی توێژینەوەكان سەلماندوویانە، هەروەها تاقی كردنەوەكانی بافلۆفیش ئەو ڕاستیەیان ئاشكرا كرد، كە هەندێك لەسەگەكان تەنها پێویستیان بەدوو سێ جار دووبارە كردنەوەی پرۆسەكە هەبوو بۆ ئەوەی وەلآمدانەوەی مەرجایەتیان (الأستجابة الشرطية) لەلا دروست ببێت، بەلآم هەندێكی تریان پێویستیان بە (٢٠٠) تا(٣٠٠) دوو سەد تا سێ سەد جار دووبارە كردنەوە هەبوو بۆ ئەوەی وەلآمدانەوەی مەرجایەتی لەلایان دروست ببێت. (فتحي، ١٩٨٣، ص١٤).

## ڕۆڵی دایك و باوك و مامۆستا لەگەشەكردنی ئەخلاقیدا :-

١. دەبێت دایك و باوك و مامۆستاو كەسانی چواردەوری منداڵ نموونەو پێشەوای (قدوة) باش و بەكەڵك بن. چونكە منداڵ لەڕێگەی لاسایی كردنەوەو خۆخستنە شوێنەوە زۆر لەهەڵس و كەوتەكانیان فێر دەبێت.

٢. منداڵ بەپلەی یەكەم لاسایی ئەو كەسانە دەكاتەوە كە لەلای خۆشەویستن، وە زۆر كەم لاسایی ئەو كەسانە دەكاتەوە كە هێمای ترس و هەڕەشەو تۆقاندنن. لەبەرئەوە زۆر پێوستە كە دایك و باوك و مامۆستا دڵنەرم و بەبەزەیی و خۆشەویست بن.

٣. دەبێت ڕێككەوتن و تێگەیشتنێكی هاوبەش لەنێوان خێزان و قوتابخانە لەسەر پێوەرو ڕەوشتە ئەخلاقیەكان هەبێت، نابێت هەندێك پێوەرو ڕەوشت لەنێوانیان جێگەی مشت و مڕو مایەی گرژی و جیاوازی بێت، بەڵكو دەبێت هەردوولایان كۆك بن لەسەر باشی و خراپی ڕەوشت و هەڵس و كەوتەكان.

٤. دەبێت قسەو گفتی دایك و باوك و مامۆستا لەگەڵ کردارو کردەوەکانیاندا چوون یەك بن. واتە نابێت بەقسەو گفت شتێك بڵێن و بەکردەوەش پێچەوانەکەی بکەن. چونکە ئەوە منداڵ تووشی دووفاقی (الأزدواجية) دەکات و نازانێت بەکامیان بڕوا بکات، وە دەبێت مرۆڤ بەکردەوە نموونەی بەرز بێت نەك بەقسە (العاني، ١٩٨٩، ص٩٧-٩٨).

٥. دەبێت دایك و باوك لەسەر ڕاست و هەڵەی ڕەوشتەکان کۆك بن، نابێت جیاوازی و دژایەتی لەنێوانیادا هەبێت.

٦. پێویستە زانیاری تەواو دەربارەی ڕەوشتە ئەخلاقیەکان بەمنداڵ بدرێت، چونکە نەبوونی زانیاری و کەمی شارەزایی، منداڵ تووشی هەڵەو بەدکاری دەکات.

٧. پێویستە لەسەر دایك و باوك و مامۆستا، تادەتوانن لەلێدان و سوکایەتی پێکردن و تۆقاندنی منداڵەکانیان دوور بکەونەوە.

یاریکردن و گەشەی منداڵ
چیرۆک و پەروەردەکردنی منداڵ
خوێندنگاو رۆڵی لە دروستی دەروونی منداڵ
ئایا راستە منداڵ کاولکەرو تێکدەرە ؟
سزادانی منداڵ
منداڵی نازدار
منداڵی گێل
منداڵی گەمژە
منداڵی دەبەنگ
منداڵی مەنگۆلی
منداڵ بۆ درۆ دەکات ؟
چکۆسی
بروا بەخۆنەبوون
دواکەوتن لە خوێندن
شەرمکردن
هەستکردن بەکەمی

## یاری كردن و گەشەی منداڵ

یاری كردن چالاكیەكە منداڵ پێی هەڵدەستێت بەمەبەستی چێژ لێ وەرگرتن و هەست كردن بەخۆشی، نەك بەفیڕۆدانی كات و لاساری كردن وەك زۆر لەباوكان و دایكان بۆی دەچن، وە لەڕێگەی یاری كردنەوە منداڵ زۆر شت فێردەبێت، لەوانە ڕۆڵی كۆمەلایەتی و توخمی خۆی كەلەپاشەڕۆژدا دەبێت بەبەشێك لەكەسایەتی و ڕەوشتی، هەروەها ئەم چالاكیە هۆكارێكی گرنگە بۆ گەشەكردنی كۆمەلایەتی و جەستەیی و ژیری و هەڵچوونی منداڵ، وە لەڕێگەیەوە شارەزای ژینگەكەی دەبێت و لەئەنجامی ئەم دیوو ئەو دیوی ژینگەكەی زانیارییەكی زۆری دەست دەكەوێت، وە ئەم چالاكیە زۆرجار دەبێت بەئامرازێك بۆ ڕزگاربوونی منداڵ لەزۆر حاڵەتی ترس و دڵەڕاوكێ و گرژی و تێركردنی هەندێك لەحەزو ئارەزووە كپكراوەكانی ئەو منداڵانەی كەژینگەی خێزانی و كۆمەلایەتیان ئاڵۆز و دژوار و پڕ لەگیروگرفتە.

هەروەها منداڵ لەمیانەی یاری كردنەوە جیهانێكی خەیاڵاوی و ئەفسوناوی بەچێژ بۆ خۆی دەخوڵقێنێ و خۆی دەبێت بەپاڵەوانی ئەو جیهانەو ئەسپی خەو و خەیاڵی خۆی تیایدا تاو دەدات و گشت ئەو خەو و خەیاڵ و حەزو ئارەزوو داخوازیانەی كەلەژیانی واقیعیدا بۆی تێر ناكرێت، لەم جیهانە پان و بەرینەدا بەئارەزووی خۆی بەبێ ترس و سانسۆر تێریان دەكات، كەئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو منداڵە لەزۆر گرێ ی دەروونی چاوەڕوان كراو ڕزگاری بێت.

## تیۆرییەكانی یاری كردن

یاری كردنیش وەك زۆربەی دیاردە دەروونی و كۆمەلایەتیەكانی تر خراوەتە بەر تیشكی لیكۆلینەوە و زۆر لەدەروونزان و كۆمەلناسەكان خۆیان پێوە خەریك كردووەو بەزۆر شیوەی جیاجیا ماناو مەبەستی یاریكردنیان لیكداوەتەوە. گرنگترینیان ئەمانەی لای خوارەوەن:-

### ١) فرۆید:

یاریكردن لای فرۆید ئامرازو كەرەستەیەكە بۆ خالی كردنەوەو دەرچوون و رزگار بوون لەزۆر باری هەلچوونی كپ كراوو پەشێوی دەروونی، بەتایبەتی ئەو حەزو ئارەزوو داواكارییانەی كەلەنەستی مرۆڤدا كپ و خەفەكراون و ناتوانرێت راستەوخۆ و ئاشكرا لەجیهانی واقیعیدا تیر بكرێت، بەلام مندال دەتوانێت لەرێگەی یاریكردنەوە هەندێك لەو حەزو ئارەزوو داواكارییانە تیر بكات، بۆ نموونە، مندال كاتێك لەخێزانێكی نائاسایی و پر لەگیروگرفتدا دەژی و زۆرجار دەكەوێتە بەر شالاوی لێدان و ئازار و سوكایەتی پێكردنی باوك و دایكی یان كەسانی تری چوار دەوری، ئەو مندالە بەستەزمانە لەم كاتەدا رق و كینەو تورە بوونێكی پیرۆزی لا دروست دەبێت بەلام ناتوانێت بەئاسانی لێ ی رزگار بێت چونكە لەلایەك داب و نەریتی كۆمەلایەتی رێگە بەمندال نادات بەگژ دایك و باوكیدا بچێتەوە .

لەلایەكی ترەوە لاوازی و بێ دەسەلاتی و كەم توانایی مندالیش لەچاو باوك و دایكیدا ، وا لەو مندالە دەكات كەئەو رق و كینەو تورەییەی كپ و خەفە بكات و لەهەستی خۆی دووری بخاتەوەو دەروازە پۆلایینەكانی نەستی لەسەر دابخات، بەلام ئەم بەند كردن و دوورخستنەوەیە كاتیەو هەر دەبێت مندال لێی رزگار بێت، ئەگینا تووشی چەندەها گرێ ی دەروونی و نەخۆشی دەكات، لەگرنگترین دەروازەكانی رزگار بوونیش یاری

کردنە، کەمنداڵ دەتوانێت لەمیانەی یاری کردن و شکاندنی بووکە شووشەو چاوهەڵکەندنی و پان کردنەوەیی و قژ دەسکەنە کردنی، تۆڵەی خۆی بکاتەوەو داخی دڵی خۆی بەو کەل وپەل و ئامرازی یاری کردنانە بڕێژێ، کەلەدڵ و دەروونی خۆیدا لەجیاتی دایکە و باوکی دایان دەنێت. واتە ئەو یارییانە دەبن بەهێما (رمز) بۆ زۆرداری و زوڵمی دایکە و باوکە و کەسانی تری چواردەور.

*۲) تیۆری کورت کردنەوە:*

خاوەنی ئەم تیۆرە (ستانلی هول، ئدرندیکە و هنری بت)ن کەدەڵێن یاریکردن تاڕادەیەکی زۆر لەنێوان منداڵی مرۆڤ و بێچووی ئاژەڵدا چوون یەکن و بۆماوەین (وراثی) وە گوزارشت لەسەرجەم قۆناغەکانی مرۆڤایەتی دەکەن، واتە منداڵ لەمیانەی یاریکردنەوە گشت ئەو قۆناغانە دووبارە دەکاتەوە کە باب و باپیرو سەرجەم مرۆڤایەتی لەسەرەتای ژیانەوە تاوەکو ئەمڕۆ پیایدا تێپەڕیون، بۆ نموونە کاتێکە منداڵ یاری بەئاو دەکات ئەوە گوزارشت لەقۆناغی (ماسی) دەکات، کاتێکە مرۆڤ ماسی بووەو لەدەریادا مەلەی کردووە، سەرکەوتن و هەڵبەزو دابەز بەسەر دارو بەردو دیوارو بەریەستدا پەیوەستە بەو قۆناغەی کە مرۆڤ مەیموون بووە، هەروەها یاری و حەزی منداڵ بۆ ڕاوکردن و ڕاونان و چاوشارکێ وکشتوکاڵ، گوزارشت لە قۆناغەکانی ڕاوکردن و کشتوکاڵ دەکات کە مرۆڤ لەیەکێکە لەقۆناغەکانی ژیانیدا پێ ی هەڵساوە، واتە یاری منداڵ پەیوەستە بەقۆناغەکانی گەشەکردنی مرۆڤایەتیەوە.

*۳) تیۆری ئامادەکردن بۆژیان:*

دانەری ئەم تیۆرە (کارل گرۆسە) کە دەڵێت یاری، ئامرازێکە بۆ ئامادەکردنی منداڵ بۆ پاشەڕۆژ، واتە یارییەکانی منداڵ دەبێتە هۆی پتەو کردن و ڕاهێنانی ئەندامەکانی لەشی منداڵ بۆ کارو پیشەکانی قۆناغی هەرزەکاری و کامڵی و پەیوەستە

بەململانێ ی مرۆڤ لەتەک دەوروبەر، (گرۆس) دەڵێت كاتێک منداڵ لەكاتی یاریكردن دەستو قاچو پەنجەو لەش دەجوڵێنێت ، مەبەست لەوە زاڵ بوونە بەسەر جوولەو چۆنیەتی بەكار هێنانی ئەندامەكانی لەش لەپاشەڕۆژدا، بۆ نموونە:_

كاتێک بێچووە پشیلە یاری بە گلۆلە دەزوویەک یان تۆپەڵە خوورییەک دەكات، ئەوە ڕاهێنان و خۆ ئامادەكردنە بۆ ڕاوكردنی مشک لەداهاتوودا، هەروەها یاری كردنی منداڵ بە تفەنگ و دەمانچەو شیرو تیر، خۆئامادەكرنە بۆ یاریكردنی ڕۆڵی جەنگاوەر لەپاشە ڕۆژدا وەیاریكردنی كچ بە كەل پەل و كەرەستەی چێشتخانەو دروومان و چاودێری منداڵ، خۆئامادەكردنە بۆ یاریكردنی ڕۆڵی ئافرەت لەپاشەڕۆژدا، وەگرنگترین بۆچوونی ئەم تیۆرە ئەوەیە كە یاریكردن چالاكیەكی بەئامانجە، هەر چەندە زۆر جار وادەردەكەوێت كەكات بەفیڕۆدانە (وافی، ١٩٨٥،ص٩-٢٢).

***٤) تیۆری زیادە ووزە:-***

خاوەنی ئەم تیۆرە (هربرت سبنسر)ی فەیلەسوفی ئینگلیزیە، كە دەڵێت منداڵی مرۆڤو بێچوی ئاژەڵ ووزەو چالاكیەكی لەڕادەبەدەریان هەیە وە لەڕێگەی یاریكردنەوە ئەو منداڵ و بێچووانە لەو ووزەو چالاكیانە ڕزگاریان دەبێت و تووشی جۆرە هاوسەنگیەک دەبن و ئەو یاریكردنە دەبێتە هۆی خاڵی كردنەوەو مژینی ئەو ووزە زیادەی لەلای ئەو منداڵ و بێچووانە هەیە.

ئەگەر بەووردی سەنجی ئەو تیۆرانەی سەرەوە بدەین، بۆمان دەردەكەوێت كە هەریەكەیان لەگۆشەنیگایەكەوە ڕوانیویانەتە یاریكردن، كەچوون یەک بووە لەتەک بۆ چوونو فەلسەفەو بیرو باوەڕیان، وە زۆربەیان تەواوكەری یەكترین، واتە یاریكردن سودوقازانجێكی زۆر بەمنداڵ دەگەیەنێ، بۆ نموونە منداڵ لەمیانەی هەندێک یاری وەک (هەڵپەڕكێ و چاوشاركێ و دامەو سێ ڕسكێن و هەڵماتێن و.... هتد ) فێری زۆر داب و

نەریت و ڕەوشتی کۆمەڵایەتی دەبن وە لەڕێگەی یارییەکانی (تۆپ تۆپێن، هەڵوکێن، خەت خەتێن، بازدان، ڕاکردن، سەرکەوتن و دابەزین...هتد) زۆر لەئەندامەکانی جەستەی منداڵ بەهێز دەبێت، هەروەها هەندێک یاریش دەبێتە هۆی زیادکردنی شارەزایی منداڵ و ڕاهێنانی هەستەوەرەکانی (حواس) :

لەلایەنی هەڵچوونیشەوە قازانجێکی زۆری پێدەگات، لەبەرئەوە زۆر هەڵەیە بەربەست لەبەردەم یاریکردنی منداڵدا دابنرێت بەبیانووی ئاژاوەو لاساری و خەو حەرام کردن و ئازاردانو...... هتد، چونکە قەدەغەکردنی منداڵ لەیاری کردن مانای شێواندنی گەشەی منداڵ و بێ بەش کردنیەتی لەگەورەترینو بەچێژترین چالاکی کەتایبەتە بەقۆناغی منداڵیەوە، لەبەرئەوە زۆر پێویستە لەسەر دایکە و باوک کە بەپێ ی توانا کەرەستەو کەلو پەلی یاریکردن بۆ منداڵەکانیان پەیدابکەن و جێگای یاریکردنیان بۆ دابین بکەن، <u>*وەزۆر خاسیەت و مەرج هەیە دەبێت ڕەچاو بکرێت لەکاتی پەیداکردن و کڕینی کەل وپەل و کەرەستەی یاریکردن بۆ منداڵ لەوانەش ئەمانەی لای خوارەوەیە:-*</u>

١) بریقەدارو ڕەنگاو ڕەنگ بێت ٢) سوک و نەرم و نیان بێت ٣) بتوانرێت بەئاسانی بشۆردرێت و پاک بکرێتەوە٤) بارستاییەکەی ئەوەندە ببێت منداڵ نەتوانێت قووتی بدات ٥) تیژ نەبێت بۆ ئەوەی ئازاری منداڵ نەدات ٦) جۆرەبەرگرییەکی تێدابێت و بەئاسانی نەشکێت ٧) لەتەک تەمەن و قۆناغی گەشەکردنی منداڵەکەدا بگونجێت، بۆ نموونە کەرەستەی یاریکردن ئاسان و سادەبێت باشترە بۆ منداڵی بچکۆلە لەکەرەستەی ئاڵۆزو گرانی کارەبایی یان میکانیکی، چونکە لەتوانای منداڵی بچوکدا نییەو لەتەک ژیری و لێ هاتوی ئەودا ناگونجێ و چێژی لێ وەرناگرێت. بەڵام منداڵی گەورە چێژ لەو کەرەستە ئاڵۆزو میکانیکی و کارەباییانە وەردەگرێت. بۆ چوونێک هەیە لەهەڵبژاردنی کەرەستەی یاریکردنی منداڵدا ئەویش ئەوەیە، منداڵ چەند بچوک بێت، دەبێت ئەوەندە کەرەستەی یاریکردنی گەورەو سادە بێت، وەچەند گەورە بێت، دەبێت ئەوەندە یارییەکانی بچوک و ئاڵۆزبێت.

## چیرۆک و پەروەردەکردنی منداڵ

بەزۆر شێواز دەتوانرێت منداڵ ڕۆشنبیرو پەروەردە بکرێت، یەکێک لەو شێوازانەش گێڕاندنەوەو خوێندنەوەی چیرۆکە بۆ منداڵان، هەموومان دەزانین کەچیرۆک و حیکایەت مێژوویەکی دوورو درێژی هەیەو نەوە لەدوای نەوە بۆ یەکتریان گواستۆتەوەو بووە بەفۆلکلۆرو سەرمایەو شارستانیەتی، بێگومان چیرۆکیش بەشێکی گرنگی ئەو شارستانیەتەیە. چیرۆکە بەپێ ی ناوەڕۆکەکەی دەتوانرێت دابەش بکرێت بۆ چەندەها جۆر، لەوانە (چیرۆکی گاڵتەو گەپ و پێ کەنیناوی، سۆزو خۆشەویستی، دەروونی، فەلسەفی، سیاسی، ئایینی، کۆمەڵایەتی، هێمایی [رمزی]...هتد) چیرۆکە گرنگیەکی زۆری هەیە لەژیانی منداڵدا، چونکە پڕیەتی لەبەسەرهات و ڕووداو داب و نەریت و ئاکاری جوان و ڕۆشنبیری و زانیاری منداڵ زیاد دەکات، دەتوانین گرنگی چیرۆکە لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:-

١) هۆکارێکی گرنگە بۆ دەوڵەمەند کردنی زمانی منداڵ و پاراو کردنی بەووشەو زاراوەو ڕستەی جۆراوجۆر. لەڕێگەی گێڕاندنەوەی چیرۆکەوە منداڵ فێری زۆر کون و کەلەبەری زمانەکەی و سەرمایەی زمانی زیادو دەوڵەمەند دەبێت، هەروەها کاتێکە منداڵ دووبارە ئەو چیرۆکانە لەسەر زمانی خۆی بۆ کەسانی تر دەگێڕێتەوە زیاتر زمانی دەوڵەمەندتر دەبێت.

٢) منداڵ لەڕێگەی چیرۆکەوە شارەزایی و زانیارییەکی زۆری لەبارەی ژیان و زۆربەی بوارەکانیەوە بۆ پەیدا دەبێت. شارەزای هەندێکە لایەنی ژینگەی جوگرافی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی وڵاتەکەی دەبێت، زانیاری دەربارەی پاڵەوان و سەرکردەو ناودارانی گەلەکەی دەبێت، بێجگە لەزانیاری لەبوارە زانستیەکاندا.

٣) منداڵ لەڕێگەی چیرۆکەوە فێری زۆر سیفات و ڕەوشتی جوانی کۆمەڵایەتی و مرۆڤانە دەبێت لەوانە (ڕاستگۆیی، دەست پاکی، وەفاداری، هاوڕێ یەتی، نیشتمان پەروەری، دڵسۆزی، دادوەری...هتد) وە خراپی و دزێوی زۆر سیفات و خاسیەتی ناشیرینی بۆ ڕوون دەبێتەوە لەوانە (درۆ، دزی، تاوان، فرتو فێڵ...هتد). کەئەمە خۆی لەخۆیدا پەروەردەکردنێکی گیانی و ئاکارییە بۆ منداڵ.

٤) هەندێک لەپرۆسەکانی ژیری، لەڕێگەی لەبەرکردن و گێڕاندنەوەی چیرۆکەوە دەتوانرێت گەشەی پێ بدرێت و منداڵ لەسەریان ڕابهێنرێت، لەوانە (ئاگاداری، چاو تێبڕین، یادکردنەوە، بەراورد کردن، دەوڵەمەند کردنی خەیاڵ و بۆچوون).

٥) منداڵ دەتوانێت لەڕێگەی چیرۆکەوە لەزۆر گرژی و ئەندێشەی دەروونی ئاڵۆز ڕزگاری بێت، چونکە زۆر لەناوەڕۆکی چیرۆکەکان دەبنە هۆی (پێ کەنین و گریان و گاڵتەجاڕی و تووڕەبوون و هاوارکردن و ناڕەزایی...هتد). کەسەرجەم ئەمانە دادەنرێن بەدەروازە بۆ بەتاڵ کردنەوەی ئەو بارگە هەڵچوونیە کۆکراوانەی ناوەوەی منداڵ و ڕزگار بوون لێ یان، هەندێک لەدەروونزانەکان چیرۆک وەک شێوازێک بۆ دەست نیشان کردن و چارەسەرکردنی هەندێک لەنەخۆشیە دەروونیەکان بەکار دەهێنن، چونکە هەندێک جار بەسەرهات و ڕووداوەکان و ڕۆڵی پاڵەوانی چیرۆکەکان زۆر نزیکن لەژیان و بەسەرهات و گرفتی زۆر لەو منداڵانەی کەگوێ بیستی دەبن یان دەیبینن ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ سودی لێ وەردەگرن و لەڕێگەی خۆخستنە شوێن و لاسایی کردنەوە، منداڵەکانیش لەو گرفت و ئەندێشە دەروونیانەیان ڕزگاریان دەبێت و وەک هێماو (ئیحایەک) کاریان تێ دەکات و دەبێت بەجۆرێک لەچارەسەری دەروونی بۆیان.

**بەلام ئەم ئامانج و گرنگیانەی سەرەوە نایەنەدی ئەگەر لەکاتی گێڕاندنەوەو باس کردنی چیرۆکدا رەچاوی ئەم خالانەی خوارەوە نەکرێت :-**

١) دەبێت ئەو چیرۆکانە لەئاستی زیرەکی و ژیری و قۆناغی مندالەکاندا بێت و پەیوەست بێت بەحەزو ئارەزوو خەوو خەیالیانەوە.

٢) دەبێت ئەو کەسەی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە بەشێوەیەکی سادەو ساکارو بەزمانێکی پاراوو بەدەنگێکی زولال و تۆنێکی گونجاوو تام و چێژەوە بۆ مندالەکانی باس بکات بۆ ئەوەی کاریگەری خۆی بەجێ بهێلێ.

٣) نابێت چیرۆکەکە زۆر درێژ بێت و مندال تووشی ناڕەزایی و بێزاری بکات.

٤) نابێت ناوەڕۆکی چیرۆکەکە دڕنداوی و خوێناوی و پڕ لەترس و تۆقاندن بێت، تا دەتوانرێت دەبێت پالەوانەکانی خاوەنی سیفات و ڕەوشتی جوانی مرۆڤایەتی بن و سیفات و خاسیەتە دزێوو نامرۆڤایەتیەکان دەبێت سوک و ڕیسوا بکرێتو ببن بەپەند بۆ خاوەنەکانیان و مندال سودی لێ وەربگرێت و لەدوا ڕۆژدا لێ ی دوور بکەوێتەوە.

٥) دەبێت گولبژێر بکرێت، واتە ئەو چیرۆک و بەسەرهاتانە بۆ مندالان باس بکرێت کەلەگەل سەردەم و داب و نەریت و ئاکاری کۆمەلایەتیدا دەگونجێت و لەو چیرۆکانە دوور بکەوێتەوە کەناوەڕۆک و بەسەرهاتەکانی هیچ سودو قازانجێک بەمندالانمان ناگەیەنێت.

## قوتابخانەو رۆڵی لەدروستی دەروونی منداڵاندا

منداڵ کاتێک بۆ یەکەم جار ماڵ ئاوایی لەماڵەوە دەکات و ڕوو دەکاتە گۆرەپانی قوتابخانەو دەبێت بەقوتابی، ڕووبەڕووی کۆمەڵێک گرفت دەبێتەوە، ئەگەر پشتگوێ خراو مامەڵەی زیرەکانەی لەتەکدا نەکرا، ئەوکاتە ناتوانێت بەئاسانی خۆی لەتەک ژینگەی قوتابخانەدا بسازێنێ و تووشی کۆمەڵێک گرفت دەبێت. لەبەرئەوە ئەرکی سەرشانی قوتابخانەیە کەدەست نیشان و چارەی گرفتەکانی بکات. گرفتەکانیش لەئەنجامی ئەو ژینگە تازەیەوە دروست دەبێت کەبۆ یەکەم جار منداڵ ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، ئەویش ژینگەی قوتابخانەیەو زۆر شتی تازەیەو منداڵ ئاشنایەتی لەتەکیاندا نیە لەوانە (خشتەی وانەکان کەکاتەکانی دیاریکراوەو منداڵ ناتوانێت پشت گوێیان بخات، دەبێت بەپێ ی پێوەرو یاساو دابو نەریتی تایبەتی هەڵسو کەوت بکات، لغاو کردنی چالاکیە هەرەمەکیو سەربەستەکانی، بەستنەوەی منداڵ لەپۆلدا لەسەر کورسیەکی ڕەق و تەق، جێ بەجێ کردنی ئەرکەکانی قوتابخانە، ململانێ لەسەر دەستکەوتنی سۆزو خۆشەویستی و بەزەیی مامۆستا، ڕێگە پێنەدان بەمنداڵ بۆ ئەوەی بەئارەزووی خۆی قسە بکات، پێکەنینو هاوارکردنی لێ قبوڵ ناکرێت لەناو پۆلدا...هتد). کەسەرجەم ئەم داواکاریو گۆڕانکارییانە پێچەوانەی داوکارییەکانی ژینگەی پێش هاتنە قوتابخانەیەتی، لەبەر ئەوەی منداڵ پێش تەمەنی شەشساڵانی سەربەستەو بەئارەزووی خۆی هەڵبەزو دابەز دەکات و مەرج و یاساو سنوور نیە بۆ چالاکیەکانی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی کەهو دیاریکراونو بەئارەزووی خۆی هاوار دەکاتو پێدەکەنێت و دەگری و یاریی دەکات.

بێگومان ئەم گۆڕانکارییە کتوپڕە لەژیانی منداڵداو چوونە قوتابخانەی دادەنرێت بەناسکترین و شلۆقترین کات، بەتایبەتی هەفتەکانی یەکەمی چوونە قوتابخانەی، ئەوەی زیاتر قورەکە خەستترو گرفتەکان ئاڵۆزتر دەکات کەسایەتی لاوازو پەروەردەی هەڵەی خێزانەکەیەتی، چونکە زۆرجار هاتنی منداڵ لەژینگەیەکی خێزانی نائاسایی و پڕ

گرفتەوە کێشە بۆ قوتابخانەو گرفت بۆ منداڵەکە دروست دەکات. کاتێک منداڵ لەناو خێزاندا نازدار بەخێو دەکرێت و سەربەستیەکی لەڕادەبەدەری دەدرێتێ، یان بێزراو پشتگوێ دەخرێت و بەڕەڵا دەکرێت و هەڵەکانی بۆ ڕوون ناکرێتەوە یان ئازار دەدرێت و سوکایەتی پێ دەکرێت و توندوتیژی لەبەرانبەر بەکار دەهێنرێت و ڕانەهێنرا بێت لەسەر پشت بەخۆ بەستن و بڕوا بەخۆبوون و هەست بەکەمی بکات، لەئەنجامدا کەسایەتی ئەو منداڵە دەشێوێ و بەزەحمەت دەتوانێت خۆی لەتەک قوتابخانەدا بسازێنێ و بەردەوام پەنا بۆ میکانیزمە بەرگرییە دەروونیەکانی وەک (چەپاندن، هۆهێنانەوە، بەسەرا بڕین، خۆخستنە شوێن، دەست درێژی...هتد) دەبات، هەروەها زۆرجار بەداخەوە هەندێک مامۆستا ڕاو بۆچوونی هەڵەیان دەربارەی ڕەوشت و هەڵس و کەوتی ئاسایی و درێوی منداڵ هەیە، بەڕای ئەوان (پسکەپسک، سوور بوون لەسەر ڕاوبۆچوون، بەجەرگی، جوولەی بەردەوام، حەز کردن بەزانینو ئەم دیوو ئەو دیو کردنی دیاردەکان، زۆر پرسیار کردن، بەرکەوتن و شکاندنی هەندێک کەل و پەلی قوتابخانە) جۆرێکە لەلاساری و سەرکێشی منداڵ، بەڵام بەڕای پزیشکو دەروونزانەکان ئەو هەڵس و کەوتانە ئاساییەو بەڵگەی کۆڵ نەدان و سوور بوونە لەسەر ژیان. بەپێچەوانەشەوە هەندێک مامۆستا لەو بڕوایەدان کە(شەرم کردن، گومانو مل کەچی، مەلوولی و داماوی، ترس، بێ دەنگی و نەجوولان) بەڵگەن بۆ ژیری و بەئەدەبی ئەو منداڵانە، لەکاتێکدا دەرونزانەکان بەنیشانەی پاشەکشێ و بوونی گرێ و ململانێ ی دەروونی دادەنێن.

بەم شێوەیە مامۆستا ڕەوشتە ئاساییەکان بەنائاسایی و چەوتەکان بەڕاست لەقەڵەم دەدات و دەردی منداڵ گرانتر دەکات، لەبەرئەوە پێویستە لەسەر قوتابخانە کەژینگەیەکی پەروەردەیی کۆمەڵایەتی گونجاو بخوڵقێنێت بۆ قوتابیەکان و گرفتەکانیان دەست نیشان و چارەسەر بکات و ڕەچاوی جیاوازی تاکایەتی نێوانیان بکات و هەلس و کەوت و مامەڵەی دکتاتۆریانە نەبێت و، گیانی هاوکاری و تەباییان تیدا بچێنێت و هەل و بواری سەرکەوتنیان بۆ زیاد بکات و کۆسپ و سەرنەکەوتنەکانیان کەم بکاتەوەو بەهاوکاری خێزانەکانیان ڕەوشتە هەڵەکانیان ڕاست بکەنەوە و شارەزاییەکی باشیان لەسایکۆلۆژیەتی منداڵدا هەبێت، ئەم ئەرکانەش جێ بەجێ ناکرێت ئەگەر بەڕێوەبەری بەبەزەیی و سەرکەوتووی نەبێت و مامۆستا دەرویشی پیشەو هاوسۆزی منداڵان نەبێت و پرۆگرام و شێوەکانی وانە ووتنەوە لەتەک حەزو ئارەزوو توانستەکانی فێرخوازاندا چوون یەک نەبێت و ژینگەی قوتابخانە بەرفراوان و بێ گرفت نەبێتو پەیوەندی پتەو لەنێوان مامۆستایان و خوێندکاراندا نەبێت و سەرجەم وەک خانەکانی هەنگ لەخزمەتی پرۆسیسی پەروەردەو فێرکردندا نەبن.

## ئایا ڕاستە منداڵ کاول کەرو تێکدەرە؟

منداڵ بۆ ئەوەی بەتەواوی و بێ گیروگرفت و گرێ ی دەروونی گەشە بکات، پێویستە ژینگەی ئاسایی و لەباری بۆ بخوڵقێندرێ کەچوون یەک بێت لەتەک پێداویستی قۆناغەکانی گەشەکردن، یەکێک لەگرنگترین پێداویستیەکانی منداڵ، زانینی دەوروبەرو ئەو ژینگەیەیە کەتیایدا دەژی. کاتێک منداڵ بۆ یەکەم جار دەچێتە جێگایەکی تازەوە یان کەل و پەل و شتێکی تازە دەبینێت لەئەنجامی پاڵنەرو ڕەمەکی ئارەزووی شت زانینەوە هەوڵ دەدات شارەزایی تەواو لەبارەی ئەو جێگاو کەل و پەلە تازانەوە پەیدا بکات، دوور نیەو لەوانەیە لەئەنجامی هەڵس و کەوتی منداڵەوە زەرەرو زیان بەو جێگاوکەل و پەلانە بکات، ئالێرەوە گیروگرفتەکە سەر هەڵدەدات.

پێویستە دایک و باوک و گشت ئەو کەسانەی مامەڵە لەگەڵ منداڵ دەکەن چەند ڕاستیەک هەیە بیزانن، لەوانە منداڵ بۆ ئەوەی شارەزایی و کارامەیی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیادو فراوانتر ببێت، پێویستی بەوە هەیە کەهەموو دیاردەکان (بەتایبەتی جەستەیی و ماددی و هەست پێ کراوەکان) ئەم دیوو ئەو دیو بکات، چونکە هەموویان تازەو سەرنج ڕاکێش و نامۆن بەلای منداڵەوە، لەبەرئەوە بەردەوام هەوڵ دەدات پێکهاتەو پارچەکانیان بزانێت و لەڕێگەی تێک دانیان و کردنەوەو هەڵوەشاندن و دووبارە دروست کردنەوەی کەل و پەل و کەرەستەکان و پرسیار کردن لەبارەیانەوە، شارەزایی پەیدا دەکات. ئینجا زۆرجار لەکاتی یاری پێ کردن و ئەم دیوو ئەو دیو کردنیاندا لەوانەیە هەندێک لەو کەل و پەل و کەرەستانە بشکێن و ئا لێرەدا منداڵ بەتێکدەرو کاولکەر ناو دەبرێت و لەوانەشە ئازارو لێدانیشی بەرکەوێت.

بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە منداڵ هەموو گیانی هێزو وزەو جوولەیەو بەردەوام هەڵبەزو دابەزیەتی و بەڕاست و چەپی خۆیدا دەگەڕێت، هەموویشیان لەئەنجامی ڕەمەکی حەز بەزانینی شتەکانو تاقیکردنەوەوەیە. دەتوانین لەمیانەی ئەم چەند نموونەی خوارەوە

زیاتر مەبەستەکەمان ڕوون بکەینەوە. کاتێک منداڵ دەبینێ باوکی خەریکی کاتژمێرەکەیەتی، ئەم دیاردەیە تازەو نامۆیە بەلای منداڵەکەوە، لەئەنجامی ئەو ڕەمەکەوە منداڵ هەوڵ دەدات ئەویش وەک باوکی ئەو کاتژمێرە ئەم دیوو ئەو دیو بکات و ئەگەر پێویستی کرد تێکی بداتو هەموو نهێنیەکانی ئەو کاتژمێرە بزانێت و تێنوێتی لێی بشکێ، دوای ئەوە فڕێی دەدات و ئیشی پێ ی نامێنێ، بەڵکو لەئەنجامی نەزانی و کەم شارەزایی و توانایی منداڵەکەوە لەوانەیە کاتژمێرەکە بەساغ و سەلامەتی لەبەردەستی ئەم تازە پێگەیشتوەدا ڕزگاری نەبێت و تووشی زیان و کەم و کورتی ببێتو منداڵەکەش بکەوێتە بەر هەڕەشەو لێدانی باوکەکەی و بەتێکدەرو شەڕخوازیش تاوانبار بکرێت. یان کاتێک دایک خەریکی بڕینی پارچە قوماشێکە، منداڵیش کەچاوی لەوە دەبێت، هەوڵ دەدات لاسایی دایکی بکاتەوەو ئەویش وەک دایکی مقەست بگرێت بەدەستیەوەو قوماش پارچە پارچە بکات و ئەویش لەو خۆشی و تام و چێژی شت بڕینە بێبەش نەبێت لەلایەکو شارەزایی پەیدا بکات لەبارەی ئەم کردارەوە لەلایەکی ترەوە، بەلام لەوانەیە دایک ڕێگە بەمنداڵەکەی نەدات ئەم حەزو ئارەزووەی بێتەدی، منداڵەکە ناچار دەبێت بەدزیەوە مقەستەکەی دەست بکەوێت و ئەو ئاواتەی بێتەدی.

بەلام لەبەرئەوەی منداڵ نرخی کەل و پەلەکان نازانێت وەک یاری و کەرەستەیەکی ئاسایی مامەلەیان لەگەلدا دەکات، لەوانەیە پارچە قوماشێکی گران بەهای دایکی پارچە پارچە بکات، ئا لێرەدا جارێکی تر منداڵ دەبێت بەکاولکەرو مایەی بێزاری و دلتەنگی دایک و باوک، بەلام لەڕاستیدا ئەم منداڵە مەبەستی زەرەردان و کاول کردن نیە، بەلکو تێرکردنی ڕەمەک و پالنەرە بایەلۆژیەکانیەتی. بەلام لەئەنجامی نەزانی ئەو دایکەوە کەمقەست و پارچە کاغەز یان ڕۆژنامە کۆنێک یان پارچە قوماشێکی بێکەلکی نەدا بەمنداڵەکەو لێی شاردەوەو حەزو ئارەزوەکەی تێر نەکردو پێداویستیەکانی بۆ دابین نەکرد، لەبەر ئەوە منداڵەکە بەناچاری و نەزانی پەنای بۆ ئەو ڕێگەیە بردو ئەو دەرئەنجامەی لێکەوتەوە.

جاری وا هەیە ڕێکەوت دەکات باوک خەریکی نووسینە، منداڵ کەچاوی لەباوکی دەبێت ئەویش حەز دەکات وەک باوکی ئەو کارە بکاتو ئەم دیاردەیەش تاقی بکاتەوە و بزانێت ئەم کاغەز ڕەش کردنەوەیە تام و چێژی چی تێدایە، ئەگەر هات و باوک قەڵەم و پارچە کاغەزێکی نەدا بەمنداڵەکەی بۆ ئەوەی ئەو حەزو ئارەزووەی تێر بێت، ئەوا منداڵەکە ناچار خۆی دەگەڕێت بەدوای قەڵەم یان تەباشیر یان خەڵوز...هتد، دوایی ئەگەر کاغەزی دەست نەکەوت ئەوا دیواریماڵەکە دەکات بەتەختە ڕەش و داخی دڵی خۆی بەو دیوارە دەڕێژێو چی لەدڵو دەروونیدا هەیە بەهۆی چەند خەتێکی ڕاست و چەپ و (شەقلی و پەقلی) دەری دەبڕێت و لەسەر دیوارەکە دەی نەخشێنێ.

منداڵ کاتێک ئەم کارە دەکات نرخی دیواری بۆیاخکراو نازانێت و هیچ جیاوازی ناکات لەگەڵ پارچە تەختەیەکدا، لێرەشدا منداڵ هەر بەکاول کەرو تێک دەر لەقەڵەم دەدرێت، بەلام هەڵە هەڵەی ئەو باوکەیە کەقەڵەم و پارچە کاغەزێکی بۆ منداڵەکەی دابین نەکرد، تا تینویەتی خۆی بشکێنێ و وەڕسو بێزار ببێت لەنووسین و دوایی وازی لێ بهێنێ. لەبەر ئەوە منداڵەکە بەناچاری بەو ڕێگە تایبەتیەی خۆی ئاواتەکەی هێنایەدی. ئەمانەو چەندەها نموونەو دیاردەی تر، ڕۆژانە لەزۆربەی ماڵەکان ڕوودەدات و کارێکی ئاسایی و سروشتیە بەلای منداڵەوەو بەو ڕێگەیە حەزو ئارەزوەکانی تێر دەبێت و شارەزای دیاردەکانی ژیان دەبێت و گەشە دەکات و کارامەیی و زانیاری پتر دەبێت، بەلام جێگەی داخە زۆرجار لەئەنجامی دابین نەکردنی پێداویستی و کەرەستەکان بۆ منداڵ تاوەکو بەشێوەیەکی سروشتی ئەو پێداوییستی و حەزو ئارەزوانەی منداڵ تێر بکرێت و لەئەنجامی نەزانی و پشت گوێ خستنی هەندێک دایک و باوک، منداڵ دەکەوێتە ئەو هەڵانەو بەتێک دەرو کاول کەر لەقەڵەم دەدرێت و تووشی ئازارو کێشەو لێدانیش دەبێت. هۆکەشی بۆ ئەم خاڵانەی لای خوارەوە دەگەڕێتەوە:-

١) منداڵ هێشتا ماسوولکەو ووردە دەمارو ئەندامەکانی تری لەشی بەتەواوی گەشەیان نەکردووە، لەبەرئەوە زۆرجار لەکاتی جووڵەو هەڵبەزو دابەزو ڕاکردندا زەرەرو زیان بەکەلو پەلو کەرەستەکانی تری ناوماڵ دەگەیەنێت یان لەدەستی دەکەوێتە خوارەوە یان خۆی پێدادەکێشێت.

٢) منداڵ لەلایەنی ژیرییەوە بەتەواوی گەشەی نەکردووەو شارەزایی دەربارەی نرخو بەهای کەل و پەلەکان نیە، لەبەر ئەوە گرانبەهاترین کەلو پەل لەناو ماڵدا بەلای ئەوەوە هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ یارییەکدا (لعابة). لەوانەیە مەزهەرییەک یان سەعاتێکی سەرمێز یان کەلو پەلێکی تری گران بەها هەڵگرێت و فڕێ بدات و بیدات بەبەردو دیواردا، بۆ ئەوەی شارەزایی لەبارەیەوە پەیدا بکات و تام وچێژ لەتەقە تەق و کەوتن و فڕێ دانەکەی وەربگرێت، لەم کاتەشدا دوور نیە ئەو کەل و پەلە گرانبەهایانە بشکێتو منداڵ چێژیشی لێ وەربگرێت وەک چۆن چێژو خۆشی دەست دەکەوێت کاتێک یارییەک (لعابة) دەشکێنێت و هەڵی دەوەشێنێت.

٣) تەسک بوونەوەی ژینگەو بواری جووڵەی منداڵ لەئەنجامی پێشکەوتنی شارستانیەت و کەم بوونەوەی ڕووبەری باخچەی خانوو ژمارەی ژوورەکان و زیاد بوونی کەرەستەو کەلو پەلی ناوماڵ و شکاندنیان بەئاسانی و قەرەباڵغ بوونی چوار دەوری منداڵ و گەڕەک و کۆڵان و سەرشەقامەکان. منداڵ خۆی لەخۆیدا لەم قۆناغەدا پێویستی بەجووڵەو ڕاکردن و هەڵبەزو دابەز هەیە، بێ گومان لەم کاتەدا بەر ئەو کەل و پەلانە دەکەوێت و زەرەریان پێ دەگات، چونکە ناوماڵ لەم ڕۆژگارەدا زۆر قەرەباڵغەو منداڵی هەژار بواری جوڵاندن و هەلس و کەوتی نەماوە، لەبەرئەوە ئێستا ئەو زەرەرو زیانەی منداڵ دەیدات زۆر زیاترە لەجاران، چونکە (٤٠) یان (٥٠) ساڵ پێش ئێستا ناو ماڵ ئەوەندە کەل و پەلی تێدا نەبووە، هەروەها کۆڵان و ناوماڵ ئەوەندە قەرەباڵغ نەبوون و ژینگەیەکی فراوان و گەورە هەبوو بۆ یاری کردن و جووڵەی منداڵ.

٤) ڕوون نەکردنەوەی دیاردەکانی ژیان و ژینگە بۆ منداڵ، لەلایەن دایکان و باوکان و کەسانی چوار دەورییەوە، هەروەها تێرنەکردنی حەزو ئارەزووەکانیان و دابین نەکردنی پێداویستیەکان و وەڵام نەدانەوەی زۆربەی پرسیارەکانی منداڵ و نەشکاندنی تینوێتی ڕەمەکی زانینی دیاردەکان، لەبەرئەوە منداڵ ناچار دەبێت زۆرجار پەنا بۆ ئەزموون و هەڵس و کەوتی خۆی ببات، بۆیە دەکەوێتە هەڵەوەو زەرەرو زیان بەکەل و پەل و

کەرەستەکانی ناوماڵ دەگەیەنێت. ئەگەر باوک و دایکی شارەزاییان هەبێت ئەوا دەتوانن منداڵ لەو زەرەرو زیانانە ڕزگار بکەن و بەڕێگەی ئاسایی و سروشتی ئەو حەزو ئارەزوانەی منداڵ تێر بکەن. (القوصی، ١٩٨١، ص٣٨٧-٣٩٨).

بەڵام بەداخەوە تاوانێکی گەورە دەرهەق بەمنداڵ دەکرێت و لەپێداویستیەکانی بێ بەش دەکرێت و هەموو دەرگاکان لەبەردەمیا دادەخرێت و لەدوایشدا بەتێکدەرو کاول کەر لەقەڵەم دەدرێت و منداڵ دەبێت بەقوربانی هەڵەو سەرەڕۆیی هەندێک باوکو دایکی نەزان و کاول کارو تێک دەر.

## سزادانی منداڵ

لەمێژە باب و باپیرانمان ووتویانە: (شەرعی مار بەدار) لەهەمان کاتیشدا فەرموویانە: (مار بەقسەی خۆش لەکون دێتە دەر)، سەرنج بدەن خوێنەرانی بەڕێز دوو پەندی دژ بەیەکتر دوو بۆچوونی جیاوان، دەربارەی بەکارهێنانی سزاو ئازار لەژیاندا بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان، ئەمە لەناو یەک نەتەوەدا، ئەی دەبێت لەسەرتاپای جیهانداو لەگێژاوی ئەو هەموو بۆچوون و ئایدۆلۆژیا جیاوازانەدا چ ڕاو بیروڕایەک دەربارەی بەکارهێنانی سزاو ئازار لەژیاندا هەبێت. کۆمەڵناس و دەروونزان و فەیلەسووفەکان دوو ڕاو بۆچوونی جیاوازیان دەربارەی سزاو ئازار هەیە. گروپێکیان لایەنگیری بەکارهێنانی سزاو ئازارن بەبیانووی ئەوەی سروشتی مرۆڤ شەڕخوازەو، مرۆڤ گورگێکەو لەپێستی مەڕدا دەژی و بەردەوام هەوڵی خواردن و تێکشکاندنی بڕبڕەی پشتی برای خۆی دەدات، سزاو ئازار پێویستە بۆ دەستەمۆکردن و ڕاهێنانی مرۆڤ لەسەر داب و نەریت و بەهای کۆمەلایەتی. بەڵام گروپی دووەم ڕای جیاوازیان هەیەو دەڵێن تاوانە ئازاری مرۆڤ بدرێت و ژیانی لێ تاڵ بکرێت و بۆ هیچ کەسێک نەهاتووەو مافی ئەوەی نیە ژیانی کەسێکی تر بکات بە دۆزەخ.

دوای کۆمەڵێک توێژینەوە لەبواری پەروەردەو دەروونناسیدا بۆ زۆربەی زانایان دەرکەوت کە بەکارهێنانی سزاو ئازار زەرەرو زیانەکانی زۆر زۆر زیاترە لە سودو قازانجەکانی وە لەترسناکترین دەرئەنجامەکانی بەکارهێنانی سزاو ئازار ئەمانەی لای خوارەوەن:-

١) بەجێهێشتنی شوێنەوارێکی دەروونی ترسناک، هیچ کەس ڕازی نابێت ئازار بدرێت و سووکایەتی پێ بکرێت، لەبەرئەوە خۆشەویسترین کەسیش ئەگەر ئازارو سزای بدەیت، ئەو ناڕازی دەبێتو تووشی خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێ و ئازارێکی دەروونی زۆر دەبێت و شوێنەواری خۆی لەسەر دەروون و کەسایەتی ئەو کەسە بەجێ دەهێڵێ.

٢) هەندێک جار ئەو کەسەی سزا دەدرێت، لەتەک ئەو ئازارو سزایەدا ڕادێت و ئەو توندو تیژییە دەمژێت و دەتوانێت خۆی لەتەکیدا بسازێنێ و ئیتر ئەو سزاو ئازارە سوودو ئاکامی نابێت، ئیتر ئەگەر بمانەوێت سزاو ئازار کاریگەری هەبێت دەبێت ڕێژەکەی زیاد بکەین، بۆ نموونە ئەگەر باوک یەکەم جار بەزلەیەک (شەقێک) منداڵەکەی ئازار بدات، ئەوا پاش ماوەیەک دەبێت بیکات بەدوو زلە(شەق)، چونکە یەک زلە کاریگەری نامێنێت و منداڵەکە لەتەکیدا ڕادێت و نرخی نامێنی و خۆشە دەبێت، دوای ئەوە دەبێت بیکات بە دوو زلەو کوتەکێک ئینجا دوو کوتەک و دوو زلە، بەم شێوەیە دەبێت بەردەوام ڕێژەکەی زیاد بکرێت، بۆ ئەوەی کاریگەری هەبێت، ئینجا ئەو کاتە ئەو خێزانە دەبێت بە دۆزەخو زیندان بۆ ئەو منداڵەو پیرۆزی و گرنگی خۆی لەدەست دەدات، لەلایەکی ترەوە دوور نیە ئەو جۆرە منداڵانە فێری سزاو لێدان ببن و ئیتر هیچ کاتێک دڵیان ئاو ناخواتەوەو کرنابن ئەگەر تێر لێدان نەخۆن و سوکایەتیان پێ نەکرێت، واتە دەبن بە مرۆڤێکی (ماسۆشی) و تام و چێژ لەلێدان و سوکایەتی پێکردن وەردەگرن.

٣) زۆر کەسی تر دەبن بە (قۆچی قوربانی) دەستی ئەو کەسەی کە ئازار دراوە، بۆ نموونە ئەگەر لەماڵەوە یان قوتابخانە بە بەردەوامی ئازارو سزا بەکاربهێنرێ، ئەو کاتە ئەو کەسەی سوکایەتی پێ کراوەو ئازار دراوە، داخی دڵی خۆی بەکەسانی لاوازو بێ

دەسەلاتتر لەخۆی دەرپژێ، واتە یان لەبرابچکۆلەکەی یان لەمندالانی دراوسێ یان لەفێرخوازێکی تر دەداتو تۆلەی خۆی لەوان دەکاتەوە. (تریفرز، ١٩٧٩ ص٣٦١-٣٦٤).

٤) زۆرجار زیانی لاوەکی دەبێت، بەردەوام ئەگەر باوک بەمندالی و مامۆستا بەفێرخوازی و لێپرسراو بەئەندامەکانی بلێت ئێوە خراپن، تێ ناگەن، بەکەلکی هیچ شتێک نایەن، گەمژەن...هتد. ئەمانە خۆی لەخۆیدا سزاو ئازاری (معنوین)، ئیتر ئەو کاتە ئەگەر بەتواناو لێ هاتوو زیرەکیش بن، لەئەنجامی ئەو قسە ناخۆشانە دوور نیە هەست و بۆچوونێکی هەلەیان لا دروست ببێت کەخراپن و تێناگەن و ڕەوشت نزم و گەمژەن، ئیتر ئەو کاتە وەک مرۆڤێکی خراپ و تێ نەگەیشتوو ڕەوشت نزم و گەمژە هەلس و کەوت دەکەنو بەرەو هەلدێرو لاساریی دەڕۆن.

٥) کەسانی تۆقێنەرو سزادەرو بەئازار دەبن بەنموونە بۆ لاسایی کردنەوە، ئەو کاتە مندال وەک باوکی، فێرخواز وەک مامۆستای، ئەندام وەک لێپرسراوی دڕندەو سزادەری دەبێت بە دڕندەو توندوتیژو دەست درێژکەرو ئەویش لەداهاتوودا وەک ئەوان دەردەچێت.

٦) هەندێک جار ئەو کەسانەی ئازارو سزا بەکاردەهێنن، لەوانەیە ژیریی و دەسەلات لەدەست بدەن و وردە وردە بکەونە گیانی بەرانبەرەکەیان و تووشی زیانی جەستەیی و نرقستانیەکی گەورەیان بکەن. بۆ نموونە تەنها لەئەمریکا سالی یەک ملیۆن مندال تووشی زیانی جەستەیی گەورە دەبن و زۆربەشیان لەئەنجامی لێدان و ئازاردانی دایک و باوک و مامۆستاکانیانەوە دەمرن.

لەتەک ئەو هەموو زیان و خراپیانەی بەکارهێنانی ئازارو سزا، هەندێک جار ئاماژە بۆ بەکارهێنانی دەکرێت، بەلام دەبێت ڕەچاوی ئەم خالانەی خوارەوە بکرێت بۆ ئەوەی سزاو ئازاردانەکە پەروەردەیی بێت و ئامانجی خۆی بپێکێ:

١) پێویستە پەیوەندیەکی خۆشەویست و پتەو هەبێت لەنێوان سزادەرو سزادراودا، چونکە ئەگەر سزادەر خۆشەویست و دڵسۆز بێت، ئەوا سزادراو ڕازی دەبێت و زۆر پێی سەغلەت نابێتو لەو کارە خراپەشی دوور دەکەوێتەوە کەلەسەری سزا دراوە، بەلام ئەگەر سزادەر بێزراو و دڵ ڕەق بێت و سزادراو ڕقی لێی بێت، ئەو کاتە سزاکە هیچ سوودێکی نابێتو سزادراو لەو کارە خراپەی دوور ناکەوێتەوە و بگرە لەرقی سزادەر زیاتر لەسەری بەردەوام دەبێت.

٢) پێویستە هۆی سزادانەکە ڕوون بکرێتەوە واتە باوک یان مامۆستا، ئەگەر سزای منداڵیکی دا پێویستە بۆی ڕوون بکاتەوە لەسەرچی سزا دراوە، ئەگەر نەزانێت هۆی سزادانەکەی چی یە، ئەوا دەکەوێتە گێژاوی بیرکردنەوەو دڵەڕاوکێ و بەزەحمەت لێ ی دەرباز دەبێت و سزاکەش هیچ سوودێکی نابێت.

٣) دەبێت سزا دوای کارە خراپەکە بێت و سوک و بۆ ماوەیەکی کەم بێت و نابێت جەستەیی و زۆر بەئازار بێت و شوێنەواری جەستەیی و دەروونی بەجێ بهێڵێ و سارێژ نەبێت.

٤) پێویستە ئەو کەسەی لەسەر کارێکی خراپ سزا دەدرێت، فێری ڕەوشت و هەڵس و کەوتی ڕاست و باشتر بکرێت بۆ ئەوەی واز لەو کارە هەڵەو خراپەی بهێنێ.

## منداڵی نازدار

نازداری دیاردەیەکی کۆمەلایەتیەو بریتیە لە نازپێدانی زۆر بەمنداڵ و نوقمکردنی لەدەریای سۆزو خۆشەویستی لەڕادەبەدەرو بەچوار دەوریا هاتن و جێ بەجێ کردنی گشت پێداویستیەکانی و چاوپۆشین لەهەڵەو سەرەڕۆییەکانی و بەرزکردنەوەی بۆ پلەو پایەی پاشایەکی بچکۆلە، دایک و باوک و کەسانی تری چواردەری دەبن بەبەردەست و گوێ ڕایەڵی ئەم پاشا بچکۆلە تازە پێداکەوتووە. بێگومان هەندێک دایک و باوک لەئەنجامی نەزانی و پەروەردەی هەڵە یان لەبەرئەوەی منداڵەکەی تاقانەیە یان کوڕێکەو دوای چەند کچێک لەدایک بووە یان دواهەمین منداڵە یان،، هتد. نازێکی زۆر بە

منداڵەکانیان دەدەن و بەردەوام پێداویستیەکانیان بۆ تێر دەکەن و گشت کۆسپ و گرفتەکانی ڕۆژانەیان بۆ چارەسەر دەکەن و هەمیشە داواکارییەکانیان بۆ جێبەجێ دەکەن، لەکاتێکدا کە لەتوانای منداڵ خۆیدا هەیە ئەو کارو فەرمانانە بەئاکام بگەیەنێت و بەرەنگاری ئەو کۆسپ و تەگەرانە ببێتەوەو بەیارمەتی گەورەکان بەسەریاندا زاڵ ببێت.

ئینجا کاتێک دایک و باوک نایەڵن منداڵەکانیان سەربەخۆ بین و پشت بەخۆیان ببەستن و فێری ئەرکەکانی سەرشانیان ببن، ئا لەم کاتەدا دایکو باوک بە دەستی خۆیان چاڵ بۆ منداڵەکانیان هەڵدەکەنن و بەربەست و ڕێگر لەبەردەمیاندا دروست دەکەن و لەڕێچکەی گەشەکردنی ئاسایی خۆیان لایان دەدەن، دەرئەنجامیش زەرەرو زیانێکی گەورە لەکەسایەتی و هەڵس و کەوتی ئەو منداڵە دەکەوێت، دایک و باوک بەبۆچوونی خۆیان وا دەزانن کە نوقم کردنی منداڵ لەسۆزو خۆشەویستیدا کارێکی باشەو لەبەرژەوەندی منداڵەکانیانە، بەڵام بەداخەوە دەرئەنجامی زۆربەی توێژینەوەکانی بواری پەروەردەو دەروونناسی ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەو جۆرە مامەڵەیەو نازپێدانی زۆر بەمنداڵ هەڵەیەو لەپاشەڕۆژدا ڕەنگدانەوەی ترسناکی دەبێت لەسەر کەسایەتی ئەو منداڵانە، چونکە نازداری بڕبڕەی پشتی منداڵ تێک دەشکێنێ و بۆچوونی هەڵەی لا دروست دەکات، وەک ئەوەی ئەو سەروەری جیهانەو هەر وەردەگرێت و هیچ نادات و ناتوانێت لەبەردەم کۆسپ و گرفتەکانی ژیاندا خۆی ڕاگرێت و زوو هەرەس دەهێنێ و بڕوای بەخۆی نابێتو گیانی تەنیایی و سەربەخۆیی تێدا دەکوژێت، تووشی ملململانێ ی دەروونی دەکات، مرۆڤێکی مشەخۆرو خۆ پەرستی لێ دەردەچێت، بەردەوام چاوی لەدەستی خەڵکانەو چاوەڕوانی یارمەتی و خزمەتگوزاری کەسانی تر دەکات و زۆر جاریش تووشی گۆشەگیری دەبێت، بەردەوام دەکەوێتە بەر پلان و تیرو توانجی منداڵان و کەسانی تر بەهۆی کەم توانایی و بێ دەسەڵاتیەوە.

ئەم گرفتانەی سەرەوە بەرەو ڕووی منداڵی نازدار دەبێتەوە بەتایبەتی کاتێک کە لەماڵ دەچێتە دەرەوەو ڕوو لەکۆڵان و قوتابخانەو بوارەکانی تری ژیان دەکات و تێکەڵاوی

کەسانی تر دەبێت، ئا لەم کاتەدا منداڵ ناتوانێت خۆی لەتەک ئەو ژینگە تازانەدا بسازێنێو بەردەوام وەک منداڵێکی ساواو بێ دەسەڵات هەڵس و کەوت دەکات و هەرچاوی لەدەستی کەسانی ترە، بەڵام بەداخەوە کەسانی دەرەوە (هاوڕێ، مامۆستا، لێپرسراو..هتد) وەک دایک و باوک مامەڵە لەتەک منداڵی نازدار ناکەن و کەسیان ئامادە نیە پێداویستیەکانیان بۆ تێر بکات و گشت داواکارییەکانیان جێبەجێبکات، ئا لێرەدا منداڵ تووشی نوشستی و ململانێ دەبێت ، چونکە جیهانی دەرەوە جیاوازە لەجیهانی خێزان، لەئەنجامی پەروەردەی هەڵەی ناو خێزان ، ئەو منداڵانە ئامادەو ڕانەهێنراون بۆ جیهانی دەرەوە و بێ دەسەڵات و کەم توانا دەبن لەبەردەم گۆڕانگاری و داواکارییەکانی جیهانی دەرەوەی خێزان.

لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە دایک و باوک هەر لەمنداڵیەوە منداڵەکانیان ڕابهێنن و فێری ئەرک و فەرمانەکانی خۆیانیان بکەنو نازدار بەخێویان نەکەن و بارودۆخی لەباریان بۆ بخولقێنن بۆ ئەوەی خۆیان ئەو کارانە بەئەنجام بگەیەنن کە دەتوانن بیکەن و لەتەک تەمەنو توانایاندا دەگونجێت، دەبێت منداڵ هان بدرێت و ڕێنمایی بکرێت بۆ ئەوەی وردە وردە سەربەخۆیی وەرگرێت و ناسنامەو کەسایەتی خۆی هەبێت و بچێتە ناو کۆڕو کۆبوونەوەو خۆی لەتەکیاندا بسازێنێ، بۆ نموونە دەبێت منداڵ پێش چوونە قوتابخانەی زۆر ئیش و کار هەیە بیزانێت لەوانە: (جل و بەرگ لەبەرکردن، پێڵاوو گۆرەوی لەپێکردن، قەیتان توندکردن، دەم و چاوو خۆشووشتن، کۆکردنەوەو ڕێکخستنی پێداویستیەکانی قوتابخانە، بڕوا بەخۆ بوون و سەربەخۆیی..هتد) بۆئەوەی کەچووە قوتابخانەو دەرەوەی ماڵو ناو کۆمەڵ تووشی گرفت و ململانێ ی دەروونی نەبێتو هەست بە کەمی و لاوازی و بێتوانایی نەکات و نەبێت بەگاڵتەجاڕو نێچیری منداڵانی تر.

بەڵام ئەگەر دایک و باوک ئەو کارانەی بۆ بەئەنجامگەیاندو منداڵەکەی لەسەریان ڕانەهێنا، ژینگەی لەباری بۆ فێربوونیانی نەخولقاندو هانی نەدا بۆ ئەوەی خۆی بەرەنگاری گرفت و ڕووداوەکانی ژیان ببێتەوەو لەکاتی تەنگانەدا ڕێنمایی نەکرد ئەوا کاتێک ئەو منداڵە دەچێتە قوتابخانە یان دەرەوەی ماڵ، هەر ج یەکێک لەو کارو فەرمانانەی سەرەوەی هاتە سەر ڕێگا، ئەوا ناتوانێت بەئاکامیان بگەیەنێت و زەلیل و

داماو لەبەردەمیاندا (دۆش) دادەمێنێ و بەردەوام چاوەڕوانی کەسانی تر دەکات و تووشی گرفت و ململانێ ی دەروونی و ئەندێشەی کۆمەڵایەتی دەبێت و ناتوانێت خۆی لەئەک دیاردەو گۆڕانکارییەکانی ژیاندا بسازێنێ، لەبەرئەوەی لەناو خێزاندا پڕ چەک نەکراوە بۆ بەرەنگار بوونەوەی جیهانی دەرەوە.

## منداڵی گێل

گێلی (معتوه) (Idiot) ترسناکترین جۆری دواکەوتنی ژیرییە کەرێژەی زیرەکیەکەی لەنێوان (سفر-٢٥) دایە، ئەم جۆرە مرۆڤانە لەئەنجامی تووشبوونیان بەو دەردە دەبن بەبار بەسەر کۆمەڵەوە. گرفتی زۆر بۆ خۆیان و بۆ کۆمەڵەکەیان دروست دەکەن، ئەو منداڵەی تووشی گێلی دەبێت بەهیچ شێوەیەک ناتوانرێت نە فێری خوێندن و نووسین و بیرکاری بکرێت نە فێری پیشەو کارێکی ڕۆتینی سادەش بکرێت، ئەو کەسانە ناوی خۆشیان نازانن، بەهیچ شێوەیەک هەست بە مەترسی دیاردە دڕێوو ترسناکەکانی ژیان ناکەن، لەئاگرو ئاو ناگەڕێنەوە، ئەگەر ئاگاداری نەبن یاری بەئاگر دەکاتو خۆی دەسووتێنێت، خۆی فڕێدەداتە ناو ئاوو ڕووبارەوە، لەسەر شەقامەکان گوێ بەماشێنو کەسانی چواردەوریان نادەن، هەر چ شتێک بکەوێتە بەردەستیان وەک منداڵی شیرەخۆرە دەیخەنە ناو دەمیانەوە، زۆر جار پرچی خۆیان دەسکەنە دەکەنو تاتواناییان هەبێت لێی دەخۆن، پارچە پەڕۆو لباد دەخۆن، هەر لەم بارەیەوە (ترید جولد)ی زانا دەڵێت: (جاری وا هەبووە کەسێکی گێل مردووە لەئەنجامی پڕبونی گەدەو ڕیخۆڵەکانی لەپەڕۆو قژە سەر دوای خواردنیان) (الشیخ، ص٨١). منداڵی گێل ناتوانێت کۆنترۆڵی پرۆسیسی دەرهاوێشتن بکات و بەردەوام خۆی پیس دەکات و لە هەر چ کات و شوێنێک تەنگاو بوو خۆی لێ دەریاز دەکات بەبێ گوێ دان بە گونجاوی و لەباری ئەو کات و شوێنە. فێری قسەکردن نابێت، بێجگە لەدووبارە کردنەوەی چەند ووشەیەکی سادەی بێ مانا کە لەبۆڵەبۆڵ دەچێت، کەمو کورتیو نوقوستانی زۆریش لەجەستەو لەش و بالایدا

هەست پێ دەکرێت وەک ئیفلیجی، فێ لێهاتن، کەوتن بەم لاولادا، زۆر بەگیلی و نەزانی نان دەخوات، هەتا بۆی دابنرێت دەخوات، هەست بەتێربوون ناکات. دەبێت خواردن بەزۆر لەبەردەستی لاببرێت، ئەگینا هەر دەیخنێتە ناو دەمیەوە بەبێ گوێدان بەپڕبوونی دەم و گەرووی. ئەم جۆرە کەسانە پێویستیان بە چاودێری بەردەوام هەیە، دەبێت جێگاو مەڵبەندی تایبەتیان بۆ دابین بکرێت و بەردەوام خزمەت بکرێن تاوەکو ئەو ڕۆژەی ماڵئاوایی لەو جیهانە تاریکەیان دەکەن.

جێگەی وەبیرهێنانەوەیەکە ئەم جۆرە مرۆڤانە تەمەنیان زۆر درێژ نی یەو کەم دەژین و زوو دەمرن، بەڵام تا ئەو ڕۆژەی دەمرن دەبێت خزمەت بکرێن، هەروەها زۆربەی ئەم جۆرە مرۆڤانە نەزۆکنو منداڵیان نابێت، منداڵی گێل وەک منداڵی دەبەنگ و گەمژە سوود لەپەروەردەی تایبەتی وەرناگرێت، چونکە ڕێژەی زیرەکیەکەی ئەوەندە نزمە ناتوانرێت هیچی لەگەڵدا بکرێتو فێری هیچ جۆرە هەڵسو کەوتو دابو نەریتێکی کۆمەلایەتی بکرێت وەک جل و بەرگ لەبەرکردن و خۆشتشن و نان خواردن و...هتد، کەواتە ڕەوا نیە ئەمانە ڕەوانەی دامەزراوی پەروەردەیی تایبەتی بکرێن، چونکە چەند هەوڵ بدرێت ناتوانرێت فێری قسەو ڕەوشتە مرۆڤایەتیەکانی تر بکرێن، لەبەرئەوەی ئامادەباشی و توانستی ژیریان نیە بۆ وەرگرتن و فێربوونی شتەکان.

## منداڵی گەمژە

گەمژە (أبلة) **(Imbecile)** بەو کەسانە دەووترێت کە ڕێژەی زیرەکیان لەنێوان (٢٥-٥٠) دایە، ئەم جۆرە کەسانە ناتوانن فێری خوێندن و نووسین و بیرکاری بکرێن، بێجگە لەچەند ژمارەیەکی ساکارو خوێندنەوەی تووتیانەی چەند ووشەیەک، بەڵام دەتوانرێت فێری پیشەو کارێکی ڕۆتینی سادە بکرێن وەک پاککردنەوەی ڕێگاوبان یان هەڵگرتنی جانتاو کەلو پەل، یان ئاوەدانی باخچەو ڕێکخستنی، هەرچەندە لەکاتی ئەو ئیشانەشدا هەر پێویستیان بەچاودێری کەسانی چواردەوریان هەیە، ئەم کەسانە ژیرییەکەیان ئەوەندە نزمە کەناتوانن بژێوی ڕۆژانەی خۆیان پەیدا بکەن، بەڵام لەتوانایاندا هەیە هەست بەمەترسی دیاردە ترسناکەکانی ژیان بکەن.

بۆ نموونە دەزانن ئاگر بڤەیەو دەیان سوتێنێ و، ئاو ترسناکەو دەیانخنکێنێ و ئۆتۆمبیل خەڵک دەکوژێت و، سەگ و گورگ و مار ئازاری مرۆڤ دەدەن. لەبەرئەوە لەتوانایاندا هەیە خۆیان لەو شتە ترسناکانە بپارێزن، بەڵام لەلایەنی جەستەو گەشەکردنەوە، لەمنداڵانی ئاسایی زۆر کەمترن و ئەگەر بەراوردیان بکەین بەمنداڵانی ئاسایی، ئەو کاتە بۆمان دەردەکەوێت کە کێش و باڵاو بارستایی منداڵانی گەمژە بەشێوەیەکی گشتی کەمترە لەکێش و باڵاو بارستایی منداڵانی ئاسایی هەروەها زۆر درەنگیش پێ دەگرن و فێری ڕۆیشتن دەبن، بەرگریشیان بۆ نەخۆشی کەمەو زوو زوو نەخۆش دەکەون و زۆر درەنگ دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر ئینجا دەتوانن زاڵ بن بەسەر پرۆسیسی دەرهاویشتندا، دەتوانن فێری ناوی هەندێک شتی بەرچاو ببن و ناوی خۆی و باوکی دەزانێت بەڵام ناتوانێت بەتەواوی دەریببڕێت (مرسی،ص٥٥)، زمانی لاوازەو زۆر جار تاوەکو تەمەنی (٥) ساڵان فێری زمان نابن، بەڵام دەتوانن شەوو ڕۆژ لێک جیا بکەنەوەو بەیانی و ئێواریش هەست پێ بکەن، بەڵام کاتەکانی تر نازانن و ناتوانن کاتژمێر بەکاربهێنن، تەنها لەچواردەوری ماڵی خۆیان دەخولێنەوە ئەگەر کەمێک دوور کەوتنەوە، ئەوا وون دەبن و ڕێگەی ماڵی خۆیان پێ نازانن.

ئەمانەی سەرەوە خاسیەت و سیفاتی منداڵی گەمژەیە، کە لەئەنجامی چەند هۆکاریکی دەرەکیەوە (کە هەندیکیان زانراوەو هەندیکی تریان تاوەکو ئیستا نەزانراوە) ئەو منداڵانە توشی ئەو دەردە دەبن، شایەنی ئاماژە بۆ کردنە کە زۆربەی منداڵانی مەنگۆلی دەکەونە ناو ئەم کۆمەڵەوە، لە سەدا ( ٢٥ ) دواکەوتووەکان گەمژەن، چارەسەری ئەو حاڵەتانەش تەنها لەڕیگەی پەروەردەی تایبەتیەوە (التربیة الخاصة) دەکریت و لەو دامەزراوە تایبەتیە پەروەردەییەدا فێری چەند پیشەو کاریکی میکانیکی و دەستی و ڕۆتینی دەکرین بۆ ئەوەی سەرقاڵی بزو سوود لەو توانستە ژیرییە کەمەیان وەربگیریت، هەروەها دەتوانریت فێری هەندیک داب و نەریتی کۆمەڵایەتی بکرین، وەک چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ کەسانی چواردەور هەروەها چۆنیەتی جلو بەرگ لەبەرکردن، خۆشووشتن، پاک و خاوینی، نان خواردن، خۆ ڕزگارکردن لەپاشەڕۆ، فێربوونی ناوی کەسانی چواردەورو ناسینەوەی ماڵو گەڕەک و شوینە گرنگەکان، ئەگەر توانرا فێری ئەو ڕەوشتو کردارانە بکرین، ئەو کاتە نابن بە کۆڵو بار بەسەر خیزانو کۆمەڵەکەیانو بەپیچەوانەوە دەتوانن ئەو توانستە ژیرییە کەمەی هەیانە بۆ خزمەتی پیشخستنی کۆمەڵەکەیان بەکاری بهینن، بەڵام دەبیت ئەوەشمان لەیاد نەچیت کەنابیت پەلە بکریت لەبڕیاردان لەسەر چارەنووسی ئەو منداڵانەو لەڕیگەی چەند هەڵس و کەوتیکەوە بڕیاری گەمژەیی یان گیلی یان دەبەنگی منداڵ بدریت و ڕەوانەی دامەزراوی پەروەردەیی تایبەتی بکریت، بەڵکو دەبیت ئەو بڕیارە تیمیکی شارەزا کەلەپسپۆری جیاجیا پیک هاتبن ئەو بڕیارە بدات و چەندەها پیوەریش بەکاربهینیت لەکاتی بڕیارداندا، واتە نابیت تەنها پشت بەڕیژەی زیرەکی ببەستریت، بەڵکو دەبیت توانست و لیهاتوویی کۆمەڵایەتی و توانستە جیاجیاکانی تریش ڕەچاو بکریت.

## منداڵی دەبەنگ

دەبەنگی زاراوەیەكە بەو كەسانە دەووترێت كەڕێژەی زیرەكیان لەنێوان (٥٠-٧٠) دایە، ئەم ڕێژەیەش دەكەوێتە خانەی دواكەوتوانی ژیرییەوە. منداڵی دەبەنگ (مۆرۆن) چەند هەوڵ بدات و گەورە ببێت زیرەكییەكەی لەزیرەكی منداڵێكی ئاسایی (٧-١١) سالان زیاتر نابێت، ئەم منداڵە دەبەنگانە (مۆرۆن) لەتوانایاندا هەیە فێری خوێندنو نووسین و بیركاری بكرێن، بەمەرجێك بارودۆخێكی پەروەردەیی‌و پرۆگرام و بەرنامەی تایبەتیان بۆ دابین بكرێت كە گونجاو بێت بۆ ژیری و توانایان و مامۆستای تایبەتمەند ئەو وانانە بڵێتەوە. لەتواناشیاندا هەیە تاوەكو پۆلی پێنجەمی سەرەتایی خوێندن تەواو بكەن، بەڵام ئەم جۆرە منداڵانە بەهیچ شێوەیەك ناتوانن لەخوێندنگای ئاسایی لەگەڵ منداڵانی ئاسایدا بخوێنن. هەروەها دەتوانرێت ئەم منداڵە دەبەنگانە لەسەر هەندێك پیشەو كاری دەستكردو ئاسایی ڕابهێنرێن و لەڕێگەیەوە بژێوی تایبەتی خۆیانی پێ دابین بكەن و سەرە تەقەیەكی لەگەڵدا بكەن‌و لەتواناشیاندا هەیە فێری هەندێك داب و نەریتی كۆمەڵایەتی ببن‌و خۆیان لەتەك كۆمەڵەكەیاندا بسازێنن، بەڵام ئەگەر تۆزێك گۆڕانكاری بەسەر ژینگە هات و تۆزێك ئاڵۆز بوو، بەهیچ شێوەیەك ناتوانن خۆیان لەتەك ئەو ژینگەیەدا بسازێنن و تا لەم كاتەدا پێویستیان بەچاودێری‌و ڕێنمایی كەسانی چواردەوریان هەیە.

منداڵی دەبەنگ دەتوانێت جل و بەرگی خۆی لەبەر بكات و ئاگاداری پاك و خاوێنی خۆی ببێت‌و كۆنترۆڵی پرۆسیسی دەرهاویشتن بكات، بەڵام دەبێت هەوڵی لەگەڵ بدرێت و فێر بكرێت، هەروەها دەتوانن مامەڵە بەپارە بكەن و دراوە جیاجیاكان بناسنەوە، بەڵام منداڵانی دەبەنگ نوقستانی و كەم و كورتی زۆریان هەیە، لەلایەنی جەستەیی و گەشەكردنی لەشەوە كەمترن لەمنداڵانی ئاسایی، بۆ نموونە درێژی و كێشیان لەمنداڵی ئاسایی كەمترە، هەروەها زمانیان وەك منداڵی ئاسایی دەوڵەمەندو پاراو نیەو درەنگ

فێری زمان دەبن و جوڵەو چالاكیان سسترەو زۆربەی كاتیان بەگۆشەگیری و دوورەپەرێزی یان بەدەست درێژی و شەڕخوازی بەسەر دەبەن.

بێگومان ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ كەمنداڵی ئاسایی تووشی گۆشەگیری و دەست درێژی نابێت، بەڵكو ئەوانیش ئەو خاسیەت و سیفاتانەیان هەیە، بەڵام ڕێژەی ئەو هەڵس و كەوتانە لەلای منداڵی دەبەنگ زیاترە، بۆ نموونە {(دەرئەنجامی توێژینەوەكانی (كیرك و جۆنسۆن) ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كەڕێژەی ٣/٢ دوو لەسەر سێی منداڵە دەبەنگەكان یان گۆشەگیرو دوورە پەرێزن یان شەڕ خوازن}(الشیخ، ص٧٠). هەروەها توێژینەوەكانی زانایان پۆرتۆن‌و ستاس و ئەنگلینۆش ئاماژە بۆ هەمان دەرئەنجام دەكەن، بێگومان ئەم ڕەوشتانەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەموو بەربەست و ڕێگرانەی كە لەبەردەم منداڵی دەبەنگدا دادەنرێت‌و ئەو ژینگەی ئەو تیایدا دەژی بۆ منداڵی ئاسایی دروست كراوەو لەگەڵ تواناو ژیری ئەو منداڵە دەبەنگانە ناگونجێت، لەبەر ئەوە بەناچاری یان پەنا بۆ گۆشەگیری و دوورەپەرێزی دەبەن بۆ ئەوەی لەهەڕەشەو ناڕەزایی و سووكایەتی كەسانی چواردەوریان ڕزگاریان بێت یان پەنا بۆ دەست درێژی و توندوتیژی دەبەن بۆ ئەوەی بەسەر ئەو كۆسپ‌و بەرگرانەدا زاڵ بن و پلەو پایەو جێگایەكیان لەناو كۆمەڵەكەیاندا هەبێت.

هەروەها منداڵی دەبەنگ زۆر ڕاڕاو دوو دڵەو بڕوای بەخۆی نیەو بە چاوی سووك و گومانەوە سەیری خودی خۆی دەكات و پرۆسیسی یادكردنەوەی لاوازەو زوو زوو شتی بیر دەچێتەوەو ناتوانێت بۆ ماوەیەكی درێژ چاو ببڕێتە شتێك و داڵغە زۆر لێ دەدات و بیرو هۆشی بۆ جێگای دوور دەڕوات‌و توانای بیركردنەوەی ڕووتی (التفكیر المجرد) نیەو تەنها ئەو شتانە وەردەگرێت كە لەڕێگەی هەستەوەرەكانیەوە هەستی پێ دەكات و تەمەنی ژیریان لەتەمەنی كاتیان زۆر كەمترە، لەبەر ئەوە پێداویستیان بە پەروەردەی تایبەتی هەیەو دەبێت مامەڵەی تایبەتی بكرێن‌و بەچاوی ڕێزو خۆشەویستیەوە سەیر بكرێن‌و نابێت لەنرخیان كەم بكرێتەوەو سووكایەتیان پێ بكرێت. چونكە ئەم جۆرە منداڵانە بەرگەی زەبرو ئازارو توندوتیژی ناگرن و زوو هەرەس دەهێنن و بەزەحمەت دەتوانن خۆیان لەتەك بارودۆخی ئاڵۆزو نائاساییدا بسازێنن.

## منداڵی مەنگۆلی

مەنگۆلی جۆرێکە لەدواکەوتنی ژیریی (التخلف العقلی) کە تووشی ژمارەیەک لە منداڵان کەرێژەیان بەنزیکەی (٠،٠٠١) یەک لەدەهەزاری کۆی دانیشوانی جیهان قەبلێنراوە، دەبێت. بێگومان ئەم ناوەش (مەنگۆلی) لەوڵاتی مەنگۆلیاوە کە دەکەوێتە نێوان یەکێتی سۆڤێتی پێشوو وڵاتی چینەوە وەرگیراوە، لەبەرئەوەی ئەم منداڵانە لەسیماو خاسیەتی دەم و چاودا زۆر نزیکن لەدەم و چاوی دانیشتوانی مەنگۆلیا، ئەم ناوەش لەلایەن زانایەکەوە کەناوی (لانگدون)ە بەسەریاندا دابڕا. شایانی ئاماژە بۆ کردنە ئەم منداڵانە هەموویان وەک یەک وانو لەوە دەچن هەموویان خوشک و برا بن و بەم خاسیەتانەی خوارەوەدا دەناسرێنەوە:

(سەری بچووک، چاویان لەشێوەی مۆزدایە، پێستی پێڵوی چاویان ئەستوورە، برۆکانیان چرو پرو لەیەکەوە نزیکن، لووتی کورت و فشەڵ، زمانی گەورەو درزاوی و قاش بوو، گوێی بچووک یان گەورە، دەستی نیمچە ئاوساوو سوورهەڵگەراو...هتد) هەروەها لێدانی دڵیان رێک و پێک نیەو نارێکیش لەکرداری هەناسەدانیاندا هەیە و دەست و قاچیان شین هەڵدەگەڕێن، بەڵام مەرج نیە هەموو ئەم خاسیەتانە لە یەک منداڵی مەنگۆلیدا هەبن، لەوانەیە هەندیکیان هەبن، زۆر خۆشەویست و بێ وەیی‌و خوێن شیرین و هەردەم لێو بەخەندەو کامەران دیارن و زۆر حەز بە پەیوەندی کۆمەڵایەتی و تێکەڵاوی کەسانی چواردەوریان دەکەن، ئارەزووی گۆرانی و مۆسیقاو سەما کردنیان هەیەو تینووی لاسایی کردنەوەو فێربوونی هەڵس و کەوتی کەسانی چواردەوریانن.

ڕێژەی زیرەکیان زۆر نزمەو لەخوار (٦٠)ەوەیەو دەتوانرێت کەمێکیان فێری بڕێک خوێندنو نووسین بکرێن، بەڵام زۆربەیان لەتوانایاندا نیە فێری پیشەو کارێک بکرێن، بەڵام دەتوانرێت فێری (نان خواردن، خۆ گۆڕین و شوشتن، چوون بۆ سەر ئاو، ئاودانی باخچەو گوڵ، بەخێوکردنی پەلەوەری ناو ماڵ، ڕێزگرتنی کەل و پەل و کەرەستەی

کەسانی تر، سەردانی خزم و دراوسێ، لەبەرکردنی هەندێک سروودو گۆرانی، سەماکردن، هەڵپەرکێ...هتد). بکرێت و لەژیانی رۆژانەیدا سوودی لێ وەربگرێت و پێویستی بەکەسانی تر نەبێت.

*تاوەکو ئێستا بەتەواوی نەزانراوە ئەو منداڵانە بۆچی تووشی ئەم حاڵەتە دەبن، هەرچەندە هەندێک بۆچوون و لێکدانەوەی زانستی هەیە لەوانە:*

١) هەندێک لەزاناکان لەو بڕوایەدان کە *تەمەنی دایک* پەیوەندی هەیە بەم حاڵەتەوە، دەڵێن ئەو ژنانەی کەتەمەنیان لەسەرووی (٤٠) ساڵانەوەیە، لەبەرئەوەی چوونەتە تەمەنەوەو منداڵدانیان لاواز بووە، دوور نیە نەتوانن هەموو پێداویستی یەکانی کۆرپەلەکانیان لەناو منداڵداندا دابین بکەن و خۆراک و ئۆکسجینی تەواویان پێ نەگات و کەم و کورتی بکەوێتە کۆئەندامی دەماری ناوەندیان (الجهاز العصبي المركزي) و مێشکیان بەتەواوی گەشە نەکات، بەڵام رەخنەی زۆر لەم بۆچوونە گیراوە، لەبەرئەوەی زۆر جار ئەو ئافرەتانە منداڵەکانیان ئاساییە لەلایەک و لەلایەکی تریشەوە ئەو ژنانەی کەتەمەنیان لەنێوان (٢٠-٤٠) ساڵاندایە هەندێک جار منداڵی مەنگۆلیان دەبێت.

٢) هەندێک لەزاناکان لەو بڕوایەدان کە *تووش بوونی دایکی دووگیان بەهەندێک نەخۆشی ڤایرۆسی ترسناکی* وەک سورێژەی ئەڵمانی و کەوتنە بەر تیشکی وەک (×) یان بەکارهێنانی هەندێک داوودەرمانی پزیشکی بەبڕێکی زۆر لەکاتی دوو گیانیدا، هۆکارێکە بۆ دروست بوونی ئەم حاڵەتە، بەڵام ئەم بۆچوونەش بێ هەڵەو کەم و کورتی نیە، لەبەرئەوەی هەندێک لەئافرەتان تووشی هیچ نەخۆشیەکیش نابن و دووریشن لە کارتێکردنی تیشک و بەکارهێنانی داو و دەرمانی پزیشکی لەکاتی دووگیانیدا، لەگەڵ ئەوەشدا منداڵی مەنگۆلیان بووە. (الشيخ، ١٩٦٦، ص٥٨-٦١).

٣) دەستەیەکی تر لەلێکۆڵەرەوەو زاناکان دەڵێن حاڵەتی مەنگۆلی لەرێگەی *بۆماوەوە* بۆ منداڵەکان دەگوێزرێتەوەو هەندێکی تریان دەڵێن کەم و کورتی لەدابەش بوونی

ژمارەی كرۆمۆسۆمەكان بەرپرسیارە لەم حاڵەتە، مرۆڤی ئاسایی (٤٦) كرۆمۆسۆمی هەیە، بەڵام هەندێك جار لەئەنجامی قەڵەمبازو (الطفرة)و خراپی دابەش بوونی كرۆمۆسۆمەكان ژمارەیان دەبێت بە (٤٧)، ئیتر ئەو كرۆمۆسۆمە زیادەیە دەبێتە هۆی مەنگۆلی، بەڵام دەركەوتووە كە هەندێك لەمنداڵە مەنگۆلیەكان وەك هەموو مرۆڤێكی ئاسایی تەنها (٤٦) كرۆمۆسۆمیان هەیە، بەم شێوەیە تاوەكو ئێستا یەكالا نەكراوەتەوەو نازانرێت هۆكارە سەرەكیەكانی ئەم حاڵەتە چین.

بێگومان ئەم جۆرە مندالانە پێداویستیان بە پرۆگرام و شوێن و پەروەردەو مامەڵەی تایبەتی هەیە بۆ ئەوەی بتوانن لەژیاندا بەردەوام بن و نەبن بەئەرك و بارێكی گران بەسەر شانی كەس و كاریانەوە، ئەگەر توانرا ئەو جۆرە مامەڵەو پەروەردە تایبەتیەیان بۆ دابین بكرێ ئەوا بەكامەرانی لەناو خێزان و كۆمەڵەكەیاندا دەژین.

## منداڵ بۆ درۆ دەکات؟

درۆ گوتەیەکە لەتەک واقیعدا چون یەک نیەو مەبەست چەواشەکردن و هەڵخەڵەتاندنی کەسانی ترە، یان بەمەبەستی شاردنەوەی ڕاستیەو ئیتر لەبەر هەر چ هۆیەک بێت، هەر چ کەسێک بیەوێت کارێک بکات یان شتێک بڵێتو ببێتە هۆی شاردنەوەی ڕاستی و خۆشی هەست بەوە بکات و مەبەستی بەئاکام گەیاندنی ئامانجێکی دیاری کراو بێت دادەنرێت بەدرۆ.

زۆر جار منداڵ پەنا بۆ درۆ دەبات بۆ جێ بەجێ کردنی کارەکانی هەرچەندە زیان نە بەخۆی نە بەکەسانی تر ناگەیەنێ لەم کاتەدا ناو دەبرێت بەدرۆی سپی، لەڕاستیدا ئەم جۆرە درۆیانە دەبێت بەسەرەتای ڕوودانی درۆی گەورەترو ئاڵۆزترو زیان بەخشتر.

درۆ دیاردەیەکی باوەو زانراوە، لەوانەیە زۆر بەسادەیی سەر هەڵبدات، بۆ نموونە کاتێک دایک بە منداڵەکەی دەڵێت دەستت شتووە یان برسیت نیە ئەویش دەڵێت بەڵێ، هەرچەندە لەڕاستیدا دەستی نەشتووەو برسیشیەتی، وەیان لەوانەیە درۆ ئاڵۆزتر بێت وەک ئەوەی منداڵ دەڵێت چووم بۆ قوتابخانەو لەڕاستیشدا بەدرێژایی ئەو ڕۆژە لە کۆڵانو شەقامەکان سوڕاوەتەوە. هەرچەندە گشت ئەوانە بەدرۆ دادەنرێت، بەڵام نابێت بەدیاردەیەکی باوو شاز لەلای منداڵ وەنابێتە مایەی دەردەسەری بۆ خۆی و کەس و کاری، ئەگەر ڕێچکەیەکی بەردەوام وەرنەگرێت و دووبارە نەبێتەوە، بەڵام ئەگەر بوو بەبەشێک لەڕەوشتی ئەو منداڵەو لەتەک کەسانی تردا مامەڵەی پێ کرد ئەو کاتە دادەنرێت بە دیاردەیەکی دزێویی ناشیرین و زیانبەخش و پێویستی بەچارەسەرکردن هەیە. (العظماوی، ١٩٨٨، ص١٨١-١٨٢).

ڕاست گۆیی و درۆ کردن لەو دیاردە دەروونیانەن کە مرۆڤ لەژینگەی کۆمەڵایەتییەوە فێری دەبێت. لەبەرئەوە زۆر پێویستە تاکەکانی ئەو ژینگەیەی منداڵی تێدا دەژی (خێزان، قوتابخانە،...هتد) خاوەنی قسەی خۆیان بنو هەوڵ بدەن کردارو گوتەکانیان چون یەک بن، چونکە منداڵ بەردەوام بەهۆی خۆخستنە شوێن و لاسایی کردنەوەی گەورەکان فێری زۆر ڕەوشتو هەڵس و کەوت دەبێت.

## درۆ زۆر جۆری هەیە لەوانە

### ١- درۆی خەیاڵاوی:

کە هەندێک منداڵ هێزێکی خەیاڵاوی پتەویان هەیەو بوارێکی فراوان لەمێشک و بیریان داگیردەکات، ئەم جۆرە درۆیە منداڵ وەک یارییەک خۆشی لێ دەبینێ، وەک گێڕانەوەی چیرۆکو بەسەرهاتی سەرسوڕهێنەر کە زۆر جار پێچەوانەی واقیعن و دوورن لەڕاستیەوە.

### ٢- درۆی تێکەڵ کردن:

زۆر جار منداڵ ناتوانێت ڕاستیەکان لەخەیاڵ و خەوو بۆچوون و حەزو ئارەزووەکانی خۆی جیا بکاتەوە، بۆیە هەندێک لەقسەکانی دوورن لەواقیعەوە، لەچنینی خەیاڵی خۆیەتی، ئەویش لەئەنجامی تێکەڵکردنی ڕاستی لەتەک خەوو خەیاڵەکانی خۆیدا.

### ٣- درۆی پارێزگاری:

منداڵ زۆر جار ناچار دەبێت، پەنا بۆ درۆ ببات بۆ پارێزگاری کردن لەخودی خۆی و دەرباز بوون لەسزاو ئازارێکی چاوەڕوان کراو ئەگەر هاتو ڕاستی ووت، وە ئەم جۆرە درۆیە لەشیاوترین و بلاوترین درۆیە کە زۆربەی منداڵان پەنای بۆ دەبەن. (القوصي، ١٩٧٥، ص٣٣٩-٣٥٤) (قطامي، ١٩٨٩، ص١٤٨-١٥٠).

### ٤- درۆی تۆڵەسەندن:

هەندێک جار منداڵ درۆ وەک چەکێک بەکار دەهێنێت بۆ تۆڵە سەندنەوەو ئازاردانی ئەو کەسانەی کە ڕقی لێ یانە، ئەم جۆرە درۆیەش زیاتر لەناو ئەو منداڵانەدا باوە کە

لەژینگەیەکی خێزانی نائاسایی و ئالۆزدا دەژین، هەست بە یەکسانی و دادپەروەری ناکەن لەمامەڵەدا، بۆ نموونە ئەگەر منداڵێک ڕقی لەیەکێک لە خوشک و براکانی بێت، لەلای دایک و باوکی درۆیان بۆ هەڵدەبەستێت بۆ ئەوەی سزا بدرێن و بکەونە بەر هەڕەشەو تووڕەیی دایک و باوک.

**٥ - درۆی لاسایکردنەوە:**

منداڵ زۆر لەدرۆکانی لەڕێگەی لاسایی کردنەوەی دایک و باوک و کەسانی تری چواردەوریەوە فێریان دەبێت، بۆ نموونە کاتێک باوک بە منداڵەکەی دەڵێت ئەگەر فلان کەس هات پێی بڵێ باوکم لەماڵەوە نیە، ئایا باوک بەم ڕێگەیە منداڵەکەی فێری درۆ ناکات؟ یان بەمنداڵەکەی دەڵێ ئێواری دیاریەکی خنجیلانەت بۆ دەهێنمەوە یان ئەچین بۆ شاری یاری...هتد، بەلام ئێواری باوک دەگەڕێتەوە دیاری پێ نیە.. ناش چن بۆ شاری یاری...هتد.
منداڵ بەم شێوەیە فێری درۆ دەبێت و ئەویش وەک باوکو دایکی وا ئەزانێ شاردنەوەی ڕاستی کارێکی ئاساییەو گەورەو بچووک بەئاکامی دەگەیەنن.

**هۆکانی درۆ کردن**

**أ- بێ بەش بوون:**

کاتێک منداڵ لەسۆزو خۆشەویستی بێ بەش دەبێت یان حەزو ئارەزوو پێداویستیەکانی بۆ دابین ناکرێت، ناچار پەنا بۆ درۆ دەبات بۆ تێرکردنی ئەو حەزو ئارەزووانەی، هەرچەندە ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیش بێت. بۆ نموونە کاتێک منداڵ حەز بە جل و بەرگ و یارییەکی جوان دەکات و دەستی ناکەوێت ناچار لەناو برادەرەکانیدا دەڵێت یارییەکە یان جلو بەرگێکی جوانم کڕیوە.

*٢- درۆكردنی دایك و باوك و كەسانی تری چواردەوری مندال:*

هۆكارێكی ترسناكە بۆ فێربوونی درۆ چونكە مندال لەقۆناغی گەشەكردندایەو لەڕێگەی لاسایی كردنەوەو خۆ خستنە شوێنەوە زۆربەی ڕەوشت و هەڵس و كەوتی گەورەكانی بەتایبەتی دایك و باوك فێر دەبێت.

٣- *مندال هەندێك جار پەنا بۆ درۆ دەبات، بۆ سەلماندنی خودی خۆی، بۆ* ئەوەی سەرنجی تاكەكانی چواردەوری ڕابكێشێ. ئەویش لەڕێگەی دروست كردن و هۆنینەوەی چیرۆكو بەسەرهات لە خەیاڵیدا كە زۆربەیان دوورن لەواقیع و ڕاستیەوە.

٤- *زۆر جار مندال لەترسی سزاو سەرزەنشت و ئازار پەنا بۆ درۆ دەبات،* كاتێك بزانێت ئەگەر ڕاستی بەسەرهاتەكە بگێڕێتەوە ئەوا دووچاری ئەشكەنجەو ئازاردان دەبێت، ئەم جۆرە درۆیەش لەناو ئەو مندالانەدا باوە كە باوك و دایك و تاكەكانی تری خێزان بەردەوام پەنا بۆ توندوتیژی و بەكارهێنانی سزا دەبەن كاتێك مندالەكانیان هەلەیەك دەكەن.

٥- *كاتێك مندال تووشی كەم و كورتییەكی جەستەیی یان كۆمەلایەتی یان ژیری دەبێت* زۆر جار بۆ پڕكردنەوەی ئەو كەم و كورتیەو ڕاكێشانی سەرنجی كەسانی چواردەور پەنا بۆ درۆ دەبات، ئەویش بەدروست كردنی چەندەها بەسەر هات و ڕووداوی سەیرو سەمەرە كە زۆربەیان لەواقیعدا نین و خۆی دەكات بە پالەوانی ئەو چیرۆك و بەسەرهانە.

*چارەسەری درۆكردنی مندال*

١- دیاری كردنی جۆری درۆكە، واتە مەبەستی مندال چیە لەو درۆكردنە، ئەگەر پالنەری سەرەكی درۆ كردنەكەمان زانی ئەوا چارەسەركردنی بریتیە لە نەهێشتنی ئەو پالنەرەو تێركردنیەتی.

٢- بەکار نەهێنانی لێدان و سزای بەردەوام، چونکە بە لێدان چارەسەری درۆ ناکرێت و لەوانەشە بەهێزتریشی بکات، بەتایبەتی ئەو حاڵەتانەی کە منداڵ لەترسی ئەشکەنجەو ئازار پەنا بۆ درۆ دەبات هەروەها کاتێک منداڵ ڕاستی دەڵێ و دان بەهەڵەکەیدا دەنێت، پێویستە منداڵ سزا نەدرێت، چونکە لێدانو سزا لە نرخی ئەو ڕاستگۆیی و دان پیانانە کەم دەکاتەوە، ئیتر جارێکی تر منداڵ دان بەگوناهو هەڵەکانیدا نانێت و لەسەر درۆکانی بەردەوام دەبێت.

٣- پێویستە ژینگەی (خێزان، قوتابخانە،...هتد) منداڵ گونجاو و دروستو لەبار بێت بۆ گەشە کردنی و دوور بێت لە هەڵس و کەوتی خوارو خێچ و فێڵاوی، چونکە درۆ کردنی دایکو باوک و کەسانی تری ژینگەی منداڵ هۆکارێکی خراپە بۆ فێربوونی درۆ لەلایەن منداڵەوە.

٤- هەوڵ بدرێت نەهێڵدرێت منداڵ سوود لەدرۆکردنەکەی وەربگرێت، چونکە کاتێک هەست دەکات کە درۆکەی بەقازانجی ئەو تەواو نابێت و بێ کەڵکە، بەناچاری وازی لێ دەهێنێت و دووبارەی ناکاتەوەو لێی دوور دەکەوێتەوە(باقر، ١٩٧٦، ص١٠٠-١٠٥).

٥- بوار نەدرێت بەمنداڵ وابزانێت کەسانی تر بەئاسانی بڕوای پێ دەکەن بۆ ئەوەی منداڵەکە تێ بگات کە درۆکردن و هەڵخەڵەتاندنی کەسانی تر وا ئاسان نیەو دەبێتە مایەی ڕەنجاندن و تورەیی و نارەزاییان لەبەرئەوە پێویستە منداڵ بەردەوام ڕاست گۆبێت بۆ ئەوەی جێگەی خۆی لەدڵ و دەروونی کەسانی چواردەوری بکاتەوەو مایەی ڕێزو ستایشیان بێت.

## چکۆسی (الغیرة)

چکۆسی (غیره) هەڵچوونێکی ئاڵۆزەو گوزارشت لەبوونی ململانێ و رق و کینەو تووڕەیی دەکات و چەکێکی دەروونیەو منداڵ بەتایبەتی و گەورە بەگشتی پەنای بۆ دەبەن کاتێک هەستیان کرد کەوا خەریکە بەهۆی کەسانی ترەوە کەسێکی خۆشەویست یان کەلو پەل یان سەرچاوەی سۆزو دڵنیاییان لەدەست دەچێت ، ئا لەم کاتەدا مرۆڤ پەنا بۆ ئەم چەکە دەروونیە دەبات و لەهەستو هۆش و هەڵس و کەوتیدا ڕاستەخۆ یان ناڕاستەوخۆ ڕەنگ دەداتەوەو ئاڕاستەی ئەو کەسو سەرچاوانەی دەکات کە کەوتوونەتە ململانێو پێشبڕکێ لەتەکیدا بۆ زەوتکردنی ئەو کەس و سەرچاوەی خۆشەویستی و کەرەستانەی کەئەم بە موڵکی خۆی دەزانێت، هەندێک جاریش مرۆڤ (بچووک یان گەورە) ئەو غیرەیە لەژێر پەردەی کپکردندا دەشارێتەوەو دەری نابڕێت، یان پێچەوانەکەی دەردەبڕێت، بۆ نموونە غیرەو رق و کینەو تورەییە ڕاستەقینەکەی ناوەوە دەگۆڕێت بۆ خۆشەویستیەکی لەڕادەبەدەری دەرەکی دروست کراو، هەرچەندە لەناخەوە هەست بەئازارو رق و کینەش دەکات..

زۆر جار دایک و باوک، کاتێک هەست بەغیرەو ڕک و کینەی منداڵەکانیان دەکەن، ئەم و مژی خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێ دایان دەگرێ و تووشی ترس و نارەحەتی دەبن ، لەڕاستیدا پێویست بەو هەموو ترس و دڵەڕاوکێ یە ناکات، چونکە بوونی غیرە بەرێژەیەکی گونجاوو لەسنووری ئاساییدا سروشتیەو لای هەموو منداڵێک هەیەو بەڵگەی دروستی دەروونی منداڵەو هێزێکی ناوەکیە بۆ پارێزگاری کردنی خودی منداڵ و هێنانەدی حەزو ئارەزووەکانی و ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو منداڵە لەلایەنی دەروونی و ژیریی و کۆمەلایەتیەوە ئاساییەو تووشی گرێی دەروونی و دواکەوتنی ژیری نەبووەو هەوڵ دەدات پارێزگاری لەسەرچاوەو ئەو کەرەستەو کەسانە بکات کە بە موڵکی خۆی دەزانێتو خۆشەویستی و پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکانی دەپارێزێ، بەلام ئەو منداڵانەی کە بەهیچ شێوەیەک غیرە ناکەن، مانای وایە کەم و کورتی لەژیانیاندا هەیەو پێویستە

هەولی چارەسەرکردنی بدرێت، لەوانەیە ژیانی خێزانی و کۆمەڵایەتیان ناخۆش بێت و توندوتیژی لەتەکیدا بەکار بهێنرێت یان هەست بکات کەبێزراو زوڵم لێکراوە لەلایەن دایک یان باوک یان کەسانی تری خێزانەوە، ئا لەم کاتەدا منداڵ ناتوانێت پەیوەندی کۆمەڵایەتی و سۆزو خۆشەویستی لەتەک ئەو کەسانەدا دابنێت و بەردەوام رقیشی لێیان دەبێت و هەوڵ دەدات کە لێیان دوور بکەوێتەوەو هەست بەرق کینەو غیرە ناکات ئەگەر هەرکەسێک هەوڵی زەوت کردنیان بدات، یان ئەو منداڵانەی کەتووشی دواکەوتنی ژیری (تخلف عقلی) بوون و دەبەنگ و گەمژەن و لەتواناناندا نیە پەیوەندی و خۆشەویستی لەگەڵ کەسانی چواردەور دابنێن و ئەو ژیری و شارەزایی و توانایەشیان نیە کە هەست بەلەدەست چوونیان بکەن. ئا لەم دوو حاڵەتەی سەرەوەدا منداڵ هەست بە غیرە ناکاتو بەڵگەشە بۆ ئەوەی کە ئەو منداڵانە ئاسایی نین، بەڵام ئەگەر غیرە لەرێژەی گونجاو دەرچوو سنووری ئاسایی خۆی بەزاند، ئەوە ئەو کاتە ئاسایی نیەو پێویستە بەدوای ئەو هۆکارانەدا بگەڕێین کە بوونەتە هۆی دروست کردنی ئەو بارودۆخە.

غیرە لەقۆناغی منداڵیدا دروست دەبێت، کاتێک منداڵ هەست و توانای ئەوەی دەبێت کە پەیوەندی کۆمەڵایەتی پتەو لەتەک تاکەکانی خێزاندا دابنێت و هەست بە موڵکداری بکات. یەکەم کەسی گرنگیش لەژیانی منداڵدا دایکە، چونکە یەکەم کەسە کە سەرجەم پێداویستیەکانی بۆ تێر دەکات و لەباوەشیدا هەست بە ئارامی و دڵنیایی دەکات، دوای ئەویش کەسانی تر، منداڵ ئەمانە هەمووی بەموڵکی خۆی دەزانێت و رازی نابێت کەس لێی زەوت بکات یان ببن بە هاوبەشی، ئەمانە دەبن بە راستی بەڵگەنەویست لەخەیاڵی منداڵدا دێنو دەچن، ئینجا هەر چ کاتێک منداڵ هەست بکات ئەو کەس و سەرچاوانەی سەرەوە خەریکە لەدەست دەچن، یەکسەر پەنا بۆ چەکی غیرە دەبات و پارێزگاری لەخودی خۆی و ئەو کەس و سەرچاوانە دەکات. چونکە منداڵ بەردەوام هەوڵ دەدات ئەو پەیوەندییانە بپارێزێتو ئەو خۆشەویستی و دڵنیاییەی لە دەست نەچێت، گومانی تێدا نیە کە *زۆرجار منداڵ هەست بەهەرەشەو مەترسی لەدەست دانی ئەو کەس وکەرەستەو سەرچاوە خۆشەویستانە دەکات بەهۆی ئەم هۆکارانەی لای خوارەوە:*

١- لەدایك بوونی منداڵی تازە لەخێزاندا.　　٢- هاتنی میوانو كەسانی تری دەرەوەی خێزان. ٣-بەراوردكردن لەنێوان منداڵاندا.　　٤-هەست كردن بەكەمی. ٥-لەدەست دانی مافێك لەمافەكانی پێشووی، بەهۆی پەیدابوونی كەسێكی تر. لەم حاڵەتانەی سەرەوەدا مرۆڤ (بچووكو گەورە) هەست بەغیرە دەكەن، چونكە بەرژەوەندی (امتیازاتیان) بەهۆی كەسانی ترەوە دەكەوێتە مەترسیەوە. مەترسی لەوەدایە كاتێك منداڵ غیرە لەخوشكە یان برایەكی بچووكی دەكات. لەوانەیە بەتوندی ئازاری بدات، زۆر جار سەرین یان خاولی لەسەردەمی كۆرپەی ساوای ناو بێشكە دادەنێت، لەوانەیە بیخنكێنێ و كارەساتێكی گەورە ڕوو بدات یان پەنجە بەچاویا بكات یان لێی بدات. زۆر جار ئەمانە ڕوو دەدەن هەرچەندە منداڵەكە لەوانەیە ئەو مەبەستەی نەبێت، بەڵام لەئەنجامی نەزانی و تورەیی و غیرەوە ئەو كارەساتانە ڕوو دەدەن، لەبەر ئەوە پێویستە دایك و باوك زۆر ووریاو لێهاتوو بن و نەهێڵن منداڵەكانیان تووشی غیرەی زۆر ببن ئەویش لەڕێگەی ئەم خاڵانەی خوارەوە:

١- نابێت دایك و باوك یان مامۆستا منداڵان بەیەكتری بەراورد بكەن و یەكێكیان بەرز بكەنەوەو بڵێن لەو باشترە، چونكە ئەمە دەبێتە مایەی دروست بوونی غیرە.

٢- جیاوازی نەكردن لەنێوان منداڵاندا، ئیتر چ كوڕ بێت یان كچ یان تاقانە، دەبێت هەموویان بەیەك چاو سەیر بكرێن و مافی كەسیان پێشێل نەكرێت بۆ یەكێكی تریان.

٣- خۆ ئامادەكرنی خێزان بۆ پێشوازی منداڵی تازەو، تێگەیاندنی منداڵەكانی تر كە ئەوەی دێت خوشك و براو پاڵپشتو دڵسۆزی ئێوەن، وە نابێت گشت سۆزو خۆشەویستی و گرنگی لەمنداڵەكانی تر ببڕدرێت و پشت گوێ بخرێن و هەمووی بدرێت بەو منداڵە تازەیە، چونكە ئەمە غیرە دروست دەكات.

٤- نقوم نەكردنی منداڵ لە پاداشت و دیاریداو هەوڵ دان بۆ گەشەكردنیان و بروا بەخۆبوونیان.

٥- پێویستە منداڵ بەردەوام تێ بگات كە خۆشەویستەو پشتگوێ نەخراوەو لەهیچ كەس كەمتر نیە، چونكە پەروەردەی هەڵەی دایك و باوك و نەزانیان یەكەم هۆكارە بۆ دروستكردنی (غیرة) لای منداڵ و پەرەپێدانی.

## (بڕوا بەخۆ نەبوون) یان (متمانە نەکردن بەخوود)

بڕوا بەخۆ بوون (الثقة بالنفس) دیاردەیەکی دەروونیەو دادەنرێت بە پاڵنەری سەرەکی بۆ ڕەوشت و بیرکردنەوەی تاکو کاریگەری هەیە لەسەر ژیانی مرۆڤ و لەهەموو هەلس و کەوتێکیدا ڕەنگ دەداتەوە، دیاردەی بڕوا بەخۆبوون پەیوەندیەکی زۆری هەیە بەچۆنیەتی بڕیاردان و وورەی تاک و سەرکەوتنی لەژیاندا. واتە ئەوانەی بڕوایان بەخۆیان هەیەو هەست بە کەمی ناکەن و لە بیرکردنەوەو بڕیارداندا ڕاڕاو دوو دڵو بەگومان نین ئەوا بە ئاسانی سەرکەوتن بەدەست دەهێنن و ژیانیان ئاسوودە دەبێت، بەلام ئەو کەسانەی بڕوایان بەخۆیان نیەو هەست بەکەمی دەکەن و دەترسن و بەردەوام دڵەڕاوکێ و گۆشەگیری و گومان سەرە ڕێگای لێگرتوون، بێگومان هەموو ژیانیان دەبێت بە دۆزەخ و نازانن تامی کامەرانی و سەرکەوتن چییە.

کۆمەڵێک هۆکار هەیە کە دەبێت لەژینگەی مرۆڤدا هەبێت بۆ ئەوەی ئەو تاکە بڕوای بەخۆی هەبێت و سەربەخۆیی و بوونی خۆی بسەلمێنێ، هۆکارەکانیش بریتین لە بوونی کەشو هەوایەکی دیموکراسی ئازادو سەربەست، کەتاک بتوانێت هەر لەسەرەتای ژیانیەوە لەناو خێزان و دوای ئەوەش لەقوتابخانەو کۆلان و دامەزراوە کۆمەلایەتیەکانی تر بەبێ ترس و دڵەڕاوکێ گوزارشت لەخودو خەوو خەیاڵ و ڕاوبۆچوونەکانی (بەبێ بوونی سانسۆرو چاوسووڕکردنەوە) بکات و لەتەک تاکەکانی تری کۆمەڵەکەیدا بکەوێتە گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوەو بەردەوام لەسەر کردەوەو ڕەوشتە ڕاست و جوانەکانی پاداشت بکرێتو پشتگیری لێبکرێت و ڕێزی بگیرێ و کۆسپ و بەربەست لەبەردەم پێداویستیە فسیولۆژی و دەروونیەکانیدا دانەنرێت.

گومانی تێدا نیە ئەگەر مرۆڤ لەژینگەیەکی ئاوادا گەورە بوو ئەوا کەسایەتیەکی سەرکەوتووی دەبێت و هەست بەکەمی ناکات و بڕوای بەخۆی دەبێت و زۆر بەجەرگ و چاونەترس دەبێت. بەلام بەپێچەوانەوە ئەگەر ئەو ژینگەیەی کە تیایدا دەژی پڕ بود

لەتۆقاندن و ترس و هەرەشەو چاوسوورکردنەوەو جۆری مامەڵەکە دکتاتۆریانە بوو، تاکێ ڕێزی نەگیراو هەستی بەدڵنیایی و ئارامی نەکردو سەربەستی و مافەکانی پێشێل کرابوو، ئەوا بەهیچ شێوەیەکێ ئەو تاکانە کەسایەتیان سەرکەوتوو ئاسایی نابێت و تووشی کۆمەڵێک کێشەو گرفتی دەروونی دەبن کە یەکێکیان هەست کردن بەکەمی و بڕوا بەخۆنەبوونە.

دەرئەنجامی زۆربەی توێژینەوە زانستیەکان (القوصی، ١٩٨١، ص٣٢٧) (باقر، ١٩٧٦، ص٨٤) (جلال، ١٩٧٠، ص٤٩٠) ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە پەروەردەی هەڵەی ناو خێزان و کۆمەڵ کە بریتین لە (لێدان و توندوتیژی بەردەوام، نەبوونی مامەڵەیەکی نەگۆڕ -تذبذب- لەهەڵس و کەوتدا، پشت گوێ خستنی منداڵ، نازدار بەخێوکردنی، سووکایەتی پێ کردنی، دەرخستن و گەورە کردنی کەم و کورتیەکانی، بوونی ئاژاوەو ناخۆشی لەناو خێزاندا. نوقستانیو کەم و کورتی جەستەیی...هتد) دەبنە هۆی هەست بەکەمی کردن و بڕوا نەبوون بەخودو متمانە نەکردن پێی.

هەروەها لەناو کۆمەڵیش و لەدەرەوەی خێزان ئەو جۆرە ژینگەو مامەڵەیە دەبێتە هۆی تێکشکاندنی کەسایەتی تاکێ. لەگرنگترین نیشانەکانی بڕوا نەبوون بەخودو متمانە نەکردن پێی بریتیە لە (ڕاڕایی، شەرم، زمان تەتەڵەکردن، گۆشەگیری و پاشەکشێ، سوورنەبوون لەسەر ڕاو بۆچوونەکان و بەدوادانەچوونیان، کۆڵ دان، ترس و چاوەڕوانکردنی ناخۆشیو کارەسات، کات بەفیڕۆدان، کردنی هەزارو یەکێ حساب بۆ هەموو ئیشێکێ ئیتر بچووکێ بێت یان گەورە، خۆ دەرخستن، گرنگی دانی زیاد لەپێویست بەڕواڵەت، زیادەڕۆیی لەقسەکردن و بڕیاردان و توانستەکانیاندا هەرچەندە لەناوەڕۆکیشدا فشەڵو پووچە) هەروەها هەندێکێ جاریش بۆ پڕ کردنەوەی کەم و کورتی و داپۆشینی ئەو هەستکردن بە کەمی و بڕوانەبوونە بەخود ، شێوەی{زیندە خەون و نقووم بوون لە جیهانی خەوو خەیاڵ و چەوساندنەوەی کەسانی تر (قۆچی قوربانی) خۆ بەزلزانین و سەرەڕۆیی} وەردەگرێت.

## لەخوێندن دواکەوتن

لەخوێندن دواکەوتن گرفتێکی پەروەردەیی، دەروونی، کۆمەڵایەتی و ئابووریەو لەمێژەوە سەرنجی دەروونزان و پەروەردەکارانی ڕاکێشاوەو خەریکی توێژینەوەن بۆ زانینی گرنگترین هۆکارەکانی دواکەوتن لەخوێندن، هەر چ کەسێک وانەی ووتبێتەوەو بۆ ماوەیەکی کەمیش بوو بێت پیشەی مامۆستایەتی کردبێت، ئەوا بەئاسانی هەستی بەم دیاردەیە کردووەو بۆی دەرکەوتووە کە ژمارەیەک قوتابی ناتوانن وەک هاوڕێ فێرخوازەکانی تریان وانەکانی قوتابخانە ڕەوان بکەن و تیایدا سەرکەوتن بەدەست بهێنن و دوا دەکەون، ئەمەش خۆی لەخۆیدا گرفتێکی تر دروست دەکات، ئەویش ئەوەیە دوور نیە زۆربەی ئەو فێرخوازە دواکەوتوانە لەپۆلدا ئاژاوە بنێنەوەو دەستدرێژی بکەنە سەر کەل و پەل و کەرەستەکانی قوتابخانە یان گۆشەگیرو بێ هیوا سەیری هاوڕێکانی تریان بکەن، یان واز لەخوێندن بهێنن و تێکەڵ بە کۆمەڵێک منداڵی وەک خۆیان ببن و گروپێکی یاخی بوو دەست درێژی کار پێک بهێنن.

ئەمانە خراپەکارییەکانی ئەو کەسانەن کەلەخوێندن دوادەکەون، لەبەرئەوەی سەرنەکەوتوو بووە لە بواری خوێندندا، دەیەوێت لەبوارەکانی تری ژیاندا ئەو سەرکەوتنە قەرەبوو بکاتەوە تەنانەت ئەگەر هات و بەڕێگەی چەوتیش بێت. دواکەوتن لەخوێندن یان گشتی دەبێت (واتە فێرخواز لەزۆربەی وانەکاندا دوا دەکەوێت) یان تایبەتی دەبێت (واتە فێرخواز لەبابەتێک یان دووان سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ) دەرئەنجامی نقدبەی توێژینەوە زانستیەکان ئاماژە بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکەن و دایدەنێن بەگرنگترین هۆکارەکانی لەخوێندن دواکەوتن، هۆکارەکانیش بریتین لە:

١) ژیریی وئاستی زیرەکی :

زیرەکی پەیوەندییەکی پتەوی بەخوێندنەوە هەیە، ئەو فێرخوازانەی ڕێژەی زیرەکیان نزمەو لەکاتی خوێندنداو کۆسپ و تەگەرەی نقدیان دێتە ڕێگا لەوانەیە دوا

بکەون لەخوێندن و لەوانەکانی قوتابخانەدا سەرکەوتن بەدەست نەهێنن، چەندەها ئەزموون و تاقیکردنەوە هەیە بۆ پێوانی ڕێژەی زیرەکی مرۆڤ و بەبەکارهێنانی ئەم هاوکێشەیە ڕێژەی زیرەکی دەدۆزرێتەوە:

$$\text{ڕێژەی زیرەکی} = \frac{\text{تەمەنی ژیری}}{\text{تەمەنی کاتی}} \times ١٠٠$$

ئینجا ئەگەر ڕێژەی زیرەکی فێرخواز یەکسان بوو بە (١٠٠) ئەوکاتە زیرەکیەکەی مام ناوەندی دەبێت و ئاساییە، بەڵام ئەگەر لە (١٠٠) کەمتر بوو ئەوە زیرەکیەکەی کەمەو لەمرۆڤی ئاسایی کەمتر دەبێت و تووشی دواکەوتن و دەرنەچوون دەبێت لە قوتابخانە، هەروەها هەندێک جار فێرخواز ڕێژەی زیرەکیەکەی ئاساییە، بەڵام توانستی تایبەتی لەیەکێک لەبابەتەکانی خوێندندا لاوازە وەک بیرکاری یان زمان، یان هونەر لەبەرئەوەی دەرکەوتووە کە مرۆڤ لەچەند بوارێکدا کارامەیەو توانستی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام لەچەند بوارێکی تردا لاوازە، دوور نیە ئەم هۆکارەش هەندێک جار ببێتە هۆی دواکەوتن لەخوێندن.

## ٢) هۆکارە جەستەییەکان :

هەندێک جار لە ئەنجامی (لاوازی جەستەیی و بوونی کەم و کورتی لەهەستەوەرەکان و نەخۆشی بەردەوام -مزمن- و زوو هیلاک بوون و لاوازی ئاگاداری و چاوتێبڕین لەپۆلدا، تووش بوونی فێرخواز بەگرفتی وەک زمان فسی و گیری...هتد) گرفت بۆ فێرخواز دروست دەبێتو تووشی دواکەوتنی دەکات و هەندێک جاریش لەئەنجامی خۆ بەراوردکردن و هەست کردن بەکەمی لەیەکێک لەئەندامەکانی لەشدا خوێندکار لەخوێندنەکەی دەپچڕێ و تووشی دواکەوتن دەبێت لەوانەکانیدا.

### ٣) ئەو هۆکارانەی کە پەیوەندیان بەفێرخوازەوە هەیە:

هەندێک جار فێرخواز لەئەنجامی هەندێک هۆکارەوە کە پەیوەندی بەخۆیەوە هەیە تووشی دواکەوتن و سەرنەکەوتن دەبێت، لەوانە فەرامۆش کردنی وانەکانی قوتابخانەو پشت گوێ خستنی بۆ کۆتایی ساڵ، یان بۆ کاتی تاقیکردنەوە، ئاگادار نەبوون و لاوازی پاڵنەر بۆ خوێندن لەناو پۆلدا، نەزانی فێرخواز لەبواری (سەعی کردن) و یادکردنەوەداو سەیرکردنی خود بەچاوێکی نزم و بڕوا نەبوون و ڕاڕایی و گومان کردن لەتواناو بەهرەی تایبەتی خۆی (القاضي، ١٩٨١، ص٣٩٩-٤٠٤).

### ٤) خوێندنگا:

هەندێک جاریش خوێندنگا بەرپرسیارە لەدواکەوتن و سەرنەکەوتنی فێرخواز بەتایبەتی ئەگەر بەرنامەو پرۆگرامەکانی گونجاو نەبێت بۆ تواناو تەمەنی فێرخواز، یان مامۆستا کەم تەرخەمی بکات و سەرکەوتوو نەبێت لەوانەکەیداو شێوەی وانە ووتنەوەکەی گونجاو نەبێت بۆ بابەت و قۆناغی فێرخوازەکان، یان تووڕەو دەمارگیرو توندو تیژ بێت، هەندێک جاریش ووشکی و دکتاتۆری و نەبوونی یەکسانی و سۆزو خۆشەویستی لەژینگەی خوێندنگادا، دەبێتە هۆی دواکەوتن.

### ٥) خێزان:

نەبوونی ژینگەی گونجاوو لەبار بۆ خوێندن لەناو خێزانداو سەیرکردنی پرۆسیسی پەروەردەو فێرکردن بەچاوی سوک لەلایەن دایکو باوکی فێرخوازەوەو نەبوونی هاندانو پشتگیری و دابین نەکردنی پێداویستیەکانی خوێندن و هەژاری و گرفتی ئابووری و ڕۆشنبیریو نەبوونی پلەو پایەو پاشەڕۆژ بۆ دەرچوان و خاوەن بڕوانامەکان، گرنگترین هۆکارە بۆ دواکەوتن لەخوێندنو خاوکردنەوەی گوڕی فێرخوازو لاوازکردنی پاڵنەرو ئارەزووی بۆ خوێندنو پشت گوێ خستنی ئەرک و فەرمانەکانی خوێندنگای. حەند چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی سەرەوە دەرمانی دەردی دواکەوتنە.

## شەرم کردن

شەرم کردن یەکێکە لەو ڕەوشتانەی کەمتر لەدیاردە دەروونیەکانی تر سەرنجی کەسانی چواردەوری ڕاکێشاوەو هەندێک لەدایکانو باوکانو مامۆستایان بەدیاردەیەکی ترسناکی لەقەڵەم نادەنو ئەوەندە گرنگی پێنادەن، بەڵام لەڕاستیدا هیچی لەدیاردەکانی تر کەمتر نیەو بگرە هەندێک جاریش لەوان مەترسی لەسەر باری دەروونی و کەسایەتی مرۆڤ زیاترە، کاریگەری شەرم کاتێک دەردەکەوێت کەمرۆڤ لەناو کۆمەڵدا بێتو ببێتە خاڵی سەرنجدانو بابەتی لێدوانو گفتوگۆ کردن، واتە ئەگەر تاکە هەر خۆی بێت یان لەناو کۆڕو کۆبوونەوەدا بێت و کەس ئاگاداری نەبێتو ئەم نەبێتە مایەی سەرنجدانو لێدوانیان، ئەوا بەهیچ شێوەیەک هەست بەشەرم ناکاتو بەئاسانیش خۆی دەکات بەناو هۆڵی سینەماو شانۆو ناو بازاڕو شوێنە گشتییەکاندا.

بەڵام هەر ئەوەندە کەسانی تر چاویان بڕیە ئەمو سەرنجی هەڵسو کەوتەکانیان داو ویستیان لەتەکیدا بکەونە گفتوگۆ، ئیتر دونیا بەسەریدا سەرەو ژێر دەبێتو نیشانەکانی شەرم لەسەرو سیماو هەڵسو کەوتیدا بەئاسانی هەست پێ دەکرێت کە بریتین لە (سوورهەڵگەڕانی دەمو چاو، سەر شۆڕکردنەوە بۆ خوارەوە لەکاتی قسەکردندا، تێکەڵاوبوونی لاقەکانی لەکاتی ڕۆیشتندا، زمان گیرانو تەتەڵەکردنی، تێکەڵاوبوونی بیروهۆش، تەم و مژاوی بوونی هەموو دیاردەکانی چواردەور، حەز کردنو هەوڵدان بۆ دەرباز بوونو دوور کەوتنەوە لەو شوێنو کەسانە، ئیتر بەهەرچ شێوەیەک بێت). هەندێک جار ئەو مرۆڤە شەرمنانە ناچار دەبنو حەز دەکەن کە ژیان بەتەنیایی و گۆشەگیری بەسەر بەرنو خۆیان بەکارێکەوە خەریک دەکەن کە پێویستی بەتەنیایی هەبێتو کەسانی تر بەشداری تێدا نەکەن و بەردەوام هەوڵ دەدەن لەکۆڕو کۆبوونەوەو تێکەڵاویو چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان دوور بکەونەوە.

گومانی تێدا نیە کۆمەڵێک هۆکاری دەرەکی و ناوەکی کار لەیەکتری دەکەن و ئەم گرفتە دەروونیە لەلای مرۆڤ دەخوڵقێت، ئیتر گەورە بێت یان بچووک، لە گرنگترین هۆکارەکانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:

١) یەکەم تۆوی شەرم کردن لەڕێگەی (پشتگوێ خستن و سووکایەتی و ڕیسواکردنی) منداڵەوەو لەناو دل و دەروونیدا دەچێندرێ و ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش لەمیانەی گاڵتەپێکردنو گەورەکردنی هەڵەکانی و سەرزەنشتو گلەیی لێ کردنی زیاد لەپێویستەوە گەشە دەکات، چونکە منداڵ لە ئەنجامی ئەو جۆرە مامەڵانەوە بۆچوونێکی وای لا دروست دەبێت کە تەنها ڕێگاچارە بۆ دەربازبوون لەو سووکایەتی و ئازارو ڕیسواکردنە، گۆشەگیریو دوورکەوتنەوەیە لەکەسانی ترو تێکەڵاو نەبوونیانە، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەبێتە مایەی شەرم و ڕاکردن لە خەڵکی، بەردەوام بوونی ئەو هەڵس و کەوتە گرفتی دەروونی بۆ منداڵ دروست دەکات و بەربەستێکی دەروونی لەنێوان منداڵ و کەسانی تردا دروست دەکات، تا وای لێ دێت تێکەڵاو بوون و بینینی کەسانی تر لەنزیکەوە، دەبێتە مایەی خولقاندنی شەرم و ترسو دڵەڕاوکێ (قلق).

٢) دانانی بەربەستو ڕێگر لەبەردەم تێکەڵاوبوونی منداڵ لەگەڵ منداڵان و تاکەکانی تری کۆمەڵ بەبیانوی پاراستنی لەڕەوشتی خراپ و پارێزگاری کردنی، چونکە هەر لەسەرەتای ژیانیەوە ئەگەر بارودۆخو دەرفەتی لەبارو گونجاو بۆ منداڵ نەڕەخسێنرا بۆ تێکەڵاو بوون و شارەزابوونی ژینگەی کۆمەڵایەتی، سەرەنجام منداڵ گۆشەگیرو دوورەپەرێز دەبێت و لەداهاتوودا بەزانیاری و شارەزایی کۆمەڵایەتی چەکدار نابێت و تووشی ترس و شەرم و ڕاڕایی و هەست بەکەمی دەبێت.

٣) نەبوون یان لاوازی بڕوا بوون بەخۆو سەیرکردنی خود بەچاوی سووکە.

٤) لاسایکردنەوەی کەسانی چواردەور. واتا کاتێک باوک و دایک و کەسانی تری چواردەوری منداڵ شەرم دەکەن ئەوا منداڵیش لەڕێگەی بینین و لاسایکردنەوەی ئەوانەوە فێری شەرمکردن دەبێت.

٥) نازپێدانی زۆری زیاد لە پێویست بەمنداڵ و جێبەجێکردنی هەموو پێداویستیەکانی.

چارەسەرکردنی ئەم دیاردەیە پەیوەستە بە نەهێشتنی ئەو هۆکارانەی سەرەوە، واتە سووکایەتی پێنەکردنی منداڵ و ئازارنەدانی و ڕێگە خۆش کردن بۆی، بۆ ئەوەی

تێکەڵاوی ژینگە کۆمەڵایەتیەکەی ببێت و شارەزایی تەواو لەبارەیەوە پەیدا بکات، هەروەها نابێت منداڵ بەنازداری بەخێو بکرێت و گاڵتەی پێ بکرێت و هەڵەکانی بۆ گەورە بکرێت، دەبێت هەوڵ بدرێت تۆوی بڕوا بەخۆ بوون و ڕێزگرتنی خود لەناخیدا بچێندرێ .

هەر بۆ ئەم مەبەستەش (جاردنر)ی دەروونزان بەرنامەیەکی داناوە بۆ چارەسەرکردنی شەرمی منداڵ کە بریتیە لەوەی نابێت هیچ سزاو ئازارێکی ناپێویست ئاڕاستەی منداڵ بکرێت، دەتوانرێت هانی منداڵ بدرێت بۆ تێکەڵاو بوونی کەسانی تر لەرێگەی یاریکردنی لەتەک منداڵانی دراوسێ و ناسیاوو خوشک و برا کە شەرمیان لێ ناکات، دواتر هەوڵ بدرێت یەک لەدوای یەک ئەو منداڵە ناسراوو دۆستانەی منداڵە شەرمنەکە یارییەکە بەجێ بهێڵن و لەجیاتی ئەوان یەک لەدوای یەک منداڵانی نامۆو نەناسراو بهێنرێتە ناو گۆڕەپانی یارییەکەو جێگەی منداڵە ناسراوەکان بگرنەوە تا وای لێ دێت هەموو چواردەوری منداڵە شەرمنەکە دەبێت بە کەسانی تری نەناسراو، بەم شێوەیە دەتوانرێت چارەسەری شەرمی منداڵ بکرێت و هان بدرێت بۆ تێکەڵاو بوون (دبابنة، ص٢٠٠).

## هەست بەکەمی کردن

هەست بە کەمی کردن (الشعور بالنقص) دیاردەیەکی دەروونیەو وەک چەکێکی دوو لوولە وایە، لوولەیەکیان گەشەو لەخزمەتی مرۆڤدایەو دەبێت بەپاڵنەرو داینەمۆی هەڵس و کەوت و بیرکردنەوەی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی، بەڵام لوولەی دووهەمیان ترسناکەو دەلاقەو درزی گەورە دەخاتە کەسایەتی مرۆڤەوە، زۆر لەزانایان سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی ئەم دیاردەیەن، بەتایبەتی زانایانی قوتابخانەی شیتەڵ کردنەوەی دەروونی، لەپێشەوەشیان (فرۆید)ی دامەزرێنەر کە لەو بڕوایەدایە (هەست کردن بە کەمی لەئەنجامی هەست کردن بە نەبەکامی و لاوازی و سستی چالاکی ئەندامەکانی زاوزێوەیەو تاکە تووشی خەم و خەفەت و ترس و دڵەڕاوکێ دەکاتو ناچار [من] [الأنا] هەوڵی دوورخستنەوەی ئەو ترس و دڵەڕاوکێ یە دەدات لەبواری هەستیەوە بۆ بواری نەستی [اللاشعور] و لەوێدا بەخەفەو سەرکوتکراوی دەمێنێتەوەو دواجاریش دەبێتە ناوکی دروست بوونی گرێ ی کەمی [عقدة النقص] (مکبرايد،ص٨)

بەڵام (ئەدلەر) لێکدانەوەی جیاوازی لەفرۆید بۆ ئەو دیاردەیە هەیە. (ئەدلەر) لەو بڕوایەدایە کە مرۆڤ هەر لەچرکەی یەکەمی لەدایک بوونیەوە، ئامادەباشی بۆ دیاردەی هەست کردن بە کەمی هەیەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش لەئەنجامی خۆ بەراوردکردن بەکەسانی تر چەکەرە دەکات و ساڵ لەدوای ساڵیش سەوز دەبێت و بواری دەروونی مرۆڤ داگیر دەکات.

(ئەدلەر) لەو بڕوایەدایە (کە هەست کردن بەکەمی یەکەم جار لەڕێگەی نوقستانی و کەم و کورتی جەستەییەوە- شەلی، کوێری، لاڵی، خێلی، زۆر قەڵەو یان لاواز، زۆر درێژی یان کورت، نارێکی لەئەندامەکانی لەش- سەرهەڵدەدات و پاڵ بە تاکەوە دەنێت و دەیخاتە جووڵە بۆ ئەوەی ئەم کەم و کورتیە پڕ بکاتەوەو دواجاریش بەرفراوانتر دەبێت و هەموو تاکەکانی کۆمەڵ دەگرێتەوەو لەبواری جەستەیی دەردەچێت و دەپەڕێتەوە سنووری کەم

و کورتی و نزمی ئاستی رۆشنبیریی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و رامیاری و... هتد، نوقستانیش لەو لایەنانەدا تاک هەر تووشی هەست کردن بەکەمی دەکات (رمزی، ص٦). واتە هەست کردن بەکەمی گشتییەو لەلای هەموو کەسێک هەیەو بەبزوێنەری رەوشتی مرۆڤ بۆ گەیشتن بە ترۆپکی ئەفراندن و بەرهەم هێنان لەیەکێک لەبوارەکانی ژیاندا دادەنرێت و ئەو سەرکەوتن و ئەفراندنە دەبێت بەدەرمانی سارێژکردنی ئەو دیاردەو لەرێگەی لەبریخستنەوە (التعويض) ئەو کەسە لەو هەست و خەم و خەفەت و ئازاری هەست کردن بە کەمیە رزگاری دەبێت و قەرەبووی بەو سەرکەوتنانە دەداتەوە، وەک چۆن (دیموستینی گریکی توانی لەئەنجامی نوقستانی زمانیەوە ببێت بەگەورەترین گووتەبێژو بیتهۆڤنیش توانی قەرەبووی کەرییەکەی بەبەرهەم هێنانی باشترین سەمفۆنیای جیهانی، بداتەوە ) (غنيم، ص٥٤٠).

وەک لەسەرەتاوە باسمان کرد، هەست کردن بە کەمی چەکێکی دوو لوولەیە واتە خێریشەو هەندێک جاریش شەرە، بەڵام ئەوەی شایانی باسکردن بێت ئەوەیە کە ژینگەی خێزانیو کۆمەڵایەتی زامن و بەرپرسیارە لەهەڵبژاردنی خێرو شەری ئەو دیاردە دەروونیە، واتا ئەگەر ژینگەی خێزانی و کۆمەڵایەتی مرۆڤ ئاسایی بێت و پر بێت لەرێزگرتن و ئاسایش و دڵنیایی و هاندان و پێداویستیەکانی ژیان و ئامرازەکانی سەرکەوتن لەخزمەتی مرۆڤدا بن، ئەوا ئەو کاتە هەست کردن بە کەمی لایەنە خێرەکە وەردەگرێت و دەبێت بەهەوێنی سەرکەوتنەکانی و لەیەکێک لە گۆرەپانەکانی ژیاندا خەوو خەیاڵ و ئاواتەکانی دەهێنێتە دی وەک چۆن ناوداران و شۆرە سوارانی وەک (بیتهۆڤن، دیموستین، هیلین کیلر، تەها حسین) و سەدەها مرۆڤی تریش توانیان هەریەکەو لەگۆرەپانی خۆیدا سەرکەوتن بەدەست بهێنن.

بەڵام ئەگەر ژینگەی خێزانی و کۆمەڵایەتی دژوارو پر لەکارەسات و ترس و خەم و خەفەتو دڵەراوکێ بێت و منداڵ نازدار یان بێزراو و پشت گوێ خراو پەروەردە کراو بەردەوام سزاو ئازاردراو سوکایەتی پێکراو لەنرخو بەهای کەم کرایەوە ئەوا ئەو کاتە

هەست کردن بەکەمیەکە دەبێت بەرەشماریک و لەگەردنی ئەو مرۆڤە دەئاڵێ و بەرەو (لاساری و سەرکێشی و قومارکردن، گۆشەگیری، مشروب خواردنەوە، خۆ کوشتن، ڕەشبینی، ژیان لەخەو و خەیاڵدا)ی دەبات و زۆر دیاردەی دزێوی وەک خۆ دەرخستن، لەخۆبایی بوون، لووت بەرزی، گرنگی دان بەڕواڵەت سەردەردەهێنێ و بەردەوام بوونی ئەو بارودۆخەش دەبێتە هۆی ئەوەی وردە وردە ئەو ترس و خەم و خەفەتی هەست کردن بە کەمیە بگوێزرێتەوە بۆ سەردابی نەستی و بەخەفەکراوی لەوێ بمێنێتەوەو گرێی کەمی لێ سەوز ببێت)(زیعور، ص٢٤٥).

دڵنیایی دەروونی

ڕاوەرگرتنی منداڵ

هەر منداڵەو جیهانی تایبەت بەخۆی هەیە

یاریکردن و گەشەی کۆمەڵایەتی

هۆگری

ناخۆشی نێوان دایک و باوک

سایکۆ دراما

چالاکییەهونەری و وەرزشیەکان

منداڵ و پشت بەستنی بەکەسانی تر

منداڵ و لە شیربڕینەوە

## دڵنیایی دەروونی

یەکەم پێداویستی دەروونی مرۆڤ ئەمن و ئاسایش و دڵنیاییەو زۆر گرنگە بۆ مرۆڤ و کۆڵەکەو بڕبڕەی پشتی دروستی دەروونی مرۆڤە، ئەو مرۆڤەی هەست بە ئاسایش و دڵنیایی دەروونی نەکات، بە هیچ شێوەیەك نابێت بە مرۆڤێکی داهێنەر، لەبەر ئەوە دابین کردنی ئاسایش و دڵنیایی دەروونی زۆر پێویستە بۆ تاکەکانی کۆمەڵ. مەبەست لە دڵنیایی و ئاسایشی دەروونی (الأمن النفسي) ئەوەیە کە تاك لەو ژینگەیەی کە تیادا دەژی هەست بە دڵنیایی و ئارامی دەروونی بکات و لەوە دڵنیا بێت کە کەس دەست درێژی ناکاتە سەر سەرو ماڵ و شەرەف و کەرامەتی و ژیانی پارێزراوەو ناکەوێتە بەر هەڕەشە و تۆقاندن و چاو لێ سوور کردنەوە.

ئاسایش و دڵنیایی دەروونی لە خێزانەوە دەست پێدەکات، دەبێت باوك و دایك کەسانی دڵ نەرم و بە بەزەیی بن و منداڵ لە باوەشیاندا هەست بە دڵنیایی و ئارامی بکات و نابێت توندوتیژی و لێدان لەگەڵ منداڵدا بەکاربهێنن و لەسەر هەڵس و کەوتەکانیان سزایان بدەن، چونکە لێدان و توندوتیژی بەردەوام باری دەروونی منداڵ ئاڵۆز دەکات و تووشی زۆر گیروگرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەکات. منداڵی زیرەك و بلیمەت زۆر دەجووڵێ و پرسیار دەکات و بەجۆرەها شێواز گوزارشت لە بیرو باوەڕو حەزو ئارەزووەکانی دەکات، ئینجا بۆ ئەوەی تواناو بەهرەکانی منداڵ زیندە بەچاڵ نەبێت ئەوا زۆر پێویستە کە دایك و باوك بە سینگێکی فراوانەوە پێشوازی لەو ڕاو بۆ چوون و حەزوو ئارەزووانەی منداڵەکانیان بکەن و سووکایەتیان پێ نەکەن و ناوو ناتۆرەی ناشیرینیان بۆ نەدۆزنەوەو هەڵەکانیان بۆ گەورە نەکەن، چونکە ئەو جۆرە مامەڵانەی سەرەوە باری دەروونی منداڵ ئاڵۆز دەکات و تووشی ترس و دڵەڕاوکێی بەردەوامی دەکات.

دڵنیایی دەروونی قوتابخانەش هیچی لە ماڵەوە کەمتر نییە، لەبەر ئەوە زۆر پێویستە کە بەڕێوەبەرو مامۆستایانی قوتابخانەش لەلای خۆیانەوە هەوڵی ئەوە بدەن کە

قوتابی لە قوتابخانە هەست بە ئارامی و دڵنیایی دەروونی بكات، مامۆستا باوكی دووهەمی قوتابییەو هیچی لەڕۆڵی باوك كەمتر نییە ئەگەر زیاتر نەبێت، لەبەر ئەوە دەبێت مامۆستا بەیەك چاو سەیری هەموو قوتابییەكان بكات و هەندێك شتی لاوەكی وەك (دەوڵەمەندی، جل و بەرگی جوان، ڕواڵەت و دیوی دەرەوەی قوتابی، بیرو باوەڕی سیاسی و ئایینی، چین و توێژی كۆمەلایەتی، ناوچەگەری ....تاد) كاری تێنەكات و وای لێنەكەن كە جیاوازی لەنێوان قوتابیەكاندا بكات.

هەروەها نابێت مامۆستا بە پرسیاری لاوەكی و سەیری قوتابیان بێزارو تووڕە بێت، چونكە كارێكی ئاساییە كە هەندێك جار قوتابی زیرەك و داهێنەر پرسیاری سەیرو سەمەرەو كوت و پڕ دەكات كە لەوانەیە مامۆستا چاوەڕوانی نەكات و وەلامی پێنەبێ، ئا لەم كاتانەدا دەبێت سنگی فراوان و دڵی گەورە بێت و لەنرخی ئەو جۆرە قوتابیانە كەم نەكاتەوەو پرسیارەكانیان بە هەڕەشەو سەرەڕۆیی دانەنێت، كەواتە دەبێت قوتابی لە قوتابخانە هەست بە ئارامی و دڵنیایی دەروونی بكات و لەمامۆستاو بەڕێوەبەرو هاوڕێ قوتابییەكانی دڵنیابێت و هەست بە هەڕەشەو ترس و دڵەڕاوكێ و خەم و خەفەت نەكات.

بەهەمان شێوەش دەبێت (فەرمانبەر لە فەرمانگەكەی، كرێكار لەكارگەكەی، سەرباز لەسەربازگەكەی، تاك لەناو كۆمەڵەكەی) هەست بە دڵنیایی بكات و كەسان و دام و دەزگا كۆمەلایەتییەكان بە دۆست و هاوپشتی خۆی بزانێت و ترسی ئەوەی نەبێت كە لەسەر بیروباوەرو راو بۆ چوونەكانی سزا دەدرێت و ئەو هەستەشی لەلا دروست نەبێت كە كەسێكی بێزراوو بێ نرخ و پشت گوێ خراوە، بە پێچەوانەوە بڕوای بەخۆی هەبێت و بە چاوی گومان و سووك سەیری خۆی نەكات، ئەگەر كۆمەڵ و دام و دەزگاكانی توانیان ئەو ژینگە پڕ لە ئارامی و دڵنیاییە بۆ تاكەكانیان دابین بكەن و پێداویستیەكانی گەشەكردنی ئاسایی و دروستی دەروونیان بۆ دەستەبەر بكەن و كەش و هەوای دیموكراسی و ڕادەربڕینی ئازادیان بۆ بخولقێنێ، ئەوە بێگومان ئەو كۆمەڵە كۆمەڵێكی بەختەوەر دەبێت و تاكەكانیشی كەسانی سوودبەخش و كامەران و داهێنەر دەبن و پاشەڕۆژێكی ڕووناك و بەختەوەر چاوەڕوانیان دەكات، ئینجا هەر كەسێك بەشداری لە سازدانی ئەو كەش و هەوایەدا بكات، ئەوا گرەوە بە نرخەكەی مێژوو دەباتەوە.

## ڕاوەرگرتنی منداڵ

بە پێی (بەندی) (١٢) لە ڕێككەوتنامەی مافەكانی منداڵ، (دەبێت دەوڵەت و دام و دەزگا كۆمەلایەتیەكان بارودۆخی گونجاو بۆ ڕاوەرگرتنی منداڵ لە هەموو ئەو شتانەی كە پەیوەندیدارە بە منداڵەوە، بڕەخسێنن). كەواتە یەكێك لە مافەكانی منداڵ ئەوەیە كە گوێی لێبگیرێ و بواری ڕادەربڕینی بدرێتێ، چونكە ئەو مافە دەبێت بە بنەما بۆ پتەوكردنی كەسایەتی منداڵ و خولقاندنی ژینگەی گونجاو بۆ گەشەكردنی ئاسایی. خێزان یەكێكە لەو دامەزراوە كۆمەلایەتیە گرنگانەی كە دەتوانێت بەو كارە هەڵبستێت و ڕای منداڵەكانی لەو شتانەی كە پەیوەندیدارن پێیانەوە وەربگرێ.

(بۆ نموونە) زۆر گرنگە كە كاتێك دایك و باوك جل و بەرگ و كەلوپەلی قوتابخانەو ناوماڵ بۆ منداڵ دەكڕن، ڕای منداڵەكەیان وەربگرن و بزانن چ جۆرە جل و بەرگ و جانتا و كەرەستەیەكی بە دڵە، چونكە ئەو ڕەنگ و جۆرانەی منداڵ حەزیان لێدەكات مەرج نییە ئێمەی گەورە حەزی لێ بكەین، لەبەر ئەوە نابێت دایك و باوك ڕاستەوخۆ بچن بە ئارەزووی خۆیان چییان بە دڵ بوو بیكڕن و بۆ منداڵی بهێننەوە، چونكە لەوانەیە بە دڵی نەبێت، ئیتر لەوكاتە یان دەبێت بە زۆر منداڵەكە ناچار بكرێت كە پێ ی ڕازی بێت یان دووبارە بیگەڕێننەوەو هی تر بكڕن، كە هەردوو ڕێگە چارەكە لەبەرژەوەندی منداڵ و خێزان نییە.

هەروەها ڕاوەرگرتنی منداڵ لە كاتی (گەڕان و سەردانی شوێنەكان و دیاریكردنی جۆری خواردن و خواردنەوەو یاریكردن و ئەو هاوڕێیانەی كە منداڵ یارییان لەگەڵ دەكات) زۆر پێویستەو لەبەرژەوەندی منداڵ و دروستی دەروونیەتی، لە لایەكی تریشەوە نابێت خێزان خشتەی تایبەتی (بە بێ ڕاوەرگرتنی منداڵ) بۆ كاتی نانخواردن و خەوتن و هەڵسان و یاریكردنی منداڵەكانی دابنێت چونكە ئەوە شێوازێكی دیكتاتۆریانەیەو پێشێلكردنی مافەكانی منداڵە، هەروەها ڕاوەرگرتنی منداڵ (لە جۆری ئەویارییانەی كە

حەزیان لێ دەکات یان ئەو شتانەی کە حەز بە خوێندنەوەیان یان ئەو بەرنامەو پرۆگرامانەی کە حەز بە بیستن و بینینیان دەکات ) زۆر پێویستە.

بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە منداڵ بە ئارەزووی خۆی چی دەوێ بیکات، بەڵکو مانای ئەوەیە کە ڕاو بۆ چوون و حەزوو ئارەزووی منداڵ لە هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بە ئەوەوە هەیە لەبەر چاو دەگیرێ بەڵام ئەگەر کاتێك داوای شتێکی کرد کە زیانبەخشە یان گونجاوو دروست نییە بۆی ئالەو کاتەدا لە ڕێگەی گفت و گۆو دیالۆگەوە منداڵەکە ڕازی دەکرێت و ڕاستییەکانی بۆ ڕوون دەکرێتەوە، هەروەها زۆر پێویستە کە لە قوتابخانە و هەموو دام و دەزگا کۆمەڵایەتییەکانی تر هەمان شێوازی پێشوو لەبەر چاو بگیرێ و ڕای منداڵ لە هەموو ئەو شتانە وەربگیرێ کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە ژیان و چارەنووسی منداڵەوە هەیە لەناو قوتابخانەو کۆمەڵ.

هەر بە پێی ئەو (بەندی) (١٢)ەیە دەبێت لە دادگاش ڕاو بۆ چوونی منداڵ لەوکێشانەی کە پەیوەندییان بە ئەوەوە هەیە وەربگیرێ، ئەگەر خۆشی ئەو توانایەی نەبوو ئەوا دەبێت کەسێکی تر لەجیاتی ئەو بەوکارە هەڵبستێت، بەتایبەتیش لەکاتی تەڵاق و لێك جیابوونەوەی ژن و مێردو پاشەڕۆژی منداڵ. لەڕاستیدا ڕاوەرگرتنی منداڵ لەو شتانەی کە پەیوەندییان بە ئەوەوە هەیە زۆر پێویستەو سوودو قازانجی زۆری هەیە لەوانە:-

١- هەر چ بڕیارێك منداڵ (بە پێ ی توانای خۆی) بەشداری تێدا بکات، ئەوە سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ و منداڵ جێبەجێی دەکات.

٢- لەڕێگەیەوە منداڵ فێری گیانی دیموکراسی و گفت و گۆو ڕاگۆڕینەوە دەکرێت و لە شێوازەکانی دیکتاتۆری و کەلەگایی و خۆسەپاندن و شەڕخوازی دوور دەخرێتەوە.

٣- منداڵ هەست بە بوونی خۆی دەکات و بڕوای بەخۆی دەبێت.

٤- منداڵ لە زۆر گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی دوور دەخرێتەوەو لە پاشەڕۆژدا ئەویش بە هەمان شێواز منداڵ و قوتابییەکانی خۆی پەروەردە دەکات.

٥- دەبێتە هۆی چاندنی تۆوی هاوکاری و تەبایی و بڕوابوون بە کەسانی چواردەورو دوورکەوتنەوە لە گۆشەگیری و دوورە پەرێزی.

ئینجا بۆئەوەی منداڵەکانمان کەسایەتییەکی سەرکەوتوویان هەبێت و ببن بە کەسانی داهێنەرو سوودبەخش، ئەوا زۆر پێویستە کە ڕاو بۆچوونەکانیان وەربگرین و لەومافەیان بێبەش نەکەین.

## هەر منداڵەو جیهانی تایبەتی خۆی هەیە

منداڵانی هەموو جیهان لە لایەنی جەستەیی و ئەندامییەوە وەك یەك وان و جیاوازی ئەوتۆ لەنێوانیاندا نییە، بەڵام لە هەموو جیهان دوو منداڵی وەك یەك نادۆزرێتەوە کە لە لایەنی ژیری و دەروونی و کۆمەڵایەتی وەك یەك وابن تەنانەت ئەگەر جمك و دووانەش بن.

ئینجا ئەگەر بمانەوێت لە مامەڵە کردنمان لەتەك منداڵەکانماندا سەرکەوتوو بین، ئەوا زۆر پێویستە کە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین:-

١- نابێت بەیەك چاو سەیری هەموو منداڵەکانمان بکەین، بەڵکو دەبێت ڕەچاوی جیاوازی تاکایەتی (الفروق الفردیة) بکەین. بۆ نموونە هەڵەیەکی گەورە دەکەین ئەگەر پێش بینی ئەوە لە منداڵەکانمان بکەین کە دەبێت هەموویان وەك یەك خوێندن تەواو بکەن یان نمرەکانیان وەك یەك بێت، لەبەر ئەوەی توانست و زیرەکی منداڵەکانمان هەموویان وەك یەك نین. لەوانەیە یەکێکیان لە خوێندنی ئەکادیمی و زانستیدا سەرکەوتوو بێت، بەڵام ئەویتریان لە خوێندنی پیشەیی یان هونەریدا سەرکەوتووەو سێهەمیشیان لەبواری کۆمەڵایەتی یان وێژەییدا سەرکەوتووە، کەواتە ئەرکی سەرەکی دایك و باوك و مامۆستایە کە ئەو بوارە بدۆزێتەوە کە منداڵەکانیان تیایدا سەرکەوتوو بن.

٢- جیاوازی زۆر لەنێوان هەستەوەرو توانستە جەستەییەکانی منداڵاندا هەیە، بۆ نموونە هەندێك منداڵ هەستەوەری بینینیان لە هەستەوەری بیستنیان بەهێزترە، بەڵام هەندێکی تر لەکاری دەستی و پەنجەکانیاندا چالاکن، لەبەر ئەوە زۆر پێوستە بە پێی توانای خۆی مامەڵەی لەگەڵ بکەین و داوای شتێکی لێنەکەین کە لە توانایدا نەبێت جێبەجێی بکات.

٣- لەلایەنی كۆمەلایەتیشەوە جیاوازییەكی زۆر لەنێوان منداڵاندا هەیە بۆ نموونە هەندێك لە منداڵان زۆر كۆمەلایەتی و كراوەن، لەبەرانبەر ئەوەش هەندێك لە منداڵان زۆر گۆشەگیرو دوورە پەرێزن، سەرەڕای ئەوەش زۆربەی منداڵان دەكەونە نێوان ئەو دوو جۆرە منداڵەوە. ئینجا ئەگەر بمانەوێت لە لایەنی كۆمەلایەتیەوە سەركەوتوو بین، ئەوا دەبێت بە جۆرێك مامەڵە لەگەڵ منداڵەكانمان بكەین كە لەگەڵ باری دەروونی و جۆری كەسایەتی بگونجێت.

٤- بێگومان منداڵان لە لایەنی هەڵچوونیشەوە جیاوازن و هەندێكیان زوو هەڵدەچن و بە ئاسانی تووڕەو دڵتەنگ و بێزار دەبن، بەڵام هەندێكی تریان زۆر درەنگ هەڵدەچن و بە ئاسانی تووڕەو دڵتەنگ نابن. لە ڕاستیدا هەڵچوونی منداڵان بنەمای فسیۆلۆژی و بۆماوەیی خۆی هەیەو دایك و باوك هەر لە منداڵیەوە هەست بەو ڕاستییە دەكەن، بۆ نموونە هەندێك لە منداڵان هەر لە منداڵیەوە زۆر دەگریەن و زوو تووڕە دەبن و زۆربەی جار لەبارێكی دەروونی ئاڵۆزدا دەژین، بەڵام هەندێكی تریان هەر لەكاتی لەدایك بوونەوە سست و بێ دەنگن و زۆر بە زەحمەت هەڵدەچن. لەبەر ئەوە زۆر گرنگە لە كاتی پەروەردەكردندا ڕەچاوی مەزاج و هەڵچوونەكانی منداڵ بكرێت، بۆئەوەی لە مامەڵەكردنماندا سەركەوتوو بین.

٥- هەروەها حەزوو ئارەزووی هەموو منداڵان وەك یەك نین، لەبەر ئەوە ئەگەر بمانەوێت یاری یان جل و بەرگ بۆ منداڵەكانمان بكڕین، ئەوا زۆر پێویستە كە ڕەچاوی حەزوو ئارەزووەكانیان بكەین، حەزیان لە چ ڕەنگ و شێوەو یارییەكە یان حەز بە سەردانی چ جێگاو شوێنێك دەكەن، ئەوا پێویستە بۆیان جێبەجێ بكەین، چونكە ڕەچاوكردنی حەزوو ئارەزوەكان فاكتەری سەرەكی دروستی دەروونی منداڵەكانمانن. بێگومان ئەو دایك و باوك و مامۆستایانەی ڕەچاوی جیاوازییەكانی نێوان منداڵەكان دەكەن و بە پێی تواناكانیان مامەڵەیان لەگەڵ دەكەن، ئەوا سەركەوتنی گەورە بەدەست دەهێنن و ئەوەیەكی بەختەوەرو دەروون دروست بەرهەم دەهێنن.

## *یاریکردن و گەشەکردنی کۆمەڵایەتی*

یەکێك لەو شێوازانەی کە منداڵ لەڕێگەیەوە شارەزای کۆمەڵەکەی دەبێت یاریکردن و گەمەی منداڵە، چونکە منداڵ لەڕێگەی یاریکردنەوە ئەم زانیاری و شارەزاییانەی لای خوارەوەی دەست دەکەوێت:-

١- نیزام و سیستمی ڕێك خستنی شتەکان/ بۆ نموونە کاتێك منداڵ یاری بە کەل و پەلی جۆراوجۆر دەکات و دوای ئەوە فێر دەکرێت کە پاش تەواو بوونی یارییەکە، کەل و پەلەکان بۆ جێگای تایبەتی خۆیان بگەڕێنێتەوەو وەك خۆی بە ڕێك و پێکی دایان بنێتەوەو بەردەوام بوونی ئەم جۆرە چالاکیەو چەندجار دووبارە بوونەوەیی و پاداشت کردن و هاندانی منداڵ لەسەری دەبێتە هۆی ئەوەی کە منداڵ لە داهاتوودا فێری نیزام و ڕێکخستنی کەل و پەل و کەرەستەکانی ژینگەکەی ببێت.

٢- فێربوونی دەستەواژەو ڕستەو ووشەی گونجاو/ دەتوانرێت لە ڕێگەی یاریکردنەوە منداڵ فێری زۆر ڕەوشت و ڕستەو وشەی جوان و کۆمەلایەتی بکرێت، بۆ نموونە کاتێك یارییەك لە یەکێك وەردەگرێت یان ئیشی پێ ی نامێنێ، دەتوانین منداڵ فێربکەین کە بە منداڵەکەی هاوڕێ ی بڵێ (سوپاس، فەرموو) یان کاتێك هەڵەیەك دەکات و بە ناهەق یاری لە منداڵێکی تر دەستێنێ یان لێ ی تێك دەدات، ئەوا دەتوانین فێری بکەین کە داوای لێ بووردنی لێ بکات و پێی بڵێ (بەداخەوە، بم بوورە، نەمزانی، خۆم بۆت چاك دەکەمەوە یان ڕێکی دەخەمەوە).

٣- شارەزابوونی داب و نەریت و بەهای کۆمەلایەتی/ منداڵ لە ڕێگەی یاریکردنەوە دەتوانێت زۆر لە بەهاو داب و نەریتە کۆمەڵایەتیەکان فێر ببێت، لەوانە( هاوکاری، سڵاوکردن، خودا حافیزی، بەخێرهاتن، ڕەچاوکردنی مەرجەکانی یاریکردن، بەزەیی

هاتنەوە بە کەسانی تردا، ڕێزگرتنی گەورە، چاوەڕوانکردنی نۆرە، ڕازی بوون بەسەر نەکەوتن و دووبارە هەوڵدان و کۆڵنەدان....هتد).

ئینجا بۆ ئەوەی منداڵەکانمان لە چالاکی یاریکردن بێبەش نەبن، ئەوا زۆر پێویستە کە لەناو خێزان و باخچەی ساوایان جێگاو کەرەستەی گونجاوی یاریکردنیان بۆ دابین بکەین و فێری نیزام و چۆنیەتی یاریکردنی ڕاستیان بکەین.

منداڵ لەتەمەنی پێش چوونە قوتابخانە، کەسێکە کەوا هەست دەکات ئەو چەق و ناوەندی ئەم جیهانەیەو هەموو کەسەکانی تر لەچوار دەوری ئەو دەخوولێنەوەو دەبێت حەزووئارەزووەکانی ئەو تێر بکەن، واتە ناکۆمەلایەتیەو بەردەوام خەریکی خۆیەتی و هەر بیر لە خۆی دەکاتەوە، ئینجا لەم قۆناغەدا یاریکردن یەکێکە لەو شێوازانەی کە دەتوانێت منداڵ لەو جیهانە تەسك و تەنیایەی دەربهێنێ و بە کۆمەڵەکەی ئاشنا بکات، لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە دایك و باوك و مامۆستای باخچەی ساوایان منداڵان لەسەر یاری کردن بە کۆمەڵ هانبدەن و بواری گفت و گۆو ڕادەربڕینیان بۆ بڕەخسێنن، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەو یاریکردنە بە کۆمەلانەوە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تۆوی گیانی هاوکاری و کۆمەك کردن و ڕێزگرتنی کەسانی تر لەناخی منداڵدا بچێنن.

کارێکی ئاساییە کە منداڵان لە کاتی یاریکردندا شەڕ دەکەن و ئازاری یەکتری دەدەن لەبەر ئەوەی زۆربەی منداڵانی قۆناغی پێش چوونە قوتابخانە خۆ پەرستن و حەز دەکەن تەنها یاریەکان و کەل و پەلەکان هەر بۆ خۆیان بێت، بەلام دەبێت دایك و باوك و مامۆستا ئەو شەڕ کردن و ناخۆشیانەی منداڵ بۆ گەشەکردنی کۆمەلایەتی و بەرژەوەندی منداڵەکان بقۆزنەوەو لەڕێگەیەوە منداڵەکان فێری ئەوە بکەن، کە هەموو منداڵێك مافی ئەوەی هەیە کە یاری بکات و نابێت یەك منداڵ بە تەنها هەموو یارییەکان زەوت بکات و پێویستە بە نۆرە یاری بە کەرەستەو کەل و پەلەکان بکرێت و هەر جارەی یەکێك بەکاری بهێنێ، هەروەها مامۆستا دەتوانێت باسی خراپی و زیانەکانی شەڕو ئازاردانی کەسانی تر

بۆ منداڵان ڕوون بكاتەوەو فێری ئەوەیان بكات كە لەجیاتی شەڕو ئازاردانی یەكتری دەتوانن بە قسەی خۆش و گفت و گۆو ڕاگۆڕینەوە چارەسەری گرفتەكان بكەن و ئەگەر ئەوان نەیانتوانی چارەسەری گرفتەكانی خۆیان بكەن، ئەوا پێویستە داوای یارمەتی لە مامۆستاو دایك و باوك و كەسانی گەورەی چوار دەور بكرێت.

هەرچەندە لەم قۆناغەدا كەمێك زەحمەتە منداڵ فێری گفت و گۆو ڕاگۆڕینەوە بكرێت بەڵام دەتوانرێت بنەماكانی ئەو شێوازە لەناخی منداڵدا بچێندرێ و بۆ قۆناغی سەرەتایی ئامادەبكرێ و هەوڵی پێویستی لەگەڵ بدرێ، كە ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی كە لە كاتی چارەسەركردنی گرفتەكانی منداڵ فێری شێوازی دیموكراسی و ئاشتی خوازانە بكرێت.

## پەیوەندی نێوان منداڵ و دایك و باوك (هۆگری)

كارێكی ئاساییە كە منداڵ هۆگری ئەو كەسانە ببێت كە لە سەرەتای ژیانەوە و گرنگی پێدەدەن و پێداویستیە گرنگەكانی ژیانی بۆ دابین دەكەن، ئاشكراشە یەكەم كەس كە منداڵ پەیوەندی لەگەڵی دادەنێت دایكە، لەبەرئەوە دەبینین زۆربەی زۆری منداڵان هەر لەسەرەتای ژیانەوە هۆگری دایكیان دەبن و نایانەوێت یەك بست لێیان دوور بكەونەوە، ئەگەر بێت و دایكیان بەجێیان بهێڵن ئەوا دەست بەگریان و هاوار دەكەن و تا دایكیان نەگەڕێتەوەو لەباوەشیان نەكەن ئەوا زەحمەتە ژێر ببنەوە. ئەم پەیوەندییە بەهێزەی نێوان دایك و باوك و منداڵ پێی دەگوترێت هۆگری (تعلق). منداڵ كۆمەڵێك پێداویستی گرنگی هەیە لەوانە (شیر خواردن، یاریكردن، خاوێن كردنەوە، لەباوەش گرتن، لاواندنەوە ... هتد).

ئینجا ئەو كەسەی ئەم پێداویستیانە بۆ منداڵ دابین بكات ئەوا دەبێتە سەرچاوەی خۆشی و گرنگی منداڵ و هەردەم منداڵ لەنزیكیەوە هەست بە ئارامی و دڵنیایی دەكات و بە ئاسانیش دەیناسێتەوە. دەرئەنجامی توێژینەوە زانستیەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە منداڵ لە تەمەنی چوار یان پێنج مانگیەوە دەتوانێت جیاوازی لە نێوان ئەو كەسانەی كە خزمەت و چاودێری دەكەن و ئەوانەی كە خزمەتی ناكەن و بێگانە و نامۆن، بكات و بەهیچ شێوەیەك ڕێگا بە كەسە نامۆو نەناسراوەكان نادات كە لەباوەشی بگرن و بیلاوێننەوە بەڵام بە پێچەوانەوە بەباوەشی گەرم و لاواندنەوەی كەسانی ئاسیاو و نزیكی كامەران و دڵشاد دەبێت و بە دەنگ و ڕەنگ و بینینی ئەوان ژێر دەبێتەوەو ترس و خەم و خەفەتەكانی دەڕەوێنێتەوە.

شایانی ئاماژە پێكردنە هۆگری و پەیوەندی پتەوی منداڵ لەگەڵ دایك و باوك و كەسانی زۆر نزیكی، سێ خاسیەتی سەرەكی هەیە كە ئەمانەن:-

١- منداڵ لەکاتی یاریکردن و بێزاری و ترس و دڵەڕاوکێ و برسێتی و ئازار بەزۆری بۆ لای ئەوانە دەچێت کە هۆگریانەو پەیوەندی لەگەڵیان بەهێزە.

٢- بەزۆری منداڵ لەسەر دەستی ئەو کەسانە ژێر دەبێتەوەو ئازارەکانی کەمتر دەبێتەوەو هەست بە ئارامی دەکات کە هۆگریانە و ئاشنایەتی لەگەڵیان بەهێزە.

٣- منداڵ بەهیچ شێوەیەك لەناو ئەو کەسانەی کە هۆگریانە هەست بەترس و دڵەڕاوکێ و ناڕەحەتی ناکات، بە پێچەوانەوە لەناویاندا هەست بە ئارامی و دڵنیایی دەکات.

بێگومان هۆگری و پەیوەندی پتەوی نێوان منداڵ و دایك و باوك هەر لەخۆیەوە دروست نابێت و پێویستی بەکەش و هەواو ژینگەی تایبەتی هەیەو پرۆسەی خۆی هەیە، وەك دەردەکەوێت دوو پرۆسەی گرنگ لە دروست کردن و سەرهەڵدانی هۆگری بەرپرسیارن کە ئەوانیش بریتین لە:-

١- کارلێککردن و پەیوەندی بەردەوامی نێوان منداڵ و ئەو کەسانەی کە خزمەت و چاودێری دەکەن.

٢- دۆزینەوەی بوونی پەیوەندی لە نێوان تێرکردنی حەزو ئارەزوو پێداویستیەکانی منداڵ و بوونی کەسانی تر، واتە منداڵ ئەو هەست و بیروباوەڕەی لە لا دروست دەبێت کە بوون و ئامادەباشی ئەو کەسانە بەرپرسیارن لە تێرکردنی حەزوو پێداویستییەکانی لە لایەك و رزگار بوونی لە ئازارو ترس و ناخۆشیەکان لە لایەکی تر.

کەواتە کاتێك دایك و باوك پەیوەندییان لەگەڵ منداڵەکانیان خۆش دەبێت و بەردەوام بە پێی پێویست حەزوو پێداویستیەکانیان بۆ تێر دەکەن و لە ئازارو ناخۆشیەکان دەیان پارێزن، ئەوا دوای ماوەیەك منداڵەکانیان هۆگریان دەبن و پەیوەندییەکی پتەو لە نێوانیان دروست دەبێت و منداڵ لەسەر دەستیان و لەباوەشی گەرمیان هەست بەخۆشی و کامەرانی دەکەن و بەدوورکەوتنەوەو ونبوونیان تووشی ناڕەحەتی و دڵەڕاوکێ دەبن. لەبەرئەوە زۆر گرنگە دایك و باوك و کەسانی نزیکی منداڵ ئاگاداری ئەو پەیوەندییە بن و

هەوڵی پتەوکردنی بدەن، لەبەرئەوەی زۆر گرنگە بۆ کەسایەتی منداڵ و باری دەروونی، چونکە پەیوەندی نێوان منداڵ و دایک و باوک دەبێتە بنەماو بناغەی دروست بوونی پەیوەندی و خۆشەویستی لەگەڵ کەسانی تر، واتە کاتێک منداڵ لەسەر دەستی کەسانی نزیکی هەست بەخۆشی و کامەرانی دەکات و لەناویاندا هەست بە ئارامی و دڵنیایی دەکات، ئەو کاتە هەست و سۆزو خۆشەویستی لەبەرانبەر کەسانی تریش لەلا دروست دەبێت و لەناویاندا هەست بەئارامی و دڵنیایی دەکات و کەسێکی کۆمەڵایەتی دەردەچێت و دەگاتە ئەو بڕوایەی کە کەسانی تر کۆپی دووهەمی دایک و باوک و کەسانی نزیکی ئەون.

بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر دایک و باوک و کەسانی نزیکی ئەیان توانی پەیوەندی پتەو لەگەڵ منداڵەکانیان دروست بکەن و منداڵەکانیان هۆگریان نەبوون و لەسەر دەستیان تووشی لێدان و سووکایەتی و ئازارو ناخۆشی بوون، ئەو کاتە منداڵەکان بەهەموو شێوەیەک بە بینینی دایک و باوک و کەسانی نزیکیان بێزار دەبن و لەناویاندا هەست بە خۆشی و دڵنیایی ناکەن، کە بێگومان ئەمەش ڕەنگدانەوەی خراپی لەسەر باری دەروونی ئەو منداڵانە دەبێت و دوور نییە لە داهاتوودا بەچاوی گومان و دوودڵی سەیری کەسانی چواردەورو تاکەکانی تری کۆمەڵ بکەن و وابزانن کە کۆپی دووهەمی دایک و باوک و کەسانی نزیکیانن، بەئەوەش تووشی گۆشەگیری و دوورە پەرێزی و گومان و دوودڵی بن و دەرئەنجامیش ڕووبەڕووی کۆمەڵێک کێشەو گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی ببنەوە. (Wadeley,1996, P:82-83).

## ناخۆشی نێوان دایك و باوك و کاریگەری لەسەر منداڵ

دایك و باوك دووکەسی زۆر گرنگ و پیرۆزن لەژیانی منداڵداو کاریگەری زۆریان لەسەر کەسایەتی و چارەنووسی منداڵەکانیان هەیە، ئینجا ئەگەر بێت و ژیانی خێزانیان لەسەر بنەمایەکی پتەو بونیاد نەنابێت و زۆربەی کات پەیوەندی نێوانیان ناخۆش بێت و ژینگەی خێزانی پڕ بێت لە گیروگرفت و ئاژاوە، ئەوا ئەو کاتە زەرەرو زیانێکی گەورە لە منداڵەکانیان دەکەوێت، دەرئەنجامی توێژینەوە زانستییەکانی ئەو بوارەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە زۆربەی منداڵ و مێرد منداڵە لاسارو سەرەڕۆیەکان لەو خێزانانەدا پەروەردە بوون کە بەردەوام شەڕو ئاژاوەو ناخۆشی تیایدا بووە، یان تووشی لێك ترازان و جیابوونەوەی ژن و مێردبوون.

کارێکی ئاساییە ناخۆشی لەنێوان ژن و مێرددا دروست ببێت و هەندێك جاریش دڵی یەکتری زووير بکەن، بەلاَم ئەوەی ئاسایی نییە ئەوەیە کە ئەو ناخۆشی و دڵ زووير کردنە ببێتە هۆی ڕەنجاندنی دڵی منداڵەکانیان و ڕەنگدانەوەی خراپی لەسەر دڵ و دەروونیان هەبێت، ئینجا بۆئەوەی ناخۆشی و ململانێی نێوان دایك و باوك کاریگەری ترسناکی لەسەر کەسایەتی و چارەنووسی منداڵەکانیان نەبێت، ئەوا زۆر پێویستە کە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەن:-

١- پێویستە دایك و باوك کێشەکانی نێوانیان بەگفت و گۆو ڕاگۆڕینەوە چارەسەر بکەن و هەریەك ڕازی دڵی خۆی بۆ ئەوی تر بکاتەوەو چارەسەرێکی گونجاو کە دڵی هەردوولا ڕازی بکات بۆ گرفتەکان بدۆزرێتەوە، بەلاَم ئەگەر دایك و باوك نەیانتوانی بەهێنانە چارەسەری ناکۆکیەکانیان بکەن، ئەوا زۆر پێویستە کە نەهێڵن منداڵەکانیان گوێبیستی دەنگە دەنگ و ناخۆشیەکانیان ببن، با هیچ نەبێت لەژوورێکی تر بێت یان لەکاتێکدا بێت کە منداڵەکان خەوتوون یان منداڵەکان لەدەرەوەی ماڵن، چونکە ناخۆشی و دەنگە دەنگی دایك و باوك لەبەردەم منداڵەکان دەبێتە هۆی دڵتەنگی و دڵەڕاوکێ و دروست کردنی ترس

و خەم و خەفەت بۆ منداڵەکان، کە دوورنییە ببێتە هۆی خوڵقاندنی چەندەها خەوو خەیاڵی ناخۆش لەلای منداڵەکان.

٢- نابێت دایک و باوک منداڵەکانیان بکەن بەلایەنێک و ئەوانیش تووشی ناخۆشی بکەن، چونکە هەندێک جار بەزۆر پاڵ بەمنداڵەوە دەنێن کە لایەنی دایک یان باوک بگرێت و بەمەش زیانێکی گەورە بەو جۆرە منداڵانە دەگات، لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە منداڵ بەبێ لایەنی بمێنێتەوەو پەلکێشی گۆڕەپانی شەڕی نێوان دایک و باوک نەکرێت.

٣- نابێت منداڵ تێبگەیەندرێت و وای لێبکرێت کە هەست بکات ئەو بەرپرسیارە لەدروست کردنی ئەو شەڕو ئاژاوەیەی نێوان دایک و باوک، تەنانەت ئەگەر ناخۆشییەکەش لەسەر ئەو منداڵانە بێت، چونکە ئەو هەست کردنە تووشی گوناهو ئازاردانی ویژدانی دەکات و لەمیانەیەوە هەست بە پەشیمانی و گوناهو تاوانباری دەکات و دواجاریش زیانی گەورە بەدروستی دەروونی دەگەیەنێت و دووریش نییە تووشی کۆمەڵێک گرفتی دەروونی و کۆمەلایەتی ببێت.

٤- زۆر پێویستە دایک و باوک کۆنتڕۆڵی خۆیان بکەن و منداڵان نەکەن بەقوچی قوربانی و چی داخی دڵی خۆیان هەیە بە منداڵەکانیان هەڵنەڕێژن، واتە نابێت بهێڵن وئەو ناخۆشییەی نێوانیان کار بکاتە سەر پەیوەندی ئاسایی نێوانیان و منداڵەکانیان.

٥- دەبێت ناخۆشی و ململانێی نێوان دایک و باوک دوای ماوەیەکی دیاری کراو کۆتایی پێ بهێندرێت، چونکە بەردەوام بوونی ناخۆشیەکان ژیانی خێزانی منداڵەکانیان دەکات بەدۆزەخ و ڕەنگدانەوەی خراپی لەسەر خوێندن و هەڵس و کەوتی ڕۆژانەی منداڵەکانیان دەبێت و دوور نییە ببن بە نێچیری بەردەستی خەوو خەیاڵی ناخۆش و تۆقێنەر.

٦- زۆر پێویستە منداڵ تێبگەیەندرێ کە هەندێک جار ناخۆشی و دەنگە دەنگی نێوان دایک و باوک کارێکی ئاساییەو هیچ خێزانێک بێ گیروگرفت نییە. بەڵام گرنگ ئەوەیە لەکاتی خۆیدا بەهاوکاری هەموو لایەک گیروگرفتەکان چارەسەر بکرێن. لەبەرئەوە هیچ مەترسیەکی لەسەر بەردەوام بوونی خێزان و چارەنووسی نییە. چونکە ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە منداڵ لە مۆتەکەی تەڵاقدان و لێک جیابوونەوەو بێ بەشبوون لەدایک و باوک رزگاری ببێت.

ئەوە ماوە بڵێین هیچ گیروگرفتێکی خێزانی ئەوەندە گرنگ نییە کە چارەسەر نەکرێن، بەڵام تەنها پێویستی بەبیرکردنەوەی لەسەرخۆو لەخۆبوردن و گفت و گۆیەکی دۆستانە هەیەو پاش ماوەیەکیش وەک هەوری هاوین دەڕەوێتەوە.

## سایکۆدراماو چارەسەرکردنی گرفتەکانی منداڵ

یەکەم کەس کەزاراوەی سایکۆدرامای بەکارهێنا، زانایەك بوو کە ناوی (مۆرینۆ)(Moreno) بوو، نیتر دوای ئەویش زۆر لە زانایانی تر دەستیان کرد بە بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە. زاراوەی سایکۆدراما، لەهەر دوو ووشەی (psycho) (سایکۆ) و (drama) (دراما) پێك دێت و مانای نواندن و نمایشی دەروونی یان یاریکردنی ڕۆل (Role playing) دەگەیەنێت، لەڕاستیدا ئەم ئامرازو شێوازە دەروونیە زۆر گرنگ و بەسوودە بۆ دەست نیشانکردن و چارەسەری زۆر گرفت و گرێی دەروونی و کۆمەڵایەتی، ناوەڕۆك و گەوهەری ئەم شێوازە بریتیە لەوەی کە داوا (لەو کەسەی کە خاوەن گرفتە) دەکرێت کە ڕۆلی کەسیکی تر یان کەسایەتیەکی تر بگێڕێ و خۆی بخاتە شوێنی ئەو کەسەو وەك ئەو هەڵس و کەوت و بیربکاتەوە کە زۆر جار جیاوازە لە ڕۆڵی ڕاستەقینەی خۆی و دەبێت خۆی و ڕۆڵی خۆی پشت گوێ بخات، لە ئاکامیشدا زۆر لە هەڵس و کەوت و بیرکردنەوەی ئەو کەسە دەگۆڕێ و لەو گرفت و ئەندێشە دەروونی یان کۆمەڵایەتیە ڕزگاری دەبێت و جارێکی تر ناگەڕێتەوە سەر هەڵس و کەوت و جۆری بیرکردنەوەی یەکەم جاری.

بە بڕوای زۆر لە زانایان ئەم شێوازی یاریکردنی ڕۆل و سایکۆدرامایە زۆر باشترو سەرکەوتووترە لە شێوازی زانیاری پێدان و ئامۆژگاری کردن و ڕێنمایی کەسانی خاوەن گرفت. بۆ نموونە هەردوو زانایان (جینس و مان) ( Man&Janis ) لەساڵی (١٩٦٥) توێژینەوەیەکیان لەسەر کاریگەری یاریکردنی ڕۆل و نمایشی دەروونی بە ئەنجام گەیاندووە لە ئاکامدا بۆیان دەرکەوت کە ئەم شێوازی سایکۆدراما و نمایشی ڕۆڵە زۆر سەرکەوتووترە لە گفت و گۆو پێدانی زانیاری. بۆ ئەم مەبەستەش (٢٦) کچی جگەرە کێشیان هەڵبژاردو لەگەڵیان ڕێکەوتن کە ئەوان ڕۆڵی (نمایشی) ئەو کەسانە بگێڕن کە لە ئەنجامی جگەرەکێشانەوە تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بوون، بەم شێوەیە چارەسەرکاری دەروونیەکە خۆی کرد بە پزیشکی چارەسەر کارو کچە جگەرەکێشەکانیش نمایشی

كەسایەتی و ڕۆڵی نەخۆشەكانیان یاری دەكرد. بینراوەكانی ئەو نواندنانەش لە پێنج بەش پێك هاتبوو بەم شێوەیەی لای خوارەوە:-

بینراوی یەكەم: نەخۆش لەژووری چاوەڕوانی پزیشك، لەگەڵ خۆیدا قسە دەكات و بیر لە ناكامی ئەو پشكنینە (فحص)دەكاتەوە كە پاش كەمێكی تر پزیشكی تایبەتی بۆی دەكات.

بینراوی دووهەم: لە لای پزیشكی چارەسەركارو پزیشك لەتەك نەخۆشدا گفت و گۆ دەكات و پێی ڕادەگەیەنێ كە باری تەندروستی زۆر خراپەو تووشی شێرپەنجەی سییەكان بووەو دەبێت بە زووترین كات نەشتەرگەری بۆ بكرێت.

بینراوی سێهەم: نەخۆش زۆر دڵتەنگ و بێزارەو بیر لە سەركەوتن یان سەرنەكەوتنی نەشتەرگەریەكە دەكاتەوەو خەفەت لەخۆی دەخوات كە چۆن لە ئەنجامی جگەرەكێشانەوە ئاوا تووشی ئەم نەخۆشیە ترسناكە بووەو زەحمەتە چارەسەری هەبێت.

بینراوی چوارەم: نەخۆش دەربارەی نەشتەرگەریەكەو ڕێژەی سەركەوتنی و كاتی بە ئاكام گەیاندنەكەی قسە لەگەڵ پزیشك دەكات.

بینراوی پێنجەم: لە گفت و گۆیەكی تێروتەسەل پێك هاتووە كە نەخۆش لەگەڵ پزیشكەكەی باسی پەیوەندی نێوان جگەرەكێشان و تووش بوون بە نەخۆشی شێرپەنجەی سییەكان دەكەن.

لە دوای تەواوبوونی ئەم نمایش و یاریكردنی ڕۆڵە دەركەوت كە گۆڕانكارییەكی زۆر لە هەڵس و كەوت و بیركردنەوەی ئەو كیژە جگەرەكێشانەدا ڕوویداوەو، ژمارەی ئەو جگەرانەی كە دەیان كێشا زۆر كەم بووەو هەندێكیان بڕیاری وازهێنانیان دا. لە لایەكی تریشەوە دەركەوت كە ئەم شێوازی سایكۆدرامایە زۆر زۆر سەركەوتووترەو كاریگەری زیاترە لە گفت و گۆی ڕووت و بەڵگەدارو ڕاگۆڕینەوەو قسە كردن (ابوالحب، ١٩٧٨، ص١٤).

مرۆڤ لە ڕێگەی سایكۆدراماوە قازانجی تریشی دەست دەكەوێت، یەكێك لەو قازانجانە ئەوەیە كە لە ڕێگەی پرۆسەی پاككردنەوەو خاڵی كردنەوەی دەروونیەوە

(التطهير النفسي) دەتوانرێت گوزارشت لە هەست و سۆزو بیرباوەڕو بۆچوون و حەزوونارەزووەکان بکرێت، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو کەسە لە زۆر گرێ و هەڵچوونی خراپ و نیگەتیڤانە ڕزگاری بێت و فڕێیان بداتە جیهانی دەرەوە. لەڕێگەی سایکۆدراماو نواندنەوە دەتوانرێت خزمەتێکی گەورە بە منداڵانیش بگەیەندرێ.

دایك و باوك و مامۆستا دەتوانن ژینگەو بارودۆخی گونجاو لەماڵەوەو باخچەی ساوایان و قوتابخانە بۆ نمایش و نواندنی منداڵەکانیان دابین بکەن، تا لەڕێگەیانەوە منداڵ گوزارشت لە حەزوو ئارەزوو هەڵچوونە کپ کراوو پەنگ خواردووەکانی بکات و فێری ڕۆلی زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵ ببێت، دەتوانین گرنگی دراماو نواندن بۆ منداڵ لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:-

١- نواندن وەك یاریکردن دەبێتە هۆی بەهێزکردنی ماسوولکەکان و ئەندامەکانی تری لەشی منداڵ، لەبەرئەوەی نواندن و نمایشی ڕۆڵەکان پڕن لە جووڵەو هەڵس و کەوت گۆڕانکاری کە ئەمەش دەبێتە هۆی ڕاهێنان و بەهێزکردن وگەشە پێکردنی ماسوولکەکان و ئەندامەکانی تری جەستەی منداڵ.

٢- دەتوانرێت لە ڕێگەی نواندن و نمایش کردنەوە، هانی ئەو منداڵانە بدرێت کە شەرمن و گۆشەگیرو دوورەپەرێزن، بۆ تێکەڵاو بوونی کەسانی ترو هاوکاری کردنیان، لەبەر ئەوە سایکۆ دراما و نواندن پێویستی بە چالاکی و کاری هەموو منداڵان هەیەو بە کۆمەڵ دەکرێت، کە ئەمەش دەبێتە هۆی بەشداری کردنی ئەو جۆرە منداڵانەو ڕزگارکردنیان لە شەرم و گۆشەگیری و دوورەپەرێزی.

٣- منداڵ لەڕێگەی نواندن و نمایش کردنەوە فێری ڕۆڵ و پیشەو هەڵس و کەوتی زۆر لە تاکەکانی کۆمەڵ و چەندەها داب و نەریت و بەهای کۆمەڵایەتی دەبێت، کە ئەمەش دەبێتە هۆی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و ئاکاری منداڵان.

٤- تێكستی باش و سەركەوتوو منداڵ فێری زۆر سیفات و بەهای ئەخلاقی (ئاكاری) بە كەڵك دەكات، چونكە لەمیانەی نواندنەوە بە زۆر كەسایەتی ئاشتی خوازو رەوشت بەرزو خێر خواز ئاشنا دەبێت و شارەزایشی دەربارەی كەسایەتیە شەرخوازو بەدرەوشتەكان دەست دەكەوێت و دەتوانرێت فێری ئەوە بكرێت كە چۆن لەو شەڕخوازانە دووربكەوێتەوەو لاسایی ئاشتی خوازو ڕەوشت جوانەكان بكاتەوە.

٥- هەروەها لە ڕێگەی نواندن و نمایش كردنەوە منداڵ دەتوانێت ئەو حەزوو ئارەزووانەی كە دژ بە كۆمەڵ و داب و نەریتن تێریان بكات، لەوانە حەزوو ئارەزووی شەڕخوازی و گیانی پاوان كردن و كۆنترۆڵ كردنی كەسانی ترو خۆپەرستی و نێرگزی، لەبەر ئەوەی كەسایەتی و ڕووداوەكانی نواندن جۆراوجۆرو هەمەچەشنەن و بواری تێركردنی ئەو حەزوو ئارەزووە ناكۆمەڵایەتیانە دەدەن. هەروەها دەتوانرێت لەڕێگەی نواندنەوە منداڵ فێری خاوبوونەوەی ماسوولكەكان و (استرخاء) بكرێت، كە ئەمە یەكێكە لە پێداویستیەكانی دروستی دەروونی و دووركەوتنەوە لە گرژی و گرفتی دەروونی. بۆ نموونە دەتوانرێت داوا لە منداڵ بكرێت كە لاسایی ئەو كەسە بكاتەوە كە نوستووە یان لە شوێنێكی خۆش بە كامەرانی ڕاكشاوەو سەیری دیمەنی چیاو دارودرەختی سەیرانگایەك دەكات و گوێی بۆ دەنگی كەوو باڵندەی ئەو ناوە شل كردووە. یان دەتوانرێت داوا لە منداڵ بكرێت كە نمایشی كەل و پەل و جل و بەرگ بكات كە بە تەنافدا هەڵواسراون و بۆخوارەوە شۆڕبوونەتەوە. ئەمانەو چەندەها یاری و نواندنی تر منداڵ لەسەرخاوبوونەوەی ماسوولكەكان ڕادەهێنێ.

سایكۆدراما بۆ گۆڕینی ڕاوبۆچوون و ئاراستە (الاتجاه) زۆر بەكەڵكەو سەركەوتنی زۆری بەدەست هێناوە، بۆ نموونە كاتێك چەند قوتابییەك بۆچوونی نێگەتیڤانەیان دەربارەی مامۆستا یان چین و توێژێك هەیە، دەتوانرێت لەڕێگەی سایكۆدراماوە داوای ئەوەیان لێبكرێت كە بۆماوەیەك ڕۆڵی مامۆستا یان یەكێك لە تاكەكانی ئەو چین و توێژە یاری بكەن و لاسایی كەسایەتی و هەڵس و كەوتی ئەوان بكەن و خۆیان بخەنە جێگەی ئەوان، كە بێگومان ئەم جۆرە یاری كردنی ڕۆڵە دەبێتە هۆی گۆڕانكاری لە هەڵس و كەوت و بۆچوونی ئەو قوتابیانە دەربارەی ڕۆڵ و كەسایەتی مامۆستا یان ئەو چین و توێژو

چینانەی کە ئەو قوتابیانە دژیانن. کەواتە دەتوانریت سوود لەم شێوازە گرنگە (سایکۆدراما) وەربگیریت و بۆخزمەت کردنی تاکەکانی کۆمەڵ بەکاربهێنریت، هیوادارین دایک و باوک و مامۆستایانی ئیمەش سوود لەم شێوازە تازە بۆ گەشەکردنی منداڵەکانمان یان دەست نیشانکردن و چارەسەرکردنی گرفتە دەروونی و کۆمەلایەتیەکانیان وەربگرن.

## چالاکییە هونەری و وەرزشیەکان و هەڵچوونەکانی منداڵ

منداڵ لەقۆناغی پیش چوونە قوتابخانەی رووبەری زۆر کێشەو ترس و ناخۆشی دەبیتەوەو زۆرجار تووشی ترس و دڵتەنگی و بێزاری و خەمۆکیی دەکات. لەئەنجامدا پەنا بۆ زۆر شێواز دەبەن بۆ دەربڕینی ئەو بارە دەروونییە ئاڵۆزەیان. هەندێکیان پەنا بۆ دوورە پەرێزی و گۆشەگیری دەبەن، هەندیکی تریان پەنا بۆ دەست درێژی و شەڕخوازی دەبەن. کە بەداخەوە هەردوو شێوازەکە ناپەروەردەیی و نادروستەو زیان بە باری دەروونی منداڵ و پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکانی دەگەیەنن. ئینجا بۆئەوەی منداڵەکانیان پەنا بۆ ئەو شێوازە هەڵانە نەبەن، پێویستە ژینگەی لەبارو گونجاو لەناو خێزان و باخچەی ساوایان بۆ گەشەکردنی ئاساییان و بەئاکام گەیاندنی ژمارەیەك چالاکی هونەری و وەرزشی برەخسێنن، چونکە زۆرجار منداڵ لەمیانەی چالاکییە هونەری و وەرزشیەکانەوە گوزارشت لە هەڵچوونە جیاجیاکانی دەکات.

ئینجا بۆئەوەی منداڵەکانمان سوود لەو چالاکیانە وەربگرن، زۆر گرنگە بواری وێنەکردن و نیگارکێشان و وەرزش و چالاکییە جەستەییەکانی تر بۆ منداڵ برەخسێندریت. منداڵ پیش چوونە قوتابخانەی ئەگەر وێنەو نیگاریش نەزانیت، ئەوا دەتوانیت لەمیانەی کێشانی هێڵی ڕاست و چەماوەو خوارو شەقڵی و پەقڵی و رەش کردنەوەی کاغەزەکان گوزارشت لەناخی خۆی بکات و هەندێك لەخەم و خەفەت و ترس و دڵەڕاوکێکانی بەبا بدات لەبەرئەوە زۆر گرنگە کاغەزو تەختە ڕەش و کارتۆن و قەڵەم و ماجیك و کەل و پەلی تر بخریتە بەردەم منداڵ و رێگای ئەو جۆرە چالاکیانەی لێنەگیریت و گاڵتە بە وێنەو

نیگارو هێڵ و کاغەز ڕەش کردنەوەکانی نەکرێت و بەکارێکی بێسوود لە قەڵەم نەدرێت. ڕاستە لەوانەیە ئەو هێڵ و کاغەز ڕەش کردنەوانە هیچ خاسیەتێکی وێنەو نیگار کێشانیان تێدانەبێت، بەلام بەلای منداڵەوە کارێکی زۆر خۆش و دەگمەن و داهێنەرانەیەو تام و چێژێکی زۆر لە ڕەنگ کردن و ئەو هێڵکاریانە وەردەگرێت.

لەلایەکی ترەوە یاریکردن و هەڵبەزو دابەزو یاری مستەکۆڵەو پاڵەوانبازی و پێش برکێ منداڵ لەزۆر وزەو چالاکی ناوەکی و عەمبارکراوو خەفەکراو ڕزگار دەکات. بۆ نموونە کاتێك دایك و باوك یان مامۆستا یان منداڵانی تر سووکایەتی بە منداڵ دەکەن و ئازاری دەدەن و ناتوانێت تۆڵەی خۆی بکاتەوە، ئەو کاتە لەوانەیە منداڵ پەنا بۆ یارییەك یان پانکردنەوەی بووکە شووشەیەك یان چالاکیەکی توندو تیژ بەرێت و لەڕێگەیەوە لەو خەم و خەفەتە پەنگ خواردووەی ناو دڵ و دەروونی ڕزگاری بێت، هەروەها زۆرجار دەتوانرێت لەڕێگەی هەڵپەڕکێ و گۆرانی و سروودو چیرۆك و هۆنراوە نووسینەوە مرۆڤ لە هەندێك لەهەڵچوونەکانی ڕزگاری ببێت. کەواتە زۆر گرنگە بەپێی توانا بواری هەندێك لەو چالاکیانە لە ناو خێزان و کۆمەڵ و باخچەی ساوایان بۆ منداڵ برەخسێندرێ، هەروەها دەکرێت لەڕێگەی چالاکیەکانی وەك شت برینەوە بە مشار یان بەکارهێنانی چەکووش بۆ داکوتان و پانکردنەوە، یان دروست کردن و پارچە پارچە کردنی یاری و کەل و پەلە پلاستیکیەکانی ناو ماڵ، منداڵ لە هەندێك لەهەڵچوونەکانی ڕزگار بکرێت.

باخچەی ساوایان و خێزان دەتوانن قوڕی دەست کردو قوم و ئاو بۆ منداڵ دابین بکەن، چونکە شت دروست کردن بەهەندێك لەو شتانە و یاریکردن پێیان دەبنە هۆی بەکارهێنانی ماسوولکەکان و خاڵی کردنەوەی هەندێك لە هەڵچوونەکان، بۆ نموونە زۆرجار منداڵ توڕەیی و داخی دڵی خۆی بەو قوڕو لم و ئاوو کەل و پەلانەی کە دروستی دەکات دەڕێژێ و تۆڵەی خۆی لە ئەوان دەکاتەوە، هەروەها زۆر لەو چالاکیانە دەبنە مایەی تێکەڵاو بوون بە منداڵانی تر و کەمکردنەوەی ترس و شەرم و ڕزگار بوون لەگۆشەگیری و دوورەپەرێزی، سەرەڕای ئەوەش زۆر لەو چالاکی و یارییانە دەبنە هۆی مایەی دڵخۆشی و کامەرانی منداڵان. دەبا هەمووومان لەناو خێزان و باخچەی ساوایان بواری ئەو چالاکی و یارییانە بۆ منداڵەکانمان برەخسێنین.

## منداڵ و پشت بەستنی بە كەسانی تر

یەكێك لەو هەڵس و كەوت و ڕەوشتانەی كە زیان بە باری دەروونی و داهاتووی منداڵ دەگەیەنێ، پشت بەستن بە كەسانی ترە، مەبەست لە پشت بەستن بە كەسانی تر ئەوەیە، كە منداڵ پشت بە كەسانی تر ببەستێ و داوای جێبەجێكردنی كاروچالاكیەكانی خۆی لە ئەوان بكات، لە كاتێكدا تەمەن و توانا و قۆناغی گەشەكردنی ئەو جۆرە منداڵانە گونجاوو لەبارە بۆ ئەوەی خۆیان بەو كارو چالاكیانە هەڵبستن، منداڵ كاتێك لەدایك دەبێت بوونەوەرێكی لاوازو بێ دەسەلات و بێ پشت و پەنایەو ناتوانێت بەبێ یارمەتی و پشتگیری كەسانی تر بژی و لە ژیان بەردەوام بێت، یەكەم كەسیش لە ژیانی منداڵدا دایكەو زۆربەی زۆری پێداویستیەكانی (خۆراك، ئاو، خەو، پاككردنەوە، پاراستن لە گەرماو سەرما .. تاد) لە ڕێگەی دایكەوە تێردەكرێت، كە ئەمەش دەبێت بە سەرەتاو بنەمای پشت بەستنی منداڵ بە دایك، بەلام ئەم حەزوو ئارەزووەی پشت بەستنە هەتا هەتایە بەردەوام نابێت، بەڵكو پاش ماوەیەك و دوای گەورە بوونی منداڵ ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو كەمبوونەوە دەچێت و وورده وورده پشت بە خۆی دەبەستێت لەبەرئەوەی حەزوو پاڵنەرو ئارەزووی منداڵ بۆ سەربەخۆیی و پشت بەخۆبەستن زۆر بەهێزەو وا لەمنداڵ دەكات كە لە پشت بەستن بە كەسانی تر دووربكەوێتەوە.

لەسەرەتا منداڵ پشت بە دایك و باوك دەبەستێ ئینجا خوشك و برای گەورەو برادەرو خزم و كەس دواتر پشت بەخۆی، بەلام لێرەدا پرسیارێك قوت دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە، ئەی لەبەرچی هەندێك لە منداڵان ماڵئاوایش لە قۆناغی منداڵی دەكەن، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر پشت بە كەسانی تر دەبەستن و تۆوی سەربەخۆیی لە ناخیاندا بە زەحمەت و دەگمەن سەوز دەبێت، لە كاتێكدا هاوەڵ و هاوتەمەنیان كەسانی سەربەخۆن؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە پێویستە ئاماژە بۆ دەرئەنجامی توێژینەوە زانستیەكانی ئەو بوارە بكەین، كە كۆمەڵێك هۆكاری دەروونی و كۆمەڵایەتیان بۆ دیاری كردووین كە دەبنە هۆی

گەشەپێکردنی ڕەوشتی پشت بەستن بە کەسانی تر لە لای منداڵ، هۆکارەکانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:-

١)- هاندان و پشتگیری کردن:-

بەداخەوە هەندێك دایك و باوك لە ئەنجامی کەمی شارەزاییانەوە بەردەوام خۆیان کاروچالاکیەکانی منداڵەکانیان جێ بەجێ دەکەن و لەسەر پشت بەستن بە کەسانی تر هانی منداڵەکانیان دەدەن، کە ئەمەش کاریگەری خراپەو منداڵ لەسەربەخۆیی و متمانەکردن بە خود دووردەخاتەوە، کەواتە هەڵەیەو نابێت دایك و باوك هەموو ئیش و کارەکانی منداڵ جێ بەجێ بکەن، بەڵکو دەبێت بواری کارکردن و جێبەجێکردنی ئەرك و چالاکیەکان بۆ منداڵ بخولقێندرێ و ژینگەی ئازادو گونجاو بۆ سەربەخۆیی منداڵ دابین بکرێت.

٢) توخم:-

بە پێ ی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی زۆربەی گەلان و کۆمەڵگای خۆشمان جیاوازیەکی زۆر لەبواری پەروەردەکردنی کوڕو کچدا هەیە، یەکێك لەو بوارانەی کە جیاوازی تێدا دەکرێت ڕەوشتی پشت بەستن بە کەسانی ترە، ئێمەو زۆربەی گەلانی تر ڕەوشتی پشت بەستن بە کەسانی ترو نەبوونی سەربەخۆیی زیاتر بۆ کچ گونجاوە نەك کوڕ، واتە زۆربەی کۆمەڵگاکان بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدان کە کوڕ زیاتر سەربەخۆ بێت، بەڵام ئەگەر کچ سەربەخۆش نەبێت و پشت بە کەسانی تریش ببەستێت ئاساییە و کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی لێ ی قبووڵ دەکەن، کە ئەم جۆرە پەروەردەیەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پشت بەستن بە کەسانی ترو نەبوونی سەربەخۆیی زیاتر لە لای کچ گەشە بکات نەك کوڕ.

٣) ئازاداری:-

یەکێك لە شێوازە هەڵەکانی پەروەردەکردنی منداڵ، ئازدار بەخێو کردنی منداڵە، دەرکەوتووە کە ئازداری دەبێتە هۆی کوشتنی گیانی سەربەخۆیی و بڕوا بەخۆبوون و پشت

بەستن بە خود، لەبەرئەوەی ئازاری مانای جێبەجێکردنی هەموو پێداویستییەکانی منداڵ و بەرزکردنەوەی بۆ پلەو پایەیەك کە شیاوی ئەو نیە لە هەمووشی مەترسیتر ئەوەیە کە کاتێك منداڵ دەچێتە ناو کۆمەڵ و دام و دەزگاکانیەوە وەهیچ کەسێکی تری وەك دایك و باوك و خوشك و برای نیە کە سەرجەم پێداویستییەکانی بۆ دابین بکات کە ئەمەش منداڵ تووشی ململانێ و نامۆبوون و ترس و بڕوا بەخۆ نەبوون دەکات.

٤) هەست کردن بە کەمی و بڕوابە خۆنەبوون:-

هیچ شتێك وەك سوکایەتی پێکردن، گیانی بڕوابەخۆبوون و سەربەخۆیی لە منداڵدا ناکوژێت، بەداخەوە هەندێك خێزان لە ئەنجامی نەزانی و پەروەردەی هەڵەوە بەردەوام لە نرخی منداڵەکانیان کەم دەکەنەوەو بە چاوی سووك سەیریان دەکەن و چەندەها ناوو ناتۆرەو تیرو توانجیان تێدەگرن کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو جۆرە منداڵانە هەست و سۆزو بیروبۆچوونی هەڵەیان دەربارەی خودی خۆیان و تواناکانیان لە لا دروست بێت بەوەی کە کەسانی نەزان و گەمژەو بێ توانان، کە ئەمەش بە شێوەیەکی خراپ لە هەڵس و کەوت و بیرو بۆچوونیاندا ڕەنگ دەداتەوەو لە ترسی سەرنەکەوتن و قسەی کەسانی چواردەور ناوێرن دەست بۆ هیچ کارێك ببەن ئەوەك سەرنەکەون، بەردەوام بوونی ئەو حاڵەتەش وا لەمنداڵ دەکات کە کەسێکی ڕاڕاو بە گومان و دوو دڵ دەربچێ و بە ناچاری پەنا بۆ کەسانی تر ببات و داوای یارمەتیان لێ بکات. لەبەر ئەوە زۆر هەڵەیەو نابێت هیچ دایك و باوك و مامۆستایەك سوکایەتی بە منداڵ بکات و وای تێبگەیەنێ کە کەسێکی لاوازو بێ دەسەڵاتە. بەڵکو دەبێت زیاتر خاڵە بەهێزو توانا لەبن نەهاتووەکانی منداڵ بە دەربخرێن و تۆوی بڕوابەخۆبوون و گیان بازی و چاونەترسی تیایدا بچێندرێت.

٥) نوقستانی و کەم ئەندامی:-

هەندێك جاریش نوقستانی لە یەکێك لە ئەندامەکانی لەشی منداڵدا دەبێتە هۆی پشت بەستن بە کەسانی تر، بۆ نموونە کاتێك منداڵ نابینا یان ئیفلیج یان بیرکۆڵ

دەبێت، ئەوا بە ناچاری پەنا بۆ کەسانی تر دەبات و داوای یارمەتیان لێ دەکات، لەبەرئەوەی خۆی ناتوانێت بە تەنها کارو چالاکیەکانی بە ئاکام بگەیەنێت.

**٦) بارودۆخی نامۆو نەگونجاو بۆ منداڵ:-**

هەر چ کاتێك منداڵ بکەوێتە بارودۆخ و دەوروبەرێکی نامۆوە، بە ناچاری پەنا بۆ کەسانی تر دەبات، لەبەر ئەوەی خۆی ئەو تواناو شارەزاییەی نیە کە خۆی لەگەڵ ئەو بارودۆخە تازەو نامۆیەدا بگونجێنێ، بۆ نموونە کاتێك منداڵ لەگەڵ کەس و کاری سەردانی ماڵ و جێگای تازەی پڕ لە خەڵك دەکەن، ئەوا بەردەوام لە تەنیشت و نزیك دایك و باوکیەوە دادەنیشێ و داوای یارمەتی ئەوان دەکات، بەڵام دوای ماوەیەك کە شارەزای ئەو دەوروبەرە نامۆیە دەبێت و خۆی لە تەکیا دەگونجێنێ، ئەو کاتە لە دایك و باوکی دووردەکەوێتەوەو تەمی ترس و دڵەڕاوکێ ی دەڕەوێتەوە.

**٧) نەخۆشی:-**

نەخۆشیش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە وا لە منداڵ دەکات کە داوای یارمەتی لە کەسانی چواردەور بکات لەبەرئەوەی ئەو نەخۆشیە دەبێت بەڕێگر لەبەردەم جێبەجێکردنی زۆر لەکارو فەرمانەکانی، بەڵام نابێت دایك و باوك کارێکی وا بکەن کە منداڵ ئەو نەخۆش کەوتنەی بقۆزێتەوەو لە میانەیەوە لە کاروفەرمانەکانی خۆی بدزێتەوە، چونکە ئەگەر ئەوەی بۆ چووە سەر ئەوا زۆر جار خۆی نیشان دەدات کە نەخۆشە چونکە دەزانێت ئەو نەخۆشیەی لەزۆر کارو فەرمان ڕزگاری دەکات.

**٨) تاقانەیی:-**

هەندێك جاریش منداڵی تاقانە ڕووبەڕووی گرفتی پشت بەستن بە کەسانی تر دەبێتەوە، لەبەرئەوەی کەسانی چواردەوری بەردەوام کاروچالاکییەکانی بۆ جێ بەجێ

دەکەن و ناهێڵن ئەو هیچ کارێك بکات، بێگومان ئەم جۆرە مامەڵەیە هەڵەیەو ئەو جۆرە منداڵانە تووشی زۆر گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەکات. بەڵام نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت کە هەندێك جار بارودۆخ و فشاری دەرەکی وا لە مرۆڤ دەکات (بچووك بێت یان گەورە) کە بە ناچاری پەنا بۆ کەسانی تر ببات و داوای یارمەتیان لێ بکات، ئەم جۆرە داواکاری و پشت بەستنە بە کەسانی تر ناچێتە خانەی ئەم باسەی ئێمە، بەڵام ئەگەر بەردەوام منداڵ لە زۆر بواردا هەر پەنای بۆ کەسانی تر بردو داوای یارمەتی لێکردن و ئەو بێ دەسەلات و دەستەوەستان هەر چاوەڕێی ئەوانی کرد، ئەو کاتە دەبێت بە گرفت و پێویستی بە چارەسەرکردن دەبێت.

ئینجا بۆئەوەی منداڵەکانمان تووشی گرفتی پشت بەستن بە کەسانی تر نەبن و کەسایەتی و خودو ناسنامەی خۆیان لەدەست نەدەن، ئەوا زۆر پێویستە کە منداڵەکانمان لەسەر کاروچالاکی گونجاوو پشت بەستن بە خۆو سەربەخۆیی ڕابهێنین و جۆرە سەربەستیەکیان بدەینێ و بواری ڕادەربڕین و گیان بازی و تاقیکردنەوەو تاووتوێ کردنی دیاردەکانی چواردەوریان بۆ برەخسێنین، ئەویش لە ڕێگەی چالاکی وەك ئامادەکرنی خواردن و ڕێك خستنی باخچەو ناوماڵ و هاوکاری و یارمەتی دانی کەسانی ترو جێبەجێکردنی ئەرك و فەرمانەکانی ڕۆژانەوە دەبێت.

## منداڵ لەشیر برینەوە

منداڵ کاتێك لەدایك دەبێت، هیچ توانایەکی نیە کە خۆی بە تەنها خواردن بخوات، بەڵکو بە تەواوی پشت بە شیری دایکی دەبەستێت، واتە یەکەم مرۆڤ کە منداڵ ڕووبەڕووی دەبێتەوە، دایکە، وە هەروەها یەکەم شلەش کە نۆشی دەکات، شیرە. واتە پرۆسەی شیر پێدان کاریگەری تایبەتی خۆی هەیە لە ژیانی منداڵدا، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە دەبێت هەر لەسەری بەردەوام بێت، چونکە شیر هەموو پێداویستییەکانی گەشەکردنی منداڵی تێدا نیەو ناشتوانێت لە هەموو قۆناغەکانی ژیاندا منداڵ تێر بکات، لەبەرئەوە

دەبێت لەکات و ساتێکی گونجاودا لەشیر ببڕدرێتەوەو فێری خواردن بکرێت. بەڵام تاوەکو ئێستا هیچ ساڵ و مانگ و ڕۆژێکی دیاریکراو بۆ لەشیر بڕینەوە (الفطام) نیە، بەڵکو بەپێ ی کۆمەڵگاو چین و توێژو ڕۆشنبیری تاکەکانی کۆمەڵ دەگۆڕدرێت، هەندێك کۆمەڵگا لەنیوەی دووهەمی ساڵی یەکەم دەست دەکەن بە لەشیر بڕینەوەی منداڵەکانیان، هەندێك هۆزو کۆمەڵگای تر سەربەستیەکی تەواو دەدەن بە منداڵەکانیان و تا تەمەنی (٣)، (٤) ساڵان لەشیریان نابڕنەوە، بەڵام وەك دەرکەوتووە، دەوروبەری (١٨) مانگی، کاتێکی گونجاوە بۆ لەشیر بڕینەوەی منداڵ. (کەواتە زوو یان درەنگ لەشیر بڕینەوە زیانی زۆر بە کەسایەتی منداڵ و پرۆسەی گەشەکردنی دەگەیەنێت). بەڵام هەندێك جار، نەخۆشکەوتنی منداڵ و لاوازی و ناڕێکی باری دەروونی، پرووسەی لەشیر بڕینەوە دوا دەخەن.

باوەشی گەرمی دایك و پرۆسەی شیر پێدان هەردوو پێداویستیە گرنگەکانی منداڵ کە خۆیان (لە خۆراك و سۆزو خۆشەویستیدا) دەبیننەوە، تێر دەکەن، لەبەرنەوە دەبێت دایك و باوك لە کاتی لەشیر بڕینەوەدا زۆر بە ئاگابن، بۆنەوەی منداڵەکەیان تووشی زەبری دەروونی (الصدمة النفسية) نەبێت. ئینجا بۆنەوەی منداڵ لەکاتی لە شیر بڕینەوەدا تووشی خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێ نەبێت و زیانی گەورە بە کەسایەتی نەگات، ئەوا دەبێت دایك و باوك ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:-

١- لەشیر بڕینەوە، مانای ڕاهێنانی منداڵە لەسەر نان خواردن و وازهێنانی لەشیر، بەڵام ئەم پرۆسەیە نابێت لەناکاوو کوت و پڕ بێت، بەڵکو دەبێت بە قۆناغ و لەسەرخۆ بێت، واتە یەکەمجار لەگەڵ شیرخواردندا هەندێك شلەمەنی دەدرێتێ، دواتر زیاد دەکرێت، ئینجا لەگەڵ شیرخواردنەوەدا، خواردنی شلی دەدرێتێ، پاش ماوەیەك خواردنە شلەکە زیاد دەکرێت و بڕی شیرەکە کەم دەکرێتەوە، دوای ماوەیەکی تر، خواردنە شلەکەی بۆ دەکرێت بە خواردنی ڕەق، بەم شێوەیە، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بڕی خواردنەکەی بۆ زیاد دەکرێت و لەهەمان کاتیشدا بڕی شیرەکەی بۆ کەم دەکرێتەوە.

٢- نابێت بەزۆر منداڵ لەشیر ببڕدرێتەوە، چونكە زۆری و توونده تیژی زیانی گەورە بەباری دەروونی و كەسایەتی منداڵ دەگەیەنن و لەداهاتوودا تووشی زۆر گرفتی دەروونی دەكەن.

٣- نابێت دایك پەنا بۆ شێوازی هەڵەی وەك (چەورگردنی مەمك بە ماددەیەكی تفت و تاڵ و ناخۆش، دوورخستنەوەی منداڵ لە دایك) ببات، چونكە ئەو شێوازانە منداڵ تووشی خەم و خەفەت و نیگەرانی دەكەن و دەبنە هۆی بێبەشبوونی منداڵ لەسۆزو خۆشەویستی و دڵنیایی گرنگترین و خۆشەویسترین كەسی، كە ئەویش دایكە.

٤- كاتێك دایك منداڵ لەشیر دەبڕێتەوە، دەبێت خۆی لەنزیكیەوە بێت، بۆئەوەی وا هەست نەكات كە پرۆسەی لەشیر بڕینەوە، مانای نەمانی باوەشی گەرمی دایك و سۆزو خۆشەویستیەتی. بەڵام دەتوانرێت دوای ماوەیەك، ئیتر وورده وورده دایك لەمنداڵ دووربكەوێتەوەو بواری سەربەخۆیی و تەنیایی بۆ بڕەخسێندرێت.

٥- دەبێت دایك زۆر لەسەرخۆو هێمن و خۆڕاگر و بەئارام و پشوو درێژ بێت لەكاتی لەشیر بڕینەوەی منداڵەكەی، چونكە پرۆسەی لەشیر بڕینەوە كارێكی ئاسان نییە.

هەروەها دەتوانرێت بەهەمان شێواز منداڵ لەمەمەو شیری قووتوو دەستكرد ببڕدرێتەوەو دەتوانرێت لەجیاتی شیر جارجارێك (ئاو یان شەربەت یان گوشراوی میوە) بكرێتە ناو مەمەكەوە. واتە نابێت یەكسەرو كوتوپڕ بێت. (هرمز و ابراهیم، ١٩٨٨).

## پاداشت کردنی قوتابی منداڵ نەك سزادانی

هەمووومان چاك دەزانین کە قوتابخانە ماڵی دووهەمی قوتابیەو هیچ گرنگیەکی لە خێزان کەمتر نیە بگرە لە هەندێك لایەنەوە زۆر گرنگترو پێویست ترە. ئینجا بۆ ئەوەی قوتابخانە بەو ڕۆڵە گرنگ و ترسناکەی خۆی هەڵبستێت دەبێت مامۆستا لە پەروەردەکردنی منداڵاندا لە شێوازە هەڵەکان دووربکەوێتەوە. یەکێك لەو شێوازە هەڵانەی کە بەداخەوە تاوەکو ئێستاش لە قوتابخانەکانمان ماوە، پەنا بردنی مامۆستایە بۆ لێدان و سزادانی منداڵ. ئەوەش زیاتر لەلای ئەو مامۆستایانە زۆرە کە بڕوایان بە لێدان هەیەو بە کارێکی باشی لە قەڵەم دەدەن. لێرەدا پرسیارێك قووت دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە ئایا سزاو لێدان پێویستە وە ئەگەر پێویستە باشیەکانی چین؟

لەڕاستیدا سزاو لێدان هەندێك دەرئەنجامی ڕاستەوخۆی باشی هەیە، لەوانە منداڵ لە ترس و سزای مامۆستا بێدەنگ دەبێت یان خۆی بۆ قوتابخانە ئامادە دەکات یان لە هەندێك هەڵس و کەوتی خراپ بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دووردەکەوێتەوە. بەلام نابێت زیانەکانی لێدان و سزادانمان لەبیر بچێت کە زۆر زۆرترە لەو دەرئەنجامە باشانەی سەرەوە، چونکە ئەو دەرئەنجامانە کاتین و زۆر بەردەوام نابن، بەلام زیانەکانی لێدان و سوکایەتی پێکردن بەردەوام دەبن و کاریگەری خراپیان لەسەر دڵ و دەروونی قوتابی دەبێت.

ڕاستە منداڵ لە ترسی مامۆستا بێدەنگ و کڕ دەبێت، بەلام هەرئەوەندە مامۆستا چووە دەرەوە یان لەو ئاوە ئەما ئەوا منداڵەکان دەگەڕێنەوە دۆخی جارانیان و دەست بە شەیتانی و هات و هاوار دەکەن، کە ئەمەش دیاردەیەکی ئاسایی جیهانی منداڵە، بەلام ئەگەر هەندێك قوتابی زیاد لە پێویست لاسارو سەرە ڕۆن، ئەوە مانای ئەوەیە کە ئەو قوتابیانە گیروگرفتی تایبەتی خۆیان هەیەو هۆکاری (ئابووری یان کۆمەڵایەتی یان پەروەردەیی یان دەروونی) لە دوای ئەو لاساری و سەرەڕۆییەیانەوە هەیە، کەواتە

پێویستە چارەسەری گرفتەکان بکرێت نەك سووکایەتیان پێ بکرێت و ئازار بدرێن، چونکە ئەو لێدانە گرفتەکە زیاتر ئاڵۆز دەکات نەك چارەسەری بکات، ڕاستە منداڵ لەترسان خۆی بۆ قوتابخانە ئامادە دەکات بەڵام نابێت ئەوەشمان لە یاد بچێت کە زۆر جار ئەو هەڕەشەو سزادانەی مامۆستا دەبێتە هۆی وازهێنانی زۆر قوتابی و ڕاکردنیان لە قوتابخانە، لەلایەکی ترەوە زۆر هۆکارو شێوازی پەروەردەیی تر هەن، کە دەتوانن خوێندن و قوتابخانە لەلای قوتابی خۆشەویست بکەن سەرەڕای ئەوەش ئەگەر قوتابی حەزی لە خوێندن نەبێت، مانای ئەوەیە هۆکاری تایبەتی یان خێزانی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی هەیەو پێویستە چارەسەری ئەو هۆکارانە بکرێن نەك بە لێدان و هەڕەشەو چاو سوورکردنەوە منداڵ ناچاری خوێندن بکرێت، کە بێگومان دوای ماوەیەك هیچ کاریگەری نامێنێت.

مامۆستای بەتواناو لێهاتوو پەنا بۆ لێدان نابات و بە شێوازێکی پەروەردەیی نازانێت، چونکە ئەگەر مامۆستا شارەزاو زیرەك بوو ڕێگاکانی وانە گوتنەوەی لەگەڵ سایکۆلۆژیای قوتابییەکاندا چوون یەك بوو، ڕێزی قوتابییەکانی گرت، ئەو کاتە قوتابییەکان زۆر ڕێزی دەگرن و وەك ماستی مەیو گوێ بۆ ئامۆژگاری و قسەکانی شل دەکەن بەڵام ئەگەر مامۆستا لێهاتوو نەبوو، شارەزای وانەکانی خۆی و ڕێگاکانی وانە گوتنەوە نەبوو سەرەڕای ئەوەش ڕێزی قوتابییەکانی نەگرت و بەچاوی سووك سەیری کردن، بێگومان ئەو کاتە قوتابییەکان پەنا بۆ زۆر شێوازو هەڵس و کەوتی نابەجێ دەبەن و مامۆستاش ناچار دەبێت پەنا بۆ لێدان و سوکایەتی کردن و هەڕەشە ببات (چونکە لەوە زیاتر هیچی تری نیە).

لەوانەیە ئەو جۆرە مامۆستایانە پاساوی ئەوە بهێننەوە کە قوتابییەکان لاسارن و باش پەروەردە نەکراون، بەڵام ئەوە لەیاد دەکات کە هەر ئەو قوتابیانە لەوانەیەکی ترو لە لای مامۆستایەکی تر زۆر عاقڵ و بێ دەنگن. کەواتە کەم و کورتی لەلای مامۆستایە نەك قوتابی.

دەرئەنجامی زۆربەی توێژینەوە زانستیەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لێدان زیانی زۆر بە باری دەروونی قوتابی دەگەیەنێت. کە دەتوانین لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کۆیان بکەینەوە:-

١). زۆرجار دەبێتە هۆی ئەوەی کە قوتابی لە خوێندن بێزار بێت و دواجار قوتابخانە بەجێ بهێڵێ بەڵگەش لەم بارەیەوە زۆرە، کە زۆر قوتابی (بەتایبەتیش لە قۆناغی سەرەتایی) لە ترسی لێدان و سوکایەتی پێکردنی مامۆستا وازیان لە قوتابخانە هێناو کەوتنە سەر شەقام و ناو کۆڵانەکان.

٢). هەندێک جار ئەو لێدان و سوکایەتی پێ کردنە دەبێتە هۆی ئەوەی کە قوتابی ڕقی لەو وانەیەش بێت کە ئەو مامۆستایە دەیڵێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر لە سەرەتایی مامۆستای بیرکاری یان کوردی، ئازاری منداڵ بدات، ئەوە دوور نیە هەتا هەتایە ئەو منداڵە هەر ڕقی لەوانەی بیرکاری یان کوردی بێت وبەردەوام لە قۆناغەکانی تری خوێندنیش گیروگرفتی بۆ دروست بکات و خوێندنی ئەو وانانە تووشی ئازاری بکات و لێدان و سوکایەتی پێکردنەکانی مامۆستایانی قۆناغی سەرەتایی وەبیر بهێنێتەوە.

٣). لێدان و سوکایەتی پێکردنی قوتابی دەبێتە هۆی ئەوەی کە زۆر ڕەوشت و هەڵس و کەوتی نابەجێ لەلای قوتابی دروست ببێت، بۆ نموونە قوتابی هەوڵدەدات کە بە هەرچ شێوەیەک بێت تۆڵەی خۆی لە مامۆستا بکاتەوە ئیتر یان پەنا بۆ قۆپیەو (غش) یان شکاندنی کورسی و کەل و پەلەکانی قوتابخانە دەبات کە بە بڕوای هەندێک لەو قوتابیانە زیان لە مامۆستاو قوتابخانەو میری دەدەن کە ئەوانەش هێمای دەسەلاتن، یان ڕق و کینە و تووڕەیی خۆی بە لێدانی منداڵەکانی تر یان دزی لێکردنیان دادەمرکێنێتەوە، یان دیوارو دەرگاو پەنجەرەی قوتابخانە دەنووسێ یان ... یان ... تاد، پەنا بۆ یەکێک لە شێوازەکانی تر دەبات، کە سەرجەم ئەو هەڵس و کەوتە نابەجێیانە دەرئەنجامی ئەو لێدان و سوکایەتی پێکردنەی مامۆستان.

٤)- دوورنیە ئەو جۆرە قوتابیانە ببن بە کەسانی لاسارو سەرەڕۆ، لەبەر ئەوەی منداڵ وەرزەکار لە ڕێگای لاساییکردنەوەی مامۆستاکانیانەوە فێری توندو تیژی و لێدان و سوکایەتی پێکردنی کەسانی تر دەبن، کە ئەمەش دژی پرۆسەی پەروەردەو فێرکردنە، چونکە پێویستە مامۆستا نموونەی دادوەری و ڕاست گۆیی و بەوەفایی و دڵنەرمی و بەبەزەیی بێت نەك نموونەی شەڕ خوازی و توندو تیژی، کە بەداخەوە لێدان و سوکایەتی پێکردنەکانی بەرەو ئەو لایەی دەبەن.

کەواتە زۆر پێویستە مامۆستا تا دەتوانێت لە لێدان و سوکایەتی پێکردنی قوتابی دووربکەوێتەوەو لەجیاتی ئەوە بە دوای هۆکارەکانی نەخوێندن و سەرەڕۆیی و شەیتانی منداڵەکاندا بگەڕێ بۆ ئەوەی چارەسەری گونجاویان بۆ بدۆزێتەوە. سەرەڕای ئەوەش پێویستە پەنا بۆ پاداشت کردن و هاندانی قوتابییەکانی ببات.

ڕاستیەك هەیە پێویستە هەموو مامۆستاو دایك و باوکێك بیزانێت، ئەویش ئەوەیە کە جیهانی منداڵ پڕە لە هات وهاوارو سەرەڕۆیی و بەرکەوتن و تووڕەبوون، سەرەڕای ئەوەش پڕە لە کاری باش و داهێنان، کەواتە لە جیاتی ئەوەی منداڵ لەسەر هەڵەکانی سزا بدەین ئەوا پێویستە لەسەر ڕەوشت و قسەو هەڵس و کەوتە باشەکانی هانی بدەین و پاداشتی بکەین، ئەو کاتە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خاڵە باش و چاکەکانی بەهێز دەبێت و لە خاڵە خراپەکان دوور دەکەوێتەوە، بێجگە لەوەش پەیوەندی نێوان هەردوولا بەهێزتر دەبێت، ئەو کاتەش گلەیی و سەرزەنشتەکانی دایك و باوك و مامۆستاش کاریگەر تر دەبێت.

لەوانەیە زۆر لە مامۆستاکان نرخی پاداشت کردن و هاندان بە باشی نەزانن یان جۆرەکانی لە یەکتری جیانەکەنەوە، پاداشت کردن و هاندان زۆر جۆری هەیە، لەوانە پاداشت کردنی (مەعنەوی) و (ماددی) مەبەست لە پاداشت کردنی (مەعنەوی) ئەوەیە کە قوتابی کارو چالاکی و هەڵس و کەوتێکی باشی کرد ئەوا پاداشتی دەکەین و دەڵێین (ئافەرین، زۆرباشە، زۆر سوپاس، چەپڵەیەکی بۆ لێدەن، تۆ زۆر زیرەکی، تۆ پاشەڕۆژێکی

باشت دەبێت ... تاد ) لە هەمان کاتیشدا ئەگەر هەڵەیەکی کرد ئەو کاتە سزایەکی (مەعنەوی ) نەك ( مادی ) دەدرێت و مامۆستا پێی دەڵێ ( ئەگەر جارێکی تر ئەو هەڵەیە دووبارە بکەیتەوە ئەوا پەیوەندیمان تێك دەچێت یان دڵم زویر دەبێت، یان جارێکی تر پرسیارت لێ ناکەم ... تاد ) کە زۆر کاریگەر ترە لە لێدان و سوکایەتی پێکردن و ناوو ناتۆرەی ناشیرین.

بەڵام مەبەست لە پاداشتی ( ماددی ) ئەوەیە کە شتێك وەك پاداشت دەدرێت بە قوتابی لەوانە (تەباشیری ڕەنگاوڕەنگ، قەڵەم، کاغەز، دەفتەر، چکلێت، تەوقە، بازن، پسکیت،... تاد ). بەلام نابێت هەموو جارێك پاداشتەکان ( ماددی ) بێت، بەڵکو باشتر وایە (معنوی ) بن و بۆ ماوەیەکی کەم بێت. بۆ نموونە ڕۆژی پێنج شەمموان لەبەر چاوی قوتابییەکان بهێنرێتە دەرەوە، یان لە کۆبوونەوەی دایکان و باوکان باس بکرێت، یان هەفتانە ناویان لە بۆردی قوتابییە زیرەك و عاقڵەکان بنووسرێت یان پارچە قوماش و هێمایەك لەسەر سنگیان بدرێت یان لە هەندێك چالاکی و کرداردا دەربخرێن و بکرێن بە نموونە، واتە بە زۆر شێواز هانی قوتابی بدرێت.

پێویستە لەکاتی پاداشت کردن و هانداندا، ڕەچاوی جیاوازی تاکایەتی نێوان قوتابییەکان بکرێت، چونکە مەرج نییە شێوازێك بۆ هەموویان گونجاوو سەرکەوتوو بێت، بۆنموونە پیاهەڵدان و بەرز نرخاندنی قوتابییەك کە بڕوای بە خۆی نەبێت زۆر سەرکەوتوو گونجاوترە لە قوتابییەك کە بڕوای بە خۆی هەبێت، واتە پیاهەڵدان بۆ جۆری یەکەمیان باشترە هەروەها پاداشتی ( ماددی ) بۆ منداڵی هەژار لە پاداشتی ( مەعنەوی ) کاریگەرترە، بەلام پاداشتی ( مەعنەوی ) بۆ هەندێك منداڵی تر لە پاداشتی ( ماددی ) سەرکەوتووترە، کەواتە پێویستە مامۆستا ڕەچاوی هۆکارەکانی (توخم، پلەوپایەی کۆمەلایەتی، ئاستی ڕۆشنبیری وئابووری، تەمەنی ) منداڵەکان بکات و بە پێ ی حەزوو ئارەزووەکانیان پاداشتیان بکات، چونکە هاندان و پاداشت کردن پاڵنەرو داینەمۆی فێربوون و هەڵس و کەوتی باشی قوتابییانن.

دواكەوتنی ژیری

منداڵی بەهرەمەند

گەشەكردنی چەمكەكان

شەڕو ناخۆشی و شەڕانگێزی منداڵ

منداڵ بۆ دزی دەكات ؟

ترس و چۆنێتی چارەسەركردنی

منداڵی خاوەن پێداویستی تایبەتی

كابووس

## ئەوهۆکارانەی دەبنە هۆی دواکەوتنی ژیری و بیرکۆڵی منداڵ

تا ئێستا بە تەواوی هۆکارەکانی بیرکۆڵی و دواکەوتنی ژیری نەدۆزراوەتەوەو مشت و مڕێکی زۆریش لەنێوان پزیشك و دەروونزانەکاندا، دەربارەی هۆکارەکان هەیە، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە هیچ هەوڵدان و توێژینەوە لەو بوارەدا نەکراوە، بەڵکو ژمارەیەکی زۆر توێژینەوەی زانستی دەربارەی هۆکارەکانی بیرکۆڵی و دواکەوتنی ژیری (التخلف العقلی) هەیە.

ئاکامی ئەو لێکدانەوەو توێژینەوە زانستیانە ئاماژە بۆ ئەم هۆکارانەی خوارەوە دەکەن و بە گرنگترین فاکتەری تووش بوون بە دواکەوتنی ژیری دادەنێن:-

(١) هۆکارە بۆماوەییەکان (العوامل الوراثیة):-

هەندێك لەزانایان زۆربەی حاڵەتەکانی بیرکۆڵی بۆ هۆکارە بۆماوەییەکان دەگەڕێننەوە. لە گرنگترین هۆکارە بۆماوەییەکانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:-

جینە فاکتەرەکان (العوامل الجینیة):-

بە بڕوای ژمارەیەك لە زانایان هۆکانی هەندێك لەو منداڵانەی تووشی بیرکۆڵی و دواکەوتنی ژیری دەبن، کەم و کورتییە لە هەندێك لە جیناتەکان. کە ئەمانەش بەسەر دوو کۆمەڵدا دابەش دەبن، کۆمەڵی یەکەم ئەوەیە کە ڕاستەوخۆ بیرکۆڵی و دواکەوتنی ژیرییەکە لە ڕێگەی جیناتی تایبەتیەوە لە باوانەوە (باپیرو دایك وباوك) بۆ منداڵەکانیان دەگوێزرێنەوە واتە جۆرە جینێك لەو بەرەبابەدا هەیە کە بیرکۆڵی دەگوێزێتەوە، بەڵام مەرج نییە هەموو کاتێ ئەو بیرکۆڵی و دواکەوتنی ژیرییە لە منداڵەکانی ئەو جۆرە خێزانانەدا دەربکەوێت، لەبەرئەوەی ئەو جینە لە جۆری جینی سست و خاوو خلیچکە (الجین الخامل) و دەبێت بارودۆخی تایبەتی خۆی بۆ دروست ببێت، ئینجا کاریگەری و مەترسی دەردەکەوێت.

بەلام لە کۆمەڵەی دووهەم ڕاستەوخۆ جینەکان نابنە هۆی گواستنەوەی بیرکۆلی و دواکەوتنی ژیری، بەلکو ئەو جیناتانە (Genes) دەبنە هۆی دروست کردنی هەندێک کەم و کورتی لە کۆئەندامی دەماری ناوەندی (الجهاز العصبي المركزي)و کارو چالاکی هەندێک لە گلاندەکان، دوای ئەوە ناڕێکی و کارو چالاکیەکانی کۆئەندامی دەماری ناوەندی و گلاندەکان دەبنە هۆی بیرکۆلی و دواکەوتنی ژیری، واتە لەم حاڵەتەدا جیناتەکان ناڕاستەوخۆ منداڵ تووشی بیرکۆلی دەکەن، لە گرنگترین ئەو حاڵەتانەش ئەمانەی لای خوارەوەن:-

**کەم و کورتی لە پێکهاتەی مۆخ:-**

لەم حاڵەتەدا جۆرە جینێک دەبێتە هۆی دروست کردنی کەم و کورتی لە شێوەو بونیادی پێک هاتەی مۆخ کە ناتوانێت وەك مۆخی ئاسایی بەکاری خۆی هەڵبستێت، لە ئاکامیشدا منداڵ تووشی بیرکۆلی و دواکەوتنی ژیری دەبێت، ئەم حاڵەتەش بە ئەوەدا دەناسرێتەوە کە کاسەی سەر بەشێوەیەکی نائاسایی گەشە دەکات، ئیتر یان زۆر گەورە دەبێت (كبر الدماغ) (macrocephalic) یان بچووك (microcephalic) بەلام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە هەر کەسێك کاسەی سەری نا ئاسایی بوو ئیتر تووشی بیرکۆلی دەبێت، چونکە هەندێك کەس هەن کە کەللەی سەر یان زۆر گەورەیە یان زۆر بچووکە بەلام تووشی بیرکۆلی نەبوون، لەبەر ئەوەی بیرکۆلیەکە پەیوەستە بە ڕێژەی لەناوچوون و لە کارکەوتنی مۆخی ئەو کەسە نەك بە تەنها شێوەی کاسەی سەری.

**شێواندن و تێك چوونی پێك هاتەی خانەکانی مێشك (cellular Dysplasia):-**

ئەم جۆرە شێواندنەش لەڕێگەی جیناتی تایبەتیەوە دروست دەبێت واتە ئەو جۆرە جینە دەبێتە هۆی شلەژان و تێك دانی پێك هاتەو کاری هەندێك لە خانەکانی مێشك و ناهێلن بە کاری ئاسایی خۆیان هەستن کە ئەمەش دەبێتە هۆی تووش بوون بە بیرکۆلی و دواکەوتنی ژیری.

**فاکتەری (R.H):-**

مەبەست لە (RH) یەکێکە لە پێك هاتەکانی خوێن، بۆیە ناونرا (RH) چونکە یەکەم جار لە خوێنی جۆرە مەیمونێك دۆزرایەوە کە ناوی (Rhesus monkey) بوو، ئیتر هەردوو پیتی یەکەم (RH) لەو ناوەوە وەرگیرا. وەك دەرکەوتووە کە (٨٦٪)ی مرۆڤ ئەو پێك هاتەیە لە خوێنیاندا هەیە بۆیە ناو دەبرێن بە (RH+) بەلام (١٤٪)ی مرۆڤ ئەو پێك هاتەیە لە خوێنیاندا نییە بۆیە بە(RH -)ناو دەبرێن، ئینجا ئەگەر بێت و ئەو پێك هاتەیە لە باوکەوە بۆ منداڵەکەی بگوێزرێتەوە (RH+) بەلام دایکی منداڵەکە (RH -) بێت ئەو کاتە خانەکانی خوێنی منداڵ بە تەواوی گەشە ناکەن و کاریگەری خراپی بەسەر ژیان و پێك هاتەی مێشکی منداڵەوە دەبێت و زۆرجار منداڵ تووشی بیرکۆڵی و دواکەوتنی ژیری دەکات. لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە کوڕو کچ پێش ژن هێنان و شووکردن پشکنینی خوێنی خۆیان بکەن بۆ دڵنیا بوون لە پێك هاتەی خوێنەکانیان و ڕوونەدانی ئەو حاڵەتە.

**ب) تێك چوون و شلەژانی پرۆسەی میتاپۆلیزم (عملية الأيض) (metabolic Disorders):-**

لەم کاتانەدا منداڵ بیرکۆڵیەکەی لە ڕێگەی جیناتەوە بۆ ناگوێزرێتەوە بەڵکو لە ئەنجامی تێك چوونی پرۆسەی میتابۆلیزم (بینا کردن و تێك دان) منداڵ تووشی بیرکۆڵی و دواکەوتنی ژیری دەبێت، کە ئەم تێك چوونەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە وەك پێویست ئەنزیم و هۆرمۆن و پرۆتین و کاربۆهیدرات و چەوری و ڤیتامین بۆ خانەو شانەکانی لەش (بەتایبەتیش مێشك) ئەڕوات و دواجاریش وەك پێویست گەشە ئەکات و منداڵ تووشی بیرکۆڵی ببێت. بێگومان ئەم حاڵەتەش تا ڕادەیەك پەیوەندی بە فەلەمبازی جیناتەوە هەیە (الطفرة في الجينات) (Gene mutation) هەیە کە دەبێتە هۆی نەمان یان دیارنەمانی یەکێك لە ئەنزیم و ڕەگەزەکانی خۆراك لە خوێندا:-

ج ). ئەو حاڵەتانەی لەو بڕوایەدان کە لەوانەیە بە هۆی هۆکاری بۆماوەوە بێت:-

هەندێك حاڵەت لە بیرکۆڵان تاوەکو ئێستا هیچ هۆکارێکی دیاری کراوی نییەو نەتوانراوە بخرێتە یەکێك لە خانەکانی هۆکارەکانی بیرکۆڵان. لەبەرئەوە وا پێش بینی دەکرێت کە هۆکاری سەرەکی ئەو حاڵەتانە بۆ ماوەیی نەزانراوە، ئەویش لەبەرئەوەی زیاتر لە حاڵەتێك لەیەك خێزاندا هەیەو لە بەرەبابێکدا زیاتر لە جارێك دووبارە بۆتەوە.

کەواتە دەتوانین بڵێین کە هەندێك جار بیرکۆڵی لە ڕێگەی جیناتی تایبەتیەوە بۆ منداڵان دەگوێزرێتەوە، کە ئەمەش دەکەوێتە خانەی بۆماوەوە (وراثة)، بەلام هەندێك جاری تر ناڕاستەوخۆ جینی تایبەتی هەیە کە دەبێتە هۆی بیرکۆڵی بەلام ناتوانرێت بخرێتە خانەی بۆماوەوە، لەبەرئەوەی لەم کاتەدا هیچ جینێك خاسیەتی بیرکۆڵی ناگوێزێتەوە، بەلام ناڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی دروست کردنی کەم و کورتی لە کۆئەندامی دەماری ناوەندی و گلاندەکان، ئەو کەم و کورتیەش دەبێتە هۆی دروست کردنی بیرکۆڵی، هەندێك حاڵەتیش تا ئێستا نازانرێت لەبەرچی منداڵ تووشی بیرکۆڵی دەبێت، گومان هەیە کە هۆی بۆماوە بێت بەلام هەر گومانەو ناتوانرێت جەخت لەسەر هۆکاری بۆماوە بکرێت.

( ٢ ) هۆکارەکانی کاتی دووگیانی:-

هەندێك هۆکاری تر کە هیچ پەیوەندیان بە جیناتەوە نییە دەبنە هۆی بیرکۆڵی و دواکەوتنی ژیری، لەوانە تووش بوون بە نەخۆشی پەتای وەك سیفلس (زهری) یان سورێژەی ئەڵمانی (Rubella) لەکاتی دووگیانی. هەروەها تووش بوونی کۆرپەلە بە نەخۆشی زەردەهەڵگەڕانی مۆخ (الصفراء المخية) (Kenicterus) هەروەها تێك چوونی کاروچالاکیەکانی هەندێك لە کوێرە گلاندەکان (الغدد الصماء).

**دووهەم/ هۆكارەكانی كاتی لەدایك بوون:-**

هەندێك جار منداڵ لە ئەنجامی هەندێك هۆكارەوە كە لەكاتی لەدایك بوون ڕوودەدەن، تووشی بیركۆڵی و دواكەوتنی ژیری دەبێت، بۆ نموونە ئەگەر لەكاتی لەدایك بوون كاری نەشتەرگەری بۆئافرەتی دووگیان بكرێت و لەكاتی نەشتەرگەریەكە كەرەستەو ئامێری پزیشكی بەرسەری منداڵەكە بكەوێت یان بەزەحمەت منداڵەكە لە منداڵدانی دایك بێتە دەرەوە، یان پەتكە ناوك لە ملی منداڵەكە بگیرێ و بۆماوەیەكی كەم ئۆكسجین بۆ منداڵەكە نەچێت، یان منداڵەكە بەسەردا بكەوێتە سەر زەوی یان شتێكی ڕەق، یان مامان و كەسی نەزان لەكاتی منداڵ بوون ئازاری منداڵ بدەن و نەزانن مامەڵەی ڕاستی لەگەڵ بكەن ... تاد، سەرجەم ئەو هۆكارانە دەبنە هۆی لەناوچوون و باش گەشەنەكردنی هەندێك لە خانەكانی مێشك یان زیان گەیاندن بە كۆئەندامی دەماری ناوەندی منداڵەكەو دواجار تووشی دواكەوتنی ژیری و بیركۆڵی دەكەن.

**سێ هەم/ هۆكارەكانی دوای لەدایك بوون:-**

دەرئەنجامی توێژینەوە زانستیەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە هەندێك ڕووداو و كارەسات و نەخۆشی دوای لەدایك بوون منداڵ تووشی بیركۆڵی و دواكەوتنی ژیری دەكەن و دەبنە هۆی لەناو چوونی ژمارەیەك لە خانەكانی مێشك، لەوانە (سوور هەڵگەڕانی كۆئەندامی دەماری ناوەندی، بەتایبەتی سور هەڵگەڕان و هەوكردنی (السحائي) (meningitis) هەروەها هەوكردنی مێشك، یان تووش بوون بەتای (قرمزی) (الحمي القرمزية) (scarle fever) یان زیانە لاوەكیەكانی سورێژە (الحصبة) یان ڕووداوی ئوتومبیل و شەڕو كوشتار كە دەبێتە هۆی زیان پێ گەیاندنی مێشك و لەناو بردنی خانەكانی مێشك.

## چوارەم/ هۆکارە دیاری نەکراوەکان:-

هەندێک منداڵ تووشی دواکەوتنی ژیری و بیرکۆڵی دەبن، بەڵام هۆکارەکانی نازانرێت، بۆ نموونە هەندێک ئامار ئاماژە بۆئەوە دەکات کە (٣٥٪)ی حاڵەتەکانی بیرکۆڵی تائێستاش بە تەواوی هۆکارەکانی نەزانراوەو ناتوانرێت بگەڕێنرێتەوە بۆ هۆکاری زانراوو دیاری کراو، لەبەر ئەوە لە ژێر خانەی ئەو حاڵەتانەی کە هۆکارەکانی نەزانراوەو دیاری نەکراوە پۆلێن دەکرێ (الشیخ وعبد الغفار، ١٩٦٦، ص٣٧ -٤٤).

ئینجا بۆئەوەی ژمارەی منداڵانی بیرکۆڵ لە کۆمەڵگاکەمان بەرەو زیادبوون نەڕوات، پێویستە دایک و باوک و مامۆستاو توێژەری کۆمەڵایەتی و دەروونی و پزیشکەکان ڕەچاوی ئەو هۆکارانەی سەرەوە بکەن و تادەتوانن دایک و باوک وکەسانی تر هوشیار بکەنەوە بۆئەوەی منداڵ بەبیرکۆڵی لە دایک نەبێت، بەتایبەتیش هۆکارەکانی (RH)، خواردنی خراپ، دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی هەندێک داوو دەرمانی زیان بەخش لەکاتی دووگیانی و هۆکارەکانی لەکاتی لەدایک بوون و ڕووداوو نەخۆشی و کارەساتەکان ... تاد.
چونکە دەرکەوتووە تا ڕێژەی خوێندەواری و هۆشیاری تاکەکانی کۆمەڵ بەرز بێت و دایکان و باوکان شارەزاییان دەربارەی ئەو هۆکارانەی سەرەوە هەبێت ئەوا ڕێژەی تووش بووان بە بیرکۆڵی کەم دەبێتەوە، بەڵام ڕێژەی منداڵی بیرکۆڵ و دواکەوتوی ژیری لە کۆمەڵگا دوا کەوتووەکاندا زۆر زیاترە ئەگەر بەراوورد بکرێت بە کۆمەڵگا پێش کەوتووەکان، ئەوەش لەبەر کەمی هوشیاری و زانیاری دەربارەی ئەو هۆکارانەی سەرەوەو گرنگی نەدان پێیان.

## منداڵی بەهرەمەندو بلیمەتیش گرفت دروست دەکات

لەکۆنەوە زیاتر گرنگی بە منداڵی بیرکۆڵ و دەبەنگ و گێل دراوەو کەمتر بیر لە منداڵانی بلیمەت و بەهرەمەند کراوەتەوە. ئەویش زیاتر بۆ ئەوە بووە، کە منداڵی بیرکۆڵ گرفت و کێشەی جۆراوجۆریان بۆ خێزان و قوتابخانەو کۆمەڵ دروست کردووە بەڵام منداڵانی بەهرەمەندو بلیمەت کێشەو گرفت دروست ناکەن. هەرچەندە بە ڕواڵەت ئەم بۆچوونە ڕاستە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا هەڵەیە.

ڕاستە بە ئاسانی هەست بە گیروگرفتەکانی منداڵانی دواکەوتووی ژیری دەکەین و دەبینین لە قوتابخانە دەرناچن و کەم و کورتی لە توانستی عەقڵی و زمانیاندا هەیەو لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکاندا سەرکەوتوونین کەچی منداڵانی بەهرەمەندو بلیمەت بەو شێوەیە نین، ئەمە تەنها دیوێکی ڕاستیەکانە، بەڵام ئەگەر بەووردی سەیری باری دەروونی منداڵانی بەهرەمەندو بلیمەت بکەین، ئەوا دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە منداڵانی بەهرەمەندو بلیمەتیش گیروگرفت بۆخۆیان و کۆمەڵەکەیان دروست دەکەن.

**لە گرنگترین ئەو گیروگرفتانەی کە ڕووبەڕووی منداڵانی بلیمەت و بەهرەمەند دەبنەوە، ئەمانەی لای خوارەوەن:-**

١) کاتێك منداڵانی بلیمەت و بەهرەمەند هەمان بەرنامەو پرۆگرامی منداڵانی ئاسایی دەخوێنن و شان بەشانی ئەوان لەیەك پۆلدا دادەنیشن، ئەوا دوای ماوەیەکی کەم تووشی بێزاری و وەڕس بوون و هەڵچوون و گرژی دەروونی دەبن. لەبەرئەوەی ئەوان زۆر بەئاسانی لەو بەرنامەو پرۆگرامانە دەگەن و زۆر جاریش هەر خۆیان دەیانزانن، ئینجا لەبەرئەوەی ئەو بەرنامانە بۆ ئاستی ژیری ئەوان دانەنراوەو سووك و ئاسانن، بۆیە تووشی بێزاری و وەڕس بوون دەبن و نازانن چۆن لەو بێزاری و وەڕس بوونە ڕزگاریان بێت. جاری وا هەیە دەنگە دەنگ و ئاژاوە دروست دەکەن یان ناچنە ناو پۆلەوە بە بیانووی ئەوەی کە هەمووی دەزانن.

بێگومان دروست كردنی دەنگە دەنگ و نەچوونە ناو پۆل لەبەرژەوەندی منداڵی بەهرەمەندو بلیمەت نییەو گیروگرفتی لەگەڵ بەڕێوەبەرو مامۆستاكان بۆ دروست دەكەن. بەلام ئەگەر بەرنامەو پرۆگرامەكان لەو ئاستەدا بوونایە كە حەزوو ئارەزووی ئەو منداڵانەی تێر بكردایەو ناچاری بكردنایە كە هەوڵی هەرس كردن و تێگەیشتنی بوونایە، ئەو كاتە ئەو جۆرە منداڵانە تووشی بێزاری و وەڕس بوون نەدەبوون و ئەوەندەش كاتی زیادیان نەدەبوو كە بۆ دەنگە دەنگ و ڕەفتاری نابەجێ تەرخانی بكەن.

٢) هەندێك لە منداڵانی بلیمەت و بەهرەمەند لە ئەنجامی ئەو بەهرەو زیرەكیەی كە هەیانە تووشی لە خۆبایی بوون و لووت بەرزی دەبن و بە چاوی نزم و گومان سەیری منداڵەكانی تر دەكەن، سەرەڕای ئەوەش ئەو لەخۆبایی بوون و لووت بەرزییەیان لە خشتەیان دەبەن و دوورنییە لەوانەكانیاندا سەركەوتوو نەبن لەبەر ئەوەی وا تێگەیشتوون كە زۆر ئاسانەو پێویست بە خوێندنەوەیان ناكات، بێگومان ئەم بۆچوونەیان هەڵەیەو بابەت چەند ئاسان بێت، دەبێت خۆیانی بۆ ئامادە بكەن و پێش تاقیكردنەوە بیخوێننەوە، بەڵگەش لەم بارەیەوە زۆرەو لاپەڕەكانی مێژووش پڕن لەناوی ئەو بلیمەت و زانایانەی كە لە قۆناغەكانی خوێندن دەرنەچوون یان تووشی گرفت بوون.

٣) منداڵی بلیمەت و بەهرەمەند زۆر پرسیار دەكات و دیاردەكان تاووتوێ دەكات، بەلام بەداخەوە زۆر لە مامۆستایان و باوكان و دایكان زوو لەو هەموو پرسیاركردنەیان وەڕس دەبن و دوورنیە بیان شكێننەوەو تەریقیان بكەنەوە یان سەرزەنشتیان بكەن كە ئەوەش دەبێتە هۆی دڵتەنگی و خەم و خەفەت و بێزاركردنی ئەو منداڵە زیرەك و بلیمەتانەو دوور نییە لە ئەنجامدا فێری زۆر ڕەفتارو هەڵس و كەوتی نابەجێ ببن، ئینجا ئەگەر بمانەوێت منداڵە بلیمەت و بەهرەمەندەكانمان لەو گرفت و ڕەفتارە نابەجێیانە دووربن، ئەوا زۆر گرنگە كە قوتابخانەو دامەزراوی تایبەتیان بۆ بكرێتەوەو ژینگەو بارودۆخی گونجاو بۆ تەقاندنەوەو پەروەردەكردنی بەهرەو تواناكانیان بڕەخسێنرێت، بۆ ئەوەی ئێمەش لە داهاتوودا وەك زۆربەی وڵاتانی جیهان كەسانی داهێنەرو زاناو ناودارمان هەبێت و خزمەتی وڵاتەكەیان بكەن.

بەلام لە كۆمەڵەی دووهەم ڕاستەوخۆ جینەكان نابنە هۆی گواستنەوەی بیركۆلی و دواكەوتنی ژیری، بەڵكو ئەو جیناتانە (Genes) دەبنە هۆی دروست كردنی هەندێك كەم و كورتی لە كۆئەندامی دەماری ناوەندی (الجهاز العصبي المركزي)و كارو چالاكی هەندێك لە گلاندەكان، دوای ئەوە نارێكی و كارو چالاكیەكانی كۆئەندامی دەماری ناوەندی و گلاندەكان دەبنە هۆی بیركۆلی و دواكەوتنی ژیری، واتە لەم حاڵەتەدا جیناتەكان ناڕاستەوخۆ منداڵ تووشی بیركۆلی دەكەن، لە گرنگترین ئەو حاڵەتانەش ئەمانەی لای خوارەوەن:-

**كەم و كورتی لە پێكهاتەی مۆخ:-**

لەم حاڵەتەدا جۆرە جینێك دەبێتە هۆی دروست كردنی كەم و كورتی لە شێوەو بونیادی پێك هاتەی مۆخ كە ناتوانێت وەك مۆخی ئاسایی بەكاری خۆی هەڵبستێت، لە ئاكامیشدا منداڵ تووشی بیركۆلی و دواكەوتنی ژیری دەبێت، ئەم حاڵەتەش بە ئەوەدا دەناسرێتەوە كە كاسەی سەر بەشێوەیەكی نائاسایی گەشە دەكات، ئیتر یان زۆر گەورە دەبێت (كبر الدماغ) (macrocephalic) یان بچووك (microcephalic) بەلام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ كە هەر كەسێك كاسەی سەری نا ئاسایی بوو ئیتر تووشی بیركۆلی دەبێت، چونكە هەندێك كەس هەن كە كەللەی سەر یان زۆر گەورەیە یان زۆر بچووكە بەلام تووشی بیركۆلی نەبوون، لەبەر ئەوەی بیركۆلیەكە پەیوەستە بە ڕێژەی لەناوچوون و لە كاركەوتنی مۆخی ئەو كەسە نەك بە تەنها شێوەی كاسەی سەری.

**شێواندن و تێك چوونی پێك هاتەی خانەكانی مێشك ( cellular Dysplasia):-**

ئەم جۆرە شێواندنەش لەڕێگەی جیناتی تایبەتیەوە دروست دەبێت واتە ئەو جۆرە جینە دەبێتە هۆی شلەژان و تێك دانی پێك هاتەو كاری هەندێك لە خانەكانی مێشك و ناهێلن بە كاری ئاسایی خۆیان هەستن كە ئەمەش دەبێتە هۆی تووش بوون بە بیركۆلی و دواكەوتنی ژیری.

**فاکتەری (R.H):-**

مەبەست لە (RH) یەکێکە لە پێک هاتەکانی خوێن، بۆیە ناونرا (RH) چونکە یەکەم جار لە خوێنی جۆرە مەیمونێك دۆزرایەوە کە ناوی (Rhesus monkey) بوو، ئیتر هەردوو پیتی یەکەم (RH) لەو ناوەوە وەرگیرا. وەك دەرکەوتووە کە (٨٦٪)ی مرۆڤ ئەو پێك هاتەیە لە خوێنیاندا هەیە بۆیە ناو دەبرێن بە (+RH) بەلام (١٤٪)ی مرۆڤ ئەو پێك هاتەیە لە خوێنیاندا نییە بۆیە بە(-RH)ناو دەبرێن، ئینجا ئەگەر بێت و ئەو پێك هاتەیە لە باوکەوە بۆ منداڵەکەی بگوێزرێتەوە (+RH) بەلام دایکی منداڵەکە (-RH) بێت ئەو کاتە خانەکانی خوێنی منداڵ بە تەواوی گەشە ناکەن و کاریگەری خراپی بەسەر ژیان و پێك هاتەی مێشکی منداڵەوە دەبێت و زۆرجار منداڵ تووشی بیرکۆڵی و دواکەوتنی ژیری دەکات. لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە کوڕو کچ پێش ژن هێنان و شووکردن پشکنینی خوێنی خۆیان بکەن بۆ دڵنیا بوون لە پێك هاتەی خوێنەکانیان و ڕوونەدانی ئەو حاڵەتە.

**ب)تێك چوون و شلەژانی پرۆسەی میتاپۆلیزم (عملیة الأيض) (metabolic Disorders):-**

لەم کاتانەدا منداڵ بیرکۆڵیەکەی لە ڕێگەی جیناتەوە بۆ ناگوێزرێتەوە بەڵکو لە ئەنجامی تێك چوونی پرۆسەی میتابۆلیزم (بینا کردن و تێك دان) منداڵ تووشی بیرکۆڵی و دواکەوتنی ژیری دەبێت، کە ئەم تێك چوونەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە وەك پێویست ئەنزیم و هۆرمۆن و پرۆتین و کاربۆهیدرات و چەوری و ڤیتامین بۆ خانەو شانەکانی لەش (بەتایبەتیش مێشك) نەڕوات و دواجاریش وەك پێویست گەشە نەکات و منداڵ تووشی بیرکۆڵی ببێت. بێگومان ئەم حاڵەتەش تا ڕادەیەك پەیوەندی بە قەڵەمبازی جیناتەوە هەیە (الطفرة في الجينات) (Gene mutation) هەیە کە دەبێتە هۆی نەمان یان دیارنەمانی یەکێك لە ئەنزیم و ڕەگەزەکانی خۆراك لە خوێندا:-

ج). ئەو حاڵەتانەی لەو بڕوایەدان كە لەوانەیە بە هۆی هۆكاری بۆماوەوە بێت:-

هەندێك حاڵەت لە بیركۆلان تاوەكو ئێستا هیچ هۆكارێكی دیاری كراوی نییەو نەتوانراوە بخرێتە یەكێك لە خانەكانی هۆكارەكانی بیركۆلان. لەبەرئەوە وا پێش بینی دەكرێت كە هۆكاری سەرەكی ئەو حاڵەتانە بۆ ماوەیی نەزانراوە، ئەویش لەبەرئەوەی زیاتر لە حاڵەتێك لەیەك خێزاندا هەیەو لە بەرەبابێكدا زیاتر لە جارێك دووبارە بۆتەوە.

كەواتە دەتوانین بڵێین كە هەندێك جار بیركۆڵی لە ڕێگەی جیناتی تایبەتیەوە بۆ منداڵان دەگوێزرێتەوە، كە ئەمەش دەكەوێتە خانەی بۆماوەوە (وراثة)، بەلام هەندێك جاری تر ناڕاستەوخۆ جینی تایبەتی هەیە كە دەبێتە هۆی بیركۆڵی بەلام ناتوانرێت بخرێتە خانەی بۆماوەوە، لەبەرئەوەی لەم كاتەدا هیچ جینێك خاسیەتی بیركۆڵی ناگوێزێتەوە، بەلام ناڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی دروست كردنی كەم و كورتی لە كۆئەندامی دەماری ناوەندی و گلاندەكان، ئەو كەم و كورتیەش دەبێتە هۆی دروست كردنی بیركۆڵی، هەندێك حاڵەتیش تا ئێستا نازانرێت لەبەرچی منداڵ تووشی بیركۆڵی دەبێت، گومان هەیە كە هۆی بۆماوە بێت بەلام هەر گومانەو ناتوانرێت جەخت لەسەر هۆكاری بۆماوە بكرێت.

(٢) هۆكارەكانی كاتی دووگیانی:-

هەندێك هۆكاری تر كە هیچ پەیوەندیان بە جیناتەوە نییە دەبنە هۆی بیركۆڵی و دواكەوتنی ژیری، لەوانە تووش بوون بە نەخۆشی پەتای وەك سیفلس (زهری) یان سورێژەی ئەڵمانی (Rubella) لەكاتی دووگیانی. هەروەها تووش بوونی كۆرپەلە بە نەخۆشی زەردەهەڵگەڕانی مۆخ (الصفراء المخية) (Kenicterus) هەروەها تێك چوونی كاروچالاكیەكانی هەندێك لە كوێرە گلاندەكان (الغدد الصماء).

**دووهەم/ هۆکارەکانی کاتی لەدایک بوون:-**

هەندێك جار منداڵ لە ئەنجامی هەندێك هۆكارەوە كە لەكاتی لەدایك بوون ڕوودەدەن، تووشی بیرکۆڵی و دواکەوتنی ژیری دەبێت، بۆ نموونە ئەگەر لەكاتی لەدایك بوون كاری نەشتەرگەری بۆئافرەتی دووگیان بكرێت و لەكاتی نەشتەرگەریەكە كەرەستەو ئامێری پزیشكی بەرسەری منداڵەكە بكەوێت یان بەزەحمەت منداڵەكە لە منداڵدانی دایك بێتە دەرەوە، یان پەتكە ناوك لە ملی منداڵەكە بگیرێ و بۆماوەیەكی كەم ئۆكسجین بۆ منداڵەكە نەچێت، یان منداڵەكە بەسەردا بكەوێتە سەر زەوی یان شتێكی ڕەق، یان مامان و كەسی نەزان لەكاتی منداڵ بوون ئازاری منداڵ بدەن و نەزانن مامەڵەی ڕاستی لەگەڵ بكەن ... تاد، سەرجەم ئەو هۆكارانە دەبنە هۆی لەناوچوون و باش گەشەنەكردنی هەندێك لە خانەكانی مێشك یان زیان گەیاندن بە كۆئەندامی دەماری ناوەندی منداڵەكەو دواجار تووشی دواكەوتنی ژیری و بیركۆڵی دەكەن.

**سێ هەم/ هۆکارەکانی دوای لەدایک بوون:-**

دەرئەنجامی توێژینەوە زانستیەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە هەندێك ڕووداو و كارەسات و نەخۆشی دوای لەدایك بوون منداڵ تووشی بیركۆڵی و دواكەوتنی ژیری دەكەن و دەبنە هۆی لەناو چوونی ژمارەیەك لە خانەكانی مێشك، لەوانە (سوور هەڵگەڕانی كۆئەندامی دەماری ناوەندی، بەتایبەتی سور هەڵگەڕان و هەوكردنی (السحائي) (meningitis) هەروەها هەوكردنی مێشك، یان تووش بوون بەتای (قرمزی) (الحمي القرمزية) (scarle fever) یان زیانە لاوەكیەكانی سورێژە (الحصبة) یان ڕووداوی ئوتومبیل و شەڕو كوشتار كە دەبێتە هۆی زیان پێ گەیاندنی مێشك و لەناو بردنی خانەكانی مێشك.

**چوارەم/ هۆکارە دیاری نەکراوەکان:-**

هەندێك منداڵ تووشی دواکەوتنی ژیری و بیرکۆڵی دەبن، بەڵام هۆکارەکانی نازانرێت، بۆ نموونە هەندێك ئامار ئاماژە بۆئەوە دەکات کە (٣٥٪)ی حاڵەتەکانی بیرکۆڵی تائێستاش بە تەواوی هۆکارەکانی نەزانراوەو ناتوانرێت بگەڕێنرێتەوە بۆ هۆکاری زانراوو دیاری کراو، لەبەر ئەوە لە ژێر خانەی ئەو حاڵەتانەی کە هۆکارەکانی نەزانراوەو دیاری نەکراوە پۆلێن دەکرێ (الشیخ وعبد الغفار، ١٩٦٦، ص٣٧-٤٤).

ئینجا بۆئەوەی ژمارەی منداڵانی بیرکۆڵ لە کۆمەڵگاکەمان بەرەو زیادبوون نەڕوات، پێویستە دایك و باوك و مامۆستاو توێژەری کۆمەڵایەتی و دەروونی و پزیشکەکان ڕەچاوی ئەو هۆکارانەی سەرەوە بکەن و تادەتوانن دایك و باوك وکەسانی تر هوشیار بکەنەوە بۆئەوەی منداڵ بەبیرکۆڵی لە دایك نەبێت، بەتایبەتیش هۆکارەکانی (RH)، خواردنی خراپ، دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی هەندێك داوو دەرمانی زیان بەخش لەکاتی دووگیانی و هۆکارەکانی لەکاتی لەدایك بوون و ڕووداوو نەخۆشی و کارەساتەکان ... تاد.
چونکە دەرکەوتووە تا ڕێژەی خوێندەواری و هۆشیاری تاکەکانی کۆمەڵ بەرز بێت و دایکان و باوکان شارەزاییان دەربارەی ئەو هۆکارانەی سەرەوە هەبێت ئەوا ڕێژەی تووش بووان بە بیرکۆڵی کەم دەبێتەوە، بەڵام ڕێژەی منداڵی بیرکۆڵ و دواکەوتوی ژیری لە کۆمەڵگا دوا کەوتووەکاندا زۆر زیاترە ئەگەر بەراوورد بکرێت بە کۆمەڵگا پێش کەوتووەکان، ئەوەش لەبەر کەمی هوشیاری و زانیاری دەربارەی ئەو هۆکارانەی سەرەوەو گرنگی نەدان پێیان.

## منداڵی بەهرەمەندو بلیمەتیش گرفت دروست دەکات

لەکۆنەوە زیاتر گرنگی بە منداڵی بیرکۆڵ و دەبەنگ و گێل دراوەو کەمتر بیر لە منداڵانی بلیمەت و بەهرەمەند کراوەتەوە. ئەویش زیاتر بۆ ئەوە بووە، کە منداڵی بیرکۆڵ گرفت و کێشەی جۆراوجۆریان بۆ خێزان و قوتابخانەو کۆمەڵ دروست کردووە بەڵام منداڵانی بەهرەمەندو بلیمەت کێشەو گرفت دروست ناکەن. هەرچەندە بە ڕواڵەت ئەم بۆچوونە ڕاستە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا هەڵەیە.

ڕاستە بە ئاسانی هەست بە گیروگرفتەکانی منداڵانی دواکەوتووی ژیری دەکەین و دەبینین لە قوتابخانە دەرناچن و کەم و کورتی لە توانستی عەقلی و زمانیاندا هەیەو لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا سەرکەوتوونین کەچی منداڵانی بەهرەمەندو بلیمەت بەو شێوەیە نین، ئەمە تەنها دیویکی ڕاستیەکانە، بەڵام ئەگەر بەووردی سەیری باری دەروونی منداڵانی بەهرەمەندو بلیمەت بکەین، ئەوا دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە منداڵانی بەهرەمەندو بلیمەتیش گیروگرفت بۆخۆیان و کۆمەڵەکەیان دروست دەکەن.

**لە گرنگترین ئەو گیروگرفتانەی کە ڕووبەڕووی منداڵانی بلیمەت و بەهرەمەند دەبنەوە، ئەمانەی لای خوارەوەن:-**

١) کاتێك منداڵانی بلیمەت و بەهرەمەند هەمان بەرنامەو پرۆگرامی منداڵانی ئاسایی دەخوێنن و شان بەشانی ئەوان لەیەك پۆلدا دادەنیشن، ئەوا دوای ماوەیەکی کەم تووشی بێزاری و وەڕس بوون و هەڵچوون و گرژی دەروونی دەبن. لەبەرئەوەی ئەوان زۆر بەئاسانی لەو بەرنامەو پرۆگرامانە دەگەن و زۆر جاریش هەر خۆیان دەیانزانن، ئینجا لەبەرئەوەی ئەو بەرنامانە بۆ ئاستی ژیری ئەوان دانەنراوەو سووك و ئاسانن، بۆیە تووشی بێزاری و وەڕس بوون دەبن و نازانن چۆن لەو بێزاری و وەڕس بوونە ڕزگاریان بێت. جاری وا هەیە دەنگە دەنگ و ئاژاوە دروست دەکەن یان ناچنە ناو پۆلەوە بە بیانووی ئەوەی کە هەمووی دەزانن.

بێگومان دروست كردنی دەنگە دەنگ و نەچوونە ناو پۆل لەبەرژەوەندی منداڵی بەهرەمەندو بلیمەت نییەو گیروگرفتی لەگەڵ بەڕێوەبەرو مامۆستاكان بۆ دروست دەكەن. بەلام ئەگەر بەرنامەو پرۆگرامەكان لەو ئاستەدا بوونایە كە حەزوو ئارەزووی ئەو منداڵانەی تێر بكردایەو ناچاری بكردنایە كە هەوڵی هەرس كردن و تێگەیشتنی بوونایە، ئەو كاتە ئەو جۆرە منداڵانە تووشی بێزاری و وەڕس بوون نەدەبوون و ئەوەندەش كاتی زیادیان نەدەبوو كە بۆ دەنگە دەنگ و ڕەفتاری نابەجێ تەرخانی بكەن.

٢) هەندێك لە منداڵانی بلیمەت و بەهرەمەند لە ئە نجامی ئەو بەهرەو زیرەكیەی كە هەیانە تووشی لە خۆبایی بوون و لووت بەرزی دەبن و بە چاوی نزم و گومان سەیری منداڵەكانی تر دەكەن، سەرەڕای ئەوەش ئەو لەخۆبایی بوون و لووت بەرزییەیان لە خشتەیان دەبەن و دوورنییە لەوانەكانیاندا سەركەوتوو نەبن لەبەر ئەوەی وا تێگەیشتوون كە زۆر ئاسانەو پێویست بە خوێندنەوەیان ناكات، بێگومان ئەم بۆچوونەیان هەڵەیەو بابەت چەند ئاسان بێت، دەبێت خۆیانی بۆ ئامادە بكەن و پێش تاقیكردنەوە بیخوێننەوە، بەڵگەش لەم بارەیەوە زۆرەو لاپەڕەكانی مێژووش پڕن لەناوی ئەو بلیمەت و زانایانەی كە لە قۆناغەكانی خوێندن دەرنەچوون یان تووشی گرفت بوون.

٣) منداڵی بلیمەت و بەهرەمەند زۆر پرسیار دەكات و دیاردەكان تاووتوێ دەكات، بەلام بەداخەوە زۆر لە مامۆستایان و باوكان و دایكان زوو لەو هەموو پرسیاركردنەیان وەڕس دەبن و دوورنیە بیان شكێننەوەو تەریقیان بكەنەوە یان سەرزەنشتیان بكەن كە ئەوەش دەبێتە هۆی دڵتەنگی و خەم و خەفەت و بێزاركردنی ئەو منداڵە زیرەك و بلیمەتانەو دوور نییە لە ئە نجامدا فێری زۆر ڕەفتارو هەڵس و كەوتی نابەجێ بن، ئینجا ئەگەر بمانەوێت منداڵە بلیمەت و بەهرەمەندەكانمان لەو گرفت و ڕەفتارە نابەجێیانە دووربن، ئەوا زۆر گرنگە كە قوتابخانەو دامەزراوی تایبەتیان بۆ بكرێتەوەو ژینگەو بارودۆخی گونجاو بۆ تەقاندنەوەو پەروەردەكردنی بەهرەو تواناكانیان برەخسێنرێت، بۆ ئەوەی ئێمەش لە داهاتوودا وەك زۆربەی وڵاتانی جیهان كەسانی داهێنەرو زاناو ناودارمان هەبێت و خزمەتی وڵاتەكەیان بكەن.

## گەشە پێكردنی چەمكەكان لە قۆناغی باخچەی ساوایان

چەمكەكان (المفاهیم) و فێربوونیان گرنگی خۆیان لە ژیانی منداڵدا هەیەو دەبن بە یارمەتیدەر بۆ گەشەكردنی عەقڵیان، لەبەرئەوە ئەركی هەموو لایەكە بەتایبەتی دایك و باوك و مامۆستا كە هەوڵی گەشە پێكردنیان بدەن. قۆناغی پێش چوونە قوتابخانە بە تایبەتی تەمەنی چوار ساڵان و پێنج ساڵان كاتێكی زۆر باشە بۆ گەشە پێكردنی چەمكەكانی وەك (ژمارەكان، بارستایی، كێش، گەورە، بچووك، شێوەكان، بوونەوەرەكان، ئاراستەكان... تاد).

منداڵ لەم قۆناغەدا زۆر حەز بە تاووتوێكردن و مامەڵەكردن و زانینی شتە یەكسان و جیاوازو كۆمەڵەو ژمارەو شێوەو بارستاییە جیاجیاكان دەكات، بەردەوام لەهەوڵی تاقیكردنەوەی شتەكانی چواردەوریدایە، ئینجا زۆر پێویستە ئێمەی گەورە ئەو حەزو ئارەزووی تاووتوێكردن و تاقیكردنەوەی شتەكانی بقۆزینەوەو بۆ فێركردنی چەمكەكان بەكاری بهێنین. بۆ نموونە منداڵ لەم تەمەنەدا حەز دەكات فێری ژمارەكان ببێت و شتەكانی چواردەوری بژمێرێ، كەواتە ئێمە چ لەماڵەوە یان لە باخچەی ساوایان دەتوانین ئەو حەزەی بۆ تێر بكەین و یارمەتی گەشەكردنی بیركاری بدەین. ئەویش لەڕێگەی ڕاهێنانی لەسەر ژماردنی شتەكانی ناوماڵ و باخچەی ساوایان، بۆ نموونە لەبەرچاوی منداڵەكە ژمارەی خوشك و براكانی یان قاپ و قاچاغ و پەرداخ یان كورسی و مێزەكان یان گلۆپەكان، یان یارییەكانی بژمێرەو دواتر داوا لە منداڵەكە بكە ئەویش وەك تۆ یەك لەدوای یەك شتەكانی بژمێرێ. ئەگەر هەڵەی كرد بۆی ڕاست بكەرەوە. باشتر وایە لەیەكەوە هەتا دەی فێر بكرێت، ئەگەر حەزو توانای زیاتری هەبوو، دەتوانرێت ژمارەی زیاتری فێر بكرێت، بەڵام نابێت بەزۆر بەڵكو دەبێت بەئارەزووی منداڵەكە بێت و زۆر لەسەرخۆش بێت.

لەلایەكی ترەوە منداڵ حەز بەزانینی زۆرو كەم و بەش و هەموو نیوەو ... تاد دەكات، كەواتە دایك و باوك و مامۆستا دەتوانن لەڕێگەی چالاكییەكانی ڕۆژانەوە منداڵ فێری ئەو چەمكانە بكەن، بۆ نموونە لەكاتی چا یان شیر یان ناو خواردنەوەدا دەتوانین منداڵ فێری

مانای نیو پەرداخ، نیو پیاڵە یان یەک پیاڵە یان چای زۆر، شیری زۆر، چای کەم، شیری کەم، .. تاد، بکەین کە دووبارەکردنەوەی ئەو چالاکییانە وا لەمنداڵ دەکات کە فێری مانای نیوە یان زۆر یان کەم ببێت. هەروەها دەتوانرێت لەرێگەی لەت و کەرت کردنی نان و پەنیرو سەموون و پرتەقاڵ و سێوو میوەکانی تر، منداڵ فێری مانای (لەت، نیو، چارەك، دوویەش، سێ بەش، وەك یەك، زۆرتر، کەمتر، چواربەش ... تاد)، بکرێت، کە سەرجەم ئەو چالاکییانەو فێربوونی مانای ئەو چەمکانە دەبن بە بنەمایەکی پتەو بۆ گەشە پێکردنی عەقڵی منداڵ و سەرکەوتنی لەبواری بیرکاری و خوێندن و فێربووندا.

هەروەها لەرێگەی بەکارهێنانی ڕاستەو مەترو بست و پێوە، دەتوانرێت منداڵ فێری پێوانە کردنی شتەکان بکرێت. بۆ نموونە، دەتوانین لەبەرچاوی منداڵ بە پێ یان بە دەست یان بە ڕاستە یان بە مەتر کاشی و دیوارو بەرزی و نزمی کورسی و ڕاخەرو باخچەی ناوماڵ یان باخچەی ساوایان بپێوین ودواتر داوا لەمنداڵ بکەین کە ئەویش وەك ئێمە دووری و بەرزی و نزمی ئەو شتانە پێوانە بکات. کە بێگومان لەرێگەی ئەو چالاکیانەشەوە فێری مانای پێوانەکردنی (دووری، بەرزی، نزمی، لایەك، دوولا، سێ لا، چوار لا، ئەستووری) دەبێت، کە ئەو چالاکییانەش دەبنە هۆی زیاتر گەشەکردنی عەقڵی منداڵ.

منداڵ هەر لەم قۆناغەدا توانای فێربوونی مانای (زۆر، کەم، گەورەتر، بچووکتر، زۆرتر، کەمتر)ی هەیە. لەبەرئەوە دەبێت لەرێگای چالاکییەکانی وەك (ناوکردنە ناو پەرداخ یان پیاڵە یان قاپ و قاچاغ، یان لم و خۆڵ کردنە ناو سەتڵ و قاپ)، منداڵ فێری مانای زۆر وکەم و زۆرتر و کەمتر بکەین. بۆ نموونە دەتوانین منداڵ فێری ئەوە بکەین کە پەرداخ لە پیاڵە ئاو زیاتر دەگرێت، لە پیاڵەش گەورەترە، سەتڵ لە قاپ ئاو زیاتر دەگرێت و لەویش گەورەترە، قاپی گەورە لە قاپی بچکۆلە ئاو زیاتر دەگرێ ... تاد.

قۆناغی پێش قوتابخانە کاتێکی لەبارو گونجاوە بۆ فێربوونی چەمکی (کێش) (وزن) دەتوانین لەرێگەی هەڵگرتن، گواستنەوەو بەرزکردنەوەو دانانی شتەکانی ناوماڵ و باخچەی ساوایان منداڵ فێری مانای (قورس، سووك، سووکتر، یەکسان) بکەین، هەروەها

زۆرباشە ئەگەر لەڕێگەی پارەی ڕۆژانەو کڕین و فرۆشتنی سەوزەو میوەو کەل و پەلەکانی ناومانەوە، منداڵ فێری مانای پارەو نرخی (٥٠دینار، ٢٥٠ دینار، ١٠٠٠ دینار ... تاد) بکەین.

قۆناغی منداڵی، مانای قۆناغی یاریکردن و هەڵبەزو دابەزو سەربەستیە، واتە دەتوانرێت لەڕێگەی یاریکردن و هەڵبەزو دابەزەوە منداڵ لەم قۆناغەدا فێری زۆر چەمك بکرێت. کەواتە ئەرکی سەرەکی دایك و باوك و مامۆستایە کە لەناو خێزان و باخچەی ساوایان بواری گونجاو بۆ یاریکردنی منداڵ بڕەخسێنن، بۆ ئەوەی لەڕێگەیەوە فێری مانای چەمکەکان ببێت. بۆ نموونە ئەگەر لەناو ماڵ یان باخچەی ساوایان حەوزی ئاوی دروستکراو لە چیمەنتۆ یان پلاستیك هەبێت و منداڵ تاقیکردنەوەو یاری پێبکات، ئەوا مانای زۆر لە چەمکەکان فێر دەبێت. کاتێك منداڵ یاری بەئاو دەکات، فێری خاسیەت و سوودو قازانجەکانی ئاو دەبێت، فێری ئەوە دەبێت کە هەندێك شتی وەك (تەختە، کاغەز) سەر ئاو دەکەون، بەلاّم هەندێك شتی وەك (ئاسن، بەرد، ... تاد) ژێر وئاو دەکەون هەروەها فێری ئەوە دەبێت کە شت لەناو ئاو سووك دەبێت یان لەڕێگەی ماتۆڕو پەمپەوە، ئاو بۆ بەرزی فڕێ دەدرێت.

کاتێك منداڵ بەکاغەز کۆلارە یان فڕۆکەیەك دروست دەکات و بۆ ئاسمان هەڵیدەدات و یاری پێدەکات. دەگاتە ئەو بڕوایەی کە هەوا شتەکان دەجووڵێنێ، یان کاتێك بەسووکی هەناسە دەدات یان بۆ ماوەیەکی کەم هەناسە نادات، ئەو کاتە گرنگی هەوای بۆ ژیانی مرۆڤ بۆ ڕوون دەبێتەوە. سەرەڕای ئەوەش کاتێك منداڵ یاری بە سەیارەو پانکەو گڵۆپی منداڵان دەکات و پاتری بۆ کارکردنیان بەکار دەهێنێ، فێری مانای گرنگی پاتری و کارەبا بۆ جووڵاندن و گەرم کردن و ڕووناککردنەوەی شتەکان دەبێت.

کەواتە کاتێك منداڵ یاری بەقاپ و قاچاغ و بۆری و یارییە پلاستیکیەکانی ناوماڵ دەکات، شارەزاییی زۆر دەربارەی (نەرم، ڕەق، ئەستوور، باریك، تەنك، گەرم، سارد، زۆر، کەم، قورس، سووك، نزم، بەرز، قووڵ ... تاد) پەیدا دەکات. کە سەرجەم ئەو زانیاری و

شارەزاییانە بۆ ژیانی داهاتووی و سەركەوتنی لەبواری خوێندن و فێربووندا پێویستن. بۆ نموونە كاتێك جۆرەها یاری ڕەنگاو ڕەنگ و هەمەشێوە لەبەردەم منداڵ دادەنرێ و منداڵ بەئارەزووی خۆی یارییان پێدەكات، ئەو كاتە لەمیانەی تاوو توێكردن و یاریكردن بەو شتانە فێری مانای چەمكەكانی (سێگۆشە، چوارگۆشە، بازنە، لاتەریب، ڕەنگەكان، لوولەك، درێژ، كورت، ... تاد) دەبێت و سەرجەم ئەو زانیاریانە دەبن بە بنەمایەكی پتەو بۆ سەركەوتن لەبواری بیركاری و ئەندازەو جەبر لە قۆناغەكانی خوێندندا.

ب لەبەرئەوە زۆر گرنگە كە سوود لە قۆناغی پێش چوونە قوتابخانە وەربگرین و پێداویستی و یارییە گرنگەكان بۆ منداڵەكانمان دابین بكەین و لەسەر یاریكردن و تاووتوێكردنیان هانیان بدەین و لە هەمان كاتیشدا دەبێت ئەو دیاردەو چەمكانەیان بۆ ڕوون بكەینەوەو بەپێی تواناش وەڵامی پرسیارەكانیان بدەینەوە. دەرئەنجامی زۆر لەتوێژینەوەكانی ئەم بوارەش ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە بەردەوام (ئەو منداڵانەی لەو خێزان و باخچەی ساوایانەوە دێن كە پێش هاتنە قوتابخانە بە باشی پەروەردەكراون و جۆرەها یاری و كەل و پەلیان بۆ دابین كراوەو بەردەوام وەڵامی پرسیارەكانیان دراوەتەوە) زیرەكترو بەتواناترن لەو منداڵانەی كە بەو شێوەیە پەروەردە نەكراون.

كەواتە دایك و باوك و مامۆستای بەڕێز، بەردەوام هەوڵبدە، بەپێی توانا یاری و كەل و پەلی و پێداویستیە گرنگەكانی تر بۆ منداڵەكانتان دابین بكەن و ژینگە دەوروبەرەكەیان بەو كەل و پەلانە دەوڵەمەند بكەن و گەشە بەهەستەوەرەكانی (بینین، بیستن، بۆنكردن، تام و چێژكردن، دەست لێدان)ی منداڵەكانتان بكەن، سەربەستی پێویستیان بدەنێ و لەسەر شكاندنی یارییەكان لێیان مەدەن و سووكایەتیان پێ مەكەن، لەبەرئەوەی سەربەستی و هەست كردن بە ئاسایش و دڵنیایی و ڕێزگرتن و بڕوا بەخۆ بوون باشترین فاكتەرن بۆ گەشەكردنی عەقلی و داهێنان لەبوارە جیاجیاكانی ژیان، هەروەها دەبێت هاوكاری و پەیوەندییەكی بەتین لەنێوان باخچەی ساوایان و خێزاندا هەبێت، هەریەكەیان كاری ئەویتر تەواو بكات، بەڵام ئەگەر بوار نەبوو منداڵ بنێردرێتە باخچەی

ساوایان ئەوا زۆر پێویستە دایك و باوك هەوڵبدەن هەندێك لەویاری و کەل و پەل و چالاکییە گرنگانە بۆ منداڵەکانیان دابین بکەن، بۆئەوەی بەباشی سوود لە قۆناغی پێش چوونە قوتابخانە وەربگرێت و ببێت بە بناغە بۆ قۆناغەکانی تر.

## شەڕو ناخۆشی مندالان

ڕۆژانە گوێبیستی شەڕو ئاژاوەی مندالان دەبین و بەداخەوە هەندێك جار ناخۆشی نێوان مندالان دەبێت بە شەڕی گەورەکان. ئێمەی گەورە پێویستە چەند ڕاستیەك هەیە بیزانین، ئەویش ئەوەیە کە جیهانی مندالان جیهانێکی پاك و بێگەردەو دوورە لە هەموو ڕق و کینەو دڵپیسی و دوو ڕوویی گەورەکان و ئەگەر شەڕیش بکەن ئەوە کاتییەو پاش ماوەیەکی زۆر کەم کۆتایی دێت و منداڵەکان هەموو شتێکیان بیر دەچێتەوەو دووبارە دەچنەوە لای یەکتری، وەك ئەوەی هیچ شتێك ڕووی نەدابێت، لەلایەکی تریشەوە هەموو گیان و جەستەی منداڵ جووڵەو چالاکییەو پێویستی بە هەڵبەزو دابەزو ڕاکردن هەیە، کە لەئەنجامی ئەو هەڵبەزو چالاکیانەوە مندالان بەریەکتری دەکەون و بەربەست و ڕێگر بۆ یەکتری دروست دەکەن کە ئەمەش دەبێتە هۆی دڵزیزکردن و پێکدادان.

هەروەها منداڵ (بەتایبەتیش بچووکەکان) خۆپەرستەو خەوو خەیاڵی تەنها تێرکردنی حەزوو ئارەزووەکانیەتی و گەرەکیەتی کە هەموو شتێك بۆ خۆی بێت و بەشی هیچ کەسی تری لێنەدات. لەلایەکی تریشەوە لە ئەنجامی ئاڵۆز بوونی ژیان و قەرەباڵغی شارەکان ڕووبەری باخچەو شوێنە گشتیەکان کەم بوونەتەوە و تەنانەت حەوشەو ژمارەی ژووری ماڵەکانیش زۆر بچووك بوونەتەوە کە ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە مندالان زیاتر لە جاران بەریەك بکەون و بەکۆمەڵ یاری بکەن، بێگومان لە ئەنجامی ئەوەشەوە ڕووبەڕووی یەکتری دەبنەوەو کێشمەو بگرەو بەردەی زۆر بۆ یەکتری دروست دەکەن.

ژمارەی مندالانی زۆربەی خێزانەکانیش لە شارو شوێنە قەرەباڵغەکان بەرەو کەمی دەڕۆن ئەگەر بەراورد بکرێن بە خێزانی دەیەها ساڵ پێش ئێستا. زۆربەی خێزانەکانی ئێستاش بە تەنها دەژین و وەك جاران لەگەڵ باپیرو نەنك و خاڵ و مام و خزم و کەس

نازین، كە ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی ئەو دووسیٚ منداڵەی ناو یەك خیٚزان زوو زوو ڕووبەڕووی یەكتری ببنەوەو ڕق و كینەی خۆیان بە یەكتری بڕیٚژن بە پیٚچەوانەی جاران كە ژمارەی منداڵان زۆر بوون و بواری خاڵی كردنەوەی ڕق و كینەكان بەرفراوانتر بوو بەسەر زۆربەی منداڵاندا دابەش دەبوون و بە كەمی ئاڕاستەی یەك منداڵ دەكرا. هەروەها ئیٚستا كەل وپەل و پیٚداویستی منداڵان زیاتر بووەو هەریەكەی چەند یاری و جۆرە كەل و پەلیكی پیٚیەو دەبیٚتە هۆی ووروژاندنی حەزوو ئارەزووی منداڵانی ترو جوڵاندنی پاڵنەری مولكداری و خۆپەرستی و دوا جاریش بەریەك كەوتن و پەلاماردانی كەل و پەلی یەكتری، نابیٚت ئەوەشمان لەیاد بچیٚت كە منداڵانی ئەمڕۆ زیاتر لە منداڵانی جاران ڕووبەڕووی گیروگرفت و كەمی سەربەستی كۆمەڵایەتی دەبنەوە.

كەواتە لە ئەنجامی ئەو هۆكارانەی سەرەوە زۆرجار منداڵانی گەڕەك و دراوسیٚ و یەك جیٚگا لەگەڵ یەكتریدا تیٚك دەچن و دەبیٚت بەشەڕیان، هەتا ئیٚرە كارەكە ئاساییە و لەگەڵ جیهانی منداڵدا گونجاوە، بەلاّم ئەوەی ئاسایی نییە، ئەوەیە كە هەندیٚك جار گەورەكان تیٚكەڵ بە ناخۆشی منداڵان دەبن و ئەوانیش دەبن بە لایەنیٚك و كیٚشەكە گەورەو ئاڵۆز دەكەن.

ئینجا ئەگەر بمانەویٚت ناخۆشی و دەنگە دەنگی منداڵان لە سنووری ئاسایی خۆیاندا بن، ئەوە نابیٚت بە هیچ شیٚوەیەك گەورەكان لەسەر منداڵان بكەنەوەو دەنگە دەنگ لەگەڵ دایك و باوك و منداڵەكانی تر بكەن بەڵكو باشترین ڕیٚگا چارە ئەوەیە كە ڕیٚنمایی و ئامۆژگاری منداڵان بكریٚت و شویٚنی گونجاو بۆ چالاكی و یارییەكان دابین بكریٚت و بە هاوكاری دایك و باوكەكانی تر هەوڵی چارەسەری گیرو گرفتەكانیان بدەن.

بەهەمان شیٚوە منداڵانی یەك خیٚزان كە خوشك و برای یەكترین زوو زوو لەگەڵ یەكتریدا شەڕیان دەبیٚت. ئەمە مانای ئەوە نیە كە ڕقیان لەیەكترییە، بەڵكو لە ئەنجامی ململانیٚ و بەریەك كەوتن و حەزكردن بە دەست بەسەرداگرتنی كەل و پەلەكانی خوشك یان براكەیدا دروست دەبیٚت و دوای ماوەیەك نامیٚنیٚ، بەلاّم بەداخەوە هەندیٚك دایك و باوك

بابەتەکە گەورە دەکەن و وادەزانن تەنها منداڵانی ئەوان شەڕخوازن و دوورنییە بکەونە گیانی منداڵەکانیان (بەتایبەتیش گەورەکان)و بێ بەزەییانە ئازاریان بدەن، باشترین ڕێگاچارە ئەوەیە کە هەوڵی زانینی هۆی ئەو شەڕکردنەیان بدەن و دواتریش چارەسەری بکەن و پێویستە ئەوەش بزانن کە هەموو منداڵان شەڕو هات و هاوار دەکەن و کارێکی ئاساییەو دوای ماوەیەك کە گەورە دەبن بەرەو نەمان دەچن و لەو شەڕو پێکدادانانە ڕزگاریان دەبێت.

## منداڵانی یەك خێزانیش شەڕ دەکەن

شەڕو ئاژاوەی منداڵان کارێکی ئاساییەو خێزان نییە منداڵەکانی شەڕ لەگەڵ یەکتریدا نەکەن، چونکە لەناو خۆیاندا کێ بڕکێی یەکتری و غیرە دەکەن و دواجاریش بەیەکتریدا دەکێشن و دوای ماوەیەك ئاشت دەبنەوەو دەگەڕێنەوە دۆخی یەکە مجار، پاش کەمێك یاری و پێکەوە کارکردن دووبارە دەکەونەوە سەرو گوێلاکی یەکتری و دواتریش ئاشت دەبنەوە. بەم شێوەیە ئەم سوڕی یاری کردن و شەڕ کردن و ئاشت بوونەوەو دووبارە یاری کردن و شەڕکردن و ئاشتبوونەوە لەهەموو خێزانێکدا هەیەو نابێت دایك و باوك بەسەرەڕۆیی و بەدڕەوشتیان لەقەڵەم بدەن، لەبەرئەوەی بەشێکن لەسروشت و جیهانی منداڵان.

لەناو هەموو خێزانێکدا منداڵە گەورەکان هەوڵدەدەن خۆیان بەسەر منداڵە بچووکەکان و کوڕەکان خۆیان بەسەر کچەکاندا بسەپێنن، هەروەها منداڵە زیرەك و سەرکەوتووەکان گاڵتە بەمنداڵە تەمبەڵ و سەرنەکەوتووەکان دەکەن، هەندێك جاریش منداڵەکان لەناو خۆیاندا ناوو ناتۆرەو قسەی ناشیرین بۆ یەکتری دەدۆزنەوەو باسی باڵاو دەم و چاوو پرچ و قەڵەوی و لاوازی یەکتری دەکەن و دواجار دەبێت بەناخۆشیان. زۆرجاریش دایك و باوك خۆیان بەرپرسیارن لەدروست کردنی شەڕو ئاژاوەی نێوان منداڵەکان، بۆ نموونە گرنگی بە یەکێك لە منداڵەکانیان دەدەن و ئازدار بەخێوی دەکەن و منداڵەکانی تریان پشت گوێ دەخەن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە منداڵەکانی تر

ڕقیان لەو ئازارە بێت و بەهەموویان گەلە كۆمەكی لێبكەن و داخی دڵی خۆیانی پێبڕێژن. بەڵام ئەگەر ئەو دایك و باوكە بەیەك چاو سەیری هەموو منداڵەكانیان بكردایە ئەو كاتەش ئەو جۆرە ڕق و كینەیە لەنێوان منداڵەكانیاندا دروست نەدەبوو.

ڕاستیەكی تریش هەیە پێویستە هەموومان بیزانین ئەویش ئەوەیە كە شەڕو ناخۆشی منداڵان فاكتەرێكی گرنگە بۆ سەلماندنی خودو كۆنترۆڵ كردنی دیاردەكانی ژیان و زانینی ماف و ئەرك و پێداویستیەكانی كەسانی تر، واتە منداڵ لەڕێگەی شەڕكردن و زەوت كردنی یاری و كەل و پەلی منداڵانی ترەوە فێری مانای یەكسانی و دادوەری و ڕێزگرتنی مافی كەسانی تر دەبێت و دایكان و باوكان و مامۆستایان دەتوانن ئەو شەڕو ناخۆشیانەی نێوان منداڵەكان بقۆزنەوەو لەمیانەیانەوە منداڵەكانیان پەروەردە بكەن و ئەوەیان بۆ ڕوون بكەنەوە كە هەندێك شت مافی ئەو نییە و موڵكی كەسانی ترەو نابێت دەست درێژی بكرێتە سەریان، هەروەها چۆن ئەو پێی ناخۆشە كە قسەی پێبگوترێ و دەست درێژی بكرێتە سەری بەو شێوەیەش كەسانی تر پێیان ناخۆشە كە دەست درێژی بكرێتە سەریان و ئازاریان بدرێت.

هەروەها زۆر گرنگە كە دایكان و باوكان بەشەڕو ناخۆشی نێوان منداڵەكانیان هەڵنەچن و داخی دڵی خۆیان بە منداڵەكان نەڕێژن. لەبەرئەوەی زۆرجار شەڕو ئاژاوەی نێوان منداڵەكان دەبنە هۆی وەڕس كردنی دایك و باوك و خەو لێزڕانیان. واتە لێدان و سوكایەتی پێكردنی منداڵەكان لەسەر شەڕ كردنیان قورەكە زیاتر خەست دەكاتەوە، بەڵكو لەجیاتی ئەوە دەبێت بەدوای فاكتەرو پاڵنەری سەرەكی ئەو شەڕو ناخۆشیانەیاندا بگەڕێن و چارەسەری گونجاویان بۆ بدۆزنەوە، چونكە هەندێك جار شەڕو ناخۆشیەكان لەسنووری ئاسایی خۆیان دەردەچن و بەڵگەن بۆئەوەی ئەو جۆرە منداڵانە لەسۆزو خۆشەویستی بێبەشن یان هەست بە كەمی دەكەن یان هەست بە چەوساندنەوەو ناهەقی دەكەن و لەئەنجامیەوە ئەو شەڕو ئاژاوانە دەكەن. تەنها ڕێگەش بۆ نەهێشتنی ئەو شەڕو ئاژاوانە تێركردنی پێداویستیە دەروونیەكانی منداڵەكانە لەپێشەوەی هەموویان (خۆشەویستی و هەست كردن بەدڵنیاییە).

## منداڵی لاسارو سەرەڕۆ كێیە؟

لەڕاستیدا جیاكردنەوەی منداڵی ئاسایی لە منداڵی نا ئاسایی كارێكی ئاسان نییە. لەبەر ئەوەی تاوەكو ئێستا هێڵ و سنوورێكی دیاریكراوو ئاشكرا لە نێوان ئەو دوو جۆرە منداڵەدا نین، سەرەڕای ئەوەش پێوەرو كۆمەڵێك نیشانەو مەرجی تایبەتی باوەڕپێكراو بۆ ناسین و دەست نیشانكردنی منداڵی لاسارو سەرەڕۆ نین، چونكە زۆربەی ئەو ڕەوشت و هەڵس و كەوتانەی كە لەلای منداڵی نا ئاسایی هەن لەلای منداڵی ئاسایش هەن. واتە جیاوازی لەبڕو ڕێژەی ئەو هەڵس و كەوت و و خاسیەتانەیە نەك جۆری. ئینجا لەبەرئەوە كارێكی ئاسان نییە كە سنوورو هێڵێكی دیاریكراو لە نێوان ئەو دوو جۆرە منداڵەدا بكێشرێ، لەبەرئەوەی تاوەكو ئێستا خاڵێكی دیاری كراو وەك پێوەر بۆنەوەی ئەگەر منداڵ لەو خاڵە لایدا ئیتر ڕەوشت و هەڵس و كەوتەكانی دەكەوێتە خانەی منداڵی نا ئاسایی، نییە.

لەهەمان كاتدا گرفتێكی تر ڕووبەڕووی دەروونزان و پەروەردیاران دەبێتەوە ئەویش ئەوەیە زۆرجار هەڵس و كەوت و سەرەڕۆیی منداڵ ڕەنگ دانەوەی ئەو ژینگەو بارودۆخە خراپەیە كە تیایدا دەژی، واتە كەم و كورتی و نوقستانییەكە بۆ باوك و دایك و مامۆستاو كەسانی تری چواردەوری منداڵ دەگەڕێنەوەو ئەوان ئاسایی نین و جۆری مامەڵەو پەروەردەكەیان هەڵەیە، بۆیە منداڵ بەو شێوەیە هەڵس و كەوت دەكات، هەر لەبەرئەوەشە هەندێك لە زانایان لەوباوەڕەدان كە دایك و باوك و مامۆستاو كۆمەڵگای نەخۆش و لاسارو سەرەڕۆ هەن نەك منداڵی نەخۆش و لاسارو سەرەڕۆ. سەرەڕای ئەو فاكتەرو گرفتانەی سەرەوەش، تا ڕادەیەك لەڕێگەی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەتوانرێت دەست نیشانی منداڵی لاسارو سەرەڕۆ بكرێت:-

١) كاتێك جۆری پەروەردەكردن لەسەر بنەمای ڕاست و دروست دەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك منداڵ وەڵامدانەوەی پێویستیان بۆئەو جۆرە پەروەردەیە نابێت و بە

پێچەوانەوە ڕێگای چەوت و نادروست دەگرن (درۆ، دزی، سەرەڕۆیی، شەڕخوازی... تاد) ئەو کاتە تا ڕادەیەك دەتوانرێت بەو جۆرە منداڵانە بگوترێت منداڵانی لاسارو سەرەڕۆ.

٢) هەندێك منداڵ هەر لە منداڵیەوە هەندێك ڕەوشت و خاسیەتی دیاریکراو دەبن بە بەشێك لە کەسایەتی و باری دەروونیان و بەردەوام گیروگرفت بۆ خۆیان و دەوروبەریان دروست دەکەن، ئالەم کاتەشدا بەو جۆرە منداڵانە دەگوترێ منداڵانی لاسارو سەرەڕۆ، بۆنموونە هەر لەمنداڵیەوە بەبەردەوامی خۆیان لە قوتابخانە دەدزنەوەو حەز لەخوێندن ناکەن و ئازاری کەسانی تر دەدەن و هیچ ئیش و کارێکی پێویست ناکەن و زۆربەی کات پشت بەکەسانی تر دەبەستن و پیس و چەپەڵ و کەمتەرخەمن و لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانیان سەرکەوتوو نابن و زۆرجار هەڵەدەکەن و دوای هەڵەکانیشیان پەشیمان نابنەوەو چەندجاری تریش دووبارەیان دەکەنەوە.

٣). پێویستە ئەو لاساری و سەرەڕۆییەی لەئەنجامی هۆکاری بۆماوەیی و کەم و کورتی عەقڵیەوە نەبێت، واتە هەندێك منداڵ دواکەوتنی ژیرییان هەیەو هەر لە منداڵیەوە بیرکۆڵن، ئەو بیرکۆڵیە وایان لێدەکات کە هەندێك هەڵس و کەوتی نابەجێ و هەڵە بکەن، ئەوەك بە ئیرادەو ویستی خۆیان پەنای بۆ بەرن.

هۆکارەکانی لاساری و سەرەڕۆیی منداڵ

زۆربەی زانایان لەسەرئەوەن کۆکن کە هۆکاری ژینگەیی (پەروەردەی هەڵە، نەبوونی و هەژاری) توندوتیژی دایك و باوك و مامۆستا تێك چوونی شیرازەی خێزان... تاد)پاڵنەری سەرەکی لاساریی و سەرەڕۆیی زۆربەی منداڵانن. بەشێوەیەکی گشتی ئەم خاڵانەی خوارەوە بەگرنگترین هۆکارەکانی لاساری و سەرەڕۆیی منداڵ دادەنرێن.

## هەست کردن بەکەمی :-

هەندێك منداڵ لەئەنجامی ( پەروەردەی هەڵەو جیاوازی کردن و نەبوونی دادوەری لە مامەڵەداو لێدان و سوکایەتی پێکردنی ) تووشی هەست کردن بەکەمی دەبێت، ئینجا ئەو هەست کردن بەکەمیە دەبێت بە فاکتەری سەرەکی و پاڵنەر بۆ کردنی هەندێك کاروچالاکی سەرەڕۆیی، بەمەبەستی پڕکردنەوەی ئەو هەست کردن بەکەمیە.

## تۆڵە سەندنەوە:-

هەرچ کاتێك منداڵ ئەو هەست و سۆزەی لەلا دروست بوو کە کەسێکی بێزراو پشتگوێ خراوەو مافەکانی پێشێل کراوە، ئەو کاتە دوورنییە کە پەنا بۆ لاساری و سەرەڕۆیی ببات بۆئەوەی بە هەرچ شێوەیەك بێت تۆڵەی خۆی بکاتەوەو زیان بەو کەسانە بگەیەنێ کە ئازاریان پێ گەیاندووە. ئینجا ئەگەر نەیتوانی ڕاستەوخۆ ئەو ڕق و کینەو توڕەییەی ئاڕاستەی ئەو کەس و لایەنانە بکات کە تووشی ئەو ئازارو بێبەش بوونەیان کردووە، ئەو کاتە ئاراستەی دام و دەزگاو تاکەکانی کۆمەڵی دەکات و تۆڵەی خۆی لە ئەوان دەکاتەوە.

## هەست کردن بە ترس و نائارامی :-

جاری واهەیە منداڵ لەئەنجامی ترس و نائارامی و دڵەڕاوکێوە پەنا بۆ بەکارهێنانی هێزو پاڵەوانبازی و لاساری و سەرەڕۆیی دەبات. بۆئەوەی ئەولاساری و سەرەڕۆییەی بێت بە ڕووپۆش و پەردە بۆشاردنەوەی ئەو ترس و نائارامیەی.

## نەبوونی پلەو پایەو گرنگی :-

ئەگەر بێت و خێزان و قوتابخانە و دام ودەزگا کۆمەلایەتیەکانی تر، نەتوانن ژینگەی گونجاوو لەبار بۆ منداڵ بخوڵقێنن و منداڵ هەستی بە گرنگی و بوونی خۆی

نەکرد، ئەوا دوورنیە کە هەوڵبدات بەڕێگەی نائاسایی و سەرەڕۆیی (دزی، پاڵەوانبازی و هەڕەشە و لێدان) پلەو پایەو گرنگی بۆ خۆی دروست بکات و سەرنجی هاوڕێ و منداڵان و کەسانی تر بۆلای خۆی ڕابکێشێ.

دەست نەکەوتنی تام و چێژوخۆشی:-

منداڵ دەبێت لەڕێگەی یاریکردن و چالاکی و ڕێزگرتن و خۆشەویستی دایک و باوک و مامۆستاوە هەست بەتام و چێژو خۆشی ژیان بکات، بەلاّم ئەگەر لەڕێگەی ئاسایی سروشتیەوە ئەو تام و چێژو خۆشیەی دەست نەکەوت، ئەوا دوورنییە کە پەنا بۆ شێوازو ڕەوشتی نائاسایی ببات و لەڕێگەیانەوە هەست بە تام و چێژو خۆشی بکات.

ئینجا ئەگەر بمانەوێت منداڵەکانمان تووشی سەرەڕۆیی ولاساری نەبن. ئەوا زۆر پێویستە ڕەچاوی ئەو خاڵ وڕاستیانەی سەرەوە بکەین و پێداویستیە گرنگەکانی منداڵ دابین بکەین.

## شەڕخوازی منداڵان

لەو ڕۆژەوەی مرۆڤایەتی و بوونەوەر سەری هەڵداوە، شەڕخوازی و توندوتیژیش وەك دیاردەیەکی (دەروونی - کۆمەڵایەتی) هاوشانی بووەو وەك سێبەر لەگەڵیدا بووەو لەهیچ قۆناغ و سەردەمێکدا لێی جیانەبۆتەوە واتە گیانی توندوتیژی و شەڕخوازی بەشێکە لە سروشتی مرۆڤایەتی و وەك ئامادە باشیەك هەر لەکاتی لەدایك بوونەوە لەتەکیایەتی و هەتا هەتایە لەناخیدا دەمێنێتەوە، بەڵام مەرج نییە ئەو ئامادە باشیە لەهەڵس و کەوتی شەڕخوازانەدا بەرجەستە ببێت چونکە پێداویستی بە ژینگەو بارودۆخی گونجاو هەیە بۆ دەرکەوتن و گەشەکردنی.

توندوتیژی و سەرەڕۆیی بەرێژەیەکی گونجاو پێویستە بۆ مرۆڤ، چونکە لەرێگەیەوە مرۆڤ دەتوانێت بەسەر دیاردەکانی ژیاندا زاڵ بێت و خۆی لەگەڵیاندا بگونجێنێت و پارێزگاری لەخودی خۆی بکات، هەر ئەو توندوتیژی و سەرەڕۆییەی مرۆڤە کە بۆتە هۆی زاڵ بوون بەسەر ژینگەی سروشتی و دروست کردنی ڕێگەوبان و تونێل و دەستەمۆکردنی زۆر ئاژەڵی کێوی و کۆنترۆڵ کردنی لافاوو دیاردە سروشتیەکانی تر، بەڵام کاتێك توندوتیژی لەسنووری ئاسایی خۆی دەردەچێت و بەردەوام دووبارە دەبێتەوەو زیان بە کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی دەگەیەنێت، ئەو کاتە دەبێت بە دیاردەیەکی دزێوو ناکۆمەڵایەتی و پێویستی بە چارەسەر کردن دەبێت.

**پێناسە:-**

مەبەست لە شەڕخوازی (العدوان) (aggression) ئەو هەڵس و کەوت و بیرکردنەوانەیە کە بە مەبەستی ئازاردانی (خود) یان (کەسانی تر) و کەل و پەلەکانیان بەکاردەهێنرێت و ئەو کەسەی کە ئەو هەڵس وکەوتە شەڕخوازیە دەکات ئامانجی سەرەکی زیان پێ گەیاندن و تێك شکاندن و کاولکردنە، ئیتر ئەو هەڵس و کەوتە جەستەیی (لێدان، سوتاندن، کوشتن) بێت یان گفتی (جنێوو هەڕەشە) دەکەوێتە خانەی دەست درێژی و شەڕخوازی.

**شێوازەكانی شەڕخوازی:-**

**منداڵی شەڕخواز بە دوو شێوازی سەرەكی گوزارشت لە شەڕخوازییەكەی دەكات كە بریتین لە:-**

**ڕاستەوخۆ:-**

واتە ئەو منداڵە ڕاستەوخۆ توندوتیژی و شەڕخوازییەكەی ئاڕاستەی كەسانی تر دەكات و ئازاریان دەدات ئەویش لەڕێگەی لێدان و جنێودان و هەڕەشە لێكردن و شكاندنی كەل و پەلەكان و سوتاندنیان.

**ناڕاستەوخۆ:-**

منداڵ كاتێك لەبەر هەرچ هۆیەك بێت ئەگەر نەیتوانی ڕاستەوخۆ كینەو شەڕخوازیەكەی ئاڕاستەی ئەو كەسە بكات كە ڕقی لێ یەتی، ئەوا ناچار پەنا بۆ شێوازی ناڕاستەوخۆ دەبات و لەڕێگەی ( دزی كردن، درۆهەڵبەستن، مانگرتن لە خواردن، گۆشەگیری و دوورە پەرێزی ... تاد ) تۆڵەی خۆی لەبەرانبەرەكەی دەكاتەوە. بۆنموونە :- ئەگەر ئازاد ڕقی لە هیوا بێت و توانای ئەوەی هەبێت كە ئازاری بدات، ئەوە ڕاستەوخۆ ئەو ڕق و كینەو توندوتیژیەی خۆی ئاڕاستەی دەكات، ئیتر لەڕێگەی لێدانی هیواوە بێت یان جنێو پێدان و هەڕەشە لێكردنەوە بێت، ئەوا ئازاد ئازاری هیوا دەدات، بەلاَم ئەگەر ئازاد بەهیوای نەوێرا لەبەر ئەوەی لەئەو گەورەتر بوو یان پشت و پەنای هەبوو، ئەوا ئەو كاتە ئازاد بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ لەڕێگەی دزی لێكردن یان درۆ هەڵبەستن یان دووركەوتنەوەو قسە لەگەڵ نەكردنی هیواوە دەیەوێت ئازاری بدات، چونكە بە حیسابی ئازاد ئەگەر شتێكی لە هیوا دزی ئەوا هیوا خەفەت دەخوات و تووشی ئازار دەبێت.

## هۆکارەکانی شەڕخوازی:-

منداڵانی هەموو جیهان هەر لەکاتی لەدایک بوونەوە خاوەنی ئامادەباشی توندوتیژی و شەڕخوازین، بەڵام ژمارەیەکی کەمیان دەبن بە کەسانی شەڕخوازو لاسارو سەرکێش و زۆربەی زۆری منداڵانی تر کەسانی ئاسایی دەبن و نابن بە مرۆڤی شەڕخواز کەواتە دەبێت کۆمەڵێک هۆکاری کۆمەڵایەتی و ئابووری و دەروونی و جەستەیی هەبن کەوا لەو منداڵانە دەکەن ببن بەکەسانی لاسارو سەرکێش و شەڕخواز. دەرئەنجامی زۆربەی توێژینەوەکانی ئەم بوارە ئاماژە بۆ ئەم هۆکارانەی خوارەوە دەکەن کە دەبنە هۆی دروست بوونی هەڵس و کەوتی شەڕخوازانەو گەشە پێکردن و وروژاندنی ئامادەباشی شەڕخوازی:-

### لاساییکردنەوە:-

زۆر لە منداڵان ڕەوشتی شەڕخوازی لەڕێگەی لاسایکردنەوەی هەڵس و کەوتی کەسانی چواردەوریانەوە فێردەبن، واتە کاتێک باوك و دایك و مامۆستا و کەسانی تری چواردەوری منداڵ توندو تیژو لاسارو سەرەڕۆ دەبن و ئازاری کەسانی تر دەدەن، ئەوا دوور نییە کە منداڵەکانیان لاسایی ئەو توندوتیژی و شەڕخوازیەیان بکەنەوەو ئەوانیش وەك گەورەکانیان هەڵس و کەوتیان شەڕخوازانە بێت، هەروەها ئامرازەکانی ڕاگەیاندنیش ڕۆڵی سلبی دەگێڕن لەکاتی پێش کەشکردنی بەرنامەو پرۆگرامی خوێن ڕشتن و شەڕخوازی، چونکە کاریگەری خراپی لەسەرباری دەروونی بینەر دەبێت بەتایبەتیش منداڵ و هەرزەکار، لەهەموو ئامرازەکانی ڕاگەیاندنیش ترسناکتر تەلەفزیۆن و سینەمایە.(Berk, ٢٠٠٣, P:٦٢٠).

### پەروەردەی هەڵە:-

بەکارهێنانی توندوتیژی بەردەوام لەگەڵ منداڵ و لێدان و هەڕەشەلیکردنی لەناو خێزان و قوتابخانەو بەرەلاکردن و لێنەپرسینەوەیان بەخراپترین و هەڵەترین شێوازی

پەروەردە دادەنرێت، بەداخەوە هەندێك لەدایکان وباوکان و مامۆستایان کاتێك منداڵ هەڵەیەك دەکات بەردەوام پەنا بۆ سزاو لێدان و توندوتیژی دەبەن، کە بێگومان ئەم جۆرە مامەڵەیە گیانی ڕق و کینەو شەڕخوازی لەناخی منداڵدا سەوز دەکات، چونکە کاتێك لە منداڵ دەدرێت و بەردەوام ئازار دەدرێت ئەوا تووشی خەم و خەفەت و ئازار دەبێت و بەچاوی سووك سەیری خۆی دەکات و بۆچوونێکی هەڵەی دەربارەی ژیان و کەسانی چواردەوری لەلا دروست دەبێت، ئیتر لەو حاڵەتەدا یان پەنا بۆ تۆڵە سەندنەوە دەبات یان گۆشەگیری و دوورەپەرێزی و خۆخواردنەوە هەڵدەبژێرێ، کە هەردوو ڕێگاکە هەڵەن و زیانی گەورە بە باری دەروونی منداڵ دەگەیەنن، ئینجا مەرج نیە تۆڵە سەندنەوەی منداڵەکە لەو کەسە بێت کە ئازاری داوە، چونکە منداڵ ناتوانێت پەلاماری دایك و باوك و مامۆستا و کەسە گەورەکانی تر بداتەوە لەبەرئەوە بە ناچاری ڕێچکەو ئاراستەی دەست درێژی و شەڕخوازییەکەی دەگۆڕێ و ڕووبەڕووی کەسانی بچووك و بێ دەسەلاتی دەکاتەوە.

بۆ نموونە ئەگەر برای لە خۆی بچووکتری هەبێت ئەوا تۆڵەی خۆی لەو دەکاتەوە بەڵام ئەگەر براو خوشکی بچووکی نەبوو ئەوا لە منداڵانی دراوسێ یان ئاژەڵ و کەل و پەل و باڵندەی بەستەزمان تۆڵەی خۆی دەکاتەوەو داخی دڵی خۆی بە ئەوان دەڕێژێ. هەروەها چاو لێپۆشین و لێنەپرسینەوەی منداڵ و سزانەدانی لەسەر کاری خراپ و سەرکێشی و لاسارییەکانی، دەبێتە هۆی زیادکرنی ڕێژەی هەڵس و کەوتی شەڕخوازی بەڵام ئەگەر منداڵ بزانێت کە لەسەر شەڕخوازی و لاساریەکەی سزا دەدرێت ئەوا ئەو کاتە کەمتر پەنا بۆ توندوتیژی و لاساری دەبات.

<u>هاندان:-</u>

بەداخەوە زۆرجار هەندێك لە دایك و باوکان هانی منداڵەکانیان لەسەر ڕەوشتی شەڕخوازی دەدەن و هەندێك جاریش پاداشتیان دەکەن، بۆنموونە کاتێك منداڵەکەیان لە کۆڵان شەڕ دەکات و ئازاری کەسانی تر دەدات، چاوپۆشی لێدەکەن و گلەیی و سەرزەنشت و

ئامۆژگاری دروستیان ناکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە کاتێك لە کۆڵان منداڵێك لە منداڵەکەی دەدات ئەوا هانی منداڵەکەی خۆی دەدات کە بچێت تۆڵەی خۆی بکاتەوەو دەست درێژی بکاتە سەری لە جیاتی ئەوەی کە ڕێنمایی هەردوو منداڵەکە بکات و ئاشتیان بکاتەوەو لەگەڵ منداڵەکەی تر بە هێمنی چارەسەری ئەو گرفتە بکەن.

بەربەست و ڕێگر:-

منداڵ کۆمەڵێك پێداویستی فسیۆلۆژی و دەروونی و کۆمەڵایەتی گرنگی هەیەو بەردەوام لەڕێگەی چالاکیە جۆراوجۆرەکانیەوە لە هەوڵی تێرکردنیاندایە ئینجا ئەگەر بێت و خێزان و کۆمەڵ و کەسانی تری چواردەوری ڕێگرو بەربەستی لەبەردەمدا دابنێن و نەهێڵن ئامانجەکانی بێتەدی ئەوا ئەو کاتە تووڕە دەبێت و دوورنییە کە پەنا بۆ توندوتیژی و شەڕخوازی ببات، بۆ نموونە کاتێك منداڵ (یاری دەکات یان نان دەخوات یان سەعی دەکات دەیەوێت لەگەڵ هاوڕێکانی بچێتە دەرەوە یان حەز بە کڕینی شتێك دەکات، یان لە ئەنجامی لەدایك بوونی منداڵێکی ترەوە لە سۆزو خۆشەویستی دایك وباوکی بێبەش دەبێت) ئەگەر لەو حاڵەتانەدا ڕێگەی لێ بگیرێ و بەربەست لەبەردەمیدا دابنرێت، ئەوا دوورنییە کە منداڵ پەنا بۆ توندوتیژی و شەڕخوازی ببات بەمەبەستی زاڵ بوون بەسەر ئەو بەربەست و ڕێگرەدا.

هەست کردن بەکەمی:-

هەندێك جار منداڵ لەئەنجامی کەم و کورتی جەستەیی یان عەقڵی لە ئەنجامی پشت گوێ خستن و بێبەش بوون لە سۆزو خۆشەویستی دایك و باوك و کەسانی نزیکی، هەست بەکەمی دەکات، ئا لەم کاتانەدا هەندێك لەو جۆرە منداڵانە پەنا بۆ دەست درێژی کردنە سەر کەسانی تر دەبەن و ئازاریان دەدەن بۆئەوەی لەڕێگەی ئەو هەڵس و کەوتەیانەوە ئەو هەست کردن بەکەمیە قەرەبوو پڕبکەنەوەو سەرنجی کەسانی چواردەور بۆ خۆیان ڕابکێشن.

## خۆپاراستن و چارەسەرکردن:-

وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد توندوتیژی و شەڕخوازی بەشێکە لە سروشتی مرۆڤایەتی و بنەبڕکردنی مەحاڵەو بوونی بەڕێژەیەکی گونجاو هیچ زەرەرو زیانێك بە کەسایەتی و باری دەروونی مرۆڤ ناگەیەنێت، بەلام ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەو هەڵس و کەوتە شەڕخوازییە کە بووە بە بەشێك لە کەسایەتی هەندێك منداڵ و بەردەوام دووبارە دەبێتەوەو زەرەرو زیان بە کەسانی ترو کەل و پەلیان دەگەیەنێت، لەڕاستیدا دوو جۆر دەست درێژی هەیە. جۆری یەکەم ئەوەیە کە ئاڕاستەی کەس و شوێنێکی دیاری کراو دەکرێت و مەبەست و ئامانجی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ نموونە منداڵێك ڕقی لە منداڵێکی ترە و شەڕی پێ دەفرۆشێ و مەبەستی سەرەکی لێدان و ئازاردانیەتی. بەلام جۆری دووهەم ئەوەیە کە هەڕەمەکی (عشوائی)ەو ئاڕاستەو ئامانجێکی دیاری کراوی نییە، بۆنموونە منداڵی شەڕخوازی وا هەیە کە لە کۆڵان و قوتابخانە بەردەوام ڕێگا بە منداڵانی تر دەگرێ و هەرجارەی لە یەکێکیان دەدات و کەل و پەلیان لەناو دەبات و جل و بەرگیان دەدڕێنێ و ئازاریان دەدات، دوای ماوەیەك منداڵێکی تر وای لێ دەکات و دوور نییە زۆر بەشیان نەناسێ و بۆ یەکەم جارە دەیانناسێ، ئەم جۆرە منداڵانە لە جۆری یەکەم زۆر ترسناکترن لەبەرئەوەی هەست بە گوناهو پەشیمان بوونەوە ناکەن و لەئەنجامی خراپی کارەکانیان ناترسن و پەند لە سزاو هەڵەی پێشوویان وەرناگرن ئەم جۆرەیان وەك سەگی هار خەڵکی ئازار دەدەن و بەبێ هۆ پەلاماریان دەدەن و کەسایەتیەکی سایکۆپاسی و دژ بە کۆمەڵیان هەیە و چارەسەرکردنی زۆر زەحمەتە.

<u>ئینجا بۆئەوەی ڕێژەی شەڕخوازی لەلای منداڵەکانمان کەم بکەینەوەو لەزۆر کارەساتی ناخۆش دووریان بخەینەوە ئەوا زۆر پێویستە کە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین:-</u>

١- دەبێت دایك و باوك و مامۆستا و کەسانی چواردەوری منداڵ ئاشتی خوازبن و لە توندوتیژی و شەڕخوازی و ئازاردانی کەسانی تر دووربکەونەوە بۆ ئەوەی نەبن بە نموونەیەکی خراپ و شەڕخواز بۆ لاسایی کردنەوە.

٢- زۆر پێویستە پاڵەوانە شەڕخوازەکانی ناو بەرنامەو فیلم و زنجیرە تەلەفزیۆنیەکان بە سزای یاسایی بگەن و نابێت بە ئاسانی و بێ لێپرسینەوە دەرباز بن، بۆ ئەوەی بینەران (بە تایبەتیش منداڵان و هەرزەکاران) پەندیان لێ وەربگرن و لاساییان نەکەنەوە.

٣- نابێت دایك و باوك و مامۆستا بەردەوام پەنا بۆ توندوتیژی و ئازاردانی منداڵ بەرن یان پشت گوێیان بخەن و چاوپۆشی لە هەڵەو سەرەڕۆییەکانیان بکەن، بەڵکو دەبێت لەسەر کارە چاکەکانیان پاداشت بکرێن و لەسەر شەڕخوازی و لاسارییەکانیان سزاو ئازار بدرێن و کارەخراپەکانیان بۆ ڕوون بکرێتەوەو ئامۆژگاری و ڕێنمایی پێویست بکرێن.

٤- نابێت دایك و باوك و کەسانی نزیکی منداڵ لەسەر شەڕخوازی و لاساری هانبدرێن بەڵکو دەبێت خراپیەکانی لاساری و سەرەڕۆییان بۆ ڕوون بکرێتەوە.

٥- دەبێت منداڵ هەست بە سۆزو خۆشەویستی و دڵسۆزی دایك و باوك و کەسانی چواردەوری بکات، بۆئەوەی هەست بەکەمی نەکات و دوا جاریش بۆ قەرەبوو کردنی ئەو هەست کردن بەکەمیە پەنا بۆ شەڕخوازی و ئازاردانی کەسانی تر نەبات.

٦- پێویستە بواری وەرزش و چالاکیە هونەرییەکان بۆ منداڵ برەخسێندرێت تا لە ڕێگەیانەوە لە ووزەو چالاکیە زیادەکان ڕزگاری بێت، دەرئەنجامی توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە بۆکسێن و پاڵەوانبازی و زۆر چالاکی وەرزشی و هونەری تر دەبنە هۆی خاڵی کردنەوەو کەم کردنەوەی حەزوو ئارەزووی توندوتیژی و شەڕخوازی.

٧- تا دەتوانرێت دەبێت ڕێگرو بەربەستەکانی بەردەم چالاکیەکانی منداڵ کەم بکرێتەوە چونکە منداڵ زۆر حەزی بە یاری و هەڵبەزو دابەزو بە ئاکام گەیاندنی چالاکیەکانیەتی و کەمترین ئازارو بچووکترین بەربەست تووشی توندوتیژی و لاساری دەکات.

## یاخی بوونی منداڵ و هەرزەکار

زۆرجار کێشەی سەرەکی نێوان هەرزەکارو دایك و باوك و مامۆستا لەئەنجامی گوێڕایەڵی نەکردن و یاخی بوونی هەرزەکارەو ناچێتە ژێر ڕکێف و داواکانی دایك و باوك و مامۆستا، ئەمەی پێشەوە بۆچوونی زۆربەی دایك و باوك و مامۆستاکانن، بەڵام ئەگەر لەبەرانبەر ئەواندا گوێ لەڕاوبۆچوونەکانی هەرزەکارو منداڵان بگرین، بێگومان بۆچوونی تریان هەیەو لەو بڕوایەدان زۆربەی جار دایك و باوك و گەورەکانیان خۆیان دەسەپێنن و گوێ لەڕاو بۆچوونەکانیان ناگیرێ و بەچاوی نزم سەیریان دەکەن. لەڕاستیدا هەردوو بۆچوونەکان تاڕادەیەك ڕاستە بەڵام کێشەی سەرەکی ئەوەیە کە لێك تێنەگەیشتنێك لەنێوان ئەو دوو نەوەیەدا هەیەو هەریەکەیان سوورە لەسەر ڕاوبۆچوونی خۆی. واتە زۆرجار دایك و باوك و مامۆستاکان بەچاوی سووك سەیری منداڵ و هەرزەکارەکان دەکەن و دەست دەخەنە ناو کاروباریانەوەو بەباشی وەك پێویست گوێ لەڕاو بۆچوونەکانیان ناگرن (Bee, ۲۰۰۰, P:326).

دەبێت ئێمەی گەورە ئەوە بزانین کە مەرج نیە بەردەوام منداڵەکانمان گوێ ڕایەڵی داواکارییەکانمان بن و ئێمە چیمان بووێت جێبەجێی بکەن لەبەرئەوەی ئەوانیش مرۆڤن و ڕاوبۆچوونی خۆیان هەیە، بەڵام ئەگەر یاخی بوون و گوێ ڕایەڵی نەکردنەکەیان بەردەوام بوو، لەسنووری ئاسایی خۆی دەرچوو ئەوکاتە دەبێت بەڕەفتارێکی نائاسایی دابنێین و بەدوای سەرچاوەو هۆکارەکاندا بگەڕێین.

**جۆرەکانی یاخی بوون:-**

لەڕاستیدا سێ جۆر یاخی بوون هەیەو دەبێت لێکیان جیابکەینەوە کە ئەوانیش ئەمانەی لای خوارەوە:-

**بەرگری نێگەتیڤانە ( المقاومة السلبية ):-**

واتەمنداڵ لەکاتی خۆیداو وەك پێویست بەدەم داواکاری و فەرمانەکانی دایك و باوك و گەورەکانەوە نایەت و ئەگەر بەگوێی گەورەکانیشی بکات ئەوا لەناچاری و بێدەسەڵاتیەو بەدڵ و گیان جێبەجێیان ناکات و زۆر بەگرژی و غەمباری و نابەدڵی وەڵام دەداتەوە، زۆرجار گۆشەگیرو دوورەپەرێز و بەگلەیی و گازەندە دەبێت.

**بەرەنگاربوونەوەی بەرواڵەت:-**

واتە بەئاشکراو ڕووبەڕوو دەڵێت من ئەو کارە ناکەم و جێبەجێی ناکەم، هەروەها دوور نییە منداڵ و هەرزەکار هەڕەشە بکەن و بەخێرایی هەڵبچن و بەرگری لەڕاوبۆچوونەکانیان بکەن و لەسەر نەکردنی کارەکان سوور بن.

**یاخی بوونی پڕ لەرق و کینە:-**

ئەم جۆرە یاخی بوونە بریتیە لەوەی کە منداڵ یان هەرزەکار بە پێچەوانەی ئەوەی داوای لێدەکرێت هەڵس و کەوت دەکات، بۆ نموونە ئەگەر پێی بڵێی بێدەنگ بە، ئەو زیاتر هاوار دەکات، بەڵام ئەگەر پێی بڵێی نان بخۆ ئەو مان لە نان خواردن دەگرێ. ئینجا ئەگەر بێت و منداڵ یاخی بوون بکات بەشێوازێك لەژیانی و زۆربەی جار پەنای بۆ ببات، ئەوا ئەو کاتە بەردەوام ڕووبەڕووی کێشەو گرفت دەبێتەوەو هەموو ڕاوبۆچوون و داواکاریەکانی کەسانی تر ڕەت دەکاتەوە یان لە دژیان دەوەستێت، بۆیە زۆر پێویستە چارەسەر بکرێت ( شیفر، میلمان، ٢٠٠١، ص٤٠٥-٤٠٤ ).

**هۆکارەکان:-**

گومانی تێدانییە کە کۆمەڵێك هۆکار لەدوای ئەو یاخی بوون و سەرەڕۆییەی منداڵ و هەرزەکارەوەیە کەدەتوانین لەم چەند خانەی خوارەوەدا کۆیان بکەینەوە:-

١- کەمتەرخەمی و نەرم و نیانی و لێبوردنی زیاد لە پێویستی هەندێك دایك و باوك تا ئەو ڕادەیەی کە نایانەوێت بە منداڵەکانیان بڵێن (نەء) وامەکە.

٢- خۆسەپاندن و دیکتاتۆریەت و کەڵەگایی هەندێك لەدایکان و باوکان تا ئەو ڕادەیەی کە هەرچیەکیان لەمنداڵەکانیان ویست دەبێت یەکسەر بەبێ گفت و گۆو قسە لەسەر کردن جێبەجێیان بکەن، هەروەها بەردەوام خەریکی گلەیی کردن و گازاندەن و هەردەم بەگومانن و ڕەخنە دەگرن و لەهەڵس و کەوتی منداڵەکانیان ڕازی نین.

٣- ڕاڕایی و دوودڵی دایك و باوك و ڕێك نەکەوتن لەسەر یەك جۆر پەروەردە بۆ ڕەفتاری باش و خراپی منداڵەکانیان، پێوەری تایبەتی و نەگۆڕی خۆیان نییە بۆ ڕەفتاری باش و خراپی منداڵەکانیان هەر لەبەرئەوەشە کە زۆربەی منداڵانی ئەو جۆرە خێزانانە خۆیان بڕیار لەسەر ڕەوایی و ناڕەوایی و باشی و خراپی کارەکان دەدەن.

٤- شەڕو ئاژاوەو ناخۆشیەکانی ناو خێزان کە لەئەنجامی تەڵاق و لێك جیابوونەوە یان ناکۆکی نێوان ژن و مێرد یان کێشەی تایبەتیەوە دروست بوون و دەبنە هۆی ئەوەی کە دایك وباوك بەڕۆڵی سەرەکی خۆیان هەڵنەستن و منداڵەکانیان پشت گوێ بخەن.

٥- منداڵانی داهێنەرو بلیمەت و زیرەك کەمتر لەمنداڵانی تر گوێ ڕایەڵی داواکاری و فەرمانە دەرەکیەکان دەبن و زۆرجار بە پێی عەقڵیەت و مەزاجی خۆیان ڕەفتار دەکەن و سەربەخۆیی و سەرەڕۆییان زیاتر دەبێت.

٦- بێگومان ڕاوبۆچوون و ڕەفتاری دایك و باوکیش کاریگەری خۆی هەیە، بۆ نموونە ئەگەر دایك و باوك و مامۆستا ڕاوبۆچوونیان دەربارەی یاساو فەرمانبەرو پۆلیس و دام و دەزگاکانی میری خراپ بێت و ڕێزیان نەگرن ئەوا بەزۆری منداڵەکانیشیان ڕێزی یاساو فەرمانبەری دام و دەزگاکان ناگرن و جێبەجێیان ناکەن و زۆر بەکەمی ڕێزی گەورەکانیش دەگرن.

ئینجا ئەگەر بمانەوێت منداڵ و هەرزەکارەکانمان ڕێزی یاساو گەورەکان بگرن و گوێڕایەڵی ڕاو بۆچوونەکانمان بن دەبێت ڕەچاوی ئەو خاڵانەی سەرەوە بکەین و لێیان دووربکەوینەوە، واتە دەبێت پەروەردەیەکی ڕاست و دروستمان هەبێت و لەڕاڕایی و کەمتەرخەمی و دیکتاتۆریەت و کەڵەگایی دووربکەوینەوەو پێش هەموو کەس ئێمە ڕێزی یاساو گەورەکان بگرین و ئەرکەکانمان جێبەجێ بکەین و لەشەڕو ئاژاوەو ناخۆشی ناو خێزان دووربکەوینەوە بۆئەوەی منداڵەکانمان بەقسەمان بکەن و یاخی نەبن.

## ڕێگاکانی خۆپاراستن:-

ئەگەر بمانەوێت منداڵەکانمان گوێ ڕایەڵ بن و لەیاخی بوون دووریان بخەینەوە ئەوا دەبێت پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین لەبەرئەوەی باشترین ڕێگان بۆ خۆپاراستن.

### پەیوەندییەکی پتەوو بەهێز لەگەڵ منداڵەکەت دابنێ:-

باشترین شت کە باوک بیکات ئەوەیە کە دەبێت ڕێزی منداڵەکەی بگرێت و منداڵ ئەو هەستەی لەلا دروست ببێت کە باوك و دایك و مامۆستاکانی خۆشیان دەوێ و ڕێزی دەگرن سەرەڕای ئەوەش دەبێت کاتێك بۆ منداڵەکانمان تەرخان بکەین و لەکاتی یاریکردن و کارکردن و نانخواردن لەگەڵیان بین و گوێ لەخەوو خەیاڵ و داواکارییەکانیان بگرین و چارەسەری گرفتەکانیان بکەین، ئەو کاتە منداڵەکانمان گوێ ڕایەڵ دەبن و هەرچیەکیان پێ بڵێین بە پێی توانا جێبەجێیان دەکەن.

گوێ لەڕاوبۆچوون و داواکارییەکانیان بگرەو ئەوانەی کەڕەوان بۆ منداڵ و هەرزەکارانت جێبەجێ ی بکەو ئەوانەش کەڕەوانین گفت و گۆی لەسەر بکەن، ئەو کاتە تۆش چی داوا لەمنداڵەکانت بکەیت ئەوانیش جێبەجێی دەکەن و یاخی نابن.

## کەسێکی دیکتاتۆرو داپڵۆسێنەر مەبە:-

نابێت بەزۆر شت بەسەر منداڵەکانماندا بسەپێنین، بەڵکو دەبێت لەئەنجامی گفت و گۆو ڕاگۆڕینەوەوە بێت و منداڵەکان ڕاوبۆچوونیان دەربارەیان هەبێت سەرەڕای ئەوەش دەبێت منداڵ ئازادی هەڵبژاردنی هەبێت و نەخرێتە بەردەم یەك کارو فەرمان و بواری بیرکردنەوەو هەڵبژاردنی نەبێت و بەناچاری ڕەتی بکاتەوەو لێی یاخی ببێت. بۆ نموونە کاتێك دەمانەوێت منداڵەکەمان بچێت بخەوێت یان واز لەیارییەکەی بهێنێ، نابێت یەکسەر ناچاری بکەین واز لەیارییەکە بهێنێ یان یەکسەر بچێ بخەوێ بەڵکو دەبێت دەرفەتێکی بدەینێ و بڵێین ئاگادار بە تەنها پێنج (٥) خولەك ماوە بۆ خەوتن یان بۆ یاری کردنەکەت ئالەم کاتەدا منداڵ ئامادەباشی زیاتری تێدایە بۆ گوێ ڕایەڵی و جێبەجێکردنی فەرمانەکانمان.

هەروەها ئەگەر ئەو کارو فەرمانەی کە دەمانەوێت منداڵەکانمان جێبەجێی بکات ناخۆش و کەمێك گرانە، ئەوا دەبێت بواری گازاندە کردن و گلەیی بۆ منداڵەکانمان بڕەخسێنین و بەئاسایی وەریان بگرین بۆئەوەی ببێت بەدەروازەیەك بۆ خاڵیکردنەوەی هەڵچوونەکانیان و دامرکاندنەوەیان لەجیاتی ئەوەی یاخی بن و هەر بە یەك جار کارەکە ڕەت بکەنەوەو جێبەجێی نەکەن.

## خۆت ببە بە نموونەیەکی باش بۆ منداڵەکانت:-

پێش ئەوەی داوا لە منداڵەکانت بکەی کە گوێ ڕایەڵ بن و ڕێزی گەورەکان بگرن، ئەوا دەبێت خۆت ڕێزی یاسا بگریت و پێشێلی یاسای هاتووچۆ نەکەیت و لەبەرچاوی منداڵەکانمان سووکایەتی بەپۆلیس و فەرمانبەرو پیاوانی ئاسایش نەکەین و کەمتەرخەمی لە بەجێگەیاندنی ئەرکەکانمان نەکەین، ئەو کاتەش منداڵەکانمان لەئێمەوە فێری گوێ ڕایەڵی و ڕێزگرتنی یاساو جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان دەبن.

# تەلەفزیۆن و ڕەفتاری شەڕخوازی

هەموومان باش دەزانین، تەلەفزیۆن وەك سندوقێکی ئەفسوناوی خۆی بەناو زۆربەی ماڵەکانماندا کردووەو وەك میوانێك بەبێ ئەوەی لەدەرگا بدات بووە بەیەکێك لەئەندامەکانی خێزان، کە جاری واهەیە گرنگی و کاریگەری لەزۆر لەئەندامەکانی تر زیاترەو کاتێکی زۆری لەتەکدا بەسەر دەبەین.

تەلەفزیۆن یەکێکە لەئامرازەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆڵی خۆی لەپەروەردەو ڕۆشنبیر کردنی تاکەکانی کۆمەڵدا هەیە. بەڵام تەلەفزیۆن وەك تەلەفزیۆن بێجگە لەچەند پارچەو کەرەستەیەکی ئەلەکترۆنی و ماددی تر هیچی تر نیەو ماددەیەکی بێ گیان و هەستەو هیچ مەترسیەکی لەسەر باری دەروونی و پرۆسەی پێگەیاندنی تاکەکان نییە، بەڵام کاتێك مرۆڤ تەلەفزیۆن وەك کەرەستەو ئامرازێك بۆ گەیاندنی حەزوو ویست و نامەکانی بەکاردەهێنێت، ئەو کاتە کاریگەری بەباش یان بەخراپ دەردەکەوێت. ئینجا ئەگەر بێت و نامەو بەرنامەو پرۆگرامەکان پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و لەخزمەتی تاکەکانی کۆمەڵدا بن، ئەو کاتە بەقازانجی بینەر تەواو دەبن، بەڵام ئەگەر بێت و بەرنامەو پرۆگرامەکان ناپەروەردەیی و شەڕخوازی بن، ئەو کاتە بێگومان بەزیانی بینەر تەواو دەبێت.

کەواتە ئەوەی باش و خراپی تەلەفزیۆن دیاری دەکات، ئامێری تەلەفزیۆن نییە، بەڵکو ئەو کەس و دەستەو تاقم و لایەنەیە کە تەلەفزیۆنەکە بەکاردەهێنێت و بەرنامەو پرۆگرامەکان دادەنێت، کەواتە تەلەفزیۆن بێ لایەنەو دەتوانین بۆ کاری خێرو شەڕیش بەکاری بهێنین. یەکێك لەو کارە شەڕانەی کە خراوەتە پاڵ تەلەفزیۆن و تارادەیەکی زۆریش وابووەو کاریگەری خراپی هەبووە، بڵاوکردنەوەی گیانی شەڕخوازییە ( Konner, 1991, p: 323 ). بۆ دیاری کردنی کاریگەری ڕۆڵی تەلەفزیۆن و بەرنامەکانی لەسەر بڵاوکردنەوەی گیانی شەڕخوازی و هەڵس و کەوتی نابەجێ لەناو کۆمەڵدا، زۆر توێژینەوەی زانستی بە ئاکام گەیەندراوە، بەڵام دەرئەنجامی ئەو توێژینەوانە یەك

ڕێچکەیان نییەو بگرە هەندێك جار دژبەیەکیشن. بەشێوەیەکی گشتی، ئاکامی ئەو توێژینەوانە ئاماژە بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکەن:-

هەندێك لەتوێژینەوەکان ئاماژە بۆئەوە دەکەن کە بڵاو کردنەوەی بەرنامەو پرۆگرامی شەڕخوازی و ناپەروەردەیی، دەبنە هۆی دروست کردنی گیانی شەڕخوازی و توندوتیژی و زیادکردنی ڕێژەی تاوان و لادان، بۆ ئەم مەبەستەش زۆر ئاماریان بۆ بەڵگەی ڕاستی قسەکانیان هەیەو ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ڕێژەی تاوان و دەست درێژی زیاترە لەلای ئەو منداڵ و مێردمنداڵانەی کە بەزۆری سەیری فیلم و بەرنامەو پرۆگرامی شەڕخوازی دەکەن، ئەگەر بەراوورد بکرێن بە ئەو منداڵ و مێردمنداڵانەی کە بەو شێوەیە سەیری ئەو بەرنامەو فیلم و پرۆگرامانە ناکەن. بۆ نموونە زانایانی وەك (بەندۆرا)و هاوەڵەکانی توێژینەوەی لەو جۆرەیان کردو لەیەکێك لە توێژینەوەکانیان، دوو کۆمەڵ منداڵیان هێناو، فیلمێکی شەڕخوازی و توندوتیژیان پیشانی کۆمەڵەی یەکەم دا، بەڵام کۆمەڵەی دووەم سەیری فیلمێکی پێکەنیناوی خۆشی (ترفیهی)یان دەکرد. دوای تەواو بوونی بینینی فیلمەکان، هەردوو کۆمەڵە منداڵەکانیان خستە ناو هۆڵێکی گەورەی پڕ لەیاری و کەرەستەی جیاجیا.

لەئەنجامدا دەرکەوت کەزۆربەی زۆری ئەو منداڵانەی سەیری فیلمە شەڕخوازییەکەیان کردبوو، زۆربەی ڕەفتارو هەڵس و کەوتی پاڵەوان و کەسانی ناو فیلمەکەیان دووبارە دەکردەوەو وەك ئەوان شەڕخوازو توندووتیژ بوون و بەشەق و دەست و هەڵس و کەوتی جیاجیا گوزارشتیان لەڕەفتاری شەڕخوازی و توندوتیژی دەکرد، بەتایبەتی ئەو ڕەفتارو هەڵس و کەوتانەی کەلەناو فیلمەکەدا هەبوون، بەڵام منداڵانی کۆمەڵەی دووەم زۆر زۆر بەکەمی لەو جۆرە ڕەفتارەیان هەبوو، بە پێچەوانەوە زۆربەیان وەك پاڵەوان و کەسایەتیەکانی ناو فیلمە خۆش و پێکەنیناویەکەیان دەکرد. دەرئەنجامی ئەو توێژینەوەیەو ژمارەیەکی تر لەو جۆرە توێژینەوانە وای لەو زانایانە کرد، کە بگەنە ئەو دەرئەنجام و بڕیارەی کە منداڵ و هەرزەکار (بەتایبەتی)و گەورەکان بەگشتی

لەڕێگەی بینینی فیلم و بەرنامەو پرۆگرامی شەڕخوازی و توندوتیژییەوە فێری لاساییکردنەوەی ڕەفتارو هەڵس و کەوتی پاڵەوان و کەسایەتیە شەڕخوازەکانی ناو ئەو فیلم و بەرنامەو پرۆگرامانە دەبن و لەژیانی واقیعیدا بەرجەستەی دەکەن و کەسانی شەڕخوازو توندوتیژیان لێدەردەچێت (Bandura, 1963, p:204).

هەر لەبەرئەوەشە کە پێشنیازی ئەوەیان کردووە. کە تا دەتوانرێت دەبێت لەپیشاندان و بڵاوکردنەوەی فیلم و بەرنامەو پرۆگرامی شەڕخوازی و ناپەروەردەیی دووربکەوینەوە، بۆئەوەی لەڕێگەیانەوە گیانی شەڕخوازی و توندوتیژی لەناخی منداڵ و هەرزەکارەکانماندا ئەوروژێندرێ و پەرەی پێ ئەدرێت. یان ئەگەر پێویستی کرد لەو جۆرە بەرنامەو پرۆگرامانە بڵاوبکرێتەوە، ئەوە دەبێت کەسایەتی و پاڵەوانە شەڕخوازەکان بەسزای یاسایی و کۆمەڵایەتی خۆیان بگەن و نەبن بە نموونە بۆ لاساییکردنەوە.

لەبەرانبەر ئەو لێکدانەوەیە، لێکدانەوەیەکی تر هەیە کە دژ بە لێکدانەوەی یەکەمەو لەو بڕوایەدایە کە بینینی فیلم و بەرنامەو پرۆگرامی توندوتیژی هیچ زیانێك بە بینەران ناگەیەنێت. بەڵکو زۆر جاریش سوودبەخشە لەبەرئەوەی دەبێت بە دەروازەیەك بۆ خاڵیکردنەوەی حەزوو ئارەزوو هەڵچوونە شەڕخوازیەکان. بەبڕوای ئەم تیۆرەو لایەنگرانی (تیۆری شیتەڵکردنەوەی دەروونی)، بینینی فلیم و بەرنامەو پرۆگرامی توندوتیژی، شەڕخوازی شاراوەو خەیاڵی زیاد دەکات بەڵام لەهەمان کاتدا دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی شەڕخوازی دیارو ئاشکرا لەلای منداڵ، کە ئەمەش کارێکی باشەو لە قازانجی بینەرانە.

لەڕاستیدا ئەو دوو بۆچوونە هیچیان بێ کەم و کورتی نین و ڕاستیەکانیان ئە پێکاوە لەبەرئەوەی زیادەڕۆییان تێدایەو ڕەچاوی زۆر فاکتەرو لایەنی تریان نەکردووە. واتە ناتوانرێت بگوترێت کە بەردەوام و لەلای هەموو کەسێك، بینینی فلیم و بەرنامەو پرۆگرامی توندوتیژی، دەبنە هۆی دروست کردنی گیانی توندوتیژی، وەك تیۆری فێربوونی کۆمەڵایەتی (بەندۆرا) بۆی دەچێت، لەهەمان کاتیشدا ناتوانین بڕوا

بەبۆچوونەکانی ( شیتەڵکردنەوەی ) دەروونی فرۆید و هاوەڵەکانی بهێنین و بڵێین بەردەوام و لەلای هەموو کەسێك، بینینی بەرنامەو پرۆگرامی توندوتیژی دەبنەهۆی دەروازە بۆ خاڵیکردنەوەی هەڵچوونەکان و کەم کردنەوەی ڕەفتاری توندوتیژی. ئەگەر لەژیانی واقیعی سەیری دیاردەی توندوتیژی بکەین، ئەوا دەبێت جیاوازی لەنێوان دووجۆر فێربوونی شەڕخوازی بکەین:

یەکەمیان فێربوون و وەرگرتنی گیان و حەزوو ئارەزووی شەڕخوازی و توندوتیژییە، بەلام دووهەمیان فێربوون و پراکتیزەکردنی ڕەفتاری شەڕخوازییە لەژیانی واقیعیدا، واتە دەبێت جیاوازی لەنێوان حەزوو ئارەزووە شەڕخوازییە عەمبارکراوەکان و ئەو ڕەفتارو هەڵس و کەوتە توندو تیژیانە بکرێت کە لەژیانی واقیعیدا دەردەبڕدرێت و ئاڕاستەی خود یان کەسان و جیهانی دەرەوە دەکرێن، کە ئەمەش دەمان گەیەنێتە ئەو دەرئەنجامەی، کەلەوانەیە بینینی فیلم و بەرنامەو پرۆگرامی توندوتیژی ببنە هۆی (فێربوون و وەرگرتنی ) حەزووئارەزووی زیاتری شەڕخوازی، بەلام ئایا دەبێتە هۆی پراکتیزە کردن و زیاد کردنی ڕەفتاری کرداری و فیعلی شەڕخوازی لەژیانی واقیعیدا؟ بێگومان وەلام دانەوەی بە (ئا ) یان (نەء ) ئاسان نییەو پشت بە کۆمەڵێك فاکتەرو هۆکاری تر دەبەستێت لەوانە:-

ئایا منداڵ توانای جیاکردنەوەی نێوان دەست درێژی ڕاستەقینەو دەست درێژی خەیاڵی (ناو بەرنامەو پرۆگرامەکان)ی هەیە، ئەگەر منداڵ ئەو توانا عەقلیەی هەبوو کە جیاوازی لەنێوان شەڕی ڕاستەقینەو واقیعی لەلایەك و شەڕی خەیاڵی و دروست کراوی ناو تەلەفزیۆن بکات، ئەوا ئەگەری لاساییکردنەوەی شەڕخوازی و فێربوونی کەم دەبێت، بەلام ئەگەر توانای ئەو جیاوازییەی نەبوو ئەوا ئەگەری فێربوونی ڕەفتاری شەڕخوازی و لاساییکردنەوەی هەڵس و کەوتی کاراکتەرو پاڵەوانە شەڕخوازەکانی ناو تەلەفزیۆن زۆر دەبێت.

ئایا منداڵ لەسەر لاسایكردنەوەو فێربوونی ڕەفتاری پاڵەوانانی تەلەفزیۆن هانددەدرێت یان سزا دەدرێت؟ ئەگەر بێت و منداڵ لەسەر لاسایكردنەوەی ڕەفتاری خراپی پاڵەوانەكان سزانەدرێت و لایەنە ناناسابییەكانی بۆ ڕوون نەكرێتەوە ئەوا ئەگەری فێربوونی لاسایكردنەوەی زیاتر دەبێت، بەلام بە پێچەوانەوە كەم دەبێت.

ئەگەر منداڵ لەژینگەیەكدا بژی و ئەو ژینگەیە پڕ بێت لەدەست درێژی و شەڕخوازی و ڕێزی منداڵ و كەسانی شەڕانی بگیرێت، ئەوا ئەگەری فێربوون و لاسایكردنەوەی ڕەفتاری شەڕخوازی زیاتر دەبێت.

<u>ئینجا بۆئەوەی منداڵ و هەرزەكارەكانمان لە كاریگەری خراپی فیلم و بەرنامەو پرۆگرامە شەڕخوازییەكان بپارێزن، ئەوا دەبێت ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بكەین:-</u>

١- تا دەكرێت هەوڵبدرێت ڕێژەی بلاْوكردنەوەی فیلم و بەرنامەو پرۆگرامی توندوتیژی كەم بكرێتەوە.

٢- تا دەكرێت ئەو فیلم و بەرنامەو پرۆگرامانە بلاْوبكرێتەوە (ئەگەر بلاْوكرانەوە) كە پاڵەوان و كەسایەتیە شەڕخوازەكان بەسزای یاسایی و كۆمەلایەتی خۆیان دەگەن.

٣- هەوڵبدرێت منداڵ و هەرزەكار تێبگەیەندرێت، كە ئەوانەی لە تەلەفزیون و سینەما پیشان دەدرێن، خەیاڵی و ناواقیعین و نواندنن، بۆئەوەی توانای جیاكردنەوەی نێوان شەڕخوازی واقیعی و شەڕخوازی خەیاڵیان هەبێت.

٤- نابێت بەهیچ شێوەیەك منداڵ و هەرزەكارەكانمان لەسەر لاسایكردنەوەی ڕەفتاری توندوتیژی پاڵەوانانی ناو تەلەفزیۆن هانبدەین و چاوپۆشی لە هەڵەو سەرەڕۆییەكانیان بكەین.

ئەوە ماوە بڵێین شەڕخوازی و توندوتیژی بەشێکە لەسروشتی مرۆڤایەتی و ڕەگ و ڕیشەی لەقوڵایی دەروونی مرۆڤدا داکوتاوەو هەزارەها ساڵەو پێش ئەوەی تەلەفزیۆنیش هەبێت، شەڕو کوشتارو شەڕخوازی هەر بووە، بەلام وەك لەدەرونەنجامی توێژینەوەکانی ئەو بوارە دەردەکەوێت، تەلەفزیۆن یەکێکە لەو هۆکارانەی کە دەبێتە هۆی فێرکردن و بلاوکردنەوەی گیانی شەڕخوازی و ڕەفتاری توندوتیژی، دەبا ئاگامان لێی بێت و نەهێڵین بچێتە پاڵ فاکتەرەکانی تری دروست کردنی توندوتیژی وەك (بەربەست و ڕێگر، سووکایەتی پێکردن و لێدانی منداڵ، بێبەش کردن لەسۆزو خۆشەویستی و پشت گوێ خستنی منداڵ).

## شەڕو کوشتارو منداڵ

گومانی تێدا نیە ترسناکی و شوێنەواری شەڕو کوشتار لەسەر دەروونی هەموو توێژو چینەکانی کۆمەڵ بەئاشکرا ڕەنگ دەداتەوە، بەڵام منداڵ لەبەر لاوازی و کەم توانایی و شارەزایی لەهەموویان زیاتر کاریگەری شەڕو کوشتار لەسەر کەسایەتی و ڕەوشتی دەردەکەوێت، چونکە لە قۆناغی گەشەکردندایەو هەست و سۆزی ناسکەو بەرگەی تووندو تیژی ناگرێت و بچووکترین کارەسات کاری تێدەکات و شوێنەواری خۆی لەدڵ و دەروونیاندا بەجێ دەهێڵێ. شەڕەکانی ناو کوردستان بەگشتی و شەڕی ناوخۆ بەتایبەتی کارێکی خراپی کردۆتە سەر باری دەروونی منداڵانی کوردو، هەندێک جار منداڵانیش وەك گەورەکان بوون بەچەندەها گروپ و دەستەو تاقمی جیاواز جیاواز و بەئاشکرا بەنوێژی نیوەڕۆ لەئەنجامی پەروەردەی هەڵەو نالەباری ڕاگەیاندن، دوژمنایەتی یەکتری دەکەن و هەر لەئێستاوە خەریکە تۆوی ناتەبایی و ناکۆکی لەناخیاندا سەوز دەبێت.

**زۆر بە ئاشکرا دەتوانین لەژیانی منداڵانی کورددا هەست بەم شوێنەوارە خراپانەی شەڕو کوشتار بکەین و لەم بوارانەی لای خوارەوەدا ڕەنگیان داوەتەوە:-**

لەئەنجامی شەڕو ترس و گرتن و کوشتن و بۆردومانەوە زۆرجار ڕۆڵی ئاسایی دایك و باوك تێك دەچێت و ناتوانێت بەشێوەیەکی زانستی و سروشتی منداڵەکانیان پەروەردە بکەن و هەندێك جاریش لەئەنجامی خەم و خەفەت و دەمارگیرییەوە لەمامەڵەکردن لەتەك منداڵەکانیاندا توندوتیژو نائاسایی دەبن، هەروەها زۆرجار منداڵ ئەو ترس و خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێ و گرژی و دەمارگیرییە لەسەرو سیماو دەم و چاوی دایك و باوك و مامۆستاو کەسانی چواردەوریاندا دەخوێننەوەو لەڕێگەیانەوە ئەمانیش فێری ئەو خاسیەت و سیما نائاساییانە دەبن، هەروەها هەندێك جار لەئەنجامی شەڕو کوشتارەوە هەندێك منداڵ بێ دایك و باوك و لانە دەبن و لەسۆزو خۆشەویستی و ڕێنمایی ئەوان بێ بەش دەبن و دوورنیە بەرەو هەڵدێرو سەرگەردانی و لاساریش بڕۆن.

ژینگەیەك کە پڕبێت لە شەڕو کوشتارو خوێن ڕشتن و بۆردومان، بێگومان منداڵ تووشی ترس و دڵەڕاوکێ و گرژی دەروونی و شەڕخوازی دەکات و کەسانی چواردەوری دەبن بە نموونە بۆ منداڵ و لەوانەوە فێری دەست درێژی و شەڕخوازی دەبێت و ڕۆژانە لەهەڵس و کەوتیدا ڕەنگ دەداتەوەو هەروەها بۆچوونی هەڵەو ڕەشبینانەی لا دروست دەبێت بەرانبەر ژیان و دیاردەکانی و دوورنیە لەداهاتوودا بەو شێوەیە مامەڵە لەتەك تاکەکانی ناو کۆمەڵ و دیاردەکانی ژیاندا بکات، وەنموونەش زۆرن لەو بارەیەوەو دەتوانین بەئاسانی هەستیان پێ بکەین.

بۆ نموونە ئەگەر داوا لەمندالآنی کورد بکەین وێنەو نیگارێکمان بۆ بکێشن، ئەوا لەجیاتی وێنەی کەژو کێوو دەشت و دۆڵ و بناری کوردستان و ئاژەڵی دەستەمۆی ماڵی و دارو درەختی سەوزی بەردار، ئەوا یەکسەر وێنەی دەبابەو فرۆکەو چەك و تەقەمەنی و کوشتن دەکێشن، چونکە بەجۆرێك لەدڵ و دەروون و مێشکیاندا چەسپیوە کە بەئاسانی ناتوانن خۆیانی لێدەرباز بکەن.

ئەگەر سەیری یارییەکانیان بکەین دەبینین پڕیەتی لەکوشتارو شەڕخوازی و ڕاونانی یەکتری و لاسایی کردنەوەی گەورەکانیان و یاریکردنی ڕۆڵی ئەوان و زۆربەی کەرەستەو ئامرازەکانی یاریکردنیشیان هەر تفەنگ و چەقۆو تیروکەوان و تەقەمەنی و دەبابەی دروستکراوەو ئاوماڵ و حەوشەو کۆڵان و شەقامەکانیشیان کردووە بە سەربازگەو بەرەکانی پێشەوەی جەنگ، ئەمانە هەموویان زەنگی ترسناکن و پێویستی سەرشانی هەموو لایەکە کە بە ووردی حسابی بۆ بکات و لەڕێگەی بەرنامەو پرۆگرامی تایبەتی زانستیەوە هەوڵی نەهێشتن و سڕینەوەی ئەو شوێنەوارانە بدرێت، چونکە مانەوەی بڤەیەو کارەساتی گەورەی لەدوایە.

منداڵ بۆ گەشەکردنی ئاسایی پێداویستی بە ژینگەیەکی پڕ لە ئارام و دڵنیایی هەیە، چونکە دڵنیایی و ئارام گەورەترین پێداویستی گەشەکردنی منداڵەو بناغەیە بۆ کەسایەتی و دەروون دروستی، بەڵام بەداخەوە شەڕو کوشتار ژینگەی منداڵ دەکات بە دۆزەخ و پڕی دەکات لە هەڕەشەو کوشتن و بڕین و کاول کاری و کەلێن و دەلاقەی گەورە

دەكاتە جەستەی گەشەكردنی ئاسایی منداڵ و هەر ئەم ترس و نائارامیە منداڵ تووشی زۆر هەڵس و كەوتی نائاسایی دەكات لەوانە ترسان لە شوێنی چۆڵ و تاریك یان ناتوانێت بە تەنیا بچێت بۆ هەندێك شوێنی وەك سەرئاو، گەرماو، ژووری چۆڵ و هەوڵ دەدات لێیان دووربكەوێتەوە، هەروەها لەئەنجامی بیستنی زۆر دەنگی وەك پڕبوون و خاڵی بوونەوەی تانكی ئاو، داخستن و كردنەوەی دەرگاو پەنجەرەو دەنگی باو باران و گەردەلوول و تەقینی تایەی سەیارە تووشی خورپەو ڕاچەنین و ترس دەبن، بێ گومان بەردەوام بوونی ئەم خورپەو ڕاچەنینانە ژیانی منداڵ دەكات بەدۆزەخ و دەبن بەڕێگر لەبەردەم پشت بەخۆبەستن و سەربەخۆیی و گەشەكردنی ئاسایی كەسایەتی منداڵدا.

زۆرجار ئەو ترس و دڵەڕاوكێ و بێ ئارامیە لەهەڵس و كەوتی منداڵدا بەئاشكرا ڕەنگ دەداتەوە لەوانە خەولێزڕان، بینینی خەونی ترسناك (كابوس)، هاواركردن لەشەودا، دواكەوتن لەخوێندن، هەندێك جووڵەو هەڵس و كەوتی دەمارگیرانە ... هتد. دەرئەنجامی توێژینەوەی زانایان (ئەلوك، ١٩٤٥) لەبەریتانیا (برودين، ١٩٤٣) لە فنلەندا (میلگرام و میلگرام، ١٩٦٧) و (وایف، ١٩٧٣) لە ئیسرائیل و (يقطين، ١٩٧٧) لەلوبنان ئاماژە بۆ بوونی ئەو سیفات و شوێنەوارە خراپانەی شەڕو كوشتار دەكەن لەسەر دڵ و دەروونی منداڵ (يقطين،١٩٧٨، ص١١٩)

## منداڵ بۆ دزی دەکات؟

دزی کردن هەڵس و کەوتێکی چەوت و ناکۆمەڵایەتیەو منداڵ لەو ژینگەو دەوروبەرەی کە تیایدا دەژی فێری دەبێت، واتە ڕەوشتێکی بۆماوەیی نیەو لە باوانەوە بۆ منداڵ ناگوێزرێتەوە، لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆکاری دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە گەشە دەکات.

دزی کردن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دزێوەو هەموو گەل و نەتەوەکان بە دەستیەوە دەناڵێنن، تاوەکوو ئێستاش بۆ هیچ زاناو توێژەرێك دەرنەکەوتووە کە کۆمەڵگایەك هەبێت دزی کردنی تێدا نەبێت، بەڵام تەنها جیاوازی لەڕێژەو شێوازو جۆرەکانیدا هەیەو لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر دەگۆڕدرێ.

لەسەرەتای ساڵی یەکەمدا منداڵ هیچ شتێك دەربارەی موڵکداری ( الملكية )و خاوەنێتی نازانێت و کەل و پەل و پێداویستی خۆی لە کەل و پەل و پێداویستی کەسانی تر جیاناکاتەوە هەر لەبەرئەوەشە کە هەرچییەکی بکەوێتە بەردەست پەلاماری دەدات و بەموڵکی خۆی دەزانێت، ئەم ڕەوشتە بەهیچ شێوەیەك بەدزی دانانرێت و ئەو پێناسەی بەسەردا ناچەسپێت کە دەڵێت، دزی ئەو ڕەوشتەیە کە دەبێتە هۆی دەست بەسەراگرتن و زەوت کردن و بردنی موڵك و سامانی کەسانی تر بەبێ ڕەزامەندیان، چونکە ئەو منداڵە بچووکە مانای موڵکداری نازانێت. ( منداڵ لەکۆتایی ساڵی یەکەمدا هەست بە پێداویستی موڵکداری دەکات و لەسەرەتاشدا هەر لەخۆیەوە بەبێ هاندان لەلای دروست دەبێت ( القوصی، ١٩٨١، ص٣٥٩ ).

پێویستە لەکاتی سەرهەڵدانی ئەو هەستی موڵکدارییەوە هان و پشتگیری منداڵ بکرێت، بەڵام نابێت زیادەڕۆیی تێدا بکرێت و بەرەو خۆپەرستی و هەڵپەرستی و چاوبرسێتی ببرێت، هەروەها ناشبێت ئەو هەستە بمرێندرێت و منداڵ وا لێبکرێت کە

جیاوازی لەنێوان مافەکانی خۆیی و کەسانی تردا نەکات. ئینجا ئەگەر بمانەوێت منداڵ ڕێزی ماف و موڵکداری کەسانی تر بگرێت، ئەوە دەبێت ئێمەش ڕێزی ماف و کەل و پەل و پێداویستیەکانی ئەو بگرین و نابێت بەبێ پرس و بەنارەزووی کەسانی تر بەکاربهێندرێن هەروەها دەبێت شوێنی نووستن و کەل و پەلی تایبەتی خۆی هەبێت.

دزی کردن دیاردەیەکی شیاوو باوو بەربڵاوە لەناو منداڵاندا و منداڵ نیە لەجیهاندا ئەگەر بۆتەنها جارێکیش بێت دزی نەکردبێت و دەستی بەناهەق بۆ کەل و پەل و شتی کەسانی تر درێژ نەکردبێت و نەیکردبێ بە موڵکی خۆی. ئەو حاڵەتانە ئاساییەو هیچ مەترسیەکی لەژیانی ئەو منداڵانەدا نیە، بەڵام ئەگەر ئەو حاڵەتانە چەندەها جار دووبارە بووەوەو بوو بە بەشێك لەهەڵس و کەوت و ژیانی ڕۆژانەی ئەو منداڵانە، ئەو کاتە دەبێت بەدیاردەیەکی ترسناك و پێویستی بەچارەسەرکردن دەبێت.

کارێکی ئاساییە کە منداڵ لەسەرەتای ژیانیدا لەئەنجامی نەزانی و کاریگەری ڕەمەکی موڵکداریەوە (غریزە التملك) پەلاماری کەل و پەل و شتی کەسانی تر بدات و بیان کات بەموڵکی خۆی، بەڵام دوای ئەوەی کە فێری موڵکداری دەبێت و جیاوازی لەنێوان مافی خۆی و مافی کەسانی تردا دەکات، ئەو کاتە سیفاتی دەست پاکی لەلای گەشە دەکات و ڕێزی موڵك و ماڵی کەسانی تر دەگرێت و بەناهەق زەوتیان ناکات.

دەست پاکی یەکێکە لە سیفاتە مرۆڤایەتیە ڕەسەنەکان و بە بڕبڕەی پشتی ئەخلاق و پتەوی و بەردەوامی کۆمەڵگا دادەنرێت، لەبەرئەوە ئەرکی سەرشانی هەموو دام و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانە لە پێشەوەی هەمووشیان خێزان، کە هەوڵی چاندنی ئەو سیفاتە گرنگە لەناخی منداڵەکانیاندا بدەن، چونکە دەست پاکی دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوە لە دزی کردن و ناپاکی و زەوت کردنی مافی کەسانی تر. بەڵام دزی لە سیفاتە ناشیرین و دزێوەکانە و زیانی گەورە بەبوونیاتی کۆمەڵگاو بەردەوام بوونی دەگەیەنێت، هەر لەبەرئەوەشە کە هەموو کۆمەڵگاکان دژی دەوەستن و بە پێ ی هەموو داب و نەریت و یاساو ئاینێك بەتاوان

لەقەڵەم دەدرێت و ئەوانەی دزیش بکەن بەتاوانبار ناودەبرێن و بەتوندی سزا دەدرێن. بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و کۆششەی کۆمەڵگاو دام و دەزگاکانی، کەچی هێشتا دیاردەی دزی هەر هەیەو بەهیچ شێوەیەك بنەبڕ نەکراوە. ئینجا لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات ئەویش ئەوەیە بۆچی منداڵان دزی دەکەن؟.

وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە ئەوەندە ئاسان نییە، چونکە دزی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دەروونی ئاڵۆزەو لەئەنجامی کارلێککردنی کەسایەتی منداڵ و چواردەورەکەیدا دروست دەبێت و کۆمەڵێك هۆکار بەشداری گەشەکردنی دەکەن و هۆکارەکانیش لە حاڵەت و یەکێکەوە بۆ حاڵەت و یەکێکی تر دەگۆڕدرێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین دیاردەی دزی بۆ یەکێك یان زیاتر لەیەکێك لەم هۆکارانەی خوارەوەی بگەڕێنینەوە.

## نەبوونی و هەژاری:

هەندێك منداڵ لەبەرئەوەی هەژارو دەست کورتن و هیچ دەروازەو ڕێگا چارەیەکی تر لەبەردەمیاندا نەماوە، بۆیە بەناچاری پەنا بۆ دزی دەبەن بۆئەوەی پێداویستیە گرنگەکانیان تێر بکەن، ئەم حاڵەتەش زیاتر لەناو ئەو منداڵانەدا باوە کە لە خێزانێکی لێك ترازاوو پڕ لەئاژاوە گەورە دەبن و کەسێکی دڵسۆزیان نیە کە پێداویستیەکانیان بۆ دابین بکات. چارەسەرکردنی ئەو جۆرە منداڵانەش ئاسانە ئەویش بەدابین کردنی ئەو پێداویستیانەیان دەبێت و ئەو کاتەش واز لەدزی کردن دەهێنن.

## هەست کردن بەکەمی:

هەندێك منداڵ لەبەرئەوەی لەخێزان و ژینگەیەکی پڕ لە گیرو گرفتدا دەژین و لەسۆزو خۆشەویستی دایك و باوك و مامۆستاو هاوڕێکانیان بێ بەشن و ناتوانن جێگەی شیاوی خۆیان لەناو کۆمەڵدا بکەنەوە، لەبەرئەوە هەندێك جار پەنا بۆ دزی دەبەن و ئەو شتەی کە دەستیان دەکەوێت یان بەسەر هاوڕێکانیاندا دابەشی دەکەن یان لەبوارێکی تردا

بەکاری دەهێنن و ئەو هەست کردن بەکەمییەیانی پێ قەرەبوو دەکەن. بۆ نموونە کاتێك منداڵێك لەناو هاوڕێکانیدا بێزراوو بێ پشت و پەنا دەبێت هەوڵدەدات کە هەندێك شت یان لەماڵەوە یان لەدوکانێك بدزێت و بیبات بۆ ئەو منداڵانە تاوەکو بەهۆیەوە کەمێك گرنگی دان و سۆزو خۆشەویستی هاوڕێکانی بۆلای خۆی ڕابکێشێت. چارەسەری ئەو حاڵەتەش بەوە دەکرێت کە دەبێت لەخێزان و قوتابخانەو کۆمەڵدا ژینگەی گونجاوو دروست بۆ منداڵان بخوڵقێندرێ و پێداویستییە فسیۆلۆژی و دەروونیەکانیان بۆ دابین بکرێت و لە سووکایەتی پێ کردن دوور بخرێنەوە بۆ ئەوەی هەست بەکەمی نەکەن و دواجاریش پەنا بۆدزی نەبەن بۆ قەرەبوو کردنی.

### تۆڵەسەندنەوە:

منداڵی وا هەیە ڕقی لەمنداڵ یان گەورەیەکی تر هەیە، بەڵام ناتوانێت ڕاستەوخۆ تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوەو دەست درێژی بکاتە سەری، بۆیە هەندێك جار پەنا بۆ دزی کردن دەبات و هەوڵ دەدات کە شتێکی ئەو کەسەی ڕقی لێیەتی بدزێ و لەڕێگەی ئەو دزی کردنەوە تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوە، چونکە بەبڕوای ئەو منداڵە، ئەو کەسەی کە شتەکەی لێ دەدزرێ خەفەت دەخوات و دلگران دەبێت بەوەش تۆڵەی خۆی لێدەکاتەوە. ئەم دیاردەیەش لەنێوان منداڵانی ئەو خێزان و قوتابخانانەی کە بەردەوام شەڕو ناژاوەو ناخۆشی و چەوساندنەوەیان تێدایە زۆر باوە. لەبەرئەوەی ئەو منداڵانە زوڵمیان لێ دەکرێت و مافەکانیان پێشێل دەکرێن و کەسیش نیە ئەو مافانەیان بۆ بگەڕێنێتەوە، بۆیە بەناچاری پەنا بۆ دزی کردن دەبەن بۆ تۆڵەسەندنەوە لەو کەسانەی کە مافەکانیانی پێشێل کردووە، ئیتر قەڵەم یان دەفتەر یان کتێب یان پارە یان شتی تریان دەدزن. چارەسەری ئەم گرفتەش بەوە دەکرێت کە نەهێڵدرێت منداڵ زوڵمی لێبکرێت و مافەکانی پێشێل بکرێت.

## هەڵخەڵەتاندن و چەواشەكردن:

هەندێك جاریش منداڵ لەنەنجامی نەزانی و كەم شارەزاییەوە دەكەوێتە داوو تەڵەی منداڵانی لەخۆی گەورەتر. بۆ نموونە ئەو گەورانە ئەم منداڵە بچووكە بەناوی شتێكی ترەوە بۆ دزی كردن دەبەن دوای ئەوەی لەدزی كردنەكەدا بەشداری پێدەكەن، ئیتر بۆ جاری دووهەم و سێهەمیش هەر ناچاری دەكەن، ئینجا ئەگەر نارەزایی دەربڕی و نەیویست لەگەڵیان بچێت ئەو كاتە هەڕەشەی ئەوەی لێدەكەن كە دەچن بە مامۆستاو باوك و دایكی دەڵێن كە جاری یەكەم دزی كردووە یان لێی دەدەن بۆیە بەناچاری بۆ جاری دووهەم و سێهەمیش لەگەڵیان بەردەوام دەبێت و ناتوانێت وازیان لێ بهێنێ. چارەسەری ئەو حاڵەتەش بەوە دەكرێت كە دەبێت دایك و باوك و مامۆستا ئاگاداری منداڵ و قوتابییەكانیان بن و نەهێڵن لەگەڵ برادەری خراپ بگەڕێن و ئاگاداری هەڵس و كەوت و هاتووچۆیان بن و بەردەوام ڕێنمایی و ئامۆژگارییان بكەن و خراپی و زیانەكانی دزی كردنیان بۆ ڕوون بكەنەوە.

## لاساییكردنەوە:

كاتێك كەسانی گەورەو نموونەی چواردەوری منداڵ دزی دەكەن و كەسیش سزاو سەرزەنشتیان ناكەن، ئەوا منداڵیش لەڕێگەی چاولێكەری و لاساییكردنەوەی ئەو كەسانەوە فێری دزی كردن دەبێت، ئینجا بۆئەوەی منداڵان فێری دەست پاكی و ڕێزگرتنی ماف و موڵك و سامانی كەسانی تر ببن، دەبێت یەكەم جار كەسانی چواردەوری منداڵ ( دایك و باوك و مامۆستاو هاوڕێ و خزم و كەس ... تاد ) دەست پاك بن و بەهەموو شێوەیەك لەدزی كردن و زەوت كردنی مافی كەسانی تر دووربكەونەوە. ئەوكاتە بۆیان هەیە كە داوا لەمنداڵ بكەن كە نابێت دزی بكات.

منداڵ ئەگەر لەمنداڵیەوە ڕانەهێنرێت و فێری دەست پاكی و ڕێزگرتنی موڵك و سامانی كەسانی تر نەكرێت، ئەوە دوور نیە كە پەنا بۆدزی كردن ببات، چونكە منداڵ لەسەرەتای ژیانیەوە وا تێدەگات كە هەر چ شتێك لەناو خێزاندا هەبێت ئەوە موڵكی ئەوەو بۆخۆی زەوتی دەكات و ئەو مافە بەخۆی دەدات كە بەبێ یارمەتی و ڕێپێدان دەستیان بۆ ببات، هەر ئەمەشە وای لێدەكات كە دەست بۆ كەل و پەل و پارەو شتی خوشك و براو باوك و دایكی ببات. ئالەم كاتانەدا زۆر پێویستە كە منداڵ فێری ئەوە بكرێت كە هەندێك شت موڵكی خۆیەتی و مافی كەسی تری بەسەرەوە نیە بەڵام هەندێك شتی تر موڵك و سامانی كەسانی ترەو بەبێ یارمەتی و ڕەزامەندی ئەوان نەبێت بۆی نیە كەدەستیان بۆ درێژ بكات، چونكە ئەو كاتە بەدزی دادەنرێت و سزای ئەو كەسەش دەدرێت كە دەستیان بۆ درێژ دەكات ( نجاتی، ١٩٥٥، ص٥١-٥٢ ) .

## ترس و چۆنیەتی چارەسەركردنی

ترس یەكێكە لە هەڵچوونەكان و ئامادە باشی خۆی لە ناخی مرۆڤدا هەیە، ترس لە زۆر لایەنەوە سوودبەخشەو پێویستە بۆ مانەوەی مرۆڤ، واتە دەبێت مرۆڤ لە ئاژەڵە درندەكان و ئاگرو ئاووكارەباو رووداوی دڵتەزێن و تەقەمەنی و شەڕو كوشتار بترسێ، چونكە نەترسان لەو شتە بڤانە مانای نەمانی مرۆڤ و قڕكردنیەتی، ئینجا لەبەرئەوە ترس وەك هەڵچونێك لەسەرەتای مرۆڤایەتییەوە هاوشانی مرۆڤ بووەو وەك سێبەری لێی جیانەبۆتەوە، زۆر جاران مرۆڤ هەندێك لەو شتانەی لێی ترساوە پەرستوویەتی یان قوربانی بۆ داوە، مرۆڤی سەرەتایی لە هەورە تریشقە و بروسكە و تاریكی و جنۆكەو دێوو درنج و زۆر شتی تر ترساوە. بەڵام مرۆڤی ئەمڕۆ سەرەڕای هەندێك لەو شتە كۆنانە، لەشتی تازەی سەردەمەكەی دەترسێت. بێگومان جۆرو هۆكاری ترس لە كۆمەڵگایەكەوە بۆ كۆمەڵگایەكی ترو لە كاتێكەوە بۆ كاتێكی تر دەگۆڕدرێ.

هەندێك لە دەروونزانەكان لەو بڕوایەدان كە زۆربەی ترسەكان وەرگیراوەو مرۆڤ لە دوای لە دایك بوونەوە فێری دەبێت. بەڵام هەندێك دەروونزانی تر لەو بڕوایەدان كە منداڵ هەر لەسەرەتای لە دایك بوونیەوە هەندێك ترسی بۆماوەی هەیە لەوانە (ترسان لەدەنگی بەرزو كت و پڕ، ترسان لە دەست دانی پاڵپشت و پشت و پەنا ئەویش كاتێك هەستی پێ دەكەین كە منداڵ لە باوەشی دایكی یان جێگایەك بێت و لە پڕ خەریك بێت بكەوێتە خوارەوە یان پاڵی پێوە بنرێ، هەروەها ترسان لە كەوتنە خوارەوە).

بەشێوەیەكی گشتی ترس ئامادە باشیەكی بۆماوەیی هەیە و بەشێكە لەسروشتی مرۆڤایەتی، بەڵام ئەو ئامادە باشیە بە تەنها نابێتە مایەی ترس بەڵكو دەبێت كۆمەڵێك فاكتەرو بارودۆخی تایبەتی لەناو كۆمەڵ هەبێت بۆ ئەوەی ترس لەلای مرۆڤ دروست ببێت، واتە بێجگە لەو دوو سێ جۆرە ترسە ئیتر منداڵ لەهیچ شتێكی تر ناترسێت. منداڵ تا گەورە نەبێت و فێر نەبێت ئەوا بە هیچ شێوەیەك لە سەگ و پشیلە و گورگ و كارەبا و مشك

و ئەو شتانەی تر ناترسێت كە گەورەكان لێی دەترسن. بەڵكو دوای ماوەیەك لە ئەنجامی كۆمەڵێك فاكتەرو ڕووداوو كارەساتی ناخۆشەوە منداڵ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ فێری ترسەكان دەبێت.

ترسان لەو ئاژەڵ و شتە ترسناكانە لەبەرژەوەندی مرۆڤە، بەڵام بەداخەوە ترس لەو سنوورە ئاساییەی خۆیدا ناوەستێ بەڵكو زۆر جار مرۆڤ لەشتی وا دەترسێت كە پێویست ناكات لێی بترسێ و هیچ مەترسیەكی لەسەر ژیانی مرۆڤ نییە، ئەو جۆرە ترسانەش پێیان دەگوترێ ترسی نەخۆشی نەك ترسی ئاسایی و سروشتی، ئیتر ئەو ترسە نەخۆشی و نائاساییانە زۆر زۆرن لەوانە (ترس لە تاریكی، چونە شوێنی قەرەباڵغ و تەسك، ترس لە بەرزی ... تاد). مرۆڤ لە ئەنجامی ترسەوە تووشی زۆر گۆڕانكاری فسیۆلۆژی و دەرەكی دەبێت لەوانە (زیاد بوونی لێدانی دڵ، ئازاری گەدە، وەستانی رژانی لیكە گلاند، ڕەنگ زەرد بوون، لەش و لار لەرزین، ئارەق كردنەوەیەكی سارد، هەست كردن بە بوورانەوە و لەهۆش خۆ چوون ، هەندێك جار ڕشانەوەو هێلنج دان، لە دەست دانی كۆنترۆلكردنی میز كردن و زوو زوو چوون بۆ سەر ئاوو میزە چۆڕكێ... تاد) Lindgren, &Watson 1973,P:251-252).

## چارەسەری ترس:-

بێگومان زۆر جۆر ترسمان هەیە و ژمارەیەكی زۆریش هۆكار هەن كە دەبنە هۆی دروست كردنی ترس، لەبەر ئەوە زۆر ڕێگا چارەش بۆ رزگار بوون لە ترس هەیە. ئینجا هەندێك دایك و باوك و مامۆستا پەنا بۆ هەندێكیان دەبەن بەڵام هەندێك باوك دایكی تر پەنا بۆ هەندێكی تریان دەبەن لە گرنگترین ڕێگا چارەكانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:-

### دوورخستنەوەی شتە ترسناكەكە:-

هەندێك دایك و باوك دوورخستنەوەی شتە ترسناكەكە بە ڕێگا چارەی گونجاو دەزانن واتە ئەگەر منداڵەكەیان لەسەگ یا پشیلە یان كەروێشك بترسێت، دەچن شتە ترسناكەكە

(سەگ، پشیلە، كەروێشك) لەبەر چاوی منداڵەكە یان لەو شوێنەی منداڵەكەی لێیە دوور دەخەنەوە بەلام ئەم ڕێگا چارەیە سەركەوتوو نییە چونكە ترسەكە هەر لەناخ و دڵ و دەروونی منداڵەكەدا ماوەتەوە، ئینجا ئەگەر ماوەیەكی زۆریش منداڵ ئەو شتە ترسناكانە نەبینێت بەلام دوای ئەو ماوەیە بە ڕێكەوتیش بیان بینێ ئەوا هەمان ترسی یەكەم جار دروست دەبێتەوە و منداڵەكە وەك یەكەم جار هەردەترسێت. لە لایەكی تریشەوە ئەم ڕێگا چارەیە مەنتیقی نییە چونكە ئەو ئاژەڵە ترسناكە لە ماڵەوەش نەبێت لە كۆڵان یان گەڕەك یان قوتابخانە یان كۆمەڵ هەر هەیە و كەواتە لەناو بردن و دوورخستنەوەی هەتا هەتاییان مەحاڵە و درەنگ یان زوو ئەو منداڵە هەر ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، واتە دوورخستنەوەی شتە ترسناكەكە نابێتە هۆی لەبیر چوونەوەی یان نەمانی ترسەكە.

زۆر نزیك بوونەوە لەشتە ترسناكەكە:-

هەندێك كەس لەو بڕوایە دان كە باشترین ڕێگا چارە ئەوەیە كە منداڵەكە لەو شتەی لێی دەترسێت نزیك بخرێتەوە، واتە ئەگەر منداڵەكە لەو شتەی لێی دەترسێت نزیك بخرێتەوە، واتە ئەگەر لە پشیلە ترسا، ئەوا پێویستە زوو زوو پشیلە پیشانی منداڵ بدرێت و لێی نزیك بخرێتەوە بۆ ئەوەی ترسی لێی بشكێ، بەلام وەك دەركەوتووە هەندێك جار ئەم ڕێگا چارەش زۆر سەركەوتوو نیە، چونكە لەوانەیە ببێتە هۆی زیاتر ترسانی منداڵەكە، یان لەوانەیە زەرەری تریشی لێ بكەوێ و ترسەكە زیاتر بلاوببێتەوە و منداڵ نەك لە پشیلەكە، بەڵكو لەو كەسەش بترسێت كە پشیلەكە نزیك دەكاتەوە.

سزادان و سوكایەتی پێكردن:-

هەندێك دایك و باوك و مامۆستا پەنا بۆ لێدان و سوكایەتی و گاڵتە پێكردنی منداڵەكانیان دەبەن و وا دەزانن ئەو گاڵتە پێكردن و سوكایەتیانە دەبنە پاڵنەر و ڕێگا چارە بۆ هاندانی منداڵ و ڕزگار بوونی لەو ترسە. بەلام وەك دەركەوتووە ئەم جۆرە ڕێگا

چارەش زۆر سەرکەوتوو نییە و بگرە لەو حاڵەتانەی کە ترسەکە زۆرە دەبێتە هۆی ئەوەی کە منداڵ نەك لەترسەکە ڕزگاری نابێت بەڵکو ڕق و کینە و توڕەبونێکی زۆریش لەبەرانبەر دایك و باوك و مامۆستاکانی لەلا دروست دەبێت، وە ئەگەر ئەو سوکایەتی و گاڵتە کردنە لە لایەن کەسانی تریش بەردەوام بوو ئەوا دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو منداڵە ڕقی لە هەموو کۆمەڵ و دام دەزگاکانی بێت و دوور نیە هەوڵی تۆڵە سەندنەوەش بدات. بێگومان گاڵتە و سوکایەتی پێکردنی هەرزەکار و لاوان مەترسیدارترەو زیاتر لە منداڵان هەستیارترن و خەفەتی پێدەخۆن و لە دڵ و دەروونیاندا دەیهێڵنەوە.

## ڕازی کردن:-

هەندێك کەس لەو بڕوایەدان کە دەتوانرێت لەڕێگەی گفت و گۆ و قسە کردنەوە لەگەڵ کەسی ترساو، لەو ترسەی ڕزگاری دەبێت. بەڵام دەرکەوتووە کە قسە کردن و ڕازی کردن نابێتە هۆی سڕینەوە و لەبیرچوونەوەی ترس.

## لاسایکردنەوەی کۆمەڵایەتی:-

دەرەنجامی توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەلاسایکردنەوە دەبێتە هۆی ڕزگار بوون لە ترس. واتە کاتێك منداڵ لە ئاژەڵێك دەترسێت یان لە تاریکی یان لە دەنگی بەرز، بەڵام لەهەمان کاتدا دەبینێ کە منداڵانی تر یاری لەگەڵ ئەو ئاژەڵە یان یاری لە تاریکی دەکەن و لە دەنگی بەرز ناترسن، ئەو بینینە زۆر جار دەبێت بە هاندەر بۆ ئەوەی ئەو منداڵە ترساوە بچێت وەك ئەو منداڵانەی تر یاری لە تاریکی یان لەگەڵ ئەو ئاژەڵەی لێی دەترسێ بکات. بەڵام هەندێك جار بە پێچەوانەوە لەڕێگەی لاسایکردنەوە فێری ترس دەبێت، واتە کاتێك دەبینێ منداڵانی تریش لەو جۆرە ئاژەڵە دەترسن ئەوا ئەوەندەی تر ترسەکەی زیاد دەکات.

## چاکردنەوە و سڕینەوەی فێربوونی پێشوو:-

باشترین ڕێگا چارە ئەوەیە کە لەڕێگەی سڕینەوەی شوێنەواری ترسەکەو هاندان و پاداشت کردنەوە منداڵەکە لە ترس ڕزگار بکرێت. بۆ نموونە ئەگەر منداڵێکمان هەبوو لە کەروێشك دەترسا، ئەوا دەتوانرێت بەم شێوەی خوارەوە لەو ترسە ڕزگار بکرێت.
منداڵەکە لەسەر کورسیەك دابنێ و خواردنێکی خۆشی لەبەردەم دابنێ و قسەی خۆشی بۆ بکە، لە هەمان کاتیشدا کەروێشکەکە بخەرە ناو قەفەسێکەوە و لە دوورەوە لەبەرچاوی منداڵەکە دایبنێ و بەمەرجێك نەبێتە هۆی ترس. ئینجا بۆ ڕۆژی دواتر هەمان شت دووبارە بکەرەوە، بەڵام ئەمجارە کەروێشکەکە نزیکتر بکەرەوە و خۆت یاری لەگەڵ کەروێشکەکە بکە، بەم شێوەیە هەرجارەی کەمێك نزیکی بکەرەوە و منداڵەکە لە باوەش بکە و پاداشتی بکە و لە کەروێشکەکەی نزیك بکەرەوە.

بەم شێوەیە وورده وورده ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەو ترسە کەم دەبێتەوەو منداڵەکە لەو ترسە ڕزگاری دەبێت. بەڵام دەبێت ئاگاداری بین و لەناکاو و بەپەلە کەروێشکەکەی لێ نزیك نەکەینەوە، بە تایبەتی لەو کاتانەی کە زۆر لە کەروێشك دەترسێت چونکە ئەو نزیك کردنەوە خێرایەو ڕاهێنانی منداڵ دەبێتە هۆی زیادکردنی ترسەکە و دووریش نیە ترسی لە بەرانبەر ئەو خواردن و کورسی و جێگایەش لەلا دروست ببێت.

### چارەسەرکردنی دەروونی:-

زۆر جار ترسەکە ئاڵۆز و تەم و مژاویەو ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕیوە و سەرچاوە و هۆکارەکانی نەزانراوە یان لە بیر چۆتەوە واتە لە جۆری ترسی نەخۆشییە. لە ئەم کاتانەدا ئەو ڕێگا چارانەی سەرەوە زۆر سوودبەخش نین، بەڵکو پێویستە چارەسەرکاری دەروونی ئەو کەسە ترساوە ببینێ و لە نزیکەوە لە تەکیا دابنیشێ و زانیاری دەربارەی ئەو کەسە کۆ بکاتەوە، بۆ ئەوەی دەست نیشانی سەرچاوە و هۆکارە شاراوە و لە بیر چووەکان

بکات و ئەو کەسە لەو ترسە ڕزگار بکات. بێگومان ئەو جۆرە ترسانەش بە زۆری لە جۆری فۆبیان و بەردەوام ئازاری تاک دەدەن و گرفتی بۆ دروست دەکەن.

بۆ ئەوەی منداڵ و هەرزەکار و لاوانمان تووشی ئەو گرفت و نەخۆشییە دەروونیە نەبن، ئەوا زۆر پێویستە هەر لە منداڵیەوە لە هەموو ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی ترس دووریان بخەینەوە و سەرەڕای ئەوەش چیرۆکی ترسناك و پڕ لە توندو تیژی و کارەساتیان بۆ باس نەکەین و نەهێڵین تا درەنگ بە دیار بەرنامە و فیلمی ترسناك و شەڕ خوازیەوە دانیشن و نابێت بە (شەولەبان وجنۆکە و شەیتان و خێوو تاریکی و پۆلیس و ئاژەڵ و دکتۆر و خوداو دۆزەخ ...تاد) منداڵەکانمان بترسێنین، هەروەها نابێت ئێمەی گەورە لەبەرچاوی منداڵەکانمان بترسین.

## منداڵ بۆ دەترسێت وچۆنیش چارەسەر دەکرێت

هیچ شتێك ئەوەندەی ترس زیان بەباری دەروونی منداڵ ناگەیەنێت و تووشی ئازارو دڵەڕاوکێی ناکات، زۆر لە زانایان لەو بڕوایەدان کە ترس یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی تووش بوون بە نەخۆشی و گرفتە دەروونیەکان، واتە هیچ گرفت و نەخۆشیەکی دەروونی بە بێ ترس دروست نابێت. ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە ترسی نائاساییە، ئەو ترسەیە کە بە ترسی نەخۆشی لە قەڵەم دەدرێت نەك ترسی ئاسایی کە پێویستە بۆ مرۆڤ، دەرەنجامی توێژینەوە زانستیەکان ئاماژە بۆ بوونی دوو جۆر ترس دەکەن، جۆری یەکەمیان نەك زیان بە مرۆڤ ناگەیەنێت بەڵکو سوود بەخشیشە، بۆ مرۆڤ بە تایبەتی و هەموو بوونەوەرەکانی تر بەگشتی، چونکە دەبێتە هۆی مانەوەی مرۆڤ، واتە ئەگەر مرۆڤ لە ئاژەڵە دڕندەکان و دیاردە زیان بەخشەکان نەترسایە ئەوا پاش ماوەیەك ئەو مرۆڤە لەناو دەچوو بەڵام خودای گەورە و میهرەبان ئەو هەڵچوونی ترسەی بە هەموو بوونەوەرەکانی خۆی بەخشیوەو لەکاتی پێویستدا فریایان دەکەوێت، بۆ نموونە: کاتێك مرۆڤ دەترسێت هەوڵی ڕاکردن دەدات، بەڵام باڵندە دەفڕێت و ئاسك بۆی دەردەچێت و بوونەوەرە ئاوییەکان خۆیان نقووم دەکەن. بەڵام جۆری دووهەم بەترسی نائاسایی ناودەبرێت

## جۆرەكانی ترس:-

بە زۆر شێواز ترس دابەشكراوە، هەندێك لە زاناكان لەو بڕوایەدان كە دووجۆر ترسی سەرەكی هەیە، ئەوانیش ترسی ئاسایی و بابەتی و ترسی نائاسایی و خودی. هەندێكی تر لەو باوەڕەدان كە ترس دوو جۆری ترە ئەوانیش ترسی سروشتی و (معنوی) ناهەستیە، بە بڕوای فرۆید دوو جۆر ترسی سەرەكی هەیە، جۆری یەكەم ترسی بابەتی (الموضوعي) یان ڕاستەقینەیە (الحقيقية) بەلام جۆری دووهەم ترسی گشتی یان دیاری نەكراو و بێ سنوورە، جۆری یەكەم بابەتی دیاری كراوی خۆی هەیە و مرۆڤ لێی دەترسێت وەك ترسان لە (ئاژەڵ، تاریكی، مردن،... تاد) بەلام جۆری دووهەم هیچ بابەتێكی دیاریكراوی نییە، واتە ئەو كەسەی كە تووشی ئەم جۆرە ترسە دەبێت خۆشی نازانێت لەچی دەترسێت و بەردەوام دڵتەنگ و بێزار و غەمبار و ڕەشبینە و پێشبینی كاری خراپ دەكات، فرۆید بەم حاڵەتە دەڵێت دڵەڕاوكێی دەماری (القلق العصبي) (Anxiety neurosis).

هەروەها جۆری یەكەمی ترس (ترسی بابەتی یان ڕاستەقینە) بە پێی ئەو بڤەو مەترسییەی كە كەسی ترساو پێشبینی دەكات بەسەر سێ كۆمەڵ و جۆردا دابەشی دەكات، جۆری یەكەمی هۆكاری بڤەو مەترسییەكە ئاشكراو دیارە، وەك ترسان لەمار یان ئاگر یان گورگ یان مردن، جۆری دووهەمیش هۆكاری بڤەو مەترسیەكە تا ڕادەیەك دیارە بەلام بۆ هۆكاری ڕێكەوت دەگەڕێتەوە و مەرج نییە بێتە دی، وەك ترسان لە گەشت كردن و ڕۆیشتن بە شەمەندەفەر یان پاپۆر یان ترسان لە چوونە شوێنی قەرەباڵغ ئەوەك تووشی نەخۆشی ببێت، بەلام جۆری سێهەم هیچ بڤەو مەترسیەكی تێدانییە وەك ترسان لە مێروولە و قالۆنچە، یان سەركەوتنی شوێنی بەرز یان ترسان لە شوێنی تەسك یان داخراو... تاد (القوصي، ١٩٨١، ص٢١٧-٢١٨).

## هۆکارەکانی ترسی منداڵ:-

ئەو هۆکارانەی کەمنداڵ تووشی ترس دەکەن زۆرن، هەندێك سروشتین و دەبنە مایەی ترس و پێویستە منداڵ لێیان بترسێت وەك ترسان لە ئاژەڵی دڕندەو، ئاگر، ئاو،... تاد. بەڵام ئەوانەی کە ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەو جۆرە ترسەیە کە منداڵ تووشی دەبێت و هیچ بنەماو پاساوێکی مەنتیقی و واقیعی بۆ ئەو جۆرە ترسە نییە وەك ترسان لە (تاریکی، مشك، هات و هاوار، دێو و درنج، پۆلیس، پزیشك، خەوتن، کەروێشك، خزم و کەس، مامۆستا، شوێنی بەرز و نزم و قەرەباڵغ و چۆڵ و... تاد) کە لە ئاکامدا زیانی گەورە بە باری دەروونی و پاشە ڕۆژی منداڵ دەگەیەنێت.

### دەتوانین هۆکارەکانی لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

#### ١- ترسانی دایك و باوك و کەسانی چوار دەوری منداڵ:-

هۆکاری یەکەم بۆ دروست بوونی ترسی منداڵ ترسانی کەسانی چواردەوری منداڵە، لە پێشەوەی هەمووشیان دایك و باوك، واتە کاتێك دایك و باوك لەو شتانە دەترسن ئەوا منداڵیش لە ڕێگەی ئەوانەوە تووشی ترس دەبێت، چونکە منداڵ لاسایی دایك و باوك و کەسانی چواردەوری دەکاتەوە، بۆ نموونە کاتێك دایك یان باوك بە ترس و لەرزەوە لەبەرچاوی منداڵ دەرمانێك دەخوات یان دەرزیەك لەخۆی دەدات، ئەوا دوور نییە کە منداڵەکەشی لە داهاتوودا بەترس و لەرزەوە دەرمان بخوات و دەرزی لەخۆی بدات، هەروەها کاتێك مامۆستا لە باخچەی ساوایان یان قوتابخانە لەبەرچاوی قوتابیەکانی بەبینینی مشکێك یان جاڵجاڵۆکەیەك ڕادەپەڕێت و هاوار دەکات، ئەوا دوور نیە کە قوتابیەکانیش لە ئەوەوە فێری ئەو ترسە بن.

**٢- پەروەردەى هەڵەى دايك و باوك و مامۆستا:-**

بەداخەوە هەندێك جار دايك و باوك و مامۆستا و كەسانى چواردەورى منداڵ بەدەستى خۆيان منداڵ و قوتابيەكانيان تووشى ترس دەكەن، كاتێك منداڵ ناخەوێت يان ناخوات يان خۆى ناشوات، هەندێك دايك و باوك دەيانەوێ بە زۆر و لە ڕێگاى ترساندنەوە ئەو كارانەى سەرەوە بە منداڵەكانيان بكەن و پەنادەبەن بۆ زۆر شتى بێ لايەن كەمايەى ترس نين لە ڕێگەيانەوە منداڵ ناچار دەكەن كە بەو كارەى دەيانەوێ هەڵبستن، بۆ نموونە بە پزيشك يان پۆليس يان دێو يان شەيتان يان جنۆكە دەيان ترسێنن، ئا لەم كاتەشدا منداڵەكە دەكەوێتە بەردەم دوو ڕێگا، يان ئەوەيە لە ترسان كارەكە بە ئەنجام دەگەيەنێت، كە ئەمەش دەبێتە هۆى ئەوەى كە ئەو جۆرە منداڵانە بەردەوام لەو شتانەى سەرەوە بترسێن و كەسێكى ترسنۆك دەربچن يان ئەوەيە بڕوا بە قسەى دايك و باوكيان نەكەن و كارەكان بە ئەنجام نەگەيەنن و هيچ شتێكيش ڕوونەدات كە بەمەش گومان لە قسەو هەڕەشەكانى دايك و باوكى دەكات و بڕواى پێيان نامێنێ، كە هەردوو حاڵەتەكە هەڵەيە و بە زيانى منداڵ و دايك و باوكى تەواو دەبێت.

هەندێك جاريش دايك و باوك و مامۆستاو كەسانى چواردەورى منداڵ، گاڵتەو سوكايەتى بە منداڵ دەكەن و بۆ پێكەنين و ڕابواردن و كات بەسەر بردنى خۆيان منداڵ بە چەندەها شێوە دەترسێنن و كاتێكيش منداڵ دەگرى و دەترسێ ئەوان زياتر پێدەكەنن و گاڵتەى پێدەكەن.

**٣- چيرۆك و بينراوى ترسناك:-**

هەندێك جار لە ئەنجامى گێڕاندنەوەو باسكردنى چيرۆك و بەسەرهاتى ترسناك و تۆقێنەرەوە، منداڵ تووشى ترس دەبێت، وەك گێڕاندنەوەى دێوو درنج و شەيتان و جنۆكە و شەو لە بان و مردوو خۆرو پياو كوژ و دزو جەردە، كە سەرجەم ئەو بەسەر هاتانە منداڵ

تووشی ترس دەکەن و لە خەووخەیاڵی خۆیدا چەندەها شێوەی جیا جیایان بۆ دروست دەکات، لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەو شتانە یان هەر نین یان منداڵ بە هەستەوەرەکانی هەستیان پێ ناکات، زۆر جار ئەو شتانەش بە تاریکی و شوێنی چۆڵ و شەوەوە پەیوەست دەکرێن کەوا لە منداڵ دەکات بەهۆی ئەوانەوە لە تاریکی و شوێنی چۆڵ و شەویش بترسێت. هەروەها بینینی فلیم و بینراوی ترسناك و تۆقینەریش دەبێتە هۆی دروست کردنی ترس لە لای منداڵ.

٤- شەڕ و ئاژاوەی ناو ماڵ:-

هیچ شتێك ئەوەندەی شەڕو ئاژاوە و ناخۆشی ناوماڵ منداڵ تووشی ترس ناكات، چونكە دەبێتە هۆی لەفكردنی ڕاوبۆچوونی منداڵ دەربارەی دایك و باوك و چارەنووسی خێزانەكەی، وەك دەركەوتووە ئەمن و ئاسایش و دڵنیایی یەكەم پێداویستی گرنگی دەروونی منداڵە و زۆر پێویستە بۆ دروستی دەروونی، ئنیجا ئەگەر ژینگەی خێزان و قوتابخانەی منداڵ پڕ بوو لە شەڕ و ناخۆشی و لێك ترازان، ئەوا منداڵ لە گرنگترین پێداویستی كە ئاسایش و دڵنیاییە بێبەش دەبێت كە ئەمەش دەبێت بە بنەماو سەرچاوەی دروست بوونی ترسی نەخۆشی و دەماری ( خوف عصبی ومرضي ) و لە دوا ڕۆژدا ژیانی ئەو جۆرە منداڵانە دەكات بە دۆزەخ. هەروەها لە لایەكی تریشەوە شەڕوكوشتارو جەنگ و كوشتن و بڕین چەندەها جۆر ترس لە لای منداڵ بە تایبەتی و مرۆڤ بە گشتی دروست دەكات، شایانی ئاماژە بۆ كردنە كە زۆربەی ئەو مێردمنداڵانەی كە تووشی لاساری و سەرەڕۆیی و دڵەڕاوكێ و ترس و نەخۆشی و گرفتی دەروونی بوون، لەو خێزان و ژینگانەدا پەروەردە كراون كە پڕ بووە لە لێك ترازان و شەڕو ئاژاوە و ناخۆشی.

٥- -ئازداری:-

ئازداری و گرنگی دانی زیاد لە پێویست بە منداڵیش هۆكارێكی گرنگە بۆ دروست كردنی ترس لە لای منداڵ، بۆ نموونە هەندێك دایك و باوك لە ئەنجامی نەخۆش كەوتنێكی

ئاسایی منداڵ یان بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای لەشی تووشی ترس و دڵەڕاوكێیەكی زۆر دەبن و هەر بە چوار دەوری منداڵدا دێن و دەچن و خێرا بۆ لای دكتۆری دەبەن و بەردەوام چاودێری دەكەن، یان زۆر لە سەرما دەیپارێزن، كە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی كە ئەو جۆرە منداڵانە زۆر هەستیار بن و بە بچوكترین گۆڕانكاری جەستەیی یان بەرزبوونەوەی پلەی گەرما، تووشی ترس و دڵەڕاوكێ ببن و بەردەوام گرنگی بە خۆیان بدەن و بۆ بچوكترین شت سەردانی پزیشك بكەن.

**ئینجا ئەگەر بمانەوێت منداڵەكانمان بەشێوەیەكی باش پەروەردە بكەین و لە ترس و دڵە ڕاوكێ دووریان بخەینەوە ئەوا دەبێت ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بكەین:**

١- نابێت دایك و باوك و مامۆستا لەبەرچاوی منداڵەكانیان بترسن، ئەگەر هەستیشیان بەترس كرد ئەوا نابێت لەبەردەم منداڵەكانیان دەری ببڕن، چونكە ترسانی دایك و باوك و مامۆستا وەك پەتایەكی ترسناك بۆ منداڵەكانیان دەگوازرێتەوە.

٢- نابێت دایك و باوك پەنا بۆ شێوازی نازداری ببەن و زۆر بە چواردەوری منداڵەكانیاندا بێن و بچن، چونكە گەورەكردنی گرفتەكانی منداڵ و زۆر لاواندنەوەی منداڵ تووشی ترس دەكات.

٣- نابێت بەهیچ شێوەیەك دایك و باوك و كەسانی چواردەوری منداڵ پەنا بۆ سوكایەتی پێكردن و ترساندنی منداڵ ببەن، چونكە ترساندنی منداڵ بە مەبەستی ڕابواردن و كات بەسەر بردن و گاڵتە پێكردنی باری دەروونی منداڵ تێك دەدات.

٤- دەبێت دایك و باوك و مامۆستا لە گێڕاندنەوەی چیرۆك و بەسەرهاتی ترسناك و تۆقێنەر دوور بكەونەوە و تا دەشتوانن منداڵ لە بینینی فیلم و ڕووداوی ترسناك و دڵتەزێن دوور بخەنەوە.

٥- نابێت بە هیچ شێوەیەك دایك و باوك و مامۆستا منداڵ بە شتی وەك ( دێو، درنج، شەیتان، جنۆکە، شەولەبان، گورگ، دز، ....، تاد ) بترسێنن، چونکە زیانی گەورە بەباری دەروونی منداڵ و پاشە ڕۆژی دەگەیەنێت.

٦- دایك و باوك تا دەتوانن دەبێت ژینگەی خێزانی خۆش و پڕ لە ئارامی بۆ منداڵەکانیان دابین بکەن و نابێت لەبەرچاوی منداڵەکانیان شەڕو ئاژاوە دروست بکەن، چونکە شەڕو ئاژاوەی ناو خێزان ترس و دڵەڕاوکێ و گومان لە لای منداڵ دروست دەکات.

٧- دەبێت هەوڵی چارەسەرکردنی ترسەکانی منداڵ بدرێت، ئەویش لە ڕێگەی وردە وردە نزیك خستنەوەی منداڵ لەو شتەی کە لێی دەترسێت، بۆ نموونە ئەگەر لە تاریکی دەترسێت، ئەوا دەبێت ئاشنا بکرێت و لەسەر نزیك بوونەوە لە تاریکی پاداشت بکرێت، دەبێت یەکەم جار لە تاریکی نزیك بکرێتەوە، ئینجا لەگەڵ دایك و باوکی ببرێت بۆ تاریکی، ئینجا باوکی لێی دووربکەوێتەوە ئینجا باوکی لە دوورەوە قسەی لەگەڵ بکات. بەم شێوەیە دەتوانرێت منداڵ لە زۆر جۆری ترس ڕزگاری بکرێت.

## منداڵی بێزراو و پشت گوێخراو

هیچ شتێك ئەوەندەی پشت گوێخستن و بێزراوی كەسایەتی منداڵ تێك ناشكێنێ و تووشی گرفت و گرێی دەروونی ناكات، ترسناكترین و ناخۆشترین ئەزموون و هەست كردن ئەوەیە كە منداڵ بگاتە ئەو بڕوایەی كە كەسێكی پشت گوێ خراو و بێ نرخە و كەس خۆشی ناوێ، هەرچ كاتێك منداڵ ئەو هەست و سۆز و بڕوایەی لەلا دروست بوو، ئەوا تووشی بڕوا بە خۆ نەبوون دەبێت و هەردەم بە چاوی سووك سەیری خۆی دەكات و وا دەزانێت كەسێكی بێتوانا و بێ نرخە، كە ئەمەش دەبێتە هۆی هەرەس هێنانی و دروست كردنی كەم كورتی لە كەسایەتیدا و ئەگەر لەكاتی خۆیدا چارەسەری گونجاوی بۆ نە دۆزرێتەوە، ئەوا چارەنووس و پاشە ڕۆژی ئەو منداڵە دەكەوێتە مەترسییەوەو لە داهاتوودا سەركەوتوو نابێت، بەڵكو دەشبێت بە كەسێكی نەخۆش و زیان بەخش بە كۆمەڵەكەی.

ئەو منداڵانەی لەناو خێزان و كۆمەڵ هەست بە دڵنیایی دەروونی ناكەن و بەردەوام سوكایەتیان پێبكرێت و بگەنە ئەو بڕوایەی كە كەسێكی بێ نرخ و بێزراوو وپشت گوێخراون ئەوا زۆربەی ئەم خەسڵەت و سیفاتانەی خوارەوە دەبن بە بەشێك لەكەسایەتیان و ناتوانن لێیان دەرباز بن:-

*(دووركەوتنەوە لەبەرپرسیاریەتی و وەرگرتنی بڕیاری ڕاست لەكاتی پێویستدا، بڕوا بە خۆ نەبوون، گومانكردن لە تواناو بەهرەكانی خۆی، بەردەوام پێش بینی سەرنەكەوتن و كاری خراپ دەكات و هەردەم چاوەڕوانی سوكایەتی پێكردنی خۆی دەكات لەسەر دەستی هاوەڵ و كەسانی تر، دەترسێت و ناتوانێت داوای مافەكانی خۆی بكات، هیچ گیروگرفتێكی پێ چارەسەر ناكرێت، هەروەها توانای ئەوەشی نییە، كە پارێزگاری لە خۆی و كەل و پەلەكانی بكات، لە ئەنجامی هەستكردن بە كەمی، لە كۆڕو كۆبوونەوە و تێكەڵاو بوونی كەسانی تر دوور دەكەوێتەوە، بەردەوام لە حاڵەتی ترس و دڵەڕاوكێدا دەژی). كەسێكی شەرمن و لەرزۆك و بێ بڕوا دەبێت.*

**هۆکارەکانی:-**

بێگومان منداڵ هەر لە خۆیەوە تووشی ئەو حاڵەتانەی سەرەوە نابێت بەڵکو دەبێت کۆمەڵێک هۆکار هەبن کە ببنە هۆی دروست کردنی ئەو حاڵەتە. دەرەنجامی توێژینەوە زانستیەکان ئاماژە بۆ ئەم هۆکارانەی خوارەوە دەکەن:-

١- هەندێک دایک و باوک و مامۆستا بەردەوام پەنا بۆ لێدان و سوکایەتی پێکردن و ڕیسوا کردنی منداڵەکانیان دەبەن، کە ئەم جۆرە مامەڵە هەڵەیەش دەبێتە هۆی دروست کردنی ئەو هەست و سۆزە لە لای منداڵ کە کەسێکی بێ نرخ و بێزراوە.

٢- گەورەترین هەڵەی دایک باوک و مامۆستا، بەراوردکردنی منداڵانە بە یەکتری و گەورەکردن و دەرخستنی خاڵە لاوازەکانی منداڵە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی دروست کردنی هەست کردنی بە کەمی و بڕوا بە خۆ نەبوون و سەیر کردنی خود بە چاوی سووک.

٣- هەندێک جار دایک و باوک ڕقیان لە منداڵەکانیان نییەو بگرە زۆریشیان خۆش دەوێت، بەڵام بواری ئەوەیان نییە کە کاتێک بۆ پەروەردە کردن و قسە لەگەڵ کردنی منداڵەکانیان تەرخان بکەن، بەڵکو بەردەوام لە دەرەوەی ماڵن و خەریکی کارکردنن، ئەو ماوە کەمەش کە دێنەوە بۆ ماڵەوە هیلاك و ماندوون و ئارەزووی قسەکردنیان نییە، لەبەرئەوە ئەگەر منداڵەکانیان لێیان نزیك بکەونەوە یان گوێیان پێنادەن یان دەریان دەکەن و دەڵێن کاتمان نییە و وازمان لێ بهێنن، دوورنیە لێشیان بدەن و داخی دڵی خۆیان بە ئەوان بڕێژن، بەردەوام بوونی ئەم حاڵەتەش منداڵ تووشی بێزراوی و پشت گوێخراوی دەکات.

٤- جاری واش هەیە دایك و باوك بە هیوای منداڵ نەبوون و لەناکاو منداڵیان بوو یان هەر خەریکی خۆیانن و ڕۆڵی دایك و باوکی ڕاستەقینە نابینن و منداڵەکانیان بەرەڵا دەکەن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی بێزاری و وەڕس بوونی منداڵ و هەست کردن بە کەمی.

ئینجا بۆ ئەوەی منداڵەکانمان ئەو هەستەیان لەلا دروست نەبێت، زۆر پێویستە لەو هۆکارانەی سەرەوە دووربکەوینەوە و ژینگە و بارودۆخی پەروەردەیی پڕ لە ئارام و دڵنایی بۆ منداڵەکانمان دابین بکەین (Faller, 1981, P:25-26).

## باری دەروونی منداڵی پۆلی یەکەم

هەموو قۆناغەکانی ژیان خاسیەت و مۆرك و تایبەتمەندێتی خۆیان هەیەو لەقۆناغەکانی تر جیادەکرێنەوە. یەکێك لەقۆناغەکانی ژیانی منداڵ قۆناغی چوونە قوتابخانەیە، ئەم قۆناغەش گرنگی تایبەتی خۆی لە دڵ و دەروونی منداڵدا هەیە، لەبەرئەوەی منداڵ بۆیەکەم جار ڕووبەڕووی مامۆستا دەبێتەوە (ئەوانەی کە نەچوونەتە باخچەی ساوایان) سەرەڕای ئەوەش بۆیەکەم جار لەسەر کورسیەکی ڕەق و تەق و بۆماوەیەکی زۆر دادەنیشێت، هەروەها دەبێت بە بێدەنگی و عاقڵی دابنیشێت و دەنگە دەنگ نەکات، ونەگینا ڕووبەڕووی هەڕەشەو چاولێسوورکردنەوەو لێدان دەبێتەوە. کەسەرجەم ئەو گۆڕانکاری و داواکاریانە نوێن و منداڵ ئاشنایەتی لەتەکیاندا نییە ئینجا تاوەکوو منداڵ ئاشنایەتی لەگەڵ ئەو ژینگە تازەیە (کە ژینگەی قوتابخانەیە)پەیدا دەکات کاتێکی زۆری دەوێت و پێویستە بەڕێوەبەرو مامۆستایان لەتەکیدا بە ئارام و خۆڕاگرو لەسەرخۆ بن و توندو تیژی لەتەکیدا بەکار نەهێنن.

لەبەرئەوەی منداڵ پێش هاتنە قوتابخانەی سەربەستیەکی زۆری هەبووەو بەردەوام خەریکی هەڵبەزو دابەزو ڕاکەڕاکەبووەو زۆر بەدەگمەن لەشوێنێکدا بۆماوەیەکی کەم ئۆقرەی گرتووە یان دانیشتووە. بۆیە نابێت یەکسەر لەقوتابخانە داوای سیستم ونیزام و پەیڕەو کردنی یاسای لێبکرێت، بەڵکو دەبێت وردە وردە لەگەڵ کورسی و دانیشتن و گوێڕایەڵی مامۆستاو پەیڕەو کردنی یاساو داواکارییەکانی قوتابخانە ڕابهێندرێت و نابێت لەسەر جووڵەو هەڵسان و پەیڕەو نەکردنی هەندێك سیستەمی قوتابخانە سزا بدرێت یان گلەیی و هەڕەشەی لێبکرێت چونکە هیچ کەس لە پڕێ نابێت بە کوڕێ، واتە

مەحاڵە بتوانرێت وا لە منداڵی پۆلی یەکەم بکرێت کە وەك منداڵانی پۆلی سێهەم و چوارەم هەڵسوکەوت بکەن و پابەندی یاساو ڕێسای قوتابخانە بن بەڵکو پێویستە مامۆستا سەربەستی سنووردار بە منداڵ بدات و لە ڕێگەی یاری و قسەی خۆشەوە وانەکانیان پێ هەرس بکات لەگەڵ ئەوەشدا وورده وورده بە یاساو ڕێساکانی قوتابخانە ئاشنای بکات. بۆ ئەوەی لە قوتابخانە بێزار نەبێت و خوێندنی لەلا خۆشەویست ببێت.

بەڵام ئەوەی جێگای داخە هەندێك مامۆستا هەر لەسەرەتای ساڵی خوێندنەوە بە هەڕەشەو لێدان و چاو لێسور کردنەوە پێشوازی لە منداڵان دەکەن و هەست و سۆزێکی ناخۆش لە دڵ و دەروونی منداڵاندا بەرانبەر قوتابخانەو مامۆستا دروست دەکەن ئەوەی زیاتریش زەرەری لێ دەکەوێت منداڵانی پۆلی یەکەمە. لەبەر ئەوەی بۆ یەکەم جارە دێنە قوتابخانەو هیچ ئەزموون و شارەزاییەکیان دەربارەی قوتابخانە نییە، ئینجا ئەگەر بێت و خوانەخواستە مامۆستاو بەڕێوەبەرو کەسانی تری قوتابخانە ئازاری دەروونی یان جەستەییان بدەن ئەوا هەتاهەتایە ئەو جۆرە منداڵانە بەچاوی ترس و دڵەڕاوکێ و گومان دەڕواننە مامۆستاو قوتابخانە، بۆیە دەبێت قوتابخانەو مامۆستا و خوێندن لەبەر چاوی منداڵی پۆلی یەکەم خۆشەویست بکرێت و مامۆستای بەتواناو زیرەك وانەیان پێ بڵێن و مامەڵەیەکی تایبەتییان لەگەڵ بکەن بۆ ئەوەی بەزووترین کات لەگەڵ قوتابخانە رابێن و خۆیان بگونجێنن .

## منداڵە نووقستان و (کەم ئەندامەکان) و پێداویستیەکانیان

ئەگەر بمانەوێت منداڵ پیاوی دوا رۆژ بێت و شایانی ئەوە بێت کە بەرپرس و چارەنووسی گەل و نیشتمانی بخرێتە ئەستۆ، ئەوا دەبێت پێداویستیەکانی گەشەکردن و بنیاتنانی کەسایەتی بۆ دابین بکرێت. پێداویستیە گرنگەکانی منداڵ زۆرو هەمەچەشنەن، بەڵام ئێمە لەم نووسینەماندا زیاتر تیشک دەخەینە سەر پێداویتسەکانی منداڵی نووقستان و کەم ئەندام، لەبەرئەوەی باری دەروونی و گرفت و ئەندێشەکانی منداڵی نووقستان و کەم ئەندام لەزۆر لایەنەوە لەباری دەروونی و گرفت و ئەندێشەکانی منداڵی ئاسایی جیاوازە.

مەبەست لەمنداڵانی نووقستان و کەم ئەندام ئەو منداڵانەیە کە لەئەنجامی هەرچ هۆیەکەوە (بۆماوە یان ژینگە) بوو بێت، لەپێش لەدایك بوون یان دوای لە دایك بوون تووشی کەم و کورتی یەکێك لەئەندامەکانی یان زیاتر لە ئەندامێکی لەشیان بوون، کە وئەو کەم و کورتیە بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەو منداڵانە ئەتوانن وەك منداڵی ئاسایی بژین و ئەو ئەندامانەیان بۆ ڕا پەڕاندنی کارەکانیان بەکاربهێنن.

دووجۆری سەرەکی نووقستانی هەیە، کە یەکەمیان تووشی کۆئەندامی دەماری ناوەندی دەبێت و بەزۆری منداڵ تووشی بیرکۆلی و دواکەوتنی ژیری (التخلف العقلی) دەکات، بەڵام جۆری دووهەمیان تووشی جەستەیی دەکات (نابینایی، کەڕولاڵی، گۆجی، شەلی، ... هتد) گومانیشی تێدا نیە کە هەر یەك لەو کەم و کورتیانە پێداویستی بە خزمەتگوزاری و پەروەردەو مامەڵەی تایبەتی خۆی هەیە، ئینجا بۆئەوەی ئەو جۆرە منداڵانە لەلایەکەوە نەبن بە بارو مشەخۆر بەسەر کۆمەڵ و دام و دەزگاکانیەوە، لەلایەکی تریشەوە سوود لەو بەهرەو توانستانەی کە هەیانە وەربگیرێت، دەبێت ئاوڕێکیش لەو جۆرە منداڵانە بدرێتەوەو پێداویستیەکانیان بۆ دابین بکرێت و گیروگرفتەکانیشیان بۆ چارەسەر بکرێت. بۆ زانینی پێداویستیە گرنگەکانی ئەو جۆرە منداڵانەو دیاری کردنی ئاستەنگ و

ئەندێشەو گرفتەکانیان دەبێت پشت بە دەرئەنجامی توێژینەوەی زانستی و مەیدانی کە دەربارەی ئەو جۆرە منداڵانە کراوە، ببەستین.

بۆ ئەم مەبەستەش لەکۆتایی ساڵی (١٩٩٦) و سەرەتای ساڵی (١٩٩٧) نووسەری ئەم باسە بەهاوکاری هەردوو ڕێکخراوی یونیسێف و (SCF) و وەزارەتی تەندروستی و کاروباری کۆمەڵایەتی و ژمارەیەك لە مامۆستایان و قوتابیانی هەردوو بەشی کۆمەڵزانی لەکۆلێژەکانی ئاداب و پەروەردە، هەڵسان بەئەنجامدانی توێژینەوەیەکی مەیدانی بەرفراوان لەسەر ژیان و گوزەرانی منداڵانی هەردوو شاری سلێمانی و هەولێر و شارۆچکەو کۆمەڵگاو گوندەکانی سەر بە پارێزگای هەولێر، کە توانرا چاو پێکەوتن لەگەڵ هەزارەها منداڵی نیش کەرو نووقستان و کەم و ئەندام و نەخۆش بکرێت، یەکێك لە ئامانجەکانی توێژینەوەکە تایبەت بوو بە منداڵانی نووقستان و کەم ئەندام. توانرا لەمیانەی ئەو توێژینەوەیەدا چاوپێکەوتن لەگەڵ (٧٦٥) هەفت سەدو شەست و پێنج منداڵی نووقستاندا بکرێت کە (٥٣٠) منداڵیان لە هەولێرو (٢٣٥) منداڵیشیان لە سلێمانی بوون.

دوای کۆکردنەوەی زانیاری و پڕکردنەوەی فۆرمی تایبەتی بۆ ئەو منداڵانەو لێك دانەوەو شیتەڵ کردنەوەی دەرئەنجامەکان ئەم زانیاریانەی لای خوارەوەمان بۆ دەرکەوت:-

١- ئەو حاڵەتانەی کە توانرا زانیاری دەربارەیان کۆبکرێتەوە بریتی بوون لە (دواکەوتنی ژیری و بیرکۆڵی، نووقستانی لەچاو، لەگوێ، لە قاچ، لە دەست، لاڵی، کورتە باڵایی، فێ لێهاتن، نووقستانی لە کاسەی سەر، کەم خوێنی، نووقستانی لە دەم و چاو).

٢- (٣٩,٦٢٪) منداڵەکان هەر لەکاتی لەدایك بوونەوە نووقستان بوون بەڵام (٦٠,٣٨٪) منداڵەکان دوای لەدایك بوون بەهۆی شەڕو کوشتارو کارەسات و ڕووداوی دڵتەزێنی جیاجیاوە نووقستان و کەم ئەندام بوون.

٣- (٦٣,٠١٪) خێزانی منداڵەکان توانیویانە کە سەردانی پزیشك و نەخۆشخانە بەپێی پێویست بۆ چارەسەرکردنی منداڵەکانیان بکەن بەلام (٣٦,٩٩٪) خێزانەکان نەیان توانیوە.

٤- (٧٠,٥٦٪) منداڵەکان پێداویستیان بەکەرەستەو ئامرازی تایبەتی هەیە بۆ خۆسازاندن لەگەڵ ژینگەو دەوروبەرەکەیاندا، بەلام (٢٩,٤٤٪) منداڵەکان گوتیان پێداویستیمان پێیان نیە.

٥- لە (٨٢,٨٩٪) ئەو منداڵانەی کە پێداویستیان بە کەرەستەو ئامرازی تایبەتی هەیە، گووتیان دەستمان ناکەوێت و بۆمان ناکرێت. پێداویستی و کەرەستەکانیش بریتیە لە (سەماعە، دەست و پێی دەست کرد، دارشەق، عەرەبانە، چاویلکە، دەرمان، نەشتەرگەری (عملیات)).

٦- (٢٧,١٦٪) منداڵەکان بەردەوام پێداویستیان بەچاودێری و چارەسەرکردنە، ژمارەیەکی تریشیان لە چارەسەرکردن و چاك بوونەوە هیوا بڕاو بوون و هەندێکی تریشیان لەبەر هەژاری و نەبوونی ناتوانن چارەسەری خۆیان بکەن.

٧- (٤٠,١٩٪) منداڵەکان گوتیان ناتوانین بە ئیش و کارەکانی رۆژانەی خۆمان هەڵبستین و بەردەوام پێداویستیمان بەچاودێری و هاوکاری کەسانی چواردەورمان هەیە.

٨- (٦٤,٣٣٪) منداڵەکان گوتیان زۆربەی خەڵکی بەچاوی بەزەیی و نزم و کەم سەیرمان دەکەن و مامەڵەیان ئاسایی نیە، کە ئەمەش تووشی خەم و خەفەت و ئازارمان دەکات.

٩- (٤٧,٥٥٪) ئەو منداڵانە ناچنە قوتابخانەو وازیان لێهێناوەو هیچ دام و دەزگایەکی تایبەتیش نایان گرێتەخۆ.

١٠- دەرئەنجامی ئەم توێژینەوەیە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە زیاتر گرنگی بەکوڕە نووقستان و کەم ئەندامەکان دراوەو کچەکانیان پشت گوێ خستووە. بۆ نموونە (٦٠,٤٣٪) کچەکان هیچیان بۆ نەکراوە بەلام تەنها (٢٧,٦٢٪) کوڕەکان هیچیان بۆ نەکراوە. لەلایەکی تریشەوە (٨٤٪) کچەکان ناچنە قوتابخانە بەلام تەنها (٣٤٪) کوڕەکان نەخراونەتە قوتابخانە.

ئەمانەی سەرەوە حاڵ و گوزەران و باری دەروونی زۆربەی منداڵە نووقستان و کەم ئەندامەکانی هەردوو شاری سلێمانی و هەولێرن. ئەو زانیاریانەش لەزاری منداڵەکان خۆیان و خێزانەکانیانەوە وەرگیراوەو تاڕادەیەکی زۆر ڕاست گۆیەو بە ئەمانەتەوە گوزارشت لەژیان و گوزەرانی ئەو توێژەی کۆمەڵەکەمان دەکات. لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە لایەن دام و دەزگا بەرپرسەکان هەریەکە لای خۆیەوە هەوڵی دابین کردنی ئەو پێداویستیانەو دۆزینەوەی ڕێگاچارەی گونجاو بدات بۆ سووک کردنی باری گرانی ئەو منداڵانەو خێزانەکانیان و دووبارە پەروەردەکردن و پێگەیاندن. بۆ ئەم مەبەستەش ئەم پێشنیازانەی خوارەوە دەخەینە بەر دیدو بۆچوونیان:-

١- پێویستە لەمیانەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و کۆڕوکۆبوونەوەکانەوە دایکان و باوکان و مامۆستایان لە هۆکارەکانی نووقستانی و کەم ئەندامی ئاگادار بکرێنەوە، چونکە هەندێک لەحاڵەتەکان لەئەنجامی نەزانی و کەمتەرخەمی دایکان و باوکان و مامۆستای ئەو منداڵانەوە دروست بووە، کەواتە دەتوانرێت کاریگەری ئەو هۆکارانە دووربخرێتەوەو ڕێژەی ئەو منداڵانە لەداهاتوودا کەم بکرێتەوە.

٢- پێداویستیە گرنگەکانی ئەو منداڵانە لەداوودەرمان و کەرەستەو ئامرازی پێویست دابین بکرێت و چارەسەری هەندێک لە کەم و کوڕیەکانیان بکرێت.

٣- پێویستە هەڵمەتێکی نیشتمانی گەورە بۆ هۆشیار کردنەوەی تاکەکانی کۆمەڵ بکرێت، چونکە بەداخەوە کە زۆر لەتاکەکانی کۆمەڵ لەئەنجامی نەزانی و نەفامی خۆیانەوە

بەچاوی نزم و سووك سەیری کەسانی نووقستان و کەم ئەندام دەکەن، کە ئەمەش بێگومان ڕەنگدانەوەی خراپی لەسەرباری دەروونی ئەو نووقستان و کەم ئەندامانە دەبێت و گرفتەکانیان زیاتر ئاڵۆز دەکات و لەکۆڕو کۆبوونەوەو دام و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانیان دوور دەخەنەوە، کە بێگومان ئەمەش لەبەرژەوەندی خێزان وکۆمەڵ و ئەو نووقستان و کەم ئەندامانە نیە.

٤- زۆر پێویستە دام و دەزگاو قوتابخانەو پۆلی تایبەتی بۆ پەروەردەکردن و فێربوونی ئەو منداڵانە بکرێتەوە، لەبەرئەوەی زۆر لەو منداڵانە ناتوانن لەگەڵ منداڵە ئاساییەکاندا لە قوتابخانە گشتیەکان بخوێنن، بەتایبەتی ئەوانەی کە تووشی دواکەوتنی ژیری و بیرکۆڵی بوون.

٥- خولی ڕاهێنانی بەردەوام بۆ دایکان و باوکان و مامۆستایان و توێژەرە کۆمەڵایەتی و دەروونیەکان بکرێتەوە بۆئەوەی بتوانن بەشێوەیەکی سەرکەوتوانەو زانستیانە مامەڵە لەگەڵ ئەو جۆرە منداڵانەدا بکەن و فێری شێوازەکان و چۆنیەتی فێرکردن و پەروەردەکردنی ئەو منداڵانە بکرێت.

## منداڵی هەڵچوو دەمارگیر

گومانی تێدا نییە کە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان منداڵاندا هەیە و لە هەموو ژیاندا دوو منداڵی وەك یەك نادۆزرێتەوە، جیاوازی تاکایەتیش (الفروق الفردية) بۆ زۆر هۆکاری بۆماوەیی و بایۆلۆژی و ژینگەیی دەگەڕێتەوە. یەکێك لەو جیاوازیانەی کە هەیە، جیاوازی مەزاجی و هەڵچوونیە کە بە ئاسانی لە نێوان منداڵاندا بەدی دەکرێت. بۆ نموونە هەندێك منداڵ هەر لەدوای لە دایك بوون زۆر دەجوڵێن و دەگریەن و بەردەوام هەڵچوونی و دەمارگیری بوون بە بەشێك لە ڕەوشت وهەڵس و کەوتیان.

دەرەنجامی هەندێك لە توێژینەوەکانی دەروونزانان بەتایبەتیش (بافلۆف) ئاماژە بۆ بوونی دوو جۆر کۆئەندامی دەماری دەکەن، هەندێك کەس هەر لە دوای لە دایك بوون خاوەنی جۆرێك کۆئەندامی دەمارین (الجهاز العصبي) کە زۆر هەستیارەو بە بچووکترین وروژێنەر (مثیر) تووشی حاڵەتی هەڵچوونی و دەمارگیری (عصبي) دەبن، بەڵام لە بەرانبەر ئەو جۆرە، کۆمەڵێکی تر لە منداڵان هەن کە هەر لەکاتی لە دایك بوونەوە خاوەنی جۆرێك کۆئەندامی دەمارین کە زۆر سست و خاوو خلیچکە و زۆر بە زەحمەت دەوروژێندرێن.

جۆری یەکەم (واتە منداڵانی هەڵچوو دەمارگیر) پێویستیان بە مامەڵەی گونجاو و پێویست هەیە بۆیە دەبێت لە کاتی مامەڵە کردنماندا ڕەچاوی ئەو حاڵەتەیان بکەین لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە منداڵانە لەسەر بارێکی دەروونی و جەستەیی دیاریکراو بۆ ماوەیەکی زۆر نامێننەوە، بەڵکو (مەزاجی) دەبن و بەئاسانی لەحاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر دەگۆڕێت، هەروەها بچووکترین گلەیی و گازاندە و لێدان تووشی دڵەڕاوکێ وخەم و خەفەت و هەڵچوونیەکی زۆریان دەکەن. ئەم جۆرە منداڵانە لە ئەنجامی ئەو مەزاج و زوو هەڵچوونەیانەوە تووشی زۆر گیروگرفت دەبن.

بۆ نموونە ترس و دڵەڕاوکێی تاقیکردنەوە زۆر کاریان تێدەکات و لەوانەیە نەتوانن وەك پێویست وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە، هەرچەندە کە زیرەکیشن و وەڵامەکان دەزانن، بەڵام ئەو ترس و مەزاج و هەڵچوونەیان دەبنە کۆسپ و ڕێگر لەبەردەم وەڵامدانەوەی ڕاست، لەلایەکی تریشەوە زۆر جار ئەو مەزاج و دەمارگیری و هەڵچوونەیان دەبنە هۆی ئەوەی کە دڵی منداڵانی تر بڕەنجێنن و هەندێك جاریش ئازاریان بدەن. ئینجا بۆ ئەوەی ئەو جۆرە منداڵانە تووشی لاساری و سەرەڕۆیی و گۆشەگیری و باری دەروونی ئاڵۆز نەبن، ئەوا زۆر پێویستە کە دایك و باوك و مامۆستاو کەسانی چواردەوری هەر لە منداڵیەوە دەست نیشانیان بکەن و لە ڕێگەی مامەڵەی گونجاو و خولقاندنی ژینگەی لە بارەوە بواری خۆ سازاندنیان بۆ بڕەخسێنن.

**ئەم خالانەی خوارەوەش زامنی مامەڵەی دروستن لەتەك ئەو جۆرە مندالانە:**

١- نابێت دایك و باوك و مامۆستا لە ڕێگەی لێدان و توندو تیژیەوە چارەسەری گرفتی ئەو جۆرە منداڵانە بکەن، چونکە لێدان و هەڕەشە و سوکایەتی پێکردن ئەوەندەی تر باری دەروونی ئەو جۆرە مندالانە ئالۆزتر دەکەن. بەڵکو پێویستە ڕێزیان بگیرێ و ئەو مندالانە هەست بە سۆز و خۆشەویستی و بەزەیی گەورەکانیان بکەن.

٢- پێویستە زۆر گرنگی بە هەڵچوون و دەمارگیریەکەی نەدرێت و لەکاتی توڕەبوون و گریان و هات و هاوار کردنیدا پشت گوێ بخرێ و وازی لێ بهێندرێ تا دادەمرکێتەوە و دەگەڕێتەوە حاڵەتی ئاسایی خۆی ئینجا دوای ئەوە هۆی هەڵچوونەکانی بۆ ڕوون بکرێتەوە و ڕێنمایی پێویست بکرێت.

٣- زۆر پێویستە ئەو جۆرە مندالانە بە کارو چالاکیەکەوە خەریك بکرێن و وایان لێ بکرێت کە هەست بە بوون و گرنگی خۆیان بکەن.

٤- تا دەتوانرێت دەبێت ئەو جۆرە مندالانە لەو وروژێنەر و فاکتەرانە دوور بخرێنەوە کە دەبنە هۆی هەڵچوون و ترساندن و توڕە کردنیان بۆ نموونە سەیر کردنی فیلم و گۆرانی و بینراوی ترسناك و خەماوی و خوێندنەوەی چیرۆکی دڵتەزێن و باسکردنی حکایەت و ڕووداوی بە ئازار، ئەو جۆرە مندالانە تووشی بارێکی دەروونی ئالۆز دەکەن و مەزاج و دەمارگیرییەکانیان زیاتر دەکەن.

٥- نابێت بە هیچ شێوەیەك زیاد لە توانای خۆیان کاروچالاکیان لێ داوا بکرێ یان ڕێگرو بەربەست لەبەردەم پێداویستی و چالاکیە سەرەکیەکانیاندا دابنرێت بەڵکو دەبێت ئەو کارو چالاکیانەیان لێ داوا بکرێت کە دەتوانن بە ئاکامی بگەیەنن.

٦- باشتر وایە ئەم جۆرە منداڵانە لە کێ بڕکێ و پێش بڕکێ و مملمڵانێ دوور خرێنەوە و بەکەسانی تر بەراورد نەکرێن، بۆ ئەوەی هەست بەکەمی و شکستی نەکەن، لەبەرئەوەی ئەم جۆرە منداڵانە کەمتر لە منداڵانی تر بەرگەی سەرنەکەوتن دەگرن.

٧- زۆر پێویستە نیمەی گەورە لۆمە و ڕەخنەی زۆر لەو منداڵانە نەگرین و خاڵە بەهێزەکانیان بەدیار بخرێت.

## كابووس

كابووس بەو جۆرە خەونانە دەگوتريت كە مرۆڤ بەئاگا دەهينن و تووشی ترس و تۆقاندن و دڵەڕاوكييەكی زۆری دەكەن و ئەگەر پرسیاری لێ بكريت ئەوا دەتوانیت زۆربەی ڕووداوەكانی ئەو خەونە ترسناكە بگێڕێتەوە كە ئەم خاسیەتە لەزۆربەی خەونەكانی تردا نیە، چونكە كەسی بەئاگا زۆر بەكەمی ڕووداوو بەسەرهاتەكانی خەونی ئاسایی (كە بەزۆری ڕوودەدەن) بەبیردێنێتەوە، جیاوازیەكی تری نێوان خەونی ئاسایی و كابوس ئەوەیە زۆر بەكەمی ڕوودەدەن و لەنێوان سەدەها خەوندا یەكێكیان كابوس دەبێت، بەڵام ئەگەر ڕێژەی ڕوودانی كابوس زیادی كردوو لەسنووری ئاسایی خۆی تێپەڕی و لە هەفتەیەكدا بەلایەنی كەمەوە دوو سێ جار بە بەردەوامی دووبارە بووەوە، ئەوە مانای ئەوەیە كە ئەو كەسە لە بارێكی دەروونی ئاڵۆزدا دەژی و بەدەست گێروگرفت و ئەندێشەیەكەوە دەناڵێنێ و پێویستی بە ڕێنمایی و چارەسەركردنی ئەو هۆكارانەی كە تووشی ئەو بارە دەروونیەی كردووە هەیە.

لەڕاستیدا تاوەكو ئێستاش بەتەواوی هۆكارەكان و ئامانجەكانی كابوس نەزانراوەو چەندەها تیۆرو ڕاو بۆچوونی جیاجیا بۆ لێكدانەوەی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەیان لەسەر ئەوە كۆكن كە هۆكاری سەرەكی ڕوودانی كابوس دەروونین و پەیوەندیان بە ژیانی كۆمەڵایەتی و ئابووری و جەستەیی و سیاسی ئەو جۆرە كەسانەوە هەیە كە تووشی كابوس دەبن، واتە لە ئەنجامی ئەو هۆكارانەی سەرەوە لە ژیانی ئاسایی و ڕۆژانەیاندا تووشی ترس و دڵەڕاوكێ و گرژیەكی زۆر دەبن، كە ئەو ترس و گرژی و دڵەڕاوكێیانە بە چارەسەرنەكراوی دەمێننەوەو لەژیانی واقیعیدا ئازاری ئەو جۆرە كەسانە دەدەن لەكاتی خەوتنیشدا لەمیانەی خەونی ناخۆش و ترسناك و كابوسەوە گوزارشتیان لێدەكرێن. بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستیەش بەڵگەی زۆر هەیە، بۆ نموونە كابوس لەكاتی شەڕو كوشتارو كارەساتی سروشتی و نەبوونی و نەخۆشی و مردنی كەسانی خۆشەویست و نەهامەتیدا لەلای تاكەكانی كۆمەڵ بەگشتی و لەلای ئەو تاكانەی كە ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی ئەو

گێروگرفتانە دەبنەوە بەتایبەتی زۆر دەبن و زوو زوو دووبارە دەبنەوە، بەڵام هەرچ کاتێك ئەو کارەسات و شەڕو کوشتارو ناخۆشیانە نەما، ئەوا پاش ماوەیەکی کەمیش کابوس و خەونی تۆقێنەر زۆر کەم دەبنەوەو دەگەڕێنەوە سنووری ئاسایی خۆی.

لەدیارترین نیشانەکانی کابوس (ترس، بەئاگاهاتن لەخەو، زیاد بوونی لێدانی دڵ، تەنگەنەفەسی و هەست کردن بەخنکاندن، هەست کردن بەئیفلیجی و بێ دەسەڵاتی و نەتوانین بۆ خۆ ڕزگار کردنە ... تاد) کە سەرجەم ئەو نیشانانە نزیکن لە نیشانەکانی هەڵچوون و دڵەڕاوکێ.

کابوس حاڵەتێکی ئەوەندە ترسناك نیە کە مەترسی بۆ سەر ژیانی مرۆڤ هەبێت، هەرچەندە تاك بێزار دەکات و تووشی بارێکی دەروونی ئاڵۆزی دەکات، لەبەرئەوە هیچ پێویست بەمەترسی و گەورەگردنی ناکات، بەڵکو لەجیاتی ئەوە دەبێت ئەو کەسە (یان کەسانی چواردەوری) بەدوای هۆکارەکانیدا بگەڕێن، واتە دەبێت بزانێت ئەو ڕووداو بەسەرهاتانە چین کە بوونەتە هۆی ئەو کابوسە، زانینی ئەوەش ئەوەندە زەحمەت نیە ئەگەر ئەو کەسە دەست بکات بەیادکردنەوەو نووسینی ئەو ڕووداوو گۆڕانکارییانەی کە ئەو ڕۆژەی (یان چەند ڕۆژەی) پێش شەوی کابوسەکە ڕوویانداوە، وە بەراوردی بکات لەگەڵ هەموو ڕووداوەکانی ڕۆژانی تری پێش شەوی دروست بوونی کابوسەکە.

لەئەنجامی ئەوەدا بۆی دەردەکەوێت کە چ ڕووداوو بەسەرهاتێك هاوبەشەو بەردەوام پێش شەوی کابوسەکە ڕوویانداوە، ئەو کاتە دەتوانێت لەو ڕووداوو بەسەرهاتانە دوور بکەوێتەوەو لەکابوسیش ڕزگاری ببێت، دوور نیە هۆی کابوس بینینی فیلم و بیستنی چیرۆك و بەسەرهاتی ترسناك و خویناوی بێت، یان خواردنی زۆر بێت پێش خەوتن یان خەوتنی نادروست و جێگای ناخۆش بێت یان پێشبینی کردن و خەوو خەیاڵی ترسناك و مەترسیدار بێت یان هەڕەشەو تۆقاندن و هەست نەکردن بەئاسایش و دڵنیایی دەروونی بێت ... تاد. کەواتە چارەسەرکردن و ڕزگار بوون لەو هۆکارانەی سەرەوە زامنی نەمانی کابوسن.

## عینادی منداڵ و کەللە ڕەقی

عینادی (العناد) و کەللە ڕەقی منداڵ، جۆرە ڕەوشتێکە کە لەلای هەموو منداڵێک هەیە، بەڵام ماوەیەکی کەم بەردەوام دەبێت و دوای ئەوە نامێنێت، ئەم جۆرە ڕەوشتەش وەرگیراوە و منداڵ لەکۆمەڵەوە فێری دەبێت، ئینجا ئەگەر عینادی و کەللەرەقی منداڵ لە هەندێک کاتی دیاری کراو بۆ ماوەیەکی کەم بێت ئەوە ئاساییەو پێویست بە مەترسی و چارەسەرکردن ناکات، بەڵام کاتێک عینادی و کەللە ڕەقیەکە لە زۆربەی کات و بۆ ماوەیەکی زۆر دەبێت، ئەو کاتە دەبێت بە گرفت و پێویستی بە چارەسەرکردن دەبێت. عینادی و کەللە ڕەقی منداڵ مانای گوێ نەدان بەئامۆژگاری و قسەو فەرمانەکانی دایک و باوک و کەسانی ترو پابەند نەبوون پێیانەوە و سووربوون لەسەر ڕاو بۆچوونی خۆی، هەرچەندە کە هەڵەشن و دژی حەزو ئارەزو و ویستی دایک و باوک و مامۆستا و کەسانی ترە.

گومانیشی تێدا نیە عینادی و کەللە ڕەقی زۆر گیروگرفت و بگرە و بەردە بۆ منداڵ دروست دەکات، چونکە کاتێک منداڵ لەگەڵ دایک و باوک و مامۆستای دەکەوێتە عینادی و کەللە ڕەقیەوە ئەوا گرفت بۆ خۆی و دایک و باوک و مامۆستای دروست دەکات. هەروەها عینادی و کەللە ڕەقی دەبێتە هۆی گۆشە گیری و دوورە پەرێزی منداڵ، چونکە منداڵی عیناد و کەللە ڕەق و بوغزاوی، بەردەوام سوورە لەسەر قسەو ڕای خۆی و ڕازی نابێت بە نۆرمو پەیڕەو کردنی سیستمی گشتی و کۆمەڵایەتی، کە ئەمەش دەبێتە هۆی بێزاری منداڵانی ترو دوورکەوتنەوەیان.

بەزۆری عینادی و کەللە ڕەقی منداڵ لە دوای تەمەنی دووساڵیەوە سەر هەڵدەدات، لەبەرئەوەی پێش تەمەنی دووساڵی منداڵ ئەو توانا عەقڵییەی نیە کە دەبێت بە بنەمای عینادی و کەللە ڕەقی، چونکە منداڵ دەبێت هەست بە جۆرێک لەسەر بەخۆیی خۆی بکات و

ببێت بە خاوەنی قسەو ڕاو بۆ چوونی خۆی و سوور بێت و لێی پاشگەز نەبێتەوە، كە ئەم توانایەش لە دوای تەمەنی دووساڵیەوە دەردەكەوێت.

## زۆر هۆكار و فاكتەری كۆمەڵایەتی و دەروونی هەن كە دەبنە هۆی دروست كردنی هەڵس و كەوتی عینادی و كەللەڕەقی لە لای منداڵ، لەوانە:-

### ١- مل كەچ كردنی دایك وباوك و مامۆستا بۆ داواكارییەكانی منداڵ:-

گەورەترین هەڵەی دایك و باوك و مامۆستا ئەوەیە كە بەردەوام داواكاری و حەز و ئارەزووەكانی منداڵ جێبەجێ بكەن، كاتێك منداڵ داوای هەرشتێك دەكات و دەست بەگریان و هات و هاوار و كەللە ڕەقی دەكات و ئینجا دایك و باوك مامۆستا بۆ ڕازی كردن و بێدەنگ كردنی مل كەچی داواكاریەكانی دەبن، ئەمە دەبێتە هۆی چاندنی تۆوی عینادی و كەللە ڕەقی لەناخی منداڵدا، لەبەرئەوە نابێت بەردەوام دایك و باوك و مامۆستا مل كەچی داواكاریەكانی منداڵ بن، بەڵكو دەبێت بە پێی پێویست و لەكات و شوێنی گونجاودا داواكاری منداڵ جێبەجێ بكرێت و هەندێكیشیان ڕەت بكرێنەوە و هۆی ڕەت كردنەوەكەش بۆ منداڵ ڕوون بكرێتەوە، ئەگینا منداڵ لەسەر كەللە ڕەقی و عینادی بەردەوام دەبێت و دەبێت بە بەشێك لە هەڵس و كەوت و بیركردنەوەی.

### ٢- پەروەردەكردنی هەڵە:-

ئەگەر دایك و باوك و مامۆستا جۆرێك پەروەردەی ئەگۆڕ و بەردەوامیان نەبێت ئەوا زۆر ڕەوشتی نابەجێ (لەوانەش عینادی و كەللە ڕەقی) لەلای منداڵەكانیان دروست دەبێت بۆ نموونە ئەگەر باوك یان مامۆستا منداڵەكانی فێری ڕەوشتێك كردبێ، بەڵام دوای ماوەیەك پەشیمان ببێتەوە یان پێچەوانەكەی بكات، ئەو كاتە منداڵ ڕازی نابێت و دژی ویستی دایك و باوك ومامۆستای هەڵس و كەوت دەكات و سوور دەبێت لەسەر هەڵس و كەوتی یەكەم جاری، ئینجا ئەگەر دایك و باوك و مامۆستا ویستیان ڕایان بگۆڕن یان لە پەیمان و گفتێك

پەشیمان ببنەوە، ئەوا زۆر پێویستە هۆی ئەو گۆڕانکاریە بۆ منداڵەکان ڕوون بکاتەوە و لە ڕێگەی گفت و گۆوە ڕازیان بکەن.

**٢- جیاوازی نێوان دایک و باوک:-**

کاتێک باوک بە جۆرێک منداڵ پەروەردە دەکات کە جیاوازە یان دژ بە جۆری پەروەردەکردنی دایکە، یان باوک منداڵ لەسەر ڕەوشتێک سزا دەدات بەڵام دایک پاداشتی دەکات، ئا لەم کاتەدا منداڵ ئەو ناڕێکی و دژایەتیەی نێوان دایک و باوک بۆ بەرژەوەندی خۆی دەقۆزێتەوە و دەبێت بە بنەمای عینادی و کەللە ڕەقی.

**دانانی بەربەست و ڕێگری بەردەوام:-**

منداڵ زۆر حەز بە یاری کردن و چالاکی دەکات، ئینجا کاتێک منداڵ بە چالاکیەوە خەریکەو دایک و باوک بێ بەشی دەکەن و بەربەستی لەبەردەمدا دادەنێن. ئا لەم کاتەدا منداڵ عینادی و کەللە ڕەقی دەکات و دووبارەبوونەوەی منداڵ تووشی کەللە ڕەقی دەکات لەبەرئەوەی پێویسە کە باوک و دایک و مامۆستا ڕەچاوی ئەو خاڵانەی سەرەوە بکەن بۆ ئەوەی منداڵەکانیان توشی عینادی و کەللە ڕەقی بەردەوام نەبن.

**قسەکردن و رۆیشتن لەکاتی خەوتندا**

**نینۆک قرتاندن**

**پە نجە مژین**

**میزکردن بەخۆدا**

**قوتابی بۆ لە خوێندنگا رادەکات ؟**

**رێنمایی دایك و باوك**

**هەستکردن بە جوانی**

**چە پەڵی و نارێکی**

**رێز نەگرتنی کات**

## قسەکردن و ڕۆیشتن لەکاتی خەوتندا

هەندێک جار باوک و دایک لە ئەنجامی قسەکردن و ڕۆیشتنی منداڵەکانیان لەکاتی خەوتندا تووشی ترس و دڵەڕاوکێ دەبن و زیاد لە پێویست گەورەی دەکەن و بیری لێدەکەنەوە، بەڵام لەڕاستی دا ئەو دیاردەیە ئاساییە و هیچ مەترسیەکی لەسەر باری دەروونی منداڵ نییە و زیانی پێناگەیەنێ و تا گەورەش بێت بەرەو کەم بوونەوە دەچێت، واتە ئەم دیاردەیە لە لای زۆربەی منداڵان و تەنانەت گەورەکانیش هەیە و هیچ کەسێک نیە کە تووشی ئەو بارە دەروونیانە نەبێت بەڵام ئەگەر لە سنوری ئاسایی خۆی دەرچوو بەزۆری دووبارە بووەوەو گیروگرفتی بۆ منداڵ و کەسانی چواردەوری دروست کرد، ئەو کاتە پێویست بە چارەسەرو گەڕان بەدوای هۆکارەکانیدا دەکات.

زۆر هۆکاری جەستەیی و دەروونی هەن کە دەبنە هۆی سەر هەڵدانی ئەو دیاردە دەروونیەی سەرەوە، لەوانە جەستەیی (بەدهەرس کردن، قەبزی، خواردنی زۆر پێش کاتی خەوتن، تێک چوون و شلەژانی کاری هەندێک لە گلاندەکان لەوانە سیرۆیدە گلاند- الغدة الدرقية) منداڵ کرمی هەبێت، جۆر و شێوەی خەوتن، ئاوو هەوای ئەو جێگایەی کە تێیدا دەخەوێت، سوور هەڵگەران و زیادەی ناو لووت..تاد) یان دەروونین (هەست نەکردنی تاک بە دڵنیایی و وئاسایشی دەروونی، تێک چوونی شیرازەی خێزان بەهۆی لێک جیابوونەوە و مردن و کۆچ کردن... تاد) کە سەرجەم ئەو هۆکارانەی سەرەوە بە تەنها یان لەگەڵ یەکتریدا دەبنە هۆی جووڵەی زۆر لەکاتی خەوتندا و تەنانەت قسە کردن و ڕۆیشتن (القوصی، ١٩٨١، ص٢٦١).

چارەسەرکردنی ئەو حاڵەتانەی سەرەوە بەندە بە زانینی هۆکارەکانیەوە چونکە جیاوازیەکی تاکایەتی زۆر لە نێوان منداڵان و گەورەکانیشدا هەیە و حاڵەتەکان لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت، واتە هەرچ دایک و باوکێک منداڵی لەو جۆرەی سەرەوەی هەیە، دەبێت پێش هەموو شتێک پشکنینی جەستەیی و تەندروستی باشی منداڵەکەی

بكات بۆ ئەوەی لەوە دڵنیا بێت كە هیچ نەخۆشی و گرفتێكی جەستەیی نیە، هەروەها دەبێت گرنگی بە جێگاو شێوەی نووستنی منداڵەكەی بدات و نابێت جێگاكەی ڕەق و ناخۆش و بۆگەناوی و نابەجێ بێت و دووەهەم ئۆكسیدی كاربۆنی زۆری تێدا كۆ بووبێتەوە، هەروەها نابێت ڕێگە بە منداڵ بدرێت كە پێش خەوتن بە ماوەیەكی كەم خواردنی زۆر بخوات چونكە تووشی بەد هەرسی و ئازاری گەدەی دەكات و دوور نیە تووشی زۆر جوڵە و ڕۆیشتن و قسەكردنی بكات، ئەگەر دوای بە ئاكام گەیاندنی ئەو كارانە، هەر ئەو دیاردانە لەلای منداڵ بەردەوام بوون ئەوە مانای ئەوەیە كە باری دەروونی ئەو جۆرە كەسانە نا ئاساییە و بەدەست گرفت و ئەندێشەی دەروونیەوە دەناڵێنن و دەبێت چارەسەری گرفتە دەروونیەكانی بكرێت، لە ڕاستیدا ڕۆیشتن لە خەودا مەترسی لە قسە كردن زیاترە، چونكە مەترسی ئەوەی لێدەكرێت كە زیان بە خۆی بگەیەنێ و لە شوێنی بەرز بكەوێتە خوارەوە.

لەبەر ئەوە زۆر پێویستە كە دەرگاو پەنجەرە بەباشی دا بخرێت و بواری وا بۆ ئەو جۆرە كەسانە نەڕەخسێندرێ كە بتوانن بە ئاسانی هات و چۆ بكەن هەرچەندە زۆر جار ئەو جۆرە كەسانە دەڕۆن و دەگەڕێنەوە و دووبارە دەخەونەوە بەبێ ئەوەی زیان بە خۆیان بگەیەنن، هەروەها پێویستە بواری چالاكی و تێركردنی حەزو و ئارەزووەكان بۆ منداڵ دابین بكرێت، چونكە ئەگەر منداڵ لە ژیانی واقعیدا حەزوو خەو خەیاڵەكانی تێر نەكات، ئەوا بە ناچاری لەكاتی خەوتندا شەو تێریان دەكات و لەكاتی تێركردنیشدا زۆر جار دەست و قاچیان دەجوڵێنن و قسە وهات و هاوار دەكەن، بۆ نموونە جاری وا هەیە منداڵ لە خەودا یاری دەكات و لە ئەنجامیشدا لەقە دەهاوێت و سەر دەجوڵێنێ و قسە دەكات وەك چۆن لە ژیانی ڕۆژانەدا لەكاتی یاریكردندا ئەو چالاكیانە دەكات، یان حەز بە پاڵەوانبازی و شەڕخوازی دەكات و لە كاتی خەوتندا جنێو و هاوار و ئەم دیوو ئەو دیوو دەكات.

## نینۆک قرتاندن بە ددان

منداڵ لەو ڕۆژەوە لە دایک دەبێت تا دوا چرکەی ژیانی کە بە قۆناغەکانی منداڵێتی و هەرزەکاری و کاملی و بەساڵاچوویدا تێدەپەڕێت (ئەگەر تەمەنی درێژ بێت)، ڕووبەڕووی کۆمەڵێک کێشەو گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەبێتەوە لە ئەنجامیشدا تووشی چەندەها گرفت و نەخۆشی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەبێتەوە و ژیان و چارەنووسی دەخاتە مەترسیەوە.

لە ڕاستیدا زۆربەی زۆری ئەو گرفت و نەخۆشیە دەروونی و کۆمەڵایەتیانە لە ئەنجامی نەزانی و کەمتەرخەمی و توندو تیژی دایک و باوک وژینگەی نالەبار و دژواری کۆمەڵایەتی دروست دەبن. دەرەنجامی سەرجەم توێژینەوە زانستیەکان ئاماژە بۆ ئەو ڕاستیەی سەرەوە دەکەن و دەرکەوتووە کە ژینگەی نالەبار و پڕ لە گیروگرفت چارەنووسی مرۆڤ دەخاتە مەترسیەوە و تووشی زۆر دەردو ئەندێشەی دەکات. کێشە و گرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکان لەسەرەتادا زۆر سادەو ساکارن و دەتوانرێت بەئاسانی کۆنترۆڵ بکرێن بەڵام بەداخەوە پشت گوێ خستنیان دەبێتە هۆی هەڵئاوسان و گەورە بوونیان کە لە داهاتوودا زۆر بە زەحمەت چارەسەر دەکرێن.

یەکێك لەو گرفتە دەروونیانەی کە هەندێك لە منداڵان بە دەستیەوە دەناڵێنن، قرتاندنی نینۆکە بە ددان، کە زۆر جار لەگەڵ منداڵ بەردەوام دەبێت تا تەمەنێکی زۆر لە تەکیا دەمێنێتەوە، قرتاندنی نینۆك بە ددان لەسەردەمی منداڵیدا چەکەرەدەکات و ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش زیاتر سەوزتر و گەورە تر دەبێت و بە یەکێك لە هەڵس و کەوت و خووە خراپ و نا بەجێیەکان دادەنرێت. بوونی ئەم دیاردەیە بۆ ماوەیەکی کەم هیچ مەترسیەکی لەسەر باری دەروونی و کەسایەتی منداڵ نیەو پاش ماوەیەك وازی لێدەهێنێت، بەڵام مانەوەی ئەم دیاردەیە و بەردەوام بوونی تا دوا قۆناغەکانی منداڵی و سەرەتای قۆناغی هەرزەکاری، زیان بە کەسایەتی و باری دەروونی منداڵ دەگەیەنێت و پێویست بە چارەسەر کردن دەکات.

لە گرنگترین هەڵچوونەکان کە بەردەوام هاوشان و هاوکاتە لەتەک قرتاندنی نینۆك بە ددان هەڵچوونی تووڕەبوونە کە لە ئەنجامی گرژی و دڵە ڕاوکێ وناخۆشیەوە دروست دەبێت، هەر ئەمەشە دەبێتە هۆی ئەوەی کە دیاردەی قرتاندنی نینۆك بە ددان لەکاتی ڕوو بە ڕوو بوونەوەی گیروگرفت و ناخۆشی و خەم و خەفەتدا زیاتر ببێت و ئەو جۆرە منداڵانە زیاتر نارەحەت و بێزار بکات. قرتاندنی نینۆك بە ددان لە ئەنجامی دڵەڕاوکێ و گرژی و تووڕەبوون و ترس و بێزارییەوە دروست دەبێت و ئەو خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێ و گرژیانە لە ڕێگەی ئەو نینۆك قرتاندنەوە دەردەکەوێت و بە ئەمانی ئەو حاڵەتە دەروونییە ناخۆشانە لەناو دەچێت و بە زووری بوونیان زیاتر دەبێت.

یەکەم هەنگاوی چارەسەرکردن، گۆڕینی ژینگەی کۆمەڵایەتی ئەو جۆرە منداڵانەیە واتە دەبێت زانیاری تەواو دەربارەی ژیانی ئەو جۆرە منداڵانەو پەیوەندی نێوانیان و نێوان دایك و باوك و خوشك و براو مامۆستاکانیان کۆبکرێتەوە و هەوڵی دابین کردنی ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی پڕ لە خۆشی ودڵنیایی وئارامی بدرێت و دەبێت ئەو جۆرە منداڵانە هەست بە سۆز و خۆشەویستی و بەزەیی و ڕێزگرتنی کەسانی چواردەوریان بکەن، لەبەر ئەوەی هەست کردن بە ئاسایش و دڵنیایی و بەزەیی و سەربەستی لە گرنگترین پێداویستیە دەروونیەکانی منداڵەو بناغەن بۆ دروستی دەروونی و کەسایەتی سەرکەووتوی دوور لە کێشە و گرفتی دەروونی. هەروەها دەبێت ئەو جۆرە منداڵانە بەکارو چالاکیەکی ( هونەری، وەرزشی، ناوماڵ... تاد ) خەریك بکرێن، بۆ ئەوەی دەستەکانی بۆ بە ئاکام گەیاندنی ئەو جۆرە کارو چالاکیانە بەکاربهێنێ و دالغە لێنەدات و خەیاڵی بۆ قرتاندنی نینۆکەکانی نەچێت لە لایەکی تریشەوە نابێت بە هیچ شێوەیەك دایکان و باوکان و مامۆستایان بە گاڵتەو تیرو توانج سوکایەتی بەو جۆرە منداڵانە بکەن، چونکە گاڵتە پێکردن و تیرو توانج ئەو دیاردەیە زیاتر دەکەن و گرفتەکە ئاڵۆزتر دەکەن، لەجیاتی ئەوە پێویستە دەست نیشانی ئەو هۆکار و بارودۆخانە بکەن کە دەبێتە هۆی زیاد کردنی نینۆك قرتاندن بە ددان و دواتریش هەوڵی لەناو بردن و کەم کردنەوەیان بدەن، هەروەها لە ڕێگەی ئامۆژگاری بەردەوام و بیرخستنەوەی، خراپی و زیانەکانی ئەو دیاردەیە، دەتوانرێت منداڵ لەو گرفتە دەروونیە ڕزگار بکرێت.

## پەنجە مژین

لای زۆربەمان ئاشکرایە کە هەندێک هەڵس و کەوت و خووڕەوشتی ناشیرین و نادروست لە لای منداڵان هەیە و دەبێتە مایەی بێزاری و دڵتەنگی دایکان و باوکان مامۆستایان، یەکێک لەو ڕەوشت و هەڵس و کەوتە نا دروست و نا بەجێیانە پەنجە مژینە، پێشەکی پێویستە ئەوە بزانین کە توانای مژین و بە کارهێنانی هەردوولێو بۆ ماوەییە و منداڵ لەو چرکەیەی کە لەدایک دەبێت توانای مژینی هەیە و هەردوو لێوەکانی کامڵ وپێگەیشتوون و تا ڕادەیەکی زۆر یارمەتی مانەوەی ژیانی منداڵ دەدەن، چونکە ئەگەر منداڵ ئەو توانستەی نەبوایە ئەوە نەیدەتوانی بژی و مەمکی دایکی بمژێت.

پەنجە مژین لە چەند مانگی یەکەمی ژیانی منداڵدا کارێکی ئاساییە و هیچ مەترسیەکی لەسەر ژیان و باری دەروونی منداڵ نیە، لەبەر ئەوەی هەر لە دووسێ هەفتەی یەکەمەوە ئەم پەنجە مژینە لە لای هەندێک منداڵ دەردەکەوێت، بەتایبەتی کاتێک کە برسی دەبێ و لە کاتی خۆیدا شیری پێنادرێ، بەڵام بەردەوام بوونی ئەم دیاردەیە و مانەوەی لە لای منداڵ تا تەمەنی شەش هەفت ساڵی، کارێکی ئاسایی نیە وپێویست بە ئەوە دەکات کە بە دوای هۆکارەکانیدا بگەڕێین و چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزرێتەوە .

منداڵ لەسەرەتادا پەنجەکانی دەستی یان قاچی دەخاتە دەمیەوە و لە ئاکامیدا هەست بە ئارامی و دڵنیایی دەکات واتە منداڵی بچکۆلە لە کاتی خۆشی وکامەرانیدا جارناجار پەنا بۆ پەنجە مژین دەبات و بۆ ماوەیەکی کەمیشە بەڵام منداڵی گەورە لە کاتی ناخۆشی و بێزاریدا بەزۆری پەنا بۆ پەنجە مژین دەبات و ماوەیەکی زۆریش خۆی پێوە خەریک دەکات. گومانی تێدا نییە کە بەردەوام بوون و مانەوەی ئەم دیاردەیە بۆ ماوەیەکی زۆر زیان بە کەسایەتی و باری دەروونی منداڵ دەگەیەنێت، لەبەرئەوەی چالاکی و هەڵس و کەوتێکی بێ سوود وبێ ئاکام و بێ بەرهەمەو منداڵ لە واقیع دوور دەخاتەوە و دوور نیە زیان بە شێوە و ڕێک و پێکی نینۆک و ددانەکانی بگەیەنێت و سەرەڕای ئەوەش

کارێکی بێزراوو ناشیرینە و کەسانی چواردەوری منداڵ قێزوبێزی لێدەکەنەوە، لەبەر ئەوە زۆر پێویستە بەدوای هۆکارەکانی سەرهەڵدان و بەردەوام بوونی ئەم دیاردەیەدا بگەڕێن.

یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیە ئەوەیە کە منداڵ لەکاتی خۆیدا تێر نەبێت و شیرەکە بەشی نەکات، یان لەکاتی خۆیدا شیری پێ نەدرێ ئینجا منداڵ کاتێك کە برسی دەبێت و شیری پێنادرێ ئەوا دوور نیە پەنا بۆ مژینی پەنجەکانی ببات و لە ڕێگەیەوە هەست بە ئارامی دەروونی و خۆشی و تام و چێژ بکات، بەم شێوەیە هەمووکات لەکاتی برسێتیدا پەنا بۆ پەنجە مژین دەبات و دووبارە و چەند بارەیان دەکاتەوە تا پاش ماوەیەك دەبێت بە خووڕەوشتێکی نیمچە بەردەوام، بەڵام مەترسی ئەم دیاردەیە هەر لێرەدا ناوەستێت بەڵکو دەگوازرێتەوە بۆ بارو دۆخ و کات و شوێنی تر.

بۆ نموونە زۆر جار منداڵ نەك لەکاتی برسێتی بەڵکو لەکاتی بێزاری و دڵتەنگی و ناخۆشی و بێبەشبونیشدا هەر پەنا بۆ پەنجە مژین دەبات و لەناکامیەوە هەست بەخۆشی و کامەرانی دەکات و تا ڕادەیەك لەبواری دەروونی خۆیدا قەرەبووی ئەو بێزاری و دڵتەنگیەی خۆی پێ دەکات .

<u>چارەسەرکردنی پەنجە مژین پەیوەستە بە هۆکارەکانیەوە لەبەرئەوە داواکارین لە دایکان و باوکان کە سوود لەم ڕێنمایانەی خوارەوە وەربگرن و دەتوانن لە ڕێگەیانەوە چارەسەری پەنجە مژینی منداڵەکانیان بکەن:</u>

١- پێویستە دایك لە کاتی خۆیدا شیر بدات بە منداڵەکەی و تێر شیری بکات بۆ ئەوەی ناچار نەبێت کە پەنا بۆ پەنجە مژین بەرێت.

٢- دەبێت پەیوەندی نێوان منداڵ و دایك و باوك و خوشك و براکانی خۆش بێت و منداڵ هەست بە ئارامی و دڵنیایی بکات و نابێت سوکایەتی بە منداڵ بکرێت و لەسۆز و

خۆشەویستی و چاودێری دایك و باوك بێبەش بکرێت، چونکە ئەوانە بناغەن بۆ دروستی دەروونی منداڵ.

٣- دەبێت منداڵ بە یاریکردن و ئیشی دەستی و یارمەتی دانی دایك و باوك و چالاکیەکەوە خەریك بکرێت بۆ ئەوەی پەنجەکانی نەخاتە دەمیەوە بەڵکو بۆ بە ئاکام گەیاندنی ئەو کارو چالاکیانەی سەرەوە بەکاریان بهێنێ.

٤- هەروەها دەشتوانرێ ماددەیەکی تاڵ و ناخۆش لە پەنجەکانی بدرێت بۆ ئەوەی پەنجە مژینی لە لا ناخۆش و بێزراو بکرێ.

٥- دەبێت لەسەر پەنجە نە مژینی پاداشت و بەردەوامیش ئامۆژگاری پێویست بکرێ.

## میز کردن بە خۆدا: هۆکار و چارەسەرکردن

کارێکی ئاساییە منداڵ تا تەمەنی (٢)، (٣) دووسێ ساڵی، بەشەو خۆی پیس بکات و میز بکات بە خۆیدا، بەڵام کاتێک تەمەنی دەبێت بە شەش حەوت ساڵان و لەگەڵ ئەوەشدا بەشەو هەرمیز بەخۆیدا دەکات، ئەو کاتە نائاسایی دەبێت و پێداویستی بە چارەسەر کردن دەبێت، هەرچەندە تەمەنێکی دیاری کراو بۆ کۆنترۆڵ کردنی پرۆسەی دەرهاویشتن و ڕزگار بوون لە پاشەڕۆ نییە و لە منداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر دەگۆڕدرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەمەنی (٣) سێ ساڵان بە شێوەیەکی گشتی، بە تەمەنێکی گونجاو بۆ کۆنترۆلکردنی پرۆسەی میزکردن دادەنرێت.

هەرچەندە هەندێک منداڵ لە تەمەنی دوو (٢) ساڵییەوە، بەسەر ئەو پرۆسەیەدا زاڵ دەبێت و ئیتر میز بە خۆیدا ناکات. کەواتە کارێکی ئاساییە تا (٥) پێنج ساڵان، منداڵ میز بە خۆیدا بکات و هیچ مەترسیەکی نییەو نابێت دایک باوک بە نەخۆشی و حاڵەتێکی نائاسایی دابنێت. بەڵام ئەگەر تەمەنی منداڵ گەیشتە (٦)، (٧) شەش حەفت ساڵان لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەشەو میزی بە خۆیدا دەکرد، ئەوا ئەو کاتە پێویستە وەك نەخۆش و حاڵەتێکی نائاسایی سەیر بکرێن و بە دوای هۆکارەکانیدا بگەڕێن.

### زیانەکانی:-

گومانی تێدا نییە کە میزکردن بە خۆدا زیانی زۆر بە منداڵ و کەسانی چواردەوری دەگەیەنێت، دەتوانین بە کورتی زیانەکانی لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

١- پیس کردنی جل و بەرگ و پێخەف و ناخۆشکردنی بۆنی ئەو ژوورەی کە ئەو جۆرە منداڵانە تیایدا دەخەون، کە ئەمەش زیانی گەورە بەو لایەنە دەگەیەنێت.

٢- دەبێتە هۆی بێزار کردن و تورە بوونی دایك و باوك و کەسانی تر و خەفەتبار کردنیان، ئیتر لە ئەنجامی بۆنە ناخۆش و نائاساییەکەیەوە بێت یان بە ئاگاهێنان و خەولێزڕاندنیانەوە.

٣- گەورەترین زەرەر بە منداڵ خۆی دەکەوێت، بەتایبەتی کاتێك کە کەسانی چواردەوری گاڵتەو سوکایەتی پێبکەن، کەئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو منداڵە تووشی خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێ ببێت و هەست بەکەمی بکات و بە چاوی سووك سەیری خۆی بکات.

## هۆکانی میز بە خۆداکردن:-

لە ڕاستیدا یەك هۆی دیاریکراو بۆ ئەم دیاردەیە نییە، بەڵکو هۆکارەکان جۆراو جۆرن و لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر دەگۆردرێن، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەم هۆکارانەی خوارەوە بە گرنگترین هۆیەکانی میز کردن بە خۆدا دادەنرێن:

### ١- هۆکارە جەستەییەکان:-

وەك دەرکەتووە، هەندێك جار حاڵەتی جەستەیی، ڕۆڵی سەرەکی لە تووش بوون بە ئەم دیاردەیەی هەیە، بۆ نموونە (کەم خوێنی، سوور هەڵگەڕان و هەوکردنی میزەڵدان و بۆرییەکانی یان هەردوو گورچیلە، بەلهارزیا...تاد) دەبنە هۆی کۆنترۆڵ نەکردنی پرۆسەی میزکردن، کەواتە زۆر پێویستە کە پزیشك ئەو جۆرە منداڵانە ببینێت و پشکنینی (فحص) تەواوی بۆ بکات، ئەگەر دەرکەوت ئەو منداڵە هیچ نەخۆشییەکی جەستەیی نییە و کۆئەندامی دەرهاویشتنی (میز کردن) ساغ و سەلامەتە ئەوا ئەو کاتە دەبێت بە دوای هۆیە دەروونییەکاندا بگەڕێین.

## ٢- هۆکارە دەروونیەکان:-

زۆرن ئەو حاڵەتانەی کەهۆکارەکانیان دەروونین، دەرئە نجامی زۆر لە توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە نە بوونی ئەمن و ئاسایش لەناو خێزاندا، یەکەم هۆکارە بۆ تووش بوون بەم حاڵەتە، واتە ئەگەر منداڵ هەستی بە دڵنیایی خێزان و کەسانی چواردەوری نەکردو لە سۆزو خۆشەویستی دایك و باوکی بێبەشبوو، بەردەوام ڕوو بەڕووی سووکایەتی و گاڵتە پێکردن بوەوە، ئەو کاتە دوور نییە کە میز کردن بە خۆدا یەکێك بێت لە نیشانەو دەرئە نجامەکانی ئەو بارە دەروونی و خێزانیە ئاڵۆزەی کە تیایدا دەژی.

وەك دەرکەوتووە، ترس لەترسناکترین ئەو هۆکارە دەروونیانەیە کە دەبنە هۆی میزکردن بە خۆدا، ئیتر ترسەکە سروشتی بێت، وەك ترسان لە ئاژەڵ و دڕندەو هەڕەشە و لێدان یان خەیاڵی و دەست کردبێت، وەك بیستنی چیرۆك و چنینی خەوو خەیاڵی تۆقێنەر یان کۆمەڵایەتی بێت وەك لە دایك بوونی منداڵی تر و پشت گوێ خستنی ئەم یان مردنی کەسانی نزیك و خۆشەویستی.. تاد. کە سەرجەم ئەم حاڵەتانە، ئەو جۆرە منداڵانە تووشی خەم و خەفەت و ترس و دڵە ڕاوکێیەکی زیاد لە پێویست دەکەن و دوا جاریش دەبنە هۆی دروست کردنی ئەو حاڵەتانە.

## چارەسەرکردن:-

دەبێت دایکان و باوکان لەوە دڵنیا بن کە دیاردەی میزکردن بەخۆدا کاتییەوە پاش ماوەیەك نامێنێت، هەرچەندە بە داخەوە هەندێك حاڵەتی کەم تا ماوەیەکی زۆر هەر بەردەوام دەبێت، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی زۆربەی زۆری منداڵان پاش ماوەیەك لەو حاڵەتە ڕزگاریان دەبێت، بە تایبەتیش دوای ئەوەی کە کۆئەندامی دەماری ناوەندی و کۆئەندامی میزکردنیان بەتەواوی گەشە دەکەن، چونکە زۆربەی ئەو منداڵانەی کە میز بە خۆیاندا دەکەن، ماسوولکەکانی میزەڵدان بەتایبەتی و کۆئەندامی میزکردنیان بە گشتی

لەژێر كۆنترۆڵ و دەسەڵاتی خۆیاندا نین، لەبەر ئەوە پێویستیان بە هەندێك ڕاهێنان و ڕێنمایی كاتی پێویست هەیە بۆ ئەوەی بتوانن بە تەواوی كۆنترۆڵی پرۆسەی میزكردن بكەن، لەم كاتانەشدا ڕۆڵی دایك باوك و كەسانی تری چواردەوری منداڵ لە ڕۆڵی هەموو كەسانی تر گرنگترە .

**ئینجا بۆ ڕێنمایی كردنی دایكان و باوكان و چارەسەركردنی دیاردەی میزكردن بە خۆدا، ئەم خاڵانەی خوارەوە بە گرنگ و پێویست دەزانین:**

١- نابێت بە هیچ شێوەیەك گاڵتەو سوكایەتی بەو جۆرە منداڵانە بكرێت، چونكە گاڵتە پێكردن و ناووناتۆرەو قسەی ناخۆش ئەوەندەی تر حاڵەتی دەروونی ئەو جۆرە منداڵانە ئاڵۆزتر دەكەن.

٢- دەبێت ئەو جۆرە منداڵانە پیشانی پزیشكی تایبەت بە نەخۆشیەكانی كۆئەندامی میزكردن و دەرهاویشتن بدرێن، بۆ ئەوەی دڵنیا بن لەوەی كە هیچ نەخۆشیەكی جەستەییان نییە، ئەگەر هەشیان بوو دەبێت چارەسەربكرێن.

٣- نابێت ڕێگە بەو جۆرە منداڵانە بدرێت كە پێش خەوتن شلەمەنی و ئاوی زۆر بخۆنەوە، چونكە زۆر خواردنەوەی شلەمەنی زیاتر تووشی ئەو حاڵەتەیان دەكات.

٤- دەبێت یەك دوو سەعات دوای خەوتنیان بە ئەگا بهێندرێنەوە و بۆ سەر ئاو ببردرێن، بۆ ئەوەی لەو پاشەڕۆیەی ناو میزەڵدانیان ڕزگاریان بێت، هەروەها دەبێت سێ چوار كاتژمێر دوای ئەمەش بۆ جاری دووهەم بۆ هەمان مەبەست بە ئاگا بهێندرێنەوە. ئەم جۆرە ڕاهێنانە دەبێتە هۆی ئەوەی كە ئەو جۆرە منداڵانە ووردە ووردە خۆیان فێری ئەوە ببن كە لە كاتی پڕ بوونی میزەڵدانیاندا، بە ئاگا بێنەوە و لەو پاشەڕۆیە ڕزگاریان بێت.

٥- پێویستە لەسەر دایك و باوك هەر لە منداڵیەوە، منداڵەكانیان لەسەر سیستمێكی تایبەتی و دیاریكراو ڕابهێنن و لەو كاتە دیاریكراوانەدا بۆ سەر ئاو بیان بەن و لەسەر

ڕزگار بوون لە پاشەڕۆ ڕایان بهێنن، چونکە ئەو جۆرە ڕاهێنانە دەبێت بە بنەما بۆ منداڵ و زۆر جار لەو حاڵەتی میزکردن بە خۆدا، ڕزگاریان دەکات.

٦- پێویستە ڕێگە بەو جۆرە منداڵانە نەدرێت کە شیرینی یان سوێری زۆر بخۆن چونکە شتی سوێر و شیرین منداڵ ناچار دەکەن کە ئاوو شلەمەنی زۆر بخۆنەوە، کە ئەمەش لەبەرژەوەندی ئەو جۆرە منداڵانە نییە، بە تایبەتیش لە شەودا.

٧- نابێت جل و بەرگی خەوتنی ئەو منداڵانە لەو جۆرە بێت کە بە زەحمەت بکرێنەوە هەروەها دووری یان تاریکی ڕێگای ئاو دەست و شوێنی ڕزگار بوون لە پاشەڕۆ هۆکاری خراپن و دەبنە هۆی زیاد کردنی ئەو دیاردەیە.

٨- هەندێک لە ئەو جۆرە منداڵانە لە تاریکی دەترسن، ئا لەم کاتانەدا باشتروایە کە ژووری خەوتنیان کەمێك ڕووناك بێت و لە نزیك کەسێکی خۆیانەوە بخەون.

٩- باشتروایە کە ئەو جۆرە منداڵانە بە ڕۆژ بخەون، بۆ ئەوەی بەشەو خەویان قورس نەبێت و بە قوڵی نە خەون، چونکە ماندووبوونی ڕۆژ و نە خەوتنیان دەبێتە هۆی ئەوەی کە کاتێك شەو دەخەون زۆر بە زەحمەت بە ئاگا بێنەوە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی بەردەوام بوونی ئەو حاڵەتە و درەنگ ڕزگار بوون لێی.

١٠- دابین کردنی ئاسایش و ڕزگارکردنیان لە ترس و دڵەڕاوکێ، واتە ئەرکی سەرەکی دایك و باوك و کەسانی چواردەوری منداڵە کە ژینگەی پڕ لە دڵنیایی و ئارامی و خۆشەویستی بۆ منداڵەکانیان بخوڵقێنن و وا هەست نەکەن کە کەسانی بێزراو و پشت گوێ خراوو بێ نرخن، چونکە ترس و دڵەڕاوکێ و خەم و خەفەت ئەم حاڵەتە زیاتر دەکەن.

## قوتابی بۆ لە قوتابخانە رادەکات؟

دیاردەی وازهێنان و ڕاکردن لە قوتابخانە، دیاردەیەکی جیهانیەو، گەل و نەتەوە نیە لەسەر ڕووی ئەم زەمینە بەدەستیەوە نەنالێنی، هەرچەندە ئەم دیاردەیە لەهەموو وولاتێك هەیە بەلام وولاتە پێش کەوتووەکان دەستەو ئەژنۆ دانەنیشتوون لەبەردەم ئەم دیاردەیەدا، بەلکو بەردەوام بەتوێژینەوەی زانستی تاووتوێ و ئەم دیوو ئەو دیویان کردووەو ڕێگە چارەی گونجاویان بۆ دۆزیوەتەوە، بەلام لە وولاتە دواکەوتوەکان تاوەکو ئێستا گرنگی تەواویان پێ نەداوەو وەك دێوەزمەیەك دەستی ناوەتە قورقوڕاگەی پرۆسیسی پەروەردەو فێرکردن، ئەم دیاردەیە زۆر ترسناکەو زیان بەزۆر لایەنی ژیان و شارستانیەت دەگەیەنێ، لەلایەنی کۆمەلایەتیەوە، ئەو کەسانەی واز لە قوتابخانە دەهێنن و قۆناغەکانی خوێندن تەواو ناکەن، دادەنرێن بە نەخوێندەوارو ناتوانن بەئاسانی خۆیان لەتەك دیاردەکانی ئەمڕۆی پێش کەوتن و شارستانیەتدا بسازێنن.

لەلایەکی تریشەوە لەجیاتی ئەوەی ببن بەکەسێکی ڕۆشنبیرو ڕووناکبیر کاتێك خوێندن تەواو دەکەن، ئەوا دەبن بە بارو مشەخۆر بەسەر کۆمەلەوەو ڕەنجی ڕۆشنبیران و زانست خوازان دەخۆن، لەلایەنی ئابووریشەوە کەلێنێکی گەورە دەکەنە جەستەی ئابووری وولاتەوە، چونکە ئەو کەسانەی لەیەکێك لە قۆناغەکانی خوێندندا واز لە قوتابخانە دەهێنن و خوێندن تەواو ناکەن ئەوا چی مەسرەف و خەرجی و پارەی تیایدا سەرف کراوە بەفیڕۆ دەڕوات و هیچ بەرهەمێکی نابێت و لەلایەکی تریشەوە ئەو سالانەی خوێندنی وەك کەسێکی بێکارو بێ بەرهەم لەدەست چووە، ئەگەر بەهۆی خوێندنەوە نەبوایە ئەو کاتە لەبوارێکی تری بەرهەم هێنەردا بەگەڕ دەخرا، هەروەها ئەگەر ئەو سالانەی وازی لەخوێندن هێناوە یان دەرنەچووە بۆی حساب بکرێت ئەو کاتە زیانەکانی لەلایەنی ئابووریەوە گەلێك زیاتر دەبێت.

لەلایەنی دەروونیشەوە دیاردەی ڕاکردن لەخوێندن زیانی تایبەتی خۆی هەیەو هێمایەکە بۆ بوونی کەلێن و ئەندێشەو گیروگرفتی دەروونی لەلای ئەو تاکانە، بێ گومان ڕاکردن و تەواو نەکردنی خوێندن خۆی لەخۆیدا کەلێنێکی دەروونی دروست دەکات و ئەو کەسانە هەست بەکەمی و دڵەڕاوکێ و بێزاری دەکەن و ڕەنگدانەوەی خراپی دەبێت لەسەر ڕەوشت و کەسایەتیان.

**گومانی تێدا نیە، دەبێت کۆمەڵێک هۆکار هەبن و کار لە یەکتری بکەن تاوەکوو دیاردەی ڕاکردن لەخوێندن سەرهەڵبدات، لەوانەش ئەمانەی لای خوارەوەن:-**

**ژینگەی خێزان:-**

هۆکارێکی زۆر گرنگە بۆ قوتابی بۆئەوەی واز لەخوێندن بهێنێ یان بەردەوام بێت، (کاتێک ژینگەی خێزان پڕ بێت لەگیروگرفت و ئەندێشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی وەک لێک ترازاندنی خێزان لەئەنجامی بوونی ناکۆکی و شەڕو ئاژاوە لەنێوان دایک و باوک یان هەژاری لە ڕادەبەدەر کە نەتوانرێت پێداویستیەکانی قوتابی دابین بکرێت، یان سەیرکردنی خوێندن بەچاوێکی نزم و سوک لەلایەن تاکەکانی خێزانەوە یان بەزۆر کار بە خوێندکار بکرێت و پێداویستی زۆرو گران کە لەتوانای ئەودا نەبێت لێی داوا بکرێت ... هتد)، ئەمانە سەرجەم پاڵنەرێکی سەرەکین بۆ وازهێنان و ڕاکردنی خوێندکارو پچڕانی لەخوێنندنگا.

**ژینگەی قوتابخانە:-**

زۆرجار قوتابخانە خۆی هۆکارێکە بۆ ڕاکردنی خوێندکار، کاتێک بەشێوەیەکی دکتاتۆریانەو تۆقێنەرانە مامەڵە لەتەک خوێندنکارەکاندا بکات و جیاوازی تاکایەتی و پێداویست و حەزو ئارەزووەکانیان پشت گوێ بخات و پرۆگرامەکانی خوێندن وشک و قورس

و دوور لە حەزو تواناو ویستی خوێندكاران بێت و مامۆستا بەتواناو لێهاتوو نەبێت لەوانەكەیداو سەركەوتوو نەبێت لەجۆری ڕێگەو شێوەی وانە ووتنەوەداو، نەتوانێت پەیوەندیەكی سەركەوتوانەو مرۆڤانەو كۆمەڵایەتی لەتەك خوێندكارەكاندا دابنێت و قسەو گوتەی ناخۆش و ڕەق و بریندارکەر بەكاربهێنێت و نەتوانێت خاڵە لاوازو بەهێزەكانی خوێندكاران دیاری بكات و گیروگرفت و كەم و كوڕیەكانی نێوان خوێندكارانی پێ چارەسەر نەكرێت و نموونەیەكی سەركەوتوو نەبێت بۆ لاسایی كردنەوەو پاڵنەرو حەزو خواستەكانی خوێندكارانی پێ نەوروژێندرێ و ... هتد، بێ گومان لەم كاتەدا قوتابخانە وەك دۆزەخی لێ دێت لەبەرچاوی خوێندكارو بەردەوام هەوڵ دەدات لەو جۆرە ژینگەی پڕ لەئازارو ناخۆشی و گرژییە ڕزگاری بێت و لەدەستی ڕادەكات و بەدوای ژینگەیەكی خۆشترو گونجاوتردا دەگەڕێت.

## ژینگەی كۆمەڵایەتی:-

بێجگە لەژینگەی خێزان و خوێندنگا نەبێت نیتر گشت هۆكارەكانی تر ناودەبرێن بە ژینگەی كۆمەڵایەتی، بۆ نموونە (زۆرجار برادەری خراپ هۆكارێكی ترسناكە بۆ وازهێنان لەخوێندنگا. كاتێك خوێندكار تێكەڵاوی برادەری خراپ دەكات بەتایبەتی ئەوانەی كە وازیان لەخوێندن هێناوە، لەم كاتەدا هەندێك جار ئەو برادەرانە هاندەر دەبن بۆ وازهێنانی خوێندكارێكی تر لە خوێندن، بۆئەوەی ژمارەو نموونەی وەك ئەوان زۆر بێت)، (لەلایەكی تریشەوە ئەوانەی سەرەوایێك لەمێشكیاندا نیەو ڕاست و چەپی خۆیان ناناسنەوە، ئەمڕۆ لەناو كۆمەڵدا سەرومرو گەورەو خاوەن دەسەڵات و سەرمایەن و چارەنووسی خوێندەوارو ڕۆشنبیرانیان بەدەستە، ئینجا هەژاری و برسیەتی و گرانی ژیان لەولاوە بوەستێت كە بەزەحمەت بوارو دەرفەت دەدات مرۆڤ بتوانێت خوێندن تەواو بكات) خوێندكاری ئەمڕۆ كە سەیری ئەم لاو ئەولای خۆی دەكات و ئەم ژینگە كۆمەڵایەتیە ئاڵۆزو دژوارە دەبینێت، زۆرجار هەرەس دەهێنێت و بۆچوون و تێڕوانینێكی هەڵەی لا دروست دەبێت بەرامبەر خوێندن و زانست.

**ئوتابی:-**

هەندێك جار خوێندكار خۆی هۆكارێكە بۆ وازهێنان و تەواونەكردنی خوێندن و ڕاكردن لەخوێندنگا. زۆرجار نزمی ئاستی ویستی خوێندكار بۆ خوێندن و نەبوونی پاڵنەر لەلای بۆخوێندن و لاوازی و كەم و كورتی ژیری لەلای خوێندكار لەئەنجامی بوونی ناڕێكی لەكۆئەندامی دەماری ناوەندیدا یان دواكەوتنی ژیری لەئەنجامی هۆكاری بۆماوە یان ژینگە كاتێك كۆرپەلە بووە لەناو منداڵدانی دایكدا، هەروەها كەم و كورتی لەهەستەوەرەكانی (الحواس) خوێندكاردا ... هتد ئەمانە گشتیان هۆكاری خودی و ناوەكین بۆ ڕاكردن لەخوێند و نەتوانین بۆ تەواوكردنی قۆناغەكانی خوێندن.

ئەم هۆكارانەی لای سەرەوە دادەنرێن بەگرنگترین پاڵنەر بۆ وازهێنان لە خوێندن و ڕاكردن لەخوێندنگا، ئینجا ئەگەر بمانەوێت ئەو هەزارەها منداڵ و جگەرگۆشانەی ئێستا كەوتوونەتە ناو كوچەو شەقام و بازاڕو كۆڵانەكان لە وون بوون و چارەنووسی ڕەش ڕزگار بكەین و، كەمێك بەزەییمان بە پاشەڕۆژی ئەم گەل و نەتەوە هەژارو بێ كەسەدا بێتەوەو كەرەستەو ئامرازو هۆكارەكانی بەردەوام بوونی شارستانیەت بۆ پاشەڕۆژ زامن بكەین و بەهیوای ئەوە بین ئێمەش وەك گەلانی تری جیهان گەزە ئەرزو بستە زەمینێكمان هەبێت و جێگەیەكی هەرچەندە بچووكیش بێت هەمان بێت لەمێژووی گەلان و كاروانی شارستانیەتدا، ئەوا ئەركی سەرشانی هەموو لایەكەو ڕاسپاردەو پێداویستیەكی مێژووییە كە چاوێك بە پرۆسیسی خوێندن و زانستیدا بخشێندرێتەوەو زامەكانی دیاری بكرێت و هەوڵی تیمار كردن و سارێژكردنی بدرێت و بیرێك لەو بارودۆخە نالەبارو دژوارەی كوردستان بكرێتەوەو هەنگاوی پراكتیكی بە پەلەی بۆ بهاوێژرێت و چارەسەری گیروگرفت و دەردو ئەخۆشیە كۆمەڵایەتی و ئابووریەكان بكرێت، چونكە سەرجەم ئەو هۆكارانە دیاردەی ڕاكردن و وازهێنان لەخوێندنگای خوڵقاندووە. چارەسەركردنی ئەم دیاردەیە پەیوەستە بە چارەسەركردنی ئەو هۆكارانەی سەرەوە كە ئاماژەیان بۆ كرا.

## چەند ڕێنماییەكی پەروەردەیی بۆ دایكان و باوكان و مامۆستایان

پرۆسەی پەروەردە و فێركردن كارێكی زۆر ئاسان نییە و كەسانی شارەزا و بە توانا و لێهاتووی خۆی پێویستە، ئینجا كارەكە زەحمەتتر دەبێت ئەگەر پرۆسەكە پەروەردەی مندالآن و هەرزەكاران بێت. بە ئامانجی ئەوەی دایكان و باوكان و مامۆستایان لە پەروەردە و فێركردنی مندالەكانیاندا سەركەوتوو بن، ئەم پێشنیازو ڕێنماییانەی خوارەوەیان دەخەینە بەر دیدو دەستیان :

١- نابێت مندالْ ناچار بكرێت بەو جۆرە بیربكاتەوە كە ئێمە دەمانەوێت. جێگەی داخە زۆر لە دایكان و باوكان و مامۆستایان گوێ بە حەزوو ئارەزوو ویستی مندالەكانیان نادەن و ڕاو بۆ چوونی خۆیان بەسەریاندا دەسەپێنن و ناچاریان دەكەن كە ئەوان چیان دەوێت دەبێت مندالەكانیشیان هەر ئەوە بكەن. واتە جل و بەرگ و جۆری خوێندن و شێوەی یاریكردن و نان خواردن و گەشت و گوزار و هەلسان و دانیشتنیان بۆ دیاری دەكەن و دەبێت مندالْ و هەرزەكارەكانیان پەیرەوی بكەن و لە قسەیان دەرنەچن، بێگومان ئەم جۆرە پەروەردەیە زۆر هەلەیەو ناسنامە و كەسایەتی ئەو جۆرە مندالْ و هەرزەكارانە لاواز دەكات و تووشی زۆر گرفتی دەروونی و كۆمەلایەتیشیان دەكەن. لەبەرئەوە زۆر گرنگە كە بواری ڕادەربڕین و گفت وگۆ بۆ مندالْ و هەرزەكارەكانمان برەخسێنین و ڕێزی حەزوو ئارەزوو ڕاو بۆچوونەكانیان بگرین و ئەوانەش كە نە گونجاو و نادروستن ڕەت بكرێنەوە و مندالْ و هەرزەكارەكانیش لە نادروستی و نامەنتیقی ئەو جۆرە بۆچوون و حەزوو ئارەزووانە ئاگاداربكرێنەوە

٢- پێش ئەوەی دایك باوك و مامۆستا هیچ بڕیارێك بدەن، پێویستە گوێ لە مندالْ وقوتابیەكانیان بگرن وبزانن هۆو پالنەری ئەو جۆرە كردارو هەلس وكەوتەیان چی بووەوچی لەناو دلیاندا هەیە ,دوای ئەوە لە میانەی ئەو گفت وگۆو ڕادەربڕینەوە دەتوانرێت

بریاری راستەقینە بە باش و بە خراپی كارەكانیان بدرێت وپێویستیشە لە سەر كارە خراپەكانیان سەرزەنشت و سەركۆنەو لەسەر كارە باشەكانیشیان پاداشت وهانبدرێن.بە مەرجێك هۆی سزادان و پاداشت كردنەكەیان بۆ روون بكرێتەوە.

٣- دایك وباوك وماموستا نموونەی بەرزن ومندالْ وقوتابیان لاساییان دەكەنەوە. لەبەرئەوە نابێت دایك وباوك و ماموستا هەندێك هەڵس وكەوتی نابەجێ لە بەرچاوی مندالەكانیان بكەن (هاوار كردنی بەردەوام ,جنێووناوو ناتۆرە, هەڵچوونی زیاد لە پێویست ،درۆ، ناپاكی ,قومارو ئاكاری نابەجێ ....تاد)بۆ ئەوەی لە بەرچاوی مندالْ وقوتابیەكانیان سووك وبێ بەها نەبن و نەبن بە نموونەو پێشەوای خراپ بۆ لاسایكردنەوەیان, چونكە مندالْ چی ببینێ لاسایی ئەوە دەكاتەوە نەك چی ببیستێ ،كە بە داخەوە زۆر جار دایك وباوك وماموستا بە قسە و گفت ئامۆژگاری مندالەكانیان دەكەن بەلام بە كردەوە خۆیان جێبەجێی ناكەن وبگرە زۆر جاریش پێچەوانەكەی دەكەن .بۆ نموونە لە بەرچاوی مندالەكەی جگەرە دەكێشێ وسووكایەتی بە خێزانەكەی دەكات ،كەچی بە مندالەكەی دەڵێ كورم جگەرەكێشان خراپەو بەزەیت بە خوشك وبراكانتا بێتەوە.

٤- پێویستە هەر لە مندالیەوە (لە دوای تەمەنی سێ سالان)مندالْ لەسەر هەندێك كاروچالاكی ناومالْ رابهێنرێت، بۆئەوەی لەلایەك هەست بە بوونی خۆی بكات و لەلایەكی تریشەوە ئەو هەستەی لا دروست ببێت كە بەشێكە لەو خێزانەو بوونی خۆی هەیە. كارو چالاكیەكانیش بریتین لە (قاپ وقاچاغ شووشتن،رێكخستنی ناومالْ ,گسك لێدان ،هەلْخستنی جل وبەرگ ، پاككردنەوەی مێزو كورسی،رێكخستنی باخ و گولْ و بێستان.. تاد).

٥- نابێت لەبەرچاوی مندالْ دەنگە دەنگ و شەربكرێت و چارەسەری گرفتەكان بكرێن، لەبەرئەوەی ئەو دەنگە دەنگ و شەر و ناخۆشیانە باری دەروونی مندالْ ئالۆز دەكەن و هەست كردن بە ئاسایش و دلْنیایی لە دلْ و دەروونیدا دەرِمویێتەوە سەرەرای ئەوەش تووشی

ترس و دڵەڕاوکێی بەردەوامی دەکەن. ئینجا بۆ ئەوەی منداڵەکانمان تووشی ئەو بارە دەروونییە ناڵۆزە نەبن، ئەوا پێویستە دایك و باوك دوور لە منداڵ و لە ژوور و جێگای تایبەتی خۆیان چارەسەری گیروگرفت و ناکۆکیەکانی خۆیان بکەن.

٦- تا دەکرێت دەبێت دایك و باوك و مامۆستا لە لێدانی جەستەیی دوور بکەونەوە و لە جیاتی ئەوە پەنا بۆ سزادانی واتایی( معنوی ) وەك گلەیی لێکردن، توڕەبوون، هەڕەشە لێکردن، ناڕەزایی، وەرگرتن و کەم کردنەوەی پاداشت و ( امتیازات ) بەرن.

٧- پێویستە منداڵ هەر لە منداڵیەوە تێکەڵاوی هاوەڵ و منداڵانی تر ببێت و نابێت بە بیانووی ئەوەی فێری جنێووقسە و ڕەوشتی ناشیرین دەبێت ڕێگەی تێکەڵاو بوونی بە منداڵانی تری لێ بگیرێ، چونکە ئەگەر پێنج ساڵی یەکەمیش ڕێگەی پێنەدرا، ئەوا خۆ لە تەمەنی شەش ساڵی هەردەبێت بچێتە قوتابخانە و تێکەڵاوی منداڵان ببێت، ئەو منداڵانەی کە لە قۆناغی سەرەتایی تێکەڵاویان دەبێت هەر ئەو منداڵانەن کە لە پێنج ساڵی یەکەم ڕێگەی پێنەدراوە یارییان لەگەڵ بکات، ئینجا گرفتەکە نا لێرەوە سەر هەڵدەدات و ئەو منداڵە ڕووبەڕووی زۆر گرفت دەبێتەوە لەبەرئەوەی لە پێنج ساڵی یەکەم تێکەڵاوی منداڵانی وەك خۆی نەبووە و شارەزای فرت و فێڵ و ڕەوشت و هەڵس و کەوتی ڕۆژانەی ئەو جۆرە منداڵانە نەبووە .

ئینجا کاتێك لە دوای تەمەنی پێنج ساڵیەوە دەچێتە ناویان خۆی بە نامۆ دەزانێت و زۆر شتی منداڵانەی شاراوە هەیە نایزانێت و پیایاندا تێنە پەڕیوە و لە پێنج ساڵی یەکەم فێریان نەبووە، لەبەرئەوە زۆر جار منداڵانی تر فێڵی لێدەکەن و ئازاری دەدەن و مافەکانی پێشێل دەکەن. بەڵام ئەم دەستەوەستان ناتوانێت پارێزگاری لە خۆی بکات و دوور نیە تووشی گۆشەگیری و دڵەڕاوکێش ببێت.

٨- نابێت منداڵ بە هیچ شێوەیەک بخرێتە ناو کێشە و گرفتەکانی خێزان و بکرێت بە شاهید و لایەنێک، لەبەرئەوەی منداڵ توانای لێک دانەوەو هەڵسەنگاندنی کێشەو گرفتەکانی ناو خێزانی نییە و کاتێک دەکرێت بە شاهید ئەوا دوور نییە بکەوێتە هەڵەوە و دواجار ببێت بە لایەنێک و لە ئەنجامیەوە تووشی هەڕەشە و دڵتەنگی و شەرمەزاری و پەشیمانی ببێت.

٩- دەبێت ئەو نموونەو بەسەر هاتانەی بۆ منداڵ باس دەکرێت لەجیهانی واقعیەوە نزیک بێت و منداڵ رۆژانە ڕووبەڕوویان ببێتەوە، نەک باسی کەسانی خەیاڵی و ناواقیعی بۆ منداڵ بکرێت. بۆ نموونە هەندێک چیرۆک و بەسەرهات بۆ منداڵ باس دەکرێت، کە کەسایەتی و پاڵەوانەکانی زۆر زۆر ڕاستگۆ و دەست پاك و بە بەزەیی و دڵ گەورە و پیاو چاکن، کە ئەو جۆرە پاڵەوان و نموونانە بە هیچ شێوەیەک لەناو مرۆڤدا نین و مەگەر فریشتە بن، ئا لێرەدا منداڵ تووشی زۆر هێدمەو زەبری دەروونی و دووفاقی دەبێت و دوور نیە لە ئەنجامیەوە تووشی خەم و خەفەت و هەست کردن بەکەمی ببێت لەبەرئەوەی زۆر هەوڵ دەدات لاسایی ئەو جۆرە پاڵەوان و کەسایەتیە نموونەییانە بکاتەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت و جار لە دوای جاریش تووشی سەرنەکەوتن و هەست بە کەمی دەکات و وا دەزانێت کە ئەو کەسێکی بێدەسەڵاتە، نازانێت ئەو نموونەو کەسایەتیانەی بۆی باسکراوە لە واقعیدا نین و جۆرێکن لە خەیاڵ و شتی دروست کراو.

## چەند ساتێک بۆ منداڵەکەت تەرخان بکە

منداڵ پێویستیەکی زۆری بەدایک و باوك هەیە، لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە باوك و دایك ڕۆژانە چەند ساتێك بۆ قسە لەگەڵ کردن و لاواندنەوەو پەروەردەو فێرکردنی منداڵەکانیان تەرخان بکەن، ڕاستە باوك و دایك سەریان قاڵەو زۆربەی کات خەریکی پەیدا کردنی لوقمە نانێکی حەلاڵن بۆ منداڵەکانیان، بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئیتر دەبێت منداڵەکان پشت گوێ بخرێن، چونکە پشت گوێ خستنی منداڵ و تەرخان نەکردنی چەند ساتێك بۆ پەروەردە کردنیان زیانی گەورە بەکەسایەتی و باری دەروونی منداڵ دەگەیەنێت.

خۆشەویستی و لاواندنەوەی دایك و باوك بۆ منداڵەکانیان هیچی لەئاوو هەواو خۆراك کەمتر نییە، ئینجا ئەگەر باوك و دایك بەردەوام سەرقاڵی کارکردن و هات و چوون بن و ڕۆژانە کاتێکی دیاریکراو بۆ ڕێنمایی و پەروەردەکردنی منداڵەکانیان تەرخان نەکەن، بێگومان ئەو منداڵانە بۆ ماوەیەك لەسۆزو خۆشەویستی دایك و باوك بێبەش دەبن، ئینجا ئەگەر ماوەی دوورکەوتنەوەی دایك و باوك وسەرقاڵبوونیان لەسنووری ئاسایی خۆی دەرچوو، ئەو کاتە زیان بەگەشەکردنی دەروونی منداڵەکانیان دەگات ( Feldman, 2000, P:367).

لەلایەکی ترەوە ئامادەبوونی باوك و دایك و تەرخان کردنی چەند ساتێك بۆ منداڵەکانیان سوودێکی زۆر بەلایەنی عەقلی و کۆمەلایەتی و ئەخلاقی منداڵەکانیان دەگەیەنێت، پێویستە ئەوەشمان لەبیرنەچێت کە تەنها ئامادەبوونی دایك و باوك لەنێو ماڵدا بەس نییە بەڵکو زۆر پێویستە کە ئەو ئامادەبوون و کاتانە بۆ وروژاندنی منداڵ و قسە لەگەڵ کردن و وەلام دانەوەی پرسیارەکانی بێت. چونکە منداڵ سوود لەو جۆرە باوك و دایکانە وەرناگرن کە کاتی ماڵەوەیان تەنها بۆ کارکردن و خوێندنەوەو جێبەجێکردنی چالاکیەکانی خۆیان تەرخان دەکەن، لەبەرئەوە ئەگەر دایك و باوك بیانەوێت سوودو

قازانج بە منداڵەکانیان بگەیەنن ئەوا زۆر پێویستە کە ئامادەبوونیان زۆر کاریگەر بێت و ماوەیەکی دیاری کراو بۆ منداڵەکانیان تەرخان بکەن.

**باوك و دایك دەتوانن ئەو کاتەی کە بۆ منداڵەکانیان تەرخان دەکەن، بۆ بە ئاکام گەیاندنی ئەم چالاکیانەی خوارەوە سوودی لێ وەربگرن:-**

١- کاتێك دایك و باوك سەیری تەلەفزیۆن دەکەن یان گوێبیستی ڕادیۆ دەبن یان کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامە دەخوێننەوە، پێویستە هەندێك لەو شتانەی کە دەیانبینن و گوێبیستی دەبن و دەیانخوێننەوە، بۆ منداڵەکانیان ڕوونی بکەنەوەو وەڵامی پرسیارەکانیشیان زۆر بەڕاشکاوانەو زانستیانە بدەنەوە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی دەوڵەمەند کردنی زمانی منداڵ و زیادکردنی زانیاریەکانی دەربارەی دیاردەکانی ژیان و فراوانکردنی ئاسۆی بیرکردنەوەیان.

٢- منداڵ پێویستیەکی زۆری بە ئەمن و ئاسایش و دڵنیایی و بڕوا بەخۆبوون هەیە، گومانیشی تێدانیە یەکەم کەسی خۆشەویست و دڵسۆز کە بتوانێت ئەو پێداویستیە دەروونیانە بۆ منداڵ دابین بکات دایك و باوکە، ئینجا ئەگەر باوك و دایك کاتێکی دیاری کراو بۆ منداڵەکانیان تەرخان نەکەن و هەر خەریکی کاروباری دەرەوەی خێزان بن، ئەوا بێگومان منداڵەکانیان لەو پێداویستیە دەروونیانە بێبەش دەبن و بەردەوام بوونی ئەو حاڵەتەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە کەلێن و دەلاقەو درز بکەوێتە باری دەروونی و کەسایەتی منداڵانی ئەو جۆرە دایك و باوکانە.

٣- باوك و دایکی بەڕێز هەوڵبدە ئەو کاتەی کە بۆ منداڵەکانت تەرخان دەکەیت، لەڕێگەیەوە منداڵەکانت بەکەرەستەو کەل و پەلەکانی ناوماڵ و کۆڵان و ژینگەکەت ئاشنا بکە، واتە ناوی شتەکان و ئەرك و فەرمان و ڕەنگ و جۆرەکانیانی فێر بکە، بۆ نموونە منداڵێکی (٤)، (٥) ساڵانت لەماڵەوە هەیە، هەوڵبدە فێری ئەرك و سوودو قازانجەکانی

(سەلاجە، تەلەفزیۆن، فینك كەرەوە، ڕیكۆردەر، كارەبا، گلۆپ، پەنجەرە، دەرگا، تەلەفۆن، قاپ و قاچاغ، دەرزی و دروومان، پێخەف، ڕاخەر، ... تاد)بكە، كە ئەوەش سوودیكی زۆری بۆ منداڵ دەبێت، بەتایبەتیش كاتێك كە دەچێتە قوتابخانە، سەرەڕای ئەوەش باس كردنی گرنگی ئەو شتانە زۆر پرسیارو تێبینی لەلای منداڵ دروست دەكات، كە دووباره تۆش وەلامی دەدەیتەوە، گفت و گۆو مشت و مڕێكی زۆر دروست دەكات، كە سەرجەم ئەو چالاكیانەش دەبێتە هۆی فراوانكردنی ئاسۆی بیركردنەوەی منداڵ و گەشەكردنی عەقلی.

٤- زۆر پێویستە جار ناجارێك دایك و باوك منداڵەكانیان لەگەڵ خۆیان بۆ دەرەوەی خێزان بەرن چونكە كاتێك باوك لەگەڵ خۆی منداڵەكەی بۆ (باخچە، كتێبخانە، مۆزەخانە، باخچەی ئاژەلان، دوكان و بازاڕ، قوتابخانە، باخچەی گشتی، كارگەو فەرمانگە ... تاد) دەبات، بێگومان منداڵ شارەزای ئەو جێگاو شوێنانە دەبێت و بەكارمەندو خەڵك و كەرەستەو ئامێرو كەل و پەلەكانی ئەو جێگایانە ئاشنا دەبێت و سەرەڕای ئەوەش زۆر پرسیاری دەربارەیان لەلا دروست دەبێت و باوكیشی هەندێك زانیاری دەداتێ، كە بەم سەردان و گەڕانەش زانیاریەكی زۆری دەست دەكەوێت و لەداهاتوو سوودی لێ وەردەگرێت، بەمەش شارەزای ژینگەو هەندێك لەدیاردەو دامەزراوە كۆمەلایەتیەكانی دەبێت.

٥- باوك دەتوانێت زۆر چەمكی زانستی (بارستایی، كێش، كات، گەورە، بچووك، نیوە، سەرەوە، خوارەوە، لاتەنیشت، ڕاست، چەپ، بازنە، چوارگۆشە، ... تاد) فێری منداڵەكانی (پێش چوونە قوتابخانەیان) بكات، بێگومان ئەمەش سوودی زۆری بۆ ئەو منداڵانە دەبێت كاتێك كە دەچنە قوتابخانە، بۆنموونە باوك دەتوانێت كەرەستەو كەل و پەلەكانی ئاوماڵ بۆ ئەو مەبەستە بەكاربهێنێ، بۆ منداڵەكەی ڕوون بكاتەوە كە ئەم سەلاجەیە گەورەترە لە تەلەفزیۆنەكە، ئەم كورسییە شینە بچووكترە لەو كورسییە سوورە، ئەم كەوچكە درێژترە لەو چەقۆیە، ئەم كتێبە ئەستوورترە لەو گۆڤارە، ئەم پەتە بارێك

تره لەو حەبلە یان گوریسە، یان ڕەنگی ئەو قاپە شینە بەڵام ڕەنگی ئەمەیان سپییە، ئەم سێوەت بۆ دەکەم بە دوو لەتەوە، دەتۆش ئەو نانەم بۆ بکە بە دوو لەتی وەك یەکەوە، یان پێی بڵێ ئەو قاپە گەورەم بۆ بهێنە یان ئەو پەرداخە بچووکە لەوێ دانێ یان .. یان .. تاد.

کەواتە تەرخان کردنی کاتی باوك و دایك بۆ منداڵ قازانجی زۆر بە منداڵ دەگەیەنێ و زۆر پێویستە کە هەموو باوك و دایکێك چەند کاتێکی دیاری کراو لەهەفتەدا بۆ منداڵەکانیان تەرخان بکەن و هەوڵیش بدەن ئەو کاتانە بەباشترین شێوە بقۆزنەوەو بۆ پەروەردەو فێرکردنی منداڵەکانیان بەکاری بهێنن.

ئەوە ماوە بڵێین، کە هەر لە منداڵی، منداڵ پێویستی بە دایك و باوکی نییە بەڵکو لە هەموو قۆناغەکانی تری ژیانیش هەر پێویستی پێیان هەیە، بۆ نموونە لەقۆناغی هەرزەکاریش، هەرزەکار زۆر پێویستی بە دایك و باوك هەیەو دەیەوێت زانیاری پێویستی دەربارەی گیروگرفتەکانی قۆناغی هەرزەکاری دەست بکەوێت و لەگەڵیاندا بکەوێتە گفت و گۆو باسی دڵ و دەروون و ویستی خۆی بکات. بەڵام بەداخەوە زۆر لەدایك و باوکانی ئێمە هیچ گرنگیەکی ئەوتۆ بە منداڵەکانیان نادەن و وەك پێویست کاتی دیاری کراو بۆ منداڵ و هەرزەکارەکانیان تەرخان ناکەن و زۆربەی کات سەرقاڵی ئیش و کاری دەرەوەی خێزانن و کاتێکیش بۆ ماڵ دەگەڕێنەوە هیلاك و ماندوون و تواناو بواری ئەوەیان نیە کە کاتێکی دیاریکراو بۆ منداڵ و هەرزەکارەکانیان تەرخان بکەن، بەمەش زیانێکی گەورە بەگەشەکردنی دەروونی و عەقڵی منداڵ دەگات.

## تاوانی باوك، قوربانی منداڵ

سەرجەم زاناو رۆشنبیران جەخت لەسەر قۆناغی منداڵی بەگشتی و پێنج ساڵی یەكەم بەتایبەتی دەكەن و بەقۆناغێكی ناسك و گرنگی لە قەڵەم دەدەن، لەبەرئەوەی زۆربەی خاسیەت و رووداوە گرنگەكان تیایدا سەرهەڵدەدەن، یەكەم دامەزراوی كۆمەڵایەتیش كە رۆڵی گرنگ و ترسناكی لە ژیانی منداڵدا هەیە، خێزانە، خێزان یەكەم قوتابخانەیە كە منداڵ فێری وانەكانی ژیان دەكات، دایك و باوكیش یەكەم مامۆستای ئەو قوتابخانەیەن، ئینجا ئەگەر دایك و باوك بەرۆڵی سەرەكی خۆیان هەڵنەستان و لە پەروەردەكردنی منداڵەكانیاندا كەمتەرخەم بوون، ئەوا مەترسی زۆر رووبەرووی ئەو جۆرە منداڵانە دەبنەوەو بەزیانی خێزان و كۆمەڵ تەواو دەبێت. ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە كەمتەرخەمی و نەزانی هەندێك باوكە، كە دەبنە هۆی لادان و سەرەرۆیی منداڵەكانیان، بەداخەوە ژمارەیەكی زۆر باوكی نەزان و كەمتەرخەم هەن كە بەهیچ شێوەیەك سیفاتەكانی باوكایەتیان تێدا نیەو هیچ شتێكیش دەربارەی پەروەردەو مافەكانی منداڵ نازانن و بەرۆڵی پێویستی خۆیان هەڵناستن، كەئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ژمارەیەك لەمنداڵەكانیان تووشی تاوان و لاساری ببن.

ئالێرەدا پرسیارێك قووت دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە، دەبێت كامیان سزا بدرێت، ئەو باوكە نەزان و كەمتەرخەمە بەرپرسیارە یان منداڵەكانی؟ گومانی تێدا نیە وەڵامی زۆربەی مافپەروەرو یاساناسی لای خۆمان ئەوەیە كە منداڵەكە تاوانبارە، لەبەرئەوەی ئەو دزی یان تاوانەكەی بەئاكام گەیاندووە. لەراستیدا ئەو مافپەروەرو یاساناسەش مافی خۆیانە كە ئەو وەڵامە بدەنەوە چونكە ئەوان بەپێی ئەو یاسایەی لای خۆمان كێشەكان تاووتوێ دەكەن و بڕیاری خۆیان دەدەن، چونكە بەپێی یاسای مێردمنداڵان، ئەو مێردمنداڵە تاوانبار دەكرێت كە تاوانەكەی بەئاكام گەیاندووە، بەڵام ئەگەر بەشێوەیەكی زانستیانە لەو كێشانە بكۆڵینەوەو زانیاری تەواو دەربارەی ژیان و گوزەران و مێژووی ئەو مێردمنداڵە تاوانبارانە كۆ بكرێتەوە، ئەو كاتە دەردەكەوێت كە ئەو مێردمنداڵانە قۆچی قوربانی

بەردەستى هەندێك باوك و دايكى نەزان و كەمتەرخەمن و ئەوان بەرپرسيارن لەلادان و سەرەرۆيى منداڵەكانيان، كەواتە (حەق) وايە ئەو دايك و باوكە نەزان و كەمتەرخەمانە پەلكێشى دادگا بكرێن و ئەوان ڕەوانەى بەنديخانە بكرێن، نەك منداڵێكى (١٠)، (١٢) دە دوانزە ساڵان.

بەلام بەداخەوە ياساكانى لاى خۆمان لەزۆر لايەنەوە كەم وكورتى تێدايەو هەنديكيان لەگەڵ گيانى سەردەم و گۆڕانكاريەكانيدا ناگونجێن، كەواتە حكومەتى هەرێمى كوردستان، لەرێگەى وەزارەتى دادەوە چاوێك بەو حاڵەتانەدا بخشێنن كە منداڵ و مێردمنداڵان بوونەتە قوربانى نەزانى و كەمتەرخەمى هەندێك لەدايكان و باوكان، چونكە حكومەت لە هەموو وولاتانى جيهاندا باوكى دووهەمەو ئەگەر باوكى يەكەم نەيتوانى منداڵەكانى پەروەردە بكات، ئەوا مافى باوكى دووهەمە كە سەرپەرشتى ئەو جۆرە منداڵانە بكات و بەرگرى لە مافەكانيان بكات تەنانەت مادەكانى (٢٠) و (٢١) لەرێككەتنامەى مافەكانى منداڵ جەخت لەسەر ئەوە دەكات.

واتە كاتێك باوك ژنەكەى تەلاق دەدات و بۆ بەرژەوەندى تايبەتى خۆى ژنێكى تر دەهێنێتەوەو منداڵەكانى بەرەلا دەكات، يان خۆى بەرپرسياريەتى بەخێوكردنى منداڵەكانى دەداتە دەست دام و دەزگاو كەسانى ترو منداڵەكانى بەرەڵاى سەرجادەو كۆڵانەكان دەكات يان بەردەوام لێدان و توندوتيژى لەتەك منداڵەكانيدا بەكاردەهێنێ ئەوا مافى حكومەتە كە بەپێى ياسا پارێزگارى لەو جۆرە منداڵانە بكات و سزاى ئەو كەسانەش بدات (ئەگەر باوكيش بێت) كە بوونەتە هۆى لادان و سەركێشى، ئەگينا هەندێك دايك و باوكى نەزان و كەمتەرخەم ساڵانە دەيەها بگرە سەدەها منداڵى شەڕانگێزو درۆزن و تاوانبارو نەخۆش بۆ كۆمەڵ بەرهەم دەهێنن و بەوەش زيانى گەورە بەجەستەى كۆمەڵ و دام و دەزگاكانى دەگات. ئەوە ماوە بڵێم خۆزگە لەسەدەى بيست و يەك منداڵانى كورديش وەك منداڵانى زۆربەى گەلانى دونيا مافەكانى دەپارێزرا، خۆزگە.

## هەست كردن بەجوانى و چۆنيەتى گەشە پێكردنى لەقۆناغى منداڵى

هەست كردن بەجوانى بەشێكى گرنگى كەسايەتى مرۆڤەو پێداويستيەكى دەروونيشەو نەبوونى كەم و كورتى و دەلاقە دەخاتە كەسايەتى مرۆڤەوە، لەبەرئەو گرنگيەى (هەست كردن بەجوانى) زۆر پێويستە هەر لەمنداڵيەوە لەناو خێزان و قوتابخانە ژينگەو بارودۆخى گونجاو بۆ گەشەكردنى بخولقێنين. هەست كردن بەجوانى وەك پێداويستيەك رەگ و ريشەى لەقولآيى مێژوودايەو هەر لەكۆنەوە مرۆڤ هەستى بەگرنگى ئەم پێداويستيە كردووە. وێنەو نيگارى ناو ئەشكەوتەكان و هەلكۆلينى داروبەردو دروستكردنى گۆزەو ديزەو كەرەستەكانى ناوماڵ و پێداويستيەكانى رۆژانە گەواهى ئەو راستيە دەدەن كە مرۆڤ لەدێر زەمانەوە گرنگى بەو پێداويستيە داوەو هەوڵى تێركردنى داوە.

خوداى گەورە جوانەو جوانيشى خۆش دەوێت، كۆئەندامى دەمارى ناوەندى مرۆڤيش (مێشك) حەز بە بينينى شتى جوان و بيستنى دەنگى خۆش و رێك و پێك و بۆنى خۆش و تام كردنى شتى ناياب دەكات. بەبينينى و بيستنى شتى نارێك و ناخۆش بێزار دەبێت. ئەمەش ماناى ئەوەيە كە پێداويستى (هەست كردن و تام و چێژ وەرگرتن لەجوانى) بنەماى دەروونى و فسيۆلۆژى خۆى هەيەو دەتوانين لەرێگەى پەروەردەو فێركردنەوە گەشەى پێبكەين.

<u>دايك و باوك و مامۆستاو كەسانى چواردەورى منداڵ، دەتوانن لەرێگەى ئەم خالآنەى خوارەوە گەشە بە پێداويستى (هەست كردن بەجوانى) لەلاى منداڵەكانيان بكەن و تۆوى خۆشەويستى و هەست كردن بەجوانى لەناخ و دڵ و دەروونياندا بچێنن:-</u>

١- زۆر پێويستە هەر لەمنداڵيەوە منداڵ لەسەر رێك خستنى ناوماڵ و جوان دانانى كەل و پەلەكانى خۆى و بەرێزدانانى شتەكانى ناوماڵ و چواردەورى رابهێندرێت، بۆئەوەى لەرێگەى ئەو چالاكيانەوە تۆوى (هەست كردن بەجوانى لەناخيدا بچەسپێندرێت).

٢- دەبێت هەر لە منداڵیەوە منداڵ لەسەر پاك و خاوێنی و خۆشتن و پرچ داهێنان و ڕێك خستن و گونجاندنی جل و بەرگەکانی و خۆشکردنی بۆنی خۆی هانبدرێت و بەردەوامیش لەسەر ئەو چالاکیانە پاداشت بکرێت و هانبدرێت.

٣- زۆر گرنگە منداڵ و هەرزەکار لەسەر کاری دەستکردو سەردانی مۆزەخانەو پێشانگا هونەرییەکان و بینینی شانۆگەری و گوێگرتن لەمۆسیقاو دەنگی باڵندە دەنگ خۆشەکان هانبدرێت، چونکە ئەو چالاکیانە دەبنە هۆی گەشە پێکردنی توانای تام و چێژ وەرگرتن لەشتە جوانەکان.

٤- پێویستە دایك و باوك و مامۆستاو کەسانی چواردەوری منداڵ بەردەوام گرنگی بەکارو چالاکی سەرنج ڕاکێش و ڕازاندنەوەی ناوماڵ و ڕێکخستنی قوتابخانەو گەڕەك و فەرمانگەکان بدەن. بۆئەوەی ببن بە نموونەی جوان و سەرنج ڕاکێش بۆ منداڵ و هەرزەکارەکانیان و ئەمانیش لاساییان بکەنەوەو وەك گەورەکان گرنگی بەجوانی و ڕازاندنەوەو ڕێك خستنی شتەکان بدەن.

٥- نابێت ناوماڵ و قوتابخانەو گەڕەك و دام و دەزگاکانی تر پیس و ناڕێك بن. بەڵکو دەبێت گرنگیان پێ بدرێن و بە پاك و خاوێنی و ڕێك و پێکی ڕابگیرێن. بۆئەوەی منداڵ و هەرزەکار تام و چێژو خۆشی لەبینینیان وەربگرن و لاساییان بکەنەوە.

٦- زۆر گرنگە منداڵ لەسەر کۆکردنەوەی پەپوولەو گوڵ و وێنەو شتی جوان و ڕەنگاو ڕەنگ ڕابهێندرێت و ئەلبومیان بۆ دروست بکات.

## چەپەڵی و ناڕێکی وەك خوویەکی خراپ

منداڵان هەر لەمنداڵیەوە بەشێوەیەکی گشتی بێ سەرو بەرەن و پیس و چەپەڵ و ناڕێکن لەکارەکانیاندا، لەبەرئەوەی پاك و خاوێنی و ڕێك و پێکی ڕەوشت خوویەکی وەرگیراوەو مرۆڤ لەناو خێزان و کۆمەڵەکەیدا فێری دەبێت و بۆماوەو خۆڕسك نییە، لەبەرئەوە هەموو منداڵانی جیهان لەسەرەتای ژیانیانەوە هیچ جۆرە ڕەفتارو خوویەکی ڕێك و پێك و دروستیان وەك ئێمەی گەورە دەمانەوێت نییەو زۆر دەگمەنە ڕەچاوی ئەو پێوەرو سیستمانە بکەن کە ئێمەی گەورە دامان ناوەو دەمانەوێت هەموو لایەك پابەندی بن. لەبەرئەوە دەبینین زۆربەی منداڵەکانمان بەشێوەیەکی گشتی گرنگی بەجل و بەرگ و پاك و خاوێنی و ڕێك خستنی کەل و پەلەکانی ناوماڵ نادەن و بەپێچەوانەوە پیس و پۆخلن و زۆر ناڕێك و بێ سەرو بەرەن و هەموو کەل و پەلەکانیان لەناو ماڵدا بڵاو دەکەنەوە.

### هۆکارەکان:-

بێگومان هیچ هەڵس و کەوت و ڕەفتارێکی خراپ و نابەجێ بەبێ پاڵنەرو هۆکار نییە، بەڵکو لەدوای هەموو ڕەفتارو خوویەکی نابەجێوە ژمارەیەك فاکتەرو هۆکاری دەروونی و کۆمەڵایەتی هەن. لەگرنگترین ئەو هۆکارانەش کە دەبنە هۆی گەشە پێکردن و پتەوکردنی چەپەڵی و ناڕێکی و بێ سەرو بەرەیی منداڵ ئەمانەی لای خوارەوەن:-

### توڕەیی و حەزکردن بەسەربەخۆیی:-

زۆرجار چەپەڵی و ناڕێکی لەئەنجامی تووڕەبوون و ناڕەزایی و یاخی بوونی منداڵ و هەرزەکارەوەیە، واتە کاتێك دایك و باوك و مامۆستاو کەسانی چواردەوری منداڵ و هەرزەکار بەزۆری دەست دەخەنە ناو کاروباری منداڵ و هەرزەکارەکانیان و بواری

سەربەخۆییان بۆ نارەخسێنن و بەزۆری جەخت دەکەنە سەر پاك و خاوێنی و ڕێك و پێکی، ئاڵەم کاتانەدا ژمارەیەك لە منداڵ و هەرزەکارەکانیان تووڕەدەبن و ئەو داواکاری و دەست خستنە ناو کاروبارانەیان ڕەت دەکەنەوەو بە پێچەوانەی حەزوو ئارەزووی گەورەکانیان ڕەفتار دەکەن، ئەویش وەك خۆدەرخستن و سەلماندنی خودی خۆیان، ئەمەش دەمان گەیەنێتە ئەو بڕوایەی کە دەیانەوێت سەربەخۆیی خۆیان هەبێت و نایانەوێت ببنە پاشکۆی کەسانی تر، پێویستە ئێمەی گەورەش ڕێزی ئەو ویستەیان بگرین و لەسەر سەربەخۆیی و بڕوا بەخۆبوونیان هانیان بدەین و هەمووکات بەبێ هۆو پاساو دەست نەخەینە ناو کاروباریانەوە, چونکە سەپاندنی ڕاوبۆچوون دەبێتەهۆی ئەوەی کە منداڵان و هەرزەکاران بەدوای تۆڵەسەندنەوەو یاخی بووندا بگەڕێن، یەکێکیش لەو شێوازانە پەنا بردنە بۆ شکاندنی پێوەرەکان و پابەندنەبوون بەداواکاری و ڕێسای گەورەکان و ڕەت کردنەوەی پاك و خاوێنی و ڕێك و پێکی، بەمەبەستی تووڕەکردن و بێزارکردنی گەورەکان.

## ڕەتکردنەوەی هەست کردن بەلێپرسراویەتی:-

هەندێك جار منداڵ لەئەنجامی نازداری و پشت گوێ خستنەوە بەزۆری پشت بەدایك و باوك و کەسانی نزیکیان دەبەستن و فێری سەربەخۆیی و پشت بەستن بەخۆیان نابن، لەبەرئەوەی بەردەوام بۆ پاك و خاوێنی دەم و چاوو جل و بەرگ و ڕێك خستنی کەل و پەلەکانی ناوماڵ و قوتابخانە پشت بە دایك و باوك دەبەستن و خۆیان بەوکارە هەڵناستن، لەبەرئەوە بەردەوام دەبینین کەل و پەل و جل و بەرگەکانیان لەناو ماڵ و ژوورەکاندا بڵاو کراونەتەوەو هیچ ڕێك و پێکیەك لەناو ژوورەکانیاندا نییەو گرنگیەکی ئەوتۆش بەخۆرازاندنەوەو پاك و خاوێنی خۆیان نادەن و بە پێچەوانەشەوە تام و چێژو خۆشی لەنارێکی و پیس و چەپەڵی و بێ سەروبەرەیی وەردەگرن.

## کەمی یان نەبوونی شارەزایی و زانیاری دەربارەی ڕێك و پێکی و پاك و خاوێنی:-

زۆرجار منداڵ بۆیە ناڕێك و پیس و چە پەڵە، لەبەرئەوەی هیچ کات لەناو خێزان و قوتابخانە فێری ڕەفتاری ڕێك و پێکی نەکراوەو سوودو قازانجەکانی پاك و خاوێنی بۆ ڕوون نەکراوەتەوە، بە پێچەوانەشەوە هەندێك جار لەناو خێزان و ژینگەیەکدا پەروەردەو گەورەبووە، کە هەمووی بێ سەرەو بەرەو ناڕێکیەو ئەو جێگایەی تیایدا پەروەردە بووە بەهیچ شێوەیەك گرنگی بە پاك و خاوێنی و ڕێك وپێکی نادات و ئەو ڕەفتارانەی وەك بەهایەکی گرنگ لەدڵ و دەروونی منداڵەکاندا نەچاندووە. سەرەڕای ئەوەش دایك و باوك و مامۆستاو کەسانی چواردەوریان نموونەو پێشەوای سەرکەوتوو نین و زۆربەیان گرنگیەکی ئەوتۆ بە پاك و خاوێنی و ڕێك و پێکی نادەن، لەبەرئەوە منداڵەکانیشیان وەك پێویست ئەو بەهاو ڕەفتاری پاك و خاوێنی و ڕێك وپێکیە لەناخ و دڵ و دەروونیاندا گەشە ناکەن و لەژیانی ڕۆژانەیاندا هیچ گرنگیەکی ئەوتۆیان پێنادەن. کەواتە کاتێك منداڵ لەلایەن کەسانی نزیکیەوە لەسەر پاك و خاوێنی و ڕێك خستنی کەل و پەلەکانی ناوماڵ و کاروچالاکیەکانی خۆی هان و پاداشت ناکرێت، ئەوا پاڵنەرو حەزوو ئارەزووی فێربوونی ئەو ڕەفتارانەی لەلا دروست نابێت. سەرەڕای ئەوەش هەندێك منداڵ کەم و کورتی لەلایەنی زیرەکی و زانین و چاوتێبڕین و وردبوونەوەو بەراووردکردن و سەرنج دانیاندا هەیەو لەئەنجامی ئەو کەم و کورتیانەوە فێری ئەو ڕەفتارە نابن و لەماناو سوودو قازانجەکانیان ناگەن.

لەبەرئەوە زۆر گرنگە سوودوو قازانجەکانی ڕێك خستن و پاك و خاوێنی بۆ منداڵ ڕوون بکرێتەوەو ئەوەی تێبگەیەندرێت کە ئەگەر کەل و پەلەکانی ناوماڵ و کاروچالاکیەکانی ڕێك و پێك نەبن ئەوا زۆر بەزەحمەت ئەو شتەی کە دەیانەوێ بۆیان دەدۆزرێتەوەو سەرەڕای ئەوەش دەبێت کاتی زۆر لەژیانیان بۆ دۆزینەوەو دووبارە ڕێك خستنەوەی ئەو کەل و پەل و کارو چالاکییە ناڕێکانە بەفیڕۆ بدەن، هەروەها دەبێت دایك و باوك و کەسانی چواردەوری نموونەی پاك و خاوێنی و ڕێك و پێکی بن.

**چۆنیتی خۆپاراستن:-**

پێویستە لەڕێگەی ئەم خاڵانەی خوارەوە منداڵ و هەرزەكارەكانمان لە پیس و چەپەڵی و ناڕێكی و بێ سەرو بەرەیی بپارێزین. بۆئەوەی ئەو ڕەفتارە وەك پێویست لەلایان گەشە بكات-

**ڕاهێنانی بەردەوام:-**

پێویستە هەر لە منداڵییەوە منداڵەكانمان لەسەر پاك و خاوێنی و ڕێك خستنی كەل و پەلەكان و گونجاندنی كارو چالاكیەكان ڕابهێنین. واتە منداڵ لەدوای تەمەنی دوو ساڵیەوە ئامادەباشی ئەوەی هەیە كە فێری هەندێك لە پرانسیپە سادەو ساكارەكانی پاك و خاوێنی و ڕێك خستن بكرێت واتە دەتوانین منداڵەكانمان فێری ئەوە بكەین كە هەرچ كاتێك لەیاریكردن بوونەوە، ئەوا دەبێت یارییەكانیان كۆبكەنەوەوە بەڕێك و پێكی لەجێگاكانی خۆیان دایان بنێن، هەروەها كاتێك لەقوتابخانە گەڕانەوە ئەوا دەبێت جل و بەرگەكان و كتێب و پەراوەكانی قوتابخانەیان لەشوێنی تایبەتی خۆیان دابنێن، هەروەها پێش نان خواردن و دوای چوونە سەرئاوو پێشاو دەست و دەم و چاویان بەئاوو سابوون بشۆن.

كەواتە دەبێت هەر لەمنداڵیەوە خوو ڕەفتاری ڕێك خستن و پاك و خاوێنی لەڕێگەی كارو چالاكی جۆراوجۆرەوە، لەدڵ و دەروونیاندا بچەسپێندرێت. لەلایەكی ترەوە دایك و باوك دەتوانن منداڵەكانیان لەسەر شوشتنی قاپ و قاچاغ و جل و بەرگ و وشك كردنەوەو هەڵخستن و دانانیان لەشوێنی تایبەتی خۆیان و گسك لێدان و پاك و خاوێنی كەل و پەلەكانی ناوماڵ و ڕێك خستنی ژوورو كەل وپەلە تایبەتیەكانی خۆیان ڕابهێنن و بەردەوام پاداشت و هاتیشیان بدەن. هەروەها زۆر پێویستە منداڵ فێر بكرێت، بۆئەوەی جیاوازی لەنێوان جل و بەرگی یاریكردن و جل و بەرگی گەڕان و قوتابخانە بكات، واتە

کارێکی ئاساییە کە لە کاتی یاریکرن و هەڵبەزو دابەزو خۆخشاندن و وێنەکردن و وەرزش، جل و بەرگی یاریکردنی پیس و پەڵە پەڵە بکات، بەلاّم دەبێت زۆر ئاگاداری ڕێک خستن و پاك و خاوێنی جل وبەرگی دەرەوەو گەڕان و قوتابخانەی ببێت، بۆئەوەی مامۆستاو هاوڕێ و کەسانی تر بەچاوی ڕێزو خۆشەویستی سەیری بکەن و بە پیس و چە پەڵی لەقەڵەم نەدەن. سەرەڕای ئەوەش لەسەر قژوپرچ داهێنان و داخستنی دووگمەی کراس و پانتۆڵ و بەستنی پشتێن و ڕێک خستنی جلەکانی بەری ڕابهێندرێت، بۆئەوەی تووشی گێروگرفتی کۆمەلایەتی نەبێت.

## دەبێت منداڵ فێر بکرێت کە گرنگی بەکەسانی تر بدات:-

زۆر گرنگە بەردەوام بەئاکام گەیاندنی ڕەفتاری ڕێك و پێکی و پاراستنی پاك و خاوێنی بەڕازیکردن و دڵخۆشکردنی کەسانی ترەوە پەیوەست بکرێت. واتە دەبێت منداڵ و هەرزەکار بگەنە ئەو بڕوایەی کە پاك و خاوێنی و ڕێك خستنی کەل و پەلەکانی خۆی و ئاوماڵ دەبنە مایەی دڵخۆشی و کامەرانی دایك و باوك و مامۆستاو کەسانی تری چواردەوری، بەلاّم پیس و پۆخلی و ناڕێکی و بێ سەرەو بەرەیی دەبنە مایەی بێزاری و دڵ ڕەنجاندنیان. هەرچ کاتێك منداڵ ئەو هەست و سۆزو بڕوایەی لەلا دروست بوو ئەو کاتە هەر لە منداڵیەوە گرنگی بەپاك و خاوێنی خۆی دەدات و کەل و پەل و چالاکی و کارەکانی خۆی ڕێك و پێك دەکات، بۆئەوەی دڵی دایك وباوك و کەسانی چواردەوری ڕازی بکات. بێگومان تەنها دروست بوونی ئەو هەست و سۆزو بیروباوەڕە زامنی سەرکەوتنی ئەو کارانە نین، بەڵکو دەبێت لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی نێوان منداڵ و هەرزەکارو دایك و باوك و گەورەکانیان خۆش بێت و لەسەر بنەمایەکی پتەو بونیاد نرابێت و منداڵ هەست بەسۆزو خۆشەویستی و ڕێزگرتنیان بکات، ئەو کاتە منداڵ پەنا بۆ پاك و خاوێنی و ڕێك و پێکی دەبات، بۆئەوەی ئەو ڕێزگرتن و سۆزو خۆشەویستیەیان لەدەست نەچێت. لەلایەکی تریشەوە دەبێت دایك و باوك نموونەی باش بن و کاتێکی دیاریکراو بۆ یاریکردن و

ئامۆژگاری و کارکردن لەگەڵ منداڵەکانیان تەرخان بکەن و منداڵەکان ئەو هەستەیان لەلا دروست ببێت کە باوک و دایکیان گرنگیان پێدەدەن و گوێ لەڕاو بۆچوونەکانیان دەگرن، بێگومان لەم کاتانەدا بەئاسانی منداڵەکان گوێڕایەڵی دایک و باوک و گەورەکانیان دەبن و گرنگی بە پاک و خاوێنی دەدەن.

### چارەسەرکردن:-

کاتێک منداڵ لەقۆناغی خۆپاراستن دەردەچێت و تووشی پەتاو دەردی پیس و چەپەڵی و ناڕێکی و بێ سەرەو بەرەیی دەبێت، ئەوا دەبێت هەوڵی چارەسەرکردنی بدرێت و لەو گرفتە رزگار بکرێت. ئەم خاڵانەی خوارەوە زۆر گرنگن بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتەو گەڕاندنەوەی منداڵ بۆ دۆخی ئاسایی:-

### هاندان و پاداشت کردن:-

پێویستە بەردەوام منداڵانی پیس و چەپەڵ و ناڕێک لەسەر کاری پاک و خاوێن و ڕێک و پێک پاداشت بکرێن. واتە دەبێت ئەو جۆرە منداڵانە هانبدرێن و فێری پاک و ڕێک و پێکی بکرێن، ئینجا هەرچ کاتێک منداڵەکان کارێکی باشیان کردو داواکارییەکانی دایک و باوک و مامۆستاکانیان جێبەجێکرد، ئەوا دەبێت پاداشت بکرێن، ئیتر پاداشت چەندەها جۆری هەیە لەوانە (سوپاس، ئافەرین، دەست خۆش، ماچ کردن، لەباوەش گرتن، پارە پێدان، کڕینی دیاری، زیادکردنی خەرجی ڕۆژانەی، چوونە دەرەوەو گەڕان، سواربوونی پاسکیل، یاریکردن ... هتد). پێویستە دایک و باوک و مامۆستا بزانن منداڵ حەز بە چ جۆرە پاداشتێک دەکات، چونکە هەندێک منداڵ حەز بە یاریکردن ودیاری دەکەن بەلام هەندێکی تر حەز بە پارە دەکەن، کەواتە زانینی حەزوو ئارەزووی منداڵ زۆر پێویستن و گرنگە بۆ دیاریکردنی جۆری دیاری و پاداشتەکان.

دیاریکردنی خراپیەکانی پیس و چەپەڵی و ناڕێکی و باشیەکانی پاك و خاوێنی و ڕێك وپێکی:-

دەبێت دایك و باوك ومامۆستا خراپی و زیانەکانی پیس و چەپەڵی بۆ منداڵ ڕوون بکەنەوەو لەهەمان کاتیشدا جۆری ڕەفتارو کات و شوێنی کارەکان بۆمنداڵ ڕوون بکرێتەوەو داوای لێ بکرێت کە جێبەجێیان بکات، واتە دەبێت هەنگاو بەهەنگاو ئەو منداڵانە فێر بکەین کە چۆن ژوورەکانی خۆیان ڕێك دەخەن و لەچ کات و شوێنێك یاری و کەل وپەلەکانی خۆی دادەنێت و بەچ شێوەیەك ڕیزیان دەکات. دەبێت دوای جێبەجێکردنی هەرچ هەنگاوێك پاداشت بکرێت. هەروەها هەندێك جار پێویست دەکات کە ئێمە لەبەرچاوی منداڵ و هەرزەکارەکانمان کارەکان بەڕێك و پێکی بکەین و کەل وپەلەکان لەجێگاو شوێنی تایبەتی خۆیان دایان بنێین، ئینجا دوای ئەوە داوا لەمنداڵ و هەرزەکارەکان بکەین کە لاسایی ئێمە بکەنەوەو چیمان کردووە، ئەوانیش وا بکەن.

نووسینی ئەرك و فەرمانەکان و پاداشتەکان لەسەر خشتەیەك:-

هەندێك جار پێویست بەئەوە دەکات کە ئێمەی گەورە لەسەر تەختە ڕەش و کارتۆنێك داواکاریەکانی خۆمان بنووسین لەوانە (دەبێت پێش نان خواردن دەست و دەم و چاوی خۆت بشۆیت، یان دەبێت دوای هاتنەوە لەقوتابخانە جل و بەرگ و کەل و پەلەکانت لەشوێنی تایبەتی خۆیان دابنێیت، یان دەبێت هەموو ڕۆژێك کاتژمێر چواری دوای نیوەڕۆ ژوورەکەی خۆت خاوێن بکەیتەوە، یان دەبێت هەموو سێ ڕۆژ جارێك لە زستان و ڕۆژ نارۆژێك لەهاوین خۆت بشۆیت .. هتد). ئینجا هەرچ کاتێك ئەو کارانەی بەشێوەیەکی ڕێك و پێك بەئەنجام گەیاند ئەوا دەبێت پاداشت بکرێت تا دوای چەند جار دووبارەکردنەوە دەبێتە بەبەشێك لە کەسایەتی و وەك خوویەکی لێدێت و ئیتر پێویستی بەپاداشت کردن نابێت.

کەواتە ئەگەر بمانەویت منداڵەکانمان پاك و خاوێن وڕێك و پێك بن، ئەوا دەبێت پێش هەموو کەس ئێمە خۆمان پاك و خاوێن و ڕێك و پێك بین، سەرەڕای ئەوەش ڕێزی منداڵەکانمان بگرین و لەسۆزو خۆشەویستی پێویست بێبەشیان نەکەین و لەسەر پاك و خاوێنی و ڕێك خستنی کەل و پەلەکانی خۆیان و ناوماڵ هانیان بدەین و شێوازی گونجاو بۆ فێربوونیان بەکاربهێنین و نابێت لەگەڵ ئەو منداڵانەی کەپیس و چەپەڵ و نارێکن توندو تیژ بین، چونکە لێدان و توندو تیژی ئەو جۆرە ڕەفتارو خووە خراپانە بەهێزتر دەکەن، بەڵکو دەبێت بە پێچەوانەوە لەگەڵیان بەبەزەیی و خۆڕاگربین و هەوڵی چاندنی تۆوی پاك و خاوێنی و ڕێك و پێکی لەدڵ و دەروونیاندا بدەین، بۆئەوەی لەو ڕەفتارە خراپە ڕزگاریان بکەین ( شیفرو میلمان، ٢٠٠١،ص ٥٧ – ٦٧ ).

## کات و بەفیڕۆدانی

کات بەشێکی گرنگی ژیانمانەو وەك هەموو دیاردەکانی تر کاریگەری خۆی لەسەر چارەنووس و ڕێچکەی ژیانمان هەیەو پشت گوێ خستن و بەفیڕۆدانی زیانێکی گەورە بە کەسایەتیمان دەگەیەنێت. وەك چۆن بڕی خوێن لەناو لەشمان و بڕی ئاوو ئۆکسجین لەناو گەردووندا دیاریکراوە، بەهەمان شێوەش بڕی کات و ماوەکەی دیاریکراوو سنووردارە لەبەرئەوەی هەموو بوونەوەرەکان و دیاردە سروشتیەکان تەمەنێکی دیاریکراویان هەیە، واتە ماوەیەکی دیاریکراو دەژین. ئینجا ئەگەر ئەو کات و ماوە دیاریکراوە بۆ کارو چالاکی سوودبەخش تەرخان نەکرا، ئەوا ئەو کاتە بەفیڕۆ دەڕوات و وەك پێویست سوودی لێ وەرناگیرێت. لای هەموومان ئاشکرایە کە تەمەنی مرۆڤ دیاریکراوەو هەرکەسەو ماوەیەکی دیاریکراو (کەم یان زۆر) دەژی و دوای ئەوە ماڵئاوایی لەم ژیانە دەکات، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە زۆربەی زۆرمان سوودمان لەو کات و تەمەنەمان وەرنەگرتووەو زۆرجاریش بەفیڕۆمان داوەو بەکارو چالاکی بێ سوودو بگرە زیان بەخشیش بەسەرمان بردووە.

ڕێزگرتن یان ڕێزنەگرتنی کات خاسیەت و ڕەفتارێکە مرۆڤ هەر لەمنداڵیەوە لەناو خێزان و کۆمەڵەکەی فێری دەبێت و بۆماوە نییەو لەگەڵ منداڵ لەدایك نابێت، کەواتە ئەگەرەبمانەوێت ئەو خەسڵەت و ڕەفتارە لەناو دڵ و دەروونی منداڵەکانمان بچەسپێنین ئەوا دەبێت لەناو خێزان و کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی تری بوارو ژینگەی گونجاو بۆ گەشەسەندنی بخولقێنین و منداڵەکانمان بەگرنگی کات و ڕێزگرتنی ئاشنا بکەین.

بەشێوەیەکی گشتی منداڵان لەسەرەتای ژیانەوە هیچ گرنگیەکی ئەوتۆ بەکات نادەن و نرخیشی نازانن، نەك لەبەرئەوەی کات بێ نرخە، بەڵکو لەبەرئەوەی لەماناو چەمکی (مفهوم)ی کات نەگەیشتوون. واتە منداڵ لەقۆناغی پێنج ساڵی یەکەم و پێش چوونە قوتابخانەی وەك نیمەی گەورە لەماناو گرنگی کات ناگات. ڕاستە منداڵی پێنج ساڵان، مانگ و ساڵ دەزانێت و توانای یادکردنەوەی جەژنی لەدایك بوون و ڕۆژو مانگ و ساڵەکەی

هەیە، بەڵام هێشتا لەماهیەت و مانای ڕاستەقینەی کات تێناگات و زۆرجار بەفیڕۆی دەدات.

بەڵام وەك دەرئەنجامی توێژینەوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن، منداڵ لەتەمەنی دە (١٠) ساڵیدا تاڕادەیەکی باش لەمانای کات تێدەگات و پێش بینی ئەوەی لێدەکرێت کە زۆرجار ڕێزی کات بگرێت و پابەندی بێت (شیفر و میلمان، ٢٠٠١، ص٧٠). لەبەرئەوە زۆر گرنگە دایك و باوك و مامۆستا ئەو ڕاستیە بزانن و ئاگاداری منداڵەکانیان بن و هەر لەتەمەنی هەشت نۆ ساڵیەوە ڕێنماییان بکەن و لەسەر ڕێزگرتنی کات و بەفیڕۆ نەدانیان هانیان بدەن، ئەگەر هەندێك جاریش پابەندی کات نەبوون دەبێت کارێکی ئاسایی بێت و نابێت ئازارو سزایان بدەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێت لەگەڵیان خۆڕاگرو بە ئارام بن و گرنگی و بەنرخی کاتیان بۆ ڕوون بکەینەوەو ئەوەیان تێبگەیەنین کە ڕێزگرتنی کات و بەفیڕۆ نەدانی زامنی سەرکەوتنن و دەبنەهۆی بەختەوەرییان لەژیان.

ئینجا لێرەدا پرسیارێك خۆی قووت دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە بۆچی ژمارەیەکی زۆر لە منداڵ و هەرزەکار و گەورەکانمان ڕێزی کات ناگرن و ئەو تەمەنە کەم و بەنرخەی خۆیان بەفیڕۆ دەدەن؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێت ئاماژە بۆ ئەم هۆکارانەی خوارەوە بکەین کە فاکتەری سەرەکین و پاڵ بەمرۆڤەوە دەنێن کە ڕێزی کات نەگرن و بەفیڕۆی بدەن:-

## ململانێی دەروونی:-

هەندێك جار ململانێی دەروونی و بگرەو بەردەی نێوان دایك و باوك و منداڵ و هەرزەکارەکانیان فاکتەری سەرەکی ڕێزنەگرتنی کاتن. گوتەیەك هەیەو دەڵێن (چەند فشارو پاڵنان و پاڵەپەستۆی دایك و باوك و مامۆستا لەسەر منداڵ و هەرزەکار زۆربێت ئەوەندە کشانەوەو خۆدزینەوەی منداڵ و هەرزەکار زیاتر دەبێت). واتە کاتێك منداڵ و هەرزەکار ئەو هەستەیان لەلا دروست دەبێت کەوا خەریکە سەربەخۆیی خۆیان لەدەست

دەدەن و فشاری زۆریان لەسەرە، ئەوا پەنا بۆ زۆر شێواز دەبەن، یەکێك لەو شێوازانە قۆستنەوەو بەکارهێنانی کاتە وەك چەك و ئامرازێك بۆ خۆ سەپاندن و بێزارکردنی دایك و باوکیان و تۆڵەسەندنەوە لێیان و یاخی بوون، چونکە دەزانێت باوك و دایکیان بە پشت گوێ خستن و دواخستنی کارەکانیان و بەفیڕۆدانی کات بێزارو دڵتەنگ دەبن.

## دوورکەوتنەوەو ڕاکردن لەشتی ناخۆش:-

واتە کاتێك کارو چالاکییەك دەبێتە هۆی بێزار کردن و دروست کردنی خەم و خەفەت، ئەوا منداڵ و هەرزەکار هەوڵدەدەن لەدەستیان ڕابکەن و خوو بدەنە تەمبەڵی و خۆدزینەوەو دواخستنی کارەکەو بەجێنەگەیاندنی و بەفیڕۆدانی کات. بۆ نموونە کاتێك منداڵ و هەرزەکار لەقوتابخانە بێزار دەبن و حەز بە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی ناکەن، ئەوا بەیانیان خۆیان دەکەن بە نووستوو لە هەمان کاتیشدا دەیدەنە تەمبەڵی و جێبەجێ نەکردنی ئەرکەکانی قوتابخانەو دواخستنیان و بەفیڕۆ دانی کاتی خۆیان بە چالاکی بێسوودەوە، هەروەها کاتێك بێزارو دڵتەنگ دەبن، هەست بە ئەڕۆیشتنی کات و قورس دەکەن و کات بەدوژمنی خۆیان دەزانن. جاری وا هەیە ئەو کارو چالاکیە قورس و ناخۆشە، لەبەرئەوە خۆیان دوا دەخەن و بەشتی لاوەکیەوە خۆیان خەریك دەکەن بۆئەوەی ڕووبەڕووی ئەو کارو چالاکیە نەبنەوەو لەدەستی ڕابکەن.

## بێ نرخی کات:-

ئەوەی جێگەی داخە تاوەکو ئێستا کات لەلای ئێمە وەکو پێویست گرنگی خۆی پێنەدراوەو بە پێچەوانەشەوە هەندێك جار بەچاوی سووکیش سەیری کراوە. بۆ نموونە زۆر کەم ئێمەی گەورە لەکاتی سەردان و هات و چوو ڕاپەڕاندنی کارەکانمان پابەندی کات بووین و بەردەوام پێشێلی کات دەکەین و لەکات و شوێنی خۆیدا کارەکانمان بە ئەنجام ناگەیەنین و سەردانی کەس و کارو دۆست و برادەرەکانمان و کاروچالاکیەکانمان جێبەجێ

ناكەین. ئەوەش زیاتر بۆئەوە دەگەڕێتەوە كە تا ئێستا كات لەلای ئێمە نەبووە بەكێشەو كەلتورو كۆمەڵگەكەمان گرنگی خۆی پێنادات، لەبەرئەوە كارێكی ئاساییە كە منداڵ و هەرزەكارو گەورەكانمان ڕێزی كات نەگرن و ماوەیەكی زۆری تەمەنی خۆیان بەقسەكردنی سەرپێی و هات و چۆی بێسوودو كاروچالاكی لابەلا بەسەر دەبەن. ئینجا ئەگەر بماتەوێت ڕێزی كات بگرین و نرخی خۆی بدەینێ، ئەوا دەبێت منداڵەكانمان لەسەر ڕۆتینی كارو چالاكییەكانی ڕۆژانە (نان خواردن، جل و بەرگ لەبەركردن، جێبەجێكردنی ئەرك و چالاكیەكانی قوتابخانە، كاركردن، پاك و خاوێنی، یاریكردن، ... هتد) ڕابهێنین و كاتی دیاریكراویان بۆ تەرخان بكەین.

## پێشبینە هەڵەكانی دایك و باوك:-

زۆربەی دایك و باوك زانیاری تەواویان دەربارەی چەمكی كات نییەو وا دەزانن دەبێت منداڵ هەر لەتەمەنی چوار پێنج ساڵانەوە ڕێزی كات بگرێ و كاروچالاكییەكان لەكاتی خۆیدا جێبەجێ بكات، لەبەرئەوە فشارو پاڵەپەستۆ دەخەنە سەریان، منداڵەكانیش لەبەرئەوەی هێشتا بەتەواوی گەشەیان نەكردووەو لەمانای كات تێناگەن و گرنگی نازانن، بۆیە دەكەونە ململانێ و كێشەو دروست كردنی ناخۆشی. لەبەرئەوە پێویستە دایك و باوك خۆڕاگر بن و پەلە لە منداڵەكانیان نەكەن، بەڵكو ڕێنمایی پێویستیان بكەن تا بەتەواوی لەدوای تەمەنی (١٠) دە ساڵیەوە لەمانای كات دەگەن.

## جیاوازی تاكایەتی نێوان منداڵان:-

دەبێت ئێمەی گەورە ئەو ڕاستیە بزانین كە هەموو منداڵەكانمان وەك یەك نین و هەندێك منداڵ زۆر دەجووڵێن و بەخێرایی كارەكانیان بەئەنجام دەگەیەنن بەڵام هەندێكی تر هەر بە سروشتی خۆیان كەم جووڵەو سستن و كارەكان زۆر بەخاوی جێبەجێ دەكەن. ئەوەی زیاتریش كێشەكە ئاڵۆز دەكات ئەوەیە كە دایك و باوك و مامۆستا لەجۆری

چالاك و زۆر جووڵە بن، بەڵام منداڵ و قوتابیەکان لەجۆری سست و لەسەرخۆ بن، کەواتە دەبێت لەو حاڵەتانەدا دایك و باوك و مامۆستا خۆڕاگرو بەئارام بن و زۆر لەمنداڵەکان نەکەن بۆئەوەی وەڵامدانەوەی خراپیان نەبێت.

## نموونەو پێشەوای خراپ:-

کوردەواری خۆمان دەڵێت (گەورە ئاو دەڕێژێ و بچووك پێی لێدەخشێنێت) واتە گەورەو نموونەکان، کە دایك و باوك و مامۆستاو خوشك و برای گەورەن، دەبێت پێش هەموو کەس پابەندی کات بن و ڕێزی بگرن و بەفیڕۆی نەدەن، بۆئەوەی ببن بە نموونەو پێشەوای سەرکەوتوو بۆ بچووکەکانیان، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە زۆربەی گەورەکان پابەندی کات نابن و کاروچالاکیەکانیان لەکاتی خۆیدا جێبەجێ ناکەن و ڕێزی کات ناگرن و زۆرجار بەکاروچالاکی بێ سوودەوە بەفیڕۆیان دەدەن، لەبەرئەوە منداڵەکانیان وەك پێویست ڕێزی کات ناگرن و وەك گەورەکانیان بەفیڕۆی دەدەن.

## خۆپاراستن و چارەسەر:-

بێگومان خۆپاراستن زۆر زۆر باشترە لە چارەسەرکردن، واتە ئێمەی گەورە (دایك وباوك و مامۆستاو کەسانی تری چواردەوری منداڵ) دەبێت بە هەموو شێوەیەك لەو هۆکارو فاکتەرانە دووربکەوینەوە کەوا لە منداڵ دەکەن کات بەفیڕۆ بدەن و ڕێزی نەگرن، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێت ژینگەو بارودۆخی گونجاو بۆ گەشەسەندنی بڕەخسێندرێت.

ئینجا بۆ پەرەپێدانی ڕێزگرتنی کات و بەفیڕۆنەدانی دەبێت ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین:-

**١- منداڵەكەت فێربكە كە چۆن سوود لە كات وەربگرێت و خۆشت نموونەیەكی باشبە :-**

منداڵ چۆن لەناو خێزان و كۆمەڵ فێری بكەیت، ئاوا بەو شێوەیە لەكات تێدەگات و بەكاری دەهێنێ، واتە ئەگەر ئێمەی گەورە بەشێوەیەكی باش سوودمان لەكات وەرگرت و كاروبارەكانی خۆمان پێ ڕێك خستن، ئاواش منداڵ سوود لەكات وەردەگرێت و كاروچالاكییەكانی خۆی پێ ڕێك دەخات. زۆر گرنگە منداڵ هەر لەتەمەنێكی بچووكەوە فێری ڕۆتینی كاروچالاكی بكرێت، واتە ئەوە بزانێت كەكاتی دیاریكراو بۆیاریكردن هەیەو دەبێت بە هەمان شێوەش بەپێی خشتەیەك كاتەكانی خۆی بەسەر چالاكییەكانی تردا دابەش بكات لەوانە ( خوێندن و نووسین، سەیركردنی تەلەفزیۆن، گەڕان و چوونە دەرەوە ... هتد).

لەلایەكی تریشەوە دەبێت ئێمەی گەورە بەپراكتیك و لەبەرچاوی منداڵ و قوتابیەكانمان ڕێزی كات بگرین و بەفیڕۆیان نەدەین، لەهەمان كاتیشدا زۆر ڕستەو دەستەواژە هەیە نابێت لەبەرچاوی منداڵەكانمان بەكاریان بهێنین، لەبەرئەوەی بۆنی تەمبەڵی و كات بەفیڕۆ دانیان لێدێت، لەوانە (ئەمرۆ ناتوانم بەیانی جێبەجێی دەكەم، پەلە مەكە خۆ لەدەستت ڕاناكات، لێی گەڕێ بۆ كاتێكی تر، ... هتد) بەپێچەوانەوە دەبێت خۆمان و منداڵەكانمان لەسەر ئەوە ڕابهێنین كەكاری ئەمرۆ نەخەینە سبەینێ و ئەو چالاكیانەی كە پێویست و گرنگن دەبێت لەكاتی خۆیدا جێبەجێ بكرێت و نەهێڵین ئەو كاتە بەنرخەی هەمانە بەبێ سوود بڕوات. پێویستە منداڵ فێری ڕێك خستن و بەش بەشكردنی كارو چالاكییەكان بكرێت. واتە دەبێت ئەو كاروچالاكییانەی كە زۆر گرنگن یەكەمجار جێبەجێ بكرێت دوای ئەوە كارە گرنگەكان هەروەها ئەو كارانەی كە زۆرو ئاڵۆزن دەبێت بەش بەش بكرێن و هەرجارەی یەكێكیان جێبەجێ بكرێت.

بێگومان ئەو بەش کردنە وا لەمنداڵ دەکات کە لەئێش و چالاکی قورس بێزار نەبێت و لەدەستیان ڕانەکات. زۆر گرنگە منداڵ لە ئەنجامی بەفیڕۆدانی کاتەوە بەسزای سروشتی خۆی بگات و باجەکەی بدات بۆئەوەی پەندی لێ وەربگرێت و جارێکی تر دووبارەی نەکاتەوە. بۆ نموونە ئەگەر لە قوتابخانە دواکەوت ئەوە نەهێڵدرێت بچێتە ژوورەوە یان ئەگەر ئەرك و فەرمانەکانی قوتابخانەی جێبەجێ نەکرد ئەوا نمرەی نەدرێتێ یان لەکاتی خۆیدا ئامادە نەبوو لەیاری و چالاکیەکە بێبەش بکرێت. بەپێچەوانەشەوە ئەگەر لەکاتی خۆیدا وئامادەبوو وە کاروچالاکیەکانی جێبەجێ کرد ئەوا پاداشت بکرێت و ڕێزی بگیرێت بۆئەوەی لەسەری بەردەوام بێت و لەداهاتوودا دووبارەیان بکاتەوە.

## ٢- پەیوەست کردنی ڕێزگرتنی کات بەخۆشەویستی و ڕێزگرتنی کەسانی ترەوە:-

زۆر گرنگە هەر لەمنداڵیەوە ڕێزگرتنی کات بە خۆشەویستی و ڕێزگرتنی کەسانی ترەوە پەیوەست بکرێت. واتەمنداڵ ئەو هەست و سۆزەی لەلا دروست ببێت کە ئەگەر ڕێزی کات نەگرێت ئەوا کەسانی چواردەور ڕێزی ناگرن و خۆشیان ناوێت و دوور نیە لێیان بڕەنجێت، بەڵام ئەگەر لەکاتی خۆیدا کاروچالاکیەکانمان بەئاکام گەیاند، ئەوا کەسانی چواردەورمان ئێمەیان خۆش دەوێت و ڕێزمان دەگرن.

## ٣- ڕاهێنانی منداڵ لەسەر بەئاگاهاتن و جێبەجێ کردنی کاروچالاکیەکان:-

دەبێت هەوڵبدرێت لەڕێگەی زەنگ و کاتژمێرو بانگ کردنەوە لەکاتی خۆیدا بەیانیان منداڵان بەئاگا بهێنین، واتە ئەگەر منداڵێکمان هەبوو تەمبەڵ بوو یان درەنگ لەخەو هەڵدەستا، ئەوا دەبێت لەڕێگەی کاتژمێری بەزەنگ لەکاتی خۆیدا بەئاگابهێندرێت بۆئەوەی لەخەو هەڵبستێت یان کارەکەی جێبەجێ بکات، ئینجا دوای چەند جارێك پێویستی بەزەنگ و بانگ کردن نابێت و خۆی لەکاتی خۆیدا یەکسەر بەئاگادێت یان کارەکەی جێ بەجێ دەکات. هەروەها دەبێت هەوڵی کەمکردنەوەی ماوەی کارکردنی

منداڵەکان بدرێت، بۆ نموونە منداڵی وا هەیە کاتێکی زۆر بە خۆڕازاندنەوە و جل و بەرگ لەبەرکردن و نان خواردن بەسەردەبات ئینجا دەبێت چارەسەری ئەو جۆرە منداڵانە بکرێت و فێری ئەوە بکرێت کە ماوەیەکی کەمتر بۆ ئەو کارانە تەرخان بکات، ئەگەر جاران (٢٥) خولەك خەریکی خۆڕازاندنەوە بووە دەبێت فێر بکرێت بۆئەوەی بیکات بە (٢٠) خولەك دوای ماوەیەکی تر بیکاتە (١٥) خولەك، بەهەمان شێوە بۆ کاروچالاکییەکانی تر. ئینجا دەبێت لەسەر کەمکردنەوەی کاتی راپەراندنی کاروچالاکییەکان پاداشت بکرێت بۆئەوەی بەردەوام دووبارەیان بکاتەوەو دوای چەند جارێك ببن بەبەشێك لەڕەوشت و کەسایەتی.

٤- خۆشکردن و ئاسانکردنی کاروچالاکییەکان:-

زۆر پێویستە کاروچالاکییەکانی ناوماڵ و قوتابخانە لەلای منداڵ خۆش و ئاسان بکرێت، بۆئەوەی لەکاتی خۆیدا جێبەجێیان بکات و لەدەستیان رانەکات، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە هەندێك لەدایکان و باوکان و مامۆستایان کاروچالاکیەکانی ناوماڵ و قوتابخانە لەلای منداڵ زۆر قورس و زەحمەت و ناخۆش دەکەن و ڕەچاوی تەمەن و شارەزایی و توانای منداڵ ناکەن، کە بێگومان ئەوەش دەبێتە هۆی بێزارکردنی منداڵ و ڕاکردن لێیان و دواخستنیان و جێبەجێنەکردنیان کە بێگومان سەرجەم ئەوانە دەبنەهۆی بەفیڕۆدانی کات و خۆدزینەوە لەو جۆرە کاروچالاکیانە.

منداڵ چۆن خۆی لەناوێنەی خێزانەکەیدا دەبینێتەوە؟

هەستکردن بەگوناه

رووداوو مەترسیەکانی ناو ماڵ

منداڵ و هەرزەکار چۆن لە پەیوەندیەکان و شێوازی پەروەردەکردن دەگەن ؟

منداڵ و دیموکراسیەت

منداڵی خۆپەرست

باری دەروونی منداڵی نەخۆش

## منداڵ چۆن خۆی لەناوینەی خێزانەکەیدا دەبینێتەوە؟

خودو کەسایەتی منداڵ لەناوینەی خێزانیدا دەبینرێت، واتە کاتێک خێزان بەچاوی سووک سەیری منداڵ دەکات، ئەوا زۆر ئاساییە ئەو جۆرە منداڵە دوای ماوەیەك بۆچوونیکی وای لەلا دروست ببێت کە ئەو کەسێکی سووك و بێ نرخە، ئەگەر منداڵ لەناو خێزانی سووکایەتی پێ بکرێت و لەسۆزو خۆشەویستی دایك و باوك و کەسانی چواردەوری بێبەش ببێت، ئەوا دوور نییەو کارێکی دروستە کە بۆچوونێکی وای لەلا دروست بێت کە ئەو کەسێکی پشت گوێ خراوو بێزراوە. ئەگەر بەردەوام بە منداڵ بگوترێت تۆ نەزان و گەمژەو دەبەنگی، ئەوا دوور نییە ئەو منداڵە بگاتە ئەو بڕوایەی کە کەسێکی نەزان و گەمژەو دەبەنگەو دوای ئەوە وەك کەسێکی نەزان و گەمژەو دەبەنگ هەڵس و کەوت بکات هەروەها کاتێك منداڵ بە کەسێکی شەڕانگێز و دەست درێژی کار تاوانبار دەکرێت و بەردەوام سووکایەتی پێ دەکرێ، گومانی تێدا نییە کە بەچاوێکی نائاسایی سەیری خۆی دەکات و خۆی بەکەسێکی شەڕخواز لەقەڵەم دەدات. بەکورتی خودی منداڵ و باری دەروونیەکەی ڕەنگدانەوەی ئەو خێزان و کۆمەڵەن کە تیایدا دەژین.

ئینجا ئەگەر منداڵ لەچوار پێنج سالی یەکەمی تەمەنی ژیانی، ژینگەو بارودۆخی گونجاوی بۆ نەخوڵقا ئەوا گومانی تێدا نیە کە تووشی زۆر گرفت و کێشەی دەروونی و کۆمەلایەتی دەبێت. یەکێك لەو گرفتە دەروونیانە هەڵس و کەوت و جووڵەی عەسەبیانەو ڕەفتاری نائاساییە لەوانە (شان جووڵاندنی بەردەوام، چاوترووکاندنی نائاسایی، سەرجووڵاندن بەم لاو ئەولا، زۆر گریان، تووڕەبوون، دەم و لێو جووڵان، نینۆك قرتاندن، پرچ ڕاکێشان، زۆر جووڵە کردن و نوقرە نەگرتن، گازگرتن ... تاد) کە سەرجەم ئەو ڕەفتارانە نیشانەن کە ئەو جۆرە منداڵانە گرفت و ئەندێشەیان هەیەو باری دەروونیان ئاسایی نییە. ئینجا ئەگەر بمانەوێت منداڵەکانمان تووشی ئەو ڕەفتارو هەڵس و کەوتانە نەبن ئەوا زۆر پێویستە کە لەناو خێزان و قوتابخانە هەست بە ئارامی و دڵنیایی و ئاسایش و خۆشەویستی بکەن و ئەو بڕوایەیان لەلا دروست ببێت کە کەسێکی خۆشەویستن و

ڕێزیان دەگیرێ و هیچیان لەکەسانی تر کەمتر نییەو خێزان و قوتابخانە بەبەشێک لەژیانی خۆیان بزانن.

بەلام بەداخەوە لەئەنجامی نەزانی و نەخوێندەواری و هەژاری و لێک ترازانی شیرازەی هەندێک خێزان، ژمارەیەکی زۆر لەمندالەکانمان لەسۆزو خۆشەویستی و ڕێزگرتن و ئاسایش و دلنیایی بێبەش بوون و بەناچاری ملی ڕێگای کۆلان و شەقامەکانیان گرتووەو مالئاواییان لە ژیانی خوێندن کردووە، یان لەناو خێزان بەهەلە پەروەردە دەکرێن و دایک و باوک یان لەسۆزو خۆشەویستیدا نقومیان دەکەن و نازدار بەخێویان دەکەن یان زۆر توندوتیژو بێ بەزەییانە مامەلەیان لەگەل دەکەن، یان پەرەلایان کردوون و لێیان ناپرسنەوە بەوەش زیانێکی گەورە لە ژمارەیەکی زۆری مندالانمان کەوتووەو ئەگەر فریایان نەکەوین چارەنووسیان دەکەوێتە مەترسیەوە.

## هەست کردن بەگوناهو شەرمەزاری

مرۆڤ پێویستە گیانی هەست کردن بەگوناهی لەلا هەبێت و بەشێك بێت لەکەسایەتی، بەپێی تیۆرییەکەی فرۆید کەسایەتی مرۆڤ لەسێ بەشی سەرەکی پێك دێت کە ئەوانیش (ئەو (ID)، من (ego)، منی بالا (super ego))ن منی بالاش لەدوو بەش پێك دێت کە یەکێکیان منی نموونەییە (الانا المثالیة) ئەوی تریشیان ویژدانە (الضمیر). بێگومان هەست کردن بەگوناهو شەرمەزاری یەکێکە لە چالاکی و ئەرکەکانی ویژدان. واتە کاتێك مرۆڤ هەڵەیەك یان کارێکی نابەجێ دەکات و سەرپێچی داب و نەریت و یاساکان دەکات، ئەوا ویژدان سەرزەنشتی دەکات و تووشی هەست کردن بەگوناهو شەرمەزاری دەکات. تاوەکوو ئێرە کارەکە ئاساییەو بەشێکە لەسروشتی مرۆڤایەتی، بەڵام ئەوەی کە ئاسایی نییە ئەوەیە کە هەر لەمنداڵییەوە تۆوی هەست کردن بەگوناهو شەرمەزاری لەناخی منداڵدا بچێنرێت و لەسەر بچووکترین هەڵەو کاری ناسایی، ویژدانی ئازاری بدات و هەست و سۆزێکی نائاسایی لەلا دروست ببێت، کە ئەو کەسێکی خراپ و گوناهبارەو بەردەوام هەست بەکەمی و خەم و خەفەت بکات. واتە لەحاڵەتە ئاساییەکەی خۆی دەردەچێت و دەبێت بەگرێیەکی دەروونی و بەردەوام کێشەو گرفت بۆ خاوەنەکەی دروست دەکات.

لەڕاستیدا دروست بوون و گەشەکردنی ویژدان پەیوەندی بەلاساییکردنەوەو وەرگرتنی بەهاو ئاکارەکانی دایك و باوکەوە هەیە. ویژدان لە ئەنجامی هەڕەشەو ئامۆژگاری و سزادانی دایك و کەسانی نزیکی منداڵەوە دروست دەبێت. واتە لە سێ چوارساڵی یەکەم بەردەوام دایك وباوك بە منداڵەکانیان دەڵێن (درۆمەکەن، دزی مەکەن، خراپە مەکەن، جنێومەدەن، قسەی ناشیرین بەکەس مەڵێن، ... تاد) کە لە ئەنجامی ئەو هەموو (وامەکەو ئەوە مەکەو ئەوە عەیبەو ... تاد) وردە وردە ویژدان دروست دەبێت و دوای ماوەیەك دەبێت بە هێزێکی ناوەکی و لەجیاتی دایك و باوك و هێزی دەرەکی سزاو سەرزەنشتی منداڵ دەکات.

ئینجا ئەگەر بێت و شێوازی پەروەردەکردنی دایك و باوك هەڵە بێت و بەردەوام لەسەر بچووکترین شت سزای منداڵ بدەن و سووکایەتی پێبکەن و هەڵەکانی بۆ گەورە بکەن و جەخت لەسەر خاڵە لاوازەکانی بکەن، هەردەم وای تێبگەیەنن کە ئەو کەسێکی خراپ و خاوەن هەڵەیە، ئەوا بێگومان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تۆوی هەست کردن بە گوناهو شەرمەزاری لەناخیدا دەچێنن و ویژدانێکی زۆر بەهێزو داپڵۆسێنەری لەلا دروست دەکەن، کە بەردەوام سەرکووتی خاوەنەکەی دەکات و ئازاری دەدات و تووشی گرژی و دڵەڕاوکێی دەکات، کە بەداخەوە زۆرجار ئەو بارە دەروونی و گرژییە دەبێت بەپاڵنەرو لەڕێچکەی ئاسایی لایدەدات ئیتر یان تووشی گرێی دەروونی و گۆشەگیری و دوورەپەرێزی یان تووشی لادان و سەرەڕۆیی دەکات، کە هەموویان خراپن و زیان بەکەسایەتی و باری دەروونی خاوەنەکەی دەگەیەنن. ئەمەش دەمان گەیەنێتە ئەو دەرئە نجامەی کە فشار خستنە سەر منداڵ و حەرام کردنی زۆربەی شتەکان لێی و گەورەکردنی هەڵەکانی و واتێگەیاندنی کە ئەو کاری خراپ دەکات و لەڕێگەی ڕاست لایداوە، زیانی گەورە بەباری دەروونی منداڵ دەگەیەنێ و تووشی کۆمەڵێك گرفت و کێشەی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەکات.

کەواتە ئەرکی هەموو دایك و باوك و مامۆستایەکە کە ببن بە نموونەی باش بۆ منداڵەکانیان و هەڵەکانیان بۆ گەورە نەکەن و لەسەر هەڵس و کەوتەکان سووکایەتیان پێنەکەن، بەڵکو لەڕێگەی دیالۆك و گفت و گۆوە کارو هەڵس و کەوتە هەڵەکانیان بۆ ڕاست بکەنەوەو ئامۆژگاری و ڕێنمایی پێویستیان بکەن چونکە جیهانی منداڵ جیهانێکی پاك و بێگەردەو زۆر لەو شتانەی ئێمە بە هەڵەو گوناهیان دادەنێین، ئەوان ماناشی نازانن و بەو شێوەیەی ئێمە لێی تێدەگەین ئەوان لێی تێناگەن.

## ڕووداو و مەترسیەکانی ناوماڵ بۆ منداڵ

ناوماڵ لەبەرئەوەی بۆ هەموو کەسە، بەگەورەو بچووکەوە، لەبەرئەوە بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت وای لێبکرێت کە هیچ مەترسیەکی بۆ منداڵ تێدانەبێت. بۆیە بەردەوام لەهەندێك ماڵ کارەسات و ڕووداوی دڵتەزێن ڕوودەدات و ژیانی منداڵەکانیان دەکەوێتە مەترسیەوە.

**بۆئەوەی لەڕووداوو مەترسیەکانی ناوماڵ کەم بکەینەوە، پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین:-**

١- دوورخستنەوەی ئەو شتانەی کە مەترسیان بۆ منداڵ هەیە.

٢- دوورخستنەوەی منداڵ لەو شوێن و باروودۆخانەی کە ترسناکن.

پێویستە ئەو شتانەی کە منداڵ مامەڵەیان لەگەڵ دەکات بێ مەترسی بن ( پامیلامنت، ١٩٨٩، ص٤٢٨ ).

**١- ئەو شتانەی کە مەترسیان بۆ منداڵ هەیە:-**

(بەنزین، نەوت، شقارتە، چەقۆ، مووس و گوێزان، مقەست، زەهر، تەقەمەنی، فاس و مەوادی پاککردنەوەو کیمیاوی، گوێزو فستق، پارچەی یاری و شتی بچووك ) زۆربەی زۆری ئەو شتانە بۆ ژیانی منداڵ مەترسیدارن، لەبەرئەوەی منداڵی ساڵە وەختە، بەتایبەتیش شیرەخۆرە، هەرچیەکی بکەوێتە بەردەست دەیخاتە دەمیەوە، سەرەڕای ئەوەش منداڵ لەسەرەتای ژیانیدا هێشتا بەتەواوی لەلایەنی ژیرییەوە گەشەی نەکردووە، زیانی زۆر لەو شتانەی سەرەوە نازانێت، لەبەرئەوە دوورنییە نەزانێت بەکاریان بهێنێ، یان بەهەڵە بەکاریان بهێنێ و دواجار زیانی گەورە بەخۆی و چواردەورەکەشی بگەیەنێت.

**٢- دوورخستنەوەى منداڵ لەو شوێن و بارودۆخانەى كە ترسناك و مەترسيدارن :**

كاتێك منداڵ خەريكە پێ دەگرێت و گاگۆلكە دەكات و لەتەمەنێكى بچووكدايە پێويستە ئاگادارى بين و لە قادرمەو پێ پليكانەو ژوورى چێشتخانە، سۆپاو هيتەرو ئاميرى نوتووكردن، كەل و پەلى كارەبايى و ساج و پەرەميز، دوورى بخەينەوە لەبەرئەوەى شارەزايى و كارامەيى و تواناى خۆپاراستنى لەو شتە مەترسيدارو بارودۆخە ترسناكانە نييە.

**چيبكەين بۆئەوەى ماڵ و منداڵمان لە كارەسات و رووداوى ترسناك بپارێزين؟**

١- نابێت بەنزين و غازو نەوت و شقارتەو حەب و دەرمان و گوێزان ... تاد، لەبەردەم ئەو منداڵانەى كە تەمەنيان لە پێنج ساڵ كەمترە دابنرێت و بەئاسانى دەستيان بيانگاتێ، چونكە يارى پێدەكەن و بەكاريان دەهێنن و ژيانى خۆيان و كەسانى چواردەوريان دەخەنە مەترسيەوە.

٢- نابێت بەهيچ شێوەيەك چەك و تەقەمەنى لەبەردەستى منداڵدا دابنرێت چونكە نازانێت چەند ترسناكن و چۆن دەتەقنەوە، لەبەرئەوە دەستكاريان دەكات و دواجار كارەسات روودەدات.

٣- زۆر گرنگە چەقۆو شتى تيژو كەرەستەى قاپ و قاچاغ شووشتن و مەوادى كيمياوى لەبەردەم منداڵ دانەنرێت. لەبەرئەوەى ماسولكەو ئەندامەكانى لەشى و تواناى عەقلى ئەوەندە پێنەگەيشتووە كە بتوانێت بەباشى بەكاريان بهێنێ يان لە زيانەكانيان دووربكەوێتەوە.

٤- داپۆشينى سويچ و پلاك و وايەرى كارەبايى بۆئەوەى منداڵ لەزيانەكانى بپارێزرێن.

٥- دوورخستنەوەی منداڵ بەتایبەتیش (شیرەخۆر) لە هیتەرو سۆپاو ساج و پەرمێزی گەرم.

٦- منداڵ لەکاتی پێ گرتن زۆر حەز دەکات بەسەر قادرمەدا سەربکەوێ، لەبەرئەوە پێویستە لەوکاتەدا بەربەست و پەرژین بۆ قادرمەکان بکرێت بۆئەوەی منداڵی تازەپێگرتوو پیایدا سەرنەکەوێ یان ئەو منداڵانەی لەقاتی سەرەوەو سەربان دەخەون، شەو بەدەم خەوەوە پیایدا نەیەنە خوارەوە، چونکە ژیانیان دەکەوێتە مەترسیەوە.

## رێنمایی پێویست:-

١- نابێت سەری دەبەو تەنەکەو شووشەی بەنزین و نەوت و مەوادی کیمیاوی و پاککردنەوە لەناو ماڵدا بەکراوەیی بەجێ بهێڵدرێ، بەڵکو دەبێت دوای بەکارهێنان بەباشی دا بخرێت و لەبەردەستی منداڵیشدا دانەنرێت.

٢- پێویستە حەب و دەرمان لەشوێنی تایبەتی و دوور لەبەردەستی منداڵ هەڵبگیرێ.

٣- نابێت یاری زۆر بچووك و ئەو کەل و پەلانەی کە منداڵ دەتوانێت قووتیان بدات، لەبەردەستی دابنرێن، لەبەرئەوەی هەر شتێك بکەوێتە بەردەستی منداڵی بچکۆلە دەیخاتە دەمیەوەو دوورنیە بیخنکێنێ.

٤- پێویستە تیپ و سارغی لەوایەری کارەبای رووت بدرێن و پلاك و سویچە شکاوەکان چاك بکرێنەوەو لەو جۆرە بن کە منداڵ نەتوانێت پەنجەیان بخاتە ناوی، بۆئەوەی لەمەترسی کارەبا گرتن دوور بخرێتەوە.

٥- نابێت ئەو ژوورەی منداڵان یاری تێدا دەکەن، سۆپاو هیتەرو نوتووی داگیرساوی تێدابێت، چونکە دوورنیە بکەون بەسەریانداو زیان بەخۆیان و چواردەورەکەشیان بگەیەنن.

## منداڵ و هەرزەکار چۆن لەجۆری پەیوەندییەکان و شێوازی پەروەردەی خێزانی تێدەگەن؟

منداڵ و هەرزەکار لەرێگەی تۆرێکی پەیوەندی ئاڵۆز بەخێزان و دەوروبەرەکەیەوە بەستراونەتەوە، ئەو تۆرە پەیوەندیەش کاریگەری لەسەرخۆی لەسەر کەسایەتی و رەفتاری منداڵ و هەرزەکار هەیە. پەیوەندییەکانی ناو خێزان بریتین لە پەیوەندی نێوان ( باوك و دایك، باوك و منداڵەکان، دایك و منداڵەکان، منداڵەکان لەناو خۆیاندا، باپیرو نەنك و دایك و باوك ... تاد ).

ئەگەر ئەو پەیوەندییانە لەسەر بنەمای دیموکراسی و رێزگرتنی بەرانبەرو رەچاوکردنی ماف و بیروڕای یەکتری بونیاد نرابوو، ئەوا بێگومان بەقازانجی منداڵ و هەرزەکار تەواو دەبێت، بەڵام ئەگەر جۆری پەیوەندییەکان و شێوازی پەروەردەکردن لەسەر بنەماکانی دیکتاتۆریەت و کەلەگایی و چەوساندنەوەی یەکتری بونیاد نرابوو، ئەوا زەرەرو زیانێکی زۆر لە باری دەروونی منداڵ و هەرزەکار دەدەن و بەرەو سەرەڕۆیی و لادانی دەبەن، لەبەرئەوەی پەیوەندییەکان زۆرن، بۆیە دەبێت ئاگامان لەسروشت و کرۆکی ئەو تۆڕی پەیوەندییەی ناو خێزان بێت، واتە ئەگەر پەیوەندی نێوان دایك و باوك باش بێت، بەڵام پەیوەندییان لەگەڵ منداڵەکان خراپ بێت، یان پەیوەندییان لەگەڵ منداڵەکان باش بێت بەڵام پەیوەندی نێوان خۆیان خراپ بێت، یان پەیوەندی نێوان خۆیان و منداڵەکانیان باش بێت، بەڵام پەیوەندی نێوان منداڵەکان خراپ بێت ئەوا هەر زەرەرو زیان بەباری دەروونی منداڵەکان دەگات، لەبەرئەوەی کەم و کوڕی و ئاڵۆزی لەناو تۆڕی پەیوەندی خێزانیدا هەیە.

لەلایەکی ترەوە ڕاستیەك هەیەو دەبێت هەموومان بیزانین ئەویش ونەوەیە دەبێت ئاگامان لەلێکدانەوەو تێگەیشتنی منداڵ و هەرزەکارەکانمان بێت بۆ ئەو جۆرە پەیوەندییانە، واتە جاری وا هەیە بەبڕواو تێگەیشتن و لێکدانەوەی ئێمە جۆری

پەروەردەكردن و مامەڵەو پەیوەندییەكان ڕاست و دروستن و لەبەرژەوەندی منداڵ و هەرزەكارەكانمانن، بەلام بەپێچەوانەوە بەبۆچوون و تێگەیشتنی منداڵ و هەرزەكارەكانمان، ئەو جۆرە پەروەردەو مامەڵەو پەیوەندییە نادروستەو دژی ڕاو بۆچوون و حەزوو ئارەزووەكانیانە .

ئەمەش زیاتر بۆئەوە دەگەڕێتەوە كە لێكدانەوەو تێگەیشتنی ئێمەی گەورە جیاوازەو وەك لێكدانەوەو تێگەیشتنی منداڵ و هەرزەكارەكانمان نییە، سایكۆلۆژیای كۆمەلایەتیش ئەو ڕاستییەی بۆ دەرخستین كە لێكدانەوەو تێگەیشتنی تاكەكانی كۆمەڵ بۆ یەك دیاردە وەك یەك نین و بەجۆرەها شێواز لێكی دەدەنەوە. كە ئەویش پەیوەندە (بەباری دەروونی، جۆری كەسایەتی، توخم، تەمەن، ئاستی ڕۆشنبیری و كۆمەلایەتی ... تاد) تاكەكانی كۆمەڵ. ئینجا لەبەرئەوەی جیاوازییەكی زۆر لەو لایەنانەی سەرەوە لەنێوان تاكەكانی كۆمەڵ و دایك و باوك و منداڵ و هەرزەكارەكاندا هەیە بۆیە جۆری بیركردنەوەو تێگەیشتنمان بۆ دیاردەكان و جۆری پەیوەندییەكان جیاوازە.

ئەگەر بمانەوێت پەیوەندیمان لەتەك منداڵ و هەرزەكارەكانمان باش بێت و بەهەڵە لەمەبەست و بۆچوونەكانمان تێنەگەن، هەروەها منداڵ و هەرزەكارەكانمان لە گرفت و ئەخۆشییە دەروونی و كۆمەلایەتیەكان دوور بن و كەسانی سوودبەخش و بەهرەمەندیان لێدەربچێت، ئەوا زۆر پێویستە جۆری پەیوەندی و مامەڵەكانمان لەسەر بنەماكانی دیموكراسی و ڕێزگرتنی ڕاو بۆچوون و كەسایەتی منداڵ و هەرزەكارەكانمان بونیاد نرابێت وبەردەوام ڕەچاوی شێوەی بیركردنەوەو تێگەیشتنیان بكەین.

## منداڵ و دیموکراسیەت

ئەگەر دیموکراسیەت بەرزکردنەوەی دروشم و قسەو گوتەی تیۆری بێت ئەوا هەموومان دیموکراسی خوازین و هیچ گیروگرفتێکمان لەگەڵ دیموکراسیەتدا نیە، بەلام ئەگەر مەبەست لە دیموکراسیەت گەوهەرو ناوەڕۆک و پراکتیک و گیانی ئەو زاراوەو چەمکە بێت، ئەوا ئەو کاتە زۆر زەحمەت دەبێت، دۆزینەوەی کەسانی دیموکراسی خوازو ئەو ڕەوشتە زۆر دەگمەن دەبێت، لەبەرئەوەی بەدرێژایی ژیانمان لەژێر دەوارو سێبەری دیکتاتۆریەتدا پەروەردەو گۆش کراوین و ئەم چەند ساڵەی دوایی نەبێت (لەگەڵ ئەو هەموو کەم و کورتییەشدا) ئەمان زانیوە ئازادی ڕادەربڕین و بیروڕای جیاوازو دەسەلاتی چوارەم و فەرمانڕەوایی زۆرینە ماناو تامی چی یە.

لەو ڕۆژەی چاومان هەڵهێناوە لەخێزان و قوتابخانەو دام و دەزگایەکی دکتاتۆری داپلۆسێنەردا پەروەردە کراوین، باوک سەرکوتی منداڵ دەکات و بواری ڕادەربڕینی ئازادی پێ نادات و نازانێت تام و چێژی گفت و گۆو ڕاگۆڕینەوە چیەو دوو هێلی ڕاست و چەپ بەسەر بەرانبەرەکەیدا دەهێنێ و ئەوەی بۆخۆی بەڕەوای دەبینێ بەکەسانی تری ڕەوا نابینێ و کەلەگایەکە بەسەر دایک و منداڵ و خوشك و خێزانەکەیەوە، ئەویش ناهەقی نیە چونکە پەروەردەی دەستی باوکێکی دکتاتۆری تر بووەو ژینگەی پڕ لە کارەسات و چەوساندنەوە، هەر مرۆڤی دکتاتۆرو تۆقێنەرو شەڕخواز بەرهەم دەهێنن، بەهەمان شێوە منداڵ لەباوکی دکتاتۆری ماڵەوەی ڕادەکات و ڕووبەڕووی مامۆستای دکتاتۆر دەبێتەوە.

کەواتە مێژووی ڕابووردوومان کارگەی بەرهەمهێنەری تاکی دکتاتۆر بووەو هەتاوەکوو سەرئێسقان گیانی دکتاتۆریەت بەناخماندا شۆڕبۆتەوەو زۆر زەحمەتە مرۆڤی دکتاتۆریش کە زوڵم و ستەم و چەوساندنەوە تێکەڵ بەخوێنی بووبێ ببێت بەمرۆڤێکی دیموکراسی خواز، بەلام دەتوانرێت گیان و تۆوی دیموکراسیەت لەناخی منداڵدا بەئاسانی بچێندرێ، ئینجا ئێمەی کوردی زوڵم لێکراوو بەش خوراو ئەگەر بمانەوێت ئەفرەت لەدکتاتۆریەت

بکەین و ئەوەی دوای خۆمان بەرەو دیموکراسیەت بەرین، ئەوا زۆر پێویستە کە گۆڕانکاری لە پرۆگرام و شێوازەکانی پەروەردەکردنی دامەزراوە کۆمەلایەتیەکانماندا بکەین لە پێشەوەی هەموشیان (خێزان و باخچەی ساوایان و قوتابخانە).

کەواتە کاتی ئەوە هاتووە کە ڕێگە بەمنداڵ بدرێت بەئازادی یاری بکات و بەسەربەستانە بیر بکاتەوەو فێری شێوازی گفت و گۆکردن و ڕادەربڕین بکرێت و تێبگەیەندرێ کە هەموو کەس بەئازادی لەدایک دەبن و دەبێت بەئازادیش بژین و هیچ جیاوازیەکی سروشتی و ڕاستەقینە لەنێوان (هەژارو دەولەمەند، ڕەش و سپی، کوردو گەلانی تر، ... تاد) نیە، ئەوەی کە ئێستا هەیە دروست کراوە، هەروەها دەبێت لەخێزان و باخچەی ساوایان و قوتابخانە منداڵەکانمان فێری هاوکاری و دۆستایەتی و لێبوردن و خۆراگری و خۆشەویستی نیشتمان و تاکەکانی تری کۆمەڵ و مرۆڤایەتی بکەین و لەدووبەرەکی و دەمارگیری و ڕق و کینە دووریان بخەینەوە.

بەلام ئەم کارە ئەوەندە ئاسان نیەو پێویستی بەقوربانیدان و خۆنەویستی و ونارام و خۆراگری و دلسۆزی هەیەو دەبێت ئێمەی گەورەش گۆڕانکاری لەشێوازی مامەلەو پەروەردەکردنماندا بکەین و ئەو ڕەوشت و هەلس و کەوتانەی سەرەوە بەکردەوە بکەین و ژینگەی گونجاو بۆ گەشەکردنی گیانی دیموکراسیەت لەناخ و دڵ و دەروونی منداڵکانماندا بڕەخسێنین، بۆئەوەی منداڵەکانیشمان وەك ئێمەی گەورە نەبن بەکەسانی دکتاتۆر و وەك ئەو باوکەیان لێ نەیەت کە یەك جۆر جل و بەرگ و یەك جۆر ڕەنگی بۆ منداڵەکانی کڕیبوو کە زیاتر لە (تەکسی) دەچوون نەك منداڵ، منداڵەکانیش بەزۆرو لەترس هەڕەشەی باوك، دوور لەحەزی خۆیان لەبەریان کردوو لەجیاتی خۆشی و بزەی سەرلێو لە بەیانی چەژنێکی ئەم ولاتەدا فرمێسك بەچاوە ڕەش و گەشەکانیان و بەسەر بڕوەمەتە سوورو ئالەکانیاندا دەهاتە خوارەوە.

## منداڵی خۆپەرست

خۆ پەرستی (الأنانية)دیاردەو رەفتارێكە كە منداڵ لە كۆمەڵ و داوو دەزگاكانی فێری دەبێت و بەهیچ شێوەیەك بۆ ماوەو خۆرسك نییە. خۆپەرستی بە زۆر شێوازو رەفتار گوزارشتی لێدەكرێت و لە هەڵس و كەوتی منداڵدا رەنگ دەداتەوە، منداڵی خۆپەرست تەنها هەر گرنگی بەخۆی دەدات و بەرژەوەندی و حەزوو ئارەزووەكانی خۆی لە پێش بەرژەوەندی و حەزوو ئارەزووی كەسانی ترەوەیەو بەردەوام لە هەوڵی تێركردنیانەو گوێ بە كەسانی چواردەوری نادات، واتە زۆرجار خۆشی و خۆپەرستیەكەی لەسەر ناخۆشی و دەردەسەری كەسانی تر بونیاد دەنێت و گوێ بەراو بۆچوون و بیروباوەڕی كەسانی تر نادات، بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە كە هەر چ كەسێك گوێی بەڕاو بۆچوونی كەسانی تر نەدا ئیتر خۆپەرستە، بۆ نموونە منداڵانی زۆر زیرەك و بلیمەت بەزۆری گوێ بەراوبۆچوونی كەسانی ترو هەندێك داب ونەریتی كۆمەلایەتی نادەن و حەز بە تەنیایی و گۆشەگیری و بەدەوری خود خولانەوەدا دەكەن، بەلام جیاوازی سەرەكی ئەم جۆرە منداڵانە لەگەڵ منداڵانی خۆپەرست ئەوەیە، كە منداڵانی بلیمەت و زیرەك داهێنەرو خاوەن بەرهەمن و سوودو قازانج بە كۆمەڵەكەیان دەگەیەنن، بە پێچەوانەی منداڵانی خۆپەرست، كە بەزۆری بە دوای بەرژەوەندی خۆیاندا وێڵن.

راستیەك هەیەو دەبێت هەموومان بیزانین، ئەویش ئەوەیە كە لە سەرەتای قۆناغی منداڵیەوە هەموو منداڵان خۆپەرستن و بەدەوری خودی خۆیاندا دەخولێنەوەو توانای رەچاوكردن و لەبەرچاوگرتنی راوبۆچوون و حەزووئارەزووی كەسانی تریان نییە و وا دەزانن ئەوان سەنتەری ئەم گەردوونەن و هەموو كەسانی تر بەچواردەوری ئەودا دەخولێنەوە، واتە منداڵ لەو بڕوایەدایە كە ئەوو جیهان و هەموو بوونەوەرەكانی تر یەك شتن و جیاوازی لە نێوانیان نییە و وا دەزانێت هەموو كەس وەك ئەو بیردەكەنەوە.

**هۆکارەکان:-**

ئەگەر بەوردی سەیری منداڵان بکەین، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە زۆربەیان کەسانی کۆمەڵایەتین و هاوکاری کەسانی تر دەکەن و دەستی یارمەتی بۆ یەکتر درێژ دەکەن، بەڵام ژمارەیەکی کەمیان کەسانی خۆپەرستن و گرنگی بە کەسانی تر نادەن و تەنها هەڵپەی حەزوئارەزوو بەرژەوەندی خۆیانە.

بێگومان ئەو منداڵانەش لە ئەنجامی هۆکاری تایبەتیەوە فێری ئەو جۆرە ڕەفتارە بوون. دەرئەنجامی توێژینەوەکانی ئەو بوارە ئاماژە بۆ ئەم هۆکارانەی خوارەوە دەکەن کە بوون بە فاکتەر بۆ چاندنی تۆوی خۆپەرستی لە دڵ و دەروونی ئەو جۆرە منداڵانەدا:-

**ترس:-**

هەندێک جار ترس دەبێتە هۆی دروست کردنی خۆپەرستی، بۆ نموونە ئەو منداڵانەی کە ترسی بێزراوی و ڕەتکردنەوە یان بەجێهێشتن و دەرکردن یان لێدان و سووکایەتی پێکردنیان هەیە، ئەوا لە ئەنجامی ئەو ترسەوە حەز بە تێکەڵاوی ناو کۆمەڵ ناکەن و لە کۆمەڵ و داوودەزگاکانی دوور دەکەونەوەو حەز بە تەنیایی و دووره پەرێزی دەکەن و دواتر بیر لە هاوکاری و بەرژەوەندی کەسانی تر ناکەنەوە، بەمەش وردە وردە دەبن بە کەسانی خۆپەرست و مشەخۆر بەسەر کۆمەڵ و کەسانی چواردەوریانەوە. واتە لە ئەنجامی ئەو ترسانەوە منداڵ تەنها بەدوای ئاسایش و سەلامەتی و دڵنیایی خۆی وێڵ دەبێت، بە بێگوێدان بە هەست و سۆزو بۆچوونی کەسانی تر. ئەمەش بە پلەی سەرەکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە منداڵ لەناو ئەو کەسانەدا (بەتایبەتی کەسانی نزیکی) هەستی بە ئارامی و دڵنیایی و خۆشی نەکردووە، بۆیە بە هەموو شێوەیەک لێیان دوور دەکەوێتەوەو نایەوێت لێیان نزیک ببێتەوە.

نازداری:-

زۆرجار هەندێک لە دایکان و باوکان زیاد لە پێویست گرنگی بە منداڵ دەدەن و هەموو پێداویستیەکانی بۆ دابین دەکەن و بە زۆری دەیان پارێزن و هەموو داواکارییەکی بۆ جێبەجێ دەکەن. ئەم جۆرە منداڵانە لە ئەنجامی نازدارییەوە کەسایەتیەکی لاوازو قرچۆکیان دەبێت و هەست بە بەرپرسیاریەتی ناکەن و ناتوانن خۆیان لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی ژیان بسازێنن و هەر چاویان لەدەستی دایک و باوکیانەو وا دەزانن هەر ئەوان هەن و دەبێت هەموو کەسانی تر لە خزمەتی ئەواندا بن، ئینجا لەبەر ئەوەی تاکەکانی تری کۆمەڵ بەو شێوەیەی منداڵ دەیەوێ و دایک و باوکی رەفتار دەکەن، هەڵس و کەوت ناکەن بۆیە منداڵ لەناویاندا حەز بە خۆشی و دڵنیایی ناکات و بەردەوام لە هەوڵی ئەوە دایە کە لێیان دوور بکەوێتەوەو تەنها گرنگی بەخۆی و بەرژەوەندییەکانی دەدات و دواتر دەبێت بە کەسێکی خۆ پەرست.

هەروەها هەندێک جاریش دایک و باوک بە شێوەیەکی راستەوخۆ ئامۆژگاری و رێنمایی منداڵەکانیان دەکەن و پێیان دەڵێن: ( پێویستە پارێزگاری لە ماف و بەرژەوەندییەکانتان بکەن و نەهێڵن کەس زەوتیان بکەن و رێگە بە کەس مەدەن بێنە سنووری بەرژەوەندییەکانتان ) بەم شێوەیە ئەم جۆرە منداڵانە لەئەنجامی ئەو جۆرە رێنمایی و ئامۆژگاریانەی گەورەکانیانەوە، دەبن بەکەسانی خۆپەرست و بیر لە بەرژەوەندی کەسانی تر ناکەنەوە.

نە بەکامی و پێنەگەیشتن:-

هەندێک منداڵ لەئەنجامی پێنەگەیشتن و کەم و کورتی و نەبەکامیەوە، ناتوانن رەچاوی بەرژەوەندی و بیرو بۆچوونی کەسانی تر بکەن و پابەندی گفت و پەیمان و قسەکانی خۆیان بن. واتە کاتێک دەیانەوێت رەچاوی بەرژەوەندی و مافی کەسانی تر

بکەن و پێشێلیان نەکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی ناتوانن لغاوو کۆنترۆڵی حەزوو ئارەزووە تایبەتییەکانی خۆیان بکەن، بۆیە لە قسەو گفتەکانیان پەشیمان دەبنەوەو پێشێلی سنووری ماف و بەرژەوەندییەکانی کەسانی تر دەکەن و لە هەڵپەی تێرکردنی حەزوو ئارەزووەکانیان دەبن. واتە لە ئەنجامی کەم و کورتی و پێنەگەیشتنەوە دەبن بە کەسانی خۆپەرست و ناتوانن ڕەچاوی بەرژەوەندی کەسانی تر بکەن و بەرپرسیار بن لە بەرانبەر کەسانی تر. هەروەها ئەو منداڵانەش کە دواکەوتنی ژیرییان هەیە یان کەم و کورتی لە قسەکردن و فێربوونیاندا هەیە، یان گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و دەروونیان هەیە، ئەوا لە ئەنجامی ئەو کەم و کورتیانەوە دەبن بەکەسانی خۆ پەرست، لەبەر ئەوەی پێشتر فێری ئەوە نەکراون کە گرنگی بە کەسانی تر بدەن، یان پاڵنەرو حەزوو ئارەزووی گرنگی دان بەکەسانی تریان لەلا دروست نەبووە.

## ٤- لاسایکردنەوەی پێشەوای خراپ:-

کاتێک منداڵ لەناو خێزان و ژینگەیەکدا دەژی کە زۆربەیان کەسانی خۆپەرستن و زۆر بەکەمی گرنگی بە کەسانی تر دەدەن و گیانی هاوکاری کردن لەناویاندا لاوازە، بێگومان ئەمیش لاسایی گەورەکانی دەکاتەوەو لەوانەوە فێری خۆپەرستی و گرنگی نەدان بە کەسانی تر دەبێت.

## خۆپاراستن:-

بۆ ئەوەی منداڵەکانمان لە خۆ پەرستی و گۆشەگیری دوور بخەینەوە دەبێت لەناو خێزان و قوتابخانەو داوو دەزگا کۆمەڵایەتییەکانی تر، ژینگەی لەبارو گونجاو بۆ گەشەسەندنی گیانی هاوکاری و پێکەوە ژیان بخولقێنین. ئەم هەنگاو و خاڵانەی خوارەوە زامنی دوور خستنەوەی منداڵن لە خۆ پەرستی:-

**١- هەست کردن بە ڕێزگرتنی خود لە ناخی منداڵەکەتدا گەشە پێبکە:-**

باشترین بەربەست بۆ ڕێگەگرتن لە دروست بوونی خۆپەرستی ئەوەیە، کە یارمەتی منداڵەکەت بدەی بۆ ئەوەی هەست بە بوون و تواناو لێهاتوویی خۆی بکات و بە چاوی گومان و دوو دڵی سەیری خودی خۆی نەکات، لەبەر ئەوەی ئەو منداڵانەی لە خۆیان ڕازین و بڕوایان بە تواناکانی خۆیان هەیەو هەست بە ئارامی و دڵنیایی دەکەن، ئەوا گرنگی بە بەرژەوەندی و ڕاوبۆچوونی کەسانی تر دەدەن و هەست بە کەمی ناکەن و لەناو کۆمەڵدا هەست بە ئارامی و بڕوا بەخۆبوون دەکەن، لەبەر ئەوە پێویستیان بە ڕاکردن و دوور کەوتنەوە لە کۆمەڵ نییەو پەنا بۆ گۆشەگیری و دوورە پەرێزی نابەن. ئینجا لەبەر ئەوەی ڕێزگرتنی خودو سەیرکردنی بە چاوی دڵنیایی و شانازیکردن پێوەی، لە ئەنجامی پەروەردەی خێزانییەوە دروست دەبێت و ڕەنگدانەوەی ئەو خێزانەیە کە تیایدا دەژی، بۆیە دەبێت دایك و باوك ڕێزی منداڵەکانیان بگرن و لە نرخیان کەم نەکەنەوەو لە شەڕو ناخۆشی ناو خێزان دووریان بخەنەوە، بۆ ئەوەی هەست بە کەمی نەکەن و بە چاوی ڕێز سەیری خودی خۆیان بکەن و دواتریش بەچاوی ڕێز سەیری کەسانی تر بکات و لە گۆشەگیری و خۆپەرستی دوور بکەوێتەوە. لەلایەکی تریشەوە نابێت منداڵان بەیەك بەراورد بکرێن و خاڵە لاوازەکانیان گەورە بکرێت.

**٢- منداڵەکەت فێر بکە گرنگی بە کەسانی تر بدات و خۆشت نموونەو پێشەنگ بە:-**

دەبێت منداڵ فێری ئەوە بکرێت کە گرنگی بە کەسانی تر بدات، بەڵام ئەم کارە لە خۆیەوە نابێت، بەڵکو دەبێت ئێمەی گەورە بە کردەوەو لەبەرچاوی منداڵەکانمان گرنگی بە کەسانی تر بدەین و هاوکارییان بکەین و لە خۆپەرستی و هەلپەرستی دوور بکەینەوە بۆ ئەوەی ببین بە پێشەنگ و نموونە بۆ لاسایکردنەوەی منداڵەکانمان، ئەگەر ئێمە لەبەرچاوی منداڵەکانمان بەزەییمان بە هەژارو لێقەوماواندا هاتەوەو بەشداری خۆشی و

ناخۆشی خزم و کەس و هاوەڵەکانمان کردو ئەوەی بۆ خۆمان بەڕەوای دەزانین بۆ خەڵکی تریش بە ڕەوامان زانی، بێگومان دەبین بە نموونەیەکی باش بۆ لاسایکردنەوەی منداڵەکانمان و گرنگی دانیان بە کەسانی ترو دوور کەوتنەوەیان لە خۆپەرستی.

## ٢- هەندێك كاروچالاكی و بەرپرسیاریەتی بە منداڵەكەت بسپێرە:-

کاتێك یارمەتی کەسێك دەدرێت، ئەو کەسە سوپاسی پێشکەش بە ئەو کەسە دەکات کە یارمەت داوەو ئەو کەسەش کە یارمەتیەکەی پێشکەش کردووە هەست بە خۆشی و شانازی دەکات. لەبەر ئەوە زۆر گرنگە بەردەوام هەر لە منداڵیەوە بە پێی تواناو تەمەنی منداڵەکە هەندێك کاروچالاکی پێبکەین بۆ ئەوەی منداڵ لە میانەیانەوە هەست بە خۆشی و شانازی بکات و هەوڵی دووبارە کردنەوەیان بدات و بەو شێوەیەش گیانی هاوکاری و یارمەتی و گرنگی دان بە کەسانی تر لە دڵ و دەروونیدا بچێنین. گونجاوترین کاریش کاروچالاکییەکانی ناو ماڵ و قوتابخانەیە، کە منداڵ لە ڕێگەیانەوە هەست بە بەرپرسیاریەتی دەکات.

## باری دەروونی منداڵی نەخۆش

باری دەروونی مرۆڤ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕدرێ و کۆمەڵێک هۆکاری دەرەکی و ناوەکی کاری تێدەکەن.

**ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە باری دەروونی ئەو منداڵانەیە کە تووشی نەخۆشی تالاسیمیا بوون.**

هەموومان باش دەزانین کە رەمەکی ژیان (غريزة الحياة) لەلای مرۆڤ زۆر بەهێزو بەردەوام هەڵپەی ژیان و مانەوەیەتی و هەر ئەو رەمەك و خۆرسکەیە کە پاڵی پێوە ناوە بە دوای ئەمریدا بگەڕێ و بەرەنگاری مردن ببێتەوە، بەڵام بە داخەوە مردن وەك مۆتەکە هەر مایەوەو ئەمریش نەهاتە دی، کەواتە ترس لە مردن لەلای هەموو مرۆڤێك هەیەو هەندێك جار مردنی ئازیزان ژیانمان لێدەکات بە دۆزەخ. ئەو کەسەی تووشی یەکێك لە نەخۆشییەکان دەبێت و ماوەیەکی زۆریش بەدەستیەوە دەناڵێنێ و هیچ تروسکاییەکی چارەسەرکردنیشی نەبێت، ئەوا بێگومان لە بارێکی دەروونی ئاڵۆزدا دەژی، مەگەر ئەو کەسە نەخۆشە هەر بۆ خۆی بزانێ کە چەند دژوارو ئاڵۆزو ترسناکە. ئینجا ئێمەی چوار دەوری کەسی نەخۆش ئەگەر بمانەوێت کەمێك لە ئازارەکانی ئەو کەسانە کەم بکەینەوە، دەبێت پێش هەموو شتێك شارەزای باری دەروونیان ببین.

**منداڵی نەخۆش و تووش بوو بە تالاسیمیا بەدەست هەندێك لەم گرفتانەی خوارەوە دەناڵێنێ:-**

١- زۆرجار خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێ سەرو دڵی گرتوون و بەردەوام بیر لەو نەخۆشیەو چۆنیەتی چارەسەرکردنیان دەکەنەوە.

٢- كاتێك كە یەكێك لە تووش بووانی هاوەڵی كۆچی دوایی دەكات، ئەمیش بۆ ماوەیەكی زۆر غەمبارو دڵتەنگ دەبێت و ترسی مردنی لێ دەنیشێ.

٣- بەقسەو قسەڵۆك و مامەڵەی هەڵەو نامرۆڤانەی كەسانی نەزانی چواردەوری زۆر بێزارو وەڕس دەبێت و رق و كینەیەكی زۆری دەربارەیان لەلا دروست دەبێت.

٤- وەرگرتنی چارەسەری بەردەوام و خوێن گۆڕین، تووشی بێزاری و هەست بەكەمی دەكەن، بە تایبەتی كاتێك خۆی لەگەڵ كەسانی تر بەراورد دەكات.

٥- هەندێك جاریش مامەڵەی هەڵەو ناپەروەردەیی دایك و باوك و خوشك و برا بێزاری دەكەن.

<u>*لەبەر ئەو هۆكارانەی سەرەوە زۆر پێویستە كە دایك و باوك و كەسانی چواردەوری منداڵ بەم شێوەیەی خوارەوە مامەڵە لەگەڵ منداڵی نەخۆشدا بكەن.*</u>

١- نابێت بە هیچ شێوەیەك گاڵتەو سووكایەتی بەو جۆرە منداڵانە بكرێت و لەنرخیان كەم بكرێتەوە. لەبەر ئەوەی ناوو ناتۆرەو سووكایەتی پێكردن ئەوەندەی تر باری دەروونی ئەو جۆرە منداڵانە ئاڵۆزتر دەكات.

٢- نابێت زیاد لە پێویست ناز بدرێت بەو منداڵانەو بەردەوام باوك و دایك بەزەییان پیایاندا بێتەوە، چونكە بەزەیی هاتنەوەو ناز پێدانی زیاد لە پێویست زیان بە كەسایەتی ئەو منداڵانە دەگەیەنێت.

٣- نابێت مامەڵەی دایك و باوك بەجۆرێك بێت، كەوا لەو منداڵانە بكات هەست بەكەمی بكەن و ئەو هەست و بیروباوەڕەیان لەلا دروست ببێت كە ئەمان بوون بە بارو مشەخۆر بەسەر ئەمانەوەو ئەو نەخۆشییەیان بووە بە هۆی بێزار كردنی ئەوان، چونكە ئەو جۆرە هەست و سۆزە ئازاری دەروونی زۆری ئەو منداڵانە دەدات.

٤- دەبێت دایك و باوك بە حاڵەتی منداڵەکانیان رازی بن و بەردەوام بیری لێ نەکەنەوەو ئەو باوەڕەشیان لەلا دروست نەبێت کە ئەوان گوناهێکیان کردووە بۆیە ئەو جۆرە منداڵەیان بووە. چونکە ئەو بۆچوونە زۆر لە راستیەوە دوورە، ئەوە هیچ پەیوەندی بە گوناهو ئیمانداری و بێ بڕواییەوە نییە، بەڵکو بۆ کۆمەڵێك هۆکاری بۆ ماوەیی و ژینگەیی ناو منداڵدانی دایك دەگەڕێتەوە.

٥- زۆر پێویستە هیچ جۆرە جیاوازییەك لە نێوان منداڵانی نەخۆش و منداڵەکانی تردا نەکرێت و بەیەك چاو سەیری هەموویان بکرێت و وەك هەموو منداڵێکی ئاسایی بە پێی پێویست ببردرێن بۆ سەیران و گەڕان و دەرەوە. واتە نابێت ئەو نەخۆشییەیان ببێت بە بەربەست و رێگر لەبەردەم چوونە دەرەوەو چالاکیە کۆمەڵایەتییەکانی تر.

٦- پێویستە جار بە جارێك ئاهەنگ و کۆڕو کۆبوونەوە بۆ تێکەڵاوبوونی ئەو جۆرە منداڵانە بە هاوەڵەکانی وەك خۆیان بگێردرێت، بۆ ئەوەی بزانن کە زۆر منداڵی تریش وەك ئەوان وان و هەر ئەو بەتەنها تووشی ئەو نەخۆشییە نەبووە.

٧- هەروەها پێویستە بەرنامەو پرۆگرامی تایبەت بە هۆشیارکردنەوەی دایك و باوکی ئەو جۆرە منداڵانە بە تایبەتی و تاکەکانی کۆمەڵ بەگشتی لە دەزگاکانی راگەیاندن هەبێت، بۆ ئەوەی شارەزای باری دەروونی ئەو جۆرە منداڵانە بن و مامەڵەی دروستیان لەگەڵ بکەن.

# بەشی دووهەم

# سایکۆلۆژیای هەرزەکارو لاوان

قۆناغی هەرزەکاری

جیاوازی نێوان باڵقی و هەرزەکاری

گلاندەکان

هەڵس و کەوت و جووڵەی هەرزەکار

هەرزەکارو جۆرەکانی

تیۆرەکانی هەرزەکاری

## قۆناغی هەرزەكاری

هەرزەكاری یەكێكە لە گرنگترین قۆناغەكانی ژیان كە مرۆڤ پیایدا تێدەپەڕێت. ئەم قۆناغە دەكەوێتە نێوان دواهەمین قۆناغی منداڵی و قۆناغی كامڵی (مرحلة الرشد) و بە باڵقی (بلوغ) دەست پێدەكات.

لە راستیدا قۆناغی هەرزەكاری خێراترین قۆناغی ژیانی مرۆڤە لە دوای لە دایك بوون، كە گەشەكردن تیایدا زۆر خێراو كوت و پڕە، بەڵام دووهەم قۆناغە لە دوای قۆناغی (پێش لە دایك بوون) كە گەشەكردنی جەستەیی و فسیۆلۆجی تیایدا زۆر خێرایە.

بە تەواوی ناتوانرێت سەرەتاو كۆتایی قۆناغی هەرزەكاری بە مانگ و ساڵ دیاری بكرێت، لەبەرئەوەی لەنێوان شەوو رۆژێكدا منداڵ یەكسەر نابێت بە هەرزەكار، بەڵكو پرۆسەیەكی پلە پلەیە (متدرج) و ماوەیەكی دەوێ، وەك چۆن گۆڕانی وەرزەكانی ساڵ لەسەر خۆو پلە بە پلەیە، بەم شێوەیەش، چوونە ناو قۆناغی هەرزەكاری پلە بە پلەیە بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ كە نەتوانین هیچ ساڵ و كاتێك بۆ چوونە ناو قۆناغی هەرزەكاری دیاری بكەین، بەڵكو زۆر لە زانایان لەو بڕوایەدان كە لە دەوروبەری (١١) یان (١٢) ساڵی ژمارەیەك لە منداڵان دەچنە ناو قۆناغی هەرزەكاری( Faller, 1981, P:235).

بە هەمان شێوەش لە دەوروبەری (١٧) یان (١٨) ساڵان ماڵئاوایی لەو قۆناغە دەكەن. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ كە هەموو منداڵان لەو كاتەدا دەچنە قۆناغی هەرزەكاری بەڵكو ژمارەیەك لە منداڵان پێش یان دوای ئەو كاتە دەكەون، ئەوەش بە پلەی سەرەكی بۆ ئەم هۆكارانەی لای خوارەوە دەگەڕێتەوە.

(١) تۆخم (جنس):-

دەرئەنجامی توێژینەوە زانستیەکان و سەرنج و بۆچوونی دەروونزانان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە کچ پێش کوڕ بە ماوەیەک دەچێتە قۆناغی هەرزەکارییەوە، ئەوەش بە پلەی سەرەکی پەیوەندی بە فەسلەجەو جەستەو چالاکی گلاندەکانی کچەوە هەیە، کە لە زۆر لایەنەوە جیاوازە لە جەستەو فەسلەجەی کوڕ. لە کوردەواری خۆشمان لە دێرزەمانەوە باب و باپیرانمان هەستیان بەم راستیە کردووە، لەبەرئەوە فەرموویانە (کچ سالی دەنکە جۆیەک گەورە دەبێت بە لام کوڕ دەنکە گەنمێک) هەمووشمان باش دەزانین کە دەنکە (جۆ) لە دەنکە (گەنم) درێژترە.

(٢) ژینگەی گەرم و سارد:-

وەک دەرکەوتووە کەش و هەواو گەرماو سەرماش کاریگەری خۆی لەسەر گەشەکردنی مرۆڤ بەگشتی و چوونە ناو قۆناغی هەرزەکاری بە تایبەتی هەیە، لەبەرئەوە هەندێک لەزاناکان لەو بڕوایەدان کە هەرزەکارانی ناوچە گەرمەکان لەپێش هەرزەکارانی ناوچە ساردەکان دەچنە ناو قۆناغی هەرزەکارییەوە.

(٣) ژینگەی شارو لادێ:-

لەبەرئەوەی ژیان لە لادێ سادەو ساکارو ئاسانترەو پێداویستیەکانی کەمترە، بۆیە ژمارەیەکی زۆری هەرزەکارانی لادێ پێش هەرزەکارانی شار ماڵئاوایی لە قۆناغی هەرزەکاری دەکەن و سەربەخۆیی و ناسنامەی خۆیان دەست دەکەوێت.

ئەمەش بە پلەی یەکەم بۆ ئەو ئاسانکارییانە دەگەڕێتەوە کە لە گوندەکان بۆ هەرزەکارەکانیان دەکەن، بۆ نموونە ژن هێنان و ماڵ پێکەوەنان لە لادێ ئاسانترە، چونکە

بەزۆری ژن و ژن خوازی لە خزم و کەس و ناسیاوی ناو گوندەکەیان دەکەن و دوای ئەوەش بە کۆمەك و هاوکاری چەند ژوورێکی بەدارو قوڕو بەرد بۆ دروست دەکەن، سەرەڕای ئەوەش گیروگرفتی ئابووری کەمترو خێراتر لە هەرزەکاری شار سەربەخۆیی ماددی و ئابووری خۆی دەست دەکەوێت، چونکە دەتوانرێت پارچە زەویەك و چەند سەر مەڕو ماڵاتێکی پێ بدرێت یان کەس و کارو خزم و کەس هاوکاری دەکەن. سەرەڕای ئەوەش داواکاری و پێداویستیەکانی ژن هێنان و ماڵ پێکەوە نان و بژێوی ژیان زۆر زەحمەت و دژوار نییە.

بەڵام لەشار هەرزەکار رووبەڕووی زۆر گیروگرفت و داواکاری دەبێتەوە کە جیاوازە لە لادێ، لەوانە بەردەوام بوون لەسەر خوێندن و تەواوکردنی خوێندنی باڵا و چوون بۆ خزمەتی سەربازی و نەبوون و کەمی خانوو و بەرزی کرێی خانوو، سەرەڕای داواکاری زۆر لەکاتی ژن هێنان و گواستنەوەو پێکەوەنانی خێزان و کەمی بواری کارکردن کە سەرجەم ئەو هۆکارانە دەبنە هۆی ئەوەی کە تا ماوەیەکی زۆر هەرزەکار لەشار هەر پشت بە دایك و باوکی ببەستێت و داوای یارمەتیان لێبکات و نەتوانێت سەربەخۆیی و ناسنامەی خۆی وەك هەرزەکاری لادێ بەدەست بهێنێ بەڵام لەلایەکی ترەوە هەرزەکاری شار رۆشنبیرترەو زانیاری و زانستی زیاترە.

(٤) خواردن و تەندروستی باش:-

گومانی تێدانییە کە ئەو هەرزەکارەی هەر لە منداڵییەوە خواردن و تەندروستی باشە، پێش ئەو هەرزەکارەی کە خواردن و تەندروستی هەر لە منداڵییەوە باش نییە، دەچێتە قۆناغی هەرزەکارییەوە، ئەوەش بە پلەی یەکەم بۆ گەشەکردنی ئاسایی و کاریگەری و باش کارکردنی گلاندەکان و ئەندامەکانی تری لەش دەگەڕێتەوە، لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە هەر لە منداڵییەوە گرنگی بە خۆراك و تەندروستی مرۆڤ بدرێت، بۆ ئەوەی لەکاتی چوونە ناو قۆناغی هەرزەکاری تووشی گیروگرفت نەبێت.

کەواتە ئەو هۆکارانەی سەرەوە دەبنە هۆی ئەوەی کە هەموو منداڵان لەیەک کاتدا ئەچنە ناو قۆناغی هەرزەکاری، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لە هەموو جیهاندا زۆربەی منداڵان لە دەوروبەری (١٢) ساڵاندا دەچنە قۆناغی هەرزەکارییەوە بەڵام ژمارەیەکی کەم پێش ئەو ساڵە و ژمارەیەکی کەمیش دوای ئەو ساڵە بەماوەیەک ئینجا دەچنە قۆناغی هەرزەکارییەوە.

## جیاوازی نێوان باڵقی و هەرزەکاری

باڵقی (البلوغ) بەشێکە لە هەرزەکاری، واتە تەنها گۆڕانکارییە جەستەیی و فسیۆلۆژیەکان دەگرێتەوە، بەڵام هەرزەکاری بریتییە لەسەرجەم گۆڕانکارییە جەستەیی و فسیۆلۆژیی و عەقلی و هەڵچوونی و کۆمەڵایەتیەکان، کەواتە سەرەتای قۆناغی هەرزەکاری بە باڵقی دەست پێ دەکات کە چەند ساڵێکی کەمی سەرەتای قۆناغی هەرزەکاری دەخایەنێت بەڵام قۆناغی هەرزەکاری تەواو نابێت و هەرزەکار ناچێتە قۆناغی کاملی و پێگەیشتن (مرحلة الرشد) تاوەکوو هەرزەکار بەتەواوی لە لایەنی کۆمەڵایەتی و هەڵچوونی و عەقلیەوە گەشە نەکات، هەر لەبەرئەوەشە کە قۆناغی هەرزەکاری ماوەیەکی زۆر دەخایەنێ، چونکە قۆناغێکە کە منداڵ لە میانەیەوە بە تەواوی گەشە دەکات و لە کەسێکەوە کە پشت بە کەسانی تر دەبەستێ بۆ کەسێک کە پشت بەخۆی دەبەستێ دەگۆڕدرێ.

## نیشانەکانی باڵقی:-

منداڵ کاتێک کە دەچێتە قۆناغی هەرزەکاری، کۆمەڵێک گۆڕانکاری لە جەستەو شێوەو لەش و لاریدا ڕوودەدات، لە گرنگترین نیشانەو گۆڕانکاریەکانی باڵقی ئەمانەی لای خوارەوەن:-

١- پێگەیشتنی سێكسە گلاندەكان و ڕژانی سپێرم (الحیوان المنوي) لە لای كوڕو دەركەوتنی دیاردەی بێ نوێژی (الحیض) لە لای كچ.

٢- دەركەوتنی سمێڵ و ڕیش و گڕبوونی دەنگ ...... تاد) لە لای كوڕ و (بەرزبوونەوەی سنگ و كۆبوونەوەی چەوری لە هەندێك شوێنی لەش ...... تاد) لە لای كچ. سەرەڕای درێژبوونی هەردوو دەست و قاچەكانی و هەندێك گۆڕانكاری جەستەیی و فسیۆلۆژی تر لەلای هەردوو توخمەكە.

٣- گەشەكردنی هەردوو كەنالی ڤالوب و منداڵدان و بەرفراوانبوونی سێبەندو (الحوض) ران لەلای كچ.

٤- دەركەوتنی دیاردەی شەیتانی بوون (الحلم الجنسي) لە لای كوڕ.

## گلاندەکان وکاریگەرییان لە قۆناغی بالق بوون

دەرهاویشتنی گلاندەکان ( هۆرمۆنەکان ) هەر لە قۆناغی پێش لە دایك بوونەوە دەست بەکاری خۆیان دەکەن و کاریگەرییان لەسەر پرۆسەی گەشەکردنی هەیە و هەتا تەمەنی پیری بەردەوام دەبن. بڕی هۆرمۆنەکانی ناو لەش دیاریکراوو زۆر زۆر کەمن، لەبەر ئەوە زۆر بە زەحمەت بڕی پێویست بۆ مەبەستی چارەسەر کردن دەست دەکەون، بۆ نموونە ﴿بۆ دەست کەوتنی یەك کیلۆ گرام لە هۆرمۆنی سێکسی مێ ( ئەستڕۆجین ) پێویستمان بە ( ٢٠ ) بیست ملیۆن بەراز هەیە﴾ .

دەر ئەنجامی توێژینەوە زانستیەکانی ئەم بوارە ئەوەیان سەلماند کە پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان کاری هۆرمۆنەکان و زۆر دیاردەی دەروونیدا هەیە، سەرەڕای ئەوەش کاریگەری زۆر لەسەر پێك هێنانی گەشەکردنی هەڵچوونی هەیەو بەشدارییەکی زۆر لە ئاراستە کردنی هەڵس و کەوتی مرۆڤ و دیاریکردنی کەسایەتیدا دەکات .
لە هەموویان گرنگتر (بەتایبەتی لە قۆناغی باڵقی) کاریگەری هەندێك لە گلاندەکانە لەسەر وروژاندن و گەشەکردنی و خستنە گەڕی پاڵنەرو حەزوو ئارەزووی سێکسی و ئاراستە کردنیان واتە گوڕ و تینی ئارەزوو پاڵنەرە سێکسیەکان بەندە بە بڕی ئەو هۆرمۆنانە لە ناو خوێندا، حەزوو ئارەزوو رەفتاری سێکسی ئاژەڵ بە تەواوی لە ژێر کۆنترۆڵی هۆرمۆنەکاندایە.بەڵام رەفتاری سێکسی مرۆڤ دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی هۆرمۆنەکان و فاکتەرە کۆمەلایەتی و رۆشنبیری و دەروونیەکان .

لە گرنگترین گلاندەکان و جۆری هۆرمۆنەکانیان کە کاریگەرییان لەسەر حەزوو ئارەزوو رەفتاری سێکسی هەیە، ئەمانەی لای خوارەوەن :-

## پیتوەتیریە گلاند (pituitary gland):-

ئەم گلاندە (الغدة النخامية) ( پیتوە تیریە گلاند) گرنگیەكی زۆری لەسەر گەشەكردنی سێكسە گلاندەكان و كارو چالاكیەكانیان هەیە، نزیكەی (٥) پێنج ساڵ پێش بالق بوون، بەشی پێشەوەی ئەم گلاندە جۆرە هۆرمۆنێك دەردەهاوێت (افراز)كە پێی دەڵێن جۆنادۆ تروپین، كە ئەم هۆرمۆنە سێكسە گلاندەكان (هێلكەدان لەلای مێ و هەردوو گۆون لەلای نێر) دەخاتە جووڵە و چالاكیەكانیان بەگوڕ و تینتر دەكات و خێرایی گەشەكردن زیاتر دەكات. بەڵام كەمی (جۆنا دوتروپین) دەبێتە هۆی پوكانەوەی سێكسە گلاندەكان و لە دەست دانی چالاكی سێكسی و تووش بوون بە نەخۆشی (فروهلیج، Frohlich) كە منداڵ تووشی (زۆر قەڵەوی، گەشە نەكردنی كۆ ئەندامی زاووزێ، حەز كردن بە ملكەچی، گێژی و هێری، باوێشك دان و زوو خەو هاتن) دەكات. بەڵام لە كاتی سك پڕیدا زۆر بوونی هۆرمۆنی (ئەستڕۆجین) لە خوێندا دەبێتە هۆی وەستانی دەرهاویشتنی هۆرمۆنی (جۆنا دوتروپین)، كە ئەمەش دەبێتە هۆی وەستانی پرۆسەی دروست كردنی هێلكە لە كاتی دوو گیانیدا .

هەروەها بەشی پێشەوەی هەمان گلاند هۆرمۆنی ( پرۆلاكتین )( prolactine ) بەرهەم دەهێنێت، كە ئەم هۆرمۆنەش بە هاوكاری لەگەڵ هۆرمۆنەكانی (ئەستڕۆجین) و (بروجستیرون) دەبنە هۆی گەشەكردنی هەردوو مەمك و گلاندەكانی شیر دروست كردن لە كاتی بالغی بەدواوە.

شایەنی باسە دوای ئەوەی هۆرمۆنەكانی ئەم گلاندە دەبنە هۆی وروژاندنی سێكسە گلاندەكان، ئینجا بە پێچەوانەوە دەرهاوێشتەی (هۆرمۆنەكان )ی سێكسە گلاندەكان كار دەكەنە سەر كارو چالاكیەكانی ( پیتوە تیریە گلاند) و دەبنە هۆی كەمكردنەوەی كاریگەری و رێژەی هۆرمۆنی گەشەكردن كە ( پیتوە تیریە گلاند) دەری دەدات تا لە كۆتاییدا بەتەواوی بنە بڕی دەكەن و بەمەش گەشەكردنی جەستەیی رادەوەستێت .

لەلایەكی تریشەوە هۆرمۆنەكانی ( پیتوە تیریە گلاند ) بەشداری لە كۆنترۆلكردن و ڕێك خستنی پرۆسەی ( هێلكە دروست كردن، سك پڕ بوون، بێ نوێژی – العادة الشهرية ) لەلای نافرەت و پرۆسەكانی ( سپێرم دروست كردن و بارستایی پرۆستات، ڕێك خستنی هۆرمۆنی تیستوستیرۆن ) ( كە سێكسە گلاندی نێر بەرهەمی دەهێنێ ) دەكات هەروەها هەڵدەستێت بە ڕێك خستنی بەرهەم هێنان و دەرهاویشتنی هۆرمۆنەكانی سێكسی لەلای هەردوو توخمی نێرو مێ .

لە بەشی دواوەی ( پیتوە تیریە گلاند ) هۆرمۆنی ( پیتۆسین، pitocin ) دروست دەكات، كە یارمەتی گرژ بوونی ماسوولكەكانی منداڵدان دەدات، بەمەش كاری منداڵ بوون ئاسان دەكات، هەروەها دوای منداڵ بوونیش یارمەتی گەڕانەوەی منداڵدان دەدات بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ شێوەو بارستایی ئاسایی خۆی، سەرەڕای ئەوەش هۆرمۆنی ( پیتۆسین ) یارمەتی دەردانی شیر لە هەردوو مەمك بۆ دەرەوە دەدات .

**ئەدرینالینە گلاند ( الغدة الكظرية )(suprarenal gland):–**

ئەم گلاندە دەكەوێتە سەرو هەردوو گورچیلەوە، هۆرمۆنەكانی توێكڵ و بەشی دەرەوەی ئەم گلاندە ( بە شێوەیەكی گشتی ) كاریگەری خۆیان لەسەر گەشەكردنی سێكسی هەیە .

هۆرمۆنەكانی بەشی دەرەوەی ( توێكڵەكەی ئەم گلاندە ( سەرەڕای هۆرمۆنەكانی سێكس كە هەردوو سێكسە گلاند دروستی دەكەن ) بەشداری لە سەرهەڵدان و دەركەوتنی مۆرك و سیفاتی سێكسی ئاوەندی (ثانوی) لەلایەن هەردوو توخمی نێرو مێ دەكەن. لە ڕاستیدا ئەم گلاندە زیاتر هۆرمۆنی نێرایەتی بەرهەم دەهێنێت و لە هۆرمۆنی مێیایەتی زۆرترە، هەر لەبەر ئەوەشە كە ئەگەر بڕی هۆرمۆنەكانی ئەدرینالینە گلاند لە ڕێژەی ئاسایی خۆی زیادی كرد، ئەوا دەبێتە هۆی دەركەوتنی زۆر مۆرك و نیشانەی نێرایەتی ( دەنگ گڕ بوون، ڕیش و مووی سمێڵ ... تاد ) لە لای توخمی مێ سەرەڕای زوو دەركەوتنی نیشانەكانی

نێرایەتی لە لای کوڕ، واتە دەرکەوتنی ڕیش و سمێڵ و دەنگ گڕ بوون و گەورە بوونی ئەندامی زاووزێ لە لای منداڵی کوڕ پێش قۆناغی باڵقی و هەرزەکاری. بەڵام بەدەگمەن ئەم هۆرمۆنانە دەبنە هۆی دەرکەوتنی مۆرك و نیشانەکانی مێیایەتی لەلای نێر .

لە گرنگترین هۆرمۆنەکانی نێرایەتی کە ئەدرنالینە گلاند دروستی دەکات، هۆرمۆنی ( ئەندرۆجینە )( Androgens )، هەروەها کە لە گرنگترین هۆرمۆنەکانی مێیایەتیە کە ئەدرنالینە گلاند بەرهەمی دەهێنێت، هۆرمۆنی ( ئەسترۆجین ) و ( پرۆجسترۆنە ) .

## سێکسە گلاندەکان ( Sexual Gland ) :-

بریتیە لە هەردوو گون لەلای نێر و هەردوو هێلکەدان لەلای مێ و دوو جۆر دەرهاویشتنیان هەیە کە ئەوانیش بریتین لە :-

دەرەکیەکان :- کە بریتین لە خانەکانی زاووزێکردن ( سپێرم، Sperm ) لەلای نێرو ( هێلکەکان، Ova ) لەلای مێ .

ناوەکیەکان :- کە بریتیە لە بەرهەم هێنان و دەرهاویشتنی هۆرمۆنەکانی سێکسی، لە گرنگترین هۆرمۆنەکان کە سێکسە گلاندەکان بەرهەمیان دەهێنن، ئەمانەی لای خوارەوەن :

## هۆرمۆنەکانی نێرایەتی :-

هەرچەندە توێکڵ وبەشی دەرەوەی ئەدرنالینە گلاند هەندێك هۆرمۆنی نێرایەتی دروست دەکات و دەیکاتە ناو خوێنەوە، بەڵام سەرچاوەی سەرەکی بەرهەم هێنانی هۆرمۆنی نێرایەتی نییە، بەڵکو سەرچاوەی سەرەکی بەرهەم هێنانی هۆرمۆنی نێرایەتی بریتیە لە سێکسە گلاندی نێر ( هەردوو گون ) کە تۆو ( سپێرم ) بەرهەم دەهێنێت، لە ڕاستیدا گوون سێ جۆر هۆرمۆنی نێرایەتی دەردەهاوێت بەڵام ئەوەی لە هەموویان کاریگەر ترە هۆرمۆنی

تیستیستیروون ( Testesterone )، سەرەڕای ئەو سێ هۆرمۆنە، بڕێکی هۆرمۆنی مێیایەتی (ئەستڕۆجین) بەرهەم دەهێنێت .

وەك لە پێشتر ئاماژەی بۆ کرا (پیتوە تیریە گلاند) ڕۆڵی سەرەکی لە وروژاندن و بەگوڕ خستنی هەردوو گوون هەیە. هۆرمۆنەکانی هەردوو گوون بە (ئەندرۆجینەکان) واتە بەرهەم هێنەر و دروستکاری نێرایەتی ناسراون، کە ئەوانیش دوو جۆری سەرەکین و بریتین لە (ئەندرۆستیرۆن) و (تستو سترین). ئەم هۆرمۆنانە ڕۆڵی زۆر گرنگیان لە چالاك کردن و وروژاندنی حەزوو ئارەزووی سێکسی و دەرکەوتنی مۆرك و نیشانەکانی نێرایەتیدا هەیە .

پێویستە ئەوەبزانین کە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان خاسیەتەکانی سێکسی سەرەکی (اولی) و ناوەندی (ثانوي) هەیە. خاسیەتەکانی سێکسی سەرەکی بریتین لە جیاوازی فیسولۆژی و بایۆلۆژی نێوان هەردوو توخم، کە ئایا نێرە یان مێ، واتە جیاوازی نێوان ئەندامەکانی زاووزێ) بەڵام مۆرك و نیشانە ناوەندییەکان بریتین لەو مۆرك و نیشانانەی کە نێر و مێ لەلایەنی دەرەکی و ڕواڵەتەوە لە یەکتری جیا دەکەنەوە لەوانە دەنگ گڕبوون، سمێڵ و ڕیش دەرهاتن) لەلای کوڕو (مەمك دروست بوون و بەرز بوونەوەی، کۆبوونەوەی چەوری لە هەندێك جێگا، بەرفراوان بوونی سێ بەندە) لە لای کچ .

لە گرنگترین کاریگەری چالاکیەکانی هۆرمۆنەکانی نێرایەتی ئەمانەی لای خوارەوەن:-

گەورە بوونی بارستایی (ئەندامەکانی زاووزێ، پرۆستاتە گلاند، ... تاد) . دەرکەوتنی مۆرك و نیشانە سێکسە ناوەندییەکان وەك (ڕیش و سمێڵ، مووی بن باڵ و دەوروبەری ئەندامەکانی زاووزێ، دەنگ گڕبوون، گەشەکردنی قوڕگ و دەنگە ژێیەکان، بەرفراوان بوونی ناو شان، تەسك بوونەوەی سێ بەند - الحوض - مانەوەی مەمك بە پوکاوی و دەرنەکەوتویی، وروژاندنی حەزوو ئارەزووی سێکسی و هەندێك گۆڕانکاری دەروونی لە لای کوڕ) .

## هۆرمۆنەکانی مێیایەتی :-

سێکسە گلاندی مێ ( هەردوو هێلکەدان ) دوو جۆری سەرەکی هۆرمۆن دەردەدەن کە بریتین لە ( کۆمەڵەی ئەستروجین )و( کۆمەڵەی پرۆجستیرون )، بەم شێوەی لای خوارەوە :-

## دەرهاوێشتە دەرەکیەکان :-

کە بە هێلکەکان ناسراون و بۆ ماوەی نزیکەی (٣٠) سی ساڵ، هێلکەدانەکان هەر مانگی هێلکەیەک پێدەگەیەنن و فڕێی دەدەنە ناو جۆگەلەی ڤالوبەوەو لەوێشەوە دەگاتە ناو منداڵدان. ئەم هێلکانە لەکاتی باڵق بوونەوە دەست بە پێگەیشتن دەکەن و لە تەمەنی بێ هیواشیدا ( سن الیاس ) کە لە دوای (٥٠) ساڵان دەست پێدەکات وردە وردە بەرەو نەمان دەچن.

## دەرهاوێشتە ناوەییەکان :-

کە بە هۆرمۆنەکانی مێیایەتی ناسراون و بریتین لە ( ئەستروجین ) و ( پرۆجسترون ) سەرەڕای هەردوو هێلکەدان ئەدرنالینە گلاندیش بەشداری لە بەرهەم هێنانی هۆرمۆنەکانی مێیایەتی دەکات.

هۆرمۆنەکانی ( ئەندرۆجین )و( ئەسترۆجین ) لەلای هەردوو توخمی نێرو مێ هەیە، بەڵام ڕێژەی ( ئەندرۆجین ) لەلای کوڕو ڕێژەی ( ئەسترۆجینیش ) لەلای کچ زیاترە. سەرچاوەی سەرەکی ئەندرۆجینی (مێ) بریتیە لە ئەدرینالینە گلاند، بەڵام سەرچاوەی سەرەکی ئەسترۆجین بریتیە لە هەردوو هێلکەدان. شایەنی باسە بەشێوەیەکی گشتی کارو چالاکیەکانی هۆرمۆنەکانی (مێ) پێچەوانەی ناراستەی کارو چالاکیەکانی هۆرمۆنەکانی (نێرن). واتە کەم بوونی بڕی یەکێکیان دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نیشانەکانی زیاد بوونی ئەوی تریان و پێچەوانەکەشی راستە.

## ئەمانەی خوارەوەش گرنگترین هۆرمۆنەکانی مێیایەتی و کاریگەرییەکانیانن:-

### ئەستروجین:-

ئەم هۆرمۆنە بەرپرسی یەکەمی دەرکەوتنی مۆرك و نیشانەی سێکسیە ناوەندیەکانە (ثانوي) لەلای کچ لەوانە (دەرکەوتنی موو لەبن باڵ و دەورو بەری ئەندامی زاووزێ، رەنگ ئاسکی، گەورە بوون و بەر فراوانبوونی سێ بەندە (الحوض) گەشەکردنی سمت و ران، بچووك بوونەوەی ناو شان، بەرز بوونەوەی مەمك) سەرەڕای وروژاندنی حەزوو ئارەزووی سێکسی و هەندێك گۆڕانکاری دەروونی .

### پرۆجسترۆن:-

کە دەبێتە هۆی گەشە کردنی گلاندەکانی شیر، هەروەها بە هاوکاری ئەستروجین هەردوو پرۆسەی (بێ نوێژی وسك پڕ بوون) ڕێك دەخەن. سەرەڕای ڕاگرتنی پرۆسەی بەرهەم هێنانی هێلکە لە کاتی دوو گیانی (سك پڕیدا) لە ئە نجامی توێژینەوە زانستیەوە دەرکەوتووە. کە بڕین و لابردنی هێلکەدانی (مێ) مەرج نییە ببێتە هۆی کەم کردنەوەی حەزوو ئارەزووی سێکسی (مێ)، بەڵام بڕین و لابردنی ئەدرینالە گلاند (الغدة الكظرية) بە تەواوی دەبێتە هۆی نەمانی حەزوو ئارەزووی سێکسی لەلای توخمی (مێ)، هەروەها تێك چوونی بڕی پێویستی دەرهاویشتنی هۆرمۆنەکانی مێیایەتی (زیاد) یان (کەم) دەبێتەوە هۆی زۆر گۆڕانکاری لەلای توخمی (مێ).

بۆ نموونە، ئەگەر (پێتوە تیریە گلاند) هۆرمۆنی تایبەت بە چالاککردنی کاری هێلکەدان بەرهەم نەهێنێت یان کەم بێت، ئەوا دەبێتە هۆی ئەوەی کە هێلکەدان نە توانێت بە کارەکانی خۆی هەڵبستێت و ئەوەش گەشەکردنی سێکسی دوادەخات و دەبێتە هۆی شلە ژان و تێك چوونی رەفتارو هەڵس و کەوتی سێکسی، بەڵام زیاد بوونی دەرهاوێشتەکانی

(پیتوەتیریە گلاند) دەبیتە هۆی زوو گەشەکردنی سێکسی لەلای توخمی (مێ).
(أغا، ١٩٨١، ص ١٠٣ – ١٢٤)، (هرمزو أبراهیم، ١٩٨٨).

ڤۆرنۆف زانا (Vornoff) بەمەبەستی گەڕاندنەوەی لاوێتی چەند تاقیکردنەوەیەکی لەسەر مەیموون کرد، ئەویش لە ڕێگەی وەرگرتنی هۆرمۆنەکانی نێرایەتی لە مەیموون و دانی بە نێرە مەیموونێکی تر، دەرکەوت لەگەڵ گەڕانەوەی لاوێتی زۆر مۆرك و خاسیەتی لاوێتیش گەڕایەوە. هەروەها (شتایناچ) (Steinach) توێژینەوەی زۆری لەسەر ئاژەڵان کرد، یەکێك لە ئەوانە ئەوە بوو کە سێکسە گلاندی نێرە بەرازێکی هیندی بۆ مالۆسیکی (مێیە بەراز)ێکی هیندی گواستەوە بە پێچەوانەشەوە سێکسە گلاندی مالۆسەکەشی بۆ نێرە بەرازەکە گواستەوە. لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکارییە بۆی دەرکەوت کە نێرە بەرازەکان زۆر خاسیەت و نیشانەی نێرایەتیان لەدەست دا و بە هەمان شێوەش مالۆسەکان (مێیە بەرازەکان)یش زۆر خاسیەتی مێیایەتیان لە دەست دا.

هەروەها دەرکەوتووە کە ئەوانەی دەخەسێنرێن (واتە هەردوو گونەکانیان دەردەهێنرێ) زۆر خاسیەتی نێرایەتی (دەنگ گڕ بوون، توندو تیژی ... تاد) لە دەست دەدەن و دەنگیان ناسك دەبێت و تووشی سستی و خاوی دەبن و لە زۆر ڕەفتاری ئازایانە و چاو نەترسانە دوور دەکەونەوە (القوصي، ١٩٨١، ص ٤٩).

<u>باڵقی سێکسی لەلای کچ:-</u>

خولەکانی ژیانی سێکسی توخمی (مێ) بە چەند قۆناغێکی جیاجیادا تێدەپەڕێت و ئەو قۆناغ و گۆڕانکاریانەش کاردەکەنە سەر حەزوو ئارەزووە سێکسیەکانی ، لەبەر ئەوەی لەلایەتی سێکسیەوە زیاتر لە نێر شڵەژانی و بەرزو نزمی پێوە دیارە. خولەکانی ژیانی سێکسی (مێ) بە چەند قۆناغێکی دیاریکراودا تێدەپەڕێت کە بریتین لە (سەرەتای بێ نوێژی، بێ نوێژی، دووگیانی – سك پڕی، منداڵ بوون (دووبارە بوونەوە)، ساڵی بێ

هیوایی – سن الیأس﴾ یەکەم نیشانەی بالغی لە لای کچ دەرکەوتنی دیاردەی بێ نوێژییە (سووڕی مانگانە) (الحیض) کە بە یەکەم بێ نوێژی ناو دەبرێت. بالغی کاتێک روو دەدات، کە بۆ یەکەم جار هێلکە بەرهەم دێت و لە ڕێگەی جۆگەلەی ڤالوبەوە بۆ منداڵدان دەگوێزرێتەوە.

دەرئە نجامی زۆر لە توێژینەوەکانی ئەم بوارە ئاماژە بۆ ئەمانەی خوارەوە دەکەن :-

هەردوو کرداری هێلکە بەرهەم هێنان و بێ نوێژی لەلای توخمی مێ بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و دوور لە ویست و کۆنترۆڵی توخمی (مێ) روودەدەن و کاتی دیاریکراوی خۆیان هەیە، کە بە بالغی دەست پێدەکات و بە سالی بێ هیوایی کۆتایی دێت. بەڵام زۆربەی جار کرداری بەرهەم هێنانی سپێرم (تۆو) لەلای توخمی (نێر) بە ئیرادەو ویستی خۆیەتی و بە قۆناغی بالغ بوون دەست پێدەکات و هەتا مردنیش بەردەوام دەبێت.

دەرکەوتنی یەکەم بێ نوێژی بەڵگەی پێگەیشتنی سێکسی کچ نییە، لەبەر ئەوەی یەکەم بێ نوێژی بارێکی فسیۆلۆژییە و لە خۆیەوە روودەدات و نزیکەی دوو ساڵ دوای ئەو یەکەم بێ نوێژییە ئینجا کچ توانای زاووزێی دەبێت، هەروەها بە زۆری دەرکەوتنی بێ نوێژی بە شێوەیەکی بەردەوام و بێ پچڕان و دەرکەوتنی نیشانە سێکسیە ناوەندییەکان، بە بەڵگە دادەنرێت بۆ پێگەیشتنی سێکسی کچ.

بەشێوەیەکی گشتی کچ لە دەوروبەری (١٢) ساڵان یەکەم حالەتی بێ نوێژی لەلای دەردەکەوێت، بەڵام هەندێک کچ لە تەمەنی (٨) یان (٩) ساڵان و هەندیکی تریان لە دەوروبەری تەمەنی (٢٠) بیست ساڵان یەکەم حالەتی بێ نوێژی لەلایان دەردەکەوێت، بەڵام ڕێژەی ئەوانە زۆر کەمن کە یان پێش یان دوا دەکەون، چونکە زۆربەی زۆری کچان لە دەوروبەری (١١-١٤) یانزدە بۆ چواردە ساڵان یەکەم بێ نوێژی لە لایان دەردەکەوێت.

لە راستیدا بێ نوێژی لە لای کچ نابێتە هۆی دروست کردنی ئازاری زۆر، بەلام تەنها لە لای ئەوانە ئازاری زۆر دەبێت کە ( جەستەو لەش و لارێکی زۆر لاوازیان هەیە، یان کەم و کورتی جەستەییان هەیە، یان رووبەرووی زۆر گیروگرفتی دەروونی و کۆمەلایەتی بوونەتەوەو بە چاوی ترس و گومان سەیری دیاردەی بێ نوێژی و جەستەی خۆیان دەکەن، یان بڕوایان بە خۆیان نییە ... تاد ).

بێ نوێژی بۆ ماوەی ( ٣٠-٤٠ ) سالْ بەردەوام دەبێت، دوای ئەوە دەوەستێت و ئافرەت دەگاتە تەمەنی بێ هیوایی. لەکاتی بێ نوێژی کۆمەڵێك گۆڕانکاری بایەلۆژی و فیسیۆلۆژی روودەدەن و ئەو گۆڕانکارییە بایەلۆژی و فسیۆلۆژیانەش لە لایەن سەنتەری تایبەتی لەناو مێشك کۆنتڕۆڵ و رێك دەخرێن و هەر ( ٢٨ ) یان ( ٢٩ ) رۆژ جارێك بێ نوێژی روودەدات و بۆ ماوەی ( ٣ ) تا ( ٧ ) رۆژ بەردەوام دەبێت .

## بالقی لەلای کوڕ:-

دیاریکردنی سەرەتای بالق بوون لەلای کوڕ کارێکی ئاسان نییە، لەبەر ئەوەی دیاردەو گۆڕانکاریەکی نیمچە بەردەوامی وەك (بێ نوێژی) لەلای کچ نییە، چونکە گۆڕانکارییە جەستەیی و فسیۆلۆژیەکانی لای کوڕ لە کاتی جیاجیا ڕوو دەدەن .

بەلام بە شێوەیەکی گشتی سەرەتای دەرکەوتنی بالق بوون لە لای کوڕ بەسەر هەندێ گەندەلە مووی دەوروبەری ئەندامی زاووزێ ی کوڕ دەست نیشان دەکرێت بەلام ئەم نیشانەیە وەك ڕوودانی یەکەم حالەتی شەیتانی بوون لە شەودا (الأستحلام الأول) ( First nocturnal emission ) بەهێز نییە لە راستیدا بەیەك دوو سالی یەکەم پێش بالق بوون دەڵێن (قۆناغی پێش بالق بوون، لەم قۆناغە چالاکی چەورییە گلاند زیاتر دەبێت و چەوری لە لای سێبەشی هەرزەکاران لە دەم و چاویان دەردەکەوێت (زیپکە) بەلام لە قۆناغی بالقی زۆربەی ئەو چەوریانە کەم دەبنەوە. لە سەرەتای بالقی هەردوو گونی کوڕ

چالاك دەبێت دەست دەکەن بە دەرهاویشتنی سپێرم (تۆو) و هۆرمۆنەکانی سێکسی، هەروەها سپێرم تێکەڵ بەو شلەیە دەبێت کە پرۆستات دروستی دەکات، کە ئەویش شلەیەکی لینجە کە نزیکەی (٢) تا (٤) سم٣ دەبێت و لە هەر فڕێدانێکدا نزیکەی (٢) دوو تا (٣) سێ ملیۆن سپێرم لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت .

بەشێوەیەکی گشتی زۆربەی کوڕان لە دەوروبەری (١٤)و(١٥) ساڵاندا باڵق دەبن بەڵام هەندێکی کەمیان لە دەوروبەری (١٠) ساڵان و هەندێکی تریان لە دەوروبەری (٢٠) ساڵان ئینجا باڵق دەبن، واتە یان پێش یان دوای هاوەڵەکانیان دەکەون.

هەندێك لە زاناکان لەو بڕوایە دان کە زوو باڵق بوون بە قازانجی کوڕ تەواو دەبێت و لەناو برادەرەکانیدا شانازی پێوە دەکات، بەڵام زوو باڵق بوون لە بەرژەوەندی کچ نییە و دوور نییە تووشی ترس و دڵە ڕاوکێ و خەم و خەفەتی بکات و ببێتە مایەی شەرم بۆی لەناو دەستە خوشك و کەسانی چواردەوری .

## هەڵس و كەوت و جووڵەی هەرزەكار

هەرزەكار لە سەرەتای قۆناغی هەرزەكاری تووشی جۆرە تەمبەڵی و خاوو خلیچكیەك دەبێت، ئەوەش بە پلەی یەكەم بۆ گەشەكردنی خێرای جەستەو لەش و لاری هەرزەكار دەگەڕێتەوە، چونكە لەناكاوو خێرا دەست و قاچەكانی درێژ دەبێت و ناتوانێت بە ئاسانی كۆنترۆڵیان بكات، لە لایەكی تریشەوە هاوسەنگی و پێكەوە كاركردن لە نێوان كۆئەندامی جووڵە (الجهاز الحركي) و كۆئەندامی دەمار (الجهاز العصبـــي) دا دروست نەبووە، لەبەرئەوەی جەستەو پێگەیشتنی ئەندامەكانی جووڵە پێش گەشەكردنی كۆئەندامی دەمارەكان دەكەوێت، كە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی كە هەرزەكار تووشی جۆرە سستی و تەمبەڵیەك ببێت بەڵام دوای ماوەیەك كۆئەندامی دەماریش گەشەدەكات و هاوسەنگیەك لەنێوان كۆئەندامی جووڵەو كۆئەندامی دەماری هەرزەكاردا دروست دەبێت و ئیتر دەتوانێت بە تەواوی كۆنترۆڵی ئەندامەكانی لەشی بكات و لە سستی و تەمبەڵی ڕزگاری ببێت هەروەها چالاكی و جووڵەكانی هەرزەكار بە مەبەست و ئاكامدارە، بە پێچەوانەی منداڵ كە زۆربەی هەڵس و كەوت و جووڵەكانی بێ ئامانج و لابەلاییە.

لە ڕاستیدا لە سەرەتای هەرزەكاری، لە ئاكامی ئەو گەشەكردنە خێرایە و نەبوونی هاوسەنگی پێویست لەنێوان هەردوو كۆئەندامی جووڵەو كۆئەندامی دەماری، هەرزەكار تووشی شڵەژان و تێك چوونی جووڵەیی دەبێت و لەكاتی شت هەڵگرتن و ڕۆیشتن دەست و قاچەكانی تەتەڵە دەكات و شتی لە دەست دەكەوێتە خوارەوەو قاچی بەرشت دەكەوێ و لەوانەیە بكەوێ. كەواتە پێویستە دایك و باوك و مامۆستا ڕەچاوی ئەو گۆڕانكاریانە بكەن و ڕێنمایی پێویستی هەرزەكار بكەن بۆئەوەی بە ئاسانی بەسەر ئەو كۆسپ و كەم و كورتیانەدا زاڵ ببێت، بەڵام كەم كردنەوە لە نرخی هەرزەكارو گاڵتەو سووكایەتی پێكردنی، دەبێتە هۆی ئاڵۆزبوونی باری دەروونی هەرزەكارو زیاد بوونی هەڵچوونەكانی و دروست بوونی كێشەو بگرەو بەردە لەنێوان هەرزەكارو كەسانی چواردەوری.

## تەندروستی هەرزەکار

هەندێک لە هەرزەکاران لەسەرەتای قۆناغی هەرزەکاری تووشی هەندێک نەخۆشی دەبن، بەلام زۆربەی ئەو نەخۆشیانە لە دروست کردنی خەوو خەیالی خۆیەتی و مەبەستی راکێشانی سەرنجی کەسانی ترە یان بۆ خۆ رزگارکردنە لە داواکاری و ئەرکەکانی خێزان و قوتابخانە، بە تایبەتیش ئەم دەردو حالەتە تووشی ئەو هەرزەکارانە دەبێت کە لە سۆزو خۆشەویستی و چاودێری دایک و باوك و مامۆستاو کەسانی نزیکیان بێ بەش بوون، لەبەرئەوە خۆیان نەخۆش دەخەن و وا دەردەخەن کە نەخۆشن، بۆ ئەوەی لە میانەیەوە سۆزو گرنگی و خۆشەویستی کەسانی چواردەوریان دەست بکەوێت، یان لە ئەرك و کارەکانی خێزان و قوتابخانە رزگاریان ببێت. ئینجا بۆئەوەی هەرزەکار پەنا بۆ ئەو چەکە دەروونیە نەبات، پێویستە رێزی بگیرێ و هەست بکات کە کەسێکی خۆشەویستە و پلەوپایەی تایبەتی خۆی لەناو خێزان و قوتابخانە و کۆمەڵ هەیە.

هەرزەکاران تووشی چەند نەخۆشییەکی سایکۆسۆماتی (جەستە دەروونی) دەبن، ئەمانەش ئەو نەخۆشیانەن کە هۆکارەکانی تووشی بوونیان دەروونیەو دەرئەنجام و ئاکامەکانیشیان جەستەییە، لەوانە نەخۆشییەکانی (سور هەڵگەڕان و سووتانەوەی دوانزە گرێ و گەدەو، رەبوو تەنگە نەفەسی و هەناسە سواری و ئازاری پشت و ماسوولکەکان و ... تاد) ئەوەش بە پلەی سەرەکی بۆ ئەو هەموو گێروگرفت و خەم و خەفەت و توڕەبوونانە دەگەڕێتەوە کە بەردەوام رووبەڕووی ژمارەیەك لە هەرزەکاران دەبێتەوە، بە تایبەتیش ئەو هەرزەکارانەی کە خەم و خەفەت و دڵەراوکێکان لەناوەوەی خۆیان کۆدەکەنەوەو گوزارشتی لێناکەن و لە رێگەی چەند چالاکیەکەوە رزگاریان نابێت لێیان.

هەروەها هەندێك جار باری دەروونی هەرزەکار لە ئەنجامی خۆشەویستی و دڵداری و بیرکردنەوەی رۆمانسیانەوە ئاڵۆز دەبێت و لە ئاکامیشدا رووبەڕووی زۆر گرفتی تەندروستی و جەستەیی و دەروونی و کۆمەلایەتی دەبێتەوە، لەبەرئەوە زۆر پێویستە بەردەوام رێنمایی پێویستی هەرزەکار لەو بارەیەوە بکرێت.

لەسەرەتای هەرزەکاریش هەندێك جار هەرزەکار تووشی ئازاری گەدەو دڵ و کەم خوێنی و کەم بوونەوەی ئارەزووی نان خواردن و ماندووبوون دەبێت، کە ئەمەش کاردەکاتە سەر چالاکی و باری دەروونی.

## هەرزەکاری و جۆرەکانی

وشەو زاراوەی هەرزەکاری (Adolescence) لە کرداری (Adolescere)ی لاتینییەوە وەرگیراوە کە مانای گەشەکردنی پلە پلەیی و هەنگاو بە هەنگاوی جەستەیی و سێکسی و ژیری و هەڵچوونی و کۆمەڵایەتی دەگەیەنێت (زیدان، ١٩٩٤، ص١٥٦-١٥٧) (هرمز و ابراهیم، ١٩٨٨، ص٥٦٥).

هەندێك لە زاناکان هەرزەکاری بەسەر چەند جۆرێکدا دابەش دەکەن، یەکێك لە دابەشکردنەکان ئەمانەی لای خوارەوەن:-

(١) هەرزەکاری خۆگونجاو (المراهقة المتكيفة):

مەبەست لەم جۆرە هەرزەکارییە ئەوەیە، کە هەرزەکار تا رادەیەك خۆی لەگەڵ ژینگەو دەوروبەرەکەیدا گونجاندوەو هیچ گیروگرفت و ئەندێشەیەکی ئەوتۆی لەگەڵ کۆمەڵەکەیدا نییە، واتە هەرزەکار هەست بە بوون و ناسنامەی خۆی دەکات و کۆمەڵگا رێزی دەگرێت و پلەو پایەی گونجاوی خۆی داوەتێ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەرزەکار لە خۆیی و کۆمەڵەکەی رازی بێت و دوورکەوێتەوە لە زیندە خەونی زۆر و (أحلام اليقظة) و خەوو خەیاڵ و بۆچوونی خراپ.

(٢) هەرزەکاری گۆشەگیرو دوورە پەرێز (المراهقة الإنسحابية المنطوية):-

ئەم جۆرە هەرزەکارە تووشی گۆشەگیری و دوورە پەرێزی و تەنیایی دەبێت و زۆر حەز بە ناو کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی ناکات، بەڵکو هەست بە خەمۆکی و بێزاری و کەمی و شەرم

دەکات و لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانیدا سەرکەوتوو نیە، لە جیاتی ئەوە جیهانێکی خەیاڵاوی و نموونەیی بۆ خۆی دروست دەکات و گرنگی بەلایەنی نایبفی و ناکاری و ئەخلاقی دەدات و هەندێك جاریش نقومی جیهانی خەوو خەیاڵ و زیندە خەون دەبێت، کە لە وانەیە لە جیهانی واقیعی دوور بخاتەوەو تووشی زۆر گیروگرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی بکات.

(٣) هەرزەکاری سەرەڕۆو شەڕخواز (المراهقة العدوانية المتمردة):-

ئەم جۆرە هەرزەکارانە ڕێگای سەرەڕۆیی و شەڕخوازی دەگرنە بەرو دەست درێژی دەکەنە سەر دایك و باوك و مامۆستاو کەسانی چواردەوری، بەزۆر شێواز گوزارشت لەو یاخی بوون و سەرەڕۆییانەیان دەکەن، لەوانە (لاسایی کردنەوەی گەورەکان لە ڕێگەی جگەرە کێشان و ڕیش هێشتنەوەو خواردنەوەو بەکارهێنانی داوودەرمانی هۆشبەر) هەروەها هەڵگرتنی چەقۆو چەك و کەرەستەی بریندارکردن، ئینجا هەندێك جار هەڵس و کەوتە شەڕخوازییەکەیان ڕاستەوخۆ دەبێت و ئازاری کەسانی چواردەوریان دەدەن، یان ناڕاستەوخۆ دەبێت و شێوازی (دزی کردن، درۆ، عینادی، فرت و فێڵ) دەگرێتە خۆ، هەندێك جاریش پەنا بۆ خەوو خەیاڵ و زیندە خەون دەبەن بەلام کەمتر لە هەرزەکارانی جۆری دووهەم.

(٤) هەرزەکاری لاسارو لادەر (المراهقة المنحرفة):-

ئەم جۆرە هەرزەکارانە بریتین لە سەرەڕۆو لاسارەکانی جۆری دووهەم و سێهەم (گۆشەگیرو شەڕخوازەکان) هەرچەندە هەرزەکارانی دوورەپەرێزو سەرەڕۆی (دووهەم و سێهەم) نا ئاساین و ناتوانن خۆیان لەگەڵ کۆمەڵەکەیان بسازێنن بەلام ناگەنە ئەو قۆناغەی کە بە تەواوی لە ڕێگەی ئاسایی و یاسایی دەربچن و مەترسیان لەسەر کۆمەڵ هەبێت، بەلام ئەم جۆرەیان مەترسیدار دەبێت و زیان بە کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی دەگەیەنێت و شێوازی ترسناك دەگرێتەبەر، لەوانە (تاوانی کوشتن، بەد ڕەوشتی، پێشێل کردنی ئاشکرای یاساو داب و نەریتی کۆمەڵایەتی، تووش بوون بە نەخۆشی دەروونی و عەقلی ...... تاد) (زیدان، ١٩٩٤، ص١٦١-١٦٢).

# تیۆرییەکانی هەرزەکاری

## هەرزەکاری دیاردەیەکی بایۆلۆژییە

قۆناغی هەرزەکاری یەکێکە لەو قۆناغانەی کە سەرنجی زۆر لە توێژەرو زانایانی بۆ لای خۆی راکێشاوە، بەلام هەر کۆمەڵەیان بەجۆرێك لێکی دەداتەوە کە لە زۆر لایەنەوە جیاوازە لە کۆمەڵەکانی تر. یەکێك لە لێکدانەوەکان کە (ستانلی هۆل)ی زانای ئەمریکی رابەرو دامەزرێنەریەتی، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەرزەکاری دیاردەیەکی بایۆلۆژییە واتە سەرجەم گۆڕانکاری و گیروگرفتەکانی قۆناغی هەرزەکاری بۆ گۆڕانکارییە جەستەیی و فسیۆلۆژییەکان دەگەڕێتەوەو پەیوەندییەکی زۆر کەمی بە ژینگەی کۆمەلایەتی و ئابووری و رۆشنبیری هەرزەکارەوە هەیە. وە قۆناغی هەرزەکاری بە لە دایك بوونێکی نوێ لە قەڵەم دەدات، لەبەرئەوەی کۆمەڵێك گۆڕانکاری جەستەیی و فسیۆلۆژی خێراو لەناکاو روودەدات کە هەرزەکار تووشی ترس و گرژی و دڵە راوکێ دەکات و لەوەوپێش خۆی ئامادە نەکردبوو بۆیان.

بە بڕوای (هۆل) ئەو گۆڕانکاریانە هەردەبێت ڕوویدەن و (حتمیة) و لە توانای هیچ کەس و ژینگەیەکدا نیە کە نەهێڵێت ڕوویدەن، هەر ئەمەشە کە وا لە هەرزەکار دەکات تووشی کۆمەڵێك گرفتی دەروونی و کۆمەلایەتی ببێت، ئیتر ئەو هەرزەکارە لە هەرچ کۆمەڵگایەك بژی (پێش کەوتوبێت یان دواکەوتوو، سادە بێت یان ئالۆز) دەبێت تووشی ئەو گرفت و ئەندێشەو یاخی بوون و سەرە ڕۆییانە ببێت. بە بڕوای لایەنگرانی ئەم لێك دانەوەیە، گۆڕانکارییە سێکسیە ناوەندیەکان وەك (دەنگ گڕبوون، موولێهاتن، گەورەبوونی سنگی کچە هەرزەکار، درێژبوونی دەست و قاچەکان و ...... تاد) و گۆڕانکاریە سێکسیە سەرەکیەکانی وەك (پێگەیشتنی ئەندامی زاوزێی کورو کچ و دەرکەوتن و جۆشدانی رەمەکی (غریزة) سێکسی و رووداوی دیاردەی بێ نوێژی لە لای کچ و شەیتانی بوون لە لای کوڕ) هۆکاری سەرەکی خولقاندنی ئەندێشەو گیروگرفتن بۆ هەرزەکار،

لەبەرئەوەی کوت و پڕو لە ناکاون و وەك قۆناغی منداڵی لەسەرخۆو پلە بە پلەو یەك لە دوای یەك نین.

هەروەها بۆچوونەکانی (فرۆید) و هاوەڵەکانی دەربارەی قۆناغی هەرزەکاری زۆر نزیکن لە بۆچوونەکانی (ستانلی هۆل)، لەبەرئەوەی فرۆیدو هاوەڵەکانیشی گیروگرفتی هەرزەکار بە رەمەکی سێکسی و حەزوو ئارەزووە سێکسیەکانەوە دەبەستنەوەو لەو باوەڕەدان کە لە ئەنجامی بوونی ململانێ لە نێوان حەزوو داواکاریەکانی (ئەو) ((ID) و پێداویستی و داواکاریەکانی (من) (الأنا) و (منی باڵا) (الأنا العلیا) هەرزەکار تووشی گرفت و ئەندێشەی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەبێت، بە تایبەتی لەو کاتانەی کە (من) لاواز دەبێت و ناتوانێت هاوسەنگیەك لەنێوان حەزوو ئارەزووە سێکسی و بایۆلۆژیەکان لە لایەك و داواکاری و داب و نەریتە کۆمەڵایەتیەکان لە لایەکی تر رابگرێت، چونکە فرۆید لەو بڕوایە دایە کە تاك وەك بووکە شووشەیەك، هێزە فسیۆلۆژی و ڕەمەکەکان یاری پێ دەکات و بەردەوام گیرۆدەی دەستیانە، هەرچەندە دەتوانێت لە ڕێگەی میکانیزمە دەروونیەکانەوە کەمێك لە فشاری هێزی رەمەکەکان کەم بکاتەوە.

لە راستیدا ئەم لێکدانەوەی (هۆل) و (فرۆید) و هاوەڵەکانیان ڕەخنەو پلاری زۆری تێگیراوە، لەبەرئەوەی لە زۆر کۆمەڵگا هەرزەکار ڕووبەڕووی ئەو هەموو گیروگرفت و سەرەڕۆیی و یاخی بوونانەی کە ئەوان باسی دەکەن نابێتەوە، چونکە زۆربەی گیروگرفتەکانی هەرزەکار بۆ ژینگەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری ئەو کۆمەڵگایە دەگەڕێتەوە کە هەرزەکاری تێدا دەژی نەك بۆ گۆڕانکاریيە جەستەیی و فسیۆلۆژیەکان واتە ئەگەر ژینگەی دەرەوەی هەرزەکار لەبارو گونجاو بێت بۆ گەشەکردنی ئاسایی هەرزەکار و کەسانی چواردەور لە نرخی کەم نەکەنەوەو بەربەست و ڕێگری بۆ دروست نەکەن و ڕێنمایی پێویستی بکەن، ئەوا زۆر زەحمەت و دەگمەنە لایەنی جەستەیی ئەو هەموو گرفتانە بۆ هەرزەکار دروست بکات و بە پێچەوانەوە بە ئاسانی دوور لە گرفت و یاخی بوون بە قۆناغی

هەرزەکاریدا تێدەپەڕێت. واتە لایەنی جەستەیی گرنگی خۆی هەیە بەڵام بەو شێوەیە نیە کە ( هۆل ) و ( فرۆید ) و هاوەڵەکانیان باسی دەکەن.

## هەرزەکاری دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە

هەندێك لە زانایان لەو بڕوایەدان کە هەرزەکاری دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە نەك بایۆلۆژی، واتە گیروگرفت و جۆری کەسایەتی هەرزەکار لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر و لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەگۆڕێ و هەموو هەرزەکارانی جیهان یەك جۆر گیروگرفت و ئەرك و پێداویستیان نیە، بەڵکو بەپێی داب و نەریت و شارستانی و ئاستی رۆشنبیری ئەو کۆمەڵگایەی کە تیایدا دەژی دەگۆڕێ. بەپێی بۆچوونی ئەو زانایانە کۆمەڵگایەك کە پڕ بێت لە بەرگرو و بەربەست و ململانێ و کێ بڕکێ و چەوساندنەوەو جۆرەها بەهاو ئاکارو فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیای جیاجیا، ئەوا هەرزەکاری ئەو جۆرە کۆمەڵگایانە بە زۆری تووشی ململانێی دەروونی و گیروگرفت و ئەخۆشی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەبن ئەگەر بەراورد بکرێت بە ئەو هەرزەکارانەی کە لە کۆمەڵگایەکی سادەو ساکارو دوور لە بەربەست و رێگردا دەژین و یەك جۆر فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیاو ئاین و بەهاو ئاکاری کۆمەڵایەتیان هەیە.

لەبەرئەوەی هەرزەکار لە کۆمەڵگای ئاڵۆزو پڕ لە گیرو گرفتدا بەردەوام رووبەرووی ناخۆشی و ململانێ دەبێتەوەو نازانێ لەو هەموو ئاین و فەلسەفەو داب و نەریتە کۆمەڵایەتیە جیاجیایانەی کۆمەڵگاکەی کامیان هەڵبژێرێ و کامیان واز لێبهێنێ بەڵام لە کۆمەڵگای سادەو ساکار هەرزەکار تووشی ئەو بارە دەروونیەی پێشوو نابێت، لەبەرئەوەی یەك جۆر ئاین و فەلسەفە و داب و نەریتی گشتی هەیە و پەیڕەوی دەکات و تووشی ململانێی هەڵبژاردن و کێ بڕکێ نابێت.

لە لایەکی ترەوە زانایانی ئەم ڕێبازە لەو بڕوایەدان کە هەڵس و کەوتی شەڕخوازانەی هەندێك لە هەرزەکاران بەهۆی گۆڕانکاری جەستەیی و هۆرمۆنات و بۆماوەوە نیە بەڵکو لە ئەنجامی لاسایی کردنەوەی هەڵس و کەوتی شەڕخوازانەی کەسانی چواردەوری و پەروەردەی هەڵەی ناو خێزان و کۆمەڵەوەیە، بەڵام لە هەندێك کۆمەڵگا هەرزەکار تووشی ئەو شەڕخوازی و سەرەڕۆییە نابێت لەبەرئەوەی جۆری پەروەردەکەیان دوورە لە توندوتیژی و کۆمەڵگاکەیان پڕە لە لێبوردن و بەزەیی و خۆشەویستی. ئەوەی زیاتر گرنگی ڕۆشنبیری و کەلتورو شارستانیەتی کۆمەڵگاکانی لەسەر جۆری کەسایەتی و ڕەوشت و باری دەروونی هەرزەکاران دەرخست، زانایانی بواری ئەنپروبۆلۆژیا بوو کە خەریکی توێژینەوەن لەسەر ڕۆڵی ڕۆشنبیری و کەلتوری کۆمەڵگاکان لەسەر کەسایەتی تاکەکانیان و بەراورد کردنی جۆری پەروەردەو ژیانی کۆمەڵگا سەرەتاییەکان بە کۆمەڵگا ئاڵۆزو پێشکەوتووەکان لەوانە زانایان ( مالینوفسکی / بندکت / مارگریت مید ... تاد ).

مارگریت مید یەکێکە لەو زانایانەی کە توێژینەوەی لەسەر دانیشتوانی نیمچە دوورگەی سامۆ ( غینیای تازە ) کردو ماوەیەکی زۆر لەناویاندا ژیاو زانیاری تەواوی دەربارەی ژیان و گوزەران و چۆنیەتی پەروەردەکردنی منداڵ و چوونە ناو قۆناغی هەرزەکاری و پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆکردەوە، دوایی بە کۆمەڵگای ئەمەریکی بەراورد کرد و گەیشتە ئەم ڕاستیانەی لای خوارەوە:-

١- هەرزەکار لە کۆمەڵگای ( سامۆا ) زۆر بە کەمی تووشی نەخۆشی دەروونی و ململانێ و کێشمەکێشی کۆمەڵایەتی دەبێت و گیانی شەڕخوازی و یاخی بوون و گۆشەگیری زۆر کەمترە ئەگەر بەراورد بکرێت بە هەرزەکاری ئەمەریکی.

٢- هۆی سەرەکی ئەو جیاوازیەی نێوان هەرزەکاری سامۆای و ئەمەریکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ژیان لە کۆمەڵگای ( سامۆا ) سادەو ساکارە و ململانێ لە نێوان دایك و باوك و منداڵەکانیان زۆر کەمە و ئەگەر هەشبێت زۆر بە ئاسانی چارەسەر دەکرێت و تووشی

ململانێی بیروباوەڕی جیاجیا نابێت و لە پێناوی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیدا ناچەنگێ و گرفتی هەڵبژاردنی کام بیروباوەڕ و ئایین و پیشەو کاری نیە و زۆر بە کەمی تووشی ترس و دڵەراوکێ و چەوساندنەوەو سووکایەتی پێ کردن دەبێت.

بە پێچەوانەی هەرزەکاریکی ئەمەریکی کە بەردەوام لە ململانێ و بگرەو بەردەدا دەژی و نازانێ بڕوا بەچی بهێنێ و چۆن چارەسەری ئەو هەموو گرفت و پێداویستیە جیاجیاو دژ بەیەکانە بکات، لەبەرئەوە لە قۆناغی هەرزەکاریدا تووشی زۆر گێروگرفت و سەرەڕۆیی دەبێت وەك (هۆل) باسی دەکات. کەواتە بە بڕوای مارگریت مید و هاوەڵەکانی هۆی گێروگرفت و ناخۆشیەکان کۆمەڵە نەك جەستەو گۆڕانکاریەکانی.

## هەرزەکاری دیاردەیەکی دەروونییە

(لیڤن) یەکێکە لە زانایانی ڕێبازی بوار (مجال) و سەربە قوتابخانەی (جەشتالتە) و لەو بڕوایەدایە کە هەرزەکاری دیاردەیەکی دەروونیەو دوو خاسیەتی سەرەکی لە قۆناغەکانی تری جیا دەکاتەوە، کە ئەوانیش بریتین لە :-

١- بەرفراوان بوونی بواری (کۆمەڵایەتی، کاتی، شوێنی، جەستەیی) هەرزەکار، واتە هەرزەکار زیاتر لە منداڵ تێکەڵاوی کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی دەبێت و ڕووبەڕووی کێشەو دیاردەی کۆمەڵایەتی زیاتر دەبێتەوە، هەروەها ئەگەر لە قۆناغی منداڵیدا بە دووری ڕۆژو هەفتەو مانگ بیری کردبێتەوە، ئەوا لە قۆناغی هەرزەکاریدا بیر لە چەند ساڵی تری پاشەڕۆژو داهاتووی دەکاتەوە، واتە بواری کاتی و بیرکردنەوەی بەرفراوانترو زیاتر دەبێت لە لایەکی تریشەوە ئەو ڕووبەرو ناوچەو شوێنانەی کە هەرزەکار مامەڵەیان لەناودا دەکات زۆر بەرفراوانترو زیاترە لەو بوارو شوێنانەی کە منداڵ تیادا دێت و دەچێت، هەروەها لە لایەنی جەستەیی و فسیولۆژیشەوە هەرزەکار زیاتر گەشە دەکات و قاچ و

دەست و ئەندامەكانی تری لەشی درێژترو گەورەترو ئالۆزتر دەبن ئەگەر بەراورد بكرێن بە قۆناغی منداڵی.

٢- تەم و مژاوی و تاریكی ئەو گۆڕانكاریانەی سەرەوە. واتە كاتێك هەرزەكار لە لایەنی جەستەییەوە دەگۆڕێ، گۆڕانكاریەكان زۆر بە خێراو، كوت و پڕن و هەرزەكار لە سەرەتادا ناتوانێت بە ئاسانی خۆی لە تەكیاندا بسازێنێ و شارەزایی و زانیاری تەواوی لە بارەیانەوە نیە كە ئەمەش تووشی ڕاڕایی و گومان و دڵە ڕاوكێ و ترس و بیریكی دەروونی ئالۆزی دەكات.

هەروەها لە لایەنی كۆمەلایەتیشەوە تووشی زۆر گیروگرفت و ململانێی دەروونی و كۆمەلایەتی دەبێت، لەبەرئەوەی ئەمنداڵەكەی جارانەو نەبووە بە كەسێكی گەورە. واتە نە منداڵان بە منداڵی دا دەنێن و نەگەورەكانیش پێشوازی لێدەكەن و بە گەورەی دادەنێن، كەواتە هەرزەكار ناسنامەی تایبەتی خۆی نیەو لە ئاسمانی خەوو خەیاڵدا پەلەقاژێیەتی و نازانێت سەر بە چ گروپ و قۆناغێكە، كە ئەمەش تووشی خەم و خەفەتی دەكات. لە لایەنی كات و بیركردنەوەی پاشەڕۆژەوە، زۆر لە دیاردەو پێش بینیەكان روون و ئاشكرانین لە لای هەرزەكار، بەڵكو وەك ئەو شارە تازەو نامۆیە وایە كە كەسێكی نەشارەزا بۆ یەكەم جار سەردانی دەكات و هیچ شوێنێك نازانێت و كەس ناناسێت و نازانێت بەرەو كوێ بڕوات، باری دەروونی هەرزەكاریش وەك باری دەروونی ئەو كابرا نە شارەزایەیە، چونكە جەستەو بواری كۆمەلایەتی و دەروونی وەك ئەو شارە شاراوەو نادیارە وایە.

سەرەڕای ئەو گۆڕانكاریانەی سەرەوە جیاوازییەكی زۆر لە نێوان جیهان و ڕاوبۆچوونی هەرزەكارو ڕاوبۆچوونی گەورەكانی هەیە و ئەمەش لە قۆناغی هەرزەكاریدا تووشی ململانێی كۆمەلایەتی و بگرەو بەردەی دەكات. بەپێی لێكدانەوەی ئەم تیۆرەی (لیڤین) هەرزەكار بوونەوەرێكی بایۆلۆژی و كۆمەلایەتیشە، لەهەمان كاتدا لایەنی جەستەیی و گۆڕانكاریی كۆمەلایەتیەكانی جیهانی دەرەوە كاریگەریان لەسەر باری دەروونی هەرزەكار

هەیە. هەروەها لیڤین لەو بڕوایە دایە كە گیروگرفتی هەرزەكار لە كۆمەڵگایەكەوە بۆ كۆمەڵگایەكی تر دەگۆڕێ و هەندێك كۆمەڵگا گیروگرفت بۆ هەرزەكار دروست دەكەن بەڵام هەندێكی تر دروستی ناكەن.

كەواتە تیۆری لیڤین گیروگرفتەكانی قۆناغی هەرزەكاری بۆ گۆڕانكاری ( جەستەیی، كۆمەڵایەتی، كاتی و شوێنی ) دەگەڕێنێتەوە. ئەویش لەبەرئەوەیە كە هەرزەكار بە ئاسانی لەگەڵیاندا ڕانایەت و كاتێكی دەوێ تاوەكو شارەزای جەستەی تازەی و سەرجەم گۆڕانكاریەكانی لەشی دەبێت و دەتوانێت كۆنترۆڵی ئەندامەكانی لەشی بكات، بەڵام لەسەردەمی منداڵی ئەو گیروگرفتانەی نەبووە لەبەرئەوەی ژینگەی كۆمەڵایەتی و ئەندامەكانی لەشی و جۆری بیركردنەوەكانی روون و ئاشكرابوون و منداڵ پێیان ئاشنایە بە پێچەوانەی هەرزەكار كە هەموویان نامۆو كوت و پڕو لەناكاون.

## هەرزەكارو گۆڕانكاری جەستەیی

هەرزەكار بەو كەسە دەوترێت كە ماڵئاوایی لە قۆناغی منداڵی دەكات و دەچێتە قۆناغێكی تازەوە كە جیاوازە لە قۆناغی منداڵی و كۆمەڵێك گۆڕانكاری لە گشت لایەنەكانی جەستەیی و كۆمەڵایەتی و ژیری و هەڵچوونیەوە تیایدا روو دەدات ئەوەی شایەنی ئاماژە بۆ كردن بێت ئەوەیە كە ئەم قۆناغە واتە قۆناغی هەرزەكاری لە شوێنیكەوە بۆ شوێنێكی تر كەمێك جیاوازە، منداڵانی ناوچە گەرمەكان پێش منداڵانی ناوچە ساردەكان دەچنە قۆناغی هەرزەكارییەوە منداڵانی لادێ پێش هاوەڵەكانیان كە لە شار دەژین و، كچان پێش كوڕان دەچنە قۆناغی هەرزەكارییەوە، ئەو كەسەی بچێتە قۆناغی هەرزەكارییەوە كۆمەڵێك گۆڕانكاری لە جەستەو سەرو سیمایدا روو دەدات لەوانە (درێژبوونی هەردوو قاچ و دەستەكانی، زیاد بوونی كێشی، گەورە بوونی بارستایی، گڕبوونی دەنگی، دەرچوونی موو لە هەندێك شوێن وەك سمێڵ، ڕیش، بن باڵا و چواردەوری ئەندامی زاوزێ) هەروەها چەند گۆڕانكارییەكی فسیۆلۆژیش هاوشان لە تەك گۆڕانكارییە جەستەییەكاندا روودەدات لە هەموویان گرنگتر بینوێژی (سووڕی مانگانە) لای كچ و شەیتانی بوون لای كوڕە.

ئەم گۆڕانكارییانەی سەرەوە لای هەموو هەرزەكارێك روودەدات، بەلام شوێنەوارە دەروونیەكەی دەگۆڕێت و جیاواز دەبێت لە هەرزەكارێكەوە بۆ هەرزەكارێكی تر، زۆر جار لە ئەنجامی نەزانی و كەمتەرخەمی دایك و باوك یان مامۆستاو كەسانی تری چواردەوری هەرزەكار لەگەڵ ئەم گۆڕانكارییە جەستەییانەی لای خوارەوە، كۆمەڵێك خەم و خەفەت و ترس و دڵەراوكێ و گرژی سەرو دڵی هەرزەكار دەگرێت :-

### ١- درێژبوونی هەردوو دەست و قاچ :-

هەرزەكار هەردوو دەست و قاچی درێژ دەبێت و لە ناكاوی و خێرایی و كوت و پڕییەكەی ترس و دڵەراوكێ لە دڵ و دەروونی هەرزەكاردا دەچێنێ، چونكە هەرزەكار

بەئاسانی لەسەرەتای هەرزەکاریدا ناتوانێت خۆی لەتەك ئەو گۆڕانکارییە کوت و پڕییەدا بسازێنێ و دەبینێت پانتۆڵ و کراس و چاکەتەکانی پێش ماوەیەکی کورتی قۆناغی هەرزەکاری بەکەڵکی نایەت و پێڵاوەکانی تەسك بۆتەوەو ئازاری پێیەکانی دەدات، جووڵەی وەك جاران رێك و پێك نیەو ناتوانێت زۆر کارو فەرمانی وردەکاری وەك سینی هەڵگرتن و پیاڵەگرتن و سەرکەوتن بەسەر قادرمەو بەربەستەکاندا وەك منداڵی بە ئاکام بگەیەنێت، چونکە گۆڕانکارییە جەستەییەکەی قۆناغی هەرزەکاری زۆر خێرایە و بە ئاسانی هەرزەکار ناتوانێت خۆی لەتەکیدا بسازێنێ لەلایەك و گەشەکردنی لایەنی ژێری و خەمڵاندن و جووڵە دەمارەکان لە لایەکی ترەوە کەمێك دوادەکەوێت و لە ئەنجامدا هەرزەکار تووشی بارێکی دەروونی ئاڵۆز دەبێت.

**٢- لووت:-**

کەپووی هەرزەکار پێش بەشەکانی تری دەم و چاوی گەشەدەکات و نزیك دەبێتەوە لە شێوەی لووتی گەورە، بەڵام بەشەکانی تری دەم و چاوی درەنگتر شێوەیان دەگۆڕدرێت، ئیتر تا ئەو کاتەی هەموو بەشەکانی تری دەم و چاوی گەشە دەکات، هەرزەکار بەردەوام خەریکی دەم و چاویەتی و بیر لە لووت و ناڕێکی دەم و چاوی دەکاتەوەو ترس و دڵە ڕاوکێ و خەفەت لە ئەنجامی ئەزانیەوە دایدەگرێت، بەڵام ئەگەر کەسانی چواردەوری بۆیان روون کردەوە کە لووت یەکەم جار گەورە دەبێت و دوای ئەوەش بەشەکانی تری دەم و چاو، ئەوا ئەو کاتە هەرزەکار تووشی ترس و خەم و خەفەت و ئازار نابێت.

**٣- زیپکە:-**

لە ئەنجامی کۆبوونەوەی پیسی و پیشەرۆ لە ژێر پێستی هەرزەکار زیپکەو عازەبانە دەم و چاوی هەندێك لە هەرزەکارەکان دەگرێتەوەو دەبێتە مایەی دڵەراوکێ و گرژی و خەم و خەفەتی هەرزەکار، چونکە لە قۆناغی هەرزەکاری چالاکی و جووڵەو فەرمانەکانی

هەرزەكار زیاد دەبێت و چەوری و عارەق و پاشەڕۆ زیاد دەكات بەڵام لە سەرەتای هەرزەكاری ئەو جۆگەلەو ڕیچكانەی ژێر پێست كە لەش ڕزگار دەكات لە پاشەڕۆ، فراوان و گەورە نابێت و دەبێتە هۆی خڕبوونەوەو تۆپەڵ بوونی ئەو پیسی و پاشەڕۆیانە لە ژێر پێست و دروست بوونی زیپكە و عازەبانە، ئیتر ئەم دیاردەیە دەبێتە مایەی ترس و خەم و خەفەت و دڵە ڕاوكێ ی هەرزەكارو بیركردنەوەو خۆخەریك كردن پێیەوەو خوراندن و برینداركردنی و بیركردنەوە لەبەكارهێنانی داوو دەرمان و شێوەكانی خۆ جوان كردن.

زۆر جاریش مامەڵەی هەڵەی كەسانی چوار دەوری هەرزەكار قووڕەكە زیاتر خەست دەكەنەوە، ئەویش لە ڕێگەی تیروتوانج تێ گرتن و گاڵتە پێكردنی هەرزەكار، هەروەها قۆناغی هەرزەكاری قۆناغی ناسنامەو خۆناسین و هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانە، لەبەرئەوە لایەنی جەستەیی و جوانی و ڕێك و پێكی لەش و لارو ساف و لووسی دەم و چاو گرنگیەكی زۆری هەیە لەبواری دەروونی هەرزەكاردا، لەبەرئەوە زۆر پێویستە ڕێنمایی و ئامۆژگاری هەرزەكار بكرێت بۆ زوو زوو شتنی دەم و چاو بە ئاوی شلەتێن و دەم و چاو دانە بەردەم تیشكی ڕۆژ و كەم كردنەوەی خواردنی چەوری و شیرنەمەنی و یاری نەكردن و نەخوراندن و برینداركردنی دەم و چاوو خۆ خەریك نەكردن پێیەوە.

## ٤- زیاد بوونی فەرمانەكانی دڵ:-

لە ئەنجامی زیاد بوونی چالاكی و كارو فەرمانەكانی هەرزەكارو ئەو گۆڕانكارییە جەستەییانە ئەوا ئەرك و فەرمانەكانی دڵیش زیاد دەكات، بەڵام كێش و تواناو بارستایی دڵ لەسەرەتای هەرزەكاری هەروەك سەردەمی منداڵیەو وورده وورده دەگۆڕێت، بەڵام تا ئەو كاتەی گەورە دەبێت و دەتوانێت كارو فەرمانەكانی قۆناغی هەرزەكاری بە ئەنجام بگەیەنێت كەمێك ماندوو دەبێت و هەرزەكار هەست بە كەمێك ئازاری دڵ دەكات و هەندێك جار لە دەروونی خۆیدا گەورەی دەكات و وا دەزانێت تووشی نەخۆشی دڵ بووە، دوورنیە هەندێك جار سەردانی پزیشكیش بكات (الالوسی، ١٩٨٣، ص٢٤٨).

**٥- گۆڕانكاری فسیۆلۆژی:-**

چەند گۆڕانكاریەكی فسیۆلۆژی لە قۆناغی هەرزەكاریدا روودەدات كە شوێنەواری دەروونی لەلای هەرزەكار بەجێ دەهێلێت، لەوانە دیاردەی بێ نوێژی بوونی كچ و شەیتانی بوونی كوڕە. ئەمانە دوو دیاردەی فسیۆلۆژی ئاساییـن و لەلای هەموو هەرزەكارێك روو دەدات و بەڵگەو هێمایە بۆ قۆناغی هەرزەكاری و كامڵی و ماڵئاوایی كردن لە قۆناغی منداڵی و پێویستە هەرزەكار شانازی پێوە بكات و شاگەشكەو شادو كامەران بێت، بەڵام بەداخەوە زۆر جار لە ئەنجامی نەزانی و كەمی شارەزایی دەربارەی ئەو دیاردانە هەرزەكار تووشی ترس و دڵە راوكێ و خەم و خەفەت و ئازار دەبێت.

كچ وا هەست دەكات تووشی نەخۆشی بووەو نازانێت ئەو دیاردەیە هەتاوەكوو كەی بەردەوام دەبێت و دەیەها پرسیاری بێ وەڵام لە مێشكیدا دێت و دەچێت نە دایك وەڵامی زۆر پرسیاری دەداتەوەو نە مامۆستاش، (ئیتر لە ئەنجامی نەشارەزاییانەوە بێت یان لە ئەنجامی شەرم و عەیبەوە). ئیتر ئەم كچە هەرزەكارە لەبیریكی دەروونی ئاڵۆزدا دەژی و لەسەرەتای هەرزەكاریدا دوور نیە هەوڵ بدات لە هەندێك سەرچاوەی تری وەك دەستە خووشكەكانی یان گۆڤارو فیلم و رۆژنامەكانەوە وەڵامەكانی دەست بكەوێت، بەڵام كێ دەڵێت ئەو سەرچاوانە بەراستی و بە ئەمەناتەوە زانیاری دەدەن بەو كیژۆڵەو وەڵامی پرسیارەكانی دەست دەكەوێت؟ دوورنیە بە هەڵە لەو دیاردەیە بگات و تووشی لادان و كۆمەڵێك گرفتی دەروونی ببێت، لەبەرئەوە زۆر پێویستە دایك و خووشكی گەورەو مامۆستای ئافرەت لە قۆناغی هەرزەكاری زانیاری و شارەزایی خۆیان بدەن بە كچە هەرزەكارەكان و بۆیان روون بكەنەوە كە ئەو دیاردەیە دیاردەیەكی فسیۆلۆژی ئاساییەو هیچ نەخۆشیەك نیەو پێویست بە ترس و دڵە راوكێ ناكات و لەلای هەموو كچێكیش هەیە، هەروەها كوڕیش لە ئەنجامی دیاردەی شەیتانی بوون و روودانی بۆ یەكەم جار تووشی ترس و خەم و خەفەت و دڵە راوكێ دەبێت (مسن، ١٩٨٦، ص٤٥٢) زۆرجاریش هەست بەگوناهو تاوان دەكات و ویژدانی ئازاری دەدات، بەڵام ئەگەر روون كرایەوە كە ئەم

دیاردەیە ئاساییەو هیچ پێویستی بە ترس و گوناهو خەم و خەفەت نیەو بەڵگەیە بۆ قۆناغی هەرزەکاری، ئەوا ئەو کاتە ئازارو خەم و خەفەتەکێنی کەم دەبێتەوە.

٦- زیادبوونی چالاکی عەرەقە گلاند:-

لە قۆناغی هەرزەکاریدا عەرەقە گلاند چالاکی زیاد دەبێت و دەست و دەم و چاوی هەرزەکار زیاتر لە قۆناغی منداڵی عارەق دەکاتەوەو ئاو لە پی دەستەکانی زوو زوو تەڕ دەبێت و دوور نیە تووشی خەم و خەفەتی بکات و هۆکارەکانی نەزانێت و دەفتەرو پەڕاوەکانی لەکاتی نووسیندا پیس بکات و ئینجا ئەگەر مامۆستاش گاڵتەی پێ کردو یان لەسەر پیس کردنی دەفتەرو پەڕاوەکانی سەرزەنشت و سزای دا ئەوا ئەو بارە هەڵچوونیەش ئەوەندەی تر عارەقەی زیاتر دەکات و ئینجا گەرماو وەرزی هاوینیش زیاتری دەکات، لەبەرئەوە پێویستە زانیاری لەو بارەیەوە بدرێت بە هەرزەکار و گاڵتەو سووکایەتی پێ نەکرێت و لەکاتی مامەڵەکردندا رەچاوی ئەو خاڵانە بکرێت، بۆ ئەوەی باری دەروونی هەرزەکار لەوە زیاتر ئاڵۆز نەکرێت و تووشی خەم و خەفەت و ئازار نەبێت.

٧- دواکەوتن یان پێش کەوتن لە چوونە ناو قۆناغی هەرزەکاری:-

لە ئەنجامی جیاوازی تاکایەتی و هەندێك هۆکاری دەرەکی تر، هەندێك هەرزەکار لەکاتی خۆیدا لەگەڵ هاوەڵەکانیان ناچنە ناو قۆناغی هەرزەکارییەوە ئیتر یان پێش هاوڕێکانیان دەکەون یان دوادەکەون، لە هەردوو باردا دوور نیە گرفت بۆ ئەو هەرزەکارانە دروست ببێت لەبەر ئەوەی کاتێك خۆیان بە هاوەڵەکانیان بەراورد دەکەن هەست بە کەمی دەکەن و جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوان و برادەرەکانیان، بەڵام ئەگەر ئەوەیان بۆ روونکرایەوە کە هەندێك کەس درەنگتر یان زووتر لە کەسانی تر دەچنە ناو قۆناغی هەرزەکارییەوەو دیاردەیەکی ئاساییەو هیچ پێویست بە ترس و دڵە راوکێ و خەم خەفەت ناکات، ئەوا ئەوانیش ئازارەکانیان کەم دەبێتەوە.

**٨- دەنگ گڕبوون:-**

کاتێك منداڵ دەچێتە قۆناغی هەرزەكارییەوە، لە ئەنجامی درێژبوون و ئەستووربوونی دەنگە ژێکانیدا و زیادبوونی ( هۆرمۆنی ئەندرۆجین ) دەنگی گڕ دەبێت و وەك دەنگی گەورەی لێدێت، بەڵام ئەوەی شایەنی باسكردن بێت ئەوەیە كە دەنگ گڕبوونەكە بەشێوەیەكی كوت و پڕەو شێوەیەكی ناخۆش و نەشاز وەردەگرێت و هەندێك جار دوو دەنگی جیاواز بەیەك ( گڕو ناسك ) یان ( ناسك و گڕ ) بەدوای یەكدا دێن و هەرزەكار تووشی شەرم و خەم و خەفەت دەكات و زۆر جار وای لێدەكات شەرم بكات و قسە نەكات و بەشداری ناو كۆڕو كۆبوونەوە نەبێت و بەشداری گفت و گۆی ناو پۆل نەكات، ئیتر لەم كاتانەدا نابێت مامۆستا یان دایك و باوك زۆر لە هەرزەكارەكە بكات بۆ بەشدار بوون و قسەكردن، لەوانەیە سوودی نەبێت و گرفت بۆ هەردوو لایان دروست بكات، هەروەها نابێت سووكایەتی بە دەنگ و قسەكردنی بكرێت و دەبێت هان بدرێت و پشتگیری بكرێت و ئەو دیاردانەی سەرەوە لەبەرچاوی ئاسان بكرێت و زانیاری بدرێتێ و رێنمایی بكرێت و خەم و خەفەت و ئازارەكانی كەم بكرێتەوە بۆئەوەی قۆناغی هەرزەكاری بەسەلامەتی ببڕێت.

## گۆڕانکارییە هەڵچوونیەکانی قۆناغی هەرزەکاری

هەڵچوونەکانی هەرزەکار لە زۆر لایەنەوە جیاوازن لە هەڵچوونەکانی منداڵ و کەسانی کامڵ و پێگەیشتوو، لە گرنگترین خاسیەتەکانی هەڵچوونەکانی هەرزەکار و لایەنەکانی ئەمانەی لای خوارەوەن:-

١- هەڵچوونەکانی هەرزەکار لە سەرەتای قۆناغی هەرزەکارییدا زۆر خێراو توندوتیژو بێ سنوورن و هەرزەکار بە بچووکترین شت هەڵدەچێت و وەك فیشەکە شێتە بە ئاسماندا دەچێت، ئەمەش بە پلەی یەکەم بۆ گۆڕانکارییە جەستەییە خێراو کوت و پڕەکانی ئەم قۆناغە دەگەڕێتەوە، کە هەرزەکار ناتوانێت بە ئاسانی خۆی لە تەکیاندا بسازێنێ لە ئەنجامیشدا تووشی هەڵچوونەکانی (ترس، تووڕەبوون، شەرم، دڵە راوکێ، خەم و خەفەت ...... تاد) دەبێت.

٢- کاتێك هەرزەکار تووڕە دەکرێت یان دەوروژێنرێت و تووشی حاڵەتی هەڵچوون دەکرێت ئەوە ناتوانێت کۆنترۆلی دیوی دەرەوەی هەڵچوونەکانی بکات و بە زەقی لەسەرو سیماو دەم و چاوو دەست و قاچیدا رەنگ دەداتەوە، لەبەرئەوە دەبینین (هاواردەکات، شت دەشکێنێ و فڕێی دەدات، شەق دەهاوێت، گازدەگرێت، دەست دەوەشێنێت، دەگری) هەروەها هەمان شێوەش لە کاتی دڵخۆشیدا روودەدات و هەرزەکار نازانێت چۆن گوزارشت لە هەڵچوونەکان و دڵخۆشیەکەی بکات و دەبینین بە هەردوو دەست و قاچ و سەرو شان و مل ئاماژە بۆ ئەو حاڵەتەی دەکات و بە ئاسانی ئەو خۆشی و کامەرانییە لەسەرو سیمایدا دەخوێندرێتەوە.

ئینجا پێویستە دایك و باوك و مامۆستا ئاگاداری ئەو حاڵەتانە بن و بەشێوەیەکی پەروەردەییانە مامەڵەی لەگەڵ بکەن و هۆکارو پاڵنەرەکانی هەڵچوونەکانی هەرزەکار بە باشی دیاری بکەن، بۆئەوەی ئەکەونە هەڵەوە، چونکە هەڵچوونەکانی هەرزەکار لە

سەرەتای گەشەکردندان و هێشتا بە تەواوی پێنەگەیشتوون، کەواتە دەبێت بەپێی ئەو گۆڕانکاری و خاسیەتانەی قۆناغەکەی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.

٣- هەندێك لە هەرزەکاران لە ئەنجامی زوڵم و ستەم و ناهەقی کەسانی چواردەوریان و نەزانیان دەربارەی گۆڕانکاریەکانی قۆناغی هەرزەکاری، تووشی دڵتەنگی و بێزاری و خەم و خەفەت و ئازاری دەروونی دەبن، کە ئەمەش ئەگەر لەکاتی خۆیدا چارەسەر نەکرێت، دوورنییە کە زەرەرو زیانی گەورە بە باری دەروونی و دروستی دەروونی (الصحة النفسية) هەرزەکار بگەیەنێ، کە بە داخەوە هەندێك جار ململانێی نێوان هەرزەکار و دایك و باوك و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی دواکەوتوو دەبێتە هۆی خوڵقاندنی بیرکردنەوە دەربارەی خۆکوشتن و راکردن لە خێزان و قوتابخانەو دەست درێژی کردنە سەر کەسانی تر.

٤- لەم قۆناغەدا هەندێك سۆزو عاتیفەی کەسی و خودی (شخصي وذاتي) سەرهەڵدەدات و لە رێگەی گرنگی دان بە جل و بەرگ و رواڵەت و شێوەی قسەکردن و نان خواردن، گوزارشتی لێدەکرێت، چونکە هەرزەکار ئەو هەستەی لەلا دروست دەبێت کە منداڵەکەی جاران نەماوەو ئێستا گەورە بووەو مافی قسەکردن و رادەربڕینی هەیە. لەبەرئەوە ئەرکی دایك و باوك و مامۆستایە کە رێزی ئەو هەستەی هەرزەکار بگرن و ژینگەی لەبارو دروست لەناو خێزان و قوتابخانە بۆ گەشە پێکردنی بخوڵقێنن، بۆ ئەوەی هەرزەکار ببێت بە کەسێکی بەسوودو خاوەن ناسنامەی سەربەخۆ بۆ کۆمەڵەکەی.

٥- هەروەها لەناوەراست و دواساڵەکانی قۆناغی هەرزەکاری، دیاردەی گرنگیدان بە سروشت و سۆزو عاتیفە بەرانبەر شتە جوانەکان لە لای هەرزەکار سەرهەڵدەدات، کە ئەمەش پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەوەی گرنگی بە سروشت و هونەرە جوانەکانی بدات و خولیای خوێندنەوەی چیرۆك و هۆنراوەو رۆمانە رۆمانسی و عاتیفیەکان ببێت.

لێرەدا ئەركی خێزان و قوتابخانەیە كە لە ڕێگەی هەندێك چالاكی خێزانی و قوتابخانەوەو لە میانەی هەندێك لەوێنەو چالاكیە دەرەكیەكانی قوتابخانەوە، ئەو حەزوو ئارەزووانەی هەرزەكار تێربكرێت و ژینگەی گونجاو بۆ گەشەكردنیان بخولقێندرێ، بۆئەوەی سوود لە بەهرەو تواناكانی هەرزەكاران و لاوان وەربگیرێت و لە لاساری و سەرەڕۆیش دوور بخرێنەوە.

٦- هەندێك جار هەڵچوونەكانی هەرزەكار لەگەڵ وروژێنەرەكانیان (المثیرات) ناگونجێت، واتە رەخنەو گلەیی و گازاندەیەكی بچووك، دوورنییە هەرزەكار تووشی توڕەبوون و هەڵچوونێكی زۆر بكات، یان نوكتەو قسەیەكی خۆشی ئاسایی لەوانەیە هەرزەكار تووشی دڵخۆشی و كامەرانیەكی زۆر بكات، سەرەڕای ئەوەش گرفت و ناخۆشیەكی خێزانی ئاسایی هەرزەكار تووشی خەم و خەفەت و دڵتەنگیەكی زۆر دەكات، بە كوردیەكەی خۆمان (لە دەنكە نۆكێك كفتەیەك) دروست دەكات، واتە زۆر جار شتەكان گەورە دەكات و زیاد لە پێویست گرنگیان پێ دەدات، كە ئەمەش باری دەروونیەكەی بۆ ماوەیەك ئاڵۆز دەكات، ئەمەش بە پلەی یەكەم بۆ كەم شارەزایی و پێنەگەیشتنی هەڵچوونەكانی دەگەڕێتەوە، لەبەرئەوە پێویستە ئێمەی گەورە ئەو راستیە بزانین و لەكاتی مامەڵەكردنمان لەگەڵ هەرزەكار رەچاوی ئەو خاڵەش بكەین، بۆ ئەوەی نەكەوینە هەڵەوەو گرفت بۆ خۆمان و هەرزەكاریش دروست نەكەین.

٧- هەروەها دیاردەی گۆڕینی هەڵچوونەكان و ڕاڕایی (التذبذب الأنفعالي) زۆر بە زەقی لە قۆناغی هەرزەكاری هەستی پێ دەكرێت، بۆ نموونە هەندێك جار هەرزەكار زۆر خواپەرست و باوەڕدارە بەڵام دوورنیە دوای ماوەیەك پێچەوانەكەی بكات و پاش ماوەیەكی تریش بگەڕێتەوە بۆ خواپەرستیەكەی، یان هەندێك جار كۆمەڵایەتیەو حەز بە تێكەڵاوبوون و هاوڕێیەتی كەسانی چواردەوری دەكات، بەڵام دوورنیە دوای ماوەیەك حەز بە تەنیایی و گۆشەگیری و دوورە پەرێزی بكات، یان هەندێك جار زۆر ئازاو بە جەرگ دەردەكەوێ بەڵام هەندێك جاریش پێچەوانەكەی.واتە هەرزەكار لە بیریكی دەروونی

رارابیندایە و بەردەوام خەریکی تاووتوێ کردنی دیاردەکانەو لە هەوڵی هەڵبژاردنی ناسنامەو ئایدۆلۆژیاو جیهانی تایبەتی خۆیدایە، ئینجا لەبەرئەوەی زانیاری و شارەزایی کەمە، بۆیە تووشی ئەو حاڵەتە دەبێت.

کەواتە ئەرکی ئێمەی گەورە ئەوەیە کە زانیاری و شارەزایی و رێنمایی پێویست بدەین بە هەرزەکار بۆ ئەوەی لەسەر بیرکردنەوەو هەڵس و کەوتی راست و زانستی بەردەوام ببێت و لە خراپەکان دووربکەوێتەوە.

٨- هەروەها گۆڕانکارییە فسیۆلۆژیەکان و سەرهەڵدانی حەزوو ئارەزووی سێکسی و گەشەکردن و دەرکەوتنی سێکسە گلاندەکان تارادەیەك هەرزەکار تووشی ترس و شەرم و هەست کردن بە گوناه دەکەن، هەروەها دیاردەی رارایی و بڕوا بە خۆنەبوونیش دەربارەی گۆڕانکاریەکانی بە ئاشکرا لەم قۆناغەدا هەستی پێ دەکرێت.

٩- یەکێك لە زەقترین و دیارترین دیاردە هەڵچوونیەکانی قۆناغی هەرزەکاری دیاردەی زیندەخەونە (حلم اليقظة)، هەرزەکار لە رێگەی ئەم زیندە خەونەوە زۆر لە خەوو خەیاڵ و حەزوو ئارەزووە تێرنەکراوەکانی خۆی تێردەکات. هەرزەکار کۆشکی خەیاڵی و سەیرو سەمەرە دروست دەکات و ئەوەی خۆی حەزی لێدەکات لە رێگەی خەیاڵ و داڵغە لێدانەوە تێری دەکات. زیندەخەون راکردنە لە واقیع و ژیانە لە خەوو خەیاڵ. لە راستیدا زیندەخەون وەك میکانیزم و چەکێکی دەروونی تارادەیەکی باش بۆ هەرزەکار بەسوودەو هەرزەکار نییە ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت پەنا بۆ زیندەخەون نەبات. بەڵام کاتێك رێژەی زیندە خەون زۆر دەبێت و هەرزەکار بە بەردەوامی رادەکات و پەنا بۆ زیندەخەون و داڵغە لێدان دەبات، ئا لەم کاتانەدا ترسناکەو مەترسی لەسەر باری دەروونی هەرزەکار دەبێت و تووشی نامۆبوون و پچڕانی کۆمەڵایەتی دەکات. لەبەرئەوە پێویستە ئالەم حاڵەتەدا دایك و باوك و مامۆستا بەدوای چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ئەو جۆرە هەرزەکارەدا بگەڕێن، بۆ ئەوەی لە رێگەی زانینی هۆکارەکان و رێنمایی پێویستەوە

هەرزەکار بۆ جیهانی واقیعی بگەڕێنرێتەوە، چونکە بەردەوام بوونی ئەو حاڵەتە هەرزەکار تووشی زۆر گیروگرفتی پەروەردەیی و دەروونی و کۆمەڵایەتی دەکات.

١٠- هەرزەکاریش وەك منداڵ و کەسانی تر خەون دەبینێ، بەڵام جۆری خەونەکانی هەرزەکار لە زۆر لایەنەوە لە خەونەکانی کەسانی تر جیاوازن چونکە ناوەڕۆکی خەونەکانی هەرزەکار پەیوەستە بە جیهان و خەوو خەیاڵ و گیروگرفت و حەزوو ئارەزووەکانی قۆناغی هەرزەکاری، لەوانە (سێکس، خوێندن و قوتابخانە، کارکردن، هاوسەری ژیان، پاشەڕۆژ ... تاد)، سەرەڕای ئەوەش بێجگە لە شتە هەست پێکراوەکانی قۆناغی منداڵی زۆر دیاردەی رووت و هەست پێ نەکراوو مەعنەوی (المجرد) دێتە بواری دەروونی هەرزەکارەوە لە خەون و خەیاڵیدا رەنگ دەدەنەوە، هەرزەکار خۆی پاڵەوان و نووسەرو ئەکتەرو دەرهێنەری خەونەکانیەتی و رەگ و ریشەی لە رابردووەوە رەنگ دانەوەی واقیعی ئێستاو هەوڵدانە بۆ تێرکردنی حەزوو ئارەزووەکانی داهاتووی.

١١- خۆشەویستی یەکێکی ترە لە گرنگترین هەڵچوونەکانی هەرزەکار، هەرزەکار بەردەوام بە دوای خۆشەویستی کەسانی تردا دەگەڕێ و دەیەوێ خۆشەویست بێت و رێزی بگیرێ و پلەو پایەی لەناو خێزان و قوتابخانەو کۆمەڵەکەیدا هەبێت. گومانی تێدا نیە کە تێرکردنی پێداویستی خۆشەویستی هەرزەکار بەردی بناغەی دروستی دەروونیەتی (الصحة النفسية)، واتە کاتێك هەرزەکار هەست بە خۆشەویستی دایك و باوك و مامۆستاو خوشك و براو هاوڕێکانی دەکات، ئەوە مانای ئەوەیە کە خاوەنی دروستی دەروونی خۆیەتی و بڕوای بە خۆیەتی و دەتوانێت بە ئاسانی خۆی لەتەك کۆمەڵەکەی بسازێنێ. بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر هەرزەکار ئەو هەستەی لەلا دروست بوو کە کەسێکی پشت گوێ خراوە لە سۆزو خۆشەویستی و رێزی کەسانی چواردەوری بێ بەشەو هیچ پلەو پایەیەکی کۆمەڵایەتی نییە، ئا لەو کاتەدا تووشی زۆر گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەبێت و بەچاوی رق و کینە دەڕوانێتە کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی، بەردەوام بوونی ئەو حاڵەتەش هەرزەکار بەرەو سەرەڕۆیی و لاساری دەبات.

دەرئەنجامی توێژینەوەکانیش ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی لاساری هەرزەکاران و مێرد منداڵان، بێ بەش بوونە لە سۆزو خۆشەویستی دایك و باوك و مامۆستاو کەسانی چواردەور.

خۆشەویستی هەرزەکاریش پەیوەستە بە زۆر سەرچاوەو بابەت، لەوانە خۆشەویستی (دایك و باوك، مامۆستا، نیشتمان، خێرو چاکە، تووخمەکەی تر، ...... تاد).کەواتە ئەرکی سەرەکی خێزان و قوتابخانە ئەوەیە کە ژینگەیەکی پڕ لە سۆزو خۆشەویستی بۆ هەرزەکاران دابین بکەن، بۆ ئەوەی هەرزەکار بەشێوەی گونجاو گەشە بکات و دووربێت لە سەرەڕۆیی و لادان و گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی.

١٢- دیاردەی تووڕە بوون و یاخی بوونیش یەکێکی ترە لە دیاردە هەڵچوونیەکانی قۆناغی هەرزەکاری. یاخی بوون لە دەسەڵاتی خێزان و قوتابخانە و کۆمەڵ، واتە کاتێك کۆسپ و تەگەرەو بەربەست لەبەردەم پێداویستی و حەزوو ئارەزووەکانی هەرزەکاردا دادەنرێت، ئەو کاتە هەرزەکار زۆر بە توندی هەڵدەچێت و هەوڵی پەلاماردانەوەی دەسەلات دەداتەوە. چونکە هەرزەکار دەیەوێت ناسنامەی خۆی هەبێت و سەربەخۆیی خۆی وەربگرێت، بەڵام کاتێك گەورەکانی وەك منداڵ مامەڵەی لەگەڵ دەکەن و ڕێگەی قسەکردن و رادەربڕینی پێ نادەن، ئا لەم کاتانەدا زۆر لە هەرزەکاران رێگای یاخی بوون و تووڕەبوون و پەلاماردان دەگرنەبەر، لەبەرئەوەی هەست بە زوڵم و ستەم و ناهەقی چواردەور دەکەن.

ئینجا بۆ ئەوەی هەرزەکار ئەگاتە ئەو حاڵەتە، زۆر پێویستە ئێمەی گەورە رێزی بگرین و بواری رادەربڕین و ئازادی هەڵبژاردنی هاوسەری ژیان و هاوڕێ و پیشەو جۆری خوێندن و بیرکردنەوەی بۆ برەخسێنین، بەڵام هەرچ کاتێك هەستمان کرد خەریکە لە رێگەی راست لادەدات و هەڵە دەکات، ئەو کاتە بۆمان هەیە ئامۆژگاری و رێنمایی پێویستی بکەین.

١٢- ترسیش یەکێکی ترە لە هەڵچوونەکانی هەرزەکار و لە زۆر لایەنەوە جیاوازی هەیە لەگەڵ ترسی منداڵ، چونکە منداڵ بە زۆری لە شتە هەست پێکراوەکانی چواردەوری دەترسێ بەلام هەرزەکار بەزۆری لەشتە کۆمەلایەتی و مەعنەویەکان دەترسێ، لەوانە ترسان لە (دەرنەچوون، لە دەست دانی پلەو پایەی کۆمەلایەتی، تووش بوون بە نەخۆشی، مردن، ناژاوە تێکچوونی شیرازەی خێزان، ئیفلاسی و گەندەڵی و ریسوایی کۆمەلایەتی، کاری ئەخلاقی و کەوتنە ناو چلپاوی بەد رەوشتی ....... تاد).

لەبەر ئەوە زۆر پێویستە ئێمەی گەورە ئاگاداری ترس و دوودڵیەکانی هەرزەکارین و بە دوای هۆکارەکان و رێگا چارەی گونجاودا بگەڕێین، سەرەڕای ئەوەش ژینگەی پڕ لە ئارامی و دڵنیاییان لە خێزان و قوتابخانە بۆ دابین بکەین بۆ ئەوەی لە ئازارو زیانەکانی ترس دووربن.

هۆکارەکانی هەڵچوونەکانی هەرزەکار:-

هەڵچوونەکانی هەرزەکار پەیوەستە بە کۆمەڵێک هۆکارەوە دەبنە هۆی هەڵچوونەکانی هەرزەکار، بەلام ئەم خالانەی خوارەوە بە گرنگترین هۆکارەکانی هەڵچوون دادەنرێن:-

(١) نەبوون و کەمی توانای خۆ گونجاندن لەگەڵ ژینگەدا:-

هەرزەکار لەو بڕوایەدایە کە گەورە بووەو منداڵەکەی جاران نییەو پێویستە رێزی بگیرێ، بەلام بەداخەوە زۆر لە دایکان و باوکان و مامۆستایان هەر بە چاوی منداڵی سەیری هەرزەکار دەکەن و راستەوخۆ دەست دەخەنە ناو هەموو کاروبارێکی هەرزەکارەوە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی بریندارکردنی هەستی هەرزەکارو بە دەست تێوەردانی لە قەڵەم دەدات و نا رەزایی دەربارەیان دەردەبڕێ، دواتریش دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەرزەکار تووشی زۆر حاڵەتی هەڵچوونی و ناخۆش ببێت.

## (٢) نەبوونی و دەست کورتی:-

زۆر جار هەژاری و نەبوونی گرفتی زۆر بۆ هەرزەکار دروست دەکات و تووشی خەم و خەفەت و دڵتەنگی و بێزاری دەکات، بە تایبەتی کاتێک دەبینێ هاوەڵەکانی پارە خەرج دەکەن و خەریکی چوونە دەرمومو گەڕانن و جۆرەها جل و بەرگی جوان لەبەردەکەن، بەڵام ئەم ناتوانێت وەك ئەوان بکات، کە ئەمەش وای لێدەکات کە خەفەت بخوات و لە ئەنجامی خۆ بەراوردکردنەوە بە کەسانی تر، هەست بە کەمی بکات، چونکە لە ئەنجامی نەبوونی و هەژارییەوە ناتوانێت زۆر لە حەزوو ئارەزووەکانی تێربکات، سەرەڕای ئەوەش هەرزەکار هەست دەکات کە بووە بە پیاوو دەیەوێت ئەویش ببێت بە خاوەنی ماڵ و خێزانی خۆی بەڵام لە ئەنجامی نەبوونیەوە ناتوانێت هاوسەری ژیانی خۆی هەڵبژێرێ و رەمەکی (غریزە)ی سێکسی تێر بکات، ئەمەش تووشی کۆمەڵێک گێروگرفت و حاڵەتی هەڵچوونی دەکات.

## (٣) دواکەوتنی گەشەکردنی عەقلی:-

یەکێك لە گەورەترین گێروگرفتەکانی هەرزەکار ئەوەیە کە هەموو لایەنەکانی کەسایەتی بەیەکەوە گەشە ناکەن، بۆ نموونە گەشەکردنی جەستەیی زۆر خێرایەو پێش گەشەکردنی عەقلی دەکەوێ، واتە جەستەو لەش و لارێکی گەورە بەڵام عەقڵ و لێك دانەوەیەکی بچووك، کە ئەم حاڵەتەش (تا بەتەواوی لە لایەنی عەقلیەوە گەشە دەکات)، زۆر گێروگرفتی هەڵچوونی بۆ دروست دەکات و بە زەحمەت لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە جەستەییانە رادێت و کۆنترۆڵیان دەکات، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە زۆر هەڵس و کەوتی منداڵانە بکات و بکەوێتە بەردەم رەخنەو گلەیی و بێزاری گەورەکان.

## (٤) ململانێ لەگەڵ گەورەکان:-

بەداخەوە زۆر جار گەورەکان هۆکاری سەرەکین بۆ تورەبوون و بێزارکردنی هەرزەکار، لەبەرئەوەی بە دوو جۆر شێواز مامەڵە لەگەڵ هەرزەکار دەکەن، بۆ نموونە کاتێك نیشیان

پێی دەبێت، وەك گەورە مامەڵەی لەگەڵ دەکەن و داوای کاری گەورەی لێ دەکەن و پێی دەڵێن تۆ پیاوی و گەورە بوویت و دەبێت ئەو ئیشە بکەیت، بەڵام کاتێك هەرزەکار داوای سەربەستی و سەربەخۆیی و ئازادی خۆی دەکات، پێی دەڵێن تۆ چی، تۆ سەلکی سیری تۆ قنچکی پیازی؟ تۆ بۆنی شیری خاو لە دەمت دێت، تۆ چیت تا راو بۆچوونت هەبێت؟ واتە لەم کاتانەدا بە منداڵی دادەنێن، ئەمەش دەبێتە هۆی بێزاربوون و وەڕس بوونی هەرزەکار. سەرەڕای ئەوەش جیاوازیەکی زۆر لەنێوان بیرکردنەوەو راوبۆچوونی هەرزەکارو گەورەکاندا هەیەو بە زەحمەت لێك حاڵی دەبن، ئەمەش خۆی لە خۆیدا کۆمەڵێك گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی بۆ هەرزەکار و کەسانی چواردەوری دروست دەکات.

ئینجا بۆ ئەوەی هەرزەکار بەشێوەیەکی باش پەروەردە بکرێت، پێویستە ئێمەی گەورە رەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین:-

١- لە هەموو شتێکدا (گەورەو بچووك) دەست نەخەینە ناو کاروباری تایبەتی هەرزەکارەوە بەڵکو دەبێت جۆرە سەربەستی و ئازادیەك بە هەرزەکار بدەین.

٢- پێویستە شارەزای باری دەروونی و ئەندێشەکانی ببین و هەوڵی چارەسەرکردنی گیرو گرفتەکانی بدەین.

٣-نابێت بە دوو شێواز مامەڵەی لەگەڵ بکەین، بەڵکو دەبێت بە چاوی گەورەو رێزەوە سەیری هەرزەکار بکرێت و لە نرخی کەم نەکرێتەوە.

٤- پێویستە لە جیاتی ئامۆژگاری و رێنمایی راستەوخۆ، پەنا بۆ گفت وگۆ کردن و لێك حاڵی بوون بەرین و بە عەقڵێکی کراوەو دڵێکی گەورەی پڕ بەزەیی و سۆزو خۆشەویستیەوە گوێ لە داواکاری و خەوو خەیاڵەکانی هەرزەکار بگرین.

٥- پارمەتی هەرزەکار بدەین بۆ ئەوەی لە راڕایی و دوو دڵی هەڵچوونی (التناقض الانفعالي) رزگاری بێت و بڕوای بە خۆی هەبێت و لە نقووم بوون لە جیهانی خەون و خەیاڵ و زیندەخەون دووربکەوێتەوە.

٦- ژینگەی پڕ لە ئاسایش و دڵنیایی و رێزگرتن بۆ هەرزەکار بخولقێنین، بۆئەوەی سەربەخۆیی و ناسنامەی خۆی دەست بکەوێت و بگاتە پێگەیشتن و کاملی هەڵچوونی.

٧-قۆستنەوەی بۆشایی کاتی (وقت فراغ) هەرزەکار و خەریك کردنی بە کارو چالاکیەکی سوود بەخشەوە، بۆ ئەوەی هەست بە بوونی خۆی بکات و ورده ورده بڕوای بە خۆی هەبێت.

## شلەژان و گرفتە دەروونیەكانی قۆناغی هەرزەكاری

بە زۆری شلەژان و گرفت و كێشە دەروونیەكان لەو قۆناغ سەردەمانەدا روودەدەن كە گۆڕانكارییەكان خێراو كوت و پڕ و لەناكاون. یەكێك لەو قۆناغانەش كە گەشەكردن و گۆڕانكاری تیایدا خێرا و كوت و پڕو لەناكاوە، قۆناغی هەرزەكارییە. لەسەرەتای هەرزەكاریدا هەرزەكار رووبەرووی زۆر داواكاری كۆمەلایەتی دەبێتەوەو لەهەمان كاتیشدا گۆڕانكارییە جەستەییەكانی فشارێكی زۆری دەخەنە سەر، هەر لەبەر ئەوەشە لەكاتی بالق بووندا تووشی ژمارەیەك گیروگرفت دەبێت و هەندێك جاریش هاوسەنگی خۆی لەدەست دەدات، هەرچەندە ئەو كێشەو گیروگرفت و گۆڕانكارییانەی قۆناغی هەرزەكاری بەو مەترسیدار نین و هەرزەكار تووشی لادان و سەرەڕۆیی ناكەن، بەلام دەبنە هۆی زیادكردنی گریمان و ئەگەری تووش بوون بە كۆمەڵێك كێشەو گرفتی دەروونی، لەلای ئەو هەرزەكارانەی كە پێشتر بەهۆی بارودۆخی نالەبارو پەروەردەی هەڵەوە، ئامادەباشی لادان و سەرەڕۆییان لە لادروست بووە. **هەر لەبەر ئەوەشە لە قۆناغی هەرزەكاری هەندێك شلەژان و گرفتی دەروونی لەلای هەندێك لەو جۆرە هەرزەكارانە سەر هەڵدەدەن، لەوانەش:-**

### دڵەڕاوكێ (قلق):-

لە قۆناغی هەرزەكاریدا دڵەڕاوكێ و ڕاڕایی سەرو دڵی هەندێك لە هەرزەكارەكان دەگرێت، بەبێ ئەوەی خۆشی بە تەواوی سەرچاوەو هۆكارەكانی ئەو دڵە ڕاوكێ و ڕاڕاییەی بزانێ، لەبەرئەوەی سەرچاوەی زۆربەیان بۆ قۆناغی منداڵی و كێشەو گیروگرفتەكانی ئەو كاتە دەگەڕێتەوە لەوانە ( بێبەش بوون لە سۆزو خۆشەویستی دایك و باوك و كەسانی نزیك، پەیوەندی خراپی نێوان دایك و باوك و منداڵ، كپكردن و خەفەكردنی زۆر لە حەزوو ئارەزووەكان ... هتد ). هەر لەبەر ئەوەشە زۆرجار ئەو جۆرە هەرزەكارانە ناتوانن كێشە و گیروگرفتەكانی خۆیان دەست نیشان و چارەسەر بكەن، چونكە رەگ و ریشەی كێشەو

شلەژانەکانیان لە بواری نەستیاندایە (اللاشعور). زۆر بەشمان دەزانین جیاوازی سەرەکی نێوان ترس و دڵەڕاوکێ ئەوەیە، کە سەرچاوەو هۆکارەکانی زۆربەی ترسەکان دیارو ئاشکران و لە بواری هەستیدان (شعوری)، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری هۆکارو سەرچاوەی دڵەڕاوکێ کان نادیارن و لەبواری نەستیدان.

لەبەر ئەوە زۆر گرنگە ڕێنمایی و ئامۆژگاری ئەو جۆرە هەرزەکارانە بکرێت بۆ ئەوەی سەردانی بنکەو کەسانی تایبەت بە نەخۆشی و کێشە دەروونیەکان بکەن و لە نزیکەوە لە ئەنجامی چەند دانیشتن و چاوپێکەوتنێکەوە چارەسەری گونجاو بۆ دڵەڕاوکێ و کێشەکانی تریان بدۆزرێتەوە. واتە تازوو چارەسەر بکرێت باشترە، بەڵام دواخستن و پشت گوێ خستنی ئەو جۆرە هەرزەکارانە، دەرئەنجامی باشی نابێت و کێشەو دڵەڕاوکێ کان ئاڵۆزتر دەبن.

**خەمۆکی:-**

یەکێکی تر لەوشڵەژان و کێشە دەروونیانەی کە لە قۆناغی هەرزەکاری ڕوویەرووی هەرزەکار دەبنەوە خەمۆکی و دڵتەنگی و غەمبارییە، هەرچەندە خەمۆکی و دڵتەنگیەکانی سەرەتای قۆناغی هەرزەکاری هێشتا لە سنووری ئاسایی خۆیدایە و نەبوون بە نەخۆشی دەروونی، بەڵام پشت گوێ خستن و چارەسەر نەکردنی خەمۆکی ی ئەو جۆرە هەرزەکارانە دەبێتە هۆی تەشەنەکردن و سەر هەڵدانی کۆمەڵێک کێشەو گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی. کارێکی ئاساییە کە هەرزەکار لەسەرەتای هەرزەکاری لە ئەنجامی مامەڵەی هەڵەی دایک و باوک و گۆڕانکارییە خێراو کوت و پڕەکانی سەردەمی هەرزەکاری و فشاری کۆمەڵ و دام و دەزگاکان بۆ سەری، تووشی خەمۆکی و دڵتەنگی ببێت. بەڵام ئەوەی ئاسایی نییە بەردەوام بوونی ئەو بارەدەروونیەیە بۆ دوای قۆناغی هەرزەکاری و کامڵی. ئەمەش مانای ئەوەیە کێشە و گیروگرفت و ملمڵانێکانی هەرزەکار زۆر ئاڵۆزو هەمەلایەنەیەو ڕەگ و ڕیشەی بۆ سەردەمی پێش قۆناغی هەرزەکاری دەگەڕێتەوە، سەرەڕای ئەوەش کێشەو گۆڕانکارییەکانی

قۆناغی هەرزەکاری هاتۆتە سەر. ئالەم حاڵەتانەدا دەبێت کەسانی پسپۆڕو شارەزا لە بواری دەروونی هاوبەشی و هاوکاری خێزانی ئەو جۆرە هەرزەکارانە بکەن و هەوڵی چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشی و کێشە دەروونیانەیان بدەن. لەبەر ئەوەی کێشەکەی ئاڵۆز بووەو پێویستی بە هاوکاری زۆر لایەن هەیە( Feldman, 2003, P:425 ).

## خۆکوشتن:-

ئەوەی مایەی کارەسات و نەهامەتیە، ئەوەیە کە هەندێك لە هەرزەکارەکان لە ئەنجامی پشت گوێ خستن و چارەسەر نەکردنی کێشەکانیانەوە پەنا بۆ خۆکوشتن دەبەن و بەداخەوە هەندێك جاریش سەرکەوتوو دەبن و کۆتایی بە ژیانی خۆیان دەهێنن. ڕاستە زۆربەی زۆری هەرزەکاران لە قۆناغی هەرزەکاری ڕووبەڕووی کێشەو ململانێ دەبنەوە، بەڵام ژمارەیەکی زۆرکەمیان پەنا بۆ خۆکوشتن و ئازاردانی کەسانی تر دەبەن ئەوەش هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە، لە پێشەوەی هەموویان، ئەو جۆرە کەسانە کەسێتیەکی لاوازو قرچۆکیان هەیەو لە قۆناغی منداڵیدا بنەماو بناغەی پتەوی پەروەردەکردن و بونیادنانیان لاواز بووە، سەرەڕای ئەوەش ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووریان زۆر ئاڵۆز بووە، واتە کێشەی خێزانی و دەروونی هەرەسی پێ هێناون و توانای بەرەنگاربوونەوەیانی نیە و لە بەردەمیاندا چۆك دادەدەن، بۆیە بیر لە خۆکوشتن وەك تەنها چارەسەر دەکەنەوە.

## زیندە خەون ( أحلام اليقظة )

زیندە خەون بریتییە لە هیواو ئاوات و بیری خۆش و بەتام کە مرۆڤ زۆرجار پەنای بۆ دەبات، ئەم جۆرە خەوو خەیاڵ و بیرە خۆشانە بە ڕێژەیەکی گونجاو پێویست و بە سوودن، بەڵام ئەگەر لەڕێژەی ئاسایی خۆی دەرچوون و مرۆڤ بەبەردەوامی و بۆ ماوەیەکی زۆر پەنای بۆ بردن، ئەو کاتە زیان بەخش دەبێت و تاك لە ژیانی واقعی دوور دەخاتەوەو شوێنەواری خراپی لەسەربارى دەروونی دەبێت. زیندە خەون لە هەموو قۆناغەکانی ژیان هەیە، بەڵام زیاتر لە قۆناغی منداڵی و هەرزەکاری باوە، کە منداڵ و هەرزەکار لە ڕێگەیەوە نوقمی ناو خەوو خەیاڵ و حەزوو ئارەزووەکانیان دەبن و خۆیان بە پاڵەوان و ناودارو کەسانی خاوەن پلەو پایەی بەرز دادەنێن و لە ڕێگەی خۆخستنە شوێنی ئەوانەوە ( تقمص ) لاسایی کەسایەتی و ڕەفتاریان دەکەنەوەو ماوەیەکی کەم یان زۆر ئاگایان لە چواردەوریان نامێنێ و لەناو خەووخەیاڵدا دەژین، زۆر جاریش تەلەفزیۆن و ئەنتەرنێت و ئەتاری و کتێب و بڵاوکراوەی وێنەدار ئەو زیندە خەوو خەیاڵانەیان لەلا زیاتر دەکات، وەك دەرکەوتووە لەسەرەتای باڵق بوون و قۆناغی هەرزەکاری بدزۆری منداڵ و هەرزەکار پەنا بۆ زیندەخەون دەبەن و ماوەیەکی زۆرتر لەواقیع دوور دەکەونەوەو ئاگایان لە چواردەوریان نابێت. هەر چ کاتێك منداڵ و هەرزەکار بەشێوەیەکی تایبەتی و کەسانی تر بە گشتی بە زۆری پەنایان بۆ زیندە خەون بردو لە واقیع دابڕان، ئەوە بەڵگەیەو مانای ئەوەیە کە ئەو کەسە گرفتی هەیەو ناتوانێت لە واقیعدا چارەسەریان بکات، بۆیە بەناچاری پەنا بۆ زیندە خەوو خەیاڵ و بیری خۆش دەبات.

### هۆکارو فاکتەرەکانی زیندەخەون:-

کاتێك منداڵ یان هەرزەکار ئەو بڕوایەی لەلا دروست دەبێت کە ژیانی واقعی زۆر زەحمەت و دژوارەو ناتوانێت حەزوو ویست و ئارەزووەکانی تیایدا بهێنێتە دی، بۆیە بەناچاری پەنا بۆ زیندە خەوو خەیاڵی خۆش دەبات و هەوڵدەدات لە ڕێگەیانەوە حەزوو

ئارەزووە تێرنەكراوەكانی ژیانی واقعی تێر بكات، لەلایەكی تریشەوە ئەوەی بۆ دەردەكەوێت كە خەوو خەیاڵ زۆر ئاسانترە لە چارەسەر كردن و جێ بەجێ كردنی كارو ئەركەكانی قوتابخانەو ناو ماڵ و كۆمەڵ و ئەو زیندە خەوە دەبێت بەدەروازەیەكی خۆش و ئاسان بۆ ڕاكردن لەواقیع و خۆدزینەوە لە ئەرك و كێشە كۆمەڵایەتی و ئابووری و دەروونیەكان، چونكە هەندێك جار منداڵ هاوڕێ و دۆستی خەیاڵی لە ڕێگەی زیندە خەونەوە بۆ خۆی دروست دەكات و لە گەڵیان دەكەوێتە گفت و گۆو ڕاگۆڕینەوەو یاریكردن و قەرەبووی بێبەش بوونەكانی ژیانی واقعی بۆ دەكاتەوەو لە بێ هاوڕێیەتی و پشت گوێخراوی ڕزگاری دەبێت و لە خەوو خەیالی خۆیدا دەبێت بە پاڵەوان و سەركردەو ناوداری دوور لە ڕەخنەو كەم و كورتی.

## قەرەبووكردنەوەی كەم و كورتیەكی راستەقینە :

زۆر جار ئەو منداڵ و هەرزەكارانەی بەدەست نووقستانی و كەم و كورتیەكی جەستەییەوە دەناڵێنن، پەنا بۆ خەوو خەیاڵ و زیندە خەون دەبەن و دەیانەوێت لە ڕێگەیانەوە بگەنە ئەو بڕوایەی كە ئەوان كەسانی ئاساین و لە هیچیان كەم نییە، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەو زیندە خەوو خەیاڵە خۆشانەوە قەرەبووی نوقستانیەكانیان بكەنەوەو، لە هەست كردن بە كەمی ڕزگاریان بێت. بۆ نموونە ئەو منداڵانەی كە كێشەی خوێندنیان هەیەو ڕێژەی زیرەكیان كەمە یان بەزەحمەت لە مامۆستا دەگەن و ئەركەكانی خوێندنیان بۆ جێبەجێ ناكرێت و بەردەوام ڕووبەڕووی ڕەخنەو گازاندەو تیرو توانج دەبنەوە، بەزۆری پەنا بۆ خەیاڵ و زیندە خەون دەبەن و جیهانێكی خەیالی خۆش بۆ خۆیان دروست دەكەن و لە ڕێگەیانەوە حەزوو ئارەزووەكانیان تێر دەكەن و قەرەبووی سەرنەكەوتنەكانی ژیانی واقیعیانی پێدەكەنەوەو لە هەست كردن بە كەمی و تیرو توانج ڕزگاریان دەبێت.

## زیندەخەون وەك خوویەك :

وەك لە پێشەوە ئامارژەمان بۆ کرد زیندە خەون بە ڕێژەیەکی ئاسایی زیانی نیەو زۆر باویشە لەناو منداڵان، بەلام ئەوەی جێگەی داخە ژمارەیەك لە منداڵان زیندە خەون دەکەن بەخوویەکی بەردەوام و بە زۆری پەنای بۆ دەبەن، وەك چۆن هەندێك منداڵ ( پەنجە مژین، نینۆك قرتاندن، سەرخوراندن، چاو تروکاندن ) دەکەن بە خوو بە بەشێك لە ڕەفتاری ڕۆژانەیان، بەو شێوەیەش ئەو جۆرە منداڵانە زیندە خەون و ژیان لە ناو خەووخەیاڵ و ڕاکردن لە واقیع دەکەن بە خوو ڕەفتارێکی ڕۆژانەو بەردەوام بۆ ماوەیەکی دیاریکراو پەنای بۆ دەبەن، ئەوەی زیاتریش جێگەی مەترسیە ئەوەیە کە ئەو جۆرە منداڵانە لە کاتی ئامۆژگاری کردنی دایك و باوك یان وانە گوتنەوەی مامۆستا پەنا بۆ زیندە خەون ببەن و بەهۆیانەوە لە خوێندن دوا بکەون.

## شەرم :

بەشێوەیەکی گشتی زیندە خەون لەلای منداڵ و هەرزەکاری شەرمن زۆرەو بەردەوام پەنای بۆ دەبەن، لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە هەرزەکارو منداڵانە لە ئەنجامی شەرمەوە لەناو کۆمەڵ و قەرەباڵغیدا هەست بە دڵەڕاوکێ و ترس و ناخۆشی دەکەن و ناتوانن خۆیان لەگەڵیان بسازێنن، لەبەر ئەوە خەیاڵ و زیندە خەون بەهەل دەزانن و وەك دەروازەو ڕێگا چارەیەك پەنایان بۆ دەبەن و لەو ترس و دڵەڕاوکێیەی ناو کۆمەڵ و قەرەباڵغی ڕزگاریان دەکەن و لەناو خەیاڵ و زیندە خەونەکاندا هەست بە خۆشی و کامەرانی دەکەن و کاتێکی خۆش لەگەڵیان بەسەر دەبەن و بەئاسانی کەسانی چواردەوریان لەسەرو سیماو دەم و چاویاندا خۆشی و دڵنیایی هەست پێدەکەن بۆیە ئیتر وردە وردە ژیان لەناو خەووخەیالدا بەرەو زیادبوون دەچێت.

## ڕێگاکانی خۆپاراستن

بۆ ئەوەی هەرزەکارو منداڵەکانمان لەناو خەووخەیاڵی زیاد لە پێویست نووقم نەبن و لەو دیاردە نا ئاساییە بیان پارێزین، پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی لای خوارەوە بکەین:-

### گەشە پێکردنی هەست کردن بە بڕوا بەخۆبوون و لێهاتوویی:-

لەبەر ئەوەی زۆر جار زیندە خەون وەڵامدانەوەو بەرپەرچ دانەوەی بڕوا بە خۆنەبوون و کەم توانایە، بۆیە زۆر پێویستە هەر لە منداڵیەوە تۆوی هەست کردن بە خودو بڕوا بە خۆبوون و دڵنیایی لەناو دڵ و دەروونی منداڵەکانماندا بچێنین و نەهێڵین هەست بە کەمی بکەن بە چاوی سووک سەیری خۆیان بکەن و لە نرخیان کەم نەکەینەوە، بۆ ئەوەی لەناو خێزان و کۆمەڵدا هەست بە دڵنیایی و خۆشی بکەن و پێویستیان بە خەوو خەیاڵ نەبێت. واتە نابێت منداڵ نازدار بەخێو بکرێت یان سووکایەتی پێ بکرێت، بەڵکو دەبێت ڕێزیان بگیرێت، لە هەمان کاتیشدا بواری سەربەخۆیی و ڕادەربڕینیان بۆ بڕەخسێندرێت. باشترین شت ئەوەیە کە منداڵ هەر لە سەرەتای ژیانیەوە بواری کارکردن و جێ بە جێ کردنی چالاکیەکانی ناو ماڵی بۆ بڕەخسێندرێت و بەپێی تەمەن و شارەزایی و توانای، ئیشی بچووک و گونجاوی پێ بسپێردرێت، بۆ ئەوەی لە ڕێگەیانەوە هەست بە بوونی خۆیان بکەن و لەناو کۆمەڵ و دام و دەزگاکانیدا هەست بە خۆشی و دڵنیایی بکەن و ناچار نەبن پەنا بۆ زیندە خەوو خەیاڵ و بیری خۆش بەرن. منداڵ کاتێک بۆ یەکەم جار دەچێتە قوتابخانەی سەرەتایی، ڕووبەڕووی ژینگەو باروودۆخێکی نوێ دەبێتەوەو دەبێت بە ئەزموونی یەکەم بۆ تاقیکردنەوەی تواناکانی منداڵ و خۆ سازاندنی لەگەڵ ژینگەی قوتابخانە ئینجا ئەو منداڵانەی بە چاوی سووک سەیری خۆیان دەکەن و لە هێزو تواناکانی خۆیان بە گومانن، ئەوا ڕووبەڕووی زۆر کێشەی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی دەبنەوەو لە ناو قوتابخانە هەست بەخۆشی و کامەرانی ناکەن و بە زۆریش پەنا بۆ زیندە خەون و خەیاڵی جۆراوجۆر دەبەن و

بە واقیع و ئەرکەکانی قوتابخانەو خۆسازاندن رادەکەن، لەبەر ئەوە زۆر گرنگە کە منداڵ پێش چوونە قوتابخانە ئامادەبکرێت و قوتابخانەی لە لا خۆشەویست بکرێت و پێش وەخت قسە لەگەڵ مامۆستاکانی بکرێت، بۆ ئەوەی بەئاسانی لەگەڵ ژینگەی قوتابخانە رابێت و ئەرك و فەرمانەکانی جێبەجێ بکات.

## جەخت کردنە سەر هەست کردن بەرازی بوون لە ژیانی رۆژانەی :-

زۆر هەرزەکارو منداڵی بەتواناو لێهاتوو هەیە، بەڵام بەداخەوە زۆر جار لەکارو چالاکییەکانی خۆیان رازی نین، بۆیە لە خەوو خەیاڵی خۆیاندا کەش و هەوایەکی پڕ لە دڵنیایی و رازی بوون بۆ خۆیان دەخوڵقێنن، لەبەر ئەوە زۆر گرنگە کەوا لە هەرزەکارو منداڵ بکرێت لە میانەی کارەکانیەوە هەست بە رازی بوون و کامەرانی بکات، بێگومان زۆر شێواز هەیە کە دایکان و باوکان و مامۆستایان دەتوانن لە میانەیانەوە هەست کردن بە رازی بوونی رۆژانە لەلای هەرزەکارو منداڵەکانیان دروست بکەن لەوانە :-

## نموونەو پێشەوا :-

کاتێك دایك و باوك و مامۆستا و کەسانی چواردەوری هەرزەکارو منداڵ لە میانەی کارو چالاکییەکانی رۆژانەیان هەست بەخۆشی و کامەرانی و رازی بوون دەکەن و ئەو خۆشی و رازی بوونە لەدەم و چاوو دڵ و دەروونیاندا دەردەکەوێت و لە رەفتاری رۆژانەیاندا رەنگ دەداتەوە، ئەو کاتە هەرزەکارو منداڵەکانیشیان لاساییان دەکەنەوەو هەست بە هەمان خۆشی و رازی بوون دەکەن، بەڵام ئەگەر دایك و باوك و کەسانی تری چواردەوی منداڵ لەکاتی بەئاکام گەیاندنی ئیش و کارەکانیانەوە هەستیان بە بێزاری و ناڕەحەتی کردو بەردەوام گازاندەو پرتەو بۆڵەیان بوو نارازی بوون، ئەو کاتە منداڵەکانیش ئەو جۆرە رەفتارو هەست و سۆزەی دایك وباوکیان دووبارە دەکەنەوەو هەست بە بێزاری و ناڕەحەتی دەکەن و دوور نییە پەنا بۆ خەوو خەیاڵ و زیندە خەون ببەن، بۆ ئەوەی هەست بە خۆشی و رازی بوون بکەن.

## گفت و گۆكردن:-

ئەم شێوازە ئاسانەو دایكان و باوكان و مامۆستایان دەتوانن لەكاتی گفت گۆو قسەكردنیاندا باس لە هەست و سۆزو رازی بوونی خۆیان بكەن و ونەوە دەربخەن كەچۆن لە كاتی (خوێندنەوە، نیش كردن، نووسین، كەل و پەل رێك خستن، پاك و خاوێنی ناو ماڵ ...... هتد) هەستیان بە خۆشی و كامەرانی كردووەو رازین لە كارو چالاكییەكانی رۆژانەیان. بێگومان ئەم قسە كردن و راگۆڕینەوەیە دەبێتە هۆی خۆش كردنی چالاكییەكانی رووژانە لەبەر چاوی هەرزەكارو منداڵ و گەشە پێكردنی هەست كردن بە رازی بوون لەكارو ئەركەكانی رۆژانە و پەنا نەبردن بۆ خەوو خەیاڵ و زیندەخەوو دالغەلێدان.

## هاندان و پاداشت كردن:-

بێگومان هاندان و پاداشت كردنیش فاكتەرێكی ترە كە دەبێتە هۆی بەهێز كردنی هەست كردن بە رازی بوون. واتە كاتێك هەرزەكار یان منداڵ لە میانەی كاروچالاكییەكانی رۆژانەیەوە هەست بە سەركەوتن و خۆشی و رازی بوون دەكات ئەوا زۆر گرنگە پاداشت و هانبدرێت، ئەویش لە رێگەی زەردەخەنەو دست خۆشی و پاداشت و دیاری و سوپاس و هاندانەوە دەبێت، بۆ ئەوەی منداڵ و هەرزەكار لە داهاتوودا دووبارەیان بكەنەوەو هەست كردن بە خۆشی و رازی بوون لە دڵ و دەروونیاندا گەشە بكات و لە ژیانی رۆژانەو واقیعیدا هەست بە خۆشی و كامەرانی بكەن و ناچار نەبن پەنا بۆ خەیاڵ و زیندەخەون ببەن.

## جەخت كردنە سەر خاڵە بەهێزەكان و كەمكردنەوەی هەست كردن بەكەمی:-

بە زۆری هەرزەكارو منداڵانی نوقستان هەست بەكەمی دەكەن و كەم و كورتی لە یەكێك لە ئەندامەكان یان چالاكیەكانیاندا هەیە، بۆ نموونە ناتوانێت وەك منداڵانی تر بنووسێت یان رابكات یان یاری بكات یان كاروچالاكییەكی دیاریكراو بە ئاكام بگەیەنێت،

لەبەر ئەوە هەست بە کەمی و خەم و خەفەت دەکات و دواجار دوور نییە پەنا بۆ زیندەخەون ببات و لەو واقیعە ناخۆشە رابکات، ئینجا بۆ ئەوەی ئەوە روونەدات زۆر گرنگە کە جەخت بکرێتە سەر خالە بەهێزەکانی ئەو جۆرە هەرزەکارو مندالە و پەرەیان پێبدرێت بۆ نموونە مندالەکە توانای رۆیشتنی نییە بەلام توانای نووسین و قسەکردنی باشە، یان توانای قسەکردنی نییە، بەلام توانای وەرزشی و وێنەکیشانی زۆر زۆر باشە یان توانای خوێندنی کەمە بەلام توانای میکانیکی و هونەری زۆر باشە، کەواتە دەبێت گرنگی بەلایەنە باش و بەهێزەکانی ئەو جۆرە هەرزەکارو مندالانە بدرێت و سوودیان لێوەربگیرێت و بواری گونجاو بۆ گەشەکردنیان برەخسێندرێت، تا لە میانەیانەوە هەست بە بوونی خۆیان بکەن و تام و چێژ لە ژیانی واقیعی وەربگرن و ناچار نەبن پەنا بۆ خەوو خەیال بەرن.

## چارەسەرکردن

**چالاکی:-**

زۆر پێویستە نەهێلدرێت ئەو هەرزەکارو مندالانەی کە بە زۆری پەنا بۆ زیندەخەون دەبەن بێ ئیش بن یان بە زۆری بە تەنها بن و تووشی بێزاری ببن، لەبەر ئەوەی ئەو فاکتەرو بارودۆخانە رێژەی زیندە خەونەکانیان زیاتر دەکەن، بۆیە زۆر گرنگە کە بەردەوام بە کاروچالاکی رۆژانەو ئاسانەوە خەریکیان بکەن، وە پێویستە ئەو کارو چالاکیانەش لەو جۆرە بێت کە مندال تام چێژو خۆشیان لێوەربگرێت و ناچار نەبێت لێیان رابکات و پەنا بۆ زیندە خەون بەرێت.

زۆر گرنگە هەول بدرێت برادەرو هاورێ بۆ ئەو جۆرە مندالانە بدۆزرێتەوەو وایان لێبکرێت کە یارییان لەگەل بکات و بکەونە گفت و گۆو راگۆڕینەوە، هەروەها دەکرێت زوو زوو ئەو جۆرە هەرزەکارو مندالانە لە رێگەی (قسە لەگەل کردن، بانگ کردن، جوولاندن و دەست لە شاندان) بە ئاگابهێنرێنەوە، بۆ ئەوەی نەهێلدرێت تام و چێژ لەو خەیال و زیندە

خەونانەیان وەربگرن، لەلایەکی تریشەوە دەکرێت هەندێك کاروچالاکییان پێ بسپێردرێت کە ئاسان و سوك و خۆش و لەهەمان کاتیشدا پێویستیان بە سەرنج دان و بە ئاگایی و چاوتێبڕین و وردەکاری هەیە، تا لە ڕێگەیانەوە ڕێژەی زیندە خەونەکانیان کەم بکەینەوە، سەرەڕای ئەوەش زۆر گرنگە زوو زوو پرسیاریان لێبکرێت و پێیان بگوترێت (چی بوو، چی ڕوویدا، بۆ ئەوە بوو، چۆن چارەسەر دەکرێ، ......هتد). ئەگەر بکرێت ئەو جۆرە هەرزەکارو منداڵانە لەسەر چوونە ناو تیپ و کۆڕو کۆبوونەوەو کاری بە کۆمەڵ هانبدرێن و بەردەوام لەسەر بە ئاگایی و چاوتێ بڕین و کەمکردنەوەی زیندە خەونەکانیان پاداشت و هانبدرێن.

## پاداشتی بە ئاگایی و چالاکی و بەرهەمەکانی بکرێت:-

بە پێی پرنسیپەکانی قوتابخانەی ڕەوشتایەتی دەبێت بەردەوام پاداشتی ماددی و مەعنەوی بە ئاگایی و چالاکییە بە سوودەکانی واقیعی و ژیانی ڕۆژانەی ئەو جۆرە هەرزەکارو منداڵە بکرێت، بۆ ئەوەی لەسەری بەردەوام بن، لەهەمان کاتیشدا ڕەفتاری زیندە خەون و خەیاڵاوی نا ئاسایی پشت گوێ دەخرێت بۆ ئەوەی سوودی لێوەرنەگرن و دواتر لێی دوور بکەونەوە، واتە دەبێت ژیانی واقیعی و ڕۆژانەی زیاتر خۆش و بەتام تر بێت لە ژیانی خەیاڵی و زیندەخەونەکانی، هەروەها زۆر گرنگە خێزان و قوتابخانە هاوکاری یەکتری بکەن و هەرزەکار یان منداڵ هەر ڕەفتارو کارێکی بە ئاگایی لە قوتابخانە یان خێزان کرد، پاداشت بکرێت و یەکتری ئاگادار بکەنەوە، وە نابێت بە هیچ شێوەیەك ڕەخنەو لێدان و توونە و تیژی لەگەڵیان بەکار بهێندرێت، لەبەر ئەوەی ڕێژەی زیندە خەون و خەیاڵەکانیان زیاتر دەکات، لەلایەکی تریشەوە دەکرێت کاتژمێری بە ئاگاهێنانەوە (زەنگ) بەکاربهێندرێت بۆ ئەوەی زوو زوو بە ئاگابهێندرێنەوەو ماوەی داڵغە لێدان و زیندە خەونەکانیان کەم بکرێتەوەو دواتریش لە جێگای ئەو کاتژمێرە لە ناوەو خودی ئەو جۆرە هەرزەکارو منداڵانە، کۆنترۆڵکردن و بە ئاگاهێنانەوە گەشە بکات.

## ناوەرۆکی زیندەخەونەکان دیاری بکرێت:-

بۆ ئەوەی چارەسەرکردنەکە سەرکەوتوو بێت، دەبێت هەوڵی زانینی ناوەرۆکی زیندەخەونەکان بدەین، واتە دەبێت باوك و دایك و مامۆستا پەیوەندییەکی پتە و لەگەڵ ئەو جۆرە هەرزەکارو منداڵانە دابنێت بۆ ئەوەی لە ڕێگەی پرسیارکردن و گفت و گۆو ڕاگۆڕینەوەوە (هەرزەکار) منداڵ باسی ناوەرۆکی زیندەخەونەکانی بکات، بۆ نموونە لەوانەیە ناوەرۆکی زیندەخەونەکە پەیوەندی بە هەست کردن بە کەمی یان قەرەبوو کردنەوەوە هەبێت و هەرزەکار لە خەوو خەیاڵی خۆیدا جیهانێکی فەنتازیای بۆ خۆی دروست کردووەو ڕۆڵی پاڵەوان و ناوداران دەگێڕێ، کەواتە لە واقیعدا لە زۆر لەو شتانە بێبەشە، بۆیە دەبێت لە ژیانی واقیعی هەوڵی دابین کردنی ئەو حەزوو ئارەزوو خەوو خەیاڵانە بدرێت بۆ ئەوەی لە زیندە خەونەکان دوور بکەوێتەوە، یان لەوانەیە هەرزەکار خەون بە کۆشك و تەلارێکەوە ببینێ کە پڕیەتی لە ئەمن و ئاسایش و دڵنیایی و بەخۆشی و کامەرانی بۆ خۆی تیایدا دەژی کە دوور نیە لەبەر ئەوە بێت کە ژینگەی خێزانی ئەو هەرزەکارە پڕە لە ناخۆشی و شەڕ و ئاژاوە، کەواتە دەبێت ژینگەی خێزانی خۆش بکرێت و هەرزەکار لەو ترس و دڵەڕاوکێ یە ڕزگار بکرێت و لە ڕاستیدا هەرزەکار لەناو خێزان و دایك و باوك و قوتابخانەکەیدا هەست بە ئاسایش و دڵنیایی بکات، بۆ ئەوەی پێویستی بە ئەوە نەبێت کە لە خەووخەیاڵدا ئەو جۆرە ژینگەیە دابین بکات.

کەواتە دەست نیشانکردنی ناوەرۆکی زیندە خەونەکان گرنگەو دەبن بە فاکتەری سەرەکی بۆ زانینی باری دەروونی ئەو جۆرە هەرزەکارانە دۆزینەوەی ڕێگاچارەی گونجاو بۆ زیندە خەونە نا ئاساییەکانیان. ئینجا ئەگەر هات و دایك و باوك و مامۆستا و کەسانی تری چواردەوری هەرزەکار لە ڕێگەی ئەو هەنگاوو خاڵانەی سەرەوە نەیان توانی چارەسەری زیندە خەون و داڵغە لێدانیان بکەن و ئەوەندەش زیادی کرد کە بوونە هۆی دروست کردنی کێشەو گیروگرفتی پەروەردەی و کۆمەڵایەتی و دەروونی، ئەوا زۆر گرنگە پەیوەندی بە کەسی پسپۆڕو شارەزا لە بواری دەروونزانی بکەن و بە هاوکاری هەموو لایەك چارەسەری ئەو کێشەیە بکەن و هەرزەکارە بگەڕێننەوە دۆخی ئاسایی خۆی (شیفرو میلمان، ٢٠٠١، ص٤٦ - ٥٣).

## خۆشەویستی لە قۆناغی هەرزەكاری

خۆشەویستی (عاتیفة) و سۆز ویژدانیكە لەلای هەموو كەسێك هەیە، تەنانەت یەكێكە لە رەمەكەكانی (غریزة) جیهانی ئاژەڵان و خۆرسكەو هەر لە كاتی لەدایك بوونەوە لە ناخ و دڵ و دەروونی تاكەكاندا هەیە . خۆشەویستی زۆر جۆرو شێوازی تایبەتی خۆی هەیە لەوانە (خۆشەویستی نێوان دایك و منداڵ، خۆشەویستی نێوان ئەندامانی خێزان، خۆشەویستی مرۆڤ بۆ وڵات و هاوڕێ و دۆست و برادەرانی، خۆشەویستی زانست و مرۆڤایەتی و كاری خێرو چاكە، خۆشەویستی توخمەكەی تر ... تاد) ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە، خۆشەویستی هەرزەكارو چۆنیەتی گەشەكردنیەتی لە قۆناغی هەرزەكاری، كە زیاتر پەردە پۆش و ئامرازێكە بۆ شاردنەوەی حەزوو ئارەزووی سێكسی و پەیوەندە بە هەرزەكارو كەسانی تری چواردەوریەوە بەتایبەتیش توخمەكەی تر.

حەزوو ئارەزووی سێكسی دیاردەیەكی سروشتی و ئاسایی و زەقی قۆناغی هەرزەكارییە، لەبەر ئەوە لەم قۆناغەدا كۆمەڵێك گۆڕانكاری فسیۆلۆژی و جەستەیی روودەدەن لە پێشەوەی هەمووشیان كەوتنە گەڕو پێگەیشتنی سێكسە گلاندەكانە (الغدة الجنسیة) لەلای هەردوو توخمەكە (نێرو مێ) كە بریتین لە هەردوو گون لەلای نێرو هەردوو هێلكەدان لەلای كچ. ئەم سێكسە گلاندانە لە قۆناغی هەرزەكاری چالاك دەبن و دەست دەكەن بە دەرهاویشتنی هۆرمۆناتی تایبەتی (هۆرمۆنی نێرایەتی و مێیایەتی) كە كاریگەری زۆریان لەسەر باری دەروونی و گۆرانكارییە فسیۆلۆژیەكان و دەركەوتنی حەزوو ئارەزووەكانی سێكسی هەیە، هەر چەندە رەمەكی سێكسی خۆرسكەو هەر لە كاتی لە دایك بوونەوەلە ناخ و سروشتی مرۆڤدا هەیە، بەڵام ئەو گوڕو تینەی قۆناغی هەرزەكاری نییە و لەسەر دەمی منداڵی بە شێوازی تایبەتی لە قۆناغەكانی (دەمێتی، كۆمێتی، ئەندامی زاووزێتی) گوزارشتی لێدەكرێت. بەڵام لە قۆناغی هەرزەكاری دوای پوكانەوەی هەردووگلاندی منداڵی (پینیە گلاند) (الغدة الصنوبریة)و(تیموسە گلاند) ئیتر حەزوو ئارەزووی سێكسی بە تەواوی گەشە دەكات و دەبێت بە بنەما و پاڵنەری سەرەكی خۆشەویستی .

خۆشەویستی و حەزوو ئارەزووی سێکسی هەرزەکار بە چەند قۆناغێك تێدەپەڕێت و لە کاتی گەشە کردنیدا لە هەر قۆناغێکدا تایبەتمەندیەتی خۆی هەیە. قۆناغەکانی گەشەکردنی خۆشەویستی و حەزوو ئارەزووی سێکسی ئەمانەی لای خوارەوەن:-

## قۆناغی نێرگزیەتی (المرحلة النرجسية):-

ئەم قۆناغە راستەوخۆ دەکەوێتە پێش باڵقی و دەرکەوتنی نیشانەکانی هەرزەکاری و نزیکەی دوو ساڵ دەخایەنێ و بەزۆری لە دە ساڵی دەست پێ دەکات و لە دوانزە ساڵی کۆتایی دێت. لە گرنگترین مۆرك و نیشانەکانی نێرگزی، گرنگی دانی زۆرە بە جەستەو لەش و لار. واتە تاك لەم کاتەدا گرنگیەکی زۆر بە لەش و لاری دەدات و بە زۆری لە بەردەم ئاوێنەدا رادەوەستێت و سەیری لەش و باڵای خۆی دەکات و بە جۆرەها شێواز خۆی دەگۆڕێ و دەرازێنێتەوە و پرچی شانەو رێك دەخات، هەر ئەم نێرگزیەتەیە کە بەرەو وەرزش و ماکیاج و جۆرەها چالاکی جەستەیی پاڵی پێوە دەنێ و زۆر خۆی خۆش دەوێ و وەك بڵێیت دڵدارو عاشیقی خۆی دەبێت. ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێ کە لەم کاتەدا ئیتر گرنگی بە هیچ کەسێکی تر نادات و تەنها خۆی خۆش دەوێت، نەخێر کەسانی تریشی خۆش دەوێت بەڵام زۆربەی هێزو گوڕو تینی خۆشەویستیەکەی ئاراستەی خودو جەستەی خۆی دەکات و بە چەندەها شێوازیش گوزارشتی لێدەکات .

گرنگترین شت لەم قۆناغەدا لەلای هەرزەکار جەستە و لەش ولارو خودی خۆیەتی، واتە زۆر حەز بە پیاهەڵدان و باس کردنی خۆی دەکات و سەری زمان و بنی زبانی هەر خۆیەتی، لەبەر ئەوە سوکایەتی پێکردن و کەم کردنەوەی نرخی زۆر بێزارو توڕەی دەکەن و باری دەروونی ئاڵۆز دەکەن، بۆیە پێویستە ئێمەی گەورە رەچاوی ئەو خاڵە بکەین و سوکایەتی پێنەکەین، بۆ ئەوەی بە چاوی سووك سەیری خۆ ی نەکات و خۆشەویستیەکەی بۆ رق و کینە و هەست کردن بە کەمی نەگۆڕ درێت .

ئەم خۆشەویستی خودەو گرنگی دان بە جەستەو لەش و لار هیچ مەترسیەکی تێدا نییە و یەکێکە لە قۆناغەکانی گەشەکردنی خۆشەویستی و تاك بەرەو پێگەیشتن و قۆناغەکانی تری خۆشەویستی دەبات .

## گرنگی دان بە توخمەکەی خۆی:-

پێش ماوەیەکی زۆر کەم لە کۆتایی هاتنی قۆناغی نێرگزی، دیاردەی بالق بوون لەلای هەرزەکار دەردەکەوێت، ئەویش خۆی لە (دەنگ گڕ بوون و درێژی و زیاد بوونی کێش و بەرز بوونەوەی سنگی هەرزەکار و بێ نوێژی و شەیتانی بوون و پێگەیشتنی هەردوو سێکسە گلاندی (نێر و مێ) و بەرهەم هێنانی سپێرم لەلای کوڕو هێلکە لەلای کچ) دەبینێتەوە .

ئەم قۆناغی گرنگی دان بە توخمەکەی تر (الجنسية المثلية) نزیکەی چوار ساڵ دەخایەنێ و لە دوانزە ساڵیەوە دەست پێدەکات و لە دەوروبەری شانزدە ساڵیدا کۆتایی دێت بەبێ ئەوەی مرۆڤ هەست بە ئەوە بکات کە لە نێرگزیەت و گرنگی دان بە جەستەو لەش و لاری رزگاری بووە، یەکسەر لە تەمەنی دوانزە ساڵان و دەورووبەری حەزوو ئارەزووی گرنگی دان بە جەستە و لەش ولاری کەسانی تر کە لە هەمان توخمی خۆین (کوڕ بۆ کوڕ، کچ بۆ کچ) لەلای دەردەکەوێت.

لەم کاتەدا زۆر حەز بە بینینی جەستەو لەش وبالآی هاوتەمەن و هاو توخمی خۆی دەکات و لە شی خۆی بە لەشی ئەوان بەراورد دەکات و وردە وردە دەکەوێتە داوی گرنگی دان و سەر سوڕمان و حەز کردن بە تێکەڵاو بوونی هلو توخمەکەی خۆی، واتە خۆشەویستی لەم کاتەدا لە جەستەو باڵا و خودی خۆیەوە بۆ باڵا و جەستەی هاوەڵەکانی دەگوێزێتەوە و دڵفە لێدەدات و خەونیان پێوە دەبینێ و زیندە خەون و خەووخەیاڵی جۆراو جۆر دەربارەیان دەهۆنێتەوە، ئەم خۆشەویستیەی هەرزەکار بۆ هاورێکانی قوتابخانە یان کۆڵان و دراوسێ ی بۆشاییەکی زۆر لە دڵ و دەروونی داگیر دەکات و تەنها برادەرێتی نییە بەڵکو زۆربەی جار لە ناوەخنەکەیدا حەزوو ئارەزوو مۆرکی سێکسی پێوە دیارە.

بە بڕوای هەندێک لە دەروونزانان ئەم حەزوو ئارەزوو خۆشەویستیەی هەرزەکار بۆ توخمەکەی خۆی هیچ جیاوازییەکی ئەو تۆی لە گەڵ ئەو خۆشەویستیە نییە کە لە قۆناغی ڕاهاتوو بۆ توخمەکەی تر هەیەتی .

ئەم جۆرە خۆشەویستیە هیچ مەترسیەکی ئەو تۆی تێدا نییە و زیاتر ڕوو کەش و ڕۆمانسیە و زۆر بە کەمی بۆ ئاستی نزم دادەبەزێت و دەبێتە هۆی تێرکردنی واقیعی ئەو حەزوو ئارەزووە سێکسیە و لادان و سەرە ڕۆیی. واتە گرنگی دانێکی کەم بە هەرزەکارەکان و ڕێنمایی کردنی و چاودێرییەکی ئاراستەوخۆیان زامنی پاکی ئەو خۆشەویستی و پەیوەندیەن و بە سەلامەتی ئەو قۆناغە دەبڕن و دوای ماوەیەک دەچنە قۆناغێکی نوێوە .

بەڵام ئەگەر ئەو خۆشەویستی و گرنگی پێدانە زۆر خەست بێتەوە، ئەوا ئەو جۆرە هەرزەکارە وەک دڵدارێکی وێڵ و سەرگەردان بەردەوام لە خەوو خەیاڵ و خولیای ئەو کەسەی کە خۆشی دەوێ دەبێت و حەز دەکات بەردەوام لە نزیکیەوە بێت و بە هیچ شێوەیەک لێی جیا نەبێتەوەو بە دوورکەوتنەوەی غەمبار و دڵتەنگ بێت و لە بۆنە و جەژنەکاندا دیاری و کەل و پەلی پێشکەش دەکات و بە نەخۆش کەوتنی دڵتەنگ و بێزارو بەسەرکەوتنی دڵخۆش و کامەران دەبێت. وەک ئەوەی یەک گیان بن و لە دوو جەستەی جیاوازدا بژین .

ئەم جۆرە خۆشەویستیە بۆ یەکەم جار ئاراستەی کەسانی دەرەوەی خێزان و خودی خۆی دەکرێت، لەبەر ئەوە گرنگیەکی زۆری لە ژیانی هەرزەکاردا هەیە و دەبێت ئێمەی گەورە ئاگاداری بین و مامەڵەی پێویستی لەتەکدا بکەین .

## گرنگی دان بە توخمەکەی تر:-

لە دەورو بەری شانزدە ساڵان هەرزەکار دەچێتە قۆناغێکی ترەوەو لە گرنگی دان بە هەمان توخمی خۆی ڕزگاری دەبێت و لە جیاتی ئەوەی حەزوو ئارەزوو خۆشەویستی بۆ

توخمەکەی تر دەگوازێتەوە (کوڕ بۆ کچ). ئەوەی زیاتریش یارمەتی ئەم گواستنەوەیە دەدات گەشەکردن و پێگەیشتنی عاتیفی و سۆزی و عەقڵی هەرزەکارە .

لەم قۆناغەدا کوڕ (هەروەها کچیش) حەزوو ئارەزوویەکی عاتیفی و خۆشەویستی دەربارەی کچ لە لا دروست دەبێت و کچ بە لای ئەوەوە (یان کوڕ بەلای کچەکەوە) منداڵەکەی جاران ئەماوەو ئێستا گەورە بووەو لەش و بالای پان و گەورە بووە و زۆر گۆڕانکاری لە سنگ و جەستەو لەش و لاریدا ڕوویداوە کە سەرجەم ئەوانە دەبنە مایەی گرنگی پێدان و تێڕامانی کوڕ ئەم گرنگی و تێڕامانە هەست و سۆزی تایبەتی لە لای هەرزەکار دروست دەکات کە لەوەو پێش بەرانبەر توخمەکەی تر هەستی پێنەکردبوو .

سەرەتای حەزوو ئارەزوو گرنگی دان بە کچ و کوڕی مام و خاڵ و دراوسێ و کۆڵان دەست پێدەکات و دواتریش بۆ دەرەوەی خێزان و کۆمەڵ دەگوێزرێتەوەو لە میانەیانەوە هاوسەری ژیانی خۆی هەڵدەبژێرێ .

ئەمانەی سەرەوە گرنگترین قۆناغەکانی گەشەکردنی خۆشەویستی و حەزوو ئارەزووی سێکسین. ئینجا ئەگەر بەشێوەیەکی ئاسایی و سروشتی خۆی بڕوات هیچ مەترسیەکی تێدا نیە، بەڵام ئەگەر وەستان (تثبيت) لە یەکێك لە قۆناغەکانی سەرەوە ڕوویاندا ئەو کاتە زیان بە باری دەروونی هەرزەکار دەگەیەنێت و لە ڕێچکەی ئاسایی خۆی لایدەدات، بۆ نموونە چەق گرتن و وەستان لە قۆناغی ئێرگزی دەبێتە هۆی ئەوەی کە تاك گرنگیەکی زۆر بە خۆی بدات و تووشی لووت بەرزی و یاخی بوون ببێت و کەسێکی خۆ پەرستی لێ دەربچێت و لەخۆی زیاتر گرنگی بە کەسی تر نەدات و بۆ گەیشتن بە حەزوو ئارەزووەکانی هەموو بەرژەوەندییە گشتیەکان بکات بەژێرپێیەوە و لە دانانی پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکانیدا سەرکەوتوو نەبێت، لەلایەکی تریشەوە گرنگیەکی زۆر بە جەستەی خۆی دەدات و لەلایەنی سێکسیشەوە خوو بە دەسپەڕ (العادة السرية)ەوە دەگرێت و زیاد لە پێویست گرنگی پێدەدات (الزيادى ، ١٩٥٨، ص٧١-٨٠) .

بەڵام ئەگەر لە قۆناغی گرنگی دان بە هاوەڵان و هاو توخمی خۆی چەق بگرێت و نەتوانێت لێی رزگار بێت، ئەو كاتە ناگوێزرێتەوە بۆ قۆناغی گرنگی دان بە توخمەكەی تر، بەڵكو بە پێچەوانەوە دەبێت بە كۆیلە و عاشقی هاو توخمی خۆی كە بەمەش ژیانی گەورە بەباری دەروونی دەگات و دوورنییە تووشی لادانی سێكسی بە تایبەتی (هەتیوبازی پانی بە پانی) ببێت و ئیتر گرنگی بە توخمەكەی تر نەدات و لە ژیانی هاوسەریدا سەركەوتن بە دەست نەهێنێ. یان لەوانەیە لەسەر هەموو قۆناغی هەرزەكاری چەق بگرێت و نەتوانێت لێی دەرباز بێت، كاتێكیش دەگاتە تەمەنی كامڵی و پێگەیشتنی سێكسی هەروەك هەرزەكار دەیەوێت حەزوو ئارەزووە سێكسیەكانی لە ڕێگەی (خۆشەویستی رۆمانسی و خەیاڵی یان كپ كردنی حەزوو ئارەزووە سێكسیەكانی یان تێر كردنی نا ئاسایی و هەرزەكارانەوە) تێر بكات.

گومانی تێدا نییە، چەق وەرگرتن و مانەوە لە یەكێك لە قۆناغەكان پەیوەندی بە جۆری پەروەردەی سەردەمی منداڵی و ئەو ڕووداوو شارەزایی و كارەساتانەی كە هەرزەكار ڕوو بە ڕوویان دەبێتەوە هەیە، سەرەڕای ئەو ژینگە و بارو دۆخەی كە تاكی تێدا دەژی.

## هەرزەکار و گەشەکرنی کۆمەڵایەتی

منداڵ کاتێك ماڵئاوایی لە قۆناغی منداڵی دەکات و پێ دەنێتە قۆناغی هەرزەکارییەوە کۆمەڵێك گۆڕانکاری گرنگ لە بواری کۆمەڵایەتی و هاوکاری و ژیانی رۆژانەیدا روودەدات، لەوانە فراوان بوونی تێکەڵاو بوون و ژینگەی کۆمەڵایەتیەکەی و زیادبوونی ژمارەی هاوڕێکانی و زیاتر چوونە ناو کۆڕو کۆبوونەوەو شارەزابوونی داب و نەریت و بەها کۆمەڵایەتیەکانی. لەبەرئەوە ئەرکی سەرەکی دایك و باوك و مامۆستا و کەسانی تری چواردەوری هەرزەکارە، کە ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیانە لەبەرچاو بگرن و مامەڵەی راست و دروستی لەگەڵدا بکەن، بۆ ئەوەی وەك هەموو کەسێکی ئاسایی لە لایەنی کۆمەڵایەتیەوە گەشەبکات و نەکەوێتە گێرمەو کێشەو بگرەو بەردە، چونکە ئێستا ئەو هەرزەکارە منداڵەکەی جاران نیەو گەورە بووەو راوبۆچوونی تایبەتی خۆی هەیە.

ئینجا ئەگەر بمانەوێت ئەو هەرزەکارە بە ئاسانی و دوور لە گیروگرفت قۆناغی هەرزەکاری ببڕێت و بەسەلامەتی بچێتە قۆناغی گەورەیی و کامڵیەوەو کەسێکی بەکەڵك و بەرهەم هێنەر بێت و دووربێت لە گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی، ئەوا دەبێت زۆر بە زیرەکانە مامەڵە لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیانە بکەین کە لە قۆناغی هەرزەکاریدا روودەدەن.

هەرزەکار لە منداڵ زیاتر حەز بە ناو کۆمەڵ و کۆڕو کۆبوونەوەی گەورەکان دەکات. لەبەرئەوەی ئەو بۆچوونەی لەلا دروست بووە، کە ئەو منداڵەکەی جاران نەماوەو ئێستا گەورە بووەو هیچی لە باوك و دایك و مامۆستاو گەورەکانی تر کەمتر نیەو ئەویش دەتوانێت هەموو ئەو کارو چالاکیانە بکات کە گەورەکان بە ئاکامی دەگەیەنن، ئینجا بۆ ئەوەی ئەو راو بۆ چوونانەی بێتەدی و تووشی ململانێی دەروونی و گۆشەگیری یان شەڕخوازی نەبێت، ئەوا دەبێت بارودۆخی گونجاوی بۆ بخولقێنێدرێ و گەورەکان رێزی بگرن و لە نرخی کەم نەکەنەوەو بەچاوی سووك و منداڵی سەیری نەکرێت.

هەرزەکار لەسەرەتای قۆناغی هەرزەکاریدا جیهانێکی رێك و بێگەردو جوان بۆ خۆی دروست دەکات و ئەو بڕوایەی لەلا دروست دەبێت، کە پێویستە هەموو کەل و پەل و دیاردەکانی ژیان بێ کەمی کورتی و نووقستانی بن و لەو پەڕی (کەمال) و کاملی و رێك و پێکیدابن، وەك ئەو کەسە دەردەکەوێت کە لە دەریای خەوو خەیاڵ و نموونەیی (میسالیدا) نقووم بووبێت و بەچاوی واقعیانە سەیری ژیان نەکات، ئەمەش بە پلەی سەرەکی بۆ کەم ئەزموونی و شارەزایی هەرزەکار دەگەڕێتەوەو لایەنی سۆزو (عاتیفة) بەسەر لایەنی مەنتقی و عەقلیدا زاڵە. هەر ئەو بیرو بۆچوونە میسالی و ناواقیعیانەیە کە وای لێدەکات بەردەوام رەخنە لە کەسان و دیاردەکانی چواردەوری بگرێ.

بۆ نموونە زۆر جار هەرزەکار لە ئەنجامی ئەو بۆچوونانەیەوە لەگەڵ دایك و باوك و مامۆستاو کەسانی تری چواردەوری دەکەوێتە ململانێ و رەخنەو پلارو تیرو توانج لە جل و بەرگ و هەڵس و کەوتی دایك و باوکی دەگرێت و بە کەل و پەل و کەرەستەکانی ناو ماڵ رازی نابێت و بەردەوام داوای گۆڕین و لەناوبردنیان دەکات و بەهیوای شتی تازەو بێ کەم و کورتیە. شایانی ئاماژە بۆ کردنە هەرزەکار لەم قۆناغەدا بەئاشکرا کاریگەری پاڵەوان و کەسایەتیەکانی ناو فیلم و بەرنامەو پرۆگرامەکانی تەلەفزیۆن و سینەمای لەسەر دیارەو ناو ماڵ و جل و بەرگ و هەڵس و کەوتی دایك و باوکی بە ناوماڵ و جل و بەرگ و هەڵس و کەوتی ئەو پاڵەوان و کەسایەتیانەی ناو دەزگاکانی راگەیاندن و دەرەوەی ماڵ بەراورد دەکات و بەردەوام هەوڵدەدات کە ناو ماڵ و جل و بەرگ و هەڵس و کەوتی دایك و باوکی وەك ئەوان لێ بکات، کە بێگومان ئەمەشی بۆ ناچێتە سەرو لە ئەنجامیشدا لەگەڵ دایك و باوکی دەکەوێتە ململانێ و بگرەو بەردەو تووشی خەم و خەفەت و دڵتەنگی و هەست کردن بەکەمی دەبێت.

بەڵام ئەگەر دایك و باوکی هەرزەکار زانیاری تەواویان دەربارەی ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیانەی قۆناغی کوڕو کچەکانیان هەبێت و بەشێوەیەکی راست و دروست مامەڵەی لە تەکدا بکەن، ئەوا هیچ گیروگرفتێکی ئەوتۆ دروست نابێت و دەتوانرێت لە رێگەی

ئامۆژگاری و ڕێنمایی پێویستەوە هەرزەکار وورده وورده لە خەوو خەیاڵ و جیهانی نموونەیی و عاتیفی دوور بخرێتەوەو بە جیهانی واقیعی ئاشنا بکرێت. بۆئەوەی هەرزەکار بەسەلامەتی ئەم قۆناغە ببڕێت، ئەوا دەبێت کەسانی گەورەی چواردەوری هەرزەکار (لە پێشەوەی هەموشیان دایک و باوک) بە ئارام و لەسەرخۆو خۆراگر بن و زۆر ژیرانە گفت و گۆ لە تەك هەرزەکاردا بکەن و دیاردەکانی ژیانیان بۆ روون بکەنەوەو باسی جیاوازی نێوان واقیع و خەوو خەیاڵیان بۆ بکەن، کە بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو هەرزەکارە رۆژ لە دوای رۆژ لە ئاسمانی خەوو خەیاڵ بەرەو زەوی واقیع و ژیانی ڕاستەقینە شۆڕ ببێتەوەو لەدوا قۆناغی هەرزەکاری وەك هەموو مرۆڤێکی کامڵ و پێگەیشتوو بیر بکاتەوەو جیاوازی لەنێوان جیهانی واقیعی و جیهانی (میسالی) و خەوو خەیاڵ بکات. کەواتە ئەم گرفتە لە ڕێگەی دیالۆك و ڕاگۆڕینەوەوە چارەسەر دەکرێت نەك بە توڕەبوون و هەڕەشە و لێدان و گاڵتە پێکردنی هەرزەکار. لەبەرئەوە زۆر هەڵەیە کە باوك و دایك و کەسانی تری چواردەوری هەرزەکار تووندوتیژی و سووکایەتی پێکردن بەکاربهێنن، چونکە ئەوە نەك چارەسەری گرفتەکە ناکات بەڵکو ئاڵۆزتریشی دەکات.

هەروەها دیاردەی بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتی دایك و باوك و مامۆستا لەسەرەتای قۆناغی هەرزەکاری، یەکێکە لەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیانەی کە چەکەرە دەکات و رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر گەشە دەکات، تا دەبێت بەخاسیەتێکی قۆناغی هەرزەکاری. واتە هەرزەکار منداڵەکەی جاران نەماوە، تا ئێمەی گەورە بە ئارەزووی خۆمان بیهێنین و بیبەین و چی پێبڵێین رازی بێت و بێ سێ و دوو گفت وگۆ جێبەجێی بکات. کەواتە ئەو دایك و باوك و مامۆستایانەی وا دەزانن کە هەرزەکار هەر منداڵەکەی جارانە، ئەوا بێگومان بە هەڵەدا چوون و لەگەڵ هەرزەکارەکاندا رووبەرووی زۆر کێشەو گیروگرفت دەبنەوە.

ئینجا ئەگەر بمانەوێت هەرزەکار یاخی نەبێت و رووبەرووی گەورەکان نەوەستێت، ئەوا دەبێت ڕێزی بگیرێت و گوێ لە قسەو راوبۆچوونەکانی بگیرێ، بەڵام ئەگەر ئێمەی گەورە ڕێزی راوبۆچوونی هەرزەکارمان نەگرت و ویستمان راوبۆچوونی خۆمان بەسەریدا

بەپێنێن و بەردەوام وەك منداڵ مامەڵەمان لەگەڵ کردو بەربەست و ڕێگرمان لەبەردەم ئەرزوو ئارەزوو پێداویستیەکانیدا دروست کرد، ئەوا ئەو کاتە ڕازی نابێت و دوورنیە ڕووبەڕووشمان بووەستێتەوە یان ماڵ و قوتابخانە بەجێ بهێڵێ و ملی کۆڵان و شوێنەگشتی و نابەجێکان بگرێتە بەرو کەسێکی لاسارو سەرە ڕۆو لوڕ دەربچێت، کەئەمەش زیان بە کەسایەتی و باری دەروونی و لایەنی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی هەرزەکار دەگەیەنێت.

لە قۆناغی هەرزەکاریدا ڕۆڵی برادەرو هاوڕێ بە ئاشکرا لە ژیانی هەرزەکاردا دەردەکەون و زۆر جار کاریگەری ئەو برادەرانەی لە کاریگەری خێزان زیاتر دەبێت و هەرزەکار بە ئاسانی گوێ ڕایەڵیان دەبێت و بە قسەیان دەکات، بە تایبەتیش لە لای ئەو هەرزەکارانەی کە ژیانی خێزانیان ئاڵۆزەو پەیوەندیان لەگەڵ دایك و باوك و مامۆستاکانیان خۆش نیە. لەبەر ئەوە دەبێت دایك و باوك لە نزیکەوە ئاگاداری هەرزەکارەکانیان بن و ژینگەی کۆمەڵایەتی گونجاوو دروست بۆ گەشەکردنی ئاساییان بخولقێنن، بۆ ئەوەی هەست بە بێزاری و نامۆبوون نەکەن و بە ناچاری پەنا بۆ ئاو برادەری خراپ نەبەن.

چونکە ئەگەر هەرزەکار لەناو خێزان و قوتابخانە هەستی بە ئاسایش و دڵنیایی نەکردو ڕێزی نەگیرا، ئەوا دوور نیە کە پەنا بۆ جۆرەها کۆمەڵ و لایەن و دەستەو تاقم ببات، بەو هیوایەی کە لەناویان هەست بە ئاسایش و دڵنیایی و ڕێزگرتن بکات، کە بە داخەوە زۆر جاریش وا دەرناچێت و بگرە پێچەوانەکەشی دەردەچێت و ئەو جۆرە هەرزەکارانە دەقۆزرێنەوەو بۆ مەبەست و کاری تایبەتی بەکاردەهێنرێن، ئەوەی جێگەی داخیشە باری دەروونی ئەو جۆرە هەرزەکارانە بۆ قۆستنەوەو بەکارهێنانیان بۆ کاری نادروست زۆر لە بارن و دەرەنجامی هەموو توێژینەوە زانستیەکانیش ئەوەیان سەلماندووە کە زۆربەی زۆری ئەو هەرزەکارو مێرد منداڵانەی کە تووشی لاساری و سەرەڕۆیی دەبن، لەو جۆرە خێزانانەدا پەروەردەبوون کە لێك ترازاوو پڕ لە گیروگرفت و ناخۆشی بوون.

گرنگی دان بە جل و بەرگ و روالەت یەکێکە لەو دیاردە کۆمەلایەتیانەی کە لەسەرەتای قۆناغی هەرزەکاری سەرهەلدەدات، واتە هەرزەکار حەز بە جۆرەها جل و بەرگی زەق و رەنگاو رەنگ و سەرنج راکێش دەکات و هەولدەدات لاسایی پالەوان و کەسانی گرنگی ناو فیلم و بەرنامەو پرۆگرامەکانی تەلەفزیۆن و سینەما بکاتەوە، هەروەها کچان زۆر حەز بەخۆ جوان کردن و رازاندنەوەو بەکارهێنانی داوودەرمان و بۆیەو (کەمالیات) و روالەت دەکەن، چونکە ئەم قۆناغە قۆناغی گەشەکردنی حەزوو ئارەزووی سێکسی و عاتیفیەو هەر توخمەو دەیەوێت سەرنجی توخمەکەی تر بۆ لای خۆی رابکێشێت.

ئینجا یەکێك لەو لایەنانەی کە هەرزەکار گرنگی پێدەدات و لە میانەیەوە سەرنجی توخمەکەی تر بۆلای خۆی رادەکێشێت، لایەنی جەستەیی و روالەت و جل و بەرگ و خۆرازاندنەوەیە، کە ئەمەش زۆر جار گیروگرفت بۆ هەرزەکارو دایك و باوك و کەسانی تر دروست دەکات، بە تایبەتیش لەو جۆرە خێزانانەی کە هەژارو دەست کورتن و هەرزەکار بە ئاسانی ئەو حەزوو ئارەزووەی بۆ تێر ناکرێت و لە ئەنجامیشدا هەست بە کەمی و خەم و خەفەت و ئازارو دلتەنگی دەکات و دووریش نیە خوانەخواستە کەسانی داوێن پیس هەندێك لەو کچە هەرزەکارانە (کە بێ چاودێری و رێنمایی گەورەکانیانن) هەلبخەلەتێنن و بە بیانووی جل و بەرگ و روالەت لەخشتەیان بەرن.

هەروەها لە ئەنجامی ئەم دیاردەیەوە گیروگرفتێکی تریش سەر هەلدەدات، ئەویش ئەوەیە کە هەندێك دایك و باوك و مامۆستا لە ئەنجامی نەشارەزاییان و نەبوونی زانیاری پێویست دەربارەی ئەم قۆناغە، دەست دەکەن بە رەخنەو تیرو توانج تێگرتنی هەرزەکارو ناوو ناتۆرە لێنانیان و گومان لێکردنیان، کە بەداخەوە هەندێك دایك و باوك سووکایەتی بە هەرزەکارەکانیان دەکەن و بواری تێرکردنی ئەو جۆرە حەزوو ئارەزووەیان بۆ ئارەخسێنن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی دروست کردنی گیروگرفت (Bee, 2000, P:326).

پێویستە دایک و باوک ئەوە بزانن کە حەزکردن بە خۆڕازاندنەوەو رواڵەت یەکێکە لە خاسیەتەکانی قۆناغی هەرزەکاری و پێویستە لە رێگەی رێنمایی و ئامۆژگاری و گفت و گۆوە وردە وردە لەو دیاردەیە رزگار بکرێت و پاش ماوەیەکیش هەرزەکار خۆی وازیان لێدەهێنێ و ئیتر زیاتر گرنگی بە ناوەرۆک دەدات و لە رواڵەت و روکەش دووردەکەوێتەوە، بەلام هەردەبێت بۆ ماوەیەك بواری تێرکردنیان بۆ بڕەخسێندرێ و نابێت بەهیچ شێوەیەکیش توندوتیژی و سووکایەتی پێکردن بەکاربهێندرێت.

لە لایەکی تریشەوە بیرکردنەوە لە هەڵبژاردنی پیشەو کارێکی گونجاو یەکێکی ترە لەو مۆرك و سیما کۆمەڵایەتیانەی کە لە قۆناغی هەرزەکاریدا سەرهەڵدەدات و بوارێکی زۆر لە دڵ دەروونی هەرزەکار داگیردەکات و بەزۆری بیری لێدەکاتەوە، کەواتە دەبێت لە قوتابخانەو خێزان بواری هەڵبژاردن و دەست نیشانکردنی پیشەو کارێکی گونجاو بۆ هەرزەکار بخولقێندرێ و ئاسانکاری و رێنمایی پێویست بکرێت، واتە ئەرکی دایک و باوک و مامۆستاو کەسانی تری چواردەوری هەرزەکارە کە زانیاری پێویست دەربارەی جۆری خوێندن و پیشەکان بە هەرزەکار پێش کەش بکەن، بۆ ئەوەی هەرزەکار بە حەزو ئارەزووی خۆی و بەرێنمایی دایک و باوك و مامۆستا جۆری خوێندن و پیشەو کاری پێویست هەڵبژێرێ.

کەواتە زۆر هەڵەیە کە دایک و باوك و مامۆستا هەرزەکار ناچار بکەن کە جۆرێك لە خوێندن یان پیشەیەکی دیاریکراو هەڵبژێرێ. هەروەها لەم قۆناغەدا کەسانی دەرەوەی خێزان کاریگەریان لەسەر کەسایەتی و باری دەروونی هەرزەکار لە دایک و باوك زۆرتردەبێت، لەبەرئەوە زۆر گرنگە کە دایک و باوك هەوڵی ئەوە بدەن کە باشی و خراپی ئەو کەسانەی دەرەوەی خێزان بۆ هەرزەکارەکانیان روون بکەنەوەو سوودیان لێ وەربگرن.

ئەوە ماوە بڵێین کە گەشەکردنی کۆمەڵایەتی هەرزەکار پێویستی بە بارو دۆخ و ژینگەی گونجاو هەیە و دەبێت دایک و باوك و کەسانی چواردەوری هەرزەکار رەچاوی ئەو

گۆرانکاریە کۆمەلایەتیانە بکەن کە لە قۆناغی هەرزەکاری روودەدات، هەروەها ئەرکی سەرەکی دایک و باوکە کە سەربەستی بدەن بە کورو کچە هەرزەکارەکانیان بۆ ئەوەی لەژێر چاودێری ئەواندا بە ویستی خۆیان برادەرو و پیشەو جۆری خوێندن و هاوسەری ژیانی خۆیان هەلبژێرن. واتە سەربەستی بدرێت بە هەرزەکار تا ئەو کاتەی خەریکە هەلە دەکات، دوای ئەوە پێویستە دایک و باوک ئامۆژگاری و رێنمایی پێویستی بکەن و لە هەلەکان دووری بخەنەوە.

## جۆرەکانی خێزان و رەنگدانەوەیان لەسەر باری دەروونی هەرزەکار

وەك چۆن زۆربەی دیاردەکانی ژیان جۆراوجۆرو هەمە چەشنەن، بە هەمان شێوەش پێکهاتەکانی خێزان و شێوازی مامەڵەکردنیان لەگەڵ منداڵەکانیان جۆراوجۆرن، دەرئەنجامی چاوپێکەوتن و توێژینەوە زانستیەکان ئاماژە بۆ بوونی جۆرەها خێزانی جیا جیا دەکەن. واتە هەر یەکەیان بە شێوازێك مامەڵە لەگەڵ تاکەکان دەکات کە جیاوازە لە ئەوانی تر.

### لە گرنگترین جۆرەکانی خێزان ئەمانەی لای خوارەوەن:-

### ئەو خێزانانەی کە منداڵەکانیان بێزراوو پشت گوێ خراون:-

ئەوەی جێگەی داخە ژمارەیەك لە خێزانەکان لەم جۆرەن، واتە زۆربەی کات منداڵەکانیان ترۆو پشت گوێ دەخەن و جێگەی رەزامەندی نین و باوك و دایك رێزو سۆزوخۆشەویستی پێویست بە منداڵەکانیان نادەن، هەندێك جار یان دایك یان باوك لەو جۆرەیە، هەندێك جاری تریش هەردووکیان.

کەواتە لەم جۆرە خێزانانەدا منداڵ و هەرزەکار کەمترین گرنگیان پێدەدرێت و دایك و باوك یان یەکێکیان زۆر بەسەر منداڵەکانیدا زاڵەو، هەندێك جاریش رقیان لێیانە. هەندێك جاریش دایك و باوك لە ئەنجامی پشت گوێ خستن و سووکایەتی پێکردنی منداڵەکانیانەوە هەست بۆ گوناهو ئازاری ویژدان دەکەن، لەبەر ئەوە بۆ رازی کردنی ویژدانیان و رزگاربوون لە هەست کردن بە گوناه، دەست دەکەن بە پێدانی سۆزو خۆشەویستی زیاد لە پێویست، یان ئاسانکاری زیاد لە پێویست و شل کردنی سەری پەت و حەبلەکە بۆیان ، کە بێگومان هەردوو حاڵەتەکە خراپەو بە زیانی هەرزەکارو منداڵەکانی تر تەواو دەبێت. گومانی تێدا نییە هۆکاری زۆر هەیە بۆ پشت گوێ خستنی ئەو جۆرە دایك

و باوکە و هەڵنەستانیان بە ئەرك و رۆڵی دایکایەتی و باوکایەتی، بەلام ئەوەی لە هەموویان گرنگترە، ئەوەیە کە ئەو جۆرە دایك و باوکانە کەسانی پێگەیشتوو کامڵ نین لەلایەنی هەڵچوونیەوە، سەرەڕای ئەوەش بنەمەکانی سەرکەوتنی ژن و مێردایەتیان لاوازەو توانای خۆ سازاندنیان لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەیان زۆر لاوازە.بێگومان ئەو جۆرە خێزان و مامەڵەی دایك و باوکە رەنگدانەوەی خراپی لەسەر کەسایەتی و باری دەروونی هەرزەکار هەیە لەوانە:-

لە داهاتوو منداڵەکانیان، (بەتایبەتیش لە قۆناغی هەرزەکاری) هەست بە ئاسایش و دڵنیایی ناکەن و زۆربەی کات ڕاڕاو دوودڵ و بەگومان دەبن.

زۆر جار لەوانەیە رەفتاری منداڵ و هەرزەکارەکانیان ناکۆمەڵایەتی بێت و نیشانەکانی وەك (پەلاماردانی کەسانی تر، دزی، درۆ، پەرتەوازە بوون، لادان و شەڕخوازی) ببن بە بەشێك لە کەسایەتیان. دەروونزانێك کە ناوی (وولبری)یە لەم بارەیەوە دەڵێت {رق و کینە، بەردەوام دەتوانێت نەهێڵێت هەرزەکار خۆی لەگەڵ ژیان بگونجێنێت، ئەویش لەبەر ئەوەی لە هەست کردن بە دڵنیایی و ئاسایش بێبەشی دەکات و بڕوا بەخۆبوونی تێك دەشکێنێ و گەشەکردنی (خودی) دەشێوێنێت} (زیدان، ١٩٩٤، ص ١٧٦). نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت، کە زەحمەترین و دژوارترین کار ئەوەیە کە چارەسەری ئەو هەرزەکارانە بکرێت کە لە ئەنجامی بێزران و پشت گوێ خستنەوە تاڵ و سوێری زۆریان چەشتووە، لە هەمان کاتیشدا دەرکەوتووە کە ژمارەیەکی زۆریان تووشی لادان و لاساری بوون و ناویان لە تۆماری خانەو دادگای ئەوجەوانان و مێرد منداڵاندا پارێزراوە.

ئەو خێزانانەی كە لە منداڵ و هەرزەكارەكانیان رازین و سۆزو خۆشەویستیان دەدەنێ:-

ئەم جۆرە خێزانانە پێچەوانەی جۆری یەكەمن، واتە هەرزەكار پلەو پایەو جێگای تایبەتی خۆی هەیە و مایەی رێزی دایك و باوكە، بێگومان زۆربەی زۆری ئەم جۆرە باوكانە لە كاتی خۆیدا لەسەر دەستی دایك و باوكی بەبەزەیی و دڵ گەورە پەروەردە بوون و ئەوانیش لەسەردەمی منداڵیدا لەسەر دەستی دایك و باوكی بە وەفاو پەروەردیار گەورە بوون و كەش و هەوای خێزانەكانیان پڕ بووە لە خۆشەویستی و رێزگرتن و دڵسۆزی و مامەڵەی دروست، واتە پەروەردەی راست و دروست، باوك ودایكی راست و دروستت بۆ بەرهەم دێنی. هەر لەمبارەیەوە (سیموند)ی زانا دەڵێت (هاووڵاتی باش و دڵسۆز، زانایان، كرێكارانی خێرخواز، هاوسەری سەركەوتوو، دایك و باوكی بەختەوەر، ... هتد) لەو جۆرە خێزانانەوە دێن و دروست دەبن كە تیایدا منداڵ بەرێزەو دایك و باوك بە پەرۆشن بۆیان) (زیدان، ١٩٩٤، ص١٧٦).

ئەو خێزانانەی كە دیكتاتۆرن و هەرزەكارەكانیان دەچەوسێننەوە:-

لەم جۆرە خێزانانەدا زۆربەی كات دایك و باوك (یان یەكێكیان) خۆیان بەسەر هەرزەكارەكانیاندا دەسەپێنن و كارو چالاكی و سنووری كاركردنیان بۆ دیاری دەكەن و كەمترین كەمتەرخەمی و هەڵەی هەرزەكار دەبێتە مایەی لێدان و تووندوتیژی و چاو سووركردنەوەو هەڕەشە لێكردن، هەر لەبەر ئەوەشە بەردەوام هەرزەكارو منداڵانی ئەو جۆرە خێزانانە مل كەچی داواكارییەكانی دایك و باوكیان دەبن، نەك بە ئارەزووی خۆیان یان لەبەر رێزگرتنی دایك و باوك، بەڵكو لە ئەنجامی ترس و هەڕەشە، هەر لەبەر ئەوەشە كاتێك دایك و باوك وەك سەرچاوەی ترس و تۆقین دیار نابن، منداڵ و هەرزەكارانی ئەو جۆرە خێزانانە وەك ئاوێكی زۆری پەنگ خواردوو بەسەر كەسان و دیاردەكانی چواردەوریاندا دەتەقنەوەو زیانیان پێدەگەیەنن، بەلام لەكاتی دووبارە

دەركەوتنەوەی دایك و باوك (سەرچاوەی ترس) دووبارە منداڵ و هەرزەكارەكانیان زۆربەی ویست و داواكاری و راوبۆچوونەكانیان دەشارنەوەو هەوڵی كپ كردنیان دەدەن.

هەندێك جار ئەم جۆرە دایك و باوكانە گرنگی بە منداڵەكانیان دەدەن و خۆشیشیان دەوێن، بەڵام بەردەوام ناچاریان دەكەن مل كەچی داواكاریەكانیان بن و لەژێر ركێف و كۆنترۆڵی ئەواندا بن. لەبەر ئەوەی لەو بڕوایەدان كە ئەو جۆرە مامەڵە و مل كەچ كردنە لەبەرژەوەندی هەرزەكارەكانیانە، بێگومان زۆربەی ئەم باوك و دایكانە لە كاتی خۆیدا لەسەر دەستی دایك و باوكی وەك خۆیان پەروەردە بوون و بە هەمان شێوە مامەڵەیان لەگەڵ كراوە، بۆیە ئەمانیش ئێستا لاسایی ئەوان دەكەنەوەو ڕێچكەی ئەوانیان گرتووە.

<u>شایانی ئاماژە بۆ كردنە، ئەم جۆرە مامەڵەیەش ڕەنگدانەوەی خراپی لەسەر كەسایەتی منداڵ و هەرزەكارەكانیان هەیە لەوانە:-</u>

پشت نەبەستن بەخۆ راستە زۆر منداڵی ئەو جۆرە خێزانانە لە ترسی هەڕەشەو لێدان بێدەنگ و لەسەرخۆ و بێ ئاژاوە دادەنیشن، بەڵام كاتێك گەورە دەبن و دەچنە ناو قۆناغی هەرزەكارییەوەو بواری ئەوەیان دەبێت سەربەست و ئازاد بن، ناتوانن تام و چێژو خۆشی لەو ئازادی و سەربەستیەیان وەربگرن، لەبەر ئەوەی لەكاتی خۆی، واتا لە قۆناغی منداڵی رانەهێنراون و بواری ئازادی و سەربەستییان نەبووە، لەبەر ئەوە لە قۆناغی هەرزەكاریدا ڕووبەڕووی زۆر كێشەو گیروگرفت دەبنەوەو هەست بە كەمی و رارایی دەكەن. زۆربەی جار هەرزەكارانی ئەو خێزانانە دوور لە چاودێری دایك و باوكیان كەسانی توندوتیژو شەڕانی دەبن و كەسانی تری لەخۆیان لاوازتر دەكەن بە قۆچی قوربانی و تۆڵەی خۆیان لە ئەوان دەكەنەوە.

هەندێك جار بە ئاسانی هەڵدەخەڵەتێندرێن و لەلایەن برادەری خراپەوە دەقۆزرێنەوەو بەرەو خراپەو لاساریان دەبەن، هەر لەبەر ئەوەشە زۆرجار هەرزەكارو لاوانی

ئەو جۆرە خێزانانە بەندو دادگایی دەکرێن و تاوان و لاساری دەکەن، هەرچەندە خێزانەکانیان لە ئاستێکی بەرزی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئابووریشدان و لە هیچ شتێکیان کەم نییە، تەنها ئەوە نەبێت کە لە خێزانێکی توندو تیژو دیکتاتۆردا پەروەردە بوون.

## ئەو خێزانانەی کە زیاد لە پێویست گرنگی بە منداڵەکانیان دەدەن:-

لەم جۆرە خێزانانەدا زیاد لە پێویست گرنگی بە منداڵ و هەرزەکار دەدرێت و هەندێک جار دایک و باوک منداڵەکانیان نقومی ناو خۆشەویستی و گرنگی پێدانی زیاد لە پێویست دەکەن و گرنگیەکی زۆریان پێدەدەن، تا ئەو رادەیەی کە کاتێک دەچنە قۆناغی هەرزەکارییەوە، دایک و باوک هەر بە چاوی منداڵی سەیریان دەکەن و ئەو بڕوایەیان لەلا دروست نابێت کە منداڵەکانیان گەورەبوون و پێویستە کەمێک سەربەستی و ئازادی و سەربەخۆییان بدەنێ، کە بێگومان بەم رەفتارو مامەڵانەیان نایەڵن منداڵەکانیان وەک پێویست گەشە بکەن و کەم و کورتی زۆر دەکەوێتە کەسێتی و باری دەروونیانەوە.

هەندێک جاریش ئەو جۆرە دایک و باوکانە ئاسانکاری زۆر بۆ منداڵەکانیان دەکەن و چاو پۆشی لە زۆر لە هەڵەو سەرەڕۆییەکانیان دەکەن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵەکانیان لە داهاتوودا کەسێتیەکی سەرکەوتوو پتەویان نەبێت. دەرئە نجامی زۆر لە توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە منداڵان و هەرزەکارانی ئەم جۆرە خێزانانە لە داهاتوودا سەرکەوتوو نابن و بڕوایان بە خۆیان نابێت و بەچاوی گومان و دوودڵی سەیری خۆیان و تواناکانیان دەکەن، هەروەها توانای کۆنترۆڵ کردنی هەڵچوونەکانیان نابێت، لەبەر ئەوەی گرنگی دانی زیاد لە پێویست جۆرێکە لە دیکتاتۆریەت و کۆنترۆڵ کردن کە ناهێڵن منداڵ و هەرزەکارەکان وەک پێویست فێری دیاردەکانی ژیان ببن و وەک منداڵانی تر تاووتوێیان بکەن، هەر لەبەر ئەوەشە هەرزەکارو لاوانی ئەو جۆرە خێزانانە لەبەر

پرسیاریەتی رادەکەن و حەز بە تەنیایی و گۆشەگیری دەکەن و وەک تاکێکی کامڵ و پێگەیشتوو رەفتار ناکەن و بەسەر کۆسپ و تەگەرەکانی ژیاندا زاڵ نابن.

## خێزانی دیموکراسی خواز:-

لەم جۆرە خێزانانەدا زۆربەی شتەکان روون و ئاشکران، واتە باوک و دایک رۆڵ و ئەرک و فەرمانەکانی خۆیان بە باشی دەزانن و لە هەمان کاتیشدا منداڵەکان سنووری رەفتارو ماف و ئەرکەکان دەزانن. سەرجەم ئەندامانی ئەم جۆرە خێزانانە بەپێی پرانسیپ و بنەمای تایبەتی رەفتار دەکەن و ئەگەر منداڵەکان هەڵەو لاسارییەکیان کرد ئەوا رووبەرووی سزاو سەرزەنشت و گلەیی دەبنەوە، بەلام لە هەمان کاتیشدا ئەگەر کاری چاکەو سوود بەخشیان کرد ئەوا پاداشت و سوپاس دەکرێن. بێگومان ئەم جۆرە خێزانانەش وەک هەموو جۆرەکانی تری خێزان رووبەرووی کێشەو گیروگرفت دەبنەوە، بەلام جیاوازی سەرەکی ئەوەیە کە کێشەو گیروگرفتەکانی ئەم جۆرە خێزانانە ئاساییەو ماوەیەکی زۆر بەردەوام نابێت و رێگا چارەی گونجاوی بە هەموو لایەك بۆ دەدۆزنەوە. لەم جۆرە خێزانانە دایك و باوك ئەو راستیە باش دەزانن کە هەر منداڵەو کەسایەتی تایبەتی خۆی هەیە و حەزوو ئارەزووی وەك ئەوانی تر نییە، لەهەمان کاتیشدا منداڵ لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر دەچێت و گۆرانکاری بەسەردا دێت و رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر گەشە دەکات و بەرەو هەرزەکاری و لاوێتی و کاملی دەچێت.

هەر لەبەر ئەوەشە شێوازی پەروەردە کردن و جۆری مامەڵەکردنیان بە پێی کەسایەتی و قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵەکانیان دەگۆرن، لە هەمان کاتیشدا دایك و باوکی ئەم جۆرە خێزانە منداڵەکانی خۆیان خۆش دەوێت، بەلام نە زیاد لە پێویست گرنگیان پێدەدەن نە پشت گوێشیان دەخەن، بەڵکو بە چاوێکی بابەتیانەو واقیعانە سەیریان دەکەن. هەر لەبەر ئەوەشە منداڵ و هەرزەکارانی ئەم جۆرە خێزانانە لە داهاتوودا کەسایەتی پتەویان

دەبێت و لە ژیانی واقیعیاندا سەرکەوتوو دەبن و بەچاوی ڕێزو گرنگی سەیری خودی خۆیان دەکەن و بڕوای تەواویان بە خۆیانەو بە زۆری لە گرفت و کێشەی دەروونی بە دوور دەبن.

سەرکەوتوویی ئەم جۆرە خێزانانە لەوە دایە کە بە پێی سیستەمێکی دیموکراتیانە کار دەکەن و ماف و ئەرک و ڕۆڵی هەموو یەکێک دیاری کراوو پارێزراوەو کەس سنووری ئەوی تر نابەزێنێ و مافەکانی پێشێل ناکات.

## هەرزەکار لە نێوان حەزوو ئارەزووە تایبەتیەکانی و حەزوو ئارەزووی دایک و باوک و هۆکارە دەرەکیەکان

حەزوو ئارەزوو بەشێکە لە کەسایەتی مرۆڤ و ڕەنگ دانەوەی خۆی لەسەر ڕێچکەی ژیانی مرۆڤ هەیە، واتە ئەگەر مرۆڤ سەرکەووتوو بوو لە تێرکردنی حەزوو ئارەزووەکانی و ئەو تێرکردنەش لەتەک توانستە عەقلی و جەستەیی و هەڵچوونیەکانیدا چوون یەک بوون ئەو کاتە تاک لە ژیانیدا سەرکەوتوو دەبێت و لە تواناییدا دەبێت کە خۆی لەگەڵ کۆمەڵەکەی بسازێنێ، بەلام ئەگەر حەزوو ئارەزووەکانی لەتەک توانستە عەقلی و هەڵچوونی و جەستەییەکانیدا چوون یەک نەبوون، واتە حەزوو ئارەزووی لە پیشەو جۆرە خوێندنێکە کە توانای عەقلی یان جەستەیی یان هەڵچوونی لەتەکیدا ڕێک ناکەوێت، بۆ نموونە هەندێک پیشەو بواری خوێندن پێویستیان بە ڕێژەیەکی زۆر لە زیرەکی و توانستی عەقلی تایبەتی هەیە، کە ئەگەر مرۆڤ حەزیشی لێیان بێت بەلام ئەو زیرەکی و توانستە عەقلیە تایبەتیەی نەبێت، ئەوا تیایاندا سەرکەوتوو نابێت، ئەمەش مانای ئەوەیە کە حەزوو ئارەزوو بەتەنها نابنەمایەی سەرکەوتنی تاک، لە هەمان کاتیشدا زیرەکی و توانستی عەقلی و هەڵچوونی و کۆمەلایەتی و جەستەیی پێویستیش بە تەنها نابنە مایەی بەختەوەری و کامەرانی مرۆڤ ئەگەر بێت و حەزوو ئارەزوو هاوشانیان نەبن، واتە ئەگەر هەرزەکارێک توانای جەستەیی و بەرزی بالآیی و بە هێزی ماسوولکەکانی بۆ پیشە و جۆرە یارییەک گونجاون، بەلام بە هیچ شێوەیەک حەزوو ئارەزووی لەو پیشەو جۆرە یارییە

نییە، کەواتە ئەگەر ناچار بکرێت کە ئەو پیشەیە بۆ خۆی هەڵبژێری یان ئەو جۆرە یارییە بکات، ئەو کاتە بە تەواوی سەرکەوتنی تیادا ناهێنێ و خۆشی و کامەرانیشی دەست ناکەوێت. کەواتە سەرکەوتووترین هەڵبژاردن ئەو جۆرە هەڵبژاردنەیە کە حەزوو ئارەزووی هەرزەکار لەتەک توانست و بەهرەکانیدا چوون یەک دەبن.

ئینجا لێرەدا پرسیارێک سەر دەردێنێ، ئەویش ئەوەیە ئایا بارودۆخی کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسی و رۆشنبیری ئێمە لەو ئاستە دایە کە هەرزەکارەکانمان بتوانن رەچاوی ئەو خالانەی سەرەوە بکەن و بەجۆرێک پیشەو جۆری خوێندن بۆ خۆیان هەڵبژێرن کە لە لایەک حەزوو ئارەزووەکانیان تێر بکەن و لەلایەکی تریشەوە لەتەک تواناو بەهرەکانیاندا بگونجێن؟ گومانی تێدانییە کە هەرزەکاری ئێمە بەو ئاسانییە ناتوانێت پیشەو جۆری خوێندنی گونجاو بۆ خۆی هەڵبژێری، لەبەر ئەوەی کۆمەڵێک فاکتەری دەرەکی و ناوەکی هەن کە کاردەکەنە سەر بڕیارەکانی هەرزەکار، لە هەمووشیان گرنگتر ئەمانەی لای خوارەوەن :-

**حەزوو ئارەزووی دایک و باوک :-**

لە گرنگترین گیروگرفتەکانی هەرزەکاری ئێمە ئەوەیە کەزۆر جار دایک و باوک دەست دەخەنە ناو کاروباری کورو کچە هەرزەکارەکانیانەوەو دەیانەوێت جۆرە پیشەوکارێک یان خوێندنێک هەڵبژێرن کە لە تەک حەزوو ئارەزووی ئەواندا دەگونجێت نە ک لەتەک حەزوو ئارەزووی کوڕ و کچە هەرزەکارەکانیان، کە بەمەش زیانێکی گەورە بە باری دەروونی و چارەنووسی رۆڵەکانیان دەگەیەنن. بێگومان ئەم دەست تێوەردانەی دایک و باوک بۆ زۆر هۆکار دەگەڕێتەوە لەوانە :-

هەندێک دایک و باوک لەسەردەمی هەرزەکاری و لاوێتی خۆیاندا ئاواتە خوازی ئەوە بوون کە کۆلێژێکی دیاریکراو تەواو بکەن یان پیشەوکارێکی دیاری کراو یان جۆرە یارییەک

هەڵبژێرن، بەڵام لەبەر هەر ج هۆیەك بێت نەیانتوانی لەسەردەمی هەرزەکاری و لاوێتیاندا ئەو ئاوات و حەزوو ئارەزووانەیان بهێننە دی هەرچەندە پیشەو جۆرە یاری و خوێندنێکی تریان هەڵبژارد (یان نەیانتوانی خوێندن تەواو بکەن) بەڵام حەزوو ئاواتە تێر نەکراوەکانی سەردەمی رابردوویان هەر ماوەو لە ناخیاندا بەجۆرێك رەگ و ریشەیان داکوتاوە کە ناتوانن لەبیریان بکەن، هەندێك جاریش لە بواری هەستیاندا نەماوەو بە کپ و خەفەکراوی لە بواری نەستیاندا (اللاشعور) خۆیان حەشار داوە.

لە ئەنجامی ئەو حەزوو ئارەزوو ئاواتە خەفە کراوو تێر نەکراوانەیان، ناچار دەبن بە شێوەیەکی هەستی بێت یان نەستی پاڵ بە کوڕ و کچە هەرزەکارەکانیانەوە بنێن و حەزوو ئارەزووی خۆیان بەسەریان بسەپێنن و ناچاریان بکەن کە ئەو پیشە و بواری خوێندنە هەڵبژێرن کە ئەوان لە کاتی خۆیدا ئاواتە خوازی بوون، کە زۆر جار زیانی گەورە بە پاشەرۆژی منداڵەکانیان دەگەیەنێت لەبەر ئەوەی مەرج نییە حەزوو ئارەزووی منداڵەکانیان وەك حەزوو ئارەزووی ئەوان بێت، یان لەوانەیە زیرەکی و توانستە عەقلی و جەستەیی و هەڵچوونەکانیان بۆ ئەو جۆرە خوێندن و پیشانە گونجاو نەبێت و دواجاریش سەرکەوتنی تێدا نەهێنن.

لەبەر ئەوە زۆر پێویستە کە دایك و باوك دەست نەخەنە ناو کاروباری خوێندن و پیشەو کاری منداڵ و هەرزەکارەکانیانەوە. بەڵکو سەربەستی بە منداڵەکانیان بدەن و لە هەمان کاتیشدا رێنمایی و ئامۆژگاری پێویستیان بکەن بەڵام، نابێت حەزوو ئارەزووی خۆیانیان بەسەردا بسەپێنن .

<u>ژینگەی کۆمەڵایەتی و خێزانی</u>. جاری وا هەیە دایك و باوك لە باب و باپیرانیانەوە جۆرە پیشەو کارێکیان بۆ ماوەتەوە، ئەوانیش بۆ ئەوەی ئەو پیشەوکارەی باب و باپیرانیان هەر بە نەمری بمێنێتەوە، رۆڵەکانیان ناچار دەکەن کە هەر ئەو نیش و

پیشانە بکەن و تەنانەت خوێندنیش هەر لەو بوارەدا تەواو بکەن، کە زۆر جاریش ئەمە دژ بە حەزوو ئارەزووی کوڕو کچە هەرزەکارەکانیانە .

**هۆکاری جوگرافی:-**

مەبەست لە هۆکاری جوگرافی ئەو جێگەو ئاوو هەوایەیە کە مرۆڤ تیایدا دەژی، هەموومان دەزانین جیاوازی لە نێوان ژینگەی شاخ و ژینگەی دەشت و دەرو ژینگەی بیابان دا هەیە، هەروەها جیاوازیش لە نێوان ژینگەی ساردو ژینگەی گەرمدا هەیە، هەندێک جار ئەو جیاوازیەش جۆرە کارو پیشەو خوێندنێک بەسەر دانیشتوانەکەیدا دەسە پێنێت، ئیتر حەزی لێی بێت یان حەزی لێی نەبێت .

**کەم شارەزایی هەرزەکار:-**

مەرج نییە هەموو هەرزەکارێك حەزوو ئارەزووەکانیان راستیەکان بپێکن، تەنانەت زۆر جار پەی بە توانا و بەهرەکانیشیان نابەن لەبەر ئەوە دەکەونە هەڵەوەو پیشەوکارو جۆری خوێندنێك بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن کە لەتەك تواناو لێهاتووەکانیاندا ناگونجێت و دواتریش تووشی گێروگرفت دەبن، دەرکەوتووە زۆربەی هەرزەکاران لە سەرەتای هەرزەکاریدا دەکەونە هەڵەوەو زۆر پەلە لە دیاریکردن و هەڵبژاردنی جۆری خوێندن و کارەکانیاندا دەکەن، ئینجا لەبەر ئەوەی زانیارییان کەمەو بە پەلەشن، بۆیە دەکەونە هەڵەوە، ئا لەم کاتانەدا رابەری پەروەردەیی و مامۆستای ناوەندی و دواناوەندی رۆڵی سەرەکیان هەیە و دەبێت رێنمایی و ئامۆژگاری پێویستی قوتابیە هەرزەکارەکان بکەن.

مامۆستاو رابەری پەروەردەیی بەردەوام مامەڵە لەگەڵ قوتابیە هەرزەکارەکان دەکەن و رۆژانە وانەیان پێدەڵێنەوەو رێنماییان دەکەن، لەبەر ئەوە ئەوەندە زانیاری و شارەزاییان لەلا گەڵاڵە بووە کە بزانن کام قوتابی لە بواری ( هونەری، وەرزشی، زانستی،

ئەدەبی یان پیشەیدا ) سەرکەوتووە، ئینجا لە میانەی ئەو شارەزاییەیان دەتوانن رێنمایی و ئامۆژگاری قوتابیە هەرزەکارەکان بکەن، بەتایبەتیش قوتابیانی پۆلی سێیەمی ناوەندی و شەشەمی ئامادەیی. واتە باشتروایە ئەو قوتابیانەی توانای هونەرییان هەیە بچن بۆ پەیمانگاو ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان، بەلام ئەوانەی لەوانە زانستیەکاندا سەرکەوتوون و بەردەوام نمرەی بەرز دەهێنن و لە چالاکیە زانستیەکاندا بەهرەمەندن باشتر وایە بچن بۆ بەش و کۆلێژە زانستیەکان لە کاتێکدا باشترە کە ئەو قوتابیانەی لەوانە ئەدەبی و چالاکیە شیعری و کارە وێژەییەکاندا سەرکەوتوون بچن بۆ ئەو بەش و کۆلێژانەی ئەدەبین نەك زانستی رووت. چونکە دەر ئەنجامی توێژینەوە زانستیەکان ئەو راستیەیان دەرخست کە هەر قوتابیەك و گروپێك خاوەنی توانست و بەهرەی تایبەتین و هەر کۆمەڵەیان لە بوارێکی تایبەتیدا سەرکەوتوون، ئینجا ئالێرەدا رۆڵی مامۆستا و رابەری پەروەردەیی دەردەکەوێت، واتە تا چەند سەرکەوتووە لە دەست نیشانکردنی بەهرەو تواناکانی قوتابیە هەرزەکارەکان و دۆزینەوەی بواری خوێندن و پیشەی گونجاو بۆیان، بۆ نموونە قوتابیەك لەبواری میکانیکی و ئیشی دەستکرددا بەهرەمەند بێت، باشتر وایە بچێت بۆ کۆلێژی ئەندازیاری یان پەیمانگای تەکنیکی یان ئامادەیی پیشەسازی نەك کۆلێژی ئاداب یان پەیمانگای کشتوکاڵی یان ئامادەیی بازرگانی بەلام پێویستە لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا حەزوو ئارەزووی قوتابی هەرزەکار لەبەر چاو بگیرێ.

نابێت ئەوەمان لە بیر بچێت کە دەست خستنە ناو کاروباری هەرزەکار تەنها لە بواری خوێندن و پیشەدا نییە، بەڵکو هەموو بوارەکانی تریش دەگەرێتەوە، بۆ نموونە هەندێك دایك و باوك بەزۆر کچەکانیان بە مێرد دەدەن یان بەزۆر ژن بۆ کورەکانیان دەهێنن، یان بەردەوام حەزوو ویستی خۆیان بەسەر کچ و کورە هەرزەکارەکانیاندا دەسەپێنن، کە سەرجەم ئەو هەڵس و کەوت و مامەڵانە هەڵەن و زیان بە باری دەروونی هەرزەکار دەگەیەنن. سەرەرای ئەوەش زۆربەی مامۆستا و کەسانی تریش هەمان هەڵس و کەوت و راوبۆچوونی دایکان و باوکانیان هەیە، کە بێگومان بەزەرەری هەموو لایەك ( لە پێشەوەی هەمووشیان هەرزەکار ) تەواو دەبێت .

ئینجا ئەگەر بمانەوێت هەرزەکارەکانمان قۆناغی هەرزەکاری بەسەلامەتی ببڕن و کەسانی سوود بەخشیان لێ دەربچێت، ئەوا پێویستە رەچاوی حەزوو ئارەزووەکانیان بکەین و لەهەمان کاتیشدا رێنمایی و ئامۆژگاری پێویستیان بکەین، لە بەرامبەر ئەوەش نابێت هەرزەکار ئەو سەربەستی و ئازادییە بەشێوەیەکی هەڵە بەکار بهێنێ، بەڵکو دەبێت بەردەوام لە کاتی پێویستدا راوێژ لەگەڵ دایك و باوك و مامۆستاکانی بکات و بە هاوکاری ئەوان گرفتەکانی چارەسەر بکات.

## هەرزەكار و هاوڕێیەتی

دۆست و هاوڕێ گرنگیەكی زۆریان لە ژیانی هەرزەكاردا هەیە و دەتوانن ڕۆڵی كاریگەر لە ژیانیدا بگێڕن، ئەوەش بە پلەی یەكەم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە ژینگەی خێزان و قوتابخانە لە كۆمەڵگای وەكوو ئێمە لەبارو گونجاو نیە بۆ گەشەكردنی ئاسایی هەرزەكارو دایك و باوك و مامۆستا بواری گونجاو بۆ گفت و گۆو رادەربڕینی هەرزەكار ناڕەخسێنن، لەبەرئەوە هەرزەكار بەردەوام لە گەڕاندایە بۆ دۆزینەوەی كەس و دەستە و تاقمێك تا بتوانێت لەناویاندا بوونی خۆی بسەلمێنێ، بێگومان هەرزەكار لە دۆست و برادەرو هاوڕێ زیاتر كەسی تر نادۆزێتەوە، چونكە هەرزەكار لەناو هاوڕێكانیدا هەست بە ئارامی و دڵنیایی دەكات و دەتوانێت بەو پەڕی سەربەستیەوە گوزارشت لە خودی خۆی بكات و راو بۆچوونەكانی بۆ هاوڕێكانی دەرببڕێت.

### كاریگەری و گرنگی هاوڕێ بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگەڕێتەوە:-

١- هەرزەكار و هاوڕێكانی لە لایەنی تەمەنەوە لەیەكەوە نزیكن و زۆربەی گیروگرفتەكانی جەستەیی و كۆمەڵایەتی و ئابووری و دەروونیەكانیان وەك یەكن، كە ئەمەش وایان لێدەكات كە هەریەكە باسی گیروگرفت و ئەزموونی تایبەتی خۆی بۆ ئەوی تر بكات و زۆر وەڵام و چارەسەری گونجاو بۆ گرفتەكانیان بدۆزێتەوە.

٢- منداڵ كاتێك دەچێتە قۆناغی هەرزەكاریەوە، ئەوا یەكسەر ماڵئاوایی لە قۆناغی منداڵی دەكات و ئیتر منداڵان وەك جاران یاری و مامەڵەی لەگەڵ ناكەن و هەرزەكاریش منداڵەكەی جاران نەماوە دەزانێت لە زۆر لایەنەوە لە منداڵان جیاوازە، هەروەها لە هەمان كاتیشدا گەورەكان پێشوازی لێ ناكەن و دانی پێدانانێن و بە گەورەی حیساب ناكەن، ئا لەم كاتەدا هیچ چارەی نامێنێت تەنها هاوڕێكانی نەبێت كە جێگاو ڕێگای تایبەتی بۆ دیاری دەكەن و لەو تەنیایی و ترس و دڵە راوكێیە رزگاری دەكەن.

٣- زۆر پرسیاری گرنگ دەربارەی قۆناغی هەرزەكاری و گۆڕانكاریەكانی لە مێشكی هەرزەكاردا دێن و دەچن و چاوەڕوانی وەڵام دەكەن، بەڵام بەداخەوە هیچ یەكێك لە دایك و باوك و كەسانی گەورەی تری چواردەوری هەرزەكار ئامادەنیە یان شەرم دەكات كە وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە بە تایبەتی ئەوانەی كە پەیوەندیان بە سێكس و گۆڕانكارییە فسیۆلۆژیەكانی ژیانی هەرزەكارەوە هەیە، لەبەرئەوە بەناچاری پەنا بۆ هاوڕێكانی دەبات و زۆر لە وەڵامی پرسیارەكانی لەوێ دەست دەكەوێت( Berk, 2003, P:607).

ئینجا بۆ ئەوەی هەرزەكار لە باشیەكانی تێكەڵ بوونی هاوڕێكانی بێبەش نەبێت و لە خراپیەكانیان دووربكەوێتەوە، ئەوا زۆر پێویستە كە دایك و باوك لە نزیكەوە ئاگاداری هاوڕێكانی هەرزەكارەكانیان بن و نەهێڵن تێكەڵاوی برادەرو كەسانی خراپ ببن و بەردەوام رێنمایی پێویستیان بكەن، بەڵام نابێت راستەوخۆ دەست بخەنە كاروباری هەرزەكارەكانیانەوە, بەڵكو دەبێت سەربەستی خۆیان بدەنێ و بە ئارەزووی خۆیان هاوڕێكانیان هەڵبژێرن.

بۆ دایك و باوك نیە كە هاوڕێ بۆ هەرزەكارەكانیان دیاری بكەن و بەسەریاندا بسەپێنن، بەڵام مافی ئەوەیان هەیە كە لە نزیكەوە ئاگاداری هەڵس و كەوتیان بن و ئەگەر هەڵەیەكیان كرد بۆیان راست بكەنەوە یان ئەگەر یەكێك لە برادەرەكانیان خراپ بوو ئەوا هەرزەكارەكانیان تێبگەیەنن و لێیان دووربخەنەوە، ئەگەر باوك و دایك وەڵامی پرسیارەكانی هەرزەكارەكانیان بدەنەوەو بواری گفت و گۆو رادەربڕینیان بۆ بڕەخسێنن و رێزی راوبۆچونەكانیان بگرن ئەوا كەمتر پێویستیان بە هاوڕێ و كەسانی تر دەبێت، بەڵام كاتێك دایك و باوك وەك منداڵ مامەڵە لەگەڵ هەرزەكارەكەیان دەكەن و بەردەوام سووكایەتیان پێ دەكەن بێگومان هەرزەكارەكانیان لە ژینگەی خێزانیان رادەكەن و پەنا بۆ هاوڕێكانیان دەبەن و دوورنیە تووشی برادەری خراپیش ببن و بەرەو لادان و هەڵدێریان ببەن.

## پێداویستیەكانی هەرزەكار و ڕۆڵی مامۆستا لە دابین كردنیان

هەرزەكار وەك هەموو كەسێكی تر كۆمەڵێك پێداویستی دەروونی و كۆمەلایەتی هەیە و پێویستە تێر بكرێن. ئیجا ئەگەر ئەو پێداویستیانە تێر نەكران، ئەوا هەرزەكار ڕووبەرووی كۆمەڵێك كێشەو گرفتی دەروونی و كۆمەلایەتی دەبێتەوەو لە ژیانی خوێندن و كۆمەلایەتیدا سەركەوتن بەدەست ناهێنێ. لەبەر ئەوە زۆر پێویستە كە ئیمەی گەورە شارەزای ئەو پێداویستیانە ببین و ژینگەی گونجاو لە ناو خێزان و قوتابخانە و كۆمەڵ بۆ تێركردنیان بخولقێنین .

### ئەمانەی خوارەوەش لە گرنگترین پێداویستەكانی هەرزەكارن :-

### پێداویستی هەست كردن بە ئاسایش و دڵنیایی :-

یەكەم پێداویستی دەروونی هەرزەكار دوای ( نان و ئاو و خەو و هەوا ... تاد ) هەست كردن بە دڵنیایی و ئارامی و ئاسایشە، واتە دەبێت هەرزەكار لە ناو قوتابخانە هەست بە ئارامی و دڵنیایی بكات و هەست نەكات كە ژیان و كەرامەت و تەندروستی لە هەڕەشە دایە. بەڵكو دەبێت لە ناو قوتابخانە هەست بە ئارامی و دڵنیایی تەواو بكات، ئینجا بۆ ئەوەی ئەم پێداویستیە دەروونیە گرنگە بێتە دی، ئەوا دەبێت مامۆستا ڕێزی قوتابی هەرزەكار بگرێت و سوكایەتی پێ نەكات و هەڕەشەو توندو تیژی لە تەكیدا بەكار نەهێنێ بۆ ئەوەی تووشی گرژی و دڵە ڕاوكێ و بێزاری و خەم و خەفەت نەبێت، هەروەها دەبێت مامۆستا ڕۆڵی كاریگەری لە ڕێنمایی كردن و چارەسەركردنی گیروگرفتەكانی قوتابیە هەرزەكارەكاندا هەبێت، بۆ ئەوەی قوتابی هەست بە دڵسۆزی و باوكایەتی مامۆستا بكات، كە ئەمەش دەبێتە هۆی دڵنیایی و دڵخۆشی هەرزەكار .

## پێداویستی خۆشەویستی و ڕێزگرتن :-

زۆر پێویستە قوتابی هەرزەکار لە ناو قوتابخانە ئەو هەستەی لە لا دروست ببێت کە کەسێکی خۆشەویستەو ڕێزی دەگیرێ، لە هەمان کاتیشدا دەبێت هەرزەکار مامۆستا و هاوڕێکانی خۆش بوێت. ئیجا بۆ ئەوەی ئەم پێویستیە دەروونیە تێر ببێت، دەبێت ئێمەی گەورە (بەتایبەتی مامۆستا) کەش و هەوایەکی دیموکراسی و مرۆڤانە لە ناو قوتابخانە و کۆمەڵ بخولقێنین و هەوڵی دروست کردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە نێوان قوتابییەکان لە لایەك و قوتابیان و مامۆستا لە لایەکی تر، بدەین سەرەڕای ئەوەش مامۆستایان خۆیان لەناو یەك پەیوەندی کۆمەڵایەتیان بەهێز بێت و لە بۆنە و چەژن و ئاهەنگ و چالاکیەکانی قوتابخانەدا هاوکاری یەکتر بکەن و تۆوی یەکسانی و خۆشەویستی بچێنن لە هەمان کاتیشدا دەبێت لە دەمارگیری و جیاوازی و توندو تیژی و دیکتاتۆریەت دووریکەونەوە. ئەگەر توانیمان بەم شێوەیە لەناو قوتابخانە بجوڵێینەوە ئەوا زۆر بە ئاسانی پێداویستی خۆشەویستی و ڕێزگرتن دابین دەکرێت .

## پێداویستی بوونی جێگە و پلەو پایە لە ناو کۆمەڵدا :-

هەرزەکار زۆر پێویستی بە کۆمەڵ و قوتابخانە هەیە، بۆ ئەوەی ئەم پێداویستیەی بۆ دابین بکرێت، هەرزەکار دەیەوێت برادەری دڵسۆزی هەبێت و لە ناو کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا هەست بە بوونی خۆی بکات، لەبەر ئەوە ئەرکی قوتابخانەیە کە لە ڕێگەی چالاکیەکانی ناو قوتابخانە و چالاکیە دەرەکیەکان و کۆڕو کۆبوونەوەکاندا، هەرزەکار بەشداری بکات و ڕۆڵی تایبەتی خۆی هەبێت و لە کاتی سەرکەوتندا پاداشت بکرێت و ڕێزی بەهرەو تواناکانی بگیرێ، هەروەها دەبێت هەموو هەرزەکاران بەیەك چاو سەیر بکرێن، بۆ ئەوەی هەرزەکار هەست بە دڵنیایی و یەکسانی بکات و هەست نەکات کە ئەو لە کەسانی تر کەمترە، بەڵکو دەبێت مافی خۆی وەربگرێت و لە هەمان کاتیشدا بواری کێ بڕکێ ی پاك و یەکسان بۆ هەموو لایەك بڕەخسێندرێ .

بۆ هێنانە دی ئەم مەبەستەش پێویستە ڕەچاوی جیاوازی تاکایەتی (الفروق الفردیة) نێوان قوتابیەکان بکرێت و چەندەها جۆر چالاکی و بواری جیاجیان بۆ دابین بکرێت، چونکە هەر قوتابیەك لە بوار و چالاکیەکدا زیاتر سەرکەوتن بە دەست دەهێنێ و خاوەنی بەهرەیەکە کە لە قوتابیەکانی تر دا نیە، واتە قوتابی وا هەیە لە بواری کۆمەلایەتیدا سەرکەوتووە بەلام هاوەلەکەی لە بواری هونەری یان زانستی یان میکانیکی ... تاد، کەواتە دەبێت لە ناو قوتابخانە جۆرەها چالاکی هەبێت بۆ ئەوەی قوتابی هەست بە بوونی خۆی بکات و جێگاو پلە و پایەیەکی هەبێت .

## پێداویستی عەقلی (ژیری):-

پێویستە ژیری و بیری هەرزەکار لە ڕێگەی چالاکیەکانی ناو قوتابخانەوە گەشەی پێ بکرێت. هەرزەکار پێویستی بە ڕێنمایی پێویست هەیە بۆ ئەوەی بتوانێ بە شێوەیەکی زانستیانە بیر بکاتەوەو چارەسەری گیرو گرفتەکان بکات. کەواتە ئەرکی سەرشانی مامۆستا وەلامدانەوەی پرسیارەکانی هەرزەکارو ڕوون کردنەوەی ڕووداوەکانی ژیانە، ئیجا بۆ ئەوەی ئەم ئامانجانە بێتە دی دەبێت مامۆستا کەسێکی زیرەك و لێهاتوو بەتوانا بێت و پیشەکەی خۆی خۆش بوێت، سەرەڕای ئەوەش بواری گونجاو بۆ قوتابیە هەرزەکارەکان بڕەخسێنێ بۆ ئەوەی گوزارشت لە خۆیان بکەن.

## فەلسەفەی ژیان :-

هەرزەکار لە قۆناغی هەرزەکاریدا زۆر بیر دەکاتەوەو زۆربەی جار خەریکی تێرامانێن و لێك دانەوەی ژیانە. ئەمەش وای لێدەکات کە بەردەوام خولیای زانینی نهێنیەکانی ژیان بێت و بیر لە مردن و بەهەشت و دۆزەخ و فریشتە و چارەنووسی مرۆڤ بکاتەوە .

ئینجا بۆ ئەوەی هەرزەکار نەکەوێتە گێژاوی خەووخەیاڵ و لێکدانەوەی خراپ پێویستە مامۆستا بە شێوەیەکی زانستیانە وەلامی زۆر لەوپرسیاراتەی بداتەوەو هەندێك لەو حەزوو ئارەزووانەی تێر بکات، چونکە ئەگەر مامۆستا و کەسانی دڵسۆز دیاردەکانی

ژیانی بۆ ڕوون نەكەنەوە، ئەوا دوور نیە لە هەندێك سەرچاوەی هەڵەوە زانیاری خراپیان دەست بكەوێت و تووشی بیر كردنەوەی هەڵەی بكەن. لەبەر ئەوە زۆر پێویستە كە زۆر بە هاو ئاكاری مرۆڤانەو ئایینی و دیموكراسی و فەلسەفی مرۆڤانە فێری هەرزەكار بكرێت بۆ ئەوەی لە لایەن كەسانی ترەوە هەڵنە خەڵەتێندرێن، چونكە قۆناغی هەرزەكاری قۆناغێكی هەستیارو ناسكە و ئەگەر ئاگامان لە هەرزەكار نەبێت ڕووبەرووی زۆر گرفت و كێشەی فیكری و فەلسەفی و كۆمەلایەتی دەبێتەوە.

شایەنی باسە زۆر حاڵەتی گۆڕینی ئایین و ڕێباز و ئایدۆلۆژیا لەم قۆناغەدا ڕوودەدەن و سیاسەتمەدارو كەسانی تر دەتوانن كار لە هەرزەكار بكەن و بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان بەكاری بهێنن، لەبەر ئەوەی هەرزەكار شارەزایی كەمە و زۆر سۆز و عاتیفیانە بۆ دیاردەكان دەچێت و لێكیان دەداتەوە سەرەڕای ئەوەش هێشتا لەلایەنی عەقلیەوە بە تەواوی گەشەی نەكردووە .

## گیروگرفتەكانی هەرزەكار :-

هەرزەكار لە قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی ڕووبەڕووی زۆر گیروگرفت دەبێتەوە، ئینجا ئەگەر بمانەوێت هەرزەكار بەسەر ئەو گیروگرفتانەدا زاڵ بێت، ئەوا پێویستە ڕێنمایی پێشكەش بكەین و هاوكاری بكەین بۆ ئەوەی ئەو گیروگرفتانە نەبن بە كۆسپ و تەگەرەو ژیانی لێ ئاڵۆز نەكەن .

## لە گرنگترین گیروگرفتەكانیش ئەمانەی لای خوارەوەن :-

١-ترسان لە تاقی كردنەوەو خەم و خەفەتی دەرنەچوون .
٢-تێنەگەیشتنی هەندێك وانە و بابەت و بە زەحمەت یادكردنەوەی لە كاتی تاقیكردنەوە.

٣-سەیر کردنی خود بە چاوی نزم و بڕواهێنانی هەندێك قوتابی کە توانای کەمە و ناتوانێت قۆناغەکانی تری خوێندن تەواو بکات .

٤-توندو تیژی و دەمارگیری و کەم توانایی هەندێك لە مامۆستایان، کە گرنگی بە پێداویستی و گیروگرفتەکانی هەرزەکار نادەن .

٥-قورسی هەندێك لە پرسیارەکانی تاقیکردنەوەکان و هێنانەوەی پرسیار لە بەشێك لە وانەکە و پشت گوێخستنی بەشەکانی تر .

٦-جیاوازی کردنی هەندێك لە مامۆستایان و سەیرنەکردنی هەموو قوتابیەکان بەیەك چاو و بڵاوبوونەوەی دیاردەی واسیتە لەلای هەندێك لە مامۆستایان .

٧-کەم توانایی هەندێك لە مامۆستاکان و باش راڤە نەکردنی بابەتەکە .

٨-کەمی زانیاری دەربارەی قۆناغی هەرزەکاری و رێنمایی نەکردنی قوتابی هەرزەکار لەلایەن زۆر لە مامۆستایان .

٩- رێزنەگرتنی هەرزەکار و سەیرکردنی بە چاوی نزم و مامەڵەکردنی منداڵانە لە گەڵی.

١٠- دەرچوونی هەندێك قوتابی لە ئەنجامی قۆپی کردن و چاوپۆشینی هەندێك مامۆستا لە قۆپی کردنی ئەو جۆرە قوتابیانە .

١١-هەندێك قوتابی نازانن چۆن کۆشش بکەن و خۆیان بۆ تاقیکردنەوە ئامادە بکەن .

ئەوانەی سەرەوە لە گرنگترین ئەو گیروگرفتانەن کە ڕووبەڕووی قوتابی هەرزەکار دەبێتەوە. شایەنی باسە نووسەری ئەم بابەتە چەند پرسیارێکی لە (٧٥) قوتابی ناوەندی و ئامادەیی کرد، دەربارەی ئەو گیروگرفتانەی کە بەدەستیانەوە دەناڵێنن، لە ئەنجامدا دەرکەوت کە ئەو خاڵانەی سەرەوە لە گرنگترین گیروگرفتەکانیانن. ئینجا بۆ چارەسەر کردنی ئەو گیروگرفتانەی سەرەوە، ئەرکی سەرشانی قوتا بخانەیە (بەتایبەتی مامۆستا و رابەری پەروەردەیی و دەروونی) کە بەم کارانەی خوارەوە هەڵبستن :-

١- هەوڵبدرێت کە ڕێنمایی پێویستی قوتابی هەرزەکار بکرێت، بۆ ئەوەی لە تاقیکردنەوەو ئەزموونەکان نەترسێت و بە باشی خۆی ئامادە بکات و فێری چۆنیەتی کۆشش کردن و خوێندنەوەی راست و دروستی وانەکان بکرێت .

٢- پێویستە مامۆستا بەباشی وانەكان ڕاڤە بكات و تا دەتوانێت ئامرازەكانی فێركردن و ڕوون كردنەوە بەكار بهێنێ و گونجاوترین ڕێگەی وانە گوتنەوە بۆ قۆناغی هەرزەكاری دەست نیشان بكات بۆ ئەوەی قوتابی لە وانەكەی تێ بگات و لە كاتی ڕاڤەكردندا ئاگاداری مامۆستا بێت .

٣- پێویستە گیانی بڕوا بەخۆبوون لە ناخی قوتابیدا دروست بكرێت و خاڵە بەهێزەكانی بۆ ڕوون بكرێتەوە و تێ بگەیەندرێت كە ئەو كەم تواناو نەزان نییە، بەڵكو هەموو قوتابییەك خاڵی بەهێزو لاوازی خۆی هەیەو لە هەندێك بابەت و وانەدا سەركەوتنی باش بەدەست دەهێنێ و لە هەندێك بابەت و وانەی تردا مام ناوەندییە و دوور نیە لە یەكێك لە وانەكانیشدا كەمێك لاواز بێت، بەڵام خوێندنەوەی بەردەوام و ئامادەبوون و وریایی لە ناو پۆلداو بوونی حەزوو ئارەزووی خوێندن هۆكارو زامنی تەقاندنەوەی توانا و بەهرەكانی قوتابین، سەرەڕای ئەوەش زۆر گرنگە كە بەردەوام قوتابی لەسەر چالاكی دەرەكی و داهێنان هانبدرێت و پاداشتی بەرهەم و كارە سەركەوتووەكانیشی بكرێت .

٤- نابێت مامۆستا توندو تیژو دەمارگیر بێت و پەنا بۆ سزادان و سوكایەتی پێكردنی قوتابی ببات. بەڵكو زۆر پێویستە وەك باوك و برایەكی گەورەو دڵسۆزو بەبەزەیی و لێ بوردوو بە ئارام بێت و جیاوازی لە نێوان قوتابییەكاندا نەكات و لە ڕێگەی دایەلۆگ و گفتوگۆو ئامۆژگارییەوە قوتابی بهێنێتە سەر ڕێگای ڕاست و چارەسەری گرفتەكانی بكات .

٥- زۆر گرنگە پرسیارەكان لە ئاستی توانای قوتابییاندا بێت و تەم و مژاوی نەبێت، بەڵكو سەرتاسەری بێت و هەموو وانەو بابەتەكان بگرێتەوەو توانای جیاكردنەوەی قوتابیە زیرەكەكانی لە قوتابیە تەمبەڵ و ناوەندییەكانی هەبێت، واتە پرسیارەكان بە جۆرێك بێت كە جیاوازی تاكایەتی نێوان قوتابییەكان دەربخات . بۆ نموونە جۆرە پرسیارێكی تیدا بێت تەنها قوتابیە زیرەكەكان بتوانن وەڵامی بدەنەوە لە هەمان كاتیشدا پرسیاری وای تێدابێت كە هەموو قوتابییەكان وەڵامی بدەنەوە، ئەوانی تریش لەو نێوانەدا بێت .

٦- ڕێگە نەدان بە هەندێك قوتابی پەنا بۆ قۆپی کردن بەرێ یان چاوپۆشی کردن لە کاتی قۆپی کردن، چونکە ئەو کارە دەبێتە هۆی دروست کردنی گیروگرفت و کێشەی دەروونی بۆ قوتابیەکانی ترو نزم کردنەوەی ورەو حەزوو ئارەزووی خوێندنیان .

٧- پێویستە ڕێزی قوتابی بگیرێت و بە چاوی سووك سەیری نەکرێت و ڕێزی ڕاوبۆچوونەکانی بگیرێ و بواری سەربەخۆیی و بڕوا بەخۆبوون و ڕادەربڕینی بۆ بڕەخسێندرێت.

٨- زۆر گرنگە لە ڕێگەی خۆ ڕۆشنبیر کردن و خوێندنەوەو بەشداری کردن لە خول و کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا، مامۆستا شارەزایی پێویست دەربارەی قۆناغی هەرزەکاری و سایکۆلۆژیای هەرزەکار پەیدا بکات، چونکە ئەگەر مامۆستای ناوەندی و دوا ناوەندی شارەزای سایکۆلۆژیای هەرزەکار نەبن، ئەوا ناتوانن وەك پێویست و سەرکەوتووانە مامەڵە لەگەڵ قوتابی هەرزەکار بکەن و دەست نیشان و چارەسەری ئەندێشە و گیروگرفتەکانی بکەن .

٩- پێویستە ژینگەی قوتابخانە خۆش بکرێت، بۆ ئەوەی قوتابی تیایدا هەست بە ئارامی وئاسایش و دڵنیایی بکات و ترسی لە هەڕەشەو تۆقاندن و سوکایەتی پێکردنی بەڕێوەبەر و مامۆستا و قوتابیانی هاوەڵی نەبێت. سەرەڕای ئەوەش بابەت و وانەکان لەگەڵ خواست و حەزوو تواناکانی قوتابی هەرزەکاردا بگونجێت و تام و چێژیان لێ وەربگرێ .

١٠- زۆر گرنگە ژینگەی قوتابخانە پڕ بێت لە جۆرەها چالاکی زانستی و هونەری و وەرزشی و ئەدەبی، بۆ ئەوەی هەموو قوتابیان هەست بە بوونی خۆیان بکەن و خاڵە بەهێزەکانیان دەربکەوێ، چونکە مەرج نییە هەموو قوتابیان لە بابەتە زانستیەکان سەرکەوتوو بن لەهەمان کاتیشدا پێویستە گیانی هاوکاری وبرایەتی لە نێوان قوتابیاندا دروست بکرێت وهان و پاداشتی هەمووشیان بە پێ ی تواناکانیان بکرێت.

## کەم کردنەوە لە نرخی هەرزەکار

قۆناغی هەرزەکاری یەکێکە لە گرنگترین و ناسکترین قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ، چونکە دەبێتە هۆی گواستنەوەی مرۆڤ لە قۆناغی منداڵیەوە (کە بەردەوام پشت بە کەسانی تر دەبەستێت و ناسنامەو سەربەخۆیی تایبەتی خۆی نیە) بۆ قۆناغی کاملی و پێگەیشتن (کە دەبێتە خاوەنی ناسنامەو کەسایەتی و بوونی خۆی و لە پشت بەستن بە کەسانی تر رزگاری دەبێت). بەڵام ئەو گواستنەوەو گۆڕانکارییە هەروا بە ئاسانی روونادات بەڵکو دەبێت ژینگەو بارودۆخی گونجاو بۆ هەرزەکار دابین بکرێت، تاوەکوو بە سەلامەتی پێ گێروگرفت قۆناغی هەرزەکاری ببڕێت و بچێتە قۆناغی کاملیەوە.

یەکێك لە گرنگترین ئەو دیاردە دەروونی و کۆمەڵایەتیانەی کە لەم قۆناغەدا سەرهەڵدەدات هەست کردن بە ناسنامەو سەربەخۆییە، واتە هەرزەکار منداڵەکەی جاران نەماوە و داوای هەرچیەکی لێبکرێت یەکسەر گوێ رایەڵی گەورەکانی ببێت، بەڵکو لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە جەستەیی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و ژیرییانەی کە لە قۆناغی هەرزەکاریدا روودەدات، ئەویش زۆر راو بۆچوون و حەزوو ئارەزووی لەلا دروست دەبێت و رازی نابێت کەسانی تر پێشێلی بکەن، لەبەرئەوە زۆر جار گوێ بیستی هەندێك قسەو راو بۆچوون دەبین کە جاران لەلای ئەو منداڵەی کە ئێستا بووە بە هەرزەکار نەبووە لەوانە (بەرای من، بە بۆچوونی من، من وای بۆ دەچم، من قەناعەتم وایە، من رازی نابم، ئەی ئێمە چین، بۆ ئێمە ئینسان نین، ...تاد) کە سەرجەم ئەو راو بۆچوونانە ئاماژەن بۆ دروست بوونی ناسنامەو دەرکەوتنی دیاردەی سەربەخۆیی و پشت بەستن بەخود.

ئێمەی دایك و باوك و مامۆستاو کەسانی گەورەی چواردەوری هەرزەکار، ئەگەر بمانەوێت هەرزەکارەکەمان بەشێوەیەکی راست و دروست قۆناغی هەرزەکاری ببڕێت و بچێتە قۆناغی کاملییەوە، ئەوا دەبێت رێزی ئەو راو بۆچوونانەی هەرزەکار بگرین و ئەنرخیان

کەم نەکەینەوەو سوکایەتیان پێ نەکەین، چونکە شکاندنەوەی هەرزەکارو تەریق کردنەوەی گیانی سەربەخۆیی و هەست کردن بە خودو بوون دەمرێنێت.

بەلام بە داخەوە زۆر لە دایکان و باوکان و مامۆستایان بەردەوام لە نرخی هەرزەکار کەم دەکەنەوەو هەر بە چاوی منداڵی سەیریان دەکەن و هەڵس و کەوتیان بە پێی گۆرانکاری و قۆناغەکانی ژیانی منداڵەکانیان ناگۆڕن و هەندێک راو بۆچوون و مامەڵەی تایبەتیان هەیە و بەردەوام لەگەڵ منداڵ و دواتریش کە دەچێتە قۆناغی هەرزەکارییەوە بەکاریان دەهێنن، کە بێگومان ئەمەش هەڵەیەو زیانی گەورە بە کەسایەتی هەرزەکار دەگەیەنێت .

لەبەرئەوە زۆر گرنگە کە دایکان و باوکان و مامۆستایان و کەسانی تری چواردەوری هەرزەکار، رەچاوی ئەو گۆڕانکارییانە بکەن کە لە قۆناغی هەرزەکاریدا روودەدات و دەبێت هەڵس و کەوت و مامەڵەیان بگۆڕن، چونکە هەرزەکارەکەیان منداڵەکەی جاران نەماوەو بە زۆر شت رازی نابێت لەوانەی کە لە قۆناغی منداڵیدا پێی رازی بوو، ئیتر نابێت گەورەکان بەردەوام ئەو قسە سواوەی جاران بەکاربهێنن کە گەورەکان بۆ دەم کوت کردن و سووکایەتی پێکردنی گچکەکان بەکاریان دەهێنا ، زۆرجار ئەگەر هەرزەکار قسەیەکی بکردایە، یەکسەر پێیان دەگوت (تۆ چی، تۆ سەلکی سیری، قنچکی پیازی، تۆچی تا راو بۆچوونت هەبێت، تۆبۆنی شیری خاو لە دەمت دێت! ) کە بە داخەوە بەو مامەڵە هەڵەیە گیانی سەربەخۆیی و بڕوا بەخۆبوون لە دڵ و دەروونی ئەو هەرزەکارە تازە پێگەیشتوەدا دەمرن.

نابێت دایکان و باوکان ئەوەیان لە بیربچێت کە کورە هەرزەکارەکەیان (١٠٠٠) هەزار ئەوەندەی سەلکە سیر و قنچکە پیاز دەبێت و خاوەنی زۆر بەهرەو تواناو لێهاتوویەو هەر ئەوانن دەبن بە پیاوو لێپرسراوو پزیشک و مامۆستاو پیاوو ئافرەتی دوا رۆژ، لەبەرئەوە سووکایەتی پێ کردنیان تاوانێکە دەرهەق بە رۆڵەکانیان دەکرێت و بەرەو لاوازی و دەروون نەخۆشیان دەبات و زەرەرو زیانێکی گەورە بە کەسایەتی و باری دەروونیان دەگەیەنێت و زۆر بەهرەو توانای ئەم گەل و نەتەوەیە زیندە بەچاڵ دەکات.

**گەشەكردنی عەقڵی لە قۆناغی هەرزەكاری**

**خۆگونجاندن و خودی مرۆڤ**

**مێردمنداڵان و لاساری**

**پەروەردەی سێكسی**

**پیشەو كار لە قۆناغی هەرزەكاری**

**سایكۆلۆژیای لاوان**

**سەرچاوەی گرێ دەروونیەكانمان**

**( خووگرتن ) فێ لێهاتن**

## گەشەکردنی عەقلی و زانیاری لە قۆناغی هەرزەکاری

لە قۆناغی هەرزەکاری وەك هەموو توانست و لایەنەکانی تر، توانستە عەقلی و ژیرییەکانی هەرزەکار گەشە دەکەن، لەم قۆناغەدا گەشە کردنی زیرەکی کەم دەبێتەوەو هەمان خێرایی قۆناغی مندالی نامێنێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە گەشەکردنی توانستە عەقلی و ژیرییە تایبەتیەکان (القدرات الخاصة) زیاتر گەشەدەکەن و بەئاشکرا لە هەڵس و کەوت و بیرکردنەوەی هەرزەکاردا ڕەنگ دەدەنەوە.

هەر لەبەر ئەوەشە کە بابەتەکانی (جەبر و ئەندازەو فیزیاوو، کیمیا.... تاد) بۆ قۆناغی هەرزەکاری دوا دەخرێت و لە قوتابخانەی سەرەتایی ناخوێندرێن، بەڵکو لە ناوەندییەوە دەست بە خوێندنیان دەکرێت، چونکە توانستە عەقلیە تایبەتیەکانی وەك (توانستی بیرکاری و ژمارەیی(القدرة العددية)، توانستی شوێنی (القدرة المكانية) توانستی میکانیکی، توانستی مۆسیقی ..... تاد) بەزۆری لە قۆناغی هەرزەکاری گەشەدەکەن و کاریگەرییان لە سەر حەزوو ئارەزوو بیرکردنەوەی هەرزەکار دەردەکەوێت (توێژینەوەکانی سیگل، segal و دیامۆند، Deamond ئەوەیان سەلماند کە بەزۆری زیرەکی لە قۆناغی مندالی گەشە دەکات، بەڵام توانستە عەقلیە تایبەتیەکان لە قۆناغی هەرزەکاری گەشە دەکەن) (معوض، ١٩٨٣، ص ٣٠١).

گەشەکردنی عەقلی و زانیاری لە قۆناغی هەرزەکاری بەرەو جیاکاری و تایبەتمەندێتی دەچێت، واتە لە قۆناغی هەرزەکاری توانستە عەقلیە جیاجیاکان (زمانی، ژمارەیی، میکانیکی، هونەری، جێگایی ...... تاد) سەر هەڵدەدەن و بە تەواوی گەشە دەکەن.

ئەم توانستە عەقلیە جیاجیایانە دەبن بە هاندەرو یارمەتیدەر بۆ ئەوەی هەرزەکار توانای خۆسازاندنی لەگەڵ ژینگە ئاڵۆزو گۆڕاوەکانی ژیاندا هەبێت. گەشەکردنی عەقلی و ژیری هەرزەکار خۆیان لەم توانست و حەزوو ئارەزووانەی خوارەوەدا دەبیننەوە:-

**١. وریایی (الانتباه)،(Attention):-**

لە قۆناغی هەرزەکاری چاوتێبڕین و بە ئاگایی و وریایی هەرزەکار، زیاترو بەر فراوانتر دەبێت. واتە هەرزەکار زیاتر لە منداڵ دەتوانێت وریاو ئاگاداری قسەی مامۆستا و دایک و باوك و کەسانی تر ببێت و بۆ ماوەیەکی زۆرتر ئاگاداری ورووژێنەرو ڕووداوەکان ببێت، هەروەها دەتوانێت وریای وردەکاری و گۆڕانکاریەکانی چواردەورەکەی ببێت .

**٢. زانین (الادراك)،(Perception):-**

زانین و تێگەیشتنی هەرزەکار باشتر و بەرفراوانتر دەبێت. منداڵ زیاتر لە مانای شتە هەست پێکراوەکان (المحسوسات) تێدەگات، بەلام هەرزەکار دەتوانێت لەمانای شتە ناهەست پێکراو ڕووت و مانا دارەکانیش (المعنویة) تێبگات سەرەڕای ئەوەش بە قوڵی دەچێتە ناو بابەتەکان و تاوتوێی زۆربەی کونج و قوژبنەکانی دەکات و لە منداڵ زۆر زیاتر گرنگی بە ڕابردوو داهاتووی نزیك و دوور دەدات، لە کاتێکدا منداڵ زیاتر گرنگی بە ئێستا دەدات. بەم شێوەیە زانین و تێگەیشتنی مرۆڤ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو زیاد بوون دەچێت و زیاتر جێگیر دەبن و سەرتا پای ئێستاو داهاتوو ڕابردووش دەگرنەوە .

{یەکێك لە توێژینەوەکانی (کیمینز، kimmins) کە دەربارەی زانین و تێگەیشتی منداڵ و هەرزەکارە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە زانین و تێگەیشتنی منداڵ دەربارەی بۆردومان کردنی ئاسمانی و شەڕ و کوشتار پەیوەستە بە زانینی ڕاستەوخۆی کاولکاری و ڕووخاندن و سوتاندن و لەناوبردنی شتە هەست پێکراوەکان، بەلام زانین و تێگەیشتنی

هەرزەکار بۆ ئەو شەڕو بۆردوماتکردنە زۆر زۆر زیاترو قوڵترە، لەبەر ئەوەی هەرزەکار تەنها هەست بەو کاولکاری و تێکدانە هەست پێکراوانە ناکات، بەڵکو هەست بەو نەهامەتی و کارەسات وناخۆشیانەش دەکات کە لە داهاتوودا ئەو شەڕو کوشتارە بەسەر ئەو وڵاتەو سەرجەم مرۆڤایەتیدا دەیهێنن، واتە بیر لە داهاتوو مەترسیەکانی شەڕو کوشتاریش دەکاتەوە} . (هرمزو أبراهيم، ١٩٨٨، ص٨١) (السيد، ١٩٧٤، ص٢٨٥).

## ٢. یادکردنەوە (التذكر، Memory):-

هاوشان لە تەك زیادبوونی توانای وریایی و زانین، توانستی یادکردنەوەش بەرەو زیاد بوون و گەشەکردن دەچێت. یادکردنەوەی هەرزەکار زیاتر پشت بە تێگەیشتن دەبەستێت نەك ئەزبەرکردن (درخ)و فێربوونی ئالی و بێ مانای سەردەمی منداڵی، چونکە هەرزەکار هەوڵدەدات کە لەمانای شتەکان بگات و بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە و بەدوای دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان دیاردە و پارچەکاندا دەگەڕێت. واتە لە توانای هەرزەکاردا هەیە شتە واتادارو ڕوونتکراوەکان (مجرد) لە کۆنەندامی یادکردنەوەیدا عەمبار بکات و دواتریش بە پێی پێویست لە کات و شوێنی دیاریکراودا یادیان بکاتەوە.

بەڵام منداڵ توانای عەمبارکردن و یادکردنەوەی شتە واتادارو مەعنەوی و ڕوونکراوەکانی زۆر کەمترە، گومانی تێدانیە کە زۆر فاکتەر هەن و کاریگەرییان لەسەر پرۆسەی یادکردنەوە هەیە. بۆ نموونە هەرزەکار خێراتر ئەو شت و ڕووداوانە عەمار دەکات و لەکاتی خۆشیدا یادیان دەکات و بە ئاسانی بەبیری دێتەوە، کە حەزیان لێدەکات و لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا دەگونجێت. بە پێچەوانەشەوە زۆر بە زەحمەت لەو شتانەی کە ڕقی لێیەتی و حەزیان لێناکات، تێدەگات و بە زەحمەتیش دێتەوە یادی. هەروەها هەڵچوونەکانیش (تورەبوون، خەم و خەفەت، دڵەڕاوکێ، ترس ...... تاد). زیان بە پرۆسەی یادکردنەوە دەگەیەنن.

## خەیالکردن (التخیل)، (Imagination):-

خەیالکردن لە قۆناغی هەرزەکاری زۆر بەرفراوان دەبێت و بە زۆریش پشت بە زمان و ووشە دەبەستێت و تایبەت دەبێت بە ڕووداو و شتە مەعنەوی و ڕووتکراوەکان ( مجرد ) نەك هەست پێکراوەکان، هەر ئەو توانایەشە کە یارمەتی تێگەیشتنی بابەتەکانی ( ئەندازە، ماتماتیك، پرانسیپەکان، هێماکان ...... تاد )ی دەدات .

بێگومان پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان بیرکردنەوەوخەیالکردندا هەیە، چەند بیرکردنەوەو تێگەیشتنی هەرزەکار بەرفراوان بێت، ئەوەندەش پرۆسەی خەیالکردنی بەرفراوان و دەوڵەمەندتر دەبێت، گومانی تێدا نییە کە خەیاڵی هەرزەکار زۆر دەوڵەمەندە و پڕە لە سۆزو عاتیفە و هەڵچوون و لێکدانەوەی وردو جوانکاری و بە قوڵیش دەچێتە ناو بابەتەکانەوە، بە پێچەوانەی منداڵ کە خەوو خەیاڵەکانی زیاتر ڕواڵەت و ڕووکەش و پەیوەستن بەحەزو ئارەزووە هەست پێکراوەکانی.

زۆر جار هەرزەکار خەوو خەیاڵەکانی لە ڕێگەی نووسینی ئەدەبی و چالاکییە هونەری و زانستیەکانەوە تێر دەکات، کەلە سەرجەم ئەو نووسین و چالاکیانەدا مۆرکی جوانی ودەست ڕەنگینی و دەوڵەمەندی هەرزەکار بەدی دەکرێت کە بەتەواوی لە قۆناغی منداڵی جیا دەکاتەوە .

## ئارەزوو (المیل)، (Interest):-

حەزووئارەزووی هەرزەکار لە زۆر لایەنەوە جیاوازە لە حەزوو ئارەزووی منداڵ. لەبەر ئەوەی ئارەزووی منداڵ زیاتر پەیوەستە بە شتە هەست پێکراوەکان و جیهانی منداڵی، بەڵام ئارەزووی هەرزەکار پەیوەستە بەشتە هەست پێکراوو زیاتریش مەعنەوی و ڕووتکراوەکان ( مجرد ) و گرفت وکێشەکانی هەرزەکار. لەلایەکی ترەوە جیاوازی لە نێوان ئارەزووی (کچان و کوڕان) (زیرەك و تەمەڵ و بیرکۆڵ) (هەرزەکاری شارو لادێ) هەیە.

ئەوەی زیاتر حەزوو ئارەزووەکانی هەرزەکار دیاری دەکات، توانستە عەقلییە ئاییەتیەکانیەتی، واتە ئەو هەرزەکارانەی خاوەنی توانستی عەقلی هونەرین زیاتر حەز بە کارو چالاکیە هونەریەکان دەکەن، بەلام ئەو هەرزەکارانەی کە خاوەنی توانستی عەقلی میکانیکین، زیاتر حەز بە ئیش و کاری میکانیکی دەکەن. لەسەرەتای هەرزەکاری، هەرزەکار زیاتر حەز بە چالاکی و یاری وەرزشی دەکات بەلام دواتر بەرفراوانتر دەبێت و بوارەکانی تری هونەری و ئەدەبی و زانستیش دەگرێتەوە.

دوای ئەوەی توانستە عەقلیەکانی هەرزەکار گەشە دەکەن، هەرزەکار گرنگی بە کێشە و گرفتە کۆمەلایەتی و سیاسی و ئاینیەکانیش دەدات و بەردەوام خولیای لێك دانەوەو تێگەیشتنیان دەبێت. هەر ئەوەشە وای لێدەکات کە بەئاسانی ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی گەورەکان وەك منداڵ وەرنەگرێت و بکەوێتە گفت و گۆ و لێك دانەوەو هەڵسەنگاندنیان یان ڕەتکردنەوەیان کە ئەمەش زۆر جار گێروگرفتی لەگەڵ گەورەکان بۆ دروست دەکات، بەتایبەتیش لەگەڵ ئەو گەورانەی کە هەر بەچاوی منداڵی سەیری هەرزەکارەکار دەکەن.

ئینجا بۆ ئەوەی سوود لە بەهرەو تواناو حەزوو ئارەزوەکانی هەرزەکار وەربگیرێت ئەوا پێویستە بەردەوام دایك و باوك و مامۆستا و تاکەکانی تری کۆمەڵ لە هەوڵی دۆزینەوەی حەزوو ئارەزووەکانی هەرزەکاردابن و دواتریش ژینگەی لەبارو گونجاو بۆ گەشەکردنیان بڕەخسێنن. لەبەر ئەوەی قۆناغی سەرهەلدان و گەشەکردنی حەزوو ئارەزووە جیاجیاکانی مرۆڤە. هەر لەبەر ئەوەشە کە لە قۆناغی هەرزەکاری جۆرەها بواری خوێندن و بەشی جیاجیا سەر هەلدەدەن لەوانە (وێژەیی، زانستی، هونەرەجوانەکان، کشت وکاڵ، پیشەسازی،بازرگانی، مامۆستایان، ...... تاد) بۆ ئەوەی هەر هەرزەکارە بە پێ ی تواناو حەزوو ئارەزووی خۆی یەکێك لەو بوارانەی سەرەوە هەلبژێری.

بەلام نابێت ئەوەشمان لە یاد بچێت کە هەرزەکار بەتەنها ناتوانێت بواری خوێندن و کارکردنی گونجاو بۆ خۆی هەلبژێرێت. لەبەر ئەوەی شارەزایی کەمەو توانای ناسینەوەو

دۆزینەوەی توانا و حەزوو ئارەزووەکانی خۆی نییە، بۆیە زۆر زۆر پێویستە کە لەم قۆناغەدا دایك و باوك و مامۆستا ڕۆلی گرنگیان هەبێت و ڕێنمایی و ئامۆژگاری پێویستی هەرزەکار بکەن، بۆ ئەوەی بە هەموو لایەك بوارو جۆری خوێندنی گونجاو (کە لەگەڵ حەزوو ئارەزوو تواناکانی هەرزەکار دەگونجێت) بدۆزرێتەوە.

## بیرکردنەوە (التفكير)، (Thinking):-

لە قۆناغی هەرزەکاریدا گۆڕانکاری زۆر لە بیرکردنەوەدا ڕوو دەدات، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە جۆری بیرکردنەوەی هەرزەکار لە جۆری هەست پێنەکراوەکان بۆ جۆری مەعنەوی ڕوونکراو (مجرد) دەگۆڕدرێت، واتە هەرزەکار لەمانای شتە هەست پێنەکراوەکانی وەك (یاسا و پرانسیپەکانی فیزیاو ماتماتیك، هێماکان ...... تاد) تێدەگات ولە توانایدا هەیە لە جیاتی وێنە عەقلیە هەست پێکراوەکان وێنە عەقلیە هێمادارو مەعنەویەکان لە پرۆسەی بیرکردنەوەدا بەکار بهێنێ هەر ئەو توانایەشە کەوای لێدەکات گریمان دابنێت و هەموو لایەنەکانی گیروگرفتەکان بەیەکتر بەراورد بکات و دواجاریش بگاتە چارەسەری گونجاوی کێشەکان.

هەروەها لەم قۆناغەدا توانای ئەوەی دەبێت کەلەمانای (یەکسانی، ئازایەتی، دیموکراسی، دادوەری، هاوڕێیەتی، بەهاو هێما ئاینییەکان ... تاد) تێبگات کە لە توانای منداڵدا نییە لەو شتانە تێبگات.

لە قۆناغی هەرزەکاری جۆرە سەربەستی و نەرمی و ئاسانکارییەك (مرونة) لە جۆری بیرکردنەوەدا هەیە، واتە دەتوانێت بیر لە زۆر دیاردە و گیروگرفت بکاتەوەو سنووری کات و شوێن ببەزێنێ و لەشتی هەست پێکراوو جیهانی واقعی دوور بکەوێتەوەو لە جیهانی خەیاڵی ودەرەوەی واقعیدا گوزەر بکات. سەرەرای ئەوەش بەشێوەیەکی مەنتیقی خەیاڵ و واقیع تێکەڵ بکات و گریمانی مەنتیقی و هەنگاوی زانستی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان دابنێت.

لەبەر ئەوە زۆر پێویستە کە مامۆستایان هەرزەکاران فێری بیرکردنەوەی زانستی بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن لە ڕێگەی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەوە گیروگرفتەکانی ژیان چارەسەر بکەن، کەواتە زۆر هەڵەیەو نابێت مامۆستایان لەم قۆناغەدا پەنا بۆ وانەگوتنەوەی زارەکی و ناڵی ببەن و تەنها خۆیان تەوەرەی سەرەکی چالاکی و قسەکردن بن، بەڵکو دەبێت لە ڕێگەی گفت وگۆ و دروست کردنی گیروگرفت و چالاکی دەستی و پراکتیک، قوتابی بکرێت بە تەوەرو چەقی چالاکیەکانی ناو قوتابخانە، بۆ ئەوەی بە ماندوو بوون و چالاکی خۆی (نەك مامۆستا) زانست و شارەزایی دەست بکەوێت و بگاتە چارەسەر کردنی گرفتەکان .

## ٧. گەشەکردنی توانستە عەقلیە تایبەتی و گروپیەکان (القدرات الطائفية و الخاصة):-

زۆربەی زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە لەتەك زیرەکیدا کە توانستیکی عەقلی گشتیە، چەند توانستیکی (تایبەتی) سەربەخۆ یان لەگەڵ یەکتریدا (وەك گروپی تایبەتی) هەن وبە ئاشکرا لە قۆناغی هەرزەکاری سەر هەڵدەدەن کە گرنگترینیان ئەمانەی لای خوارەوەن

### (١) توانستی زمانی (القدرة اللفظية):-

کە بەئاشکرا لەلای هەندێك کەس دەردەکەون و توانای تێگەیشتن و بەکارهێنان و دەربڕینی زمانی و قسەکردن و نووسینیان هەیە، بۆ نموونە لە نووسین و تێگەیشتنی زمان و بەکارهێنانی ووشەکان و زانینی ماناکانیان و دژە ماناکانیان و پێك هێنانی ڕستە و شیتەڵکردنەوەیاندا زۆر سەرکەوتوون و لە کەسانی تر بەتواناترن .

**(٢) توانستی جێگایی ( القدرة المكانية ):-**

ئەم توانایەش بریتیە لە تێگەیشتنی شێوە ئەندازەییەکان و پەیوەندی نێوانیان و زانینی خاڵە لێک چوو جیاوازەکانی نێوان شێوەکان، سەرەڕای زانین و پێش بینی کردنی ئاراستەی سووڕاندنەوەو جوڵاندنەوەی شێوە ئەندازەیی و ئامێرەکان. کە ئەم توانایەش لەلای هەندێک هەرزەکار زۆر بەهێزە، لەکاتێکدا لە لای هەرزەکارانی تر لاوازە .

**(٣) توانستی ژمارەیی ( القدرة العددية ):-**

ئەم توانایەش لەلای ئەو کەسانە بەهێزە کە بەئاسانی چالاکیەکانی (کۆکردنەوە، لێدەرکردن، دابەش کردن، لێکدان، بیرکاری) بە ئاکام دەگەیەنن و لە کەسانی تر سەرکەوتووترن .

**(٤) توانای یادکردنەوەی راستەوخۆ (قدرة التذكر المباشر ):-**

ئەم توانەیەش مانای ئەوەیە کە هەندێک کەس توانای خێرای یادکردنەوەی ژمارەو ناوو ووشەو رووداویان بە شێوەیەکی راستەوخۆ هەیە و زۆربە خێرایی بیریان دەکەوێتەوە .

**(٥) توانای چنینەوەی بەرەو لووتکە (القدرة الاستقرائية):-**

ئەم جۆرە توانستە مانای گەیشتن بە لوتکەو دۆزینەوەی یاسا و بنەما سەرەکیەکانە ئەویش لە رێگەی بەشە جیاجیاکانی دیاردەکەو دەست پێکردن بەتاوو توێکردنی هەموو کونج و قوژبنێکی دیاردەکە تا دەگەین بە چارەسەری گرفتەکەو دۆزینەوەی یاساو بنەما سەرەکیەکانی، بۆ نموونە کاتێک تاوانێک دەکرێت و دادوەرو کەسانی پسپۆر زانیاری هەمە جۆر لەم لاو لەو لا کۆ دەکەنەوەو دواجاریش دەگەنە دۆزینەوەی تاوانبار. ئەم جۆرە

بیرکردنەوەو گەرانە پێ ی دەڵێن توانای چنینەوەی بەرەو لوتکە (القدرة الاسقرائیة) واتە لە کەمەوە بۆ زۆر یان لە بەشی بچووکەوە بۆ هەموو (کۆ) (الکل). کە ئەمەش جۆرێکە لە بیرکردنەوەو گەڕان بەدوای چارەسەرکردنی گرفتەکاندا {(٢،٤،٦،٨،...)، (٥،٢،١،...)، (٣٠،٢٥،٢٠،١٥،١٠،٥ ،١٥،...)} .

## (٦) توانای هەڵێنجاندن و دابەزین بەرەو بەشە جیاجیاکان (القدرة الاستنباطیة):-

ئەم جۆرە توانستە عەقڵیە پێچەوانەی جۆری بەرەو لوتکەیە، واتە ئەم جۆرە توانا عەقڵیە مانای ئەوەیە کە لە لووتکەو یاسا و سەرچاوەو بنەما سەرەکیەکەوە بەرەو خوار بۆ لای بەشە جیاجیاکان شۆڕ دەبێتەوە (من الکل الی الجزء). کەواتە لەم جۆرە بیرکردنەوەدا یاسا و بنەما سەرەکیەکە هەیە، بەڵام لەوێوە دەردەچێت و دەگاتە بەشە بچووک بچووک و هۆکارو فاکتەرە جیاجیاکانی ئەو یاسایە. بۆ نموونە کاتێک دەڵێین:-

(أ) هەموو مرۆڤێك دەمرێت (بنەما)

(ب) پاشاش مرۆڤە (بەش)

(ج) کەواتە پاشاش دەمرێت

یان کاتێك دەڵێین :-

(أ) هەموو کانزاکان بە گەرما دەکشێن (بنەما، بناغە)

(ب) ئاسن کانزایە (بەش)

(ج) کەواتە ئاسنیش بە گەرما دەکشێت.

ئەم شێوازەی بیرکردنەوەو گەیشتن بە ئاکام و چارەسەرکردنە، جۆرە توانستێکی عەقڵیەکە لەلای هەندێك کەس زۆر بەهێزە، بەڵام لەلای هەندێك کەسی ترمام ناوەندی یان لاوازە .

## ٧. توانستی زانینی خێرای شتەكان (السرعة الادراكیة):-

ئەم جۆرە توانستە وا لەخاوەنەكەی دەكات كە بەخێرایی و بە ئاسانی شتەكان بناسێتەوە و بیان زانێت (السید، ١٩٧٤، ص ٢٩٠-٢٩١ ). ئەوەی پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێبكرێت، ئەوەیە كە ئەو توانستە عەقلیانەی سەرەوە بە زۆری لە قۆناغی هەرزەكاری گەشە دەكەن، چونكە لە قۆناغی منداڵی هێشتا ئەو توانستە عەقلیانە پێنەگەیشتوون، بەڵكو لە جیاتی ئەوانە زیرەكی وەك توانستێكی عەقلی گشتی (القدرة العقلیة العامة) لەگەشەكردن دایە و رۆڵی سەرەكی لە فێربوون و زانین و یادكردنەوەی منداڵدا هەیە .

نووسینی یادگاریەكان لە قۆناغی هەرزەكاری زۆر بە زەقی سەرهەڵدەدات كە ئەمەش بەڵگەیەكی ترە لەسەر گەشەكردنی عەقلی و كۆمەڵایەتی هەرزەكار، چونكە پێگەیشتنی توانا عەقلییەكان لە قۆناغی هەرزەكاری دەبن بە پاڵنەر بۆ ئەوەی هەرزەكار دیاردەكانی ژیان تاووتۆی بكات و رای خۆی دەربارەیان بڵێ، ئەمەش دەبێتە هۆی رەخنە گرتن و گلەیی و گازاندە كردن لە كۆمەڵ و خێزان و دیاردە كۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەكان. لەلایەكی تریشەوە ئەو گلەیی و رەخنانە دەبن بە دەروازەیەك بۆ بەتاڵ كردنەوەی خەم و خەفەت و دڵە راوكێ و هەڵچوونەكانی.

## چەند راسپاردەو پێشنیارێك بۆ دایكان و باوكان و مامۆستایان:-

وەك لە ناوەرۆكی باسەكەدا ئاماژەمان بۆ كرد، قۆناغی هەرزەكاری، قۆناغی سەرهەڵدان و گەشەكردنی توانستە عەقلیە تایبەتی و مەعنەوی و رووتكراوەكانە (مجرد ). لەبەر ئەوە زۆر پێویستە كە خێزان و قوتابخانە و كۆمەڵ ژینگەی پڕ وروژێنەرو گونجاو بۆ پەرەپێدان و گەشەكردنی ئەو توانستە عەقلیانە ، دابین بكەن.

**ئینجا بۆ زیاتر گرنگی دان بەم قۆناغە ئەم پێشنیازو ڕاسپاردانەی لای خوارەوە دەخەینە بەر دیدو دەستی دایکان و باوکان و مامۆستایان :-**

١-زۆر گرنگە ڕەچاوی جیاوازی تاکایەتی (الفروق الفردیة) بکرێت، لەبەر ئەوەی هەرکەسەو تایبەتمەندی خۆی هەیەو خاوەنی چەند توانستێکی عەقلیە، کە هەندێکیان زۆر بەهێزە، بەلام لەوانەیە لە ئەوانی تر مام ناوەندی یان لاواز بێت. کەواتە زۆر پێویستە کە ئێمە جەخت لەسەر خاڵە بەهێزو توانستە دەرکەوتووەکانی بکەین.دەرکەوتووە تا ژینگەی خێزانی و قوتابخانەی هەرزەکار دەوڵەمەندو ڕۆشنبیرو پڕ لە ڕووداو و ورووژێنەر بێت، ئەوەندە زیاتر توانستە عەقلیەکانی گەشە دەکەن .

دەرئەنجامی توێژینەوەکانی (ڤیرنون، Vernon ) (١٩٦٦) ئەوەی سەلماند کە زیانی گەورە لە گەشەکردنی عەقلی ئەو هەرزەکارانە دەکەوێت کە لە تەمەنی (١٢) ساڵان و کۆتایی قۆناغی سەرەتایی واز لە خوێندن دەهێنن، لەبەر ئەوەی هێشتا بە تەواوی توانستە عەقلیەکانیان گەشەیان نەکردووە و بواری باشیان لە بەردەمدا ماوە بۆ گەشەکردنیان. بەلام کاتێک واز لە خوێندن دەهێنن ئەوا ڕێژەی زیرەکیان کەمتر دەبێت لە ڕێژەی زیرەکی هاوەڵ و براو کەس و کاریان کە دەخوێنن و لەسەر خوێندن بەردەوام دەبن (زهران، ١٩٨١، ص ٣١٧ ).

کە بەمەش ڕێژەیەکی زۆر لە توانای عەقلی هەرزەکارەکانمان بە فیرۆ دەڕوات و تواجارێش بە زیانی کۆمەڵەکەمان تەواو دەبێت .لەبەر ئەوە زۆر گرنگە کە ژینگەی گونجاوو پێویست لە ناو خێزان و قوتابخانە بۆ منداڵ و هەرزەکارەکانمان دابین بکەین بۆ ئەوەی واز لە خوێندن نەهێنن و لەو تەمەنە ناسکەدا نەکەونە سەر جادەو کۆلان و ناو بازاڕەکان، سەرەڕای ئەوەش هەوڵبدرێت ژمارەیەك لەو منداڵانەی کە کەوتوونەتە سەر جادەو کۆڵانەکان و وازیان لە خوێندن هێناوە بگەڕێنرێنەوە بۆ قوتابخانە، بۆ ئەوەی

ڕێژەی زیرەکیەکانیان بەرز بکرێتەوەو بواری گونجاویش بۆ گەشەکردنی عەقلیان بڕەخسیندرێت .

٢- زۆر گرنگە ڕابەرە پەروەردەییەکان (المرشد التربوی) ڕۆڵی خۆیان بگێڕن و یارمەتی قوتابی هەرزەکار بدەن بۆ ئەوەی بواری خوێندن و کارکردنی گونجاو بۆ خۆی هەڵبژێرێ بەمەرجێك لەگەڵ توانستە عەقلیەکانیدا چون یەك بێت .

٣- پێویستە لەم قۆناغەدا زیاتر گرنگی بە چالاکی هەرزەکار بدرێت و لەسەر خوێندنەوەو چالاکی دەرەکی و تاقیکردنەوەو تاووتوێ کردنی دیاردەکانی ژیان و بیرکردنەوەی زانستی و خۆ فێرکردن هان بدرێت .

٤- زۆر گرنگە بنکە و سەنتەری چاودێری زانستی و چالاکی هەمەڕەنگ بۆ هەرزەکاران بکرێتەوە، بۆ ئەوەی لە ڕێگەیانەوە دوای دەوامی قوتابخانەیان پەرە بە توانستە عەقلیە جیاجیاکانیان بدەن و حەزوو نارەزووەکانیان تێر بکەن .

٥- هۆبە و دامەزراوو قوتابخانەی تایبەتی بۆ هەرزەکارە زۆر زیرەك و بلیمەت و بەهرەمەندەکان بکرێتەوە، بۆ ئەوەی وەك هەموو وولاتانی جیهان سوود لە بەهرەو توانا عەقلیە لە ڕادە بە دەرەکانیان وەربگرێت .

٦- بەردەوام دەرنەچوونی ژمارەیەك هەرزەکار یان لاوازییان لە بابەتێك یان چەند وانە و بابەتێکی کەم، مانای ئەوە نییە کە ئەو جۆرە هەرزەکارانە توانای عەقلی و زیرەکیان زۆر کەمە، بەڵکو ئەوە مانای ئەوەیە کە ئەو جۆرە هەرزەکارانە لە هەندێك توانستی عەقلی تایبەتدا (نەك گشتی) لاوازن، بۆ نموونە (توانستی هونەری یان میکانیکی یان ژمارەیی)، چونکە ئەو جۆرە وانانە پشت بەو توانستە عەقلیانە دەبەستن. ئینجا بۆ چارەسەر کردنی ئەو حاڵەتانە پێویستە ڕێنمایی ئەو جۆرە قوتابیانە بکرێت کە ئەو جۆرە خوێندن و بوارانە هەڵبژێرین کە لە گەڵ توانستە عەقلیەکانیاندا دەگونجێت، یان زیاتر لەو جۆرە بابەت و وانانەدا خۆیان ماندوو بکەن و بەشداری خولی بەهێزکردن بکەن.

# سایکۆلۆژیای خۆگونجاندن و خودی مرۆڤ

خۆ گونجاندن یەکێکە لەو چەمکانەی کە لە زیندەوەرزانینەوە ( بایۆلۆژیا ) وەرگیراوە، بەتایبەتیش لە تیۆرەکەی داروین. ناوەڕۆکی ئەم چەمکە پەیوەستە بە خۆگونجاندنی بوونەوەر، لە تەك ئەو ژینگەو دەوروبەرەی کە تیایدا دەژی. واتە پرۆسەیەکە کە بوونەوەر بەشێوەیەکی گشتی ( بە ویستی خۆی بێت یان بەشێوەیەکی خۆڕسك و ڕەمەکی - غریزی - ) هەوڵی خۆسازاندن و خۆ گونجاندنیەتی تاوەکو لەناو نەچێت و لە ژیاندا بمێنێتەوە، وەك چۆن داروین لێکی دەداتەوە، ململانێیەکە لە پێناوی مانەوەو نەفەوتان. هەمووشمان باش دەزانین کە مرۆڤ بەتایبەتی، بوونەوەرەکانی تر بەگشتی زۆر میکانیزم و پرۆسەی لەو جۆرەیان هەیە. بۆ نموونە کاتێك هاوین دێت و گەرما هێرشمان بۆ دەهێنێت یەکسەر جەستەمان بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەست بە دەرهاویشتنی عارەق دەکات بۆ ئەوەی خۆی لەگەڵ ئەو گەرمایە بگونجێنێ، ئەگەر ئەو پرۆسەیە نەیتوانی کارەکە مەیسەر بکات، ئەو کاتە مرۆڤ جل و بەرگەکانی کەم دەکاتەوە. ئەگەر ئەوەش چارەسەری گرفتەکەی نەکرد، ئەوا پەنا ( بۆ خواردنەوەی ئاوی سارد و ساردەمەنی یان گەڕان بەدوای شوێنی سێبەرو فێنکدا ) دەبەین. سەرجەم ئەو هەوڵدانانە بە پرۆسەی خۆگونجاندن لە قەڵەم دەدرێت.

بەڵام ژیان ئەوەندە سادەو ساکار نییە کە بەو ڕەفتارو هەڵس و کەوتانە لەگەڵ خۆمانی بگونجێنین، بەڵکو کێشەو ململانێکان ئەوەندە زۆرن کە هەندێك جار مرۆڤ ناتوانێت خۆی لەگەڵیان بگونجێنێ یان کەرەستەو میکانیزمی خۆگونجاندنی تەواوی لەبەر دەستدا نییە، بۆیە لە ناکامدا ڕووبەڕووی زۆر کێشەی کۆمەڵایەتی و دەروونی دەبێتەوە.

لەبەر ئەوە دەروونزانەکان چەمکی خۆگونجاندنیا( التکیف )( Adjustment ) لە زیندەوەرزانیەوە وەرگرت و لە بواری دەروونزانیدا بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکاریان هێنا، بەمەبەستی دیاریکردنی خۆگونجاندنی مرۆڤ لەگەڵ ژینگەو دەوربەرەکەی بە هەموو

جۆرەکانییەوە (ژینگەی جوگرافی، ژینگەی مێژوویی، ژینگەی کۆمەڵایەتی، ژینگەی دەروونی). واتە مرۆڤ چۆن خۆی لەگەڵ ژینگەی سروشتی (ئاوو هەواو شاخ و گەرماو سەرماو بیابان و ....، هتد) دەگونجێنێت بەهەمان شێوەش خۆی لەگەڵ ژینگەی کۆمەڵایەتی و دەروونی دەسازێنێ.

بێگومان جۆری خۆگونجاندنەکان و پێداویستی و برەکەی لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر دەگۆڕێ، بۆ نموونە کاتێك منداڵ لە قۆناغی شیرەخۆریدا دەبێت شێوەی خۆگونجاندنەکەی جیاوازە لە یەکێکی تر کە لە قۆناغی پێش چوونە قوتابخانە دەبێت، هەروەها داواکاری و پێداویستیەکانی قۆناغی هەرزەکاری وەك داواکاری و پێداویستیەکانی قۆناغی لاوێتی یان کامڵی نییە. ئەمەش بێگومان بۆ سروشتی قۆناغەکەو کێشەو پێداویستیەکانی لەلایەك و تواناو لێهاتوویی مرۆڤ لەو قۆناغەدا لایەکی تر دەگەڕێتەوە. واتە داوا لە منداڵ ناکرێت و کێشەی ئەو نییە کە خۆی لەگەڵ ژینگەی کارکردن و ماڵداری و هاوسەری بسازێنێ، بەلام لەسەر هەرزەکارو لاوو مرۆڤی کامڵە کە توانای خۆگونجاندنی لەتەك ئەو داواکاری و کێشەو گیروگرفتانەدا هەبێت، بەواتایەکی تر مرۆڤ لەهەر قۆناغێکی ژیاندا (ساوایەتی، پێش چوونە قوتابخانە، قۆناغی چوونە قوتابخانە، هەرزەکارو لاوێتی، کامڵی، بەساڵاچوویی) ڕۆڵی تایبەتی خۆی هەیە و دەبێت پێیان هەڵبستێت و خۆی لەتەکیان بگونجێنێ بۆ ئەوەی کەسێکی دەروون دروست بێت و کەسایەتیەکی سەرکەوتووی هەبێت، بەلام ئەگەر نەیتوانی خۆی لە تەکیان بسازێنێ ئەوا ڕووبەڕووی کۆمەڵێك کێشەی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەبێتەوە.

شایەنی ئاماژەپێکردنە، کە خۆگونجاندنی کۆمەڵایەتی و دەروونی زۆر زەحمەت و گرنگترە لە خۆگونجاندنی سروشتی، لەبەر ئەوەی دیاردە سروشتیەکان بەپێی ڕێساو یاسای سروشتی کاردەکەن و بەئاسانی دەتواندرێت پێش بینی هاتن و ڕوودان و چۆنیەتی خۆگونجاندنیان بکرێت (بێجگە لە چەند دیاردەیەکی سروشتی کەم نەبێت وەك بومەلەرزەو زریان و لافاوو گەردەلوول) و زۆر ئاڵۆز نین. بەلام دیاردە دەروونی و

کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان ئەوەندە زۆرو ئاڵۆزو هەمە لایەنەن کە بەئاسانی کۆنترۆڵ و پێش بینی ناکرێن و خۆگونجاندن لەگەڵیان ئاسان نییە.

چەمکی خۆگونجاندنی دەروونی زۆر مانا هەڵدەگرێت، بەلام بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە (توانای بونیادنانی پەیوەندی سەرکەوتوو کاریگەر لەنێوان تاك و ژینگەکەیدا) دەگەیەنێت، واتە ئەو تواناو پرۆسە دینامیکی و زیندووەیە کە بەردەوام یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ خۆگۆڕین و خۆسازاندن لە تەك ئەو ژینگە بەرفراوانەی کە تیایدا دەژی، ئیتر ژینگەکە سروشتی بێت یان کۆمەلایەتی یان دەروونی یان سیاسی ...هتد. ژینگە بەپێی قۆناغ و کات و شوێن دەگۆڕدرێ، بۆ نموونە مرۆڤێك لە گوندێکی بچووك بژی، وەك ئەو کەسە نیییە کە لەناو شارێکی قەرەبالغ و گەورە بژی، چونکە ژیان لەو گوندە سادەو ساکارەو پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان و کێشەو گیروگرفتە دەروونیەکان کەم و سادەو بێ گرێ و گۆلن، بەلام ژینگەی شار ئاڵۆزو دژوارەو کێشەو گیروگرفت و پەیوەندییەکان هەمەلایەنەن و خۆگونجاندن لە تەکیان ئاسان نییە، لەبەر ئەوە ئەو کەسەی لە ژینگەی ئاڵۆزو قەرەبالغ و دژواردا بژی، ئەوا کێشەو گیروگرفت و فشارەکانی سەری زۆرن و هێزو گڕوتینی (دەروونی و کۆمەلایەتی) زۆری گەرەکە بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی لەگەڵ ژینگەو دەوروبەرەکەی بخوڵقێنێ. هەر لەبەر ئەوەشە کە دیاردەو گیروگرفتە دەروونی و کۆمەلایەتی و ئابووری و پەروەردەیی و سیاسیەکان لە ژینگە قەربالغ و ئاڵۆزەکاندا زیاترن.

هەمووشمان باش دەزانین کە ئێستا پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان خزم و کەس و دراوسێ و هاورێ وەك جاران نەماوەو کەمتر گرنگی بە یەکتری دەدەن و بەدەم هاوارو داواکارییەکانی یەکتریەوە دەچن، ئەوەش بە پلەی یەکەم بۆ ئاڵۆز بوونی ژیان و زیاد بوونی پێداویستیەکان و نامۆ بوونی تاکەکان دەگەڕێتەوە، کە مرۆڤی ئەم سەردەمە زیاتر خەریکی خۆی و خێزانەکەیەتی و بەدوای چارەسەرکردنی کێشە تایبەتیەکانی خۆیدا وێڵەو کەمتر بیر لە کێشەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتی و گشتیەکان دەکاتەوە، هەر لەبەر ئەوەشە کە خۆگونجاندنەکەی ئاسان نییە و زۆر کێشەو گیروگرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی رووبەرووی بۆتەوە.

## دەروونی مرۆڤ و حەزووئارەزووەكانی دەریایەكی بێ بنە

بە بڕوای زۆر لە فەیلەسوفان و زانایان و دەروونزانان، كێشەی سەرەكی مرۆڤ دەروونی خۆیەتی، واتە سەرچاوەی زۆری ململانێكان و كێشەكانی مرۆڤ زیادەڕۆیی و كۆنترۆڵ نەكردنی خوودە، دەروونی مرۆڤ پێكهاتەیەكی ئاڵۆزەو بەشەكانی بەردەوام لە ململانێدان و ئەگەر (منی) مرۆڤ بەهێزو پتەو نەبێت، ئەوا حەزوو ئارەزووە شەهوانیەكانی (ئەو) یان بڕیارو فەرمانەكانی (منی باڵا) زاڵ دەبن و كەسایەتی لە ڕێچكەی ئاسایی خۆی دەردەچێت، چونكە دەروونی لغاو نەكراو وەك ئەسپێكی شێی سەرەڕۆ، سوارەكەی سەر پشتی هەڵدەداتە خوارەوە یان سەر شێتانە خۆی و خاوەنەكەی دەخاتە ناو چەندەها چاڵ و شیوەوە، واتە دەستە مۆكردن و كۆنترۆڵ كردنی دەروون تەنها زامنی دروستی دەروونی و ژیانێكی ئارامە. بەڵام ئەوەی جێگەی داخە زۆربەی زۆری تاكەكانی كۆمەڵ كوێرانەو بێ بیركردنەوەیەكی مەنتیقیانە دوای حەزوو ئارەزوو شەهواتەكانی دەروونیان كەوتوون و بە هیچ تێر ناكرێن، بۆیە بەردەوام لە بارێكی دەروونی ئاڵۆزدا دەژین و هەست بە ئارامی و دڵنیایی ناكەن.

### خودی مرۆڤ:-

دەتوانین خودی مرۆڤ و گرنگیەكانی بۆ سێ سەرچاوە بگەڕێنینەوە، كە ئەو سێ سەرچاوەو فاكتەرە كاریگەرییان لەسەر بونیادو گرنگی خود هەیە. واتە مرۆڤ لەو سێ رەهەندو سەرچاوەوە سەیری خودی خۆی دەكات لەوانە:-

### سەیركردنی توانست ولێهاتوویەكانی خوود:-

سەیركردن و هەڵسەنگاندنی خود لەلایەن تاك خۆیەوە گرنگی خۆی هەیە، واتە كاتێك تاك بەچاوی ڕێزو گرنگی سەیری خودی خۆی دەكات و لە توانستە عەقڵی و

هەڵچوونی و جەستەییەكانی خۆی ڕازییەو بڕوای پێیان هەیەو ئەو هەستەی لا دروست بووە كە ئەو توانای فێربوونی هەیەو كەسێكی لێزان و لێهاتووە، ئا لەم حاڵەتەدا لە بارێكی دەروونی ئاسایدا دەژی و لە زۆر كێشەو گرفتی دەروونی دوور دەكەوێتەوە و خۆگونجاندنی لەگەڵ خۆی و ژینگەكەی ئاسایی دەبێت. بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە بڕوای بە توانست و لێهاتوویەكانی خۆی نەبوو، هەروەها بەچاوی گومان و دوودڵی و نزم سەیری خۆی كردو ئەو بڕوایەی لەلادروست بوو بوو كە ئەو كەسێكی بێدەسەڵات و لاوازو بێ بەهایە، ئەو كاتە خۆگونجاندنی لەتەك خودی خۆی و كەسانی چواردەوری زەحمەت دەبێت و بەردەوام ڕووبەڕووی كێشەو گرفتی دەروونی دەبێتەوە.

## پەیوەندییە كۆمەڵایەتیەكان و خودی مرۆڤ:-

ڕەهەندێكی تری خودو دەروونی مرۆڤ جۆری پەیوەندییە كۆمەڵایەتیەكان و شێوەی هەڵسەنگاندنیانە، واتە كاتێك مرۆڤ لە پەیوەندییە كۆمەڵایەتیەكانی ڕازی دەبێت و ئەو هەست و سۆزەی لە لادروست دەبێت كە ئەو كەسێكی خۆشەویستە و كەسانی چواردەوری ڕێزی دەگرن و مایەی شانازی كردنە، ئەوا خۆگونجاندنی لەتەك خودی خۆی و ژینگەكەی ئاسان دەبێت و لەگەڵیان ناكەوێتە ململانێ و كێشەو بگرەوبەردەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە، ئەگەر ئەو هەستەی لەلا دروست بوو كە ئەو كەسێكی بێزراوو پشت گوێ خراوو بێ بەهایەو كەسانی چوار دەوری ڕێزی ناگرن و لە ئەنجامی كۆمەڵێك فاكتەری ئابووری و ئایینی و سیاسی و نەتەوەییەوە خراوەتە پەراوێزەوەو ڕۆڵی شیاوی خۆی پێنەدراوەو كەسانی دەوروبەری ڕێزی ناگرن، ئەو كاتە بە چاوی سووك سەیری خۆی دەكات و بڕوای بەخۆی نابێت و خۆگونجاندنی لە تەك كۆمەڵ و دام دەزگاكانی زۆر زەحمەت و دژوار دەبێت و ڕووبەڕووی چەندەها كێشەی دەروونی و كۆمەڵایەتی دەبێتەوەو بڕواو متمانەی بە كەسانی چواردەوری نابێت و بە چاوی دوو دڵی و گومان سەیریان دەكات، واتە چۆن خەڵكی سەیری تاك دەكەن و چەند ڕێزی دەگرن و چۆن لێی تێدەگەن، بەو شێوەیەش تاك خۆی تیایاندا

دەبینێتەوە، ئینجا ئەگەر وێنەی خود لەناو ئاوێنەی کۆمەڵ و داو و دەزگاکانی روون و ئاشکراو جوان و رازاوە بێت ئەوا تاکیش خودی خۆی بەو شێوەیە دەبینێت.

بەڵام ئەگەر لێڵ و شێوێنراوو ناشیرین و دزێو بێت، بێگومان تاکیش زۆرجار بەو شێوەیە خودی خۆی دەبینێ و هەڵی دەسەنگێنێ، هەر لەبەر ئەوەشە ئەو کەسانەی کە لەناو کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی هەست بە ئارامی و دڵنیایی ناکەن و ئاوێنەی کۆمەڵ وێنەیەکی جوانی خودیان ئاوەژوو پێچەوانە ناکاتەوەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و سۆزییەکانی نێوان خۆیان و کۆمەڵ لاوازو پڕ لە کەلێن و دەلاقەیە، دەبینین بە زۆری ئەو جۆرە کەسانە سەرەڕۆو لادەرو لاسار دەردەچن و بەردەوام پێشێلی داب نەریت و یاسا و رێساکانی کۆمەڵ دەکەن و بە هەموو شێوەیەك دەیانەوێت تۆڵە لەو کۆمەڵ و دام و دەزگایانە بکەنەوە کە هیچ کات لەناویاندا هەستیان بە دڵنیایی و ئارامی نەکردووەو هەردەم وێنەکانیان لەناو ئاوێنەکانیاندا شێواوو ناشیرین و بێزراو بووە، واتە ئەو جۆرە کەسانە دەگمەنە بتوانن خۆیان لەگەڵ کۆمەڵ و داو و دەزگاکانی بسازێنن و لە خودی خۆیان و کەسانی چواردەوریان رازی بن، بە پێچەوانەوە خۆ گونجاندنیان نابێت و بەردەوام بە چاوی گومان و بێ متمانەیی سەیری کۆمەڵ و ئەندامەکانی دەکەن و دواجار کێشە بۆ خۆیان و کۆمەڵەکەیان دروست دەکەن.

## خود چۆن دەبێت ببێت ( خودی نموونەیی ):-

هەموو مرۆڤێك لە ئێمە چەند خودێکی هەیەو هەریەك لەو خودانە گرنگی و رەهەندی تایبەتی خۆی هەیە، هەموو مرۆڤێك خودێکی تایبەتی هەیە، کە بووە بە سەرداب و گەنجینەی نهێنیەکان و تەنانەت بۆ خۆشەویسترین و نزیکترین کەسی نادرکێنێ و زەحمەتە هەتا مردن کەس پەی پێیان ببات، واتە ئەم خودە پڕە لە نهێنیە تایبەتیەکانی تاك و زۆربەیان عەیب و ناشیرین و ناکۆمەڵایەتین و تاك ناتوانێت باسیان بکات لەبەر ئەوەی باسکردن و ئاشکرا کردنیان کەسێتی و خودی تاك دەخاتە مەترسی و

بەر هەرەشەی کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی، بۆیە هەر بە نهێنی و شاراوەیی دەیان هێڵێتەوەو زۆرجاریش دەبن بە سەرچاوەو بنەمای نەخۆشی و گرفتە دەروونیەکان.

لەلایەکی ترەوە مرۆڤ خودێکی تری هەیە ئەویش خودی کۆمەڵایەتیە، واتە وەك دەمامکێك رووی خودی راستەقینەی پێ دەشارێتەوەو جۆرە خودێکی کۆمەڵایەتی لێدروست دەکات و بەو شێوەیە رەفتارو هەڵس و کەوت دەکات کە کۆمەڵ دام و دەزگاکانی پێیان خۆشەو لەگەڵ داب و نەریت و رێساو یاسا کۆمەڵایەتی و ئاینیەکان دەگونجێن و هاوشێوەن. واتە ئەم جۆرە خودە بۆ رازی کردنی کۆمەڵ و تاکەکانیەتی و بەمەبەستی خۆسازاندنی کۆمەڵایەتیەو زۆرجار لە راستی و واقیعەوە دوورەو هەر ئەوەندە مرۆڤ لەکۆمەڵ و دام و دەزگاکانی دوور کەوتەوەو بواری تایبەتی خۆی بۆ خولقا ئەوا ئەو دەمامکە کۆمەڵایەتیە دەستکردە فڕێ دەدات و خودی راستەقینەو تایبەتی دەردەکەوێت.

سەرەرای ئەو دوو خودە مرۆڤ خودێکی راستەقینەو واقیعیانەشی هەیە، واتە توانستی عەقلی و جەستەیی و ویژدانی و ئاکاری خۆی چەندە، سەرجەم ئەوانە خودی واقیعی و راستەقینەی بێ روو تووش و میکیاجی ئەو تاکە دەردەخات، لەهەمان کاتیشدا هەر یەکێك لە ئێمە خودێکی نموونەیی خۆی هەیە، کە بەهیواو ئاواتی ئەوەیە رۆژێك لە رۆژان پێی بگات. واتە ناوەرۆکی خودی نموونەیی سەرجەم ئەو خەون و خەیاڵ و حەزوو ئارەزوو ئاوات و هیواو خۆزگانەیە کە مرۆڤ رۆژ لەدوای رۆژ پلانی بۆ دادەنێت و بەنیازە رۆژێك لە رۆژان پێی بگات. ئینجا ئەگەر ناوەرۆك و جەوهەری هەردوو خودی واقیعی و نموونەیی لەیەکەوە نزیك بوون، ئەوا هێنانەدی حەزوو ئارەزوو خەونەکانی خودی نموونەیی ئاسان دەبێت و مرۆڤ لە ژیانی واقیعی و لە کاتی هێنانەدی حەزوو ویست و ئارەزووەکانی تووشی کێشەوگرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی نابێت و خۆگونجاندنی لەگەڵ خودی خۆی و ژینگەو دەوروبەرەکەی ئاسان دەبێت و دەتوانین بڵێین ئەو مرۆڤە کەسێکە کە برواى بەخۆیەتی و بە باشی لەخۆی گەیشتوەو ئازایەتی تەواویشی هەیە کە بەرەنگاری کۆسپەکانی ژیان

ببينەوەو پلانەكانى ژيانى واقيعى بهێنێتەدى، سەرەڕاى ئەوەش بڕواى بە كۆمەڵ و دام و دەزگاكانى دەبێت و دەتوانێت بە ئاسانى خۆى لەتەكياندا بسازێنێ.

كەواتە خۆگونجاندنى مرۆڤ لەگەڵ خودى خۆى و لەگەڵ كۆمەڵەكەى پەيوەستە بە كۆمەڵێك فاكتەرو هۆكارەوە لەوانە (ئەو ژینگەو بارودۆخەى كە تاكى تێدا دەژى، خودو كەسايەتى تاك، بارى ئابوورى و ڕۆشنبيرى و كۆمەلايەتى، بەربەست و كۆسپەكانى ژيان، سروشتى دام و دەزگا كۆمەلايەتيەكان) هەريەك لەو فاكتەرانە كەم يان زۆر بەشدارى لەخۆ گونجاندنى تاك دەكات، واتە تا چەند كەسايەتى مرۆڤ بە هێز بێت و بڕواى بەخۆى هەبێت و كەمترين كۆسپ و تەگەرە بۆ تاك دروست بكرێت، ئەوەندە مرۆڤ بە ئاسانى دەتوانێت خۆى لەگەڵ ژينگەو دەوروبەرەكەى بسازێنێ، بەلام ئەگەر تاك بەچاوى نزم و گومان سەيرى خودى خۆى كردو بڕواى بەخۆى نەبوو لەهەمان كاتيشدا پەيوەندى لەگەڵ كۆمەڵ و دام و دەزگاكانى لاواز بوو، سەرەڕاى بوونى كێشەو بەربەستى كۆمەلايەتى و دەروونى، ئەوا خۆگونجاندن زۆر زەحمەت و دژوار دەبێت و ئەو جۆرە تاكانە لە داهاتوودا ڕووبەڕووى چەندەها كێشەو گرفتى دەروونى و كۆمەلايەتى دەبنەوە.

ئينجا ئەگەر بمانەوێت تاكەكانى كۆمەڵ لە كێشەو گرفتى دەروونى و كۆمەلايەتى دوور بن و وەك پێويست خۆيان لەگەڵ خودى خۆيان و ژينگەو دەوروبەرەكەيان بسازێنن، ئەوا دەبێت ڕەچاوى ئەم خالانەى خوارەوە بكەين و بەهەموو لايەك هەوڵى دابين كردنيان بدەين:-

١- دەبێت منداڵ و هەرزەكارو لاوەكانمان لە ناو خێزان و كۆمەڵدا بەشێوەيەك پەروەردە بكەين كە بە چاوى ڕێزو بەرز سەيرى خودى خۆيان بكەن و بڕوايان بەخۆيان و هێزو تواناكانيان هەبێت.

٢- زۆر گرنگە شێوازی پەروەردە کردن و مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵ و هەرزەکارەکانمان دوور بێت لە توندو تیژی و لەسەر بنەمای یەکسانی و ڕەچاوکردنی مافەکانیان و دیالۆگ و لێک تێگەیشتن بونیاد نرابێت و دوور بێت لە کەڵەگایی و دیکتاتۆریەت و خۆ سەپاندن .

٣- پێویستە ژینگەو بارودۆخی گونجاو بۆ گەشەکردنی خودی بۆ منداڵ و هەرزەکارەکانمان بخوڵقێنین و هەوڵ بدەین خودی واقعی و خودی نموونەییان لێک نزیک بێت، واتە خودی نموونەییەکەیان زۆر بەرزو ناواقعی نەبێت، بۆ ئەوەی منداڵ و هەرزەکارەکانمان زۆر بەرز نەفڕن و لە داهاتوودا نزم بنیشنەوە، لەهەمان کاتیشدا خودی نموونەییان زۆر نزم نەبێت و نەزانن سوود لە تواناو لێهاتووییەکانیان وەربگرن.

٤- لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە توانای کۆنترۆلکردنی خودی سەرەڕۆی خۆمان (ئەوو ڕەمەکانی) هەبێت و جڵەوی حەزو ئارەزووە شەهواتیە بێ سنوورەکانی بۆ شل نەکەین و بتوانین سنوورێکی بۆ دابنێین بەمەرجێك لەتەك داواکارییەکانی (منی باڵا) و پێداویستیە واقعیەکانی ژیان و داواکارییەکانی (من) بگونجێت.

٥- هەوڵی دابین کردنی پێداویستیە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانی منداڵ و هەرزەکارەکانمان بدەین لە پێشەوەی هەمووشیان (ئاسایش و دڵنیایی، خۆشەویستی، ڕێزگرتن، چوونە ناوکۆمەڵ و دام و دەزگاکان).

## مێرد منداڵان و لاساری

مەبەست لە مێرد منداڵان ئەو کەسانەن کە تەمەنیان لە نێوان (٩) تاوەکوو (١٨) ساڵانە {بەڵام بە پێی یاسای هەموارکراوی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان تەمەنیان لە نێوان (١١ – ١٨) ساڵانە}. واتە زۆربەی قۆناغی هەرزەکاری دەگرێتەوە. بە پێی یاسای عێراقی، هەر کەسێك لەو تەمەنەدا هەڵەو لاساری و سەرەڕۆییەك بکات، بە لاسار و سەرەڕۆ (جانح) دادەنرێت و لە دادگای مێرد منداڵان (محكمة الأحداث) دادگایی دەکرێت، هۆی سەرەکیشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو مێرد منداڵانە لە قۆناغی گەشەکردندان و بەتەواوی پێنەگەیشتوون و لەو تەمەنەدا کەم و کورتی زۆر لەبیرکردنەوەو عەقڵیەتیاندا هەیە و ناتوانن وەك کەسانی کامڵ و پێگەیشتوو بیربکەنەوەو دیاردەکانی ژیان هەڵبسەنگێنن و لایەنی سۆزی (عاطفی)و هەڵچوونیان بەسەر لایەنی عەقڵیاندا زاڵە و لە زۆر بارودۆخدا ناتوانن کۆنترۆڵی حەزوو ئارەزوو هەڵچوونەکانیان بکەن، لەبەرئەوە هەندێکیان تووشی لاساری دەبن.

گرفتی (لاساری مێرد منداڵان) لە ترسناکترین ئەو گیروگرفتانەن کە زۆربەی گەلانی جیهان بەدەستیەوە دەناڵێنن، لەبەرئەوەی ئەم گرفتە تایبەت نیە بەکاتێکی دیاریکراو یان قۆناغێکەوە، بەڵکو ئەگەر چارەسەری بنەڕەتی نەکرێت، ئەوا لەتەك ئەو کەسانەدا بەردەوام دەبێت و وەك سێبەری خۆیان لە گشت قۆناغەکانی تری ژیانیاندا لەگەڵیاندا بەردەوام دەبێت (المغربی، ١٩٦٠).

زۆربەی توێژینەوە زانستیەکانی بواری تاوان و لاساری ئاماژە بۆئەوە دەکەن، کە ڕەگ و ریشەو سەرچاوەی تاوانی گەورەکان بۆ سەردەمی منداڵی و هەرزەکارییان دەگەڕێتەوەو رێژەیەکی زۆری تاوانبارە گەورەکان لەسەردەمی منداڵی و هەرزەکاریشیاندا تاوان و لاسارییان بە ئەنجام گەیاندووە، لەبەرئەوە لاساری بە گرفتێکی ترسناك لە قەڵەم دەدرێت، چونکە دوور نیە کە لەگەڵ ئەو مێرد منداڵانە بەردەوام بێت و ژیان و چارەنووسی

داهاتوویان بخاتە مەترسیەوە. گومانی تێدا نیە كە لاساری مێرد منداڵان دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی جیهانیەو هەموو كۆمەڵگاكان بە كۆن و تازەیانەوە، بە سادەو ئاڵۆزیانەوە، رووبەرووی بوونەتەوەو وەك مۆتەكە سەر سنگیانی گرتووە، ئەوەی جێگای ئاماژە بۆ كردن بێت ئەوەیە كە هەتاوەكوو ئێستا هیچ یەكێك لە كۆمەڵزان و دەروونزانەكان كۆمەڵگایەكیان نەدۆزیوەتەوە كە ئەم دیاردەی تێدا نەبێت. (سعفان ، ١٩٦٦، ص٤٨).

كۆمەڵگای ئێمەش وەك هەموو كۆمەڵگاكانی تر رووبەڕووی ئەم گرفتە بۆتەوەو ژمارەیەك لە مێرد منداڵەكانمان بەدەستیەوە دەناڵێنن و زیانی گەورەشیان بە خێزان و كۆمەڵەكەیان گەیاندووە، گومانیشی تێدا نیە ئەو بارودۆخەی كە كوردستانی پێدا تێپەڕی، زۆر ئاڵۆزو دژوارەو زۆر هۆكاری دەرەكی و ناوەكی بۆ لادان و لاساری مێرد منداڵەكانمان لە ئارادان و رێژەكەیانی بەرەو زیادكردن بردووە، ئینجا بۆئەوەی رێژەیەكی زۆری هەرزەكاران و لاوانمان لەو بەڵایە بپارێزین و بەشێوەیەكی زانستیانەش ئەم دیاردە دژێوە تاوو توێ بكەین، وا لەخوارەوە ئاماژە بۆ گرنگترین ئەو هۆكارانەی كە دەبنە هۆی لاساری مێرد منداڵان دەكەین.

## هۆكارەكانی لاساری مێرد منداڵان

لەبەرئەوەی لاساری مێرد منداڵان دیاردەیەكی ئاڵۆزو هەمە لایەنەیە، بۆیە لە رێگەی تەنها هۆكارێكەوە ناتوانرێت لێك بدرێتەوە، سەرجەم ئەو توێژینەوانەی كە لەسەر لاساری مێرد منداڵان (جنوح الأحداث) كراوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە زیاتر لە هۆكارێك لەم هۆكارانەی لای خوارەوە لەگەڵ یەكتریدا كار لەیەك دەكەن و دەبنە هۆی دروست بوونی ئەم دیاردەیە، هۆكارەكانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:-

## ١) خێزان:-

خێزان یەکەم دامەزراوی کۆمەڵایەتیە کە ڕۆڵی گرنگ و ترسناکی لەسەر کەسایەتی و چارەنووسی منداڵەکانی هەیە، ئینجا خوانەخواستە ئەگەر لە ئەنجامی هەرچ هۆیەکەوە بێت ڕووبەڕووی لێک ترازان و گێروگرفت و ناخۆشی بووەوەو نەیتوانی لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا بە ڕۆڵی خۆی هەڵبستێت، دوورنیە تاکەکانی ڕووبەڕووی زۆر گرفت و ناخۆشی ببێتەوە، لەوانە لاساری و سەرکێشی منداڵەکانی.

یەکێک لە گرنگترین و ترسناکترین ئەو گرفتانەی کە ڕووبەڕووی خێزان دەبێتەوە لێک ترازان و تێک چوونی شیرازەی خێزانە، بە داخەوە هەندێک جار خێزان لە ئەنجامی تەڵاق و لێک جیابوونەوەو شەڕو ئاژاوەو هەژاری و نەبوونیەوە تووشی لێک ترازان دەبێت و ئیتر ناتوانێت ژینگەی کۆمەڵایەتی و دەروونی گونجاو بۆ گەشەکردنی ئاسایی منداڵەکانی دابین بکات و هیچ یەکێک لە تاکەکانی ئەو خێزانە پڕ لە ئاژاوە هەست بە ئارامی و دڵنیایی ناکات و بەردەوام لە خەم و خەفەت و ئازارو دڵەڕاوکێدا دەژی و دوورنیە هەریەکەیان بەلایەکدا پەرەوازە ببێت و لە دەرەوەی خێزان هەست بە دڵنیایی بکەن.

دەرەنجامی توێژینەوەکانی ئەم بوارە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ژمارەیەکی زۆری ئەوانەی تووشی تاوان و لاساری بوون، لەو خێزانانەدا پەروەردە بوون کە تووشی لێک ترازان بوون و وەک منداڵانی تر هەستیان بە سۆزو خۆشەویستی و چاودێری دایک و باوکیان نەکردووە و ژیانی خێزانیان وەک دۆزەخ وابووە. گومانی تێدانیە منداڵ و هەرزەکار بەردەوام پێداویستیان بە ئامۆژگاری و ڕێنمایی دایک و باوک و گەورەکانیان هەیە و دەبێت لە باوەشی گەرمی دایک و باوکدا پەروەردە بین و هەست بە ئارامی و دڵنیایی بکەن.

بەڵام ئەگەر دایکی نەمابێ یان تەڵاق درابێ و باوەژنی خراپی هەبێت و باوکی لەبەر نەزانی و کەم تەرخەمی خۆی منداڵەکانی بەرەڵا کردبێ و بەردەوام ئاگاداری هەڵس و کەوتەکانیان نەبێت و لە لایەکی تریشەوە نەتوانێت پێداویستیەکانی ڕۆژانەیان بۆ دابین بکات، دوورنیە منداڵەکانیان ملی ڕێگاو کوچەو بازاڕەکان بگرنە بەرو ڕووبەڕووی لاساری و سەرەڕۆیی ببنەوە.

لە لایەکی ترەوە جاری وا هەیە خێزان تووشی لێک ترازان نەبووەو ژیانی ئاسایی خۆی هەیە، بەڵام شێوازەکانی پەروەردەکردنی هەڵەیە، بە داخەوە هەندێک دایک و باوک بەردەوام پەنا بۆ شێوازە هەڵەکانی وەک (تووندو تیژی و لێدان، بەرەڵاکردن و لێنەپرسینەوە ... تاد) دەبەن. دەرکەوتووە لێدانی بەردەوام و بەکارهێنانی تووندو تیژی لەکاتی پەروەردەکردنی منداڵدا دەبێتە هۆی برینداركردنی هەست و سۆزی منداڵ و پاڵ پێوەنانی بۆ کردنی لاساری و سەرکێشی، چونکە ئەو منداڵە یان هەرزەکارەی کە بەردەوام ڕووبەڕووی لێدان و توندوتیژی دەبێتەوە، لە پاشەڕۆژدا کەسێکی شەڕخوازو تۆڵەسێنەر دەردەچێت و ئەگەر نەشتوانێ تۆڵەی خۆی لە دایک و باوک و کەسانی تری بکاتەوە ئەوا لە دەرەوەی خێزان داخی دڵی خۆی بە کەسانی تر دەڕێژێ و بەمەش تووشی لاساری و سەرەڕۆیی دەبێت.

هەروەها هەندێک دایك و باوك بەردەوام منداڵەکانیان بەرەڵا دەکەن و چاوپۆشی لەسەرەڕۆیی و هەڵەکانیان دەکەن و ڕێگای ڕاستیان پیشان نادەن و بەڕۆڵی دایکایەتی و باوکایەتی خۆیان هەڵناسن، گومانیشی تێدانیە کە زۆربەی زۆری ئەو منداڵانە سەرەڕۆو لاسار دەردەچن و بەردەوام ڕووبەڕووی گیروگرفت و ناخۆشی دەبنەوەو ناتوانن بەشێوەیەکی دروست گرفتەکانیان چارەسەر بکەن و کەسایەتی لاوازیان دەبێت، چونکە لەسەر دەستی دایك و باوکیان وەك پێویست پەروەردە نەکراون و بە زانست و ڕەوشتی جوان چەکدار نەکراون.

**٢) برادەری خراپ:-**

برادەرو هاوڕێ ڕۆڵی تایبەتی خۆی لەسەر باری دەروونی و بیرکردنەوەی مێرد منداڵان هەیە، بە تایبەتیش ئەو مێرد منداڵانەی کە لە لایەن دایك و باوکیانەوە پشت گوێ خراون یان ژیان و گوزەرانی خێزانیان ئاڵۆزو دژوارەو بەردەوام لە ناخۆشیدا دەژین، ئا لەم کاتانەدا ئەو مێرد منداڵانە بەرەو لای هاوڕێ و برادەرەکانیان دەڕۆن و لەوێ زیاتر هەست بە ئارامی و دڵنیایی دەکەن و بەهیوای ئەوەن کە قەرەبووی ئەو بارودۆخە ناڵەبارەی خێزانەکانیان بۆ بکەن، بەڵام مەرج نیە ئەم بۆچوونەی ئەو مێرد منداڵانە وەك خۆی دەربچێت، لەوانەیە بە پێچەوانەوە، ئەومێرد منداڵانە تووشی کۆمەڵێك برادەری خراپ بن و ئەوەندەی تر ژیان و باری دەروونیان ئاڵۆزتر بکەن، هەندێك جار برادەری خراپ ئەو مێرد منداڵانە هەڵدەخەڵەتێنن و بەرەو لاساری و سەرەڕۆییان دەبەن، لەوانەیە یەکەم جار بە بیانووی ئیش و کارێکەوە هەڵیان بخەڵەتێنن و تووشی دزی و لاسارییەکیان بکەن و دواجاریش هەڕەشەیان لێ بکەن و ئیتر نەتوانن وازیان لێبهێنن.

لە لایەکی تریشەوە مەترسی برادەری خراپ لەوەدایە کە ئەو برادەرانە لەناو خۆیاندا باندێکی دزو شەڕخوازو لاسار دروست بکەن و ئامادەباشی ئەوەیان هەبێت کە داب و نەریت و یاساو بەها کۆمەڵایەتیەکان پێشێل بکەن و حەز بە سەرەڕۆیی و گێرەشێوێنی بکەن و مێرد منداڵان ناچار بکەن کە بەپێی سیستەم داواکاریەکانی ئەوان بجووڵێنەوەو مل کەچی ڕێنماییەکانیان بن. (العظماوی، ١٩٨٨) (فهمي، ١٩٦٧).

**٣) ئابووری:-**

وەك دەڵێن ئابووری بڕبڕەی پشتی خێزان و کۆمەڵ و بەرەو پێش بردنیەتی، لە هەمان کاتیشدا هەژاری و نەبوونی و بێکاری تێك شکێنەری ئەو بڕبڕەیە، چونکە نەبوونی و هەژاری مانای تێرنەکردنی زۆربەی پێداویستیە گرنگەکانی مێرد منداڵان و دابین نەکردنی

ژینگەی گونجاو بۆ گەشەكردنی و دەرهێنانی لە قوتابخانەو بەرەلاكردنی بۆ سەر جادەو كۆلانەكان بە مەبەستی كاركردن و پەیداكردنی بژێوی خێزان، كە بەداخەوە سەرجەم ئەو بارودۆخە نالەبارە زیانی گەورە بە كەسایەتی و باری دەروونی ئەو مێرد مندالانە دەگەیەنێت و هەندێك جار لە رێگەی راست لایان دەدات، لەبەرئەوەی ئەو مێرد مندالانە هێشتا بە تەواوی گەشەیان نەكردووەو لە توانایاندا نیە لەگەڵ یاساو بارودۆخی بازاڕو شوێنە گشتیەكان خۆیان بسازێنن و دوورنیە تووشی هەلە و سەرەڕۆییان بكەن.

لە لایەكی تریشەوە ئەگەر هیچ كارێكیشی دەست نەكەوێت یان ئەو ئیشەی كە دەیكات داهاتێكی زۆر كەمی هەبێت، ئا لەو كاتانەشدا دوورنیە زۆربەی كاتی بێ ئیشی بەبیركردنەوەو دالغەلێدانی خراپ بەسەر بەرێت و نەخشەو پلانی لاساری و شەڕخوای دابنێت، چونكە بێ ئیشی زۆر خراپە و وەك پەندە كوردیەكەی خۆمان دەڵێت (شەڕ لە بەتاڵی باشترە).

لە راستیدا هەژاری و نەبوونی تەنها هۆكاری سەرەكی نین بۆ تاوان و لاساری، چونكە زۆر خێزان هەن كە هەژارو دەست كورتن و مندالەكانیشیان تووشی سەرەڕۆیی و لاساری نابن، لەبەرئەوەی خاوەنی دایك و باوكێكی باوەڕدارو رەوشت بەرزن و رێزی مندالەكانیان دەگرن و ناهێلن لە سۆزو خۆشەویستی و رێنمایی ئەوان بێبەش ببن و بەردەوام لەسەر كاری باش هانیان دەدەن و هەلەكانیان بۆ راست دەكەنەوەو بەپێی توانا پێداویستیە سەرەكیەكانی ژیانیان بۆ دابین دەكەن، بەلام كاتێك مێرد مندال لە خێزانێكی پڕ لە ناژاوەو لێك ترازاودا دەژی و خاوەنی باوك و دایكێكی نەزان و كەم تەرخەم دەبێت و لە بێزاری و ناچاریدا تێكەلاوی برادەری خراپ دەبێت و سەرەڕای ئەوەش هەژارو كەم دەرامەتن، ئا لەم كاتانەدا ئەو هەژاری و نەبوونیە لەگەڵ ئەو بارو دۆخە نالەبارەی ناو خێزان و برادەری خراپدا كار لەیەكتری دەكەن و ئەو مێرد مندالە بەرەو لاساری و سەرەڕۆیی دەبەن.

## ٤) نەخۆشی دەروونی عەقلی:-

هەندێك جاریش مێرد منداڵ لە ئەنجامی تووشبوونی بەیەكێك لە نەخۆشیە دەروونی و عەقلیەكان، ڕووبەڕووی لاساری و سەركێشی دەبێتەوە, چونكە ئەو نەخۆشیانە مرۆڤ تووشی هەندێك حاڵەتی ناخۆش دەكەن و دەبن بە پاڵنەر بۆ بە ئەنجام گەیاندنی تاوان و لاساری، بۆ نموونە، دوورنیە لە ئەنجامی هەندێك لەو نەخۆشیانە تووشی هەلاوس و وڕێنەو هەڵەو كاری نابەجێ بن و بە خەیاڵی خۆیان ئەو كەسانەی كە لە چواردەوریانن خەریكی گەڵە كۆمەكی و پلان دانانن بۆ لەناوبردنیان، یان هاوسەرەكەی ناپاكی لەگەڵ دەكات و ژەهری بۆ دەكاتە ناو خواردنەكەیەوەو دەیەوێت بیكوژێت، یان ... تاد. ئینجا لە ئەنجامی ئەو خەوو خەیاڵ و بیركردنەوە هەلانەوە (كە ئەو نەخۆشیانە دروستی دەكەن) دوورنیە كە پەلاماری ئەو كەسانە بدات و دەست درێژی بكاتە سەریان بە مەبەستی بەرگری كردن لە خۆی و تۆڵە سەندنەوە لێیان.

## ٥- هۆكاری سیاسی:-

لە هەرچ جێگایەك ئارامی و دڵنیایی نەبێت و یاساو دەسەلات بەرقەرار نەبن و ئاژاوەو پاشا گەردانی لە ئارادا بێت ئەوا دیاردەی تاوان و لاساری ڕووەو زیاد بوون دەچێت، ڕاستە تاوان و لاساری لە هەموو وولاتێك هەیە، بەلام ڕێژەكەی زۆر زیاد دەبێت لەو وولاتانەی كە ئاسایشی تێدا نیە و بەردەوام یاسا پێشێل دەكرێت و هەركەسە بۆ خۆیەتی و دەسەلاتی ڕاپەڕاندن و جێبەجێكردنی بەكاری خۆی هەڵناستێت و دیاردەی چەكداری و میلیشیات زۆرە، چونكە كەسانێك هەن كە بێ ویژدان و دەروون نزمن و ئەگەر ترسی یاسا و دەسەلاتی دەرەكیان نەبێت، ئەوا لە هیچ شتێك ناگەڕێنەوەو پێشێلی داب و نەریت و بەها كۆمەلایەتیەكان دەكەن.

ئینجا لەبەرئەوەی ئەو کەسانە هیچ ترسیکیان نیەو بە ئارەزووی خۆیان یاسا شکێنی و لاساری دەکەن و کەسیش نیە بڵێت بەری چاوتان کلی پێوەیە، ئینجا بەردەوام بوونی ئەو بارودۆخە دەبێتە هۆی ئەوەی کە کەسانی تریش لاسایی ئەو بێ ویژدان و درەوون نزمانە بکەنەوەو ئیتر ئەو دیاردە دزێوە رۆژ لەدوای رۆژ لە پەرەسەندن و تەشەنەکردندا دەبێت و وەك پەتایەك بۆ کەسانی تریش دەگوێزرێتەوە.

٦- ئامرازەکانی راگەیاندن:-

راگەیاندن بە هەموو کەنالەکانیەوە هۆکاریکی گرنگەو رۆڵی سەرەکی هەیە لە پەروەردەکردن و رۆشنبیرکردنی جەماوەر، بەلام هەندێك جار لە ئەنجامی دانان و پێشکەش کردنی هەندێك بەرنامەو پرۆگرامی نابەجێ و رووخێنەر زۆر لە جەماوەر چەواشە دەکات، لەهەمووشیان ترسناکتر کەناڵەکانی (تەلەفزیۆن و سینەما)یە، بەداخەوە هەندێك جار لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن و سینەماکان هەندێك پرۆگرام و فیلم و زنجیرەی شەڕخوازی و سێکسی و نا پەروەردەیی پێش کەش دەکرێن، کە زەرەرو زیانێکی گەورە بە بینەران بە گشتی و منداڵ و هەرزەکاران بە تایبەتی دەگەیەنێت و بەرەو سەرەڕۆیی و لاساریان دەبەن، دوورنیە کە ئەو مێردمنداڵانە زۆر شێوازی دزی کردن و کوشتن و دەست درێژکردنە سەر شەرەف و کەرامەتی خەڵکانی تر لەو بەرنامە و فیلمانەوە فێر ببن و لاسایی هەڵس و کەوتی نابەجێ و هەڵەی پاڵەوانی ئەو بەرنامەو پرۆگرامانە بکەنەوە، بەتایبەتیش ئەو پاڵەوانانەی کە لەسەر سەرەڕۆیی و لاسارییەکانیان سزا نادرێن.

ئەمانەی سەرەوە بە گرنگترین ئەو هۆکارانە دادەنرێن کە دەبنە هۆی لاساری مێرد منداڵان.

ئینجا بۆ ئەوەی رێژەی ئەو مێرد منداڵە لاسارانە کەم بکەینەوەو نەهێڵین لەوە زیاتر تەشەنە بکات، ئەوا ئەم راسپاردەو پێشنیازانەی خوارەوە دەست نیشان دەکەین:-

١- پێویستە لە ڕێگەی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و کۆبوونەوەی دایکان و باوکان و کۆڕو کۆبوونەوە گشتیەکانەوە دایکان و باوکان و مامۆستایان ئاگادار بکرێنەوەو هۆکارەکانی سەرکێشی مێرد منداڵانیان بۆ ڕوون بکرێتەوەو باسی زیان و خراپیەکانی شێوازەکانی پەروەردەکردنی هەڵەو لێک ترازان و شەڕو ئاژاوەی ناوخێزانیان بۆ بکرێت و داوای ئەوەیان لێ بکرێت تا دەتوانن لەو هۆکارە خراپانە دووربکەونەوە بۆ ئەوەی ڕۆڵەکانیان تووشی لاساری نەبن.

چونکە زۆر لە دەروونزانەکان گەیشتوونەتە ئەو دەرئەنجامەی کە پچڕانی شیرازەی خێزان و بێبەش بوونی منداڵ لە سۆزو خۆشەویستی دایک و باوک هۆکاری گرنگ و ترسناکن بۆ لادان و لاساری مێرد منداڵەکانیان. ( باولبی، ١٩٦٥ ) ( القوصی، ١٩٨١ ).

٢- پێویستە لەکاتی دانان و پێش کەش کردنی بەرنامە و پرۆگرامەکانی تەلەفزیۆن ڕەچاوی باری دەروونی مێرد منداڵان و قۆناغی گەشەکردنیان بکرێت و سانسۆرو چاودێری پێویست بخرێتە سەر ئەو فیلمانەی کە لە سینەماکان پێشکەش دەکرێن.

٣- پێویستە لایەک لە خێزانە هەژارەکان بکرێتەوەو هەوڵی چارەسەرکردنی بێکاری بدرێت.

٤- پێویستە یاسای بەزۆر پێ خوێندن (التعلیم الألزامی) جێبەجێ بکرێت و هەوڵی گەڕاندنەوەی ئەو منداڵانەش بدرێت کە وازیان لە قوتابخانە هێناوەو ئێستا لەناو کوچەو بازاڕەکاندا دەسوڕێنەوە.

٥- پێویستە دایک و باوک ئاگاداری منداڵەکانیان بن و نەهێڵن تێکەڵاوی برادەری خراپ بن.

٦- پێویستە یاسا و دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و جێ بەجێکردن ڕۆڵی خۆیان بگێڕن و هەوڵی کەم کردنەوەی دیاردەی چەکداری بدرێت.

## پەروەردەی سێکسی

زۆر جار بە عەیبە عەیبە ژیانی مرۆڤ دەکرێت بە دۆزەخ و گەشەکردنی ئاسایی لەرێچکەی خۆی لادەدرێت، یەکێك لەو بابەتانەی کە لەلای ئێمە چواردەوری بە دیوارو پەرژینێکی پۆڵاین گیراوە، بابەتی سێکسە (جنس). لای هەندێك کەس تەنانەت باس کردن و ناو هێنانیشی تاوانە و لێخۆشبوونی نیەو (نەعامە) ئاسا سەری خۆیان کردووە بەناو لم و خوڵداو وا دەزانن کەس ئایان بینێ وەك چۆن ئەوان نایانبینن، بەڵام ئەو جۆرە کەسانە بە هەڵەدا چوون چونکە سەرکردن بە خوڵ و پشت گوێ خستن و حەرام کردنی ئەو بابەتە چارەسەری گرفتەکە ناکات و لە پڕ چۆن نەعامە دەگیرێ ئاوەهاش گوڕوتینی ئەو بابەتە دەیان سوتێنێ.

پەروەردەی نوێ جێگای شیاوو دروستی بۆ سێکس و پەروەردەکردنی داناوە، لەبەرئەوەی بەشێکی گرنگی ژیانی مرۆڤە و هیچی لە پەروەردەکردنی جەستەیی و عەقڵی و هەڵچوونی کەمتر نیە ئەگەر زیاتر نەبێت. هەر ئەمەشە بۆتە هۆی ئەوەی کە زۆر لە وولاتانی پێش کەوتوو بیر لە پەروەردەکردنی سێکسی تاکەکانیان بکەنەوەو لەناو بەرنامەو پرۆگرامەکانی قوتابخانەو راگەیاندنیاندا جێگایان بۆ بکەنەوە، چونکە کپ کردنی و خەفەکردنی ئەو رەمەك و پێداویستیە, مرۆڤ تووشی زۆر گرفتی دەروونی و کۆمەلایەتی دەکات.

مەبەست لە پەروەردەکردنی سێکسی بەرەلایی و بەد رەوشتی نیە وەك ئەوەی هەندێك بۆی دەچن، بەڵکو جۆرێکە لە پەروەردەکردن کە لەمیانەیەوە زانیاری و شارەزایی راست و دروست دەربارەی سێکس دەدرێت بە تاکەکانی کۆمەڵ بۆ ئەوەی بزانن سێکس چییە، چۆن گەشە دەکات، رێگای راست و دروست چییە بۆ تێرکردنی، زیانەکانی لادانی سێکسی چییە؟ هەروەها فێری ناوە زانستیەکانی ئەندامی زاوزێ ببن و بە چاوی گومان و دوودڵی سەیری نەکەن بەمەرجێك لەگەڵ داب و نەریت و بەها مرۆڤایەتیە رەسەنەکاندا هاورێك بێت.

منداڵ هەر لە سەرەتای تەمەنی چوارساڵیەوە زۆر پرسیار لە مێشکیدا دەربارەی (سێکس، منداڵ بوون و جیاوازی کوڕو کچ و ...... تاد) دروست دەبێت و بە دوای وەڵامەکانیدا دەگەڕێ، لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە دایک و باوک بەپێی توانای خۆیان وەڵامی راست و دروستی ئەو پرسیارانەی منداڵ بدەنەوەو نەهێڵن ببن بە نێچیرێکی دەستەمۆی بەردەم برادەری خراپ و کەسانی نەزان و بێ ویژدان، کە دوورنیە بە هەڵەو چەواشەیی وەڵامی پرسیارەکانی منداڵان (بەتایبەتی لەکاتی چوونە قوتابخانەی سەرەتایی) بدەنەوە.

هەروەها پەروەردەی سێکسی زۆر گرنگە بۆ قۆناغی هەرزەکاری، لەبەرئەوەی لە قۆناغی هەرزەکاریدا کۆمەڵێك گۆڕانکاری فسیۆلۆژی و جەستەیی خێرا ڕوودەدات و حەزو ئارەزووی سێکسی چەکەرە دەکات و زۆر دیاردەی وەك (شەیتانی بوون و دەست پەڕو بێ نوێژی) دەردەکەون، ئینجا ئەگەر هەرزەکار زانیاری راست و دروستی دەربارەیان نەبێت ئەوا دوورنیە تووشی زۆر گرفتی دەروونی ببێت و لە داهاتووشدا ژیانی لێ تاڵ بکات.

بە زۆر شێواز دەتوانرێت هەرزەکار پەروەردە بکرێت، لەوانە لە ڕێگەی وانەکانی (زیندەوەرزانی، پەروەردەی تەندروستی، ئاین، ئەدەب، سەردانی باخچەی ئاژەڵان و مۆزەخانەو بینینی فیلمە زانستیەکان ... تاد) کە مامۆستا و باوك و دایك دەتوانن لە ڕێگەی هەریەك لەو وانەو کەرەستانەی سەرەوە وەڵامی زۆر پرسیاری سێکسی منداڵ و هەرزەکار بدەنەوەو دیاردەکانی ژیانیان بەتایبەتیش (زاوزێ و جووت بوون و جیاوازی نێوان نێرو مێ) بۆ روون بکەنەوە. پێویستە دایك وباوك و مامۆستا لە پرسیارەکانی منداڵان و هەرزەکاران رانەکەن یان بە شەرم و گومان و دوودڵیەوە وەڵامیان نەدەنەوە، چونکە گومان و رارایی لەلای منداڵ و هەرزەکاران دروست دەکات و زیانەکانی لە قازانجەکانی زیاتر دەبێت.

نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت کە پەروەردەی سێکسی دژ بە پەروەردەی ئایینی نیە بەڵکو تەواوکەریەتی و خودای گەورەو میهرەبان لە چەندەها ئایەتدا باسی سێکس و گرنگی لە ژیانی مرۆڤدا کردووە و ڕێگای ڕاست و دروستیشی بۆ تێرکردنیان داناوە. کەواتە نابێت ئیمەی گەورە ڕاستیەکان لە ڕۆڵەکانمان بشارینەوە چونکە دەچن لەسەرچاوەی نادروست و هەڵە بە دوایدا دەگەڕێن، ئینجا کێ دەڵێ دەستیان دەکەوێ و بەهەڵە تێیان ناگەن؟.

## پەروەردەی سێکسی و ڕەنگدانەوەی لەسەر کەسایەتی

مرۆڤ لە ژمارەیەك کۆئەندام (جهاز) پێك هاتووە لەوانە (کۆئەندامی دەمار، کۆ ئەندامی هەرس، کۆ ئەندامی هەناسەدان، کۆ ئەندامی زاووزێ ... تاد) کە هەر یەك لەو کۆ ئەندامانە گرنگی و فەرمانی تایبەتی خۆی هەیە و بە هاوکاری یەکتری کارو فەرمانەکانی لەش بە ئاکام دەگەیەنن. ئینجا کەم و کورتی لە هەر کۆئەندامێکدا هەبێت ئەوا ڕەنگدانەوەی ڕاستەوخۆ یان ناراستەوخۆی بۆ سەر کۆئەندامی تر دەبێت و زیان بە جەستەو باری دەروونی خاوەنەکەی دەگەیەنێت. لەبەر ئەوە گرنگی دان بە هەر یەك لەو کۆئەندامانەو زانینی ئەرك و فەرمان و پێداویستیەکانی زۆر پێویستە و لە بەرژەوەندی مرۆڤە .

یەکێك لە گرنگترین کۆئەندامەکانی مرۆڤ، کۆئەندامی زاووزێیە، کە بەر پرسیارە لە پرۆسەی زاووزێ و زیاد بوونی ژمارەی مرۆڤ و بەردەوام بوونی ژیان و هاتنی ئەوە بە دوای ئەوەدا. سەرەڕای ئەوەش بەر پرسە لە تێرکردنی یەکێك لە گرنگترین پێداویستیە فسیۆلۆژیەکانی مرۆڤ، ئەویش ڕەمەك و خورسکی (غریزە)ی سێکسیە .

ڕەمەك و خورسکی سێکسی گرو تینی خۆی هەیە و پشتن گوێخستن و خەفەکردنی لەلایەك یان خراپ تێرکردنی و کۆنترۆل نەکردنی بەجۆرێك کە لە تەك داب و نەریتی

کۆمەلایەتی و بەها ئاینیەکاندا نەگونجێت لەلایەکی تر، زیانی زۆر گەورە بە باری دەروونی مرۆڤ دەگەیەنێت و تووشی زۆر گرفت و نەخۆشی دەروونی و کۆمەلایەتی دەکات. لەبەر ئەو هەموو گرنگی و مەترسیانەی رەمەکی سیکسی زۆر لە زانایان و پەروەردیاران بیریان لە جۆرێك پەروەردە کردن کرد بۆ ئەوەی لە رێگەیەوە ئەو رەمەکە بەشێوەیەك تێر بکرێت کە زیان بە تاك و بە کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی نەگات، سەرەرای ئەوەش مرۆڤ زانیاری دەربارەی کۆئەندامی زاووزێ و ئەرك و چالاکیەکانی دەست بکەوێت و بزانێت چۆن چۆن مامەڵەی راست و دروستیان لە تەکدا دەکات. لەبەر ئەو هەموو گرنگیە ئێستا جۆرێك لە پەروەردە کە پەروەردەی سیکسیە لە زۆر ولاتی ئەم دونیایە لەتەك پەروەردەکانی (جەستەیی، عەقلی، نیشتمانی ، ئاینی ... تاد) هەیە .

## ئایا پەروەردەی سیکسی دژی پەروەردەی ئاینییە؟

بەداخەوە هەندێك لە دایك و باوك و مامۆستایان بۆچوونیکی هەڵەیان لەلا دروست بووە، ئەویش ئەوەیە کە پەروەردەی سیکسی حەرامە و دژی داب ونەریت و بەها کۆمەلایەتی و ئاینیەکانن، بەلام لە راستیدا وانیە و نەك دژایەتی لە نێوانیاندا نییە بەلکو پەروەردەی سیکسی پراکتیزە کردنی زۆر ئایەتی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەرە (د.خ)، لەبەر ئەوەی خودای گەورە خۆی کۆئەندامی زاووزێی بە مرۆڤ بەخشیوەو بە هیچ شێوەیەکیش بەکار هێنانی ئەو ئەندامانەو تێرکردنی رەمەکی سیکسی لەمرۆڤ حەرام نەکردووە، بەڵکو رێگەی پێداوە، بەلام مەرج و شێوازی دروست و راستی بۆ داناوە، بۆ ئەوەی کەرامەت و گەورەیی مرۆڤ بپارێزدرێت و لە ئاژەڵ و بوونەوەرەکانی تر جیا بکرێتەوە .

بە پێی بە هاکانی ئاینە ئاسمانیەکان، پێویستە مرۆڤ رەمەکی سیکسی لە رێگەی شووکردن و ژنهێنانەوە تێر بکات، کە ئەوەش کارێکی ئەوەندە گران و زەحمەت نییە و لەتەك رێچکەی گەشەکردنی مرۆڤدا جووت یەکەو هیچ دژایەتیەك لە نێوانیاندا نییە،

لەبەر ئەوەی لە قۆناغی هەرزەکاری بە دواوە سیکسە گلاندەکان پێدەگەن و گوڕوتین و حەزوو ئارەزووی سیکسی چەگەرە دەکەن. لەو کاتەش بەدواوە وردە وردە هەرزەکار دەتوانێت بە چالاکی و ماندوو بوونی خۆی و هاوکاری کەس وکار هاوسەری ژیانی خۆی هەڵبژێرێ و ئەو ڕەمەکە تێر بکات ئینجا ئەگەر ماوەیەکیش دوا کەوت، ئەوا دەتوانرێت لە ڕێگەی برگەو پرۆگرامەکانی پەروەردەیی سیکسیەوە ڕێنمایی و ئامۆژگاری پێویست بکرێت و بواری جۆرەها چالاکی هونەری و زانستی و ئەدەبی و وەرزشی و کۆمەڵایەتی بۆ هەرزەکار و لاوان برەخسێندرێت و لە میانەیانەوە گڕوتینی ئەو ڕەمەکەیان کەم بکەنەوە، بۆ ئەوەی زیان بە باری دەروونی و داب و نەریت و بەها کۆمەڵایەتیە ڕاستیەکان نەگەیەنێت .

بەڵام ئەگەر لاوو مرۆڤی کۆمەڵەکەمان هەر نەتوانێت هاوسەری ژیانی هەڵبژێرێت و ئەو ڕەمەکە فسیۆلۆژیەی تێر بکات، ئەو کاتە ئاین بەر پرسیار نییە بەڵکو بەر پرسیارو تاوانی سەرەکی کۆمەڵ و دام و دەزگاکانیەتی، لەبەر ئەوەی کوڕو کچ بە ژمارەی پێویست هەن، بەڵام خێزان و کۆمەڵ بە نەزانی خۆیان ژمارەیەك کۆسپ و تەگەرە وەك (شیربایی، ژن بە ژن، گەورە بە بچووك، کچ دان لە بری خوێن، داواکاری زۆر، ئاهەنگ و خەرجی و ئاڵتوون، نەبوونی وهەژاری، بەرز فڕی کچ یان کوڕ، هۆکاری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریان ... تاد)، خستۆتە بەردەم پێکەوە نانی خێزان و شووکردن و ژن هێنان، کە ئەوانەش بوونەتە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە کوڕان ژن نەهێنن و ژمارەیەکیش لە کچان شوونەکەن کە ئەمەش تاوانەکەی لە ئەستۆی خێزان و کۆمەڵدایە و پێویستە لە مەودوا هەوڵی لابردنی ئەو کۆسپ و تەگەرانە بدرێت و لە جیاتی ئەوە ئاسانکاری بۆ لاوان بکرێت بۆ ئەوەی بتوانن لە کاتی گونجاودا هاوسەری ژیانی خۆیان هەڵبژێرن .

## پەروەردەی سیکسی چۆن پێشکەش بکرێت؟

لایەنەکانی کەسایەتی مرۆڤ زۆرن لەوانە (کۆمەڵایەتی، هەڵچوونی، جەستەیی، عەقلی، ئاکاری، زمان و گفتی، سیکسی ... تاد) بۆ هەر لایەنێك جۆرە پەروەردەیەکی

تایبەتی هەیە و مەبەستی سەرەکی گەشە پێکردن و پەرەپێدانی ئەو لایەنەیە، دواتر هەموو جۆرە پەروەردەکان لە خاڵێکدا یەك دەگرنەوە، ئەویش پەروەردەکردنی مرۆڤە بەجۆرێك بتوانێت لەتەك کۆمەڵ و دەوروبەرەکەیدا خۆی بسازێنێ و کەسێکی داهێنەر یان سوود بەخش و بەرهەم هێنەری لێدەربچێت . هەموو جۆرە پەروەردەکانی تر بابەت و بەرنامە و پرۆگرامی تایبەتی و سەربەخۆ بە خۆیان هەیە.

ئینجا لەبەر رۆشنایی ئەو جۆرە پەروەردانە، دەکرێت پەروەردەی سێکسی بابەتی سەربەخۆی خۆی هەبێت و لە دوو توێی کتێب و نووسراوەکاندا بدرێت بە قوتابی و دایك و باوك و مامۆستا و لە چوارچێوەی قوتابخانە و دام و دەزگا زانستی و پەروەردەییەکاندا بخوێندرێت؛ زۆر لە دەروونزان و پەروەردیاران لە گەڵ ئەوە نین کە بابەتی پەروەردەی سێکسی وەك وانەیەکی سەربەخۆ بخوێندرێت بەڵکو دەبێت زانیاری و بابەتە سێکسیەکان لە رێگەی وانە و بابەتەکانی تری خوێندنەوە بدرێت بە قوتابی و لە لایەنی سێکسیەوە رۆشنبیر بکرێت و وەڵامی زۆربەی پرسیارەکانیان بدرێتەوە .

زۆربەی بابەتەکانی قوتابخانە گونجاون و دەتوانرێت لە رێگەیانەوە زانیاریەکانی بواری پەروەردەی سێکسی بدرێت بە قوتابیان، بۆ نموونە لە رێگەی بابەتی زیندەوەرزانیەوە، دەتوانرێت زۆر زانیاری دەربارەی (کۆئەندامی زاووزێ و بەشەکانی، ئەرکەکانی کۆئەندامی زاووزێ، چۆنیەتی دروست بوونی مرۆڤ و قۆناغەکانی گەشەکردنیان، گرنگی و کاری سێکسە گلاندەکان، جیاوازی نێوان نێرو مێ، زیاد بوون لە رووەك و ئاژەڵ و مرۆڤ ... تاد) بدرێت بە قوتابی، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە پەروەردەی سێکسی و وەڵامی زۆر پرسیاری ناو دڵ و دەروونی قوتابی دەداتەوە.

بەڵام بەداخەوە زۆر لەمامۆستایانی زیندەوەرزانی ئەو بەشە لە وانەکە پشت گوێ دەخەن و بە قوتابیان دەڵێن خۆتان لەماڵەوە بیخوێننەوە، کە ئەمەش هەڵەیەکی زۆر گەورەیە و لە زۆر لایەنەوە زیان بە قوتابی و پرۆسەی پەروەردەو فێرکردن دەگەیەنێ،

چونکە بەشێکی گرنگ کە بۆ فێرکردن دانراوە ئەوانیش پشت گوێی دەخەن، هەروەها ئەو پشت گوێ خستنەش خۆی لە خۆیدا مانا و کۆمەڵێک پرسیاری تەم و مژاوی لەلای قوتابیان دروست دەکات و ئەو بۆچوونە هەڵەیە لە لای هەندێک قوتابی بە هێز دەکات کە لەو بڕوایەدان، سێکس و ئەندامەکانی زاووزێ شتێکی ترسناك و بقە و قەدەغەکراون و نابێت باسبکرێن، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا شتێکی نابەجێیە و زۆربەی ئەو جۆرە قوتابیانە تووشی گرفت و گرێی دەروونی دەکات، سەرەڕای ئەوەش قوتابیان خۆیان لەو قۆناغەدا ئەو توانایەیان نییە کە بەتەنها خۆیان بتوانن لەو بابەتە هەستیارو گرنگە تێبگەن و ناکامە سەرەکییەکانی وەك مامۆستا بپێکن، دووریش نییە لە کاتی خوێندنەوەیان بە هەڵە و چەواشەکاری لێیان تێبگەن.

لەبەر ئەوە زۆر گرنگە کە لەمەودوا هیچ مامۆستایەك ئەو بەشە گرنگە پشت گوێ نەخات و ئەگەر هەر کەم و کورتیش هەبوو، ئەوا پێویستە وەزارەتی پەروەردە بە فەرمانێك ئەو لایەنە یەکلا بکاتەوەو سزای ئەو مامۆستایانەش بدرێت کە سەرپێچی دەکەن، بەلام پێویستە مامۆستای زیندەوەرزانی پیاو لە قوتابخانەی کوران و مامۆستای زیندەوەرزانی ئافرەتیش لە قوتابخانەی کچان دابنرێت، چونکە هەندێك حالەتی پێچەوانە لە چەند قوتابخانەیەك هەن، کە لەوانەیە ئەوە هۆی سەرەکی بێت بۆ پشت گوێخستنی ئەو بەشە گرنگەی بابەتی زیندەوەرزانی .

وانەی ئایینیش بابەتێکی گرنگی ترە و دەتوانرێت لە ڕێگەیەوە زۆر زانیاری تر دەربارەی ئەو ئایەت و فەرموودانەی پەیوەندییان بە (ژن و مێرد و شووکردن و ژن هێنان و چۆنیەتی تێر کردنی ڕەمەکی سێکسی و پەیوەندی نێوان نێر و مێ و زیانەکانی داوێن پیسی (زینا) و لادانی سێکسی ... تاد) یەوە هەیە بدرێن بە قوتابی بۆ ئەوەی سنوور و شێوازو چۆنیەتی تێرکردنی ئەو حەزوو ئارەزووە سێکسیانە بزانێت و لە ژیانی داهاتوودا سوودیان لێوەربگرێت .

هەروەها دەتوانرێت لە ڕێگەی وانەکانی ئەدەب و هونەرەوە، باسی پیرۆزی پەیوەندی نێوان نێرو مێ و چیرۆکی خۆشەویستی پاکی دلداران و ڕێزگرتنی هاوسەری ژیان و ... تاد) بۆ قوتابی بکرێت بۆ ئەوەی بە چاوی ڕێزو خۆشەویستی نەک گومان و دوو دلی سەیری توخمەکەی تر بکات و راو بۆچوونێکی پۆزەتیف و باشی دەربارەی توخمەکەی تر لەلا دروست ببێت، کە ئەمەش دەبێت بە بنەما بۆ سەرکەوتنی لە ژیانی هاوسەریدا. وانەی جوگرافیاش بابەتێکی گرنگە بۆ ئەوەی قوتابی زانیاری دەربارەی مەترسیەکانی زۆربوونی لە ناکاوی دانیشتوان کە بە بێ ئەخشەو پلان زیاد دەکەن دەست بکەوێت، هەروەها لە میانەی پەروەردەی خێزانیەوە دەتوانرێت زانیاری دەربارەی پێکهاتەی خێزان و ئەرکی ژن و مێرد و پەیوەندی نێوانیان و زیانەکانی تەلاق بە قوتابی بدرێت .

کەواتە دەتوانرێت لەڕێگەی زۆربەی بابەتەکانی قوتابخانەوە، پەروەردەی سێکسی پێشکەش بە قوتابیان بکرێن، بۆ ئەوەی لە دوارۆژدا کەسانی دەروون دروستیان لێدەربچێ و لە گرفت و نەخۆشی دەروونی و کۆمەلایەتی دووربن .

<u>پەروەردەی سێکسی لە ئەستۆی کێدایە؟</u>

پەروەردەی سێکسی زۆر فراوانە و لق و پۆپی زۆری لێدەبێتەوەو تایبەت بە قۆناغێکی ژیان نیە بەلکو زۆربەی ژیانی مرۆڤ بەردەوام دەبێت. لەبەر ئەوە لە توانای کەس و دام دەزگایەکی تایبەتی دیاریکراودا نییە کە بەو کارە هەلبستێت. بۆیە ئەرکی پەروەردەی سێکسی لە ئەستۆی هەموو تاکەکانی کۆمەلدایە لە پێشەوەی هەموویان دایک و باوک و مامۆستا و پزیشک و دەروونزان و کۆمەلزان و مامۆستایانی ئایینی .

یەکەم دامەزراوی کۆمەلایەتی کە ئەرکی پەروەردەی سێکسی لە ئەستۆدایە خێزانە، لەبەر ئەوەی یەکەم دامەزراوی کۆمەلایەتیە کە بە ئەرکی پەروەردەکردنی مندال هەلدەستێت. مندال لە قۆناغی پێش چوونە قوتابخانەی پێویستی زۆری بە پەروەردەی سێکسی هەیە و بەردەوام پرسیار دەربارەی ( جیاوازی نێوان کوڕ و کچ، مندال چۆن دەبێت، بۆ ئەو کوڕە یان کچ، مندال چۆن دروست دەبێت، بۆ هەندێک مندال بە مردوویی لە دایک

دەبن ... تاد دەکات، کە ئەرکی دایك و باوکە بەبێ هەڵچوون و شەرم و سووربونەوە و بە زمانێکی سادەو ساکار کە لەگەڵ گەشەکردنی عەقڵی منداڵ و تەمەنەکەی بگونجێت، وەڵامی زانستی منداڵەکان بدەنەوە، واتە نابێت راستیەکانیان لێبشارینەوە و بە هەڵە وەڵامیان بدەینەوە یان بە هەر ج شێوەیەك بێت لە کۆڵی خۆمانیان بکەینەوە، چونکە ئەوە زیانی گەورە بە باری دەروونی منداڵەکە دەگەیەنێت و متمانەش لە نێوان دایك و باوك و منداڵدا لاواز دەکات.

بۆ نموونە کاتێك منداڵ پرسیار لە باوکی یان دایکی دەربارەی دروست بوونی و چۆنیەتی منداڵ بوون دەکات، ئەگەر دایك و باوك بە شێوەیەکی زانستیانە لە ڕێگەی نموونەیەکی وەك (کوڕم ئێمە دەنگە گەنم یان جۆ یان تۆوی تەماتە و بامیە ناخەینە ناو زەویەوە، دوای ئەوە ئاوی دەدەمین و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەورە دەبێت دوای ماوەیەك بە تەواوی پێدەگات بێگومان منداڵەکە زانیاری لەو بارەیەوە هەیە و دەزانێت لە وەڵامدا دەڵێت ڕاستە وایە ئەو کاتەش باوك یان دایك بە منداڵەکەی بڵێت، کەواتە منداڵیش یەکەم جار وەك ئەو تۆوە وایە و لەناو سکی دایك ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەورە دەبێت، چونکە دایك نان و ئاوو میوە و گۆشت دەخوات و منداڵەکەش خواردن لە دایکی وەردەگرێت، ئیتر دوای نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ لە دایك دەبێت).

دەتوانرێت بە زۆر شێواز وەڵامی پرسیاری (منداڵ بوون) بدرێتەوە، بۆ نموونە دەتوانرێت سوود لە رووداوی ڕۆژانە (کە منداڵ لە ماڵدا دەبێت) وەربگیرێت. یان لەڕێگەی سەردانی باخچەی ئاژەڵان و گوندو ئەو شوێنانەی کە باڵندە و ئاژەڵی لێیە، دوور نییە لە ناو ماڵدا زۆربەمان باڵندە و ئاژەڵمان هەبێت تا لەم کاتەدا دەتوانین سوود لە (دایك بوونی ئاژەڵ یان پاڵکەوتن و کڕکەوتنی باڵندە لەسەر هێلکەو کاتی تروکاندنی) وەربگرین و منداڵ وەڵامی پرسیارەکەی دەست دەکەوێت، هەروەها زۆر فیلم و بینراو لە تەلەفزیون دەربارەی ئەو بابەتانە پیشان دەدرێن، دەتوانین سوودی زۆریان لێوەربگرین. بەلام گریمان باوك و دایك بەشێوەیەکی راست وەڵامی ئەو پرسیارەی منداڵەکەیان نەدایەوە لە جیاتی ئەوە گوتیان، وەڵا لە بازاڕ دۆزیمانەوە. یان بەیانی لە خەو هەستاین

ئەم منداڵە لە ماڵمان بوو ( بەداخەوە هەندێك دایك و باوك وا دەڵێن ) بێگومان ئەم جۆرە وەڵامە زیانی زۆرە، با بڵێین منداڵەكە بڕوای كرد، ئەو كاتە ئەو وەڵامە دەبێتە مایەی پەستی و دڵتەنگی و شێواندنی مانای خوشك و برایەتی، سەرەڕای ئەوەش مەترسی ئەوەی لە لا دروست دەبێت كە پاش ماوەیەكی تریش بچن لە بازاڕ یەكێكی تر بدۆزنەوە یان شەوێكی تریش منداڵێكی تریان بۆ بهێنن، چونكە منداڵ چكۆسی( غیرە ) لە منداڵی تازە لە دایك بوو دەكات و بەرکە باری ( منافس ) خۆی دەزانێت.

یان با بڵێین منداڵ لە منداڵانی تر وەڵامێكی تری دەست كەوت یان بڕوای بە قسەكانی دایك و باوكی نەكرد، ئالەم كاتەشدا گومان و دوو دڵی و بێ متمانەیی لە ناو دڵ و دەروونی ئەو منداڵەدا چەكەرە دەكات و پەیوەندی نێوان منداڵ و دایك و باوك كرمۆڵ و قرچۆڵ دەكات. كەواتە نابێت بە هیچ شێوەیەك راستیەكان لە منداڵ بشارینەوە، چونكە شاردنەوە یان وەڵامی هەڵە زۆر بەردەوام نابێت و درەنگ بێت یان زوو منداڵ هەر وەڵامی راستی دەست دەكەوێت. ئەو كاتەش ئێمە دەكەوینە حاڵەتێكی شلۆق و ناخۆش .

هەروەها خێزان نەك لە قۆناغی منداڵی بەڵكو لە قۆناغی هەرزەكاریش رۆڵی خۆی هەیە و زۆر پێویستە دایك وەك خوشكێكی گەورە و دڵسۆز زانیاری راست و تەواو دەربارەی سووڕی مانگانە ( بێ نوێژی ) (العادة الشهرية) و گۆڕانكارییە فسیۆلۆژیەكانی سەردەمی هەرزەكاری بە كچەكانی بدات، بۆ ئەوەی لە ئە نجامی ئەزانینەوە تووشی ترس و دڵە ڕاوكێ و خەم و خەفەت نەبن، هەروەها دەبێت باوكیش رۆڵی برایەكی گەورە و دڵسۆز بگێڕێ و زانیاری پێویست دەربارەی قۆناغی هەرزەكاری و گۆڕانكارییەكانی بە كوڕە هەرزەكارەكانی بدات .

قوتابخانەش ئەرك و فەرمانەكانی خێزان تەواو دەكات و دامەزراوی كۆمەلایەتی دوو هەمە كە پێویستە ڕۆڵی خۆی هەبێت لە پەروەردەی سێكسی، چونكە زۆر دایك و باوك نەخوێندەوارن یان خۆیان زانیاری تەواویان دەربارەی سێكس و پێداویستیەكانی

منداڵەکانیان نیە و ناتوانن وەڵامی راستی منداڵەکانیان بدەنەوە، تا لەم کاتەدا ئەرکی سەرەکی مامۆستایە کە لە ڕێگەی ئەو بابەتەی دەیڵێتەوە، بە پێی تواناو پسپۆری خۆی وەڵامی هەندێك لە پرسیارەکانی منداڵ و هەرزەکار بداتەوەو رێنمایی پێویستیان بکات، هەروەها پێویستە رابەری پەروەردەیی و دەروونی قوتابخانەکانیش رۆڵی خۆیان لە پەروەردەی سێکسی و چارەسەر کردنی گرفتە سێکسیەکاندا هەبێت، لەبەر ئەوەی ئەوان زیاتر لە مامۆستایان لە پێشترن و بواری پسپۆریان زۆر نزیکە لە پەروەردەی سێکسی و ئەو کارە یەکێکە لە ئەرکەکانیان.

سەرەرای دایکان و باوکان و مامۆستایان و رابەری پەروەردەیی و دەروونی، مامۆستایانی ئایینی و پزیشکان و رۆشنبیرانیش دەتوانن لە ڕێگەی راگەیاندن و مزگەوت و بەستنی کۆڕو کۆبوونەوەو سیمینارەوە رۆڵی خۆیان لە پەروەردەی سێکسیدا بگێرن، بۆ ئەوەی رۆڵەکانمان تووشی لادانی سێکسی و گرفت و نەخۆشی دەروونی و کۆمەڵایەتی نەبن

ئامانجەکانی پەروەردەی سێکسی:-

مەبەستی سەرەکی پەروەردەی سێکسی هێنانە دی ئەم ئامانجانەی خوارەوەیە :-

١- هەموو تاکێك زانیاری پێویستی (بەپێی قۆناغ و تەمەن) دەربارەی چالاکیە سێکسییە پەسەندکراوەکان دەست بکەوێت .

٢- فێر بوونی ناوی زانستی ئەندامەکانی زاووزێ .

٣- زانینی ئەو چالاکیە سێکسیانەی کە تاك بەرەو هەڵدێرو داوێن پیسی و لادانی سێکسی دەبەن.

٤- تاك بیرو باوەری ڕاست و پۆزەتیڤانەی دەربارەی توخمەکەی تر لە لا دروست ببێت و بە چاوی رێزیشەوە سەیری بکات .

٥- مرۆڤ فێری چۆنیەتی کۆنترۆلکردنی رەمەك و حەزوو ئارەزووە سێکسیەکانی بکرێت و لە توانایدا هەبێت کە لەو وروژێنەرو هۆکارانە دوور بکەوێتەوە کە زیان بە باری دەروونی و داب و نەریت و بە های کۆمەلایەتی دەگەیەنن .

٦- تاك فێری بەها ئاینیەکان و شێوازی راستی تێرکردنەکانی حەزوو ئارەزووی سێکسیەکان بکرێت، بۆ ئەوەی کەسایەتی و ناسنامەی خۆی لە دەست نەدات .

٧- دەبێت مرۆڤ (نێر بێت یان مێ) شانازی بە توخمەکەی خۆی بکات بە چاوی سووك سەیری نەکات .

٨- ئامادەکردنی مندالْ لە دوای قۆناغی مندالی بۆ قۆناغی هەرزەکاری و رازی بوون بە هەموو ئەو گۆرانکاریيانەی کە لە قۆناغی هەرزەکاری ڕوودەدەن .

## ئامرازەکانی گەیاندنی زانیاریيە سێکسیەکان :-

وەلآم دانەوەی پرسیارەکانی مندالآن و هەرزەکاران و هێنانە دی ئامانجەکانی پەروەردەی سێکسی کارێکی ئاسان نییە و پێویستیان بە کۆمەلێك کەرەستەو ئامراز هەیە. لە گرنگترین کەرەستەو ئامرازەکان ئەمانەی لای خوارەوەن :-

١. پرۆگرام و بابەتەکانی خوێندن، هەریەك لەو بابەت و پرۆگرامانە (وەك لە پێشتر باسمان کردن) رۆلی سەرەکیان هەیە لە رۆشنبیر کردن و پێدانی زانیاری بە مندالآن و هەرزەکاران .

٢.سەردانی باخچەی ئاژەلآن، کاتێك مندالْ و هەرزەکار لە نزیکەوە پرۆسەی جووت بوونی ئاژەلْ و بالندەکان و چۆنیەتی لە دایك بوون و تروکاندنی هێلکەکان و پەیوەندی نێوان ئاژەلْ و بالندە نێرو مێیەکان دەبینن، ئەوا وەلآمی زۆر پرسیاریان چنگ دەکەوێت کە بە داخەوە ئێمەی گەورە لێی رادەکەین، کە ئەوەش هەلەیەکی گەورەی ئێمەیە، چونکە ئەگەر ئێمەش وەلآمیان نەدەینەوە، ئەوا دەچن لە گۆڤارو رۆژنامەو فیلمی نا پەروەردەیی یان برادەری خراپ یان سەرچاوەی تری بێ‌ڤه و ترسناك بە دوایدا دەگەڕێن، کە دوور نییە

بە هەڵەو چەواشەکاری دەستیان بکەوێت و دواتر تووشی گرفت ببن و هەتا مردن بە دەستیەوە بناڵێنن .

٢. فیلم و بابەتی تۆمارکراوی زانستی تایبەت بە ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ و پێک هاتە و کارو فەرمانەکانیان.

٤. سەردانی مۆزەخانەو پێشانگا زانستیەکان، بە تایبەتی ئەوانەی کە تایبەتن بە پەیکەرو کۆئەندامەکانی باڵندە و مرۆڤ و ئاژەڵ، بۆ ئەوەی قوتابی یان منداڵ و هەرزەکار لە نزیکەوە سەیری ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ بکەن و خۆیان بگەنە راستی جیاوازی نێوان نێرو مێ و ئەندامەکانی زاووزێیان .

٥. گواستنەوەی رووداوەکانی رۆژانە (لە دایک بوونی منداڵی نوێ، مردن و شوشتن و ناشتنی مردوو، شتنی منداڵی بچکۆلە، شیردان بە منداڵ ... تاد) کە لە میانەیەوە منداڵ زۆر زانیاری پێویستی دەربارەی سێکس دەست دەکەوێت و دەتوانین ئێمەی گەورەش بۆ وەڵامدانەوەی منداڵەکانمان سوودیان لێ وەربگرین .

٦- زۆر گرنگە قوتابخانەو زانکۆ و پەیمانگاکانیش بە پێی پێویست میوانداری کەسانی پسپۆرو شارەزا لە بواری سایکۆلۆژیا و پزیشکی و ئەو جۆرە پەروەردەیەدا بکەن، بۆ ئەوەی سیمینار یان کۆڕێك دەربارەی پەروەردەی سێکسی و پێداویستیەکانی قوتابیان پێشکەش بکات و دوای ئەوەش گفت و گۆ دەربارەی ناوەرۆکی باسەکە بکرێت .

## چەند پێشنیارێك بۆ دایکان و باوکان و مامۆستایان

١. دەبێت ئەو زانیاریانەی پێشکەش دەکرێن لە ئاستی تەمەن و تێگەیشتنی ئەو کەسە بێت کە پێشکەشی دەکرێت .

٢. نابێت زانیاریەکان تەم و مژاوی و ئاڵۆز بن، بەڵکو پێویستە بە زمانێکی سادەی بێ گرێ و گۆڵ بێت .

٣. دەبێت قسەکان بنەمای زانستیان هەبێت و دوور بن لە خورافیات و زیادە ڕۆیی .

٤. پێویستە وەڵامەكانمان ئەوەندەی پرسیارەكە هەڵدەگرێت، بێت و زیادڕۆیی نەكەین .

٥. نابێت لەكاتی وەڵامدانەوە زمانمان تەتەڵە بكات و دەم و چاومان سوور هەڵبگەڕێ و بەرانبەر وا تێبگات كە تاوانێكی كردووە و نەدەبوایە ئەو پرسیارە بكات .

٦. نابێت دایك و باوك جیاوازی لە نێوان منداڵەكانیان بكەن و كوڕەكانیان زیاتر لە كچەكانیان خۆشتر بوێت، چونكە ئەو مامەڵەیە دەبێتە هۆی دروست كردنی رق و كینە لەلای كچ بەرامبەر كوڕ لەلایەك هەروەها سەیركردنی كچ بە چاوی سووك لەلایەكی تر، واتە كوڕەكە وا تێدەگات كە كچ لە كوڕ كەمترە. ئەوەی زیاتریش قورەكە خەستتر دەكاتەوە ئەوەیە ئەگەر بێت و باوكیش لەبەر چاوی منداڵەكانی بەردەوام سووكایەتی بە ژنەكەی بكات و لێی بدات، كە سەرجەم ئەو هەڵس و كەوتانە هەست و بیرو بۆچوونێكی هەڵە لە ناو دڵ و دەروونی منداڵەكاندا بەرامبەر خێزان و هاوسەری ژیان و پەیوەندی نێوان ژن و مێرد دروست دەكات كە دوور نیە لە پاشە ڕۆژدا بە زیانیان تەواو ببێت .

٧. زۆر گرنگە سەنتەرو جێگای پێویست بۆ كات بەسەر بردن و راهێنان و فێركردنی رۆڵەكانمان بدۆزینەوە، بۆ ئەوەی لەلایەك كاتی خۆیان بەشتی بە سوودەوە خەریك بكەن و لەلایەكی تریشەوە ئەو حەزوو ئارەزووە سێكسیە كپ كراوانەشیان لە رێگای چالاكیە هونەری و وەرزشی و ئەدەبی و زانستیەكانەوە لە میانەی سەرخستن (الاعلاء)ەوە بە تاڵ بكەنەوە.

٨. پێویستە دایكان و باوكان و مامۆستایان ئەو راستیە بزانن كە دەبێت پەروەردەی سێكسی شان بە شانی گەشەكردنی عەقڵی و كۆمەلایەتی و هەڵچوونی منداڵ و هەرزەكار بڕوات، واتە یەكەم جار منداڵ پرسیار لە جەستەو لەش و لاری خۆی دەكات و بە لەشی خوشك و براو هاوەڵەكانی بەراورد دەكات و پرسیار دەربارەی ئەندامەكانی زاووزێ ی دەكات، دواتر پرسیار لە ئەرك و فەرمانەكانی دایكی دەكات و بە دوای وەڵامی چۆنیەتی منداڵ دروست بوون و لە دایك بووندا دەگەڕێ دوای ئەوەش ئیتر پرسیار لە ئەرك و رۆڵی باوك لە پرۆسەی منداڵ بووندا دەكات و لە كۆتاییشدا بە دوای وەڵام و چۆنیەتی چارەسەر كردن و جۆری گیروگرفتە سێكسیەكانی قۆناغی هەرزەكاریدا دەگەڕێت .

## پیشەوکار لە قۆناغی هەرزەکاری

زۆربەی دەروونزانەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە کاروپیشە گرنگی خۆیان لە تەواوکردنی کەسایەتی مرۆڤدا هەیە، سەرەتای دەست پێکردنی کارو پیشەیەکی نیمچە نەگۆڕ لە قۆناغی هەرزەکاری سەرهەڵدەدات، لەبەر ئەوە زۆر گرنگە کە لە قۆناغی هەرزەکاری بەدواوە کارو پیشەیەك بۆ هەرزەکار دابین بکرێت، بۆ ئەوەی لە میانەیانەوە هەست بە بوونی خۆی بکات و لە ڕێگەی پیشەکەیەوە هەندێك لە حەزوو ئارەزووەکانی تێر بکات. لە گرنگترین باشیەکانی کارو پیشە ئەمانەی لای خوارەوەن :-

١- پیشەوکارێك دەبێت بە دەروازەیەك بۆ دابین کردن و دەست کەوتنی سەرمایەی ماددی و باش کردنی باری ئابووری هەرزەکار، ئینجا لەبەر ئەوەی هەرزەکار بەدوای ناسنامەی خۆیدا دەگەڕێ و دەیەوێت سەربەخۆیی خۆی هەبێت و پاشکۆی کەس نەبێت. بۆیە بوونی پیشەوکارێکی نیمچە نەگۆڕ سوودو قازانجێکی زۆر بە هەرزەکار دەگەیەنێت و بواری سەربەخۆ بوونی بۆ دەرەخسێنێت .

٢- پیشەوکار دەبێت بەسەرچاوە بۆ دابین کردن و هێنانە دی زۆر لە ئامانجەکانی هەرزەکار.

٣- زۆر لە هەرزەکاران دەتوانن لە ڕێگەی پیشەوکارێکەوە گوزارشت لە حەزوو ئارەزووە کپ کراوەکانیان بکەن. هەردوو ڕەمەك و خۆڕسکی سێکس وشەڕ خوازی لە هەموو ڕەمەکەکانی تر زیاتر ڕووبەڕووی هەڕەشە و چاولێسوورکردنەوە و کپ کردن دەبن، ئینجا زۆر جار دەتوانرێت لە ڕێگەی میکانیزمی دەروونی سەرخستن و بەرزکردنەوە (الاعلاء أو التسامی) ئەو ڕەمەکە سێکسی و شەڕخوازیانە بۆ کارو چالاکیەکی کۆمەڵایەتی کە کۆمەڵ لێی ڕازی بێت بگۆڕدرێت.بۆ نموونە دەتوانرێت لە ڕێگەی بۆکسێن و زۆرانبازی یان

چوونەڕیزی ئاسایش و سەربازی، هەندێك لە حەزوو ئارەزووە شەڕ خوازییەکانی هەرزەکار تێر بکرێت و لەلادان و تاوان و سەرە ڕۆیی ڕزگار بکرێت .

٤- پیشەوکار بواری تێکەلاو بوونی کۆمەلایەتی بۆ هەرزەکار دەڕەخسێنێ و لە میانەی ئەو پیشەوکارەوە شارەزای کۆمەڵ و دام و دەزگا و زۆر داب و نەریتی کۆمەلایەتی دەبێت.

٥- مرۆڤ ئەگەر هیچ ئیش وکاری نەبێت، ئەوە زۆر بەزەحمەت تۆوی هەست کردن بە لێپرسراویەتی لە ناخیدا دەچیندرێ، بەلام ئەگەر خاوەنی پیشەوکارێك بوو، ئەوا ئەو کاتە ئەو پیشەو کارە ناچاری دەکات کە هەست بە لێپرسراویەتی بکات و هەرچ کەم و کورتیەك لە بەئاکام گەیاندنی کارەکەی ڕوویدات ئەوا ڕووبەڕووی هەڕەشەو گلەیی و سزا دەبێتەوە.

**هەڵبژاردنی پیشەوکار پەیوەندە بە زۆر فاکتەرەوەو ئەو فاکتەرانە ڕۆڵی خۆیان دەبینن، لە گرنگترین فاکتەرەکانیش ئەمانەی لای خوارەوەن :-**

١- هەندێك جار ئەو ژینگەو بارو دۆخەی کە هەرزەکار تێیدا دەژی دەبن بە فاکتەری سەرەکی و پاڵ بە هەرزەکارەوە دەنێت کە جۆرە پیشەوکارێك هەڵبژێرێت کە لەو ژینگەو دەووروبەرەدا هەن. بۆنموونە ناوچەو گوندێك بە (کشت وکاڵ یان ڕاوە ماسی یان کلاش دروست کردن یان قاچاغچێتی ... تاد) بەناوبانگەو زۆربەی خەلکەکە ئەو جۆرە ئیشە دەکەن لەبەر ئەوە زۆر جار هەرزەکاریش ئەو جۆرە پیشە هەڵدەبژێری .

٢- جاری واش هەیە حەزوو ئارەزووە کپ کراو و تێرنەکراوەکانی سەردەمی منداڵی دایك و باوك دەبن بە فاکتەری سەرەکی و هەرزەکار ناچار دەکەن کە ئەو جۆرە پیشەوکارانە هەڵبژێری کە ئەو حەزوو ئارەزووە خەفە کراوو تێر نەکراوانەی دایك و باوکی تێر دەکەن، هەرچەند هەرزەکار خۆشی بە دڵی نییە .

بۆ نموونە دايك و باوك لەسەردەمى هەرزەكارى و لاوى خۆيدا حەزى دەكرد كۆليژيكى دياريكراو تەواو بكات يان بچێتە بوارێكى تايبەتيەوە بەلام لەبەر هەر چ هۆيەك بێت (نابوورى، كۆمەلايەتى، راميارى، پەروەردەيى ... تاد) نەيتوانى لە كاتى خۆى ئەو حەزوو ئارەزووەى بهێنێتە دى، بەلام لە هەمان كاتيش بيرى نەچۆتەوەو دوورنيە لە بوارى هەستيدا نەمابێتەوەو چووبێتە بوارى نەستى ( اللاشعور) ئينجا لەبەر ئەوە ئێستا دەيەوێت بەخۆشى بێت يان ناخۆشى مندالە هەرزەكارەكەى بچێت ئەو كۆليژە تەواو بكات يان ئەو بوارە هەلبژێرێ كە كاتى خۆى باوكى ئاواتى بووە و بۆى تەواو نەكراوە. گومانى تێدا نييە زۆرجار بە زيانى هەرزەكار تەواو دەبێت، لەبەر ئەوەى ئەو خۆى حەزى لەو جۆرە كۆليژو بوارە نييە .

٣- هەندێك هەرزەكاريش دەچن بە دواى ئەو پيشەوكارانەدا دەگەرێن كە پارەو پولێكى باشى تێدايە .

٤- جارى واش هەيە هەرزەكار بير لە هەلبژاردنى ئەو جۆرە پيشەوكارانە دەكاتەوە كە پلەو پايەى كۆمەلايەتيان هەيە، واتە كۆمەل و دام و دەزگاكانى بە چاوى رێزو بەنرخەوە سەيريان دەكەن .

٥- هەندێك پيشەوكار پێويستيان بەرادەيەكى بەرز لە زيرەكى و توانستە عەقليەكان هەيە، لەبەر ئەوە تەنها ئەو كەسانەى كە ئەو جۆرە زيرەكى و توانستە عەقلييە تايبەتيانەيان هەيە دەتوانن تيايدا سەركەوتووبن. واتە ليرەدا فاكتەرى سەرەكى زيرەكى و توانستە عەقليەكانە .

٦- هەندێك جاريش حەزوونارەزووى هەرزەكار رۆلى سەرەكى لە هەلبژاردنى پيشەوكاردا دەگێرن، واتە هەرزەكار خۆى حەزى لە بوارى هونەرى يان ئەدەبى يان زانستى يان راميارى

هەیەو هەوڵدەدات پیشەوکارو بوارێکی خوێندن هەڵبژێرێ کە ئەو حەزوو ئارەزووەی تیژ دەکات.

ئەمانەی سەرەوە لە گرنگترین ئەو فاکتەرانەن کە رۆڵی سەرەکیان لە هەڵبژاردنی پیشەو کاردا هەیە .

**ئینجا ئەگەر بمانەوێت هەرزەکار لە بواری کارکردنیدا سەرکەووتوو بێت و کاروپیشەیەکی ئیمچە ئەگۆرو بەردەوام بۆ خۆی هەڵبژێرێ ئەوا دەبێت رێنمایی پیشەیی (التوجیه المهني) بکرێت و رەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت :-**

١- دەبێت هەرزەکار شارەزایی هەندێك لە پیشەوکارەکانی ناوچەکە و شارو دەوروبەرەکەی ببێت، بۆ ئەوەی بتوانێت یەکێکیان هەڵبژێرێ .

٢- تەنها شارەزا بوون بەس نییە، بەڵکو دەبێت هەرزەکار بزانێت کە هەریەك لەو پیشەوکارانە پێویستیان بەچ شارەزایی و لێزانیەك هەیە و سروشتی ئەو کاروپیشانە چین.

٣- لەلایەکی تریشەوە دەبێت هەرزەکار شارەزای توانا و لێزانی و شارەزاییەکانی و ئاگاداری خاڵە بەهێزو لاوازەکانی خۆی ببێت .

٤- دەبێت دایك و باوك و مامۆستایان رێنمایی پێویستی کورو کچە هەرزەکارەکانیان بکەن و پێیان بڵێن کە ئێوە ئەوە تواناو لێزانیەکانتانە و ئەوەش پیشەوکارەکانە. ئیتر ئێوە بۆخۆتان سەربەستن لە هەڵبژاردنی ئەو پیشەوکارو بواری خوێندنانە. بەڵام ئێمە پێمان باشە بیر لەو جۆرە پیشەوکارانە بکەنەوە کە لەگەڵ توانست و لێزانی و حەزوو ئارەزووەکانتاندا دەگونجێت، بۆ ئەوەی لە ژیانی پیشەیتاندا سەرکەووتوو بن .

## سایكۆلۆژیای لاوان

لاوان توێژێكی بەرفراوانی كۆمەڵن و ڕۆڵی سەرەكیان لە پێش كەوتنی شارستانیەت و كۆمەڵگادا هەیە، لەبەر ئەوەی لە ئەو پەڕی گەشەكردنی عەقلی و جەستەیدان و هێزو گوڕوتینیان بێ سنوورە، بەلام ئەو هێزو گوڕوتینەی لاوان هەر لە خۆیەوە دەرناكەوێت، بەڵكو دەبێت زەمینە و كەش و هەوای دەروونی و كۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسی خۆی بۆ خۆش بكرێت .

ئینجا ئێمەی گەورەو بەرپرس و مامۆستا، ئەگەر بمانەوێت سوود لە بەهرەو تواناكانی لاوانمان وەربگرین، ئەوا دەبێت بە ناخی لاواندا بچینە خوارەوەو لە سایكۆلۆژیای ئەو قۆناغە گرنگەی ژیان بگەین و بەشێوەیەكی زانستیانە مامەڵەی دروستی لە تەكدا بكەین.

**لە گرنگترین خەسلەت و تایبەتمەندیەكانی قۆناغی لاوێتی، ئەمانەی لای خوارەوەن:-**

**١- ململانێ ی دەروونی و كۆمەلایەتی:-**

یەكێكە لە گرنگترین خاسیەتەكانی قۆناغی لاوێتی، مەبەست لە ململانێ ی دەروونی ئەوەیە كە لاو ناتوانێت بە ئاسانی هاوسەنگیەك لە نێوان حەزوو ئارەزوو پاڵنەرە جیاجیاكانیا دروست بكات، كە ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی كە لاو لە بارێكی دەروونی نیمچە ئاڵۆزدا بژی و بەردەوام هەست بە گرژی و نارەحەتی بكات، ئەوەش بە پلەی یەكەم بۆ كەم ئەزموونی و شارەزایی لاو لەلایەك و زۆربوونی (اغراوات) و داواكارییەكانی ژیان لەلایەكی تر دەگەڕێتەوە.

ئینجا بۆ ئەوەی لاو لەو تەنگژەو بارە دەروونیە ئاڵۆزە ڕزگاری بێت، ئەوا دەبێت بە شێوەیەكی وا پەروەردە بكرێت، كە كەسایەتیەكی بەهێزی هەبێت و لە توانایدا هەبێت لە حەزوو ئارەزووە لاوەكیەكان دوور بكەوێتەوەو لەكاتی خۆیدا بڕیاری گونجاو بدات و خۆی لەو ململانێ دەروونیە ڕزگار بكات، بەڵام مەبەست لە ململانێی كۆمەڵایەتی ئەوەیە كە زۆر جار لاو دەكەوێتە ئاوكێشەو بگرەو بەردەی كۆمەڵایەتی و ناتوانێت بە ئاسانی خۆی لەگەڵ داب نەریت و بەها كۆمەڵایەتیە باوەكاندا بگونجێنێ.

ئەوەش بە پلەی سەرەكی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە لاو زۆر لەو بەهاو داب و نەریتە كۆمەڵایەتیانە ڕەت دەكاتەوەو لە هەمان كاتیشدا هەوڵ دەدات كە بە داب و بەهاو ڕەوشتی تر بیان گۆڕێتەوە، بەڵام ئەو ویست و حەزوو ئارەزووەی لاو بەو ئاسانیە نایەتە دی، بەڵكو زۆر جاریش ڕووبەڕووی هەڕەشەو سزادانی كەسانی چواردەوری دەبێتەوە، لەبەر ئەوە دەبینین بەردەوام لە هەموو كۆمەڵگاكاندا جۆرە ململانێ و ڕووبەڕوو بونەوەیەك لە نێوان ئەوەی نوێ ( لاو )و ئەوەی كۆندا (باب و باپیر) هەیە، كە بەداخەوە زۆر جار لەم ململانێ یەدا حەزوو ویستی ئەوەی كۆن سەردەكەوێت و لاویش بەدەم ئازارو برینەكانی سەرنەكەوتنیەوە دەناڵێنێ. بێگومان بەردەوام بوونی ئەو حاڵەتەو چارەسەرنەكردنی كێشەو گرفتەكان، لاو بەرەو هەڵدێر و زۆر گرفتی دەروونی و كۆمەڵایەتی دەبات .

**٢- تازەگەری:-**

بەزۆری لاوان حەز بە نوێخوازی و تازەگەری دەكەن و زۆر لە سیستەم و شێوازە كۆنە باوەكان ڕەت دەكەنەوە. بەڵام بەداخەوە لەم هەوڵەشیاندا زۆر جار سەركەوتن بەدەست ناهێنن. لەبەر ئەوەی لەلایەك تازەگەری و نوێخوازیەكەیان لەسەر بنەمایەكی پتەو نیيە و پلان و نەخشەی زانستی پێویستیان بۆ دانە ڕشتووە، بەڵكو جۆرێكە لە لاسایی كردنەوەی كوێرانەی وڵاتانی تر، یان دوورە لە حەزوو ئارەزوو پێداویستیەكانی مرۆڤی كورد، لە لایەكی تریشەوە بەداخەوە تا ئێستا لە كۆمەڵگای كوردەواری بە چاوی گومان و دوو دڵیەوە

دەرواننە داواکاری و حەزوو ئارەزووەکانی لاوان. کە ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە و بە زەرەرو زیانی کۆمەڵەکەمان تەواو دەبێت. باشترین ڕێگا چارەش بۆ دەرباز بوون لەو کێشەیە ئەوەیە کە لەلایەك لاوان لە خراپی وزیانەکانی لاسایی کردنەوەی کوێرانەی هەندێك مۆدەو ڕێبازو شێوازی ژیانی کۆمەڵگاکانی تر ئاگادار بکرێنەوەو لە لایەکی تریش لە ڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و کۆڕ و کۆبوونەوەکانەوە دایکان و باوکان و مامۆستایان لە ڕەوایی و ڕاست و دروستی زۆر لە داواکاری و حەزوو ئارەزووەکانی لاوان، هۆشیار بکرێنەوە، بۆ ئەوەی ئیمچە تێگەیشتنێك لەنێوان هەردوو ئەوەکەدا دروست ببێت، سەرەڕای ئەوەش پێویستە ڕۆشنبیران پاڵپشتی سەرەکی داواکارییە ڕەواکانی لاوان بن و چۆك بۆ هەندێك داب و نەریتی کۆمەڵایەتی دواکەوتوو دانەدەن.

## ٢- کەسایەتی و ناسنامەی تایبەتی:-

گەڕان بەدوای ناسنامەی تایبەتی و دۆزینەوەی خود یەکێکە لە گرنگترین پێداویستیەکانی لاو. مەبەست لە ناسنامەی تایبەتی ئەوەیە کە لاو بتوانێت وەڵامی پرسیاری (من کێم؟) بداتەوە، کە بەداخەوە زۆربەی لاوانی ئێمە بێ ناسنامەن، ئەمەش بە پلەی یەکەم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تاوەکو ئێستا ئێمە وەك ئەتەوەیەك بێ ناسنامەین و بوونی سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیری تایبەت بە خۆمان نییە کە ئەمەش لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بە زەقی ڕەنگی داوەتەوە. یەکێك لە ڕەنگدانەوە خراپەکان ئەو کۆچە بە کۆمەڵەی لاوانە، کە من پێم وایە گەڕان بە دوای ناسنامە لە گرنگترین هۆکارەکانیەتی. واتە لاو بە مەبەستی دۆزینەوەی خودی خۆی و دەست کەوتنی ناسنامە کۆچ دەکات، بەلام بەداخەوە زۆر جار ئەو مەبەستەی نایەتەدی کە ئەمەش لە هەندەران لاو تووشی کۆمەڵێك کێشەی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری دەکات.

سەرەڕای ئەوەش لاوانی ناوخۆ هەر بەو خەوو خەیاڵەی دۆزینەوەی ناسنامە دەژین بەلام بەداخەوە بێ کاری و هەژاری و نەبوونی دادگەری کۆمەڵایەتی پێویست و دروست

نەکردنی خێزان، ئەو خەون و خەیاڵانە زیندە بە چاڵ دەکەن، کە ئەوەش ڕەنگدانەوەی ترسناکی لەسەر هەڵس وکەوت و بیرکردنەوەی خراپی لاواندا هەیە ودەبینین پەرەوازەی سەر گروپ و لایەنە جیاجیاکان بوون و هەر کۆمەڵەیان بە ئاراستەی جیاواز لە کۆمەڵەکانی تر کار دەکات کە ئەمەش بە زیانی لاو و کۆمەڵەکەمان تەواو دەبێت. باشترین ڕێگا چارەش پتەو کردنی ئەم ئەزموونەی هەرێمی کوردستانە و هەوڵدانە بۆ دەست کەوتنی دان پیانانی نێو دەوڵەتی و چارەسەرکردنی گرفتەکانی بێکاری و هەژاری و نەبوونی دادگەری پێویست و چەسپاندنی یاسایە، بۆ ئەوەی لاوی کوردیش وەك لاوانی هەموو وولاتانی تر هەست بە ناسنامەو بوونی خۆی بکات و جۆرە ئارامیەکی دەروونی دەست بکەوێت.

**٤- هەست کردن بە بۆشایی کات:-**

دەتوانین بڵێین یەکێك لە گرفتە سەرەکیەکانی لاوانی ئێمە بوونی بۆشایی کاتە (وقت الفراغ)، لەبەر ئەوە بەردەوام دەیان بینین بە تاك و بە کۆمەڵ لەبەردەم بازارو شوێنە گشتیەکاندا یان دەوەستن یان بەبێ ئامانج هات و چۆ دەکەن، یان لە چایخانە و شوێنەکانی تر خۆیان بە کاری لاوەکی و بێ سوودەوە خەریك کردووە، تەنانەت هەندێکیان نەیان توانیوە سوود لە لایەنە باشەکانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت وەربگرن و لە جیاتی ئەوە خۆیان بە سەیر کردنی هەندێك بەرنامەو پرۆگرام یان یاریکردنی بێ سوودەوە خەریك کردووە. لە بەرامبەر ئەوانەدا ژمارەیەکی زۆر کەم لە لاوانمان توانیویانە ئەو کاتە زۆرەی هەیانە بۆ کارو چالاکیەکی بە سوود تەرخان بکەن.

بۆ چارەسەر کردنی ئەو گرفتەش زۆر پێویستە وەزارەتە پەیوەندیدارەکان و ڕێکخراوەکانی تایبەت بە قوتابیان و لاوان هەوڵی کردنەوەی جۆرەها سەنتەرو پەیمانگا و بنکە و خولی تایبەتی بە هوشیار کردنەوەو فێر کردن و ڕاهێنانی لاوان بدەن، بۆ ئەوەی سوود لەو کاتە زۆرەی بێ کاریان وەربگیرێت و لاوان لەو جێگایانە خۆیان بەکارو چالاکیەکانی (هونەر، وەرزش، ئەدەب، زانستی، ... تاد) یەوە خەریك بکەن و لە ڕێگەیانەوە لە لایەك بەهرەو تواناکانیان بدۆزرێتەوە لە لایەکی تریشەوە لە سوڕاندنەوەو هاتووچۆی شوێنە نا دروست و نا پەروەردەییەکان دوور بخرێتەوە .

## گرفتەکانی لاوان و چۆنیەتی زاڵ بوون بەسەریاندا

لەوانەیە کەسانێك هەبن و لەو بڕوایەدابن کە خەڵکی وا هەیە هیچ گیروگرفتێکیان نییە وخۆزگەیان پێدەخوازن، بەڵام بەداخەوە ئەوان هەڵەن و بیروباوەڕەکانیان دوورە لە راستیەوە، چونکە مرۆڤ نییە لە دونیادا گیروگرفت و ناخۆشی لە ژیانیدا نەبێت. لەبەر ئەوەی زۆر گیروگرفت ڕوو بەڕووی مرۆڤ دەبێتەوەو تووشی بووە، کە ئەو مرۆڤە هیچ ئیرادەو ویستێکی لە دروست بوونیاندا نەبووە. بۆ نموونە ( ناوی ناخۆش گرفتی بۆ دروست دەکات، لە خێزانێکی هەژارو دەست کورتدا لە دایك بووە، دایك و باوکێکی کەللە ڕەق و ڕەزیلیان هەیە، شێوەو بالاو جەستەی ناشیرینە، دواکەوتنی ژیری هەیە، مامەڵەی خراپی لەگەڵ دەکەن، تووشی نەخۆشی و بێ کاری دەبێت، نەیان هێشتووە خوێندن تەواو بکات، جیاوازی لە نێوان ئەوو خوشك و براکانی تریدا دەکەن، مامۆستایەکی خراپی هەیە، وولاتەکەی پڕە لە شەڕو ئاژاوە ... تاد ). کە سەرجەم ئەو هۆکارانەی سەرەوە سەرو دڵی دەگرن و گیروگرفتی بۆ دروست دەکەن.

بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە کەسانی تر گیروگرفتیان نییە، بەڵکو هەموو کەس گیروگرفتی گشتی و تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام شێوەو جۆرەکەی جیاوازە، لە لایەکی تریشەوە ئەمە مانای ئەوەنییە کە ئێمە دەست لە ئەژنۆ دابنیشین و هەر خەم و خەفەت بخۆین و خۆمان لە خەون و خەیاڵدا نقوم بکەین و بڵێین ئەو هۆکارو بارودۆخە لە دەرەوەی تواناو ویستی ئێمە دایە و ئێمە هیچمان پێ ناکرێ، چونکە ئەو لێك دانەوەیە هەڵەیە و لەگەڵ تواناو بەهرەکانی مرۆڤدا یەك ناگرنەوە. لەبەر ئەوەی ئیرادەو بەهرەی مرۆڤ ئەوەندە گەورەو لە بن نەهاتووە کە دەتوانێت بەسەر هەموو گرفت وکۆسپ و تەگەرەیەکدا زاڵ بێت.

ڕاستە لەوانەیە توانای گۆڕینی ناراستەی هەندێك ڕووداوی جیهانی دەرەوەمان نەبێت، بەڵام خۆ توانای گۆڕینی ڕاو بۆچوونی خۆمان هەیە و دەتوانین لێك دانەوەو

بۆچوونی خۆمان دەربارەی ژیان بگۆڕین. چونکە سەرکەوتنی مرۆڤ پەیوەندی بە ئیرادەو ویست و لێك دانەوەکانی جیهانی ناوەوە هەیە. بۆ نموونە یەکێك لە کارێك دەردەکرێت یان لە خوێندن سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ یان لەگەڵ هاوسەرەکەی ژیانی سەرکەوتوو نابێت، ئەو ڕووداوە تووشی دڵتەنگی و بێزارییەکی زۆری دەکات و دەست لە ئەژنۆ دادەمێنێ و وا دەزانێ ژیان کۆتایی هاتووە و هیچ تروسکایەك و خۆشییەکی تێدا نەماوە، بەردەوام بوونی ئەو جۆرە بیرکردنەوەو لێك دانەوەیە، خاوەنەکەی تووشی کۆمەڵێك کێشەو گرفت و گرێی دەروونی دەکات.

بەڵام کەسێکی تر ڕووبەڕووی هەمان گرفت و ناخۆشی کەسی یەکەم دەبێتەوە، بەڵام وەك کەسی یەکەم تووشی هەرەس هێنان و چۆك دانان نابێت، بە پێچەوانەوە بە دوای هۆکارەکانی ئەو سەرنەکەوتنەی دەگەڕێت و هەوڵی چارەسەرکردن و دووبارە نەبوونەوەیان دەدات و بەهێزو گوڕوتینێکی تازەوە بە دوای کارێکی نوێدا دەگەڕێ و دووبارە خۆی بۆ خوێندن ئامادە دەکات و کەم و کورتیەکانی پێشووی چارەسەر دەکات و بەدوای هۆکارەکانی ناخۆشی نێوان خۆی و هاوسەرەکەیدا دەگەڕێ و ڕێگا چارەی گونجاوی بۆ دەدۆزێتەوە. واتە مرۆڤ لە ژیانیدا ڕووبەڕووی زۆر گرفت دەبێتەوە، ئەمە یاسای ژیانەو وەك لە پێشتر ئاماژەمان پێکرد کەس نییە گرفت و کێشەی نەبێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەسەر ئەو گرفتانەدا زاڵ بێت. ڕێگا چارەی گونجاویان بۆ بدۆزێتەوەو لە هەمان کاتیشدا پەندیان لێوەر بگرین و جارێکی تر دووبارەیان نەکەینەوە. واتە دەبێت بۆچوونێکی واقعیانەمان بۆ ژیان هەبێت و هەموو تاڵ و شیرینیەکانی بەیەك چاو هەڵسەنگێنین و لە خەوو خەیاڵ و خۆ خواردنەوەو ڕاکردن و چۆك دادان دوور بکەوینەوە، چونکە تەنها ڕێگا چارەو سەرکەوتن ڕووبەڕوو بوونەوەی گرفتەکانی ژیان و لێك دانەوەیانە نەك ڕاکردن لێیان.

**بۆ ئەوەی لە ژیان بەختەوەر بیت و بەسەر کۆسپ و گرفتەکانیدا سەرکەوتوو بین، دەتوانین پەیرەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین:-**

١- هەوڵبدە لە کاتی بێ نیشیدا خۆت بەکارو چالاکیەکی (هونەری، وەرزشی، ئەدەبی، زانستی ... تاد )یەوە خەریك بکەو کاتی بێ نیشیتی پێ بەسەر بەرە، چونکە لەلایەك لە بێزاری و بێ نیشی و خەو و خەیاڵی خراپ دوورت دەخاتەوە، لەلایەکی تریشەوە هەندێك لە حەزوو ئارەزووەکانت تێر دەکەیت و لەوانەیە شارەزای بەهرەو توانا شاراوەکانیشت ببیت.

٢- دەبێت لە ژیاندا فەلسەفەو بۆچوونێکی تایبەتی خۆت هەبێت، بۆ ئەوەی لە ڕێگەیەوە ئامانجەکانی ژیانت دیاری بکەیت و شێوازو میکانیزمی پێویست بۆ گەیشتنیان دەست نیشان بکەیت، چونکە نەبوونی فەلسەفەو ڕاو بۆچوونێکی دیاری کراو دەربارەی ژیان، مرۆڤ بەرەو هەڵدێرو لابەلایی و سەرە ڕۆیی و شکستی دەبات.

٣- پێویستە کەسێکی کۆمەڵایەتی بیت و تێکەڵاوی کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی بکەیت و هاوکاری کەس و کارو دۆست و برادەران بکەیت، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە و بەبێ کۆمەڵ و تێکەڵاو بوون و هاوکاری و خۆشەویستی، کەسێکی نەخۆش دەبێت .

٤- هەوڵبدە ڕوویەڕووی ترسەکانت ببیتەوەو بەدوای هۆکارەکانیدا بگەڕێ و بزانە لە ئەنجامی چییەوە تووشی ئەو جۆرە ترسە بوویت، چونکە تەنها ڕێگا دۆزینەوەی هۆکارەکانی ترسە، دوا جاریش زاڵ بوون بەسەریاندا، چونکە مەحاڵەو کەس ناتوانێت لە ژێر سایەی ترس و دوو دڵیدا ژیان بەسەر بەرێت .

٥- پێویستە لە خەوو خەیاڵی بەردەوام و نقووم بوون لە زیندە خەون دووربکەویتەوە، چونکە هیچ کێشەوگرفتێك بە خەوو خەیاڵ و ڕاکردن چارەسەر ناکرێت. بەڵکو دەبێت لە ژیانی واقیعدا تێریان بکەیت و چارەسەری گونجاویان بۆ بدۆزیتەوە.

٦- وەرزش و رۆیشتنی ڕۆژانە باشترین هۆکارن بۆ بەهێز کردنی ئەندامەکانی لەش و تەندروستی باش، لەبەر ئەوە هەولبدە ڕۆژانە هەندێك چالاکی وەرزشی بە ئاکام بگەیەنە

٧- خۆشەویستی و هەلبژاردنی هاوسەری ژیان مافی سروشتی مرۆڤە و دەتوانیت ئەو مافەی خۆت وەرگریت، بەلام زیادە ڕۆیی تیایدا و گرتنی شێوازی چەوت و نابەجێ تووشی زۆر گرفتی کۆمەلایەتی و دەروونیت دەکات، لەبەر ئەوە دەبێت ئاگاداری ئەو لایەنەش بیت .

٨- لەبەر دەم خەم و خەفەت و دلە ڕاوکێدا چۆك دانەدەیت، بەلکو هەموو گرفت و کێشەیەکی کۆمەلایەتی و دەروونی هۆکارو چارەسەری خۆی هەیە کەواتە هەولبدە بە دوای چارەسەری گونجاودا بگەڕێ، دەشتوانیت سوود لە توانا و شارەزایی کەسانی تریش وەربگریت و هیچ پێویست بە شەرم و دوو دلی ناکات و داوای یارمەتی و زانیاری پێویستیان لێ بکە .

٩- ئەکەی لەکاتی بوونی گیرو گرفت و ناخۆشی پەنا بۆ ( مەی خواردنەوەو خۆسەرخۆش کردن و جگەرە کێشان و قومار، ... تاد )ببەیت، لەبەر ئەوەی ئەو چالاکی وکارانە چارەسەری گرفتەکان ناکەن بەلکو ئالۆزتری دەکەن، لەلایەکی تریشەوە بەرەو دەردەمەی و خووپێوەگرتن و زۆرکاری خراپ و کێشەی کۆمەلایەتیشت دەبەن . ( نجاتی، ١٩٥٥، ص ٩٨-٩٩ ).

١٠- لەگەلّ هەموو ئەوانەشدا دەبێت زۆر بە جەرگ وخۆڕاگرو دلگەورە بیت و نابێت کۆلّ بدەیت بەلکو دەبێت بڕوات بەخۆت هەبێت و لە هەولی چارەسەرکردنی گرفتەکانتدا بیت، چونکە تەنها ئەو کەسانە گرەوی مێژوو دەبەنەوەو کامەرانیان دەست دەکەوێت، کە کۆلّ نادەن و بەردەوام خۆڕاگرو بە ئارامن و لە کەوتنەکانیان سوود وەردەگرن و لە دوای هەرکەوتنێك خۆیان بۆ هەنگاوێکی نوێ ئامادە دەکەن .

# نامۆ بوونی لاوان

یەکێك لە گرفتە سەرەکیەکانی لاوان، کە وەك مۆتەکە سەرسنگی گرتوون نامۆبوونە، نامۆبوون کوشندەترین دەردی کۆمەڵایەتیە و هەموو تواناو بەهرەکانی لاوان زیندە بەچاڵ دەکات. چەمکی نامۆ بوون زۆر مانا هەڵدەگرێت و بەزۆر شێواز لێکدراوەتەوە. زۆربەی زانایان لەو بڕوایەدان کە بۆ یەکەم جار و بەشێوەیەکی میتۆدی و زانستی ڕێك و پێك لەلایەن هیگڵەوە لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم بەکار هات، هەرچەندە پێشتر ئەم چەمکە وەك زاراوەیەك لەبیروبۆچوونی دیاندا (مسیحی) لە سەدەکانی ناوەڕاست دەرکەوتووە، بەڵام هیگڵ بۆ یەکەم جار خستیە چوار چێوەو قالبێکی زانستیەوە، دوای ئەویش لەلایەن مارکسەوە بۆ شیتەڵکردنەوەو لێکدانەوەی سروشتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی سیستەمی سەرمایەداری بەکارهاتووە. بەڵام لەلایەنی کۆمەڵایەتی و دەروونیەوە زۆر بەسەرکەوتووانە لەلایەن (سیمان)ی زاناوە بەکارهات و پێناسەیەکی گشتی و سەرتاسەریشی بۆ داڕشت کە باس لە پێنج جۆر مانای جیاجیای نامۆ بوون دەکات کە ئەمانەی لای خوارەوەن:-

## ١- بێدەسەڵاتی یان لەدەست دانی کۆنتڕۆڵکردن:-

ئەم مانایەی نامۆبوون بریتیە لە ئەوەی کە تاك هەست بە بێدەسەڵاتی خۆی دەکات و گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە توانای هیچ گۆڕانکارییەکی کۆمەڵایەتی نییە و تەنانەت ناشتوانێت چارەنووس و پاشەڕۆژی خۆشی دیاری بکات، سەرەڕای ئەوەش ناتوانێت بەشداری بڕیار وەرگرتن و یەکلا کردنەوەی ئەو کارو چالاکیانە بکات کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە چارەنووسیەوە هەیە.

## ٢- بێ مانایی، لە دەست دانی مانا:-

لێرەدا نامۆ بوون مانای ئەوەیە کە تاك بە هیچ شێوەیەك هەست بە تام و چێژی ژیان ناکات و لە جیاتی ئەوە هەست بە بۆشاییەکی دەروونی و کۆمەڵایەتی بەرفراوان و لە ڕادە

بەدەر دەکات و هیچ فەلسەفەو ڕێبازێکی تایبەتی لە ژیان نییە و خۆشی نازانێت بۆ چی دەژی و ئامانجەکانی کامانەن.

۳- بێ پێوەری:-

لێرەدا نامۆ بوون ئەوە دەگەیەنێت کە تاك دەگاتە ئەو بڕوایەی کە ئامرازو ڕێگاو شێوازی نابەجێ و دزێو و هەڵە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان پێویستن، لەبەر ئەوەی هیچ پێوەرو بەهایەکی باوەڕ پێکراوی نەگۆڕ نییە. هەموو شتەکان تێکەڵ بەیەکتری بوون. کەواتە گرتنە بەری شێوازی خوارو خێچ و نابەجێ بۆ هێنانە دی حەزوو ئارەزوو ئاواتەکان پێویستن. ئەم حاڵەتەش لە کاتێکدا دروست دەبێت کە بەهاو داب و نەریت و پێوەرە کۆمەلایەتی و ئەخلاقیەکان لێك دەترازێن و توانای کۆنترۆلکردن و دەستەمۆ کردنی ڕەوشت و ڕەفتاری تاکەکانی کۆمەڵیان نابێت.

٤- گۆشەگیری و دوورە پەرێزی کۆمەلایەتی:-

لێرەدا نامۆ بوون مانای ئەوەیە کە تاك لە میانەی کارو چالاکیەکانیەوە هیچ هەست بە خۆشی و کامەرانی و ڕازی بوون ناکات و پەیوەندی لەتەك خودی خۆی تێك دەچێت و لە خۆی و تواناکانی ڕازی نییە و تەنانەت گومان لە خۆشی دەکات. وەك ئەو کەسە دەبێت کە هەرجارەی ڕۆڵ و نمایشی کەسایەتیەکی تر دەکات و هەرجارەی ڕوو پۆش و دەمامکێك دەپۆشێت وهەست بە بوون و کەسایەتی و ناسنامەی ڕاستەقینەی زۆر بە دەگمەن دەکات.

کەواتە بە پێی ئەو پێناسانە کەسی نامۆبوو ئەو کەسەیە کە هیچ هەست بە گرنگی خۆی ناکات و ژیانی نرخێکی ئەو تۆی نییە و ئەو بڕوایەی لەلا دروست بووە کە بوون و نەبوونی ئەو وەك یەك وایە و لە توانایدا نییە هیچ گۆڕانکارییەکی پێویست لەژیانی خۆی و کۆمەڵەکەیدا بکات و خاوەنی هیچ فەلسەفە و ڕێباز و بیرو باوەڕێکی بونیاد و کاریگەر نییە و کەلتوری ئەو کۆمەڵەی تیایدا دەژی بەهی خۆی نازانێ و سەرەڕای ئەوەش بە چاوی

گومان و دوو دڵى سەيرى خۆى دەكات. كە سەرجەم ئەمانەش بەرەو نامۆ بوونى كۆمەڵايەتى و رۆشنبيرى و ئايينى و دەروونى دەبەن. (الزغل و عضيبان، ١٩٩٠، ي ٤٨-٤٩) .

## نيشانەكانى نامۆ بوون:-

هەرچەندە هۆكارو نيشانەكانى نامۆ بوون زۆرن و هەندێك جار وەك نيشانەكانى نەخۆشى و گرفتە دەروونى و كۆمەڵايەتيەكان وان بەڵام بەشێوەيەكى گشتى ئەمانەى خوارەوە بەگرنگترين نيشانەكانى نامۆ بوون دادەنرێن و دەتوانين لە ڕێگەيانەوە كەسى نامۆ ديارى بكەين :-

*١- بەشدارى نەكردن لە چالاكيە كۆمەڵايەتى و سياسى و ئايينيەكان ... تاد .*
*٢- بڕوا نەبوون بە خودو سەير كردنى خود بە چاوى سووك .*
*٣- رەشبينى لە ژيان و بڕوا نەبوون بە پاشە رۆژ .*
*٤- نەبوون و لاوازى خۆسازاندنى كۆمەڵايەتى و خودى .*
*٥- كەمى بەرهەمى جەستەيى و عەقلى و هونەرى و ئەدەبى .*
*٦- نەبوونى فەلسەفە و ئايدۆلۆژيا و ڕێبازێكى تايبەتى لە ژيان .*
*٧- لاوازى لە پلان دانان و بڕيار وەرگرتن لە كاتى پێويست .*
*٨- بەشدارى نەكردن لە هەڵبژاردن و چالاكيە سياسى و كۆمەڵايەتيە چارەنووس سازەكان و بەرژەوەندييە نەتەوەيى و نيشتمانيەكان.*

## هۆكارەكانى نامۆ بوون:-

گومانى تێدانييە نامۆ بوون دياردەيەكى كۆمەڵايەتى دەروونييە واتە لە ڕێگەى كۆمەڵ و دام و دەزگاكانيەوە دروست دەبێت و تاك لە ڕێگەى بۆ ماوەو گوێزراوەوە وەرى ناگرێت. لەبەر ئەوە ئەگەر بمانەوێت بەشێوەيەكى زانستيانە شەن و كەوى هۆكارەكانى ئەم

دیاردەیە بکەین، ئەوا دەبێت لەنێو خەرمانی دام و دەزگا کۆمەڵایەتیەکاندا بۆیان بگەڕێین، کە ئەوانیش بریتین لە خێزان و قوتابخانە و برادەرو جێگاکانی خودا پەرستی و ئامرازەکانی ڕاگەیاندن ... تاد.

هەموومان چاك دەزانین خێزان لانەو قوتابخانەی یەکەمی هەموو تاکێکە، ئینجا ئەگەر منداڵ هەر لە منداڵیەوە لە باوەشی گەرمی دایك و باوك و کەسانی دڵسۆزی پەروەردە نەبێت و پێداویستیە فیسۆلۆژی و دەروونی و کۆمەڵایەتیە گرنگەکانی بۆ دابین نەکرێت و لە ناو خێزان هەست بە دڵنیایی وئارامی نەکات. گومانی تێدا نییە کەڵێن و دەلاقەی گەورە دەکەوێتە کەسایەتی و باری دەروونیەوەو بە چاوی دوو دڵی و ڕاڕایی سەیری تاکەکانی کۆمەڵ و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان دەکات. لەبەر ئەوەی لەناو خێزان وتاکەکانی تری دەوروو بەری هەستی بە خۆشی و دڵنیایی نەکردووە. ئینجا ئەگەر هاتوو لەناو قوتابخانەش هەر هەستی بە خۆشی و کامەرانی نەکرد و تام وچێژی لە پرۆگرام و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی ناو سنووری قوتابخانە وەرنەگرت، بێگومان ئامۆ بوون ودووره پەرێزی و گۆشە گیری دەبن بە بەشێك لەرەفتارو بیر کردنەوەی. سەرەڕای ئەوەش ئەگەر تاك لەناو کۆمەڵ و نەتەوەو وڵاتێکدا بژی، سەروەری و ئاستامەی خۆی نەبێت و بەردەوام مافەکانی پێشێل بکرێت، گومانی تێدا نییە کە ئەو تاکەش لە ئاوێنەی ئەو وڵات و کۆمەڵەدا خۆی دەبینێتەوە و هەست بە بێ ئاسنامەیی و زوڵم وستەم دەکات و بۆچونێکی وای لەلا دروست دەبێت کە بوون و نەبوونی ئەو وەك یەکەو لەتوانایدا نییە هیچ گۆڕانکارییەك بکات و چارەنووس و پاشەرۆژی لە چارەنووس و پاشە ڕۆژی کۆمەڵەکەی باشتر نابێت .

هەروەها پێشێل کردنی ماف و سەربەستیەکانی تاك لەلایەن خێزان و کۆمەڵەوەو سووکایەتی پێکردنی و وەرنەگرتنی ڕاو بۆچوونەکانیشی، کۆمەڵێك فاکتەری ترن کە مرۆڤ بەرەو ئامۆ بوون دەبەن .

**ئینجا ئەگەر بێت و لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستی و بۆچوونانەی سەرەوە ژینگەی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری و دەروونی و ڕۆشنبیری لاوی کورد هەڵبسەنگێنین ئەوا دەگەینە ئەم دەر ئەنجامانەی لای خوارەوە :-**

دەر ئەنجامی سەرجەم ئەو توێژینەوەو ئامارانەی لەسەر مرۆڤی کورد و دەورو بەرەکەی کراوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ڕێژەیەکی زۆر لە تاکەکانی کۆمەڵگای کوردەواری نەخوێندەوارن و ڕێژەیەکی زیاتریش لەوان کۆیلەی داب و نەریتی کۆمەلایەتی و دواکەوتوون، سەرەڕای ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە خێزانەکان هەژارو دەست کورتن و تا ئێستاش سیستمی عەشایەری و تائیفە گەری و ناوچەگەری بەسەریاندا زاڵە و لغاوی عەقل و بیر کردنەوەی مەنتیقیانەیانی کردووە.

ئینجا کاتێك منداڵ و هەرزەکار و لاو لە ناو ئەو جۆرە ژینگەو بارو دۆخەدا پەروەردە دەبێت، بێگومان زۆر لە مافەکانی پێشێل دەکرێت و بواری گەشەکردنی ئاسایی و دروستی بۆ ناخولقێندرێ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە تاکەکانی ئەو جۆرە ژینگەیە بەدەست کۆمەڵێك گرفتی دەروونی و کۆمەلایەتیەوە بناڵێنن و بەردەوام لە سەنگەری پارێزگاری کردندا بن و بە چاوی گومان و دوو دڵیەوە بڕواننە کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی و لەناو خێزان و دەورووبەرەکەیدا هەست بە ئاسایش و دڵنیایی نەکەن.

بێگومان ژینگەی قوتابخانەشمان زۆر لە ژینگەی خێزانەکانمان باشتر نییە، لەبەر ئەوەی هەمان عەقلیەت و بیرو بۆچوونی کۆمەڵ وەك چۆن لەناو خێزان ڕەنگیان داوەتەوە، بەهەمان شێوەش لەناو قوتابخانە و پرۆگرام و شێوازەکانی وانە گوتنەوەدا ڕەنگیان داوەتەوە و مامۆستا دایك وباوکی دووهەمە و قوتابخانەش خێزانی دووهەمە. لەبەر ئەوە هەمان بە هاوعەقلیەت وسیستەم قوتابخانەش بەڕێوە دەبات و قوتابی ئەو سەربەستی و بواری ڕادەربڕینەی نییە کە وەك پێویست بونیادی کەسایەتی بنێت و لە شوێنەوارە خراپەکانی خێزان ڕزگاری بکات.

داو و دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش بەپێی توانایان بەشداریان لە خەست کردنەوەی قوڕی نامۆ بوونی لاوی کورد کردووە، لەبەر ئەوەی لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان و لاپەڕەی کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان شتێك دەبینێ و دەخوێنێتەوە، بەلام لە واقعیدا شتێکی تر دەبینێ و ڕۆژانە بەبەر چاوییەوە پراکتیزە دەکرێت، کە ئەمەش بێگومان ئازارێکی دەروونی زۆری دەدات. لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەوە (بەتایبەتیش سەتەلایت و سینەما و تەلەفزیۆن) بە تازەترین مۆدێلی جل و بەرگ و تەکنەلۆژیاو خۆشترین ژیان و تازەترین ئایدۆلۆژیا و بیر و بۆچوون ئاشنا دەبێت و بۆ ماوەیەك بە خەوو خەیاڵ لە تەکیاندا دەژی، بەلام پاش کەمێك کۆشك و تەلاری خەوو خەیالی هەرەس دەهێنن وخۆی لەناو کۆمەڵێك داب و نەریتی داپلۆسێنەر و بێ کارەبایی و بێ ئاسنامەیی و هەژاری و نەبوونی و بێکاریدا دەبینێتەوە.

دوای ماوەیەك ئازاری دەروونی و هەڵچوون و خەم و خەفەت دووبارە لە ڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە بەهەشتەکەی یەکەم جاری بۆ دروست دەبێتەوە و دوای ماوەیەك هەرس دەهێنێتەوە بەم شێوەیە ئەم لاوە بەستەزمانەی ئێمە بەردەوام لەو بازنە داخراوەدا دەخولێتەوە کە دوور نیە زۆر بەرگەی ئەو ململانێ و گەمەیەی نێوان خەوو خەیاڵ و واقیع نەگرێت و لە ئاکامیەوە تووشی گۆشەگیری و نامۆ بوون و هەست کردن بە کەمی ... تاد) ببێت. چونکە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان واقیع و خەیالی دا هەیە، بەلام لاوێکی ولاتانی تر تووشی هەمان دەردی لاوی ئێمە نابێت، لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەو شتانەی کە لە ڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە پێیان ئاشنا دەبن نامۆ نین و لەواقیعی ڕۆژانەیدا هەستی پێدەکات و دەتوانێت بە کردەوە پراکتیزەی بکات نەك بە خەوو خەیاڵ.

لە هەموو دەردەکان کوشندەتر، ئەو بارودۆخەیە کە ئێستا لاوی کورد تیادا دەژی. هەموو تاکێکی کورد (نەك لاوان بەتایبەتی) تووشی نامۆ بوونی سیاسی بوون، لەبەر ئەوەی تا ئێستاش نازانین چارەنووسی ئەم ئەزموونانەمان چی دەبێت، ڕاستە زۆربەمان گەشبینین بە داهاتوومان، چاوەڕوانی داهاتوویەکی ڕووناك دەکەین، بەلام بنەماکانی ئەو گەشبینیەمان زۆر تۆکمە و پتەوو توندو تۆڵ نییە، سەرەڕای ئەوەش ئەزمونی تالمان لە

لایەنی سیاسیەوە هەیە و پێشتر زۆر جار کورد لەخشتە براوەو ئەزموونەکانی رابردوویان زیندە بەچاڵ کردووە. بێجگە لە هەموو ئەوانە لاوان لە هەموو توێژو چینەکانی تر هەستیار ترن و شارەزایی و ئەزموونیان کەمترە و زیاتر لایەنی عاتیفی و سۆزیان بەسەر لایەنی بیرکردنەوەی مەنتیقیانەیاندا زاڵترەو وێڵ و شەیدای گۆڕانکاری و چارەسەرکردنی گرفتەکانن و زیاتر لە توێژوو چینەکانی تر نموونەیین و کەمتر لە گەورەکان واقیع بینیانەترن، لەبەر ئەوە ئەو بارودۆخە سیاسیەی ئێستا زیاتر کاریان تێدەکات و بەرەو نامۆیی و هەڵچوون و گرژی دەروونیان دەبات.

بەگشتی ئەو فاکتەر و بارودۆخانەی سەرەوە لاوی کورد تووشی نامۆ بوون و خەم وخەفەت و گۆشەگیری دەکەن. ئەمەش مانای ئەوە نییە هەموو ئەو فاکتەرانەی سەرەوە لەلای یەك کەس کۆدەبنەوە، یان هەموو لایەك تووشی نامۆ بوون و گۆشەگیری دەکەن. بەڵکو جیاوازی تاکایەتی هەیە و بەیەك شێوە کار لە هەموو لاوەکان ناکات، دوورنییە هەندێك لاو بە ئاسانی هەرەس بهێنن، بەڵام هەندێك لاوی تر بەهێزو پتەوو خۆراگرتر بن و ئەو بارودۆخە ببێتە هۆ بەهێز کردنی کەسایەتیان.

بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەو فاکتەرانە رۆڵی نێگەتیڤانەیان لەسەرباری دەروونی لاوی کورد هەیە و زۆربەی لاوان تووشی نامۆ بوون و گۆشەگیری دەکەن. چارەسەری ئەو گرفتانەو کەم کردنەوەی فشار لەسەر لاوان و دابین کردنی ژینگەی لەبار بۆ گەشەکردنیان، زامنی کەمکردنەوەی ئازارو ئەندێشەکانی لاوانن و دەبنە هۆی کەمکردنەوەی رێژەی ئەو لاوانەی کە تووشی نامۆ بوون و رەشبینی و گۆشەگیری بوون.

## كێن ئەوانەی كە كێشەو گرفتی دەروونیان هەیە و چۆنیش بزانن كە ئەو كێشەو گرفتەیان هەیە؟

بێگومان هەموو مرۆڤێك رووبەرووی كێشەو گرفتی دەروونی دەبێتەوەو ئەگەر بۆ جارێكیش بێت بەدەستیەوە دەناڵێنێ، بەلام گرنگ ئەوەیە كە بەردەوام نەبێت و لە ئەنجامی دووبارە بوونەوەیەوە كێشەو گرفتی خودی و خێزانی و كۆمەلایەتی بۆ نەخوڵقێنێ. ئەوەی جێگەی داخ و تێرامانە، زۆربەی ئەوانەی كە تووشی گرفت و كێشەی دەروونی و هەڵچووتی بوون، لەو بڕوایەدان كە تەنهان و كەسی تر نییە كە وەك ئەوان بێت و هیچ كەسێكیش نییە كە لە گرفت و كێشەكانیان بگەن، بێگومان دەبێت ئەو كەسانە ئەوە بزانن كە ئەو بۆچوونانەیان هەڵەیەو لە ئەوە دڵنیابن كە زۆر كەسی تر هەیە وەك ئەوان بەدەست كێشەو گرفتی دەروونیەوە دەناڵێنن و كێشەو گرفتە دەروونی و هەڵچوونیەكان زۆر باون و لەناو ژمارەیەكی زۆر لە تاكەكانی كۆمەڵدا بڵاوبوونەتەوە.

یەكێك لەو راپرس و توێژینەوانەی كە لە ساڵی ( ١٩٩٤ ) بە ئەنجام گەیەنرا، ئەوەی دەرخست كە ( ٤٨٪ ) ئەو كەسانەی كە چاوپێكەوتنیان لەگەڵ سازدرا كە ( ٨٠٩٨ )كەس بوون بەدەست كێشەو گرفتی دەروونیەوە دەناڵێنن، واتە نزیكەی نیوەی خەڵكی تووشی یەكێك لە شڵەژان و گرفتە دەروونیەكان بوون، لە گرنگترین نەخۆشی و گرفتە دەروونیەكانیش ئەمانەی لای خوارەوە بوون:-

١- خەمۆكیی قورس و توندو تیژ.
٢- خووگرتن و راهاتن (الإدمان) لەسەر خواردنەوەو خۆسەرخۆشكردن.
٣- ترسی جۆراوجۆر كە بوون بە نەخۆشی.
٤- ترسی كۆمەلایەتی نا ئاسایی.
٥- خواردن و بەركارهێنانی مادده و دەرمانی قەدەغەكراوو نا یاسایی.
٦- بێ هیوایی و رەشبینی لە ژیان ( هیلز و هیلز، ١٩٩٩، ص ٤٠ ).

کەواتە ژیانی کەس نییە کە بێ گیروگرفت و ناخۆشی بێت، بە پێچەوانەوە هەموو کەس کەم یان زۆر گیروگرفت و دەردە سەری خۆی هەیە و ژیانیش بەو گیروگرفت و کێشانەوە خۆشەو دەبن بە پاڵنەر بۆ کارکردن و بیرکردنەوەو زاڵ بوون بەسەریاندا کە لە ڕێگەیانەوە توانستەکانی مرۆڤ گەشە دەکەن. بەڵام کاتێك گیروگرفتەکانی ژیان و کێشەکانی زۆر ئاڵۆز دەبن و لە توانای مرۆڤدا نابێت بەسەریاندا زاڵ بن و هێزو گوڕو تینی لەناو دەبەن، ئەو کاتە مەترسی و هەڕەشە ڕووبەڕووی کۆئەندامی دەروونی مرۆڤ دەبێتەوەو تووشی کێشەو گرفتی دەروونی دەکات.

پێویستە ئەوەشمان لەیاد نەچێت کەجیاوازی تاکایەتی (الفروق الفردیة) هەیەو هەموومان وەك یەك ڕووبەڕووی کێشەکان نابینەوەو بەسەریاندا زاڵ نابین، بۆ نموونە هەندێك کێشە هەرەس بە چەند کەسێك دەهێنن و تووشی گرفت و کێشەی دەروونی دەکەن، بەڵام هەمان کێشە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر هەندێك کەسی تر نابێت. کەواتە جۆری کەسایەتی و بیرکردنەوەو ڕووداوەکانی سەردەمی منداڵی و هەرزەکاری شێوەی ڕووبەڕووبوونەوەکە دیاری دەکەن و بەباش یان خراپ گرتنی و هێز دەدەن بە مرۆڤ.

**گرنگترین ئەو ڕووداوو گیروگرفتانەی کە مرۆڤ تووشی گرفت و نەخۆشی دەروونی دەکەن ئەمانەی لای خوارەوەن:-**

١- هەست و سۆزی بە ئازارو ناخۆش.
٢- فشاری دەروونی زۆرو هەرەس پێ هێنەر.
٣- گیروگرفتەکانی گۆڕەپانی کارکردن و خوێندن .
٤- کارەسات و نەهامەتییەکانی ژیان .
٥- ئەو کێشەو گیروگرفتانەی کە لەئەنجامی پێکەوە نانی خێزان و هاوسەرێتییەوە دروست دەبن.
٦- کێشەو گیروگرفتەکانی ناو خێزان.
٧- خەم و پەژارە لە ئەنجامی لەدەست دانی کەسێکی خۆشەویست.

کەواتە لە ئەنجامی ئەو فاکتەرانەی سەرەوە زۆر کەس تووشی نەخۆشی و گرفتی دەروونی دەبن و پێویستیان بە یارمەتی و ڕێنمایکردنی دەروونی دەبێت، بەڵام بەداخەوە ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەی کە تووشی نەخۆشی و گرفتی دەروونی بوون، هەست بەوە ناکەن کە پێویستیان بە ڕێنمایکردنی دەروونی هەیە و پەیوەندی بە کەسانی شارەزاو پسپۆڕەوە ناکەن. بەڵام زۆر گرنگە ئەو کەسانە کە زوو فریای خۆیان بکەون و چارەسەرو ڕێنمایی دەروونی گونجاو وەربگرن، لەبەر ئەوەی چەند زوو فریای خۆیان بکەون ئەوەندە زوو چاك دەبنەوەو لەو کێشەو گرفتە دەروونیانە ڕزگاریان دەبێت.

بەڵام ئەوەی جێگای داخە کە تا ئێستا وەك پێویست بنکەو سەنتەری ڕێنمایکردنی دەروونی نیەو بێجگە لە چەند بنکەو پزیشکیکی دەروونی کە بەداخەوە بە زۆری پەنا بۆ حەب و دەرمان و سەر لە کارەبادان دەبەن، هیچ شوێنێکی تری ئەو تۆ نییە کە ئەو خاوەن گرفتانە پەنایان بۆ بەرن، چونکە زۆربەی کێشەکانی ئەوان دەروونی و کۆمەڵایەتیەو بە حەب و دەرمان و سەر لە کارەبادان چارەسەر ناکرێن و بگرە هەندێك جار ئازارەکانیشیان زیاد دەکەن، بەڵکو ئەو جۆرە کەسە خاوەن گرفتانە پێویستیان بە کەسانێك هەیە کە گوێیان لێبگرن و گرێی دڵ و دەروونی خۆیان بۆ بکەنەوەو لە ڕێگەیانەوە سەرچاوەو هۆکارەکانی ئەو کێشەو گرفتە دەروونیانە دەست نیشان بکەن و ڕێگا چارەی گونجاویان لە ڕێگەی ڕێنمایکردنی دەروونی و کۆمەڵایەتی و خێزانییەوە بۆ بدۆزێتەوە.

کەواتە خوێنەری بەڕێز ئەم پرسیارانەی خوارەوە لە خۆت بکەو ئەو کاتە لەبەر ڕۆشنایی وەڵامەکانیان بۆت دەردەکەوێت کە پێویستت بە ڕێنمایکردن و خزمەتگوزاری دەروونی و کۆمەڵایەتی هەیە یان نا؟.

١- ئایا هەڵچوون و ترس و دڵەڕاوکێکانت ئەوەندە زۆربوون کە نەهێڵن وەك پێویست کارو چالاکیەکانی ڕۆژانەت بە ئەنجام بگەیەنیت؟

٢- ئایا باری دەروونیت ئەوەندە ئاڵۆز بووە کە کێشەی بۆ خۆت و خێزانت دروست کردووەو بوونەتە هۆی تێک چوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان.

٣- ئایا ئەو هەستەت لەلا دروست بووە کە ماوەیەکە وەك جاران هەست بە خۆشی ژیان ناکەیت و کەمتر بڕوات بەخۆت هەیە و بە ئاسانی ناتوانیت کۆنترۆڵی خودی خۆت بکەیت؟

٤- ئایا گەیشتوویتە ئەو بڕوایە کە لەخۆت بێزاری و حەز دەکەیت بەهەر شێوەیەك بێت لەو بارە دەروونیە رزگارت بێت؟

٥- ئایا هیچ شتێکت دەربارەی باری دەروونی و گۆڕانی هەڵس و کەوتت بۆ خێزانەکەت یان برادەرانی خۆشەویستت باسکردووە یان ئەوان هەستیان بە هیچ گۆڕانکارییەك کردووە کە لە رەفتارو باری دەروونیت روویدا بێت؟

٦- ئایا تۆ خۆت وا دەبینی کە بێدەسەڵاتیت و توانای چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان و کۆنترڵ کردنیانت نییە و ناتوانیت گۆڕانکاری لە ژیان و بیرکردنەوەتا بکەیت؟

٧- ئایا بەرهەم و رێژەی چالاکیەکانت کەم بۆتەوەو هەست دەکەیت کە وەك جاران گوڕوتینت بۆ کارکردن و بەرهەم هێنان نەماوە؟

ئەگەر زۆربەی وەڵامی ئەو پرسیارانەی سەرەوە بە (بەڵێ) بوو ئەوە مانای ئەوەیە کە تۆ کێشەو گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتیت هەیە و پێویستت بە رێنمایکردنی دەروونی و کۆمەڵایەتی هەیە و نابێت پشت گوێی بخەیت، بۆ ئەوەی کێشەو گرفتەکان زیاتر ئاڵۆز نەبن و نەبنە هۆی تێک چوونی باری دەروونیت.

## سەرچاوەی گرێ دەروونییەکانمان

مرۆڤ بوونەوەرێکی ئاڵۆزو نەناسراوەو تاوەکوو ئەمڕۆش زانست وەك پێویست پەی بە گرێ و گۆڵ و هەورازو نشێوەکانی نەبردوەو زۆر لایەنی هەر بە نهێنی ماونەتەوە.

یەکێك لە گرنگترین و شاراوەترین لایەن، باری دەروونی مرۆڤە، ڕاستە زۆر قوتابخانەو ڕێبازو لێکدانەوەی دەروونی هەوڵی زانینی نهێنییەکانی مرۆڤیان داوە، بەڵام تاوەکو ئێستا نەیان توانیوە وەك پێویست باری دەروونی مرۆڤ شەن و کەو بکەن.

لەلایەکی تریشەوە زۆر زەحمەتە بتوانرێت لە ڕێگەی قوتابخانەو تیورە بیانیەکانەوە باری دەروونی و گرێ کوێرەکانی کۆمەڵگاکەمان لێك بدرێنەوەو پەی بە نهێنیەکانیان ببەین. ڕاستە ئێمە مرۆڤین و کەم یان زۆر دەرئەنجام و لێکدانەوە دەروونیەکان و تیوەرەکان دەمان گرتەوەو تاڕادەیەك تیشك دەخەنە سەر باری دەروونیمان. بەڵام لەبەر ئەوەی سەرچاوەو کەلتورو بنەماکانی ئەو تیۆرو قوتابخانانە تاڕادەیەك جیاوازن لە سەرچاوەو کەلتورو ژینگەی کۆمەلایەتی و ئابووری ئێمە، بۆیە دەبێت لە ڕێگەی توێژینەوەو تیۆری خۆمانەوە پەی بە هەندێك لە گرێ کوێرەکانمان ببەین.

مرۆڤی کورد، وەك هەموو مرۆڤێکی تر کۆمەڵێك پێداویستی فسیولۆژی و کۆمەلایەتی و دەروونی هەیە و دەبێت تێربکرێن. بەڵام بەداخەوە ژینگەی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری و دەروونی مرۆڤی کورد تا ڕادەیەکی زۆر بەربەست و ڕێگربوون لەبەردەم تێرکردنی ئەو پێداویستیانە، چونکە زۆربەی کات مرۆڤی کورد لەژێر چەپۆك و کەلبەی دوژمنان ناڵاندویەتی و هیچ کات مامەڵەی مرۆڤانەیان لەتەکدا نەکردووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە چی لەتوانایدا بووبێت کردوویانەو بەردەوام کۆسپ و تەگەرەیان لەبەردەم تێرکردنی حەزوو ئارەزوو پێداویستیە سەرەکیەکانی مرۆڤی کوردا داناوە.

گومانیشی تێدانییە مرۆڤ کوڕو کچی ئەو ژینگەیەیە کە تیایدا دەژی، ئینجا لەبەر ئەوەی ژینگەی کوڕو کچی کورد (وەك زۆربەی ژینگەکانی تری وەکو ئێمە) پڕ بووە لە بێبەش بوون و رق و کینەو سوکایەتی پێکردن، بۆیە زۆربەی زۆرمان لەناخماندا رق و کینەو گیانی تۆڵە سەندنەوەو سوکایەتی پێکردن و کۆمەڵێك گرێی دەروونی تر هەیەو لە کاتی بە ئاگایی و بێ ئاگایدا، بەشێوەیەکی ئەستی بێت یان هەستی لە رەفتارو هەڵسوکەوت و بیرکردنەوەماندا رەنگ دەدەنەوەو لە میانەیانەوە خۆمان و کەسانی چوار دەورمان تووشی کۆمەڵێك گرفت و کێشەی دەروونی و کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسی دەکەین.

هەر کاریگەری ئەو کۆمەڵە گرفت و گرێ دەروونیانەیە کە بەردەوام یەکتری ئازار دەدەین و چاڵ بۆ یەکتر هەڵدەکەنین و زۆربەی جار لە بۆسەداین و بەدوای هەلو خاڵە لاوازەکانی بەرانبەرماندا دەگەڕێین، هەر ئەوەندە کەم و کورتیەکی بچوکمان لێبینی لێی دەکەین بە هەلاو تەپلی بۆ لێدەدەین و دەنکە نۆکێکی لێدەکەین بە کفتەیەك، بەم شێوەیەش هەست بە پشوو خۆشیەکی دەروونی دەکەین و بۆ ماوەیەك کەمێك لە گرو تینی ئەو گرێ دەروونیانە کەم دەبێتەوە، واتە ئەو سوکایەتی پێکردن و کەم کردنەوە لە نرخی کەسانی ترو تەپڵ بۆ لێدانیان سادییەتی کەسایەتیمان هێور دەکاتەوەو ئەو کەسانە دەبن بە قۆچی قوربانی.

بەلام نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت کە ئێمەش جارەها و چەندەها جار بووین بە قۆچی قوربانی ژێر دەستی کەسانی تر، ئینجا لەبەر ئەوەی بەردەوام بارودۆخ لە گۆڕان و شلەقان و قلیشانەوەدایە، بۆیە ڕۆڵ و پلەو پایەکان دەگۆڕدرێن و هەر جارەی دەستەو تاقم و کەس و لایەنێك دەبێت بە کەلەگاو لە ئەنجامی چەوساندنەوەو سووکایەتی پێکردنی بەرانبەرەکەی کەمێك لە حەزوو ئارەزووە سادییەکان تێردەبن. دوای ئەوەی کەبارو دۆخەکە دەگۆڕێ ئیتر قوربانیەکان کاژی کۆنیان فڕێ دەدەن و دەبن بە کەلەگاو

دەست دەکەن بە چەوساندنەوەی کەلەگاکانی دوێنێ. ئەمە دووبارە دەبێتەوەو دەبێت بە خاسیەت و مۆرکێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاکەمان.

ئینجا گرفتەکە لێرەدا کۆتایی نایەت بەڵکو لەو ئاستە بەرزە دادەبەزێتە خوارەوەو لە بچوکترین چالاکیە کۆمەڵایەتی و ئابووری و پەروەردەییەکاندا رەنگ دەداتەوە. بۆ نموونە بەڕێوەبەرێك تام و چێژ لە سوکایەتی پێکردن و مل شکاندنی فەرمانبەرەکانی و فەرمانبەر تام و چێژ لەدوا خستنی کاری هاوڵاتیان و ئازار دانیان و هاووڵاتیان تام و چێژ لە سوکایەتی پێکردنی خێزان و خێزان تام وچێژ لە سوکایەتی پێکردنی منداڵەکان و منداڵەکانیش تام چێژ لە لێدان و سوکایەتی پێکردنی یەکتری وەردەگرن واتە کێ بەهێز و توانا بێت یان هەل و بواری بۆ بڕەخسێ ئەوا بەشێوەیەکی راستەوخۆ دەکەوێتە گیانی بەرانبەرەکەی.

ئەمەش مانای ئەوە نییە کە مرۆڤی کورد ئەخۆش و شەڕ خوازەو مرۆڤی وڵاتانی تر ساغ و سەلامەت و ئاشتی خوازن، نەخێر سروشتی مرۆڤی کورد وەك سروشتی هەموو مرۆڤەکانی ئەم گەردوونە پان و بەرینە بێ لایەنەو تۆوی خێرو شەڕ لەناخیاندا حەشار دراوەو کەسانی ئەخۆش و خاوەن گرفتی دەروونی و شەڕخوازو تۆڵە سێن لەناو عەرەب و فارس و تورك و نەتەوەکانی تریشدا هەن. بەڵام لەوانەیە رێژەکەی لەلای ئێمە زیاتر بێت، لەبەر ئەوەی مرۆڤی کورد زیاتر لە مرۆڤی هەندێك نەتەوەی تر چەوسێندراوەتەوەو بەربەست و رێگر لەبەردەم تێرکردنی پێداویستیەکانی دانراوەو بەشێوەیەکی زانستی و بەرنامە بۆ دارێژراو هەوڵی سڕینەوەی ناسنامەو بوونی دراوەو هەردەم کراون بە گژ یەکتریداو تۆوی ناوچەگەری و هۆزایەتی لەناخیاندا چێندراوە.

ئینجا ئەگەر بمانەوێ پاشەرۆژی نەوەکانی داهاتوومان روون و ئاشکرا بێت و تاکەکانی کۆمەڵەکەمان لە گرفت و کێشەو گرێی دەروونی بەدوور بن ئەوا زۆر پێویستە گرنگی تەواو بە پەروەردەکردنی منداڵەکانمان بدەین و پێداویستیە سەرەکیەکانی ژیانیان بۆ دابین بکەین، لەلایەکی تریشەوە دەبێت کەش و هەوای گونجاو بۆ

پراکتیزەکردنی یاسا دابین بکرێت، بۆ ئەوەی یاسا سەروەربێت و رێگە بە کەسانی خاوەن گرفت و گرێی دەروونی نەدرێت کە بە ئارەزووی خۆیان یاری بە چارەنووس و بەرژەوەندی کەسانی تر بکەن، لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە کەسانە دەبێت لە رێگەی یاساوە لغاوی حەزوو ئارەزووە سادییەکانیان بکرێت و هەوڵی چارەسەرکردنی گرفت و گرێ دەروونیەکانیان بدرێت.

## پێکهێنەرەکانی دەروونی بێگەرد

زۆر زۆر کەمن ئەوانەی کە تاوەکو ئێستا دەروونیان گەردی رۆژگاری نەگرتووەو گۆڕانکارییەکانی ئەم جیهانە ماددی و ئاڵۆزە تووشی ترس و دڵەڕاوکێ و رق و کینەو گیانی تۆڵە سەندنەوەی نەکردوون. ئەوەی جێگەی داخە زۆربەی زۆرمان هەر لە سپێدەی بەیانییەوە هەتاوەکو درەنگانێکی شەو هەر هەڵپەی نان پەیدا کردن و کۆکردنەوەی ماڵی دونیاین و شەوەکەش بە ئارامی و دوور لە کابووس نابەینە سەر، بەڵکو تا ماوەیەکی زۆر هەر لەناو جێگاو پێخەفەکەماندا تەپ و تل و ئەم دیوو ئەو دیو دەکەین و بیر لە داهاتوو گۆڕانکارییە تەم و مژاوییەکانی یان بیر لە ئازارو حەزوو ئارەزووە تێرنەکراوەکانی رابردوو دەکەینەوە، کە بەو جۆرە بیر کردنەوەش ژیانی ئێستای خۆمان دەکەین بە قوربانی داهاتوو یان رابردوو.

گەورەترین کێشەو قەیرانی ئەمڕۆی مرۆڤ لەبیر کردنی ئێستایە و بەردەوام لە هەڵپەی داهاتووە، بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێ کە ژیان و رۆژگارە خۆشەکانی بەرەو کەمی دەڕۆن و کاتێک بەخۆی دەزانێ پیری و نەخۆشی و کۆمەڵێک گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی برا بەشی هەموو ئەو سەرمایە و خەوو خەیاڵانەیەتی کە ژیان و لاوێتی و خۆشیەکانی خۆی لە پێناویاندا کرد بە قوربانی، ئەو کاتەش ئەبواری پەشیمان بوونەوەو نە بواری دووبارە ژیانی لاوێتیەو وەك کوردەکە لە هەردوو بەهار دەبێت.

لێرەدا پرسیارێك خۆی دەسەپێنێ و ناچارمان دەکات گوێی بۆ شل کەین، ئەویش ئەوەیە، ئەو فاکتەرانە چین کەوایان لە مرۆڤی ئەم سەردەمە کردووە بەو جۆرە ببێت بە کۆیلەو دیلی داهاتوو، گیان و دەروونی ئەو هەموو گەردە بگرن و بەردەوام لەبارێکی دەروونی ئاڵۆزدا بژی و هەست بە دروستی دەروونی و خۆشیەکانی ژیان نەکات و سەرەڕای ئەوەش تووشی کۆمەڵێك گرفتی دەروونی ببێت؟

## بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە پێویستە ئاماژە بۆ ئەم فاکتەرانە بکەین کە دەبنە هۆی ئاڵۆزکردنی دەروونی مرۆڤ و تۆزو گەرد لێنیشتنی:-

### گیانی تۆڵە سەندنەوەو رق وکینەی خەفەکراو:-

کەسانێك هەن ( هەرچەندە زۆر کەمن ) کە گیانی لێبوردن لەلایان زاڵترە بەسەر گیانی تۆڵە سەندنەوەو لە توانایاندا هەیە کە چاوپۆشی لە هەندێك لە هەڵەو سەرەڕۆییەکانی کەسانی تر بکەن، بەڵام زۆربەمان ئەو گیانی لێبووردنە لە لامان لاوازەو ئەگەر خەڵکی خراپە بەرانبەرمان بکەن و کەمێکیش ئازارمان بدەن، ئەوا تا تۆڵەی خۆمانی لێدەکەینەوەو ئێمەش ئازاری دەدەین، لە خەم و خەفەت و رق و کینەو پلان داناندا دەژین و باری دەروونی خۆمان ئاڵۆز دەکەین، دووریش نییە کە دوای ئەوەی تۆڵەی لێدەکەینەوە هەر دڵخۆش و کامەران نەبین لەبەر ئەوەی لەتۆڵە سەندنەوە دەترسین و لەوانەیە کەسانی بەرانبەر ئەوانیش وەك ئێمە بیانەوێت تۆڵەی خۆیانمان لێبکەنەوە.

کەواتە کاتێکی زۆری ژیانمان بە خەم و خەفەت و ترس و رق و کینەوە بەسەر دەبەین و هەست بە خۆشی ژیان و کاتە بە نرخەکانی ناکەین. بەڵام ئەگەر لەجیاتی ئەو تۆڵە سەندنەوەیە بیرمان لە لێبووردنی بەرانبەرو پشت گوێ خستنی بکردایە. ئەوا ئەو هەموو ترس و خەم و خەفەت و رق و کینەمان تووش نەدەبوو، سەرەڕای ئەوەش ئەو ماوە زۆرەمان بە کارو چالاکییەکی بە سوودەوە بەسەر دەبردو لەبارێکی دەروونی خۆشیشدا دەژیان. کەواتە گیانی لێبووردن و بەخشینی کەسانی ترو پشت گوێ خستنی هەڵەکانیان تواناو بەهرەیەکە کە تەنها مرۆڤە گەورەو خاوەن ئەزموونەکان هەیانەو دەزانن چۆن بۆ خۆشی و کامەرانی خۆیان و سازێژ کردنی برینە کۆمەڵایەتییەکان بەکاری بهێنن. ئینجا ئەگەر ئێمەش بمانەوێت دڵ و دەروونمان بە بێگەردی بپارێزین و تام و چێژ لەکاتەکانی ژیانمان وەربگرین، ئەوا دەبێت خۆمان لەسەر گیانی لێبووردن و پشت گوێ خستنی هەندێك هەڵەو کەمتەرخەمی کەسانی چواردەورمان رابهێنین.

## وێڵ بوون بەدوای حەزوو ئارەزووەکان و پشت گوێ خستنی لۆژیکی عەقڵ:-

جیاوازی نێوان مرۆڤی سەربەست و مرۆڤی کۆیلە ئەوەیە کە مرۆڤی سەربەست و کامڵ گوێ لە لۆژیکی عەقڵ دەگرێت و کۆنترۆڵ و لغاوی زۆر لە حەزووئارەزوو ڕەمەکەکانی دەکات و بەباشی دیاردەکانی ژیان تاوو توێ دەکات و بڕیاری پێش وەختە نادات و لەسەر بنەمای زانستی و واقیعی بابەت و کێشەکان یەکلا دەکاتەوە، بەڵام مرۆڤی کۆیلە و نە بەکام و پێنەگەیشتو دوای مۆتەکەی حەزوو ئارەزوو ڕەمەکەکان دەکەوێت و پشت بە ڕاوبۆچوونی پێشینە دەبەستێت و بێلایەنی خۆی لە دەست دەدات و دەمارگیر دەبێت بۆ ئەو شتانەی خۆی دەیەوێ، بێگومان ئەو جۆرە بیرکردنەوەو لێکدانەوە هەڵانە خاوەنەکەی تووشی گرژی و ناڕەحەتی دەروونی دەکات.

## خووگرتن و سەرقاڵ بوون بە بەها مادیەکان و پشت گوێخستنی بەها گیانی و روحیەکان:-

یەکێکی ترە لەو فاکتەرانەی کە مرۆڤی ئەمرۆی تووشی دڵەڕاوکێ و ترس و خەم و خەفەت کردووە، هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بە ملیارەها پارەیان هەیە بەڵام لەناوەوە ئاسوودەو کامەران نین و بەردەوام خەریکی هەژماردن و زیادکردن و پاراستنی ئەو سەرمایە لەبن ئەهاتوەیانن و خەووخەیاڵ و کارو چالاکیەکان هەر لەچوار دەوری ئەو بەها مادییانەدا دەخولێنەوەو بەردەوام هەست بە بۆشایی دەروونی و گیانی دەکەن و حەسوودی بە کرێکار و شوانێکی ئاسوودە دەخوازن. باب باپیرو نەوەکانی پێش ئێمە زۆر لە ئێمە ئاسوودە تر بوون، لەبەر ئەوەی خاوەنی زۆر بەهای گیانی و روحی بوون و هاوسەنگی دەروونی بۆ ڕاگرتبوون و زۆر کەمتر لە مرۆڤی ئەمرۆ هەڵپەی پارە کۆکردنەوەو دەست کەوتنی بەها مادیەکانیان کردبوو.

## لەجیاتی پێکەوە ژیان و هاوکاری چاودێری یەکتری دەکەین:-

شارستانیەت چەند ئالۆزو پڕ گرفت بێت، ئەوەندە گیانی هاوکاری و دۆستایەتی کەمتر دەبێتەوەو ململانێ و کێ بڕکێ جێگایان دەگرێتەوە. بەداخەوە پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ وەك جاران نەماوەو گوڕو تینی رابردووی لەدەست داوەو لە جیاتی ئەوەی هاوکاری یەکتر بکەین و سارێژی برینەکان بکەین، زاڵ بوونی بەها ماددیەکان بوونەتە هۆی ئەوەی کە چاودێری یەکتری بکەین و هەندێك جاریش بکەوینە بۆسە دانان. گومانیشی تێدا نییە ئەو ململانێ و کێ بڕکێیە دەبنە هۆی وروژاندنی رەمەك و حەزوو ئارەزووە ناژەلیەکانی ئاخی مرۆڤایەتی و سەوز بوونی تۆوی شەڕو گومان و دوو دڵی.

بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونەش دەتوانین لاوازی پەیوەندییە کۆمەلایەتی و گیانیەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ بە گشتی و خزم و کەس و خووشك و براو دایك و باوك بەتایبەتی وەك نموونە بهێننەوە. هەمووومان چاك دەزانین ئەو خۆشەویستیەی کە جاران لە نێوان خزم و کەس و تاکەکانی تری کۆمەڵدا هەبوو ئێستا زۆر کەم بۆتەوەو لە جیاتی ئەوە ململانێ و کێ بڕکێ و چاودێری کردنی یەکتری سەری هەڵداوە. گومانیشی تێدا نییە کەش و هەوای ململانێ و کێ بڕکێ و چاودێری کردنی یەکتری دەبنە هۆی شێواندن و گەرد گرتنی دەروونی مرۆڤ و ئالۆزکردنی، بەلام خۆشەویستی و هاوکاری کردن دەبنە هۆی لەدایك بوونی ئاسایشی دەروونی و دڵنیایی و ئاسوودەیی.

ئینجا بۆ ئەوەی گەردوو پیسیەکانی چواردەوری دەروونمان لا ببەین و پشوویەکی دەروونی بدەین، ئەوا دەبێت لە جیاتی تۆوی رق و کینە تۆوی سۆزو خۆشەویستی بچێنین و لایەك لەبەها روحی و گیانیەکان بکەینەوەو ماوەیەك بۆ رابواردن و گەشت و گوزارو سەردانی ئازیزو دۆستان تەرخان بکەین و گیانی لێبووردنمان هەبێت و بەدوای تۆڵە سەندنەوەدا نەگەڕێین و بە پێوەری لۆژیکی عەقڵ دیاردەکانی ژیان تاوو توێ بکەین و بگەڕێینەوە بۆ باوەشی سروشت و ژیان لەوە ئالۆزتر نەکەین.

## سەرچاوەی هەرەس و یاخی بوون

هەرزەکارو لاوان بە ئاسانی و بێ گیروگرفت خۆیان لەگەڵ کۆمەڵەکەیان ناسازێنن، بەڵکو تووشی کۆمەڵێک گرفت و بگرەو بەردە دەبن و لە ئەنجامیانەوە هاوسەنگی خۆیان لەدەست دەدەن و دوور نییە هەندێکیان لە ڕێچکەی ئاسایش لابدەن و ملی ڕێگای لادان و سەرەڕۆیی بگرنەبەر. هەرزەکار دەیەوێت لەناو کۆمەڵەکەیدا پێگەو پلەو پایەی خۆی هەبێت، دەیەوێت شوێن پەنجەی دیار بێت، هەرزەکارو لاوان بە پاشکۆیی و پەراوێزی رازی نابن، بەڵام بەداخەوە کۆمەڵگاکەمان ناتوانێت ناوەوەی هەرزەکار و لاوان بخوێنێتەوەو پەی بە نهێنییەکانیان ببات، بۆیە بەهەڵە مامەڵەیان لەگەڵ دەکات و ژینگەو بارودۆخی پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی و دەروونی پێویست و گونجاویان بۆ ناخوڵقێنێت.

هەرزەکارو لاوان چاویان بڕیوەتە ئاسۆو پەرۆشی پاشەرۆژن، بەڵام بەداخەوە ئاسۆو پاشەرۆژ لەلایان روون و ئاشکرانییە، تەم و مژاوی پاشە ڕۆژ باری دەروونی هەرزەکار ئاڵۆز دەکات و دەیخاتە ناو گێژاوی بیرکردنەوەو دڵە راوکێ ی بەردەوام. هەرزەکار دەیەوێت خۆشەویست بێت و ڕێزی بگیرێ و هەست بە ئاسایش و دڵنیایی بکات، بەڵام بەداخەوە نە خێزان و نە قوتابخانەو نە کۆمەڵ ناتوانێت ئەو پێداویستیانەی بۆ دابین بکات .

ئێمە ئەگەر بمانەوێت هەرزەکار باری دەروونی دروست و ئاسایی خۆی هەبێت ئەوا دەبێت کەسانی چواردەوریشی پێش هەرزەکار هەست بە خۆشەویستی و ڕێزگرتن و دڵنیایی بکەن، واتە دەبێت دایک و باوک و مامۆستاو کەسانی چواردەوری هەرزەکار خاوەنی کەسایەتی و بوونی خۆیان بن، بەڵام بەداخەوە لە کۆمەڵگاکەمان ئەک هەرزەکارو لاو بەڵکو دایک و باوک و مامۆستاو کەسانی چواردەوریشی هەست بە دڵنیایی و بوونی خۆیان ناکەن کەواتە ئێمە ناهەقیەکی گەورە دەکەین کاتێک بەتەنها داوای مافی هەرزەکارو لاوان دەکەین لەکاتێکدا ئەو کەسانەی کە لێیان داوا دەکەین خۆیان لێی بێبەشن. کە

ئەمەش بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ واقیع و مەنتیق یەك ناگرنەوە، لەبەر ئەوەی ئەگەر یەكێك ڕێزی ئەگیرێ ئەوا بەهیچ شێوەیەك ڕێزی كەسانی تر ناگرێ، دایك و باوكێك لە حاڵەتی ترس و دڵەڕاوكێدا بژین، بە هیچ شێوەیەك ناتوانن ئاسایش و دڵنیایی بۆ منداڵەكانیان دابین بكەن، مامۆستایەك لە سۆزو خۆشەویستی بێبەش بێت، بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت سۆزو خۆشەویستی بۆ قوتابیەكانی دابین بكات، كۆمەڵێك بێ ئاسنامەو پاشەڕۆژ بێت، ناتوانێت ئاسنامەو پاشەڕۆژ بۆ ڕۆڵەكانی مسۆگەر بكات، كەواتە ئەگەر بمانەوێت بەشێوەیەكی زانستیانە كێشەو گرفتەكانی هەرزەكارو لاوان دیاری بكەین و پەی بەسەرچاوەو فاكتەرەكانی ببەین، ئەوا دەبێت لە هەموو لایەكەوە سەیریان بكەین و سەرجەم فاكتەرو هۆكارەكان لەبەر چاو بگرین، نەك وەك ئێستا لە گۆشەنیگایەكی تەسكەوە بڕوانینە فاكتەرو سەرچاوەی گرفتەكان.

هەموومان دەزانین كە زۆر خێزان (دایك و باوك) گیروگرفت بۆ هەرزەكارو لاوەكانیان دروست دەكەن، بەهەمان شێوەش زۆر مامۆستا سوكایەتی بە قوتابی دەكات. باشە تەنها سەركۆنە كردن و هێرش كردنە سەر ئەو دایك و باوك و مامۆستایانەو تاوانبار كردنیان چارەسەری گیروگرفتی ئەو هەرزەكارو لاوانە دەكەن، بێگومان نەخێر بەڵكو ئەگەر بمانەوێت چارەسەرێكی ڕاستەقینەی هەتا هەتایی كێشەكانی هەرزەكاو لاوان بكەین، ئەوا دەبێت بە دوای ئەو فاكتەرانەدا بگەڕێین، كەوایان لەو دایك و باوك و مامۆستایانە كردووە كە بەو شێوەیە ڕەفتار بكەن، چونكە هیچ ڕەفتارو هەڵس و كەوتێك لەبۆشایی و لەخۆیەوە سەر هەڵنادەن بەڵكو هۆكاری تایبەتی خۆیان هەیە، ئینجا ئەگەر توانیمان ئەو فاكتەرانە دیاری بكەین و گیرو گرفتی ئەو دایك و باوك و مامۆستایانە چارەسەر بكەین، ئەوكاتە چارەسەركردنی گیروگرفتی هەرزەكارو لاوەكانیش زۆر ئاسان دەبێتا.

ئەمە مانای ئەوە نییە كە ئێمە پشت لە گیروگرفتی هەرزەكارو لاوان بكەین و بە گیروگرفت و كێشەكانی گەورەكانەوە لغاویان بكەین، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە زۆر جار گیرو گرفتی گەورەكان دەبن بە سەرچاوەو فاكتەر بۆ خوڵقاندنی گیروگرفت بۆ هەرزەكارو لاوان بەبێ ئەوەی گەورەكان مەبەستیان بێت.

ئەگەر بمانەوێت کێشەو گرفتەکانی هەرزەکارو لاوان چارەسەر بکەین، ئەوا دەبێت پێش هەموو شتێك چارەسەری گێروگرفت و کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان بکرێت، چونکە تاوەکو دایك و باوك و مامۆستای کورد لە کۆت و بەندی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی دواکەوتوو رزگاریان نەبێت و چارەسەری بێکاری و هەژاری و بێناسنامەیی و نەخوێندەواری نەکرێت، ئەوا بە هیچ شێوەیەك چارەسەری گشت کێشەکان بە گشتی و کێشەی هەرزەکارو لاوان بەتایبەتی ناکرێت.

بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە دەست لە ئەژنۆ دابنیشین و چاوەڕوانی ئەو رۆژە بکەین تا هەموو کێشە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان چارەسەر دەکرێن، بەڵکو دەکرێت تا ئەو کاتە هەوڵ و کۆشش بەردەوام بێت و بە پێی توانا چارەسەری گرفت و کێشەکان بکرێن، بەڵام نابێت چارەسەری بنەڕەتیمان لەبیر بچێت و لە گۆشەنیگایەکی تەسکەوە سەیری سەرچاوەی گێروگرفتەکانی هەرزەکارو لاوان بکەین و هەموو بەرپرسیاریەتی بخەینە ئەستۆی خێزان و کۆمەڵ بەبێ ئەوەی ئەوەمان لەبیربێت کە خێزان و کۆمەڵیش بوون بە قۆچی قوربانی و ئەوانیش گیرۆدەی سەرچاوەو فاکتەری ترن و هیچ دەسەڵات و توانایەکیان نییە.

هەرزەکارو لاوان لە هەموو توێژو چینەکانی تر هەستیارترن و زۆر نموونەییانە سەیری دیاردەکانی ژیان دەکەن، هەر لەبەر ئەوەشە لە هەموو کەس زیاتر ئامادەباشی قوربانی و خۆبەخت کردنیان هەیەو بەدوای چارەسەری گێروگرفتەکانی کۆمەڵدا وێڵن. بەڵگەش لەم بارەیەوە زۆرە، بۆ نموونە ڕاپەڕین و خۆپیشاندان و مانگرتن و یاخی بوونی هەرزەکارو لاوان بەڵگەن بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونانەی سەرەوە.

واتە کەم و کورتی لەو خێزان و کۆمەڵەی کە تیایدا دەژین هەیە ئەگەر وانییە ئەی بۆچی هەرزەکارو لاوان پەنا بۆ ئەو شێوازانە دەبەن؟ چونکە کاتێك هەموو دەروازەکانی گفت و گۆکردن و رادەبڕین لەبەردەم هەرزەکارو لاوان دادەخرێت، هەرزەکارو لاوان

بەناچاری پەنا بۆ ئەو شێوازانە دەبەن و دەیانەوێت لەڕێگەیانەوە کۆمەڵ و دام و دەزگاکان بگۆڕن و مافە زەوت کراوەکانیان وەربگرنەوە. هەرچەندە ئەو هەڵس و کەوتانە بەرپەرچدانەوەن بۆ ئەو بارودۆخەی کە تیایدا دەژین، بەلام بەداخەوە مەبەستەکانیان ناپێکن، لەبەر ئەوەی لاوان و هەرزەکاران بەشێوەیەکی گشتی هەڵچوون و عاتیفە لەلایان زاڵە و کەم کورتی لەبیرکردنەوەی مەنتیقانەیان هەیەو بەشێوەیەکی زانستیانە دیاردەکانی ژیان هەڵناسەنگێنن بۆیە لە زۆر چالاکی و هەوڵدانیاندا مایە پووچ دەبن و دوور نییە بەرەو سەرەڕۆیی و لادانیان بەرن، ئەوەش زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هێشتا بەتەواوی توانستە عەقلیەکانیان گەشەیان نەکردووەو ئەزموون و شارەزاییان لە ژیان کەمە.

ئینجا بۆ ئەوەی کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی سوود لەو هەموو ووزەو بەهرەو توانایانەی هەرزەکارو لاوان وەربگرن، پێویستە بواری کارکردن و بەشداربوونیان بۆ بخوڵقێنن و گوێ لە ڕاو بۆچوونەکانیان بگرن و مافی بڕیاردان و دیاریکردنی چارەنووس و چارەسەرکردنی ئەو کێشانەیان هەبێت کە پەیوەندییان بە پاشەڕۆژیانەوە هەیە. بۆ ئەوەی لە ڕێگەیانەوە هەرزەکارو لاوان هەست بە بوونی خۆیان بکەن و لەترس و گومان بڕوابەخۆنەبوون و نائومێدی ڕزگاریان بێت.

## ســــەرچاوەكان

١- القرآن الكريم
٢-اسماعيل، محمد عمادالدين وآخرون(١٩٧٤). كيف نربي اطفالنا (التنشئة الأجتماعية للطفل في الأسرة العربية). القاهرة، دار النهضة العربية، ط٢،.
٣- الأعرجي، جلال علي هاشم (١٩٨٩). السرقة عند الأحداث. رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد، كلية الأداب.
٤ -أغا، كاظم ولي (١٩٨١). علم النفس الفسيولوجي. دار الآفاق الجديدة، بيروت،.
٥-ابراهيم، ريكان (١٩٨٩). مقدمة في الباراسايكولوجي، بغداد، ط٢.
٦- الألوسي، جمال و أميمة علي خان (١٩٨٣). علم نفس الطفولة و المراهقة، بغداد، جامعة بغداد.
٧ -ابو الحب، ضياء الدين (١٩٧٨). المسرحية التمثيلية النفسية لاجراء تغيرات في السلوك. في مجلة (الام و الطفل) العدد (٣٧٥).

٨- باولبي، جون (١٩٦٥). رعاية الطفل و نمو المحبة. ترجمة عبدالعزيز ابو النور و الدكتور حامد عمار. مؤسسة سجل العرب، القاهرة.

٩- باميلامنت (١٩٨٩). رعاية الطفولة و تطورها. ترجمة شاكر نصيف لطيف. جامعة بغداد/ بيت الحكمة. دار الكتب للطباعة و النشر، جامعة الموصل.
١٠- باقر، صباح وآخرون (١٩٧٦). المشكلات الأرشادية. مطبعة دار السلام، بغداد،.
١١- تريفرز(١٩٧٩). علم النفس التربوي . ترجمة د. موفق الحمداني و د.حمد ولي الكربولي. مطبعة جامعة بغداد،.
١٢- جابر، عبدالحميد جابر(١٩٧٧)، علم النفس التربوي، دار النهضة العربية، القاهرة،.
١٣- جلال، سعد (١٩٨٥)، المرجع في علم النفس، مكتبة المعارف الحديثة، اسكندرية، المصر،.
١٤- جلال، سعد (١٩٧٠). في الصحة العقلية- الأمراض النفسية و العقلية و الأنحرافات السلوكية-. مطبعة المصري، الاسكندرية،.

١٥- جعفر، نوري (١٩٧٧). الفكر، طبيعته وتطوره. مكتبة التحرير، بغداد،.
١٦- جيلفورد، ج.ب (١٩٥٦). ميادين علم النفس. ترجمة الدكتور أحمد زكي صالح وأخرون دار المعارف بمصر، ، المجلد الثاني.
١٧- الحفني، عبدالمنعم (١٩٧٨)، موسوعة علم النفس والتحليل النفسي، مكتبة مدبولي.
١٨-الحمداني، موفق (١٩٨٩)، الطفولة، جامعة بغداد، سلسلة بيت الحكمة (٢)،.
١٩-الحمداني، موفق (١٩٨٢). اللغة وعلم النفس. جامعة الموصل.

٢٠- حجازي، مصطفى (١٩٨١). الأحداث الجانحون. دار الطليعة، بيروت، ط٢،.

٢١- حسن، محمد علي (١٩٧٠). علاقة الوالدين بالطفل وأثرها في جنوح الأحداث. القاهرة، مكتبة الأنجلو المصرية، ط١.
٢٢- حسين، جميلة رمضان( ١٩٩٤). أثر التنشئة الأجتماعية في السلوك الاجرامي. رسالة ماجستير غير منشورة. جامعة صلاح الدين، أربيل.
٢٣- خليل، حلمي (١٩٨٦). اللغة والطفل. دار النهضة العربية، بيروت.
٢٤- دافيدوف لندا(١٩٨٣)، مدخل علم النفس، ترجمة الدكتور سيد الطواب واخرون، دار ماكجر وهيل، القاهرة.

٢٥- الدباغ، فخري (١٩٧٥). جنوح الأحداث. جامعة الموصل، ط١.
٢٦- دبابنة، ميشيل ونبيل محظوظ (١٩٨٤). سيكولوجية الطفولة. دار المستقبل للنشر والتوزيع، عمان/ الأردن.
٢٧- همام، طلعت(١٩٨٤)، سين وجيم عن علم النفس التطوري، مؤسسة الرسالة، دار عمار، عمان، الاردن، ط١.
٢٨- الهاشمي، عبدالمجيد محمد(١٩٨٦)، اصول علم النفس العام، دار الشروق، جدة، السعودية، ط٢.
٢٩- راجح، أحمد عزت(١٩٨٥). أصول علم النفس. دار المعارف/ القاهرة.
٣٠- رمزي، أسحق(١٩٨١). علم النفس الفردي. دار المعارف، القاهرة، ط٣.
٣١- زيدان، محمد مصطفى (١٩٩٤). النمو النفسي للطفل و المراهق و تظريات الشخصية. دار الشروق، جدة، ط٤.

٣٢- الزغل، علي و عاطف عضيبان (١٩٩٠). الشباب و الاغتراب (دراسة ميدانية). في مجلة (مؤتة للبحوث و الدراسات). المجلد الخاص، العدد الثاني، الاردن.
٣٣- الزيادي، عبدالمنعم (١٩٥٨). انت و المراهقة. سلسلة سيكولوجية (٤). الشركة العربية للطباعة و النشر، القاهرة.

٣٤- زهران، حامد عبدالسلام (١٩٧٧). علم النفس النمو (الطفولة والمراهقة). بيروت، دار العودة، ط٥.
٣٥- الزوبعي، عبدالجليل ابراهيم واخرون (١٩٨٩)، علم نفس الطفل، وزارة التربية، مطبعة الميناء، بغداد.
٣٦- زيعور، علي (١٩٧٧). مذاهب علم النفس. دار الأندلس، بيروت.
٣٧- سبوك(دكتور )(١٩٩٠). موسوعة العناية بالطفل. ترجمة عدنان كيالي وأيلي لاوند، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، لبنان.
٣٨- سعفان، حسن شحاتة (١٩٦٦). علم الجريمة. القاهرة، مكتبة النهضة المصرية.
٣٩- السيد، فؤاد البهي (١٩٧٤). اسس النفسية للنمو مصر.
٤٠- الشيخ، يوسف محمود و د. عبدالسلام عبدالغفار (١٩٦٦). سايكولوجية الطفل غير العادي و التربية الخاصة. دار النهضة العربية، القاهرة.

٤١- شيفر، شارلز و هوارد ميلمان (٢٠٠١). مشكلات الاطفال و المراهقين و اساليب المساعدة فيها. ترجمة د.نسيمة داود و د. نزيه حمدي. الجامعة الاردنية، عمان.

٤٢- الشماع، صالح (١٩٦٧). بزوغ وأرتقاء اللغة عند الطفل. مطبعة حداد، البصرة.

٤٣- شريف، عبدالستار طاهر(١٩٨٧)، النمو اللغوي للطفل الكردي. دار ثقافة الأطفال،العراق، بغداد.

٤٤- العيسوي، عبدالرحمن (١٩٨٩). علم النفس في المجال التربوي. دار العلوم العربية، بيروت/لبنان، ط١.

٤٥- عيسوي، عبدالرحمن(١٩٨٤). سيكولوجية الجنوح. دار النهضة العربية، بيروت.

٤٦-عيسوي، عبدالرحمن(١٩٧٤). علم النفس الفسيولوجي. دار النهضة العربية، بيروت.

٤٧- عيسوى، عبدالرحمن(١٩٨٠)، النمو الروحي والخلقي، الهيئة المصرية العامة للكتاب، الاسكندرية.

٤٧- عاقل، فاخر(١٩٨١). أعرف نفسك. دار العلم للملايين، بيروت، ط٧.

٤٨- عبدالله، هيام نوري(١٩٨١). العوامل الأجتماعية لجنوح الأحداث في العراق. رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد، كلية الآداب.

٤٩- عوض، عباس محمود. علم النفس العام. دار المعرفة الجامعية، الأسكندرية.

٥٠- عيسى، محمد رفقى(١٩٨١)، جان بياجية بين النظرية والتطبيق، دار المعارف، القاهرة.

٥١- العباجي، ندى فتاح زيدان(١٩٨٩)، (نمو مفهومي الامانة والصدق)، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد، كلية التربية.

٥٢- العاني، نزار(١٩٨٩)، خصائص الطفل النفسية في المرحلة الابتدائية، وزارة التربية، المديرية العامة للاعداد والتدريب، معهد التدريب والتطوير، بغداد.

٥٣- العظماوي، ابراهيم كاظم (١٩٨٨). معالم في سيكولوجية الطفولة و الفتوة والشباب. دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد.

٥٤- الغريب، رمزية(١٩٧١)، العلاقات الانسانية في حياة الصغير ومشكلاته اليومية، القاهرة، مكتبة الانجلو المصرية.

٥٥- غنيم، سيد محمد(١٩٧٥). سيكولوجية الشخصية. دار النهضة العربية، القاهرة.

٥٦- فان دالين، ديوبولد(١٩٧٧)، مناهج البحث في التربية وعلم النفس، ترجمة الدكتور محمد نبيل نوفل واخرون، مكتبة الانجلو المصرية.

٥٧- الفخرى، سالمة واخريات(١٩٨٢)، سيكولوجية الطفولة والمراهقة، جامعة بغداد، كلية التربية.

٥٨- فتحي، محمد رفقى محمد(١٩٨٣)، في النمو الاخلاقي، دار القلم، الكويت، ط١.

٥٩- فهمي، مصطفى (١٩٧٧). سيكولوجية الطفولة و المراهقة. مكتبة مصر.

٦٠- القوصي، عبدالعزيز (١٩٨١). أسس الصحة النفسية. مكتبة النهضة المصرية، القاهرة.

٦١- القاضي، يوسف مصطفى وآخرون(١٩٨١). الأرشاد النفسي والتوجيه التربوي. دار المريخ، المملكة العربية السعودية، الرياض.
٦٢- قطامي، نايفة وعالية الرفاعي(١٩٨٩). نمو الطفل ورعايته. دار الشروق للنشر والتوزيع، عمان/ الأردن.
٦٣- القيسي، طالب ناصر حسين(١٩٨٨)، دراسة مقارنة في مفهوم الذات بين البنين فاقدي الاب واقرانهم الذين يعيشون مع ابائهم، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد، كلية التربية.
٦٤- قطافي، يوسف (٢٠٠٠). نمو الطفل المعرفي و اللغوي. الاهلية الاردنية، عمان.
٦٥- لفين، ملتون(١٩٥٩). طفلك بين الثانية والخامسة. ترجمة عبدالمنعم الزيادى، القاهرة، الشركة العربية للطباعة والنشر.
٦٦- الكبيسي، عبدالكريم مجيد(١٩٨٨). قياس التكيف الشخصي والأجتماعي لدى الأحداث الجانحين وعلاقته بالمعاملة الوالدية. رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة المستنصرية، كلية الآداب.
٦٧- كلاس، جورج (١٩٨٤). الألسنية ولغة الطفل العربي. مكتبة السائح، طرابلس، لبنان.
٦٨- كونجر، جون واخرون(١٩٧٠)، سيكولوجية الطفولة والشخصية، ترجمة الدكتور احمد عبدالعزيز وجابر عبدالحميد، دار النهضة العربية، القاهرة.
٦٩- كاظم، عبدالرحمن اسماعيل)(١٩٨٥)، سايكولوجية الطفولة في مرحلة رياض الاطفال، وزارة التربية، المديرية العامة للاعداد والتدريب (ملزمة مطبوعة على الرونيو.
٧٠- منصور، طلعت وآخرون(١٩٧٨). أسس علم النفس العام. مكتبة الأنجلو المصرية.
٧١- منصور، عبدالمجيد سيد أحمد(١٩٨٢). علم اللغة النفسي. جامعة الملك سعود، الرياض.
٧٢- مرسي، كمال ابراهيم(١٩٧٠). التخلف العقلي وأثر الرعاية والتدريب فيه. دار النهضة العربية، القاهرة.
٧٣- مكيرايد، دبليو، جي(١٩٧٩). الشعور بمركب النقص. ترجمة كاظم سلمان، ط٣.
٧٤- المغربي، سعد (١٩٦٠). أنحراف الصغار. دار المعارف بمصر، القاهرة.
٧٥- معوض، خليل ميخائيل (١٩٨٣). سيكولوجية النمو (الطفولة و المراهقة). دار الفكر العربي، ط٢.
٧٦- مسن، بول و آخرون (١٩٨٦). أسس سيكولوجية الطفولة و المراهقة. ترجمة احمد عبدالعزيز سلامة. مكتبة الفلاح، الكويت.
٧٧- نجاتي، محمد عثمان (١٩٥٥). علم النفس في حياتنا اليومية. مكتبة النهضة المصرية، القاهرة.
٧٨- هرمز، صباح حنا و يوسف حنا ابراهيم (١٩٨٨). علم النفس التكويني (الطفولة و المراهقة). دار الكتب للطباعة و النشر، جامعة الموصل.
٧٩- هوكهوكي، م و آخرون (١٩٨٨). الإطفال المشكلون (تقويمهم و رعايتهم). ترجمة د.عدنان ابراهيم و د.تاج السر عبدالله. دار مشرق، سوريا/ دمشق.

٨٠- هيلز، ديانا و روبرت هيلز (١٩٩٩). العناية بالعقل و النفس. ترجمة د. عبدالعلي الجسماني. الدار العربية للعلوم، بيروت / لبنان.

٨١- وافي، علي عبدالواحد(١٩٨٥). اللعب والمحاكاة واثرهما في حياة الأنسان. دار النهضة، مصر، الفجالة، القاهرة.

٨٢- وارد زورث، بى، جى(١٩٩٠)، نظرية بياجيه في الارتقاء المعرفي، ترجمة السيد فاضل محسن الازير جاوى واخرون، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد.

٨٣- ياسين، عطوف محمود(١٩٨١). أختبارات الذكاء والقدرات العقلية بين التطرف والأعتدال. دار الأندلس/ بيروت، ط١.

٨٤- الياسين، جعفر عبدالأمير(١٩٨١). أثر التفكك العائلي في جنوح الاحداث. عالم المعرفة، بيروت/ لبنان.

٨٥-يوسف، جمعة سيد(١٩٩٠). سيكولوجية اللغة والمرض العقلي. الكويت، عالم المعرفة (١٤٥).

٨٦- يعقوب، غسان(١٩٨٢)، تطور الطفل (عند بياجيه)، دار الكتاب اللبناني، بيروت.

٨٧-يقطين، اميمة (١٩٧٨). أثار الحرب في أطفال لبنان. في (الاتجاهات الجديدة في ثقافة الاطفال). المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت / لبنان.

٨٨-يونسيف (١٩٩٩). نمو الطفل في عاميه الرابع و الخامس. دمشق/سوريا.

٨٩- بابان، جمال (١٩٩٣)، سليمانى شارە گەشاوەکەم، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بغداد، دار الحريه للگباعه.

یونسیف. ڕێکەوتن نامەی مافەکانی منداڵ.

٩٠ - Baron, Robert. A& others. **Psychology: understanding behavior**, NewYork: Holt, Rine Hart and winston.

٩١- Bandura, A. (١٩٦٣) **social Learning and personality Development**. N. Y. Holt, Rinehart and Winston.

٩٢- Bee, Helen (٢٠٠٠). **The Developing child (٩th Ed)**. Allyn and Bacon, U.S.. (Apearson Education company).

٩٣- Bennett, W,J & others. (١٩٩٩). **The Educated child**. The free press, Adivision of simon and Schuster. Inc. New York.

٩٤- Berk, Laura E(٢٠٠٣). **Child Development (٦th Ed)**. Person Education, Inc. U. S. A.

٩٥- Bigner, Jerry, J. **Parent- Child Relation**. NewYork: macamillan publishing Co., Inc, ١٩٧٩.

٩٦- Biller, Henry, B. "**The Father and Personality Developement: Paternal Deprivation and sex-role Developement**" in Lamb, michael, E (Ed). The Role of Father In Child Developement. NewYork: John wiley & sons, ١٩٧٦.

٩٧- Brown, Daniel, G "**Sex- Role Developement In A Changing Culture**" In rosenblith, Judy, F& wesely, A. (Ed). The causes of behavior; readings InChild Developement and Educational Psychology. U.S.A: Allyn and Bacon, Inc., ١٩٦٤.

٩٨- Douglas.G. "Moral Learing and Developement". **Theory and Research**. America, by willey and sons, NewYork, ١٩٧٣.

٩٩- Faller, K. coulborn (١٩٨١). **Social work with Abused and Neglected children.** The free press, New York.

١٠٠- Feldman, Robert. S (٢٠٠٣). **Development Across the life span** (٣rd. Ed). Person Education. Inc. upper sadle River. New Jersey. U. S. A.

١٠١- Freeman, Harvey, R.& others "Effects of Gender and Race on sex-Role preferences of fifth Grade children" **Social Psychology**, (٩٥) (١٩٧٥) ١٠٥-١٠٨.

١٠٢- Good. **Dictionary of Education**, NewYork ٣nd Edition, ١٩٧٣.

١٠٣- Graham, **Moral learning and Developement Theory and Research**, London.D.T. Bast ford, ١٩٧٤.

١٠٤- Hetherington, E. Mavis & Ross, D, Parke. Child psychology, Acontem**parary view points.** ٣nd Ed. NewYork: Mcgrow- Hill, ١٩٨٦.

١٠٥- Konner, Melvin (١٩٩١). **Childhood** (Amulti cultural view. Little, Brown & company (Canada) Limited.

١٠٦- Kohlberg.L. "Stage and sequence" The cognitive Developemental Approach to socialization In D.A. Goslin, **Hand book of socialization theory and Research**. Chicago: Randmenally, ١٩٦٩.

١٠٧- Kuhn, Deana & others. "**Sex- Role concepts of two and three- Years olds" child Developement.**, ١٩٧٨ ٤٤٥-٤٥١.

١٠٨- Levitin, Teresa, E.& J.D. chananie "Responses of Femal school Teachers to sex-typed behaviors in male and femal children" **child Developement**, ٤٣, ١٩٧٢, ١٣٠٩- ١٣١٦.

١٠٩- Lynn, Daryton, E "The Effect of father Absence upon social Adjustment of male and female Institutionalized Juvenile Delinquents" **<u>InThe dissertation Abstracts,</u>** ٢٨, ١٩٧٨, ٧٢٢٣-A.

١١٠- Massad, Christopher, M. "Sex- Role Identity and Adjustment During Adolesence" **<u>Child Developement,</u>** ٥٢, ١٩٨١, ١٢٩٠- ١٢٩٨.

١١١- Mussen, Paul, H. & others**<u>. Child developement and persolnality</u>** , ٢nd Ed. London: Harper & Row, ١٩٦٣.

١١٢- Piajet.J. **<u>The moral Judgment of the child</u>**. NewYork free press, ١٩٦٥.

١١٣- Ross, P.E.& Lawrence, H. Cohen. "Sex-Role and Social support As moderators of life stress Adjustment" **<u>Personality and social Psychology</u>**, ٥٢, ١٩٨٧, ٥٧٦-٥٨٥.

١١٤- Russell, G. "The Father Role and Its Relation To Masculinity, Femininity, and Androgyny", **<u>Child developement</u>**, ٤٩ , ١٩٧٨, ١١٧٤- ١١٨١.

١١٥- Smith, B. Sutton& others. "Father- Absence Effects in families of different sibling composition **<u>child developement</u>**, ٣٩, ١٩٦٨.

١١٦- Wadely, Alison (١٩٩٦). **<u>Psychology.</u>** Longman Group Limited. England.

١١٧- Watson, Robert & Lindgren, Henry clay (١٩٧٣**<u>). Psychology of the child</u>**. John wiley & sons, Inc. New

# DEVELOPMENTAL PSYCHOLOGY

**Dr. Kareem Karachatany**



# علم النفس النمو

## ( الطفولة و المراهقة )

**2009**